# ژیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

دانراوی: سەیید ئەبولحەسەنی نەدەوی




بەکوردی کردن و لێکۆڵینەوەی

مەلا مەحمودی گەلاڵەیی

(محمود أحمد محمد)

# ژیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

دانراوی:

## أبو الحسن الندوي

بە کوردی کردن و لێکۆڵینەوەی

**محمود أحمد محمد**

٢٠٠٦ ز ١٤٢٧ ك



.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★


📖 ناوی کتێب: ﴿ ژیانی پێغەمبەر ﴾

📖 دانراوی: أبو الحسن الندوي

📖 وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی: محمود أحمد محمد

📖 تیراژ: ١٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: ٦٢٧ ساڵی ٢٠٠٦

📖 چاپ و دیزاین: (کۆمپیوتەری شانیا).

📖 چاپخانەو ئۆفسێتی تیشك.

📖 ساڵی چاپ: ١٤٢٧ ك -٢٠٠٦ ز

# پێشەکی

کەلەنوسینی تەفسیری رەوان بوومەوە بڕیارم دا روبکەمە مێژوو نوسین و کتێبێکی چەند بەرگ و فراوان لەمێژووی کوردا بنوسم، زۆرم سەرچاوە خوێندنەوەو زانیاریم لێ راگوێزتن و وەسەریەکم خستنەوەو بەراوردم کردن و کەرستەیەکی باشم پێکەوە ناوە زۆرم پاکنوس کردوەو ناوم ناوە (کوردستانی گەورەو نیشتەجێ بوونی کود تێ یدا) بەنیازم خودا یاربێ لە (دە) بەرگی قەبارە گەورەدا کۆتایی پێ بێنم، وەلێ شتێکی ئاشکراو بەڵگەنەویستە کە مێژووی کورد تێکەڵ بەمێژووی ئیسلام بووەو تێیدا تواوەتەوە، چونکە گەلی کورد لەژێر سایەی ئیسلام دا هەستی یەکسایەتی خۆی کردوە، بەهاتنی ئیسلام گەلی کورد ئازادی بۆ دەستەبەربووە، لە[illegible]انەوەو کۆیلایەتی [illegible] بوو، ئایینی ئاگر پەرستییان وەلاناو چوونە ژێر سایەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، چونکە گەیشتنە ئەو قەناعەتە کەئایینی تازە داهاتوو کەسەرچاوەکەی قورئانی پیرۆزەو نامەی ئاسمانییە زۆر لەرێ و شوێنی پێشووی بەناو ئایین کە ئاگر پەرستی بوو لەبارترو چاکترەو پڕە لەگیانی یەکسانی و هەمئاهەنگی و برایەتی و ئازادی. بۆیە گەلی کورد باوەشیان بۆ ئایینی ئیسلام کردەوەو لەئامێزیان گرت و لەژێر سایەی دا حەسانەوە، هەتا یاسای ئیسلام پەیڕەو

کرابێو فەرمانڕەواو حاکمەکانی وڵات پابەندی ئەو دەستورە ئاسمانییە بوبن گەلی کورد حەسانەوەی پایەدارو درێژخایەن بووە، هەرکاتێکیش خەلیفەو فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان کەمتر پابەندی دەستورو یاساکانی ئیسلام بووبن و هەستی ئاینیان بەرەو لاوازی رۆیشتبێ ئەوە گەل و نەتەوەکانی ژێر قەڵەمڕەویان بەگەلی کوردیشەوە توشی چەوساندنەوە و توانەوە بوون و یاسای بیشەڵانیان بەسەردا سەپێنراوە، جەژنە پیرۆزەی ئازادی و یەکسانی و ئارامی و برایەتیان لێ بووە تە رۆژی رەش و کارەسات و چورتم و ناخۆشی. چەندێك ئەو فەرمانڕەوایانە لە ئیسلام دوورکەوتبنەوە ئەوەندە گەل و نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتیان توشی دەردی سەری بون و مافیان پێشێل کراوەو روبەڕوی زەبرو زەنگ و توانەوەو پاکتاوی نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبی بوونەوە، چەمکی شیعاری خودایی کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾ یان کردوە بە (و جعلناکم شعوباً و قبائل لتتقاتلوا!)! فەرمانڕەوای ستەمکار بەبیانوی جۆراو جۆرەوە بەناوی ئیسلامەوە بەناحەق و ناڕەوا قەڵاچۆی گەل و نەتەوەی بێ دەسەڵاتیان کردوەو هەوڵی پاوانخوازی و بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی خۆیان داوە، خودا بیانگرێ ئەو ئایینە پیرۆزەی کەخودا ناردویەتی ببێتە (رەحمەتەن لیلعالمین) کردویانە بەداردەست و گورزی ستەمکاری خۆیان و پاساوی کارە ناڕەواکانی خۆیانیان پێ داوەتەوەو کردویانە بە (نیقمەتەن للمضطهدین)!.

هەڵبەتە گەلی کوردیش لەو رۆژەوە کەچۆتە ژێرسایەی ئیسلامی پیرۆزەوە، بەدڵ و بەگیان باوەشی بەو ئایینە پیرۆزەدا کردووەو ئەویش زۆرجار لەلایەن خەلیفەو فەرمانڕەوا (بەناو ئیسلامی)یەکانەوە توشی کارەسات و هێرشی ناڕەواو نەفیر عام بۆ سەرکردە بۆتەوە، جا ئەگەر زۆر جار بەهۆی ئازایەتی رۆڵە کوردەکان خۆیانەوەو سەختی رێگاو کێوەکانی

کوردوستانەوە دوژمنەکانی تێ شکابن سەریان لەبەرد دابێ، ئەمجار هەوڵی نانەوەی دوبەرکی و براکوژیو بەگژ یەکدا کردنی یەکتریان بۆداونو یاسای فرق تسد)یان بۆ رەچاوکردون.

دەبێ گەلی کورد مەمنونی کێوە سەرکەشو دوڵو شیوو ئەشکەوتەکانی ولاتەکەی بێ. کەتوانیویەتی لەئامێزیان دا بەرگری لەخۆی بکاو ناحەزانی بەسەر پاشوان دا بگێڕێتەوە. ئەگینا زۆری وەکوو شائیسماعیلی صەفەوی و بریێ لەخەلیفە عوسمانییەکانو شای پەهلەویو حەمەڕەزای کوڕی و کەمەلی ئەتاتورکو صەدام حوسێنی تکریتی و ئەمثالیان پیلانی قەلاچۆکردنی گەلی کوردیان دارشتوەو هێزو توانای خۆیان تێدا بەتاقی کردۆتەوە بەلام ئاواتەکەیان نەهاتۆتە دیو سەریان لەبەردی رەق داوە، ئەوان چوونە زبڵدانی مێژووەوەو گەلی کورد لەناو چیا سەرکەشەکانی دا بەسەر بەرزیو ئاییندارییەوە ماوەتەوە، دەستی لە ئیسلام بەرنەداوە، ئەخلاق و رەوشتی ئیسلامیانەی خۆی لەدەست نەداوە، شیعاری (أشهد ان لا إله إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله) رۆژانە پێنج جار دوبارە دەکاتەوە، ئەکوردستان دەڵێ: ئەی نیشتمانم، هەتا کێوە سەرکەشەکانی تۆ پایەدار بن و دیمەنی سروشتت ئاواڕازاوەبێ من دەست لەم ئایینە پیرۆزە بەر نادەم و ئەوبانگە پیرۆزەت بەگوێدا دەدەمو عەهدو پەیمانی باوەگەورەی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیمی بەرەچەڵەك کوردمان تازە دەکەینەوە!! شانازی دەکەین بەوە ئایینمان ئیسلامەو کوردوستانی پیرۆز نیشتمانمانە، لەژێر دروشمی (لا إله ألا الله)دا بەرگری لەمافو بوونو نیشتمانی پیرۆزمان دەکەین.

جالەژێر رۆشنایی ئەوەی ئاماژەمان پێکردو ئەو واقیع و راستیانەی خستمانە رو حەزم کرد خزمەتێك بەسیرەی پێغەمبەر بکەم، پەراوێزێك

بنووسم تایبەت بێ بەژیاننامەی حەزرەتی موحەممەد، پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەربێ) بۆئەم مەبەستەش ویستم کتێبی (السيرة النبوية) دانراوی مامۆستای خوالێخۆشبوو (أبو الحسن الندوي) وەرگێڕمە سەرزمانی کوردی، بەلاّم وەرگێڕانێك پێی بگوترێ (بەکوردیکردن!) و دیاردەی وەرگێڕانی پێوە دیارنەبێ، پتر لەنووسینی سەربەخۆ بچێ، چونکە من فکرەکەم وەرگێڕاوە نەك وشەم بەوشە وەرگێڕابێ. هیوادارم جێگای رەزامەندی خوێنەران بێو لەکتێبخانەی کوردی دا جێگای خۆی بکاتەوە، خودا فەرو بەرەکەتی تێ بخاو وەکوو ئەصڵەکەی بەرەوی هەبێو موسوڵمانان سودی لێ وەربگرن.

هەڵبەتە سیرەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قوتابخانەی ژیانە، سەرچاوەی فێربوونی ئەخلاقو رەوشتە، لێیەوە فێری هەڵسو کەوتی رۆژانەی ژیانمان دەبین، لەخۆشیو ناخۆشی دا، لە گەنجیو پیری دا، لەماڵەوەو لەدەرەوە، لەگەڵ خێزانو هاوسێو خزمو هاوولاّتیو تەنانەت ناحەزیش دا چۆن روبەڕوی ژیان ببینەوە، کەواتە ئێمەی موسوڵمان ئەرکی سەرشانمانە ئەگەر بە درێژیش نەبێ بەکورتی ژیاننامەی پێغەمبەر مان ئاگادار بینو کەڵکی لێ وەرگرینو بیکەینە پەیڕەوو پرۆگرامی بەڕێوە چوونی ژیانمان. بەشوێنکەوتنی ئەخلاقو رەوشتی ئەو پێغەمبەرەمەزنە بەهرەمەند بینو کەسایەتی خۆمان لەدەست نەدەینو بەختەوەری دونیاو قیامەت بۆخۆمان دەستەبەر بکەین.

محمود أحمد محمد

٢٠٠٦/٧/١٧

## وەزع و حاڵی خۆر هەڵاتی ناوەڕاست پێش هاتنی ئایینی ئیسلام بەتایبەتی لەسەدەی شەشەمی زایینی دا:

**مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەوی لەم بارەوە دەڵێ:**

ئایینە باوەکانی ئەو ڕۆژگارە، نامە ئاسمانییەکانیان، شەریعەتو پەیامەکانیان کەلەسەردەمو ڕۆژگارە جیاجیاکاندا ڕۆڵی خۆیان لەبواری ئایینی و رەوشتو زانیاریدا گێڕا بوو، ئەم ئایینانە لەسەدەی شەشەمی زایینی دا چ بنەمایەکی ڕاستەقینەیان نەمابوو، هێندەیان گۆڕانکاری تێدا کرابوو هیچ میصداقییەتێکیان تێدا بەدی نەدەکرا، قەشەو ماڵمو موغەکانو فرمانڕەوایان بەئارەزوی خۆیان چۆنیان بویستایە ئاوا دەقەکانیان ئاراستە دەکردن، ئەو ئایینانە ئەوەندەیان ئاڵو گۆڕ تێداکرابوو، ئەگەر ڕێبەرە ڕاستە قینەکانی پێشوویانو پێغەمبەرە رەوانەکراوە کانیان زیندو بکرانایەوە نکوولییان لەوە دەکرد: کەئەوە ئایینی ئەوان بێو ئەوان هێنابێتیان.

ئایینی جولەکە ببوە کۆمەڵێك سرودو هەڵسو کەوتی چاولێکەریو لاسا کردنەوەی بێ ناوەڕۆكو بێ گیان. ئەمە بێجگە لەوەی کەئایینی جولەکە خۆی لەخۆیدا ئاینێکی نەتەوەییەو تایبەت بووە بە بەنوئیسرائیلی یەکانەوەو پەیامی جیهانی پێ نەبوە بۆ گشت نەتەوەکان.

بێگومان ئایینی جولەکە لەبواری بیرو باوەڕدا توشی نەخۆشییەکی کوشندە بو بوو، یەکتا پەرستی لەدەست دا بوو، کەلەکاتی خۆی دا ئەم خاڵە شیعارێکی سەرەکی ئایینی جولەکە بوو، خاڵێك بوو بابەگەورەی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خوای لەسەربێ) ئامۆژگاری نەوەکانی خۆی

کردبوو کەپێوەی پابەندبن و پاشخوێی نەخەن. حەزرەتی (یەعقوب)یش بەهەمان شێوە ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆی پێ کردبوو. بەڵام بەتێپەڕبوونی ڕۆژگارێکی دوورو درێژ، ئەم خاڵە سەرەکییە گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەردا هاتبوو، چونکە جولەکەکان زۆرێك لەبیرو باوەڕی جیاجیای نەتەوە هاوسێکانی خۆیان خزاندبوە ناو ئایینی خۆیانەوە،زۆر داب و نەریتی بتپەرستی و نەفامییان خستبوە ناو عیبادەت و شێوەی سرودو طقوسەکانی خۆیانەوە، خاوەنی دائیرەتولمەعاریفی یەهودی دەڵێ: ناڕەزایی پێغەمبەران و رقبوونیان لەبتپەرستی نیشانەی ئەوەیە، کەپەرستنی بت و بەندایەتیکردن بۆ خودا درۆزنەکان، دیار دەیەك بوو خرابوە ناو دڵ و دەروونی جولەکەکانەوە و کاریگەری خۆی هەبوو لەسەریان و تالەدەربەدەرییەکەیان ڕزگار نەبون و لەبابلەوە نەگەڕانەوە بۆ فەلەستین ئەم دیار دانەیان لەکۆڵ نەبوەوە. ئەم جولەکانە بیرو باوەڕی هیچ و پوچو بێ بناغەیان وەرگرتبوون بتپەرستی لەناویان بڵاو بوبوەوە، گەلێك کۆلکە خودایان بۆ خۆیان داهێنا بوون تەنانە کتێبی تەلمود کەکتێبێکە ڕاڤەی تەورات دەکاو دەقەکانی ئایینی جولەکە شی دەکاتەوە ئاماژە بەوە دەکا کە بتپەرستی لەناو جولەکەکان دا بەشێوەیەکی ڕەهاو بەربڵاو برەوی هەیە.

تەلمودی بابل کەجولەکان زۆریان پێ پیرۆزەو جاری وا هەیە لەپیرۆزی دا دەیخەنە سەروی تەوراتەوە و لەسەدەی شەشەمی پێش زایین دا کتێبی بەربڵاوی ناو جولەکەکان بوو، ئەم پەڕاوە پڕیەتی لەنموونەی هەڵس و کەوتی گێلانەو نیشانەی عەقڵ سوکی و قسەی توڕەهات و نابەجێ و بوختان هەڵبەستن لەسەر خوداو گاڵتەکردن بەحەقیقەت و ڕاستی یەکان و ئایینن!.

کەهەموو ئەمانە کاڵفامی و تێنەگەیشتویی گەلی جولەکە لەو سەردەمەدا دەردەخەن نیشانەی لەدەستدانی عەقڵ و نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و تێکچونی زەوقی ئایینی یانن.

لەلایەکی ترەوە ئایینی مەسیحی لەلایەن پیاوە ئاینییە توندڕەوەکانیانەوە توشی دەست لێدانو گۆڕانکاریەکی بێ ئەندازە هاتبوو. تەئویل کردنی دەقە ئایینی یەکان لەلایەن نەزانەکانیانەوەوبتپەرستی ڕۆمانە مەسیحییەکان هەر لەسەدەی یەکەمی زایینی یەوە، زۆر دابو نەریتی تری نائایینی کە لەناو کۆمەڵگاکاندا پەیڕەو دەکران، ئەمانە هەموویان ببوونە تەپو تۆزو ڕاستی ئایینەکەیان داپۆشیبوو، تەعلیماتو شێوە ئاسانکارییە جوانو بێ خەوشەکەی ئایینە ڕاستە قینەکەیان ژێر خۆڵ بوو. ببوونە هەورە چڵکنەو روناکی خودا پەرستیو خودا بەیەکناسینیان گوم کردبوو..! نووسەرێکی مەسیحی دان بەوەدا دەنێ: کەبیرو باوەڕی سێ خودایی (الثالوث المقدس) هەر لەئاخرو ئۆخری سەدەی چوارەمەوە بەچڕی چووەتە ناو ئایینی مەسیحی یەوە، واتە: (عقیدەی تەثلیث) بوەتە عەقیدەیەکی بەربلاوو بڕوا پێ کراوو ڕەسمی ناو جیهانی مەسیحی. هەموو ئاقارێکی عالەمی مەسیحی دا پشتی پێ بەستراوەو بانگەشەی بۆ کراوەو برەوی پێ دراوە .

شایانی باسە هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی پەردە لەسەر پەرە پێدانی بیرو باوەڕی سێ خوداییو نهێنی ئەو بیرو باوەڕە لانەدرا.

**مێژوو نووسێکی مەسیحی تر دەربارەی پەیدا بوونی بیرو باوەڕی سێ خودایی لەناو کۆمەڵگای مەسیحی دا بەشێوەی جیا جیاو ڕانواندنی ئەو بیرو باوەڕە جۆراو جۆرەدا دەڵێ:**

مەسیحییەکان زۆر لێزان بوونو ئامادە باشی چاکیان تێدا بوو بۆ وەرگرتنو هێنانی دابو نەریتی بتپەرستی لەگەلو نەتەوە پێشینیەکانو داهێنانی جەژنو دروستکردنی کەسایەتی ئەفسانەیی و لاسایی کردنەوەی ئەو گەلو نەتەوانەی کەلە دیاردەی بتپەرستیو بیرو باوەڕی ئەفسانەیی دا

ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لەکتێبی (تاريخ المسجية في ضوء العلم المعاصر) دا هاتووە دەڵێ: بێگومان بەبلاو بوونەوەی ئایینی مەسیح بتپەرستی بەسەر چوو کۆتایی هات، وەلێ بەتەواوی ریشە کێش نەکرا، بەڵکوو لەدڵو دەروونی جەماوەری مەسیحی دا لەشێوەی جیاجیادا بنجی داکوتاو بەناوی ئایینی مەسیحی یەوەو لەژێر پەردەی ئایین دا لەسەردەمێکی تردا خۆی دەرخستەوە، ئەوانەی وازیان لەبتپەرستی و بەندایەتی کردن بۆ خودا درۆزنەکان هێنا، بەشێوەیەکی تر لەقوڕو لیتەی بتپەرستی چەقینەوە، ئەوەبوو هاتن شەهیدێك لەشەهیدەکانیان دیاری کردو لەقەبو ڕەوشتی خودا کانیان پاڵ دا، پەیکەریان بۆ تاشی و پیرۆزیان کرد..! بەمجۆرە جەماوەر لەدیاردەی شیركو بتپەرستی وازیان هێناو رویان کردە پەرستش کردن بۆ پەیکەری شەهیدە خۆ ولاتیەکانیان، تەنانەت ئەم سەدەی شەشەمە بەکۆتا نەهات تاوای لێ هات بەندایەتیکردنو پەرستنی شەهیدەکانو پیاو چاکانیان بووە دیاردەی بەرچاوو گشتگیر، واتە لەم سەدەیەدا بیرو باوەڕێکی تازەیان داهێنا، ئەویش بریتی بوو لەوە کە پێیان وابوو پیاو چاکە کانیان رەوشتی خودا وەندییان هەیە، کار گەیشتە ئەوە بیرو باوەڕیان وای لێ بێ کە ئەو پیاو چاكو قدیسانە جۆرە مەخلوقێکن ڕەوشتی خوداوەندییان هەیەو لەسەر بنەمای بیرو باوەڕی ئەریسییەکان، پێیان وابوو ئەوانە ناوەندن لەنێوان خوداو ئادەمیزاد دا، بەم جۆرە بوو نەرەمزو نموونەی پیرۆزیو تەقدیس بۆ سەدەکانی ناوەڕاستو نمونەی پاکیو بێ خەوشی، لەهەمان کاتدا ناوی چەژنە بتپەرستییەکانیان گۆڕی بۆ ناوی تازە بابەت. تەنات ساڵی (٤٠٠) چوار سەدی زایینی چەژنی خۆر پەرستی کۆنیان کردە چەژنی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا (درودی خوای لەسەربێ).

بەو جۆرە لەگەڵ پەیدابوونی سەدەی شەشەمی زایینی شەڕ لەنێوان مەسیحییەکانی شام‌و عێراق‌و مەسیحیەکانی میصردا لەسەر کێشەی حەقیقەتی مەسیح‌و سروشتی ئەو زاتە، بەفیعلی بەرجەستە بوو، بەجۆرێك خوێندنگاکان‌و کەنیسەکان‌و ناو خێزانەکانیش ببوە گۆڕەپانی شەڕو مەنگەری سەربازی دژ بەیەك‌و ئەم ئەوی بەکافر دادەناو ئەو ئەمی بەلادەرو هەڵگەڕاوە لەئایین لەقەڵەم دەداو، هەندێکیان هەندێکی تریانی دەکوشت‌و خوێنی یەکتریان بەحەڵاڵ دەزانی، هەردەتگوت جەنگ لەنێوان دوو ئایینی جیا بەیەکدا بەرپابووە، ئیتر وای لێ هات جیهانی مەسیحی بەهۆی خۆ خۆری نێوان خۆیانەوە نەیان پڕژایە سەر ئەوەی دژی فەساد بجەنگن‌و چاکسازی بکەن‌و بانگەوازی نەتەوەکانی تر بکەن بۆ خودا پەرستی‌و وەدەستهێنانی بەختەوەریی بۆ ئادەمیزاد.

ئاگر پەرستەکانیش ئەوە لەدێر زەمانەوە بەوە ناسرا بوون کەعیبادەتی عونصورە سروشتی یەکان دەکەن، کە گرنگترین‌و گەورەترینیان ئاگرە. ئەوەبوو لەئاکاما خۆیان دایە ئاگر پەرستی‌و دروستکردنی ئاتەشگەدەو بەیتخانەی ئاگر پەرستی. تاوای لێ هات خانوەکانی ئاگر پەرستی بەشێوەیەکی بەر فراوان لەسەرانسەری وڵاتی ژێر قەڵەمڕەوی ساسانیەکان دا بڵاو بونەوەو ئاداب‌و یاسای وردو تەواویان بۆ ئاگر پەرستی داناو هەموو بیرو باوەڕێك‌و ئایین‌و یاساو ڕێسایەك جگە لەئاگر پەرستی و خۆر پەرستی لەو ئیمپراتۆرییەدا قەدەغەکراو نەما دیاردەی ئاگرپەرستی سەرانسەری وڵاتی گرتەوە.

خۆر پەرستی باوی سەندو ئایین لەلای خەڵکەکە بریتی بوو لەچەند هەڵس‌و کەوت‌و طقوس‌و لاسایی کردنەوەیەك کەلە پەرستگاو شوێنە تایبەتیەکاندا ئەنجامیان دەدا، لەدەرەوەی پەرستگا کانیان دا ئازادبون

چیان بکردایە کەس ڕێی لێ نەدەگیرا بە هەوەس و ئارەزوی خۆیان هەڵس و کەوتیان دەکردو پابەندی ئایینەکە یان نە دەبوون، بەکورتی لەدەرەوەی عیبادەتخانەکان دا جیاوازی لەنێوان ئاییندارو بێ دین دانەبوو.

مامۆستا (أرتهر كرستين سين) ی دانیمارکی و دانەری کتێبی (ايران في عهد الساسانين) لەباسی چینی پیاوە ئایینی و کاربەدەستە کانی ئایین و ئەرکی سەرشانیان دا دەڵێ: (پێویست بوو لەسەر ئەو کاربەدەست و پیاوە ئاینیانە، ڕۆژی چوار جار عیبادەتی خۆر بکەن، هەندێ عیبادەتی (مانگ و ئاگرو ئاو) یشیان دەخستە پاڵ خۆرپەرستییەکە، پێویست بوو چەند دوعاو پاڕانەوە یەکی تایبەتی لەکاتی نوستن و هەڵسان لەخەوو خۆششتن و زننار لەپشت بەستن و خواردن و پژمین و موتاشین و نینوک کردن و دەست بەئاو گەیاندن و چرا هەڵکردن دا ئەنجام بدەن و بیانخوێنن، هەروا پێویست بوو لەسەریان نەهێڵن ئاگری ئاتەشگەدەکان بکوژێتەوە، نەشهێڵن ئاگرو ئاو لێك بکەون، پارێزگاری ئەوەش بکەن نەهێڵن هیچ مەعدەنێك ژەنگ بگرێ، چونکە ئەوان بەلایانەوە مەعدەنەکان پیرۆزبوون و قودسییەتی تایبەتییان هەبوو.

ئێرانییەکان لەنوێژەکانیان دا رویان دەکردە ئاگر، یەزدو جورد دوا پاشای ساسانییەکان سوێندی بەخۆر خواردو وتی سوێندم بەو خۆرەی کەخودای گەورەو مەزنە.

ئەوانەی کەتۆبەیان دەکردو لەمەسیحیەت ژێوان دەبوونەوە مەرج بوو دەبوو خۆر پەرستی بکەن، بۆ ئەوەی دڵنیابن لە راستگۆیی تۆبە کردنەکەیان..! ئاگر پەرستەکان ئیمانیان بەدو خودایی هەبوو، هەمیشە بڕوایان وابوو دو خودا هەن خودای خێرو خودای شەڕ. بەخودای خێریان

دەگوت (أهورامورزدا) یان یەزدان، بەخودای شەڕیان دەگوت ئەهریمەن، پێشیان وابوو هەمیشە شەڕو دژایەتی لەنێوان ئەو دو خودایە دا بەردەوامە.

مێژوو نووسان دەربارەی ئایینی ئێرانییەکان کۆمەڵێك چیرۆك و ئەفسانەی پەیوەست بەخوداکانیان باس دەکەن دەق دەشوبهێتە خورافات و ئەفسانەی خودا وەندە ئیغریقیەکان و هیندییەکان.

ئایینی (بوذی)یش[1] کەئایینێکی بەربلاوە لەهیندوستان و ئاسیای ناوەڕاست دا ئەویش بریتی بوو لەبتپەرستی یەکی توخ و تۆکمە، لەهەرجێیەك دا ئەو ئایینە پەیدا بوبایە بت و صەنەمی لەگەڵ دابوو، پەیکەری بتەکان هەڵدەنران و دەڕازێندرانەوە، پەیکەری بوذا بینا دەکراو پەیکەرتاشان دەستڕەنگینی خۆیانیان تێدا بەتاقی دەکردەوەو تەفەننونیان تێدا دەکرد. شایانی باسە زانایان پێیان وایە: ئایینی بوذی هیچ بنەمایەکی ئایینی ئاسمانی پێوە دیار نیەو (ئایینێکی خورافی و زادەی خەیاڵی پەستی ئادەمیزادی کۆنە.

ڕەهبەرو دامەزرێنەرانی ئەم ئایینە بڕوایان بەخودای تاك و تەنها و بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی نیە، زانایان چەندێك ورد بوونەوە نەیانتوانیوە بەڵگەیەك بدۆزنەوە گەواهی ئەوە بدا کەرێبەرانی ئایینی بوذی بڕوایان بەخودای بالاّ دەست و بەدیهێنەری بونەوەر هەیە.

**لەهەمان کات دا سەریان لەوە سوڕماوە چۆن ئەم ئایینە بەرفراوانە ئاوا بەبێ ئەوەی پەیوەندی بەخوداوە هەبێ پەرەی ساندوە؟**

ئایینی بورە همیەش کەئایینی کۆن و ڕەسەنی هیندییەکانە، ئەویش ئایینێکی فرە خودایی یەو ژمارەیەکی زۆری خودای نێرو خودای مێینەیان

---

[1] بوزا، نازناوی (سکیا مونی) یەو عاقڵمەندو حەکیمێکی هیندییە لەچەرخی شەشەمی پێش زایینی دا ئایینی بوزی داهێناوە.

تێدان. هیچ ئایینێکی تری خورافی ئەوەندە کۆڵکەخوداو خودا درۆزنەی نێرو مێ ی تێدا نین. بێگومان لەسەدەی شەشەمی زایینی دا، بتپەرستن گەیشتە ڕێژەیەکی خەیاڵی و ژمارەی خوداوەندە پەرستش بۆ کراوەکان گەیشتە (٣٣٠) ملیۆن خودا!! هەرشتێك سەرنج ڕاکێش بوایە، هەرشتێك زەبەلاح و قەوارە گەورە بوایە، هەرشتێك سود بەخش بوایە یەکسەر دەکرا بەخوداوەندو پەرستنی بۆ دەکرا، ئیتر بەو شێوە دروستکردنی پەیکەرو داتاشینی بەردو دار بەشێوەی جۆراو جۆرو کردنیان بەبت و صەنەم بازاڕێکی گەرمی هەبوو، وەستاو دەست ڕەنگینەکان کارامایی خۆیانیان تێدا رادەنواند.

مامۆستا (سی، وی، وید) کە مامۆستایەکی پایەبەرزی هەندۆکییە، لە کتێبەکەی دا کەناوی ناوە (تأريخ الهند الوسطى) لەکاتێك دا باسی سەردەمی (مەلیك هەرش ٦٠٦-٦٤٨ ز) دەکا کەسەردەمێکە دوا پەیدا بوونی ئایینی ئیسلامە. دەڵێ: ئایینی هەندۆکی و ئایینی بوذی هەردوکیان ئایینی بتپەرستین و جیاوازێکیان نیە.

بەڵکوو دەتوانین بڵێین: ئایینی بوذی لەئایینی هەندۆکی زیاتر نقومی بتپەرستی بو بوو، سەرەتای ئەم ئایینی بوذییە لەسەر بنەمای نەبوونی خودا دامەزرابوو، بەڵام وردە وردە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار (بوذا) خۆی کرابە خوداوەندی گەورەو پەرستش بۆ کردنی بەرفراوان بوو، ئەمجار خوداوەندی تری خرانە پاڵو بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار بتپەرستی لەناو جیهانی بوذی دا پابەندبوانی ئایینی بوذیدا ڕەگی داکوتاو، لەمەدرەسەی فیکری بوذی دا خۆی نواندو پەرەی سەند، تاوای لێ هات وشەی بوذا لەهەندێ زمانی خۆر هەڵاتی دا بەمانا بت و صەنەم مانا دەکرا.

ئەوەی گومانی تێدا نیە، ئەوەیە کەدیاردەی بتپەرستی لەجیهانی ئەو ڕۆژگارەدا بڵاوو باوبوو، جیهان هەمووی لەدەریای ئەتڵەسی یەوە تادەریا

..رستی هادی. نقوومی بتپەرستی بو بوو، هەردەتگوت: ئایینی مەسیحی و ..ینە سامییەکان و ئایینی بوذی لە پێشبڕکی دابوون بۆ ڕێز لێنان لەبت و ..نەمەکان و بەپیرۆز زانینیان، شان بەشانی یەك هەریەکە یان لەئاستی خۆ..ود پەلەی بوو لەنوغرۆ بوون لەو قوڕو لیتەو زۆنگاوە بێ ئامانە دا.

..مۆستایەکی تری هەندۆکی بەڕێز، لەکتێبێکی دا بەناوی (الهندوکیة ..ئدة)دا دەڵێ: بێگومان دیاردەی دروستکردن و داهێنانی خودا ..ز..ەکان لەلایەن خەڵکەوە بەکۆتانە هات و نەبڕایەوە، بەڵکوو بەردەوام خو..ەندی بچوك بچوك دا دەهێندران و دەخرانە سەر لیستی خودا ..ز..ەکانی تر، هەتا وای لێ هات ژمارەی ئەو خوداوەندانە لەژمارە ..ەرچوو، ژماردنیان بەکارێکی ئەستەم دەژمێردرا، زۆربەی ئەو خو..وەندانەش خودا هەڵبەستراوەکانی هیندییە کۆنەکان بوون و خرابوونە ..ـ خودا کانی ئایینی هەندۆکی یەوە، تا وای لێ هات دەتواندرا بگوترێ ..ەردی ئەو خودا وەندانە گەیشتۆتە (٣٣٠) ملیۆن خودا!!!.

عەرەبەکایش کەلە ڕۆژگاری کۆن دا ئیمانیان بەئایینی حەزرەتی ..براهیم هێنابوو، لەخاکی ئەوان دا مالی خودا (کابە) دروستکرابوو، ..وانیش بەهۆی دوور کەتنەوەیان لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم و ..ێغەمبەرانی تر هەروا قەتیس بوونیان لەنیوە دورگەی عەرەبی دا، ئەوانیش ..ە چەرخەدا تووشی ئافەتی بتپەرستی یەکی زۆر نەفامانە بوو بوون، کەزۆر لە بتپەرستی بوذی و بورەهمیەکان گاڵتە جار تر بوو، ئەوانیش زۆر نەفامانە لەبواری بتپەرستی و هاوەڵدانان بۆ خودا بەرەو پێش چون و نوغرۆی ئەو قوڕو لیتە سامناکە بون، چەند بت و صەنەمێکیان لەدارو بەرد تاشی و کردیانە هاوەڵ بۆ خوداو بڕوایان وابوو ئەو دارو بەردە داتاشراوانە هاوبەشی خودان لەبونەوەرداو کاریگەرییان هەیە لەهەڵسوڕانی کەون دا!

پێیان وابوو توانایەکی زاتییان هەیە لەبواری سود پێ گەیاندن‌و زیان لێ دوورخستنەوە، لەبواری بەدیهێنان‌و فەوتاندن دا، ئیتر نەتەوەی عەرەب سەرانسەر نوغرۆی قوڕە ڕەشی بتپەرستی بوو، دەستیان کرد بەبەندایەتی کردنی بت‌و صەنەم بە درێوترین شێوە، ئەوە بوو وایان لێ هات هەموو خێڵێك، هەموو هۆبەو هەرێم‌و ناوچەیەك، هەموو شارو شاروچکەیەك بتێکی تایبەتی هەبوو، بەڵکوو هەموو خێزانێك بتێکی بۆ خۆی داتاشی‌و بەندایەتی بۆ دەکرد!!.

## چاوگێڕانێك بەسەر وڵاتەکان و نەتەوەکان دا:

ئەوەی لەوەوپێش ئاماژەی پێ کرا واقیع‌و حاڵ‌و وەزعی ئەو ئایینانە بوو لەپێش هاتنی ئیسلام دا، بارودۆخی ئەو سەردەمە بوو کە بانگەوازی بۆ خودا پەرستی تێ یدا سەری هەڵدا، ئەو وڵاتە شارە ستانیانەی کەحکوماتی گەورەو بەناوبانگیان تێدا بەر پابوو، زۆر زانیاری‌و زانستی جۆراو جۆریان تێدا پەیدا بوو گەشەی کردو لانکەی ژیارو پیشە سازی‌و ئاداب بوون، دەڵێم: ئەو وڵاتانەش وڵاتێك بوون ئایین تێیان دا سڕا بوەوە، ڕەسەنایەتی‌و وزەی خۆی لەدەست دابوو هیچ وڵاتێك لەو وڵاتانە مرۆڤی چاکسازی تێدا نەمابوو، مامۆستای فێرکاری خێر خوازی لەدەست دابوو.

## ئیمپراتوریەتی رومانی خۆر هەلات (بیزەنتیەکان):

حکومەتی ڕۆمانی خۆرهەلات کەلە سەردەمە پانتیەکی زۆر بەرفراوانی جیهانی دەگرتەوە[2].

سەرانەو بەرتیل و بەرتیلکاری تیّ یدا پەرەی سەند، باج و گومرگ تیّ یدا دو چەندانەو چەند چەندانە بوونەوە، جەماوەر هێندە باریان گران بوو بوو. ئامادە بوون پێشوازی لەهەر دەسەلاّتێکی بێگانە بکەن کەحکومەتەکە یان بڕوخێنیّ و ببێتە جیّ نشینی. بۆیە هەمیشە ولاّت لەئاشوبو گێژاودا نقوم بو بوو، راپەڕین دوا ڕاپەڕین دژی دەسەلاّت بەرپا دەبوو، خۆپیشاندان و بەگژدا چونەوەی دەسەلاّت دیاردەیەکی هەمیشەیی و ڕۆژانە بوو، بۆ نمونە سالّی(٥٣٢ ز) لەپشێوی و ئاژاوەیەك دا لەسەردەمی جیستنی یەکەم لەپایتەختی قوستە نطيني)دا (٣٠٠٠٠) سی هەزار کەس کۆکوژو قەتل و عام کرا. کار بەدەست و قسە ڕۆیشتووەکانیان هەر خەریکی کۆکردنەوەی سامان بوون، جا چۆنیان بۆ بلوایە گوێیان بەوە نەدەدا ئاخۆ هۆکاری مالّ کۆکردنەوەکە رەوایە یان نا! ئەمجار ئەم مالّ و سامانەیان لەرابواردن و هەوەسبازی خۆیان دا خەرج دەکردو زێدەرەویان دەکرد لەمالّ بەفیڕۆدان و سەرفکردنی لەبواری ناڕەواو خراپە کاری دا، هەتا وایان لیّ هاتبوو مرۆڤایەتی خۆیان لەدەست دابوو گەیشتبوونە ئاستی ئاژەلّی درندەو زێنە خرۆ.

---

[2] حکومەتی ڕۆمای خۆر هەلاّت لە سەدەی شەشەمی زایینی دا حکومەتی یونان و بلقان و ئاسیای بچوك و سوریا و فەلەستین و هەموو حەوزی دەریای سپی و ولاّتی میصرو هەموو کیشوەری ئەفریقیای شیمالی دەگرتەوەو پایتەختەکەی قوستەنطينية بوو، ئەم حکوومە زەبەلاحە سالّی (٣٩٥) زایینی دامەزراو سالّی (١٤٥٣) زایین عوسمانییەکان پایتەختەکە یان گرت و ئیمپراتوریەتەکەشیان ڕوخاندن.

لەکتێبی (الحضارة ماضيها وحاضرها) وێنەی کۆمەڵگای بیزەنتی رادەنوێنێ و هەڵس و کەوتی دژ بەیەك و هەوەسبازی و زێدە ڕەوی لەرابواردن و لەگرێژە نەچوونی باری کۆمەڵایەتی و لەدەستدانی بەها مرۆڤایەتیەکانیان کەلە سنوری ئاسایی دەرچو بون و گەیشتبونە ئەندازەی دڕندەیی و هەمە جییەت دەست نیشان دەکا، لەم بارە دانەرەکانی ئەم کتێبە دەڵێن: دژایەتیەکی یەکجار بەرچاو لەژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای بێزەنتی دا هەبوو، لەلایەکەوە بیرو باوەڕی ئایینی لەناخیان دا خۆی داکوتابوو، دیاردەی رەبەنی لەناویان دا بلاو بو بوەوەو سەرانسەری ولاتی گرتبوەوە، وای لێ هاتبوو مرۆڤی ئاساییان دەمی لەباسی قوڵ و فەلسەفەی ئایینی دەداو کێشەو جەدەلی دەنایەوەو خۆی پێوە هەڵەو گیر دەکرد، بەشێوەیەکی گشتی ژیانی جەماوەرەکە مۆرکی رێبازی باطنی پێوەبوو، کەچی وێڕای ئەوەش لەسەرێکی ترەوە سوربوون لەسەر پەیڕەوی کردنی جۆرەها لەهوو لەعب و ڕابواردن و کەیف سازی و تەنپەروەری. تەنانەت دەڵێن:

گۆڕەپانی پان و پۆڕی وایان بۆ وەرزش و وەرزشکاری دروست کردبوون، هەریەکەیان هەشت هەزار کەسی تێدا جێ دەبوەوە بۆ دانیشتن و تەماشاکردنی زۆرانبازی نێوان پیاوو پیاو، یان پیاوو کەڵە گاو شێرو درەندەی تر. لەکاتی ئەنجامدانی ئەو جۆرە بەناو یارییانەدا، جەماوەرەکە یان دەکردە دووبەش" بەشێکیان بەرەنگی شین رەنگدەکردن و بەشەکەی تر یان بەرەنگی سەوز نیشانە دەکران، زۆریان حەز لەجوانی و خۆڕازاندنەوە بوو، حەزیان لەتوندو تیژی و ئەزیەتدان هەبوو، زۆربەی کات یارییەکانیان خوێنی تێدا دەڕژاو کوشتاری تێدا دەکرا، سزادانی تاوانباران زۆر بێ رەحمانە ئەنجام دەدرا، جۆرە سزای وایان بۆ تاوانبارێکی ئاسایی دادەنا پێستی بینەری گرژ دەکردو موچوڕکەی دەخستە سەر جەستە.

ژیان و رابواردنی کار بەدەست و لێ پرسراوانیان بریتی بوو لەرابواردن و زیـدە ڕەوی لەژیانی مجون و تەنپەروەری و پیلان لەیەکدی کردن و ماستاو کردن بۆ گەورەکانیان، ئەنجامدانی کاری ناشرین و پەیڕەوی کردنی داب و نەریتی ناشیرین و نەشاز: ولأتی میصریش کەیەکێك بوو لەویلایەتە دەوڵەمەندەکانی ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرا بکەوێتە بەر شاڵاوی چەوساندنەوەی ئایینی و سیاسی، بێ ئیشی و قەتارەو حەبسی و لێدان و دادو شینی جەماوەرەکە، دیاردەیەکی بەرچاوو گشتگیر بوو، لەکاتێك دا ئەو ولأتە، واتە: ولأتی میصر سەرچاوەیەکی گرنگ و گەورە بوو بۆ بەهێز کردنی باری ئابووری حکومەت و خۆشگوزەرانی کار بەدەستانی. ئەو ولأتەیان کردبوە مەڕی شیردەر جوانیان دەزانی بیدۆشن بەلأم لەوەڕی خراپ و کەمیان دەدایە!

سوریاش کۆیلایەتێکی تری ئیمپراتوریەتی بیزەنتی بوو، ئەویش وەکوو ولأتێکی تری هەوسارکراوو بارە بەری تەماعکارە بیزەنتی یە ڕۆمەکان بوو، هەمیشە فەرمانڕەوای ئەو ولأتە بێگانە بوون، بەزەبری ئاسن و ئاگر حوکمیان بەڕێوە دەبردو هیچ بەزەییان بەگەل و دانیشتوانی بێ دەسەلأت دانەدەهاتەوە.

زۆر جار وارێ کەوتووە دانیشتوانی ئەو ولأتە ناچار دەبوون کوڕەکانیان بفرۆشن بۆ ئەوەی قەرزی کەڵە کە بووی سەرشانیان بدەنەوە بەحکومەت، زوڵم و ستەم و بێگار پێ کردن و کردنی ڕۆڵەکانیان بە کۆیلە دیاردەیەکی بەرچاوو بەربلأو بوو.

ئیمپراتۆریەتی ئێرانی (ساسانی)[3] ئایینی زەردەشتی دوا بەدوای ئایینی مەزدائی هاتە ئاراوە، مەزدائی ئاینێکی کۆنی ئێرانیانەو نازاندرێ کەی پەیدا بووە. واپێدەچێ زەردەشت رێبەری ئایینی زەردەشتی لەسەدەی حەوتەمی پێش زایین دا پەیدا بووە .

٢- وەکوو باوە دەڵێن: زەردەشت لەوڵاتی میدیا شیمالی خۆرئاوای ئێران دا لەدایك بووە، لەبنەماڵەیەکی ئازر بایجانە، سەرەتا بانگەوازی خۆی لەوڵاتی بەڵخ دا بڵاو دەکردەوەو لەوێوە کەوتە ناو وڵاتی فارسەوەو ئایینی زەردەشتی هەر لەیەکەم ڕۆژی پەیدا بوونیەوە لەسەر بنەمای دژایەتی نێوان روناکی و تاریکی دامەزراوە، پێ ی وایە هەموو کاتێ شەڕ لەنێوان روناکی و تاریکی و یان گیانی خێرو گیانی شەڕ یان بڵێ: خوداوەندی خێرو خودا وەندی شەڕدا بەرپایەو پێکەوەیان شەڕو هەرایەو دوژمنی بابە کوشتەی یەکترن.

---

[3] ئیمپراتۆرییەتی ساسانی لەئیمپراتۆرییەتی رومانی خۆر هەڵات گەورەترو بەرفراوان تر بوو، ساڵی (٢٢٤) زایینی لەسەر دەستی ئەردەشێر بنیات نرا لەڕۆژگاری دەسەڵاتداری ئەودا زۆر وڵاتو هەرێمی گرتوونەوە، لەوانە وڵاتی خوزستانو میدیاو فارسو ئازر بایجانو طەبەردستانو سەرەخسو جورجانو کرمانو مەروو بەڵخو بوخاراو سەغەدو سیستانو هوراتو خوراسانو خوارەزمو کودستانو عیراقو وڵاتی یەمەن لەنیوە دورگەی عەرەبی، هەروا هەندێ لەویلایەتەکانی هیندو ستانیشی گرتەوە، لەوانە ویلایەتی کەجەو کاتیهاوارو مالوە. ئەم ئیمپرایورییەتە لەسەدەی چوارەمی زایینی بەم لاوە زۆر بەرفراوان بوو گەشەی کرد، لەشیمالو خۆرهەڵاتی یەوە زۆر چووە پێشو گەیشتە ئەو پەڕی سنورەکانیان شاری تەیسەفون (مەدائینی ئێستا) پایتەختی ئیمپراتوریتەکە بوو ئەم شارە زۆر پێشکەوت لەبواری شارەستانیو ئاوەدانی دا زۆر گەشەی کردو نمونە بوو.

لەسەرەتاى سەدەى سێیەمی زایینی دا (مانی) پەیدا بوو[4] ئاینی زەردەشتی تازە کردەوە، هەندێ شتی تریشی خستە پاڵ ئاینەکە. شاهپور) کەلە دوا ئەردەشێر بوو بەپاشای ساسانی شوێن مانی کەوت و ئاینی تازە کراوەو گۆڕانکاری تێدا کراوی قبوڵ کردو باوەشی بۆ بانگەوازی مانی کردەوە. بەڵام زۆری پێ نەچوو لێ ی ژێوان بووە و کەوتە دژایەتی کردنی مانی.

مانی لەبانگەوازیکردنەکەی دا بانگەشەی بۆ ژیانی رەبەنی کردوە، هەوڵی داوە دیاردەی ژنهێنان و شوکردن نەهێڵێ بۆ ئەوەی ریشەو نژادی ئادەمیزاد بەکۆتابێ و ئاسەواری ببڕێتەوە. ئەوەی ڕاگەیاند: کەتێکەڵاو بوونی روناکی بەتاریکی شەڕو نەگبەتیە، پێویستە ئادەمیزاد خۆی لێ قوتار بکا، بەم بۆنەوە ژن و ژنخوازی قەدەغەکردو بەحەرامی لەقەڵەم دا بۆ ئەوەی زۆر زوو ژیان بەکۆتا بێ و روناکی بەسەر تاریکی دا باڵا دەست بێ و رەچەڵەکی ئادەمیزاد لەناو بچێ، لەسەر ئەمە تووشی راوەدونان و دژایەتیکردن بۆوە، سەرەنجام ناچار بوو بەرەو هەندەران هەڵبێ و خۆی قوتار بکا، پاشان جارێکی دی گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئێران و گیراو لەسەردەمی بەهرامی یەکەم دا کوژرا. وەلێ پەیامەکەی بەمردنی مانی لەناو نەچو بەڵکوو بەردەوام کاریگەری خۆی لەهزرو بیرو بۆ چونی کۆمەڵگای ئیمپراتورییەتی ساسانی دا دەنواندو ماوەیەکی زۆر دوا لەناوچوونی مانی بانگەوازییەکەی رۆڵی خۆی بینی و کاریگەری لەدەست نەدا.

---

[4] مانی وێنەکێش و نیگار کێشێکی بەناوبانگی ئێرانی بووە، لافی پێغەمبەرێتی لێ داوە، ماوەیەك بانگەوازی یەکەی برەوی ساند، لەرۆژگاری بەهرامی یەکەمی ساسانی دا لێ پێچینەوەی لەگەڵ دا کراو بەشێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە کوشتیان و پێستیان گرو پڕیان کرد لەکاو هەڵیان هاخنی و لەبەر دەرگای شاری جوندیسابوردا هەڵیان واسی بۆ ئەوەی جەماوەر سەیری بکەن چاو ترسێن بن.

لەسەرەتای سەدەی پێنجەمی زایینی دا مەزدەك پەیدا بوو، ئەم بەپێچەوانەی (مانی) یەوە بوو، بانگەوازی دەكرد بۆ بەرەڵڵایی و تێكەڵبوونی ژن و پیاوو نەهێشتنی هەموو لەمپەرەكان و شكاندنی هەموو سنورەكان، بانگەوازی بۆ ئەوە كرد كە سامان و ئافرەت تایبەتمەندی و خصوصیەتیان نەمێنێ و مڵكایەتی لابرێ و گشتی و هەموانی بێ، دیاردەی خێزان و ژن و مێردایەتی وەلا بنرێن و هەموو پیاوێك بۆی هەبێ پەیوەندی ببەستێ لەگەڵ هەر ئافرەتێك كەبیەوێ بەبێ ئەوەی هیچ لەمپەرێك هەبێ رێگای لێ بگرێ، بانگەوازی یەكی بەهێز بوو، پێشوازییەكی باشی لێ كرا، كارگەیشتە ئەوە خەڵك خۆیان بەماڵی دەوڵەمەندێك دا دەكرد، بەئاشكرا ماڵ و سامانەكەیان لێ دەستاندو خانوەكەیان لێ زەوت دەكردو كەس نەبوو بەهانایەوە بێ، لەبەڵگە نامەیەكی مێژوویی ئیرانی دا كەبە (نامەی تەنسر) ناوزەد كراوە وێنەی ئەو رۆژگارەی بانگەوازی مەزدەكی تێدا بڵاو بۆتەوەو نمایش كراوە بالاَ دەستی ئەو بانگەوازییەمان بۆ دیاری دەكاو دەڵێ: بەبێ پەروا ئابڕوی ئافرەتیان شكاند، بێ یاسایی باوی سەندو هەموو یاساو رێسایەكی مرۆڤایەتی پێشێل كراو كۆمەڵگای ساسانی بوو بەكۆمەڵگای ئاژەڵی و (هەوسار داماڵدرا) و هیچ شتێك نەبوو خەڵك لەخراپەكاری و هەوەسبازی بگێڕێتەوە، چینێك پەیدابوو بێ ڕێزو بێ ویژدان، بێ كارو تەمبەڵ و تەوەزەل، بێ رەصیدو رابردوی سەروەری، هیچ بەزەییان بەسەرەنجامی گەل دا نەدەهاتەوەو هیچ گرنگییەكیان بەوە نەدەدا ئاخۆ وڵات و گەل بەرەو هەڵدێرو وێرانی یەك دەڕوا یان نا!! هیچ پیاوەتێكیان تێدا نەبوو، هیچ لێهاتوویی و دەست رەنگینیەكیان پێوە دیار نەبوو، بێ موبالات و بێ كار ژیانیان بەسەر دەبرد، لێهاتو لەفیتنەیی و دوو زمانی دا، لەدرۆو بوختان و چاوو ڕاودا لەماستاو كردن و پێدا هەڵدانی ئەم و ئەودا.

ئـەم ئاكـارو ڕەفتارانـەیان كردبوونـە هۆكـاری پـارە پەیـدا كـردن‌و سـامان كۆكردنـەوەو بەدەسـتهێنانی پلـەو پایـە[5] (لارتهـر كرسـتن سـین) دەڵـێ: سەرەنجامی ئەو بەرەڵڵایی‌و بێ یاسایی یە ئەوە بوو هـەژارو جوتیارەكـان ڕاپـەڕینیان بـەرپا كـرد، تالانچی‌و دزو جـەردە زۆر بـوون، تـالان‌و بـڕۆ بـاوی سەند پەلاماری ماڵە دەوڵەمەندو خاوەن قەصرو باڵەخانەكانیان دا، چییان تێـدا بـوو چـەپاویان كـردو بـەتالان بردیـان، بەكۆمـەڵ خۆیـان بـەماڵی دەوڵەمەندا دەكرد هەرچی ناو ماڵ‌و پارەو زێڕێكی هەبوایـە لێیـان دەسـەندو ئافرەتـەكانیش دەبوونـە دەسـتكەوتی تـالان‌و بـەم جـۆرە پـشێوی‌و ئـاژاوە كەوتـە نـاو وولاتـەوە، جەماوەر پـەلاماری سـامانداره‌كانیان دا موڵك‌و مـاڵ‌و زەوی‌و زاریان لێ داگیر كـردن، بـەلام نـەیانزانی ڕەنێویـان بێنن، بۆیـە زەوی‌و باخ‌و بێستانەكان وێرانبون‌و كەڵكیان لێ وەرنەگیرا، چونكە ئەوانـە بـێ كـارو تەمبەڵ ژیانیان ڕابوارد بوو و هیچ لـەبارەی كشتیاری‌و بەخێو كردنـی ڕەزو باخ فێر نەبو بوون[6] بەمـەش ئەوەنـدەی تـر ولات توشـی تەنگژەو پشێوی‌و داوەشان هات.

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ كەلـەئێرانی كۆن دا ئامـادە باشـی یـەكی سـەر سوڕهێنـەر هـەبوە بـۆ وەرگـرتن‌و بـەپیرەوە چـوونی بانگـەوازی تونـد ڕەوی‌و بـــەرەڵلایی بـــێ ســـنور، هەمیـــشە دانیـــشتوانەكەی لـــەژێر كاریگـــەری‌و كاردانـەوەی تونـد ڕەوی دابـون، هەمیـشە لەبـەرزو نزمـی دابـوون لـەنێوان فەلسەفەو ئایدیای جۆر بەجۆردا ژیانیان بەسـەر دەبرد، دەمـێ پابەنـد بـوون بە فەلسەفەی ئەبیقۆرەو كەپێی وابوو لەززەت‌و خۆش ڕابواردن هـەرە خێـرو دەستكەوتی بەرزو پیرۆزن! كاتێكی تر ڕەبەنی‌و دێرنشین‌و سـوفیگەرییەكی

---

[5] نامەی تەنسر، چاپی مینوی ل/ ١٣.

[6] ایران في عهد الساسانین ص/٤٧٧.

وشك‌و لەرادە بەدەر، یان قۆر غکردنی هەموو دەسەلاَت‌و خۆشی یەك بۆ بنەماڵەیەك یان بۆ چینێك یان بۆ پیاوانی ئایینی، چەلی وایش هەبوو شیوعییەتێکی توند رەوانەو تێگرو تێگو شیویەکی رەها سەرانسەری ولاَتی دەگرتەوە. ئەم بەرزیو نزمییە لەنێوان ئەو ئایدیای بیرو بۆ چونانەدا، ولاَتی داوە شاندو ئابوری روخاندو ئارامی لەناو برد.

بەم جۆرە حاڵ‌و وەزعی رەشە خەڵکەکە لەوپەڕی نەهامەتیو دەردو ناخۆشی دابوو، هەموو دانیشتوانی سەر زەمین ئیمپراتۆرییەتی ساسانی لەسەدەی شەشەمی زایینی دا لەژێر رەحمەت‌و میزاجی پاشاکانیان دابوون، ئەم پاشایانەی کەبەشێوەی میراتی (وراثي) دەهاتنە سەرکورسی فەرمانڕەواییو خۆیان پێ لەئادەمیزاد بەرزتر بوو پێیان وابوو: ئەوان کەسانێکن لەژوور مرۆڤەوە، خۆیان بەخودا دەزانیو دەبوایە بە وشەی خوداوەند (پاشا، شاهەنشا)بانگیان لێ بکرایە، یان لەگەڵ ناوی خۆیان دا وشەی خودایان بخرایە پاڵ‌و بەئاشکرا بەخودایان بزانینایە، ئیمپراتۆر خۆی بەیەکەم مرۆڤ دەزانیو نەدەبوو بەناوی خۆیەوە بانگی لێ بکرێ، چونکە ئەو خۆی بەنەوەی خودا دەزانی!!

هەرچی مڵك‌و دارایی ولاَت هەبوو بەمڵکی تایبەتی خۆیانیان دەزانیو کاراماو چاو چنۆك بوون بۆ کۆکردنەوەی ماڵ‌و سامان‌و کڕین‌و هەڵگرتنی زێڕو زیوو شتی گرانبەها، زۆر خەریکی ڕێکخستنی شوێن رابواردن‌و ژووری نوستن‌و دابینکردنی هۆکاری تەنپەروەری بوون، ئەوەندە ڕۆچوو بوون لەخۆشگوزەرانیو رابواردن دا، هێند سەرگەرمی پێشبڕکێ ی دەوڵەمەند بونو رازاندنەوەی کۆشك‌و تەلارو عەرش‌و راخەرو پێخەف بوون، گەیشتبوە ئاستی خەیاڵ‌و ئەفسانەو شیعر!

کەسێك بەوردی لێکۆڵینەوە لەمێژووی ئێرانی کۆن و شیعرو ئەدەبی ـانەکا ناتوانێ بەخەیاڵیش ئەو ئاستانە کۆنترۆڵ بکاو ئەو دیاردەو مەظاهیرە خەیاڵاویانە بخاتە ژێر کەمەندی تەصەوراتی خۆیەوە. کەسێك ئاگادار نەبووبێ بەسەر چۆنیەتی شاری تەیسەفون (پایتەختی ساسانی) ـا. کۆشك و تەلارو ئەیوانی کیسرای نەخستبێتە بەر توێژینەوە، بەوردی ـێکۆڵینەوەی لەبەهاری کیسرا (فەرشی بەهاری) و تاجی کیسراو هەموو ئەو شتانەی تایبەت بوون بەپاشایانی ساسانی یەوە لەخزمەتکارو کارەکەرو ـژ و خێزان و کۆیلەو چێشت لێنەرو شوانی ئەسپ و بەخێوکاری باڵندەو ـڕندەو ئاژەڵی هەموو جۆرو بێئەندازەو زۆرو لەرادەبەدەر، مەنجەڵ و سەماوەرو قاپ و قاچاخی زێڕین و زیوینی لەهەژمار نەهاتووی ئەو پاشایانە ـا نەکردبێ، هەموو ئەو شتانە بەئەفسانەو خەیاڵبازی لەقەڵەم دەداو ناتوانێ قەناعەت بە خۆی بکا کەڕۆژگارێك بووە لەو شوێنەی شاری مەداینی لێ بوەو ئێستا سەلمانپاکی پێ دەگوترێ: هەموو ئەو شتانەی باسمان کردن و ئامارەمان بۆ کردن زۆر لەوەش زیاتر لەسەر زەمین واقیع دا هەبوون، بەفیعلی بەرجەستە بوون! هەرچەندە تەصەور کردنی بڕێك لەو دیاردەو مەظاهیرانە مرۆڤ سەرسام دەکاو دەیتاسێنێ. بۆ نموونە یەزدوجوردی سێیەم، دوا پاشای ساسانی، کاتێك لەترسی سوپای رزگاریکەری ئیسلام بەپەلە پڕوزە لەپایتەخت (شاری مەدائین) وەدەرکەوت و ویستی گیانی خۆی رزگار بکا، بەو حاڵە شپرێوی و راوەدونراوییە، بەو پەراگەندەیی و تەخت و تاراج تێکچویی و ئاوارەیی یەوە هەزار چێشت لێنەرو قاپ شۆرو سفرە رازێنەرەوەو هەزار گۆرانی بێژو هەزار چاودێرو شوانی پڵنگ و هەزار بەخێو کەری پشیلەو دارو دەستەیەکی زۆری تر لەخزمەتچی و کار بەدەستی هەمە کارەو سەرپەرشتیاری خەزێنەو

رابەری قافڵەو....هتد لەتەکیا بوو ئەمە لەکاتێك دا خۆی بەئاوارەو پەنا هەندە دەزانیو خۆی بەو پەڕی لێقەوماویو شکستی دەهاتە بەرچاوو شوێنو جێگەی داگیر کرابوو، هۆکاری رابواردنو خۆشگوزەرانی لێ تێك چوو بوو[7]. ئەمە لەکاتێك دابوو زۆربەی هەرە زۆری جەماوەری سەرزەمینی ساسانی لەژیانی کولەمەرگیو کەم دەرامەتیو ترسو بیمی یاساوڵەکانی دەسەڵات دابوون، بەگەدەی روتو برسیو چاوی فرمێسکاوییەوە ژیانیان بەسەر دەبرد، تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە بەماندو بوونێکی زۆرو خەمو خەفەتو هەناسە سارديیەوە ئەمجار دەیانتوانی نەمری نەژی پاروە نانێك پەیدا بکەنو ئازاری برسیایەتی تۆزێك لەخۆیان بڕەوێننەوەو پارچە سیپاڵێك پەیدا بکەن شەرمگای خۆیانی پێ داپۆشن.

سەرباری ئەوەش پشتیان چۆمابوەوە لەژێر باری گرانی خەرجیو باجو گومرگ سەرانەو بەرتیل دا، بەبچوکترین بەهانەو سوکترین سەرپێچی دەخرانە کونەرەشی بەندیخانەو لەکۆتو زنجیر دا رێز دەکرانو سزا دەدران، زۆربەی زۆری رەشەخەڵکەکە ژیانیان لەژیانی ولاٌخی بارە بەرو نیر لەسەر مل خۆشتر نەبوو، هەموویان لەژێر باری گرانی زوڵمو ستەم دا دەیانناڵاندو فرمێسکیان دەڕشتنو کەس بەفریان نەدەهات، تاکار گەییشتە ئەوە زۆر لەمسکێنو کشتیارەکان وازیان لەفەلاییو وەرزێری هێناو دەستبەرداری کارو کاسبی خۆیان بونو خۆیان کردە رەبەنو دێرنشینو ژیانی سارانەوەردیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەباجو گومرگو سەرانەو هاوبەشی کردن لەسوپای هەمیشە تێوە گلاوی شەڕ خۆیان قوتار بکەن[8] چونکە زۆربەی کاتەکان ئەو جەماوەرە خێر نەدیوە سوتەمەنی بێ نرخی

---

[7] ايران في عهد الساسانيين ص/٦٨١.

[8] ايران فى عهد الساسانيين ص/٦٨١.

شەڕە خوێناوی و کاولکارییەکانی نێوان ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی بوون، بەزۆرە ملیّ و بێ ئەوەی هیچ سودێکی جەماوەری تێدا بێ، دەستە دەستەو پۆلّ پول گەنج و لاوی خێر نەدیوی ئەو وڵاتە راپێچی نێو ئاگری هەمیشە هەڵگیرساوی شەڕی فارس و رۆم دەکران و دەبوونە دەستەچیلە و سوتەمەنی!!

## وڵاتی هیندوستان:

وڵاتی هیند کەلە چاخە کۆنەکان دا خاوەنی ژیارو رۆشنبیرییەکی کەموێنە بوو، لەبواری زانستەکانی وەك ماتماتیك و ئاسمانشوناسی و پزیشکی و قوڵبونەوە لە فەلسەفەدا ناوبانگی دەرکردبوو، کەچی لەسەدەی شەشەمی زایینی دا هەموو بەها مرۆڤایەتیەکانی لەدەست دابوون، ئەوەتا مێژوو نووسان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کەداوە شاوترین سەردەمی هیندوستان لەبواری ئایینی و رەوشت و کۆمەڵایەتی دا ئەو سەردەمەیە: کەسەدەی شەشەمی زایینی دەست پێ دەکا[9]. لەو سەرو بەندەدا بەدرەوشتی پەرەی سەندو هەموو وڵاتی گرتەوە، تەنانەت لەناو پەرستگاکان دا بەدرەوشتی و ناموس فرۆشی ئەنجام دەدراو بەشتێکی پیرۆزی دەژمێردرا، چونکە ئایین جۆرە پیرۆزی یەکی پێ بەخشی بوو، بەجۆرێك لەعیبادەت دادەنرا. لەو کۆمەڵگایە دا ئافرەت نرخێکی بۆ دانەدەنرا، هیچ شێوە پارێزگارییەکی لێ نەدەکرا، وادەبوو پیاو لەقومار کردن دا ژنەکەی دۆڕاندوە، ئەگەر مێردی بمردایە بێ کەس دەمایەوەو هیچ رێزێکی لێنەدەگیرا، رێگەیان پێ نەدەدا جارێکی تر شوبکاتەوە، هەندێ

---

(9) الهند القديمة ج/٣ لمؤلفة آرسي. R.C. DUTT.

جار زیندە بەچاڵ دەکرا، هەروا خوسوتاندنی بێوەژنەکان دوای مردنی مێردەکانیان بو بوو بەدیاردەیەکی بەرچاوو بەربلاو، بەتایبەت لەناو چینی وەجاغزادەو بنەماڵە ئەرستوقراتیەکان دا، ئەمەش لەروی وەفاداری بۆ مێردەکانیان و خۆ رزگار کردن لەو هەموو نارەحەتی و چەرمەسەرییەی کە ئافرەت دوا مردنی مێردەکەی توشی دەهات و سوکایەتی پێ دەکرا، بەم دیاردە دەگوترا (ستی)، دوایش بەدرێژایی ڕۆژگار ئەم داب و نەریتە بە بەربلاوی مایەوەو بەتەواوی بەکۆتانە هات، هەتا ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم ئەو کاتەی ئینگلیز ئەو وڵاتەی داگیر کرد بارو دۆخەکەی گۆڕی، ئەو جا ئەو دیاردەیە نەماو وازی لێ هێندرا[10]. هیند لەناو جیرانەکانی داو زێدە لەهەموو وڵاتانی جیهان بەوە ناسراوە: کە جوداوازی یەکی بەرچاو لەنێوان چینەکانی کۆمەڵدا تێیدا بەرجەستە بوبوو، تەنانەت لەنێوان ئەم تاك تا ئەو تاك جوداوازی یەکی بەرفراوان دەبیندرا- دەسەڵات و یاسای کارپێکراوی هیند تابڵێ ی دەسەڵاتێکی بێ بەزەیی و کۆنەپەرستانە بوو، هیچ نەرم و نیانی و چاوپۆشییەکی تێدا نەبوو، ئەم دەسەڵاتە زەبر بەدەستە گەندەڵە هەمیشە ئەم کارە نارەوایانەی ئەنجام دەدات و پشتی بەئایین و بیرو باوەڕی بورە همیە دەبەست، فەرمانبەر داری بەرژەوەندی ئارییە داگیرکەرەکان بوو، گوێ لەمستی بەراهیمیەکان بوو ئەو بەراهیمیانەی پاوانخوازی ئایین و بەها پیرۆزەکانیان کردبوو، دەسەڵاتێك بوو لەسەر بنەمای چینایەتی و رەگەزایەتی و بنەماڵەیی و حیرفەو پیشەسازی دامەزرابوو، قانونێکی پێکهاتە لە قانوونی شارەستانی و سیاسی و ئایینی پەیرەو دەکرا، یاساناسە هیندییەکانی ئایین پەروەر ئەو قانوو نەیان بۆ وڵات دارشت بوو کردبوویانە قانونی گشتی بۆ وڵات و

---

[10] رحلة الرحالة الفرنسي برنير وتاريخ الراجوات والأمراء في القرون الوسطى.

دەستوری ژیان، لەژێر رۆشنایی ئەو قانوونانەدا کۆمەڵگای هیندی کرابوو بەچوار پلە.

١. چینی کاهین و پیاوە ئایینیەکان کەبریتی بوون لەبەراهیمیەکان.

٢. چینی پیاوانی سوپاو سەربازەکان کەبە (شتری) دەناسران.

٣. چینی فەلاو ئاڵ و وێرکەر: کەپێیان دەگوتن: (ویش) .

٤. چینی خزمەتکار کەپێیان دەگوترا (شودر) ئەم چینە پایین ترو پەست ترین چینی ئەو کۆمەڵگایە بوو، بڕوایان وابوو بەدیهێنەری بونەوەر لەقاچی خۆی دروست کردون بۆ ئەوەی خزمەتی سێ چینەکەی تر بکەن و راحەتی ژیانیان بۆ دابین بکەن.

ئەم قانوونە دەسەڵاتێکی رەهای دابوو بەبەراهیمەکان و کەس نەیدەتوانی شان بدا لەشانیان، ئەگەر کابرایەکی بەرهەمی بەتاوان و کردەوەکانی هەرسێ چینەکانی تر لەناو بەرێ هیچ لێ پرسینەوەی لەسەر نەبوو، بەهیچ شێوەیەك نەدەگونجا باج و خەراج بخرێتە سەر بابایەکی بەرهەمی، ئەگەر بەرهمیەك کەسێك یان چەند کەسێکی تری بکوشتایە نەدەکوژایەوە.

چینی (شودر) بۆیان نەبوو ماڵ و سامان کۆبکەنەوە، یان زێرو زیو پەزمەندە بکەن، یان لەگەڵ بەرهەمییەك دابنیشێ، یان دەستی لێ بدا، یان فێری کتێبە پیرۆزەکان بێ و بیانخوێنێتەوە. بەمجۆرە کیشوەری هیند لەحاڵەتێکی پشێوی و ئاشوب دابوو ویلایەتەکانی لێك دابڕابوون ولاتەکە پچڕ پچڕ بو بوو، میرنشین و حکومەتەکانی بەسەدان بوو، هەموو ئەم میرنشین و حکووماتانە پێکەوەیان شەڕو هەرابوو، هەڵس و کەوتیان دژ بەیەك بوو، گەندەڵی و خراپ بەڕێوە بردن و لەگریژەنە چوونی باری

ئاسایش و پشتگوێ خستنی بەرژەوەندی جەماوەرو وەلآمدانەوەی رەخنە گران بەئاگرو ئاسن تائەو پەڕی سنور پایەدار بوو.

وێـڕای ئـەوەش هیندوسـتان بەگـشتی لـەجیهانی دەرەوە دابڕابـوو، لەگۆشـەگیرییەکی تۆکمـە دابـوو. نـاڕازی بـوونی جـەماوەر لەدەسـەلآت و زێـدەڕۆیی لەهـەموو شـتێك دا، جـوداوازی نێـوان چـینەکانی کۆمـەڵ و دەمارگیری خوێنـاوی و تایفەگـەری، سەرانـسەری ولآتـی گرتبـوەوە. مێـژوو نووسێکی هەندوکی کەمامۆستای مێژوو بووە لەیەکێ لەزانکۆکانی هینددا دەربارەی چـەرخی پـێش هـاتنی ئیسلام دەڵـێ: دانیـشتوانی هینـد پـێش سەردەمی هاتنی ئیسلام، لەجیهان دابڕابوون، کەوتبوونە وێزەی یەکتری و خۆ خۆری. هیچ زانیاری و ئەزمونێکیان دەربارەی وەزعی جیهانی دەرەوە نـەبوو، ئـەم نـەزانی و کـەم ئەزمونیـە تـەواوبێ هێـزی کردبـون، نیـشانەی پاشـکەوتوویی و تێـك روخـان سەرانـسەری ولآتـی گرتبـوەوە، شـیعرو ئەدەبیات بێ گیان بوو، فەننی بیناسازی و وێنە گرتن و هونەرە جوانەکانی تریشیان بەو جۆرە بێ گیان و پاشکەوتوو بوو، بەکورتی کۆمەڵگای هیندی کۆمەڵگایـەکی راوەسـتاو وشـك بـرینگ بـوو، جـودا وازییـەکی بـەرفراوان لـەنێوان چـینەکانی کۆمـەڵ دا بـەدی دەکـرا، فـەرق و جیـایی یـەکی نالـەبار لـەنێوان ئـەو خێـزان و ئـەم خێـزان دا هـەبوو، هەنـدێ بنەماڵـە رازی نـەبوون کـچەکانیان شـو بکـەن، هەنـدێ خـواردن و خواردنـەوەیان لـەخۆیان قەدەغـە کردبـوو، هەندێکیـشیان بـۆ خۆیـان قـۆرغ کردبـوو، ڕێگـە نـەدەدرا هەنـدێ بنەماڵە بێنە ناو شارەوە، بە ناچاری دەبوایە دوور لەشار بژین.!!

## نیوە دوورگەی عەرەبی:

بێینە سەر باسی وەزعی عەرەبەکان، لەراستی دا کۆمەڵگای عەرەبیش حاڵی لەحاڵی وڵاتەکانی تر باشتر نەبوو، رەوشتیان لەدەست دابوو، ئەخلاقیان روخابوو، ملیان لەخواردنەوەی عەرەق نابوو تابینە قاقایان نقومی قومار کردن بو بوو، دڵرەقی دەمارگیری و وشکە تەبیاتییان گەیشتبوە ئاستێك کچیان زیندە بەچاڵ دەکرد، تاڵان و برۆو چەپاوکردن ببوە کارێکی ئاساییان، دزی و جەردەیی و رێگری کاروان لەناویان دا بڵاو بو بووەوە بەنیشانەی ئازایەتی و پیاوە تییان دەژمارد. پلەوپایەی ئافرەت لەناویان دا زۆر دابەزی بوو، وای لێ هاتبوو وەکوو کاڵا مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، دەکرایە میرات و وەکوو کاڵاو ئاژەڵ بەسەر میراتگران دا دابەش دەکرا، هەندێ خواردن هەبوو تایبەت بوو بەپیاوانەوە و لەئافرەت قەدەغە بوو، پیاو دەیتوانی چەندێکی بوێ ژنان مارە بکا، سنورێکی دیاری کراوی بۆنەبوو، هەندێ پیاو هەبوو لەترسی فەقیری و هەژاری منداڵی خۆی دەکوشت!

دەمارگیری خێڵایەتی و خزمایەتی تائەو پەری سنوور سەر کەش و بەهێز بوو، بەرادەیەك شەرەنگیزو شەر خواز بوون بێ شەرو کوشتار نەیاندەتوانی دانیشن، شەرو هەرا لێیان بو بوو بەخوو لەززەتیان لێ دەبینی، خوێن رشتنیان بەلاوە شتێکی ئاسایی بوو، بچوکترین بەهانەو روداو دەبوە هۆی هەڵگیرسانی شەر لەنێوانیان داو زۆر بەزەحمەت ئەو شەرە کۆتایی دەهات، وابووە چل ساڵ بێ پسانەوە شەری برا کوژییان کردوەو بەهەزار جەنگاوەریان لەیەکتر کوشتوە.[11]

---

[11] سەیری شیعری شاعیرانی سەردەمی پێش ئیسلام بکە هەروا ئەو کتێبانەی دەربارەی رۆژانی رابردووی عەرەب و هەواڵ و بەسەرهاتیانی تۆمار کردون.

**ئەوروپا**: گەل و نەتەوە ئەوروپاییە کانیش حاڵیان لە حاڵی نەتەوەی کوردو فارس و عەرەب باشتر نەبوو، ئەوانیش هەمیشە خەریکی شەڕی خوێناوی و کاولکاری بوون، لەناو تاریکی نەزانی و نەخوێندەواری دا کوێرانە هەنگاویان دەناو چی رەفتاری خراپ و ئاکاری بەدبوو ئەنجامیان دەدا، دوور لەشەقامە ڕێی کاروانی ژیارو ئەدەب و ڕۆشنبیری ژیانی کولەمەرگی و ئاژەڵ ئاساییان بەسەر دەبردو دابڕاو لەجیهان و بێ بەش لەبەها مرۆڤایەتیەکان کەنارگیر بو بوون، کەس چی بەسەرەوە نەبون و ئەوانیش چییان بەسەر کەسەوە نەبوو. لەش و لاریان چڵکن و کوڵکن و قێزەون، مێشکیان پڕ بوو لەخەیالاتی پڕو پوچ و بێ سەرو بەر! هیچ گرنگیان بەپاك و خاوێنی نەدەداو خۆشتن و نینوك کردن هەندام ڕێك کردن لەناویان دا زۆر کەم و دەگمەن بوو، ڕەبەن و دێرنشینەکانیان زۆر زێدە ڕەویان دەکرد لەسزادانی جەستەیان دا، وەکوو ئاژەڵی کێوی دەژیان و هۆگری ئادەمیزادەکانی تر نەدەبوون![12] بیریان لەوە دەکردەوە ئاخۆ ئافرەت ئاژەڵەیان ئادەمیزادە؟ ئایا گیانی نەمری هەیە، یان بێ گیانی جاویدانی یە؟ ئایا مافی ئەوەی هەیە بێتە خاوەن مڵك و بۆی هەیە کڕین و فرۆشتن بکا یان مافی ئەمانەی هیچ نیە.

**ڕۆبەر بریفوڵت** Robert Briffault **دەڵێ**: لەسەدەی پێنەمی زایینی یەوە تاسەدەی دەیەم شەوێکی تاریك، ئەوروپای داپۆشی بوو، هەمیشە ئەم شەوە زەنگە تاریکتر دەبوو، بێگومان ئاژاوەو ئاشوبی ئەم سەردەمە زۆر سامناکتر بوو لەئاژاوەو ئاشوبی سەردەمی کۆن، چونکە ئەوروپا بەگشتی ئەوکاتە دەشوبهایە لاشەی حەضارەتێکی گەورە کەبۆ گەنی کردبێ، هەموو

---

[12] سەیری کتێبی (تأريخ الأخلاق الأوروبية) دانراوی نووسەری بەناو بانگ Lecky جـ٢ باسی (من قسطنطنية الى شارلمان) بکە.

-یـ ـردەی ژیـارو شارەسـتانی پێشوو سڕابووەوە، ئەوی مـابوو بـەرەو نـەمان
-دەڕۆیـشت، زۆر وڵاتو هـەرێمو فـەرمانڕەوای بـەرفراوان کـە لـەوەپێش
حـەضـارەت تییـان دا بەرجەسـتە بـوو گەیـشتبوە ئاسـتێکی بـەرزو سـەرنج
ڕ کـێش وەکـوو ئیتالیـا و فەرەنسا، لـەم سـەردەمەدا بـەر شـاڵاوی ئاشـوبو
وێرانکاری کەوتو ئاداری بەسەر پاداری یەوە نەما.

## تاریکییەکی گشتگیرو ناهومیدییەکی کوشندە:

پوختـەی قـسە ئەوەیـە کەسـەدەی شەشـەمی زایینـی کـە ڕۆژگـاری
پەیـدابوونی پێغەمبـەری ئیـسلامەو سـەردەمەکانی دوا هـەڵهاتنی خـۆری
ئیـسلام. ناخۆشترین ڕۆژگاری مێژوو بوون تـاریکترین سـەردەمو کات بوون،
مرۆڤایـەتی بەتـەواوی لـە داهـاتووی خـۆی ناهومێـد بـو بـوو، چـاوەڕوانی
نـەمانو تێـدا چـوونی سەرانـسەری ژیـانی لێ دەکـرا، هیـوای مانـەوەو
پێشکەوتنی ڕەو ڕەوەی ژیانی تێدا نەدەکرا.

نووسـەرێکی ئینگلیـزی بـەناوی (H.G. Wells) لەنووسـینی خـۆی دا
وێنـەی ئـەم چـەرخەی گرتـووەو لەباسـی بـارودۆخی دوو حکوومـەتی
ساسـانی و بیزەنتـی سـەدەی شەشـەمی زایینـی دا دەڵـێ: زانـستەکانو
فەلـسەفەو سیاسـەت لەسـەردەمی ئـەم دوو ئیمپراتورییەتـە زلهێـزە بەشـەڕ
هاتووە دا لەگیانەڵاو دابوون، هەردو ئیمپراتۆرییەتەکەش بەرەو نەمانو تێك
ڕوخـان ملیان نـابوو، چینی ئـەخیری فەیلە سوفەکانی ئەثینا زۆر بەتونـدو
تـۆڵی و ڕێـزو دڵـسۆزی، کتێبـە ئەدەبیـە کۆنـەکانیان پارێزگـاری دەکـردو
سـەرگەرمی خوێنـدنو فێربـوونو فێرکردنیـان بـوونو دەیانویـست لـەو
کەلەپوورە دا نەبڕێنو لێیان بێگانە نەبن، هەرچەندە بەتـەواوی لێیان حاڵی
نەبنو وەکوو پێویست هـەزمیان نەکەن. جا کە ئەم چینە کۆچبار بونو

ماڵئاواییان لەجیهان کرد، ئیتر هیچ چین و توێژێك و کەسانێك نەمان رابەرایەتی ئازادی فیکرو ئازادی ڕادەربڕین بکەن، کەس نەما خۆ پەیوەست بکا بەو کەلەپورەو نەهێڵێ بەتەواوی لەناو بچێ، کەس نەما هەڵگری ئاڵای بیری ئازادو توێژینەوەی جدی بێ، وەکوو پێشینەکانیان پێشەنگی کۆمەڵ بن و هەڵگری ئاڵای عیلم و زانیاری بن. وێرای ئەوەش ئاشوب و پشێوی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لەگۆشەگیر کردن و تەفرو تونا کردنی ئەم چینە ڕۆشنبیرەو سڕینەوەیان لەسەر شاشەی رووداوەکان. لایەنێکی تر لەو هۆکارانەی بیری مرۆڤایەتیان ئیفلیج کردو وشکاییان بەکانیاوی هەستی ئازادانەی ئادەمیزاد هێنا ئەوەیە کە ئەم سەردەمە سەردەمی دەمارگیری و نەبوونی چاو پۆشی بوو لەسایەی هەردو حکومەتی ئێرانی و بیزەنتی دا کەهەردوکیان نیمچە دەسەڵاتی ئایینی بەسەریان دا زاڵ بوو، بەهۆی ئەوەوە هەردوکیان عەقڵی مرۆڤایەتییان خستبوە کۆت و زنجیرەوە.

ئەمجار دوای ئەوەی نووسەر چیرۆکی هێرش بردنی سوپای ساسانی بۆ سەر وڵاتی بیزەنتی را دەنوێنێ و پاشان سەرکەوتنی بیزەنتیەکان بەسەر ئێرانیەکان دا کەمێك بەدرێژی باس دەکا، دەگەڕێتەوە بۆ سەر باس و خواسی داڕوخانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی کەلە ئاخرو ئۆخری سەدەی شەشەمی زایین دا توشی کۆمەڵگای ساسانی و بیزەنتی بو بوو، دەڵێ:

هەرکەسێك تۆزی تێفکرین و وردبونەوەی هەبوایەو لەحاڵ و وەزعی جیهانی بڕوانیایە بەتایبەتی لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی زایینی، زۆر بەئاسانی دەیتوانی بڕوا بەوەبکا کە کیشوەری ئەورو پاو کیشوەری ئاسیا زۆری پێ ناچێ دەکەونە ژێر رەحمەتی مەغووله دڕندەکانەوە، چونکە لەهەموو ئەورووپادا دیاردەی ئەمن و ئاسایش و یاساو نیظام بەدی نەدەکرا.

هەمووی لەئاشوب و پشێوی دا مو نجاوی دەدا. هەردو ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی و ئیرانیش چنگیان لەیەك هێنابوو، ساڵە های ساڵ بوو شەڕێکی خوێناوی وێرانکەر لەنێوانیان بەرپابو بوو کوژانەوەی نەبوو، گەنج و لاوی هەردو وڵاتی یان و بەرین پەیتا پەیتا دەبوونە سوتەمەنی ئەو شەڕە کولکارییەو ثەروەت و سامانی هەردوو ئیمپراتورییەتیش بەفیڕۆ دەچوو. وەزع و حاڵی دانیشوانی هیندو ستانیش لەوڵاتەکانی تر باشتر نەبوو، وەکوو لەمەوپێش ئاماژەمان پێکرد.

## جیهان هەمووی لەگرێژەنە چوو بو فەسادو ئاشوب و لە وشکانی و دەریادا بەرپابو بوو.

بەکورتی و پوختی مرۆڤایەتی لەسەر دەمی هاتنی ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا بەرەو نەمان هەنگاوی دەنا، ئادەمیزاد لەو ڕۆژگارە دا بەدیهێنەری ڕاستەقینەی خۆی لەبیر کردبوو، خودای حەقی خۆی نەدەناسی، ئیتر خۆیشی لەبیر چو بوەوەو نەیدەزانی سەرەنجامی بەچی دەگا، عەقڵ و ئاوەزی خۆی لەدەس دابوو، نەیدەتوانی جودا وازیی نێوان خێرو شەڕو چاك و خراپ بکا، ئادەمیزاد تێکڕا لەو سەرو بەندەدا بیری خۆیان نەمابوو، بەشتی بێهودەو زیانبەخشەوە هەڵەو گیربو بوون، لایەکیان لەئایین و ڕۆژی دوایی نەدەکردەوە، ساتێکیش بیر یان لەگیان و دەروون و بەختەوەری قیامەت و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و چاکسازی حاڵی خۆیان و کۆمەڵگا نەدەکردەوە، دەتوانین بڵێین: واریٚ کەوتووە هەرێمێکی بەرفراوان و بۆ ماوەیەکی درێژیش تاقە کەسێکی تێدا نەبوە گرنگی بەئایینی حەق بداو بەندایەتی خودای خۆی بکاو هاوەڵی بۆ بەرەوانە زانی و بەپەرۆش بێ بۆ مرۆڤایەتی و سەرەنجامی ترسناکی! باشترین ئاوێنەی باڵا نما بۆ وەزع و

حاڵی ئادەمیزاد بەگشتی لەو سەردەمەدا ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ (٤١) سورة الروم.

## بۆچی حەزرەتی موحەممەد لەنیوە دورگەی عەرەب کرا بەپێغەمبەرو بانگەوازی ئیسلامی لەوێوە سەری هەڵدا؟:

حیکمەتی پەروەردگار داخوازی ئەوە بوو: کەخۆری پڕتەوبەخشی ئیسلام لەئاسۆی نیوە دورگەی عەرەبەوە سەر دەربێنێ و تاریکی ڕامالێ و جیهان پڕ بکا لەنورو هیدایەت، چونکە لەو سەردەمەدا نیوە دورگەی عەرەب لەهەموو ئاقارێکی جیهان پتر تاریکستان بوو، نەفامی و سەرگەردانی بەتەواوی باڵی رەشی خۆی بەسەر داکێشابوو، بۆیە لەهەموو شوێنێکی تر زیاتر پێویستی بەو نورە پڕتەو بەخشە بوو. بێگومان خودای باڵا دەست، عەرەبەکانی هەڵبژاردن بۆ ئەوەی یەکەمجار بانگەوازی ئیسلامییان پێ بگاو وەری بگرن و ئەمجار ئەوانیش بیگەیەننە دوور ترین کون و قوژبنی جیهان، هۆی ئەو هەڵبژاردنەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕوپەڕی دڵی ئەو عەرەبانە صاف و بێ گەرد بوو، نووسینی وردو فەلسەفە ئامێزی تێدا نەنووسرابوو، بەجۆرێك کەسڕینەوەی زەحمەتبێ، بەپێچەوانەی حاڵی رۆم و فارس و هیندییەکانەوە بەزانست و ئەدەبی خۆیانەوە دەکرد، شانازییان بەشارەستانی و کۆشك و تەلارو فەن و فەلسەفەی خۆیانەوە دەکرد، گرێ کوێرکەی دەرونی و فیکری وای لێ کردبوون زۆر زەحمەت بێ بەئاسانی قبووڵی بانگەوازی یەکی دیکە بکەن، بەڵام عەرەبەکان سادە بوون، لەسەر لەوحەی دڵیان و لەناو زیهنیان دا جگە لەچەند زانیارییەکی سادە کە دەستی نەزانی و سارانشینی لە سەر روپەڕی دڵەکانیان نەخشی کردبو

هیچی تر نەبوو: ئەوەش بەئاسانی دەتواندرا بسڕێتەوەو بشۆرێتەوەو ...یاری دیکەو وێنەی تری لەسەر نەقش بکرێن. بەتەعبیرێکی عیلمی ...ردەمی ئەمڕۆ دەتوانین بڵێین: عەرەبەکان خاوەنی نەزانی سادە (الجهل ...سیط) بوون کەبەئاسانی چارەسەری دەکرا، گەلەکانی تر کەخاوەنی ...ژدستانی و فەلسەفەی جۆراو جۆر بوون و خوێندنگاو کۆڕو مەڵبەندی جۆراو جۆریان بنیات نابوون بۆ زۆر جۆر زانست کەعەرەبەکان ناویشیان ...بیستبون، ئەمەش وای لەو گەلانە کردبوو توشی نەخۆشی جەهلی ...دکەب بوبوون و بەزەحمەت چارەسەر دەکراو شتنەوەی دڵ و دەروون و ...شکیان لەو زانست و فەلسەفانە بەکارێکی ئەستەم دەژمێردرا.

عەرەبەکان ئەهلی فیطرەت بوون و دارای ئیرادەیەکی بەهێز بوون، هەرکاتێ لەحەق حاڵ نەبوونایە دژی دەوەستان، هەرکاتێ (حەق) یان بۆ ...ون ببوایەوەو پەردەی لەسەر لابدرایە قبوڵیان دەکردو خۆشیان حویست و لەپێناو یا خۆیان بەخت دەکرد. ئەوەی زۆر بەباشی تەعبیر لەو ...خسییە تە عەرەبی یە دەداتەوە ئەو وتەیەیە: کەسوهەیلی کوڕی عەمر کاتێک گوێی لەناوەرۆکی ئاشتینامە (صلح) ی حودەیبیە بوو: کەتێیدا ...تبوو (هذا ماقاضی علیه محمد رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەکسەر ...ی دایەو وتی: سوێندم بەخودا ئەگەر ئێمە بمانزانیایە تۆ پێغەمبەری خودای بەرهەڵستیمان نەدەکردی و شەڕمان لەدژت بەرپا نەدەکرد(12).

هەروا ئەو هەڵوێستەی عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل لەکاتێك دا ...شەڕی یەرموك دا پێکداداں و لێکدان گەرم بوو لەهەموو لایەکەوە ...لامار دراو دوژمن تەنگە تاوی کرد، وەکوو شێر نەڕاندی و وتی: من

---

- صحیح مسلم/ کتاب الجهاد والسیر باب صلح الحدیبە.

لەهەموو شوێنێك دا دژی پێغەمبەر جەنگاوم و تاشیرم بڕیوەیەتی لەگەڵ ئەو شەڕم کردوە، ئێستا لەبەر ئێوە هەڵدێم؟! ئەمجار هاواری هاوەڵانی کرد، کێ پەیمانی شەهید بونم لەگەڵ دا دەبەستێ، کۆمەڵێك پەیمانیان دایە تاشەهید بون بجەنگن ئیتر درێژەی بەشەڕدا بریندار کراو شەهید بوو[13]

بەڵێ ئەو عەرەبانە واقیعی و ڕاستاڵ بوون، خاوەنی هەڵوێستی بێ پێچ و پەنا بوون، فێڵیان لەخۆیان و غەیری خۆیان نەدەکرد، خوویان گرتبوو بە ڕاستگۆیی و بڕیاردانی صەراحەت ئامێزو پابەندبوون پێیەوە ئەم ئاکارانە یان لێ ببوە خوو لەناخیان دا ریشەی داکوتابوو، ئەوەی کە ئەم ڕاستییە دەچەسپێنێ ئەو ریوایەتەیە کەدەربارەی پەیمانی عەقەبەی دووەم ریواتکراوەو پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ مەدینە بەستراوە. ئیبنو ئیسحاق دەگێڕێتەوە دەڵێ:

کاتێك هۆزی ئەوس و خەزرەج کۆبوونەوە بۆ ئەوەی پەیمان لەگەڵ پێغەمبەردا ببەستن، عەباسی کوڕی عوبادەی خەزرەجی وتی: ئەی هۆزی خەزرەج! ئێوە دەزانن لەسەر چی پەیمان لەگەڵ ئەم پیاوە دا دەبەستن؟ وتیان بەڵێ دەزانین وتی: ئێوە پەیمانی لەگەڵ دا دەبەستن لەسەر جەنگی (سورو ڕەش) واتە: (جەنگی عەرەب و عەجەم) جا ئەگەر دەزانن هەرکاتێ ئێوە ماڵ و سامانتان بەتاڵان ببرێ و توشی بەڵاو ناخۆشی بن و پیاو ماقوڵ و سەرە کانتان کوژران، ئیتر ئیوە دەست بەرداری دەبن، ئەوە هەر لەئێستاوە پەیمانی لەگەڵ مەبەستن، چونکە ئەگەر شتی وا بکەن بەخودا دەبێتە مایەی شەرمەزاری دونیاو قیامەتتان. خۆ ئەگەر دەزانن: ئێوە پابەندی وا دەکانتان دەبن و لەتەنگانەدا بەدەمیەوە دەچن و بەرۆینی ماڵ و سامانتان و کوژرانی

[13] تأريخ الطبري ج/٤ ص/٣٦.

پیاو ماقوڵو گەورەکانتان دەست بەرداری نابن، ئەوە لەئێستاوە دالْدەی بدەنو لەخۆتانی بگرن، سوێندم بەخودا ئەمە دەبێتە هۆی خێرو بێرو شکۆمەندی هەردو دونیاتان، ئیتر هەموویان وتیان: بەڵێ ئێمە بەهەموو حالێك لەخۆمانی دەگرینو تێکڕا ئامادە باشی خۆیان دەربڕی ئەمجاروتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسەر ئەم هەڵوێستەمان ئێمە چیمان دەدرێتێ، ئەگەر پابەندی پەیمانی خۆمان بین پاداشتمان چیە؟ پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێ فەرمووی بەهەشت، ئەمجار وتیان: دەست بێنە، ئەویش دەستی بۆ درێژ کردنو یەکە یەکە پەیمانیان لەگەڵ دا بەست.

بێگومان دوایش پابەندی پەیمانی خۆیان بوونو بەوپەڕی دڵسۆزییەوە یارمەتی ئایینی خودایان داو، هیچ ماڵ لەکیس چونو کوژرانی پیاو ماقوڵو ڕۆڵەیەکیان لەو پەیمانە پەشیمانی نەکردنەوە..ئەوە تاسەعدی کوڕی مەعاز لەسەر زوبانی ئەوان دەڵێ: سوێندم بەخودا، ئەی پێغەمبەر! ئەگەر بڕۆی بەرەو قەصری (غمدان) لەیەمەن لەگەڵت دێین، وەڵڵاهی ئەگەر ئەو دەریایەمان بەرەو ڕو بکەیەوە لەگەڵتا خۆی تێ فڕێ دەدەین.

بێگومان ئەم ڕاستگۆییو بڕوا بە خۆبوونو دڵسۆزیو جدییەتو گیانی پابەند بوون بەحەقو سووربوون لەسەر هەڵوێستی مەردانەی ئەو هاوەڵانە بوو کەکاریان کردە سەر یەکێکی وەکوو عوقبەی کوڕی نافیع (سەرکردەی لێهاتووی موسوڵمان) کەبەسوپای پیادەوەو ئەسپ سواریەوە تاکە نارەکانی دەریای ئەتڵەسی ڕۆیشت، پاشان وتی: خودایە خۆت دەزانی ئەگەر ئەم دەریایێ ئامانە نەبوایە درێژەم بەپێشڕەوی خۆم دەداو نەدەگەڕامەوە، لەپێناو ئایینی تۆدا جیهادم دەکرد! بەپێچەوانەوە یونانیەکانو ڕۆمەکانو ئێرانییەکان خویان بەخۆگونجاندن لەگەڵ

بارودۆخەکانو زەمانە سازی گرتبوو، فێری ماستاو کردنو فرتو فێڵ بو بوون، ستەمو چەوساندنەوە نەی دەهەژاندن، حەقانیو حەق ویست نەبوون فکرەو بانگەوازی یەکی حەقو راستیان لەناودا نەبوو کەگۆشیان بکاو کێشیان بکاو بیرو بۆ چونی پوچیان لەبیر بەرێتەوەو گوشی حەق بنو گیانو ماڵی خۆیانی لەپێناودا بەخت بکەن.

عەرەبەکان تا ئەندازەیەك لەجیهان گۆشە گیر بوونو فێری تەنپەروەریو رابواردنی شارەستانی نەبو بوون، بەجۆرێك کەزەحمت بێ چارەسەر بکرێو لەو جۆرە ژیانە واز بهێنن، کەبەڕواڵەت زۆر جار ژیانی تەرەفو خۆشگوزەرانی دەبێتە لەمپەڕ بۆ دڵسۆزی بۆ بیرو باوەڕو خۆبەختکردنی لەپێناویدا خاوەنی رەوشتی ڕاستگۆییو دەستپاکیو دلێریو شەجاعەت بوون، بەسروشت فێری دوڕوییو پاشقول نەبو بوون هەڵمەت بەری جەنگ بوون، سوار چاکی دلێر بوون، حەزیان لەوە بوو هەمیشە لەسەر پشتی ئەسپ بنو هێرش بەرن، خاوەنی توندو تۆڵیو گورجو گۆڵی بوون، فێری ژیانی زبرو تەقەشوف بوون، سوار چاکی رەوشتی هەرە دیارو بەرچاویان بوو، ئەمەش شتێکی پێویست بوو بۆنەتەوە یەك کە ئەنجامدانی کارێکی گەورەی بخرێتە ئەستۆ، چونکە سەردەمەکە سەردەمی جەنگو پاڵەوانبازیو فیداکاری بوو.

هێزە کاراو فیکرییەکانیان ماندو نە بو بوون، لێهاتویی یە سروشتی یە کانیان پەزمەندە کرابوون و مابوونەوە، لەتوێژینەوەو دیراسە کردنی فەلسەفە خەیالییەکانو کوڕە جەدەلو نەزۆكو بێهۆدەکانی بیزنتیو ڕێبازەکە لامییەکان دا خەرج نەکرابوون، مێشکیان بەو جۆرە علومو زانستانە نەهاخندارا بوو، هەروا لە شەڕی نێو دەوڵەتیو سیاسی یەوە

ـەگلابوون، نەتەوەیەکی گەنجی زیندوی چوستو چالاکی خاوەن ورەو حەماسەت بوون!!

نەتەوەیەك بوون بەسروشت حەزیان لەئازادیو یەکسانی بوو، وەگری خاكو ولاتی خۆیان بوونو سروشتیان خۆش دەویست، هەرگیز راستەوخۆ ژێر دەستەی هیچ حکومەتێکی بێگانە نەبوو بوون، ئولفەتیان بەکۆیلایەتیو چەوساندنەوە نەگرتبوو، حەزیان لەوە نەبوو مرۆڤ بەندایەتی مرۆڤ بکا، پراوەی ژیانی ژێر دەستەییو پاشاو رەعیەتییان نەکردبوو، پاشایەکیان نەبوە وەکو کیسرای ئێران یان هیر قەلی رۆم بیانچەوسێنێتەوەو سوکایەتییان پێ بکا، پاشاکانی ساسانی کەجیرانی عەرەبەکان بوو، خۆیان بەخودا دەزانیو پێیان وابوو ئەوان لەژوور ئادەمیزادەوەن، هەرکاتێ پاشا کەنە شاخی لەخۆ بگرتایە، یان دەرمانی بخواردایە، جار دەدرا بەناو خەڵك - کەکەس لەدارو دەستەی کۆشکی پاشا کارنەکا، بەڵکوو دەبوایە - نیشتوانی پایتەخت هەموویان بۆ ماوەیەك دەستەو نەزەر راوەستنو واز هەموو کارو بارێکی خۆیان بهێنن[14] ئەگەر بپشمییایە کەس بۆی نەبوو کەدوعای بۆ بکا، یان ئەگەر دوعای بکردایە کەس بۆی نەبوو ئامینی بۆ بکا. چونکە ئەو خۆی لە ژوور ئاستی ئادەمیزاد دادەناو پێویستی بەدوعاو پرانەوەی ئەوان نەبوو. خۆ ئەگەر رۆژێك لەرۆژان پاشا سەردانی ماڵی وەزیرێك، کار بەدەستێکی بکردایە، ئەو رۆژە دەبو بکرایە بە رۆژێکی بەناو بانگو پیرۆزو ببوایە بەرۆژێکی وەها، مێژووی پێ دیاری بکرایە، ئەو کەسەش کەپاشا سەردانی دەکرد بۆ ماوەیەك لەباجو خەراج عەفو دەکراو حیسابی تایبەتی بۆ دەکراو زۆر ئەركو پێویستیاتی گشتی نەیدەگرتەوە،

---

[14] ایران فی عهد الساسانيين ص٥٣٥-٥٣٦.

چـونکە پاشـا بـەو سـەردانەی رێـزی لێ نـاوەو شـکۆمەندی زیـاتری پـێ بەخشیوە.

ئەمـە جگـە لـەو هـەموو دابو نەریتانـەی دەبوایـە پیـاوانی دەربـاری کۆشکی پاشاو پیاوانی تری حکومەتو پیاو ماقوڵەکان پێوەی پابەند بنو ڕۆژانە بەوردی ئەنجامی بدەنو بەهیچ شێوەیەك پاشگوێی نەخەن. هەنـدێك لەم دابو نەریتانە وەکوو راوەستان لەخزمەت پاشاو دەست خستنە سەر سینگو سەردانەواناندنو هەندێ جار کڕنوش بردن بۆی. هـەروا راوەسـتان لەخزمـەت پاشـادا بەشێوەی راوەستانی مـرۆڤ لەنوێـژدا بەرامبـەر بـەخودای گـەورە، ئـەم دابو نەریتانـە بـەواقیعی لەسـەردەمی گـەورەترینو عـادل تـرین پاشـای ساسـانی کیـسرای یەکـەم ناسـراو بـە (نەوشـیرەوان) (٥٣١-٥٧٩ز) ئـەنجام دەدرا، دیـارە لەسـەردەمی ئـەو پاشا ساسـانی یانـەی کەبەسـتەمکار بەناو بانگن بەشێوەی چڕ ترو بەر فراوانتر ئەنجام دراون. ئازادی بیرو ڕادەر بـڕینو رەخنـە گـرتن لەدەسـەڵات لەسەرانـسەری وڵاتـی ساسـانی دا هـەر وجودی نـەبوە، کەسـێك نـەبوە بتوانـێ بەئازادی رای خـۆی دەربـڕێ. مێـژوو نووسـی بـەناوبانگ ئیبنـو جـەریری گهبەبـەری سـەر گوزەشـتەیەکی سـەیرو سەمەرە لەکیسرا ئەنەوشیروان دەگێڕێتـەوە: کەئـەو روداوە ئاوێنەیـەکی بـاڵا نومایە بۆ ئەو ئاستەی فەرمانڕەوایی ساسانی پـێ ی گەیشتبوو لـەکپکردنی دەنگەکانو تاساندنی وشـە لەگـەروی رەخنـە گران داو نـەبوونی هـیچ جـۆرە ئازادی یەك.

**تەبەری دەڵێ**: پاشای ساسانی قوبازی کوڕی فـەیرۆز لـەئاخرو ئـوخری پاشایەتی دا فەرمانی دا کە ڕوپێوێکی وڵاتەکەی بکری بەدەشتو چیایەوە، بۆ ئەوەی خەراجی بخاتە سەر، فەرمانەکەی پەیڕەو کراو مەسحی وڵاتەکەی ئـەنجام درا، بـەڵام پـێش ئـەوەی پاشـا چـەندییەتو چـۆنیەتی خەراجەکـە

-یاری بکا لەدونیا دەرچوو، کوڕەکەی کە کیسرا بوو چوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی و فەرمانی دا پڕۆژەی مەسحەکە تەواو بکرێ و دارخورماو زەیتوون و بیری ئاوەکان سەر ژمێر بکرێن، ئەمجار فەرمانی دابە بەفەرمانبەرەکانی پوختەی خەراجە کەیان بۆ دەرهێنا، فەرمانی دا خەڵکەکە کۆبکرێنەوە فەرمانی دا بەبەرپرسی کۆکردنەوەی خەراج چەندییەت و چۆنیەتی وەرگرتنی خەراجەکەیان پێ ڕابگەیەنێ، ژمارەی دارخورماو دار زەیتوون و بیرەکانیان بۆ روون بکاتەوە، ئەویش بەبێ چەندو چون فەرمانەکەی جێ بەجێ کردو ئامارەکەی بەسەردا خوێندنەوە، پاشان کیسرا پێ ی گوتن: ئەی خەڵکینە: ئێمە وامان بەباش زانی کەخەرج و باج لەسەر ئەو زەوی زارو بیرو باخ و باخاتانەی روپێوو سەرژمێرمان کردون ساڵانە بەسێ جار لێیان وەربگرین و لەبەیتول مالی خۆمان کۆی بکەینەوەو خەزنی بکەین، بۆ ئەوەی ئەگەر لەداهاتودا توشی قۆرت و چورتم و بەلاو موصیبەتێك بوین و شتێکمان بەسەر هات پێویستمان بەماڵ و سامان بوو ئەو کاتەدا نەکەوینە پارە کۆکردنەوەو پیتاك کردن و بەزۆر ماڵ ستاندن لەئەم و ئەو، ئەرێ راتان چیەو ئەم فکرەتان پێ چۆنە؟ کەس وەڵامی نەدایەوە، سێ جاری تر کیسرا ئەم قسەیەی لێ دووبارە کردنەوە، پیاوێك لەناویان دا غیرەتی بەخۆی داو هەستایە سەرپێ وتی: خاوەن شکۆی نەمر! خودا دەست بەتەمەنتەوە بگرێ، ئایا ئەم باج و خەراجە دەکەوێتە سەر ڕەزە وێران و زرعاتی وشکەوە بوو بیری بێ ئاوو کانی و کارێزو جۆگای ئاو تێدا نەماو؟ کیسرا وتی: ئەی چارە رەشی بەدبەخت! ئەتۆ لەچ چینێکی کۆمەڵی؟ وتی من لەچینی نووسەرانم، کیسرا وەتی: بەدەوات لێ ی بدەن تاگیانی دەردەچێ، نووسەران بۆ ئەوەی پاکانە بۆ خۆیان بکەن و نیشانی بدەن کەئەو رایە هی ئەوان نیە، وەری گەڕانێ بەلێدان تاگیانی دەرچوو، ئەمجار

خەڵکەکە بەتێکڕا وتیان خاوەن شکۆ ئێمە رازین و هیچ تێبینی یەکمان نیە لەسەر بڕیارەکەت.

وەنەبێ ڕۆمەکان لەم بارەوە لەفارسەکان باشتر بوبن هەرچەندە بەئەندازەی فارسەکان مرۆڤ نەویست نەبون و قەیصەرەکان بەئەندازەی کیسراکان چەوسێنەرەوەی نەتەوەکەیان نەبوون، مێژوو نووسی ئەوروپایی (ڤیکتور شوپارت) لەکتێبەکەی خۆی دا بەناوی (العالم الرومانی) دا دەڵێ: قەیصەرەکان خۆیان بەخودا دەزانی، ئەمەش بەشێوەی بنەماڵەو میراتی نەبوو، بەڵکوو هەرکەسێك بچوویایە سەر کورسی فەرمانڕەوایی، دەبوو بەخوداو خۆی بەخودا دەزانی باهیچ بەڵگە یەکیش نەبوو بێ کەگەیشتۆتە ئەو پلەو پایە، ناز ناوی (ئەغسطس) ی پاشایانەی قەیصەرەکان لەئیمپراتۆرێکەوە بۆ ئیمپراتۆرێکی تر بەگوێرەی دەستورو قانون نەبوو، تەنانەت کاری ئەنجومەنی پیران لەرۆمان دا تەنیا بریتی بوو لەوە دەستخۆشی بکەن لەو بڕیارانەی بەزەبری شمشێر دەردە چوون، ئەگینا هیچی تریان بەدەست نەبوو، بەکورتی ئەو ئیمپراتوریيەتە بریتی بوو لەدیکتاتۆرییەتێکی سەربازی هەموو شتێك بەزەبری شمشێر دەچەسپاو رەها دەکرا. قانون و یاسا هەر ناوەکەی هەبوو!!

لەلایەکی ترەوە کڕنوش بردن بۆ پاشاکانی رۆم، شتێکی ئاسایی بوو، دەبوایە لەکاتی دیاریکراودا لەلایەن هەندێ کەسەوە ئەنجام بدرێ، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب لەوسەر گوزشتەدا کەدەربارەی هیر قەل (قەیصەر) ی رۆم دەیگێڕێتەوە کاتێك نامەی پێغەمبەری پێ دەگا داوای ئیمانهێنانی لێ دەکا، لەکۆتایی سەرگورشتە کە دا دەڵێ: هیر قەل فەرمانی بە دانیشتوانی مەجلیسەکەی کرد ئیمان بەپێغەمبەری ئیسلام بهێنن ئەوانیش بێزارییان دەربڕی، جاکە هیر قەل هەستی بەبێزاری خەڵکەکە کردو دڵنیا بوو

کەئامادەنین ئیمان بەپێغەمبەر بهێنن، لەهەمان کات دا هەریەکەیان بەلایەك دا ڕۆیشتن‌و کۆڕەکەیان جێ هێشت، هیرقەل ووتی: جارێکی تر خەڵکەکە کەم بۆ کۆبکەنەوە، کەگردبوونەوە وتی: من ئەو داوایەم لێ کردن بەراستم نەبوو، ویستم بزانم تاچەند ئێوە پابەندی ئایینی خۆتانن، ئەوا بۆم دەرکەوت‌و زانیم کەئێوە سوورن لەسەر ئایینی خۆتان.

ئیتر خەڵکەکە سوژدەیان بۆ هیر قەل بردو ڕەزامەندی خۆیان بەرامبەر هیر قەل دەربڕی. ئەمە دوا کاری هیر قەل بوو لەگەڵ جەماوەرەکەی.

لەوڵاتی هیندیش سوکایەتی کردن بەئادەمیزاد گەیشتبوە ئەو پەڕی سنوور، چەوساندنەوەو بەکەم تەماشا کردنی ئەو چینانەی کەئارییەکان‌و ئەو قانوونەی یاسا ناسە ئارییەکان دایان نابوو بەمەخلووقێکی بێ ڕێز یان دەزانین‌و لەئاژەڵیان جیا نەدەکردنەوە، پێیان وابوو ئەوانە جودا وازییان لەئاژەڵ هەر ئەوەندەیە کەلەسەر دوو قاچ دەڕۆن. هەرچەندە ئەو خەڵکانە دانیشتوی ڕەسەنی وڵاتی هیندو ستان بوون ئارییەکان دوایی هاتبوونە ئەو وڵاتەو خۆیان بەسەر خەڵکەکەدا سەپاندبوو، وێڕای ئەوەش بەبێ ڕێزی سەیری ڕەشە خەڵکەکەیان دەکردو سوکایەتیکردنیان بەدانیشتوانە ڕەسەنەکە گەیشبوە ئاستێك بەخەیاڵیش پەی پێ نەبرێ. ئەوە تا لەقانوونی مەدەنی ئەو وڵاتەدا کەیاسا ناسە ئارییەکان دایان نابوو دەڵێ: ئەگەر بەگۆچان‌و عەصا لەبورەهمیەك ڕاساو ویستی دەست درێژی بکاتە سەر، دەبێ دەستی ببڕدرێ، ئەگەر بەرقەوە هەنگاوی بۆ هەڵهێناو پەلاماری دا، دەبێ قاچەکانی گۆج بکرێن‌و قاچی بابدرێن‌و لەکار بخرێن. ئەگەر لافی ئەوەی لێ دا کە ئەو زانایەو فێری خوێندن‌و زانستی دەکا، زەیتی کوڵاتوی بەقوڕگدا دەکرێ، کەفارەتی کوشتنی سەگ‌و پشیلەو بۆق‌و سەرمازەڵەو قەلە ڕەش‌و کوندە بوو ئادەمیزاد لەچینی ئەو قێزە لێکراوانە وەکوو یەك

وایە. جا ئەگەر ئەم داب و نەریت و یاسایانە بەرامبەر بکرێن بەو داب و نەریتەی عەرەبەکان پێوەی پابەند بوون دەربارەی ئازادی و نەفس بەرزی و سنوور دانان بۆ رێز گرتن لەگەورە پیاوان و پاشایان پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، دەبینی فەرق و جوداوازییەکی رەها هەیە لەنێوان طەبیعەت و هەڵس و کەوتی ئەو دوو نەتەوە ئەو دوو کۆمەڵگایە، واتە: نەتەوەی ناعەرەب و نەتەوەی عەرەب.

ئەوەتا عەرەبەکان قسەیان لەگەڵ مەلیك و گەورە پیاوانی خۆیان دەکرد بەرستەی (أبيت اللعن) ناخۆشی نەبینی (عم صباحا) بەیانیت باش دەستیان پێ دەکرد، تەنانەت ئازادی رادەر بڕین و پابەند بوون بەپاراستنی کەسایەتی و رێز گرتن لەمرۆڤ گەیشتبوە ئاستێك هەندێ جار ملیان نەدەدا بۆ جێ بەجێ کردنی داخوازی مەلیکە کانیان، جاری وابوە راستەو خۆ داوای فرمانڕەواو ئەمیرەکانیان رەتکردۆتەوە، بۆ نموونە دەگێڕنەوە: کەیەکێك لەمەلیکەکانی عەرەب پێش ئیسلام داوای ئەسپێك لەپیاوێکی هۆزی تەمیم دەکا، ئەسپەکە ناوی (سکاب) دەبێ کابرای تەمیمی بێ چەندو چوون داواکەی رەت دەکاتەوە لە سەرەتای شیعرێکی دا دەڵێ:

أبيت اللعن أن سكاب علق  نفيس لأبقار ولاتباع[15]

ماڵت نەشێوی (سکاب) ماڵێکی بەقیمەتەو نرخی نایە، ناخوازرێ و نافرۆشرێ. لەکۆتایی شیعرەکەش دەڵێ:

فلا تطمع أبيت اللعن فيها  ومنعكها بشيء يستطاع

---

[15] رستەی (أبيت اللعن) واتە: ئەی مەلیکی خاوەن رێز کارێك نەکەی ریسوایی لەدوادابێ خودا توشی ناخۆشیەکت نەکا ببیە شوێنی تانەی خەڵك ئەم جۆرە رستانە شێوەی سەلامکردن بوو لەپاشایانی عەرەب لەسەردەمی نەزانی دا.

تەماع مەکەرە ئەسپەکەم (خودا ناخۆشیت بەسەر نەهێنێ، مەنعکردنت
ئەسپەکەم بەجۆرێك لە جۆرەکان لەتوانا دایە، دەتوانم داواکەت رەت
بکەمەوە. بێگومان ئەم جۆرە ئازادییەو لەخۆرا دیوی و بڕوا بەخۆ بوونەو
مل نەدان بۆ ژێر دەستەیی، بڵاوەی کردوە بەناو هەموو چینەکانی
کۆمەڵگای عەرەبی ئەو کاتەدا:

لەسەرەوە شۆڕ بۆتەوە بۆ خوارەوەو لەپیاوو ئافرەت دا رەنگی
داوەتەوە، بەڵگە لەسەر ئەوە هۆی روداوی کوژرانی عەمری کوڕی هیند
مەلیکی وڵاتی حیرە بەدەستی عەمری کوڕی کولثوم، سوار چاك و شاعیری
بەناوبانگی عەرەب، کە مێژوو نووسان دەیگێڕنەوە دەڵێن: عەمری کوڕی
هیند (پاشای حیرە) ناردی بۆ لای عەمری کوڕی کولثوم کەدیدەنی بکاو
دایکیشی ببینێ عەمر لەنیوە دورگەی عەرەبەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لەپیاوی
هۆزی بەنی تەغلەب بەرەو حیرە بەڕێ کەوت، هاوکات لەیلای کچی
(مهلهل)یش لەکەژاوەی هۆزی بەنی تەغلەب دا بەرەو ئەوێ کەوتە ڕێ،
عەمری کوڕی هیند فەرمانی دا خێمەیەکی گەورە یان لەنێوان حیرەو فورات
دا بۆ هەڵبدەن، شوێن و مەکانی تایبەتیان بۆ دیاریی کرا، عەمری کوڕی
کولثوم لەشوێنی بۆ دیاری کراوی خۆی دابەزی و لەیلاش لەنزیك ئەو
رەواقەی بۆ عەمر دانرابوو لەخێمەی بۆ دیاری کراوی خۆی دا دابەزی،
عەمری کوڕی هیند فەرمانی بە دایکی کردبوو کە لەکاتی سفرە دانان و
سینی هێنان دا خزمەتکارو کارەکەرەکانی خۆیان کەنار گیر بکاو لەوێ
ئامادە نەبن، کاری سفرە راخستن و نان دانان بەلەیلا بکەن، عەمری کوڕی
هیند داوای کرد سفرە راخەن و خواردەمەنی بخەنە پێش دەستی میوان،
ئەمجار داوای سینی و قاپ و قاچاغی کرد، خزمەتکارو کارە کەرەکانیش
لەوێ نەبوون، هیند (دایکی عەمر) وتی: ئادەی لەیلا ئەو سینی و قاپ و

قاچاغانەم بدەرێ، لەیلا وتی ئەوە ئیشی من نیەو با خاوەن ئیش بەکاری خۆی هەڵسێ. هیند لێ ی دوبارە کردەوە داوای لێ کردسینی یەکەی بداتێو ئیلهامی لێ کرد، لێیان بوو بەکوردە ناموسیو لێك سور بوونەوە، ئیتر لەیلا قیژاندیو هاواری کرد، ئای لەزەلیلی منو سوکایەتی پێ کردنم! ئای هۆزی تەغلەب ئەوە چۆن ئەوە قبوڵ دەکەن ئاوا سوکایەتیتان پێ بکرێ؟! عەمری کوڕی کولثوم لەخێمەکەی خۆیەوە گوێی لەم هاوارو قیژە قیژە بوو، رقی هەڵساو پەلاماری شمشێرێکی هەڵواسراوی دا کەلە رواقەکەی دا بوو دای لەسەری عەمری کوڕی هیندو کوشتی، ئەمجار بەنو تەغلبییەکان تالآنی رەواقەکەیان کردو گەڕانەوە بۆ نیوە دوورگەی عەرەب. عەمری کوڕی کولثوم لەم بارەوە چامەیەکی بەناوبانگیو تووە کەیەکێکە لەو قەصیدانەی (معلقات السبعة).. کاتێکیش موغەیرەی کوڕی شوعبە کەنێردراوی موسوڵمانەکان بوو بۆ لای روستەم، چووە وتاغی روستەمەوەو دیدەنی کرد، بینی کەروستەم بەفیزەوە لەسەر تەختی شکۆمەندی خۆی دانیشتوە، موغەیرە وەکوو دابو نەریتی عەرەب چوو لەسەر تەختی روستەمو لەتەنیشتییەوە رۆنیشتو شانی دادا، دارو دەستەی وتاغ قڵەمبازی بوونێو لەسەر تەخت خستیانە خوارو تێلاٚ ترێنیان کرد. وتی: ئێمە وامان دەزانی ئێوە هۆشمەندو خاوەن حیلمو حیکمەتن، نابینم کەس لەئێوە گێل تر بێ، ئێمە (نەتەوەی عەرەب) هەمووومان یەکسانینو کەسمان ئەوی ترمان بەکۆیلە نازانێو سوکایەتی پێ ناکا، ئێمە یەکتر ناکەین بەکۆیلە، مەگەر لەکاتی شەڕداو دژی ئەوی تر بجەنگێ! ئەمن پێم وابوو ئێوە دڵنەوایی یەکتر دەکەن وەکوو ئێمە، کۆمەك بە بەیەکتر دەکەن، دەبوایە لەجیاتی ئەو هەڵسو کەوتەی لەگەڵ منتان کرد پێم بڵێن: ئێوە هەندێکتان خودای

هەندێکتانن‌و ئەم کارەش لەناو ئێوەدا پایە دار نابێ‌و ئێمە نایکەین، من نەدەهاتم وەلێ ئێوە بانگتان کردم.[16]

لەنیوە دوورگەی عەرەب داو لەشاری مەککەدا کەعبە هەبوو ئەوکابەیەی حەزرەتی ئیبراهیم‌و ئیسماعیل (دروودی خوای لەسەربێ) بنیاتیان نابوو بۆ ئەوەی یەکتا پەرستی تێدا بکرێ، تەنیا خودا پەرستی تێدا ئەنجام بدرێ، هەروەها ببێتە سەرچاوەی بانگەوازی بۆ یەکتا پەرستی بۆ هەتا هەتایە.

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾[17]

یەکەم خانوویەك کەدانراوە بۆ خودا پەرستی ئەوەیە کەلەشیوی مەککەدا بنیات نراوە، خانوویەکی پیرۆزەو نیشانەی هیدایەتە بۆ هەموو جیهان.

بێگومان هەرچەندە تەورات زۆر گۆڕانکاری تێدا کراوە کەچی وشەی وادي البكاء)و لەجیاتی (عەلەم)کردویانە بە (نکرة). لەمەزامیری داوود دا هاتووە دەڵێ (طوبى لاناس عزهم بك، طرق بيتك في قلوبهم، عابدين في وادي البكاء يصيرون ينبوعا)[18] زانایانی جولەکە دوای چەند سەدەیەك هەستیان بەوەکرد کەبەهەڵە ئەو وشەیەیان وەرگێڕاوە، ئەوەتا لەدائیرە تولمەعاریفی یەهودی دا ......[19] دەڵێ (وادي البكاء) شوێنێکی تایبەتی بێ ئاوە بێگومان ئەو کاتەی حەزرەتی ئیبراهیم‌و حەزرەتی ئیسماعیل (دروودی خوای لەسەربێ) بناغەی دیوارەکانی کەعبەیان بەرز دەکردەوە لەخودا پاڕانەوە کە خودا پێغەمبەرێك بنێری بۆ سەر ئەو نەتەوەیەی لەدوا ڕۆژدا لەو دەڤەرە

---

[16] تأريخ الطبري ج. ٤/١٠٨.

[17] سورة آل عمران/٩٦.

[18] الكتاب المقدس في مطبعتها في ساحة أستور من مدينة نيورك، لندن ١٨٠٤م.

[19] چەند دێڕێك بەپێویستم نەزانی وەریان گێڕم.

جێ نشین دەبن، پێغەمبەرەکەش لەرەگەزی خۆیان بێ، دوعاو پاڕانەوەکەشیان وەکوو قورئان بۆ مان دەگێڕێتەوە بەم جۆرە بووە، ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾[20] خودایە: پێغەمبەرێك بنێرە بۆ سەر ئەو وەچەو نەوانەی ئێمە کەلە دوا ڕۆژدا لێرە نیشتەجێ دەبن، پێغەمبەرەکەش لەرەگەزی خۆیان بێ، نامەی ئاسمانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو پەیامی تۆیان پێ ڕابگەیەنێ و فێری شەریعەت و نامەی ئاسمانییان بکاو حیکمەتیان بۆ شی بکاتەوە، لەچڵکی گوناهو بتپەرستی پاکیان بکاتەوە، بێگومان زاتی پاکت بالاّ دەست و کار دروست و لێزانە هیچی لێ عاسێ نابێ و کاری بێهودە ناکا.

بێگومان داب و نەریتی خودا واهاتووە پاڕانەوەی ڕاستاڵ و نزاکاران گیر بکاو ویستەکانیان بێنێتەدی. چ جای ئەگەر ئەو نزاکارانە پێغەمبەران بن.

نامە ئاسمانییەکان و خەبەرە ڕاستەکان زۆر نمونەی گیرا بوونی نزای ڕاستاڵانیان لەخۆ گرتووە. لەتەورات دا دەقێك هەیە ئاماژە بەگیرابوونی پاڕانەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیم دەکا.

ئەوەتا لە (سفر التكوين)دا بەدەق هاتووە دەڵێ: (وعلى اسماعيل استجبت لك هوذا أباركه وأكبره وأكثره جدا، فسيله أثنى عشر رئيسا وأجعله لشعب كبير) بۆیە لەپێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە کەدەربارەی خۆی دەیفەرموو: (أنا دعوة ابراهيم وبشرى عيسى) من ئاکام و نەتیجەی پاڕانەوەی ئیبراهیم و موژدەدانی عیسام. (درودی خوایان لەسەربێ).لەتەورات دا وێڕای ئەو هەموو گۆڕانکارییەی تێ یدا کراوە زۆر بەڵگەی تێدان: کەپاڕانەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیم گیرابووە، ئەوەتا لە (كتاب التثنية)دا ئایەتی ژمارە (١٨-

[20] سورة البقرة /١٢٩.

ـ لەسەر زوبانی پێغەمبەری خودا کە حەزرەتی موسایە بەدەق هاتووە
ـحێ: (يقيم لك الرب الهك نبيا من وسطك من أخوتك مثلي، له تسمعون)
ـێگومان وشەی (إخوتك) لەدەقەکەدا ئاماژە بەوە دەکا کەمەبەست بەو
ـرایانە ئەوەی حەزرەتی ئیسماعیلە کەدەبنە ئامۆزای بەنو ئیسرائیلی
ـەکان، هەردوای دوو ئایەتو لەهەمان لاپەڕەدا (١٨–١٧) هاتووە دەڵێ:
قال لي الرب قد أحسنوا فيما تعلموا، اقيم لهم نبيا من وسط اخوتهم مثلك،
و جعل كلامي في فمه فيكلمهم بكل ما أوصية به (سفر التثنيه ١٧–١٨)
ـستەی (اجعل كلامي في فمه) واتە: دەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چونکە
حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) تاکە پێغەمبەرە کە کەلامی خودای بەدەق
گەیاندبێ، ئەوەتا قورئان بەرونی ئەوە ڕادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى﴾[21] یان دەفەرموێ: ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[22] وەلێ سێپارەو صوحوفی پێغەمبەرەکانی
بەنوئیسرائیلی، ئەوەیان تێدا نیە کە بە لەفظ و مەعناوە کەلامی خودابن،
زاناکانی بەنو ئیسرائیلیش کۆ لەوە ناکەنەوە: کە دانانی وشەو رستەی ئەو
کتێبانە پاڵ بە پێغەمبەرەکانیان بدەن، ئەوەتا لەدائیرە تولمەعاریفی
یەهودی دا هاتووە دەڵێ: بێگومان پێنج نامە هەوڵینەکانی کتێبی پیرۆز
العهد القديم) وەکوو لەهەواڵە کونینەکانی جولەکەدا هاتووە دانراوی
حەزرەتی موسایە جگە لەهەشت ئایاتی کۆتایی نەبێ کەباسی مردنی موسا
دەکەن. هەر لەکۆنیشەوە تائەمڕۆ زاناو مالمە جولەکەکان گرنگی دەدەن بەو
دژایەتیو جودا وازییەی لەو پێنج کتێبەدا بەرچاو دەکەونو هەمیشە
لەهەوڵی ئەوەدان بەحیکمەتو لێزانیو قسەزانی خۆیان ئەو کەلەبەرو

---

[21] سورة النجم / ٣–٤.

[22] فصلت/٤٤.

دژایەتیەی نێوان هەندێ لە دەقەکانی ئەو پێنج کتێبە چارە سەر بکەن، بۆ ئەو مەبەستە تەئویل و ئاڕاستە کردنی جیا جیا دەدۆزنەوە چوار ئینجیلە بەناو بانگە کانیش کە بە (العهد الجديد) ناو دەبرێن ئەوە زۆر لەوە دوورترن کەبە لەفظ و مەعنا کەلامی خودا بن، کەسێك سەرنج بداتە ئەو ئینجیلانەو لاپەڕەکانیان هەڵبداتەوەو لێیان وردبێتەوە بۆی دەردەکەوێ کەلەراستی دا زیاتر لە کتێبی ژینامەو چیرۆك دەچن تالەوەی کتێبێك بن لەسەر بنەمای (وەحی و ئیلهام) ی خودایی دانرابن.

لەلایەکی ترەوە شوێنی جوغرافی نیوە دوورگەی عەرەبی بەشێوەیەك بوو کە گونجاوبێ ببێتە مەڵبەندی پەیدابوونی بانگەوازی یەکی خودایی کەبۆ هەموو جیهان بێ و هەموو نەتەوەو رەگەزەکان بگێڕێتەوەو خیطابی خۆی ئاڕاستەی هەموو چین و توێژێك بکاو هەموو گەل و نەتەوەکان بگرێتەوە.[23] نیوە دوورگەی عەرەبی لەگەڵ ئەوەدا کە بەشێکە لەکیشوەری ئاسیا، نزیکی کیشوەری ئەفەریقاو ئەوروپاشە، هەریەکێکیش لەو کیشوەرانە لەو سەردەمەدا مەڵبەندی جۆرەها ژیارو شارە ستانیەت (الحضارات) و ڕۆشنبیری جیاوازو ئایینی جۆراو جۆرو فەرمانڕەوایی

(23) دکتور حوسێن (كمال الدين) سەرۆکی بەشی ئەندازیاری شارەستانی لەکۆلێژی ئەندازیاری لەزانکۆی (ریاض) لەگفت و گۆیەکی ڕۆژنامەوانی دا کەلە قاهیرە بلاّو بۆوە، ئەوەی ڕاگەیاند کەلە ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی دا گەیشتۆتە جۆرە تیۆرێکی جوغرافی ئەوە دەچەسپێنێ کەمەککەی پیرۆز چەقی وشکانی گۆی زەوییەو(واتە: مەرکەزی زەوییە) لێکۆڵینەوەکەش بەدروستکردنی خەریتەیەك دەست پێ کرد کەئەندازەی دووری هەموو لایەکی زەوی بۆ چەقی مەکە پێ حیساب بکا ئەمەش بەمەبەستی تەصمیم کردنی ئامێرێکی عەمەلی هەرزان بەها کەبتواندرێ لەهەموو شوێنێك ڕوگەی پێ بدۆزرێتەوە، لەکاتێك دا سەرگەرمی لێکۆلینەوەکە بوو لەناکاو بۆی دەرکەوت کەمەککەی پیرۆز کەوتۆتە مەرکەزی زەوییەوە.

ـەهێزو بەرفراوان بوو، کاروانی بازرگانی نێوان زۆر وڵاتی جیا جیاو دورو ـزیکی پێدا تێدەپەڕیو بەرو بوم‌و کاڵای جۆراو جۆری ئەم وڵات بۆ ئەو وڵات‌و بەپێچەوانەشەوە بەنێو وڵاتی نیوە دورگەی عەرەبی دا ـدگوێزرایەوە.

لەهەمان کات دا وڵاتی نیوە دوورگەی عەرەبی کەوتبوە نێوان ـووزلهێزی دژبەیەکی هەمیشە بەشەڕ هاتوو، هێزی مەسیحی‌و هێزی مەجوسی، یان بڵێ هێزی خۆر ئاواو هێزی خۆر هەڵات، (ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی‌و ئیمپراتۆرییەتی ساسانی) وێڕای ئەوە کە ئەم هەرێمە کەوتبوە نێوان ئەو دوو زلهێزەوە کەچی پارێزگاری ئازادی‌و کەسایەتی خۆی کردبوو، هەندێ قەراخ‌و بیجاخی‌و هەندێ خێڵی لێ دەرچی ئەوی تری ژێر دەستەی هیچ کامێ لەو دوو حکوومەتە نەبوو! سەر بەخۆو ئازادانە دانیشتوانەکەی ژیانی خێڵایەتی‌و کۆچەرییان تێدا بەسەر دەبرد، لەهەندێ دەڤەرو شارەکانیشی دا بازرگانی‌و ئاڵ‌و وێریان دەکردو وەرزانەکاروانیان بەرەو وڵاتی یەمەن‌و وڵاتی شام لەهاتوو چۆ دابوو. بۆیە وڵاتی نێوە دوورگەو بەتایبەتی مەککە باشترین جێگا بوو کە ببێتە مەڵبەندی بانگەوازی بۆ ئایینێکی مرۆڤایەتی‌و جیهانی، ئایینێك بەگشتی بانگەوازی ئادەمیزاد بکا بۆ پابەند بوون بەو ئایینە ئاسمانییەکە ئایینی ئیسلامەو لەئاستێکی زۆر بەرزدا بانگەوازی خۆی رابگەیەنێ‌و هیچ کاریگەرییەکی سیاسی‌و بێگانەی لەسەر نەبێ.

لەبەر ئەو هۆیانە هەموو، پەروەردگار وڵاتی نیوە دوورگەی عەرەبی‌و بەتایبەتی مەککەی پیرۆزی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە شوێنی رەوانە کردنی پێغەمبەرو نازڵکردنی نیگای ئاسمانی بۆ سەری‌و خاڵی خستنە گەڕی هێزو توانا بۆ بڵاوکرنەوەی ئایین ئیسلام سەرەتا لەناو جەزیرە خۆی داو

ئەمجار بەناو دەوروبەرو هەموو جیهان دا. (والله أعلم حيث يجعل رسالته) خودا بۆ خۆی دەزانێ بانگەوازیو پەیامی خۆی بۆ کێ دەنێرێو لەکوێ دا بلاۆی دەکاتەوەو کێ دەکاتە بەرپرس لێ ی.

## سەردەمێکی تاریكو رۆژگاری نائومێدی:

وێڕای ئەو هەموو مەوهیبانەی خودا رێزی نەتەوەی عەرەبی پێ گرتبوو، سەرەڕای ئەو هەموو تایبەتمەندییانەی کەلە ولاتی نیوە دوورگەی عەرەبی دا بەرجەستە بو بوون بۆ ئەوەی هەڵبژێردرێو بکرێتە لانکەی بانگەوازی ئیسلامیو پێغەمبەری تێدا رەوانە بکرێو ئیسلامی تێدا دەربکەوێو گەشە بکا دەڵێین: وێڕای هەبوونی ئەو هەموو دیاردانە لەولاتی نیوە دوورگەی عەرەب دا کەچی نیشانەی وریا بوونەوەو سەرهەڵدانو دیاردەی نارازی بوون لەو بارو دۆخە بەدی نەدەکرا، ئەوانەی بە (حنفاء) ناسرا بوونو دژی بتپەرستی بونو ئەوانەی بەشوێن دۆزینەوەی حەق دا وێڵ بوون، ژمارەیان لەپەنجەی دەست تێپەڕ نە دەبوو، وەکوو ئەوە وابوون ژمارەیەکی زۆر کەم لەمێشە درەوشاوەکان[24] کەلە شەوێکی زستانی زۆر تاریكو هەوراویو لێزمە باران دابێ کەتروسکاییو روناکی ئەو باڵندە بچکۆلە روناکایی بۆ کەس نابێو کەسی پێ شارەزایی ناکرێو سەرما بردوش گەرم ناکاتەوە!

ئەم سەردەمەی کە حەزرەتی موحەممەدی تێدا کرا بە پێغەمبەرو رەوانە کرا بۆ سەر ئادەمیزاد ڕۆژگارێك بوو لەتاریکترینو پاشەکەوتووترین ڕۆژگارو سەردەمانێك کەولاتی جەزیرەی پێدا تێدەپەڕی، هیچ روناکی یەك

---

[24] مێشێکە بەشەو دەفڕێ وەکوو ئاگر، روناکی دەدا.

ـەئاسۆدا دیار نەبوو، ناخۆشترین و قورسترین سەردەم بوو کەپێغەمبەرێك ـەپێغەمبەرانی خودا بەرەنگاری بێتەوە!.

بێگومان نووسەرێکی ئینگلیزی نووسەر لەژینامەی پێغەمبەردا کەناوی (William Sir)ە بەناوبانگە بەوەی زۆر رقی لە ئایینی ئیسلام و پێغەمبەرەکەیەتی، ئەم نووسەرە زۆر جوان وێنەی ئەو سەردەمەی کێشاوە ڕەدی ئەو نووسەرە ئەوروپاییانەی داوەتەوە: کەدەڵێن: سەردەمەکە ئامادەی تەقینەوە بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەکات و شوێنی خۆی دا هات و شقارتەیەکی لێ دا کڵپەی سەند. ئەو نووسەرە ئینگلیزە پێ ی وایە بارودۆخەکە وانەبوە، دەڵێ: بارودۆخی کۆمەڵایەتی لەجزیرەی عەرەبی دا ـەسەردەمی گەنجایەتی پێغەمبەردا گونجاو نەبوو بۆ قبووڵکردنی هیچ گۆڕانکارییەك یان ڕاپەڕین و بەرخودانێك، تەنانەت هیچ کاتێك ناهومێد بوون لەچاکسازیکردنی باری کۆمەڵایەتی نەتەوەی عەرەب ئاوانەگەیشتبوە تۆپەڵاك، وەکوو لەسەروبەندی رەوانە کردنی حەزرەتی موحەممەددا پێ ی گەیی بوو، بەڵام کاتێك متمانە لاواز دەبێ بەهۆکاری ئاکامێکی تایبەتی، هۆکاری تری بۆ دەدۆزرێتەوەو دەکرێن بەسەبەبی پەیدابوونی ئەو ئاکامە. بۆ وێنە کەسانێك هەن دەڵێن: حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) کاتێك ڕاپەڕی و دەستی کرد بەبانگەوازی و گۆڕانکاری هەموو عەرەب لەگەڵیا ڕاپەڕین بۆ چوونە ژێر بەیداخی ئایینێکی تازە، هەموو دانیشتوانی نیوە دوورگەی عەرەب بەیەك دەنگ هەمئاهەنگ و هاوکاری پێغەمبەر بوون، ئەمجار لەسەر ئەم بۆ چوونە هەڵەوە نەتیجەیەك دەخەنە ڕو دەڵێن: هەموو جزیرەی عەرەبی ئامادە باش و تینو بوون بۆ گۆڕانکارییەکی گەورەو لەناکاو گشتگیری!!.

وەلێ بەبڕوای ئێمە واقیعو مێژوو ئەمە بەدرۆ دەخاتەوەو ئەو نەتیجە نادا بەدەستەوە. ئێمە ئەگەر لەمێژووی عەرەب پێش هاتنی ئیسلام وردبینەوە، بەدڵێکی کراوەو چاوی وردبینی یەوە سەیری رووداوەکانی ئەو ڕۆژگارە بکەین دەبینین هەوڵو کۆششی بەردەوامی مەسیحییەکان بانگەوازی بەرفراوانیان بەدرێژایی پێنج سەدە سەرکەوتو نەبوو، جگە لەکەسبکردنی ژمارەیەکی کەم لەبڕێ هۆزو تیرە کەوەکو شەپۆلێکی بچوك بەسەر دەریای ژیانی شلوێ نەبووی عەرەب دا تێدەپەڕیو ئاوێنەی بالأنما بوو بۆ ئەو هەوڵو کۆششە بێ ئاکامەی بانگخوازانی مەسیحی ئەنجامیان دا، هەرچەندە هەندێ جار بەهۆی کاریگەری بانگەوازی جولەکایەتیەوە ئەو شەپۆلانە قولترو بەهێز تر بون، بەلأم شەپۆلەکانی بتپەرستیو خەیاڵە پووچەکانی ڕێڕەوی بەناو ئیسماعیلی بەهێز ترو بەهەڵمەت تر بوو، تەوژمی ئەو شەپۆلە بتپەرستی یە نەفامییە، کەعبەشی گرتەوەو دیوارەکانی بەبتی جۆراو جۆر رازاێندرابوونەوە.

هەمان نووسەری ئینگلیزی (سیر ولیم میور) لەشوێنێکی تردا لەکتێبەکەی دا دەڵێ: (بارو دۆخی عەرەبەکان پێش رەوانەکردنی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) لەهەموو گۆڕانکارییەك دوورە پەرێز بوو، هیچ ئامادە باشییەکی پێش وەخت بۆ گۆڕنکاری ئایینی لەگۆڕێ نەبوو، هەروەکوو چۆن عەرەبەکان لەبارەی کۆمەڵأیەتیو سیاسی یەوە خێڵ خێڵو تیرە تیرە بوون، هیچ یەکیەتیەکی نیشتمانیو جەماوەری یان تێدا نەبوو، ئایینەکەیان بریتی بوو لەبتپەرستی یەکی نەفامانەی رەگ داکوتراوو ریشەدارو تۆکمە، کەهەوڵو کۆششی مەسیحیەکانی میصرو شام بۆ چاکسازیو بلأوکردنەوەی ئایینەکەیان لەو دەڤەرەدا بێهودە بوو. نەیانتوانی ئەو لەمپەرە تۆکمەیە ببەزێنن.

ئـەم حەقیقەتـە راسـتییە مێـژوویی یـە دەق دەشـوبهێتە لـوغزو گـرێ کوێرکەیەکی زانستی زانای بەناوبانگی خۆر ئاوایی Bosworth Smith بەشێوەیەکی کورتو رونو ئاشکرا رای خۆی دەردەبڕێو دەڵێ: (بێگومـان هەر مێژوو نووسێکی لەناو هاوەڵەکانی دا بەوە ناسرا بێ کەواقیعیانە بیر دەکاتـەوە ڕێبـازێکی فەلـسەفی هەیـە ئـەوە دەچەسـپێنێ: کەبەدرێـژایی مێـژووی ئادەمیزاد لـەناو هـەموو ئـەو شـۆڕشو راپەڕینانـەی کەکاریگـەری خۆیـان لەسـەر روبـەری ژیـان تۆمـار کـردوە هـیچ شۆڕشـێك هێنـدەی ئیسلام بـەدوور لـە (قیـاسو هیـوا) بـەلای عـەقڵی ئـادەمیزادی یـەوە نـاوازە نـەبوە کەلەناو عەرەب دا سەر هەڵبدا، بێگومان پەیدا بوونی ئیسلام لەناو عـەرەب دا بـەلای عـەقڵو قیاسەوە روداوێك بوو چاوەڕوان نەکراوو کـەس بەتـەمای پەیدابوونی نەبوە.. بۆیـە ناچارین دان بـەوەدا بنـێ ین کـەزانیاری مێژوویی ئەگـەر شـتێك هـەبێ پـێ ی بگـوترێ: زانـستی تـاریخ، بەسـەر گـەردانی دەمێنێتەوەو ناتوانێ زنجیرەی ئەو هۆکارانە بدۆزێتـەوە کە بوونـە هۆکـار بۆ پەیدابوونی ئیسلامو ئەم شۆڕشە گەورەی کە بەسـەر نیوە دورگـەی عـەرەبی داهات.

## پێویستی ئادەمیزاد بۆ پەیدابوونی پێغەمبەر:

بـارودۆخی داوەشـاوو گەنـدەڵ، پـشێویو ئاشـوب دارمـانی بنـەمای کۆمـەڵو دارمـانی ئـەخلاقو رەوشـت لەنێوەراسـتەکانی سـەدەی شەشـەمی زایینی دا گەیشتبوە ئاستێك لەوە گەورەتر بوو چەند کەسانێك لە ئیصلاح خوازانو مامۆستایان بتوانن چارەسەری بکەن، چونکە قەضییەکە تـەنها بریتـی نـەبوو لـە چاککردنی بیرو باوەڕێـك لـەبیرو باوەڕەکـان، یـان لابردنـی دابو نـەریتێك لـە دابو نەریتـەکان، یـان ئیـصلاحکردنی کۆمەڵگایـەك لـە

کۆمەڵگاکان، یان چەسپاندنی جۆرە عیبادەتێك، ئەگەر قەیرانەکە هەر ئەوە بوایە، ئەوە هەموو وڵاتێك لە هەموو سەردەمێك دا بەشی خۆی ئیصلاح خوازو مامۆستای چاکساز تێدایە ڕۆڵی خۆیان تێدا دەگێڕاو چارەسەری کێشەکەیان دەکرد! بەڵکوو قەضییەکە قەضییەی ڕیشە کێش کردن و لابردنی پۆخڵاواتی سەردەمی نەفامی و دیاردەی بتپەرستی وێرانکارو روخانی سەرتاسەری ئەخلاق و رەوشتی مرۆڤایەتی بوو.. کە ئەم نەخۆشیانە وێڕای کوشندەییان سەدان ساڵ بوو کەڵەکە بو بوون و وەکوو مۆرانەو خم خۆرکە جەستەی مرۆڤایەتییان داوەشاندبوو، هەموو پەیام و تەعلیماتی پێغەمبەرانی پێشوو هەموو هەوڵ و کۆششی ئیصلاح خوازان و مامۆستایانی داپۆشیبوو، بەڵێ قەضییەکە لابردنی ئەو خشت و خۆڵەکەڵەکە بووە لەمێژینەی سەدان ساڵەی ڕۆژگاری نەفامی بوو، لەشوێنی ئەو رابەستنی بینایەکی پان و بەرزو شکۆمەندو پتەوی وەها کەبەشی جیهان بکاو هەموو نەتەوەکان کۆبکاتەوەو لەخۆیان بگرێ، قەضییەکە قەضییەی دروستکردنی ئادەمیزادی تازە بوو، کەلە هەموو رویەکەوە لەئادەمیزادی کۆن جیابێ، ئادەمیزادێك تازە لەدایك بووبێ، یان تازە ژیانی تایبەتی دەست پێ کردبێ، ﴿أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾[25] قەضییەکە قەضییەی ریشە کێشکردنی میکروبی گەندەڵبون و داڕزان بوو، لەرەگەوە هەڵکێشانی دیاردەی بتەرپستی بوو بەجۆرێك شوێنەوارو دەنگ و ڕەنگی ئەو دیاردە قێزەونە نەمێنێ و لەشوێنی ئەو بتپەرستییە نەمامی بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی لەقوڵایی دڵەکان دا بڕوێنێ و گەشەی پێ بکا، مەیلی عیبادەت کردن بۆ خوداو وەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو زاتە پاکە لەدەرون دا

---

[25] سورة الأنعام/١٢٢.

بچەسپێنێ، حەزی خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و یارمەتیدانی حەق و راستی بکاتە ئاکارو رفتارو بەهیچ شێوەیەك وازی لێ نەهێنن و هەموو حەزو ئارەزویەکی تروە لابخەن، هەموو بەرگری و لەمپەرێك رامالن..

بەکورتی دەستی مرۆڤایەتی بگرێ و نەهێلێ چی تر بەرەو نەمان هەنگاو هەلێنێ، چی تر هێزو توانای خۆی چڕ نەکاتەوە بۆ بازدان و خۆ فرێدانە ناو دۆزەخی دونیاو قیامەت، بیانخاتە سەر رێبازێك سەرەتاکەی بەختەوەری بێ بۆ ئەوانەی خودا بەحەق دەناسن و بەراستی بەندایەتی بۆ دەکەن، سەرەنجامیش بەهەشتی رازاوەو ژیانی جاویدانی تێ یدا بۆ هەتا هەتایە ئەو بەهەشتەی خودا مزگێنی بە موسولمانان داوە کەلەو دونیا بیانخاتە ناوی.. بێگومان باشترین تەعبیرو وێنە کێشان بۆ ئەو حالەتەی ئادەمیزاد پێش هاتنی ئیسلام پێ یدا تێدەپەڕی و ئەو خۆشبەختی یەی پاش هاتنی ئەو ئایینە پیرۆزە بۆی فەراهەم بوو ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆزە کەدەفەرموێ: ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾[26].

لەراستی دا ئەو ئەرکەی پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی موحەمەد (دروودی خوای لەسەربێ) ئەنجامی داو ئەو گۆڕانکارییەی ئەو هێنایە ئاراوە بێ وێنە بووەو هەرگیزاو هەرگیز مێژووی مرۆڤایەتی کەسێکی تری بەخۆیەوە نەبینیوە وەکوو پێغەمبەری ئیسلام لێزان و چاکسازو سەرکەوتوو بووبێ لەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی، کەسی تریش بەئەندازەی ئەو بەرپرسیاریەتەکەی گەورەو مەزن نەبووە، کەس هێندەی ئەو بەری کۆشش و

---

[26] آل عمران /١٠٣.

هەوڵدانی بەپیت و بەرەکەت نەبوو ئەو دارەی ئەو رواندی درەختێکی بەرداری بێ وێنە بوو، ئەو تێکۆشانەی ئەو ئەنجامی دا ئاکامەکەی رەحمەتێك بوو هەموو جیهانی بەختەوەر کرد، بەراستی رەوانە کردنی حەزرەتی موحەممەد لەعەجایەب عەجایەب ترە لەموعجیزە موعجیزە ترە، تاقە روداوی مێژووە لەهەموو رویەکەوە نەدوبارە بۆتەوەو نەدووبارە دەبێتەوە. ئەمە راستی یەکە روناکبیرو هەستیاری فەرەنسی (لامارتین)[27] بەجەختەوە شایەتی بۆ دەداو بەویژدانەوە دەڵێ: (بێگومان هیچ ئادەمیزادێك خۆ بەخش بووبێ یان نا بەدرێژایی مێژوو نەیتوانیوە کارێکی ئاوا گەورە لەئەستۆ بگرێ و تێشی دا سەرکەوتووبێ، چونکە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە پیرۆزو گەورەیە لەژوور وزەی ئادەمیزاد دابوو، تەصەور نەدەکرا ئادەمیزادێك بتوانێ ئەو ئەرکە گرانە ئەنجام بدا، بێگومان پساندنی ئەو هەموو کۆت و زنجیرە، راماڵینی ئەو حەمکە لەمپەرو بەرگرییانە لەبیرو بۆ چوونی خەیاڵی و هیوای پرو پوچ کەببوونە رێگر لەنێوان ئادەمیزادو خودای بەدیهێنەری دا، هەروا دەستگرتنی ئادەمیزادو شارەزایی کردنی بۆ لای رێبازی حەق و ئایینی راست و چەسپاندنی بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی و بەندایەتیکردن بۆ خودا بەشێوەیەکی پاك و بێ گەردو عاقڵانە، لەنێو تەم و مژو تاریکی بتپەرستی دا کەسەر تاسەری جیهانی گرتبووەوە، هەدەفێکی پیرۆزو بەرز بوو..

---

[27] لامارتین (الفونس دی) (١٧٩٠-١٨٦٩ز) یەکێکە لەبەناوبانگترین شاعیرانی فەرەنساو رابەری بزوتنەوەی (روما نطیقی) یە گەشتی خۆر هەڵاتی کردوە ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم وڵاتەدا پەیدا کردوە لەکتێبە بە ناوبانگەکانی دو دیوانی شیعرن بەناوی (التأملات) و (جوسلین) کتێبێکیش کەبەخشانە بەناوی (الرحلة الى الشرق).

بێگومـان هـیچ ئادەمیزادێـك جگـە لەحـەزرەتی موحەممـەد ئـەرکی واقـورس و گـەورەو گرنگـی نەخراوەتـە ئەسـتۆو کەسـیش لـە ئەنجامـدانی ئـەرکی سەرشـانی خـۆی دا وەکـوو پێغەمبـەری ئیسلام سەرکەوتوو نـەبوە. لـەوەش سـەرنج راکـێش تـرو سـەر سـوڕ هێنـەر تـر ئەوەیـە: حـەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) بەو بانگەوازییە گشتگیرو جیهانیـەی هـەموو بت و خـودا دروزنـەو ئایینـەکان و بیرو بـۆ چونەکانی راتلەقانـدن و لـە گرێژەنـەی بـردن و دڵ و دەروونـەکانی هەژانـدن و لەخـەوی غەفڵـەت بەخەبـەری هێنـان و ئاسۆیەکی رون و ئاشکرای خێرو بێری بۆ هـەموو مرۆڤایـەتی دیـاری کرد. هەموو ئەم پەیامەشـی بەگوێرەی ئەو نامە ئاسمانییە ئەنجام دا: کەهـەموو رستەو وشەیەکی سەرچاوەیە بۆ یاساو قانونێك، بەرەهنومایی ئەو قورئانـە پـیرۆزە برایـەتی خـستە نێـوان تاکـە کـانی کۆمەڵـەوە، هـەموو بنەماڵـەو خێزانـەکانی کردنـە هـاو هەڵوێـست و هەمئاهـەنگ و یـەك مەبەسـت. کۆمەڵگایـەکی نموونـەیی پێـك هێنـا! کۆمەڵگایـەکی خـودا پەرستی بـەخۆ چـاراو، راسـت وێـژو حـەق ویـست و میانـە ڕەو لەهەمووشـتێك دا!!!! بـەڵێ: دیاردەیەکی هەرە دیاری ئەو نەتەوەیەی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) پێکی هێنا ئەوەبوو کە زۆر دژی بت و صەنەم و خودا درۆزنـەکان بـوون، زۆر خودا خۆشەویست و خۆبـەخت کـەربوون لـەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەنـدی ئـەودا، ئـەم خۆشەویـستی یـە یـان بـۆ خـودا وای لێ کـردوون کەهـەر کەسێك سوکایەتیەك ئاڕاستەی زاتی خودا بکا سزا دەدرێ و تۆڵـەی لێ دەسێننەوە، ئەم خۆشەویستی یـە یـان بۆ زاتـی خـودا بنـەمای هـەموو رەوشـتێکی بـەرزو پیرۆزە.

بێگومـان پابەنـد بـوونی سـێیەکی جیهـان بـۆ ئـەم بـیرو بـاوەڕە بەشـێکە لەبـەها پیرۆزەکـانی خـودی ئایینەکـە، سـەروەرییە کـە بـۆ کەسـایەتی

ڕەهبەرەکەی. بەڵکوو ڕاستر ئەوەیە بڵێین: پابەند بوونی ئەو حەمکە خەڵقە بەئاینی ئیسلامەوە موعجیزەی عەقڵو ئاوەزە موعجیزەی تاکە کەس نیە. بێگومان ڕاگەیاندنی بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی لەڕۆژگارێك دا: کەجیهان تێکڕا لەژێر باری نالەباری بتپەرستی دا دەینالاند بۆ خۆی موعجیزەیەکی سەربەخۆیە. ئەوەی جێگای سەرنجو تێرامانە ئەوەیە: هەر کە حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) ئەو بیرو باوەڕەی بەناو خەڵك دا بڵاو کردەوە، عیبادەتخانە کۆنەکان چۆڵ بونو عیبادەتکەرەکان چۆڵیان کردنو کەم کەسیان تێدا مان. نەبانگ خواز مایەوە نە وەڵامدەرەوە. سێیەکی جیهان کارەبای گەرمی ئیمان لێی دانو کەمەندکێش بوون بۆ ژێر چەتری یەکتا پەرستی.[28]

بێگومان ئەم گۆڕانکارییە سەرتاسەری بەی جیهانو ئەم ڕاپەرینو ژیانەوەو سەر هەڵدانەوەی ئادەمیزاد سەر لەنوێ پێویستی بەنامەیەکی تازەی ئاسمانیو پەیامێکی تری ئاسمانی بوو کە گەورەترین نامەو بەرنامە بێ، پێویستی بەپێغەمبەرێك هەبوو خودا ڕەوانەی بکا بۆ سەر ئادەمیزاد بەهیدایەتو ئایینێکی حەقو ڕاستەوە بۆ ئەوەی بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا بالا دەست بێو هەموانیان بسڕێتەوە، وەکوو پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ البينة. رسول من الله يتلو صحفا مطهرة. فيها كتب قيمة﴾ البينة/ ١-٢.

---

[28] لامارتین لەکتێبەکەی کە بەناوی Histoire de Lu Turguie ج/٢/٢٧٦-٢٧٧.

# پێش ڕەوانە کردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

## بارودۆخی نیوە دوورگەی عەرەب پێش ئیسلام

### پێناسەو دیاریکردنی سنووری نیوە دوورگەی عەرەب:

هیچ نیوە دوورگەیەك لەجیهان دا لەبارەی پان و پۆڕیو بەرفراوانی یەوە ناگاتە نیوە دوورگەی عەرەب، ئەو نیوە دوورگەیە گەورەترین جەزیرەیە لەجیهان دا، زانایانی عەرەبو جوغرافی زانان بەشێوەی مەجاز پێیان گوتووە (جەزیرەی عەرەب) ئەگینا کیشوەرێکە بۆ خۆی لەسێ لاوە ئاو دەوری داوە، هەرێمێکە لەباشوری خۆرئاوای ئاسیا هەڵکەوتووە، لەخۆر هەڵاتەوە سنوری لەکەنداوی فارسەوە دەست پێ دەکا، لەباشورەوە دەگاتە دەریا لوشی هیندی، لەسنووری خۆرئاواشیەوە دەگاتە کەنارەکانی دەریای سوور کەلە سەرچاوە عەرەبییە کۆنەکان دا بەدەریای قولزوم (بحر القلزم) ناوە زە د کراوە.

سنووری (باکور) یش هێڵێکی خەیاڵی مەزندە کراوە، لەزارەوەی زانا عەرەبەکان دا لەکەنداوی (العقبە) وە دەست پێ دەکا تا دەگاتە شوێنی تێ ڕژانی (شط العرب) لەکەنداوی فارسی.

زانا ئیسلامییەکان نیوە دوورگەی عەرەبیان کردوە بەپێنج بەش.

١- حیجاز: حیجاز لەبەندەری (أیلە) لەسەر دەریای سوور دەست پێ دەکا تا دەگاتە وڵاتی یەمەن. ناونراوە حیجاز، چونکە پێك هاتووە لەزنجیرە چیایەك وڵاتی توهامە لەوڵاتی نەجد جیا دەکاتەوە.

٢–توهامە: زەوییەکی دەشتایی تەنگەبەری نزمە کەوتۆتە قەراخی دەریای سوور. لەنیوە دوورگەی سیناوە لەباکورەوە بەقەراخی دەریای ناوبراودا درێژ دەبێتەوە تاله باشوورەوە دەگاتە دەوروبەری یەمەن، شاری (نەجران و مەککەو جیدەو صنعاو) ی لەخۆ گرتووە،

٣– ولآتی یەمەن

٤– ولآتی نەجد: ئەم هەرێمە بریتییە لەبانوێکی پان و پۆڕ، دەشتایی و کێوی تێدا هەڵکەوتوون.

٥– العروض: ئەم هەرێمە لەخۆر هەلآتەوە بەولآتی بەحرەینەوە لکاوە، لەخۆر ئاواوە بەحیجازەوە پەیوەستە، پێ ی دەگوترێ: (العروض)، چونکە کەوتۆتە نێوان ولآتی یەمەن و ولآتی نەجدەوە. ناوێکی تریشی هەیە کە (اليمامة) یە.

## سروشتی نیوە دوورگەی عەرەب و دانیشتوانەکەی:

بەشێوەیەکی گشتی سروشتی نیوە دوورگەی عەرەب شێوە صەحرایەو بەشێکی زۆری چۆڵەوانی یە، چونکە بەهۆی چەند هۆکارێکی سروشتی و روداوی جیۆلۆجی و بەهۆی مەوقیعی جوغرافی خودی دەڤەرەکە خۆیەوە هەر لەکۆنەوە تائێستا ژمارەی دانیشتوانی لەکەمی دابوەو کەثافەی دانیشتوانی بەخۆیەوە نەبینیوە، هەربۆیەشە لەو ولآتە پان و بەرینەدا کۆمەڵگای خاوەن شارەستانی و حکوومەتی و ئیمپراتۆرییەتی گەورە هەڵنەکەوتوون، ژیانی سارانشینی و دەمارگیری و وشك تەبیاتی عەرەبایەتی و تاکرەوی و خۆپەسەندی باڵی کێشابوو بەسەر دانیشتوانەکەی دا، هەندێ لەهۆزەکان شەڕیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، هێرشیان دەکردە سەر یەکترو ماڵ و سامانی یەکتریان تالآن و چەپاو دەکرد. لەبەر ئەو هۆیانەو گەر

هۆی تریش، دیاردەی شارەستانی و ژیار تەنها لەو ناوچانەدا بەدی دەکرا کەبارانی پێویستی لێ دەباری، یان کانی و کارێزاوی تێدا بوو، یان ئاوی ژێر زەوی لەبەرزی دابوو دەتوانرا بەهۆی بیر لێدانەوە سودی لێ وەربگیرێ، کەوابوو ژیان لەنیوە دوورگەی عەرەب پەیوەست بووە بەئاوەوە، لەهەر شوێنێك ئاوو لەوەڕگا بۆ ئاژەڵەکانیان هەبوایە خێڵەکان رویان تێ دەکرد. سروشت هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ رەو پێ کردنی خێڵە عەرەبەکان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. بۆیە هیچ کاتێ ئەو خێڵە عەرەبە کۆچەریانە وەکوو فەلاو وەرزێرەکانی دەڤەری دی پەیوەست نەبوون بەزەوییەکی تایبەتەوە، هەر ئەوەندە لەناوچەیەك جێگیر دەبوون کەئاوو لەوەڕی لێ هەبوایە، کەلە وەڕ تەواو ببوایەو ئاو کەم بوایەماڵو کۆچیان دەپێچایەوەو رەویان دەکرد بۆ ناوچەیەکی تر، بۆیە دەتوانین بڵێین ژیانیان زۆر زبرو سەخت بووە، کۆمەڵگایان لەچوار چێوەی هۆزو خێڵ دا خۆی نواندوە، لە دیدو روانگەی عەرەبی خێڵەکی و دەشتەکی یەوە خێڵ فەرمانڕەواو نەتەوەبوو، داب و نەرێتی هۆز قانون و یاسایەك بوو تاکەکانی کۆمەڵ پێوەی پابەند بون و لێیان لانەدەدا. ئەم جۆرە ژیانە (ژیانی سارانشینی و کۆچەرییە) ژیانێکی کولەمەرگی و پڕ جم و جۆڵ و نەسرەوتن بوو، تەنها دان پیانانی بۆ بالاّ دەستی و هێز بوو جگە لەزۆرو هێز، دانی بەهیچی تردا نەدەنا. ژیانێك بوو هەمیشە چورت و چەرمەسەری بۆ خێڵەکان دروست دەکردو دەبوونە مایەی کێشەو قەیران بۆ ئەو شارنشین و گوند نشینانەی جیرانیان بوون، هەمیشە ئەو خێڵانە خۆبە خۆو لەگەڵ جیرانە شارەستانییەکانیان دا لەشەڕو هەرا دابوون. پەلاماردان و تالاّن و بڕۆو کوشتن و بڕین دیاردەیەکی هەرە دیاری ئەو کۆمەڵگایە بوو.

وەلێ لەلایەکی ترەوە مرۆڤی عەرەبی خێڵەکی زۆر دلسۆزو پابەند بوو بەدابو نەریتی عەشایەریەوە، بەخشندەو میوان نەواز بوو، ئەرکی میوانداری بەرێكو پێکی ئەنجام دەدا، لەشەڕو هەرادا پابەندی هاوپەیمانی و سوێند خۆری دەبوون، هەروەکوو چۆن ئەرکی دۆستایەتی و برادەرایەتی بەو پەڕی دڵسۆزی یەوە بەگوێرەی دابو نەرێت جێ بەجێ دەکرد، شیعرو پەخشانو پەندو مەثەلیان گەواهی دەری ڕاستەقینەن لەسەر ئەو حاڵەتانەو مێژوویان پڕە لەم بەندو باوە.

بابای عەرەبی لەو کۆمەڵگایە ئارەزوی لەیەکسانی بوو، شەیدای ئازادی بوو، پیاوی جیدیو خاوەن هەڵوێست بوو، چەوساندنەوە لەناویان دا کەم بوو، کۆمەڵگایەکی پارێزگار بوو، کەسایەتی خۆی خۆش دەویست، شانازی دەکرد بەو شێوە ژیانەی هەی بوو، هەرچەندە ژیانێکی زبرو پڕ کوێرەوەریو کولە مەرگی بوو، ئەوانەی زۆر ڕۆچون لەبەداوەتو سارا نشینی دا بەدەگمەن نەبێ ئایینیان لاوازە، کەمیان هەیە جگە لەدابو نەریتی عەشایەر گەری خۆیان، بڕوایان بە هیچ ئاینێکی تر هەبێ، زۆر پابەندی ڕێو ڕەسمی باوكو باپیرانی خۆیانو حەزیان لەلاسایی کردنەوەی ئەوانە، نموونەی بەرزیان لەڕەوشت دا پیاوەتیو مروئەتە، لەشیعرو پەخشانیان دا زۆریان پێدا هەڵگوتووە.

## مەڵبەندەکانی شارەستانی و ژیار لەجزیرەدا:

لەو شوێنانەی ئاو هەبوو بێ، چ ئاوی باران یان ئاوی بیر، یان ئاوی کانیو کارێز، حەضارەتو ژیار دروست بووە، لەشێوەی گوندو شارۆچکەدا لەهەندێ شوێنیش دا بازاڕی وەرزانەیان کردونەوە، ئەم ژیارو شارەستانی یە کاریگەریەکی بەرچاوی هەبوە لەژیانی عەرەبەکان دا

بەگشتی، کۆمەڵگای وایان تێدا هەڵکەوت سروشتی تایبەتییان هەبوو کەسایەتی سەربەخۆیان هەبوو، سروشتی خاك و هەوا کاری تی کردبوون، شێوەی ئیش کردن و صەنعاتکارییان شێوەی ئەو ژیانەی لەو کۆمەڵگایەدا پەیرەوییان دەکرد کاریگەری خۆیان هەبوو لەسەر دانیشتوانی ئەو دەڤەرانە. لەمەککەدا کۆمەڵگایەکی تایبەتی هەبوو، داب و نەریتێکی تایبەت بەخۆیان هەبوو، هەروا دانیشتوانی (الحيرة)و یەثریب (مەدینە) تایبەتمەندی خۆیان هەبوو، کۆمەڵگای یەمەن لە دەوڵەمەندترین و پێشکەوتوترین کۆمەڵگای عەرەبەکان دەژمێردرا، چونکە بۆ خۆیان داب و نەریتێك و مۆرکێکی تایبەتییان هەبوو، خاوەنی مێژووی ژیار و شارەستانییەکی لە مێژینە بوون، ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لەپەیڕەو کردنی سیاسەتی تازەدا، بالا دەستییان هەبوو لەبەرهەم هێنانی بەرو بوومی کشت و کاڵی دا، لێزان بوون لەبەخێو کردنی ئاژەڵ و سود وەرگرتن لەکان و کانزاکانی وڵات دا، باڵەخانەو قەڵاو شورای زۆرو زەبەندەو سەرنج ڕاکێشیان ڕابەستن، ئامێری جۆراو جۆریان لەدەرەوەی وڵات هێناوە بۆ ئەوەی بەکاریان بهێنن لەبواری پیشەسازی و پێداویستی خۆیانی پێ دابین بکەن، بەزۆریش ئەو ئامێرانەیان لەعێراق و وڵاتی شام و وڵاتی ئەفەریقیاوە بردوە.

## چین و توێژەکانی عەرەب:

سەرگورشتە گێڕەوەکان و شارەزایانی مێژوو کۆڕایان هەیە، یان لەوانەیە رایان یەکدی گیر بێ لەسەر دابەشکردنی نەتەوەی عەرەب لەروی مێژووییەوە بۆ سێ تەبەقەو چین:-

١. عـەرەبی لـەناو چـوو، وەكـوو قـەومی عـادو قـەومی ثـەمـود كەئەمانـە ئاسەواریان نەماوە.

٢. عەرەبی عاریبەو بەڕەچەڵەك عەرەبی ئەصلو ڕەسەن.

٣. عەرەبی موستەعرەبە واتە ڕەچەڵەكیان تێكەڵاوی ڕەچەڵەكی تر بووە.

هـەروا زانایـانو ئـەهلی خەبـەرو هـەواڵ كۆڕایـان هەیـە یـان لەوانەیـە كۆڕایان هەبێ لەسەر ئەوەی كەلەروی نژادو رەچەڵەكەوە عەرەبەكان بكەنە دوو بەش .

أ. قەحطانیەكان، كەشوێنو نیشتمانی یەكەمیان وڵاتی یەمەن بووە.

ب. عەدنانییەكان: شوێنو مەكانی پێشوویانو وڵاتی حیجاز بووە.

ئەمجار زانایـانی رەچـەڵەكناس عەدنانییـەكان دەكەنـە دوو لقـی گـەورە، بەرەی رەبیعە، بەرەی (مضر)، هـەر لـە كۆنیشەوە لـەنێوان قـەحطـانییـەكانو عەدنانییەكان دا دژایەتیو كێ بڕكێیەكی لەمێژینـە هـەبوو، هـەروەكوو چۆن لـەنێوان بـەرەی رەبیعـەو بـەرەی مـوضـەردا دوژمنایەتیـەكی لەمێژینـەی كوشندە هەبوو، كەچـەند سـەدەیەكی دوورو درێـژی خایاند. لەلایـەكی تـرەوە مێـژوو نووسـان كـۆكن لەسـەر ئـەوە كـە قـەحطـانییـەكان بنچینەی عـەرەبنو عەدنانییەكان لەوان فێری زمانی عەرەبی بوون، نـەوەی ئیسماعیلیش دوای رەوكردنیـان بـۆ وولاتـی حیجـاز هـەر بـەزمانی عەدنانییـەكان ئاخاوتنیـان كردوە، حەزرەتی ئیسماعیل باپیرە گەورەی عەرەبە موستـەعرەبەكانە، واتـە: عەرەبە عەدنانییەكان...

مـەوضـوعی زانینـی نەسـەبو نـژاد لـەلای عـەرەب گرنگیـەكی تایبـەتی هەبوەو هەیە، رەنگە هیچ نەتەوەیەكی تر هێندەی عەرەب بایەخی بەو لایەنە نەدابێ، ئـەهلی خیـبرەو شـارەزایانی مێـژوو لەنەتـەوەكانی تـر گـەواهیـدەری

ئەم راستی یەن، ئەوەتا روستەم سپا سالاری لەشکری کاتێك بینی دانیشتوانی ئەنجومەنەکەی لەبەرروتی و شڕوڵی سوکایەتییان بەموغەیرەی کوڕی شوعبە کرد، کەنێر دراوی موسوڵمانانە کان بوو، پێ ی گوتن: قوڕ بەسەرتان، ئەوە بۆ وا بەناشیرینی پەلاماری ئەو میوانە عەرەبەتان داو سوکایەتییتان پێ کرد؟! عەرەب هەر دەستوریان وایە گرنگی بە پۆشاك نادەن، ئەوەی بەلایانەوە گرنگە پاراستنی نژادو رەچەڵەکە!

## یەکیەتی زمان!

بێگومان شتێکی چاوەڕوان نەکراو نیە بۆ وولاتێکی پان و پۆڕی وەکوو نیوە دوورگەی عەرەب کە لەڕاستی دا پانتایی یەکەی بەئەندازەی پانتایی نیمچە کیشوەرێکە، کەچەند زاراوەو شێوە ئاخاوتنێك بەکار بهێنن و بەچەند زمانێك قسە بکەن، چونکە وەکوو لەوە پێشیش ئاماژەمان پێ کرد کۆمەڵگای عەرەب پێك هاتبوو لەچەند هۆزێك ئەم هۆزانە هەریەکە بۆ خۆی پانتایی یەکی داگیر کردبوو تێ یدا دەهاتو دەچوو بەشوێن ئاوو لەوەڕدا دەگەڕا، ئەم هۆزانە دوور لەیەکتر ژیانیان بەسەر دەبرد، ڕێگای نێوانیان دوورو درێژ بوو، برێ هۆز لە باکوری جەزیرەو هەندێکیان لەباشور ژیاون زۆر بەکەمی پەیوەندییان بەیەکترەوە هەبوە، هەروا خێڵەکانی خۆر هەلات کەمتر لەگەڵ خێڵەکانی خۆر ئاوادا یەکتریان دیوە، زیاد لەوەش دەمارگیری خێلایەتی و بنەماڵەیی کەزۆر باو بووە لەناویان دا هەروا هەندێ هۆزی عەرەب جیرانی فارس و رۆم بوون ئەمانەش تا ئەندازەیەك بەزمانەکانی فارس و کوردو رۆم و نەتەوەکانی دی موتەئەثیر بوون، بۆیە زمانی ئەم خێڵە لەگەڵ زمانی خێڵێکی تر جوداواز بوو، ئەمەش دیاردەیەکی جیهانی یە، ئەوەتا لەناو ئەوروپای ناوەڕاست دا چەند زمانێك هەبوەو هەیە. لەنیمچە

کیشوەری هیندا بەچەند زمانێکی جیا جیاو زۆر ئاخاوتن دەکرێ، تەنانەت تائێستاش لەقانونو دستوری هیندستان دا (١٥) پانزە زمانی هەرێمی بەرەسمی دانی پیانراوە، هەر زمانێك لەو زمانانە زمانێکی سەربەخۆیەو کەم وا هەیە بەتەرجومان نەبێ دانیشتووی ئەم هەرێمە لەزمانی هەرێمێکی دی حالی ببن، بەڵکوو زۆر جار پێویستە زمانێکی بێگانەی وەکوو ئینگلیزی بەکار بێنن. وەلێ تایبەتمەندی جزیرەی عەرەبی لەوەدایە کەوێڕای پانو پۆڕیو بەرفراوانی روبەرەکەیو بلاّو بوونەوەی خێڵەکان بەناوی داو لێك دابرانو دووری خێڵەکان لەیەکتر یەکیەتی زمانیان هەبوە وەحدەی لوغەت وەکوو دەڵێن: دیاردەیەکی هەرە دیاری دانیشتوانی نیوە دوورگەی عەرەبی بووە، زمانی عەرەبی هەر لەکۆنەوەو ئێستاشی لەگەڵ دابێ ئامێری لێك تێگەیشتنو نیشانەی یەکیەتی دانیشتوانی نیوە دوورگەی عەرەبی بووە، سارا نشینو گوند نشینو شارەستانییان بەقەحطانیو عەدنانییانەوە بەهەموو تیرەو بەرەبابو هۆزو خێڵیانەوە بەزمانی عەرەبی قسە دەکەنو کردویانە هەرچەندە زاراوەکانیشیان لەم هەریم بۆ ئەو هەرێم جو داوازی تتێدا بووبێو ئەم لەهجە تا ئەو لەهجەیە فەرقی هەبووبێ، ئەمەش دیاردەیەکە سروشتی زمانو فەلسەفەکەی، سروشتی هەرێمەکانو بارودۆخەکەیان، تایبەتمەندی گۆشە گیری خێڵەکان هەندێکیان لەهەندێکیان فەرزی کردبوو، لەهەموو شوێنێك زمانەکان بەگوێرەی دورو نزیکی دانیشتوان لەیەکتریو تێکەلاّویو گۆشە گیرییان کەم تازۆر جودا وازی تێدە کەوێ!.

بێگومان یەکیەتی زمان کەتایبەتمەندییەکی هەرە دیاری دانیشتوانی ناو جزیرەی عەرەبی یە یەکێکە لەهەرە هۆکارە گرنگەکان بۆ ئاسانکاری بانگەوازی ئیسلامیو خێرا بلاّوبونەوەی بەناو ئەو دەقەرە پانو پۆڕو

بەرفراوانەدا. ئاڕاستە کردنی خیطابی ئیسلامی بۆ ئەو هەموو تیرەو هۆزانە بە یەك زمان کراوە کەزمانی عەرەبی یە، بەیەك نامەو بەرنامە بانگەوازی بۆ کراوە کەقورئانی پیرۆزە ئەویش بە زمانی عەرەبی یە.

## جزیرەی عەرەبی لەمێژووی نەتەوەو ئاییـنەکان دا:

شـوێنەوارە کۆنینـەکان‌و بەڵگەنامـەکان گـەوا هیـدەری ئـەوەن کـەوڵاتی عەرەب لەچاخە بەردینە کۆنەکان دا ئاوەدان بووەو ئادەمیزادی تێدا ژیاوە، کۆنترین بەڵگەیەك کەئێستا دۆزرابێتـەوە چەند شوێنەوارێکە لەشوێنەواری ئەو چاخە دێرینە ڕۆچوە لەکۆنی دا، کەبەشێکە لە چاخە سەرەتایی یـەکانی ڕۆژگـاری بـەردینی کـۆن، کەبەسـەردەمی Chllian دەناسـرێ. سـەرەتای ژیاری دەوری بەردینە (العصر الحجري) هـەروەها باسـی عەرەبەکان لەچەند شوێنێکی تـەورات دا هـاتووە کەباسـی پەیوەندییـەکانی عیبرانیـەکان لەگـەڵ عەرەبـەکان دا بـاس دەکـا. ئـەو بـاس‌و خواسـانەی لەتـەورات دا هـاتووە دەربـارەی عەرەبـەکان مێژووەکـەیان دەگەڕێتـەوە بۆ سالأنی نێوان (٧٥٠) و سەدەی دووەمی پێش زایین هەروەها لەتەلمودیش دا باسی عەرەب کراوە.

جۆسـنۆس فلافیـوس کـە لەسـاڵانی (٣٧-١٠٠ز)دا ژیـاوە زانیـاری بـەنرخی دەربـارەی عەرەبـەکان‌و نەبـەطییـە کـان نووسـیوە، هـەروا لـەو کتێبانـەی پـێش هـاتنی ئیـسلام بـەزمانی لاتینـی یۆنـانی نووسـراون- هەرچـەند زۆر هەڵـەیان تێدایـە- هـەواڵی مێـژوویی‌و جـوگرافی گرنگیـان دەربارەی هۆزە عەرەبەکان تێدا تۆمار کراوە، ئەگەر ئەو کتێبانە نەبوو نایە هیچ زانیارییەکمان دەربارەی زۆر لەو هۆزە عەرەبانە نەدەزانی.

خوێندنگای ئەسکەندەرییەکە گرنگترین مەڵبەندی زانیاری‌و زانست بوو پێش هاتنی ئیسلام بایەخێکی زۆری داوە بەکۆکردنەوەی هەواڵ‌و بەسەر

هات دەربارەی وڵاتی عەرەب و داب و نەریتی دانیشتوانی و بەرووبوومی وەبەرهاتوو لەودەڤەرە بۆ ئەوەی بیفرۆشن بە بازرگانەکانی دەریای سپی ناوەڕاست.

کۆنترین نووسەر لە نووسەرە یونانیەکانی باسی عەرەبیان کردوە (ئەخلیس ٥٢٥-٤٥٦ پێش زایین) و (هیرو دوتس٤٨٠-٤٢٥). هەروا کۆمەڵێك نووسەری تری یونانی هەن کەلەپورو نووسراوێکی زۆر یان بۆ بەجێ هێشتوین باسی عەرەب و وڵاتی عەرەبیان تێدایە، یەکێك لەو نووسەرانە (بطلیموس) ە کەلەسەدەی دووەمی زایینی دا لەئەسکەندەرییە ژیاوە، خاوەنی چەند کتێبێکە لەزانستی ریاضیات دا، یەکێك لەو کتێبانە کتێبی (المجسطي)یە.[29]

لەکتێبە سەرچاوە گرنگەکانی نەصرانی دا زانیارییەکی زۆر هەیە دەربارەی مێژووی عەرەب لەسەردەمی پێش ئیسلام و دوا ئیسلامیش دا، هەرچەندە زانیارییەکان تایبەتن بەوشتانەی پەیوەندییان بەنەصرانییەت و بلاو بوونەوەی و مەڵبەندەکانی بلاوبونەوەی ئایینی مەسیحەوە هەیە..

کەلە تەوارات دا باسی عەرەب دەکا، مەبەستی ئەعرابە، واتە: عەرەبە خێڵەکی و سارا نشینەکان، بۆیە هەر وەصف و نەعتێکیان لەتەورات داهاتووە دەق هی عەرەبە سارا نشینەکانەو بەسەر ئەوان دادەبڕێ. هەروا لەکتێبە یونانی و رومانی و لەئینجیلە کانیش دا کەباسی عەرەب دەکرێ مەبەست ئەعرابە، ئەم عەرەبە سارانشینانە کەهاو سنووری دوو ئیمپراتورییەتی رومان و یونان بوون هەمیشە خەریکی تاڵان و بڕۆو

---

[29] کونترین کتێبە لەزانیاری ئاسمان سوناسی دا، لەبەر گرنگی وەرگێڕ دراوەتە سەر زمانی عەرەبی، بەطلیموس دایناوە حونەینی کوری ئیسحاق لە زمانی یونانی یە کراوە یە بەعەرەبی.

جەردەیی چەتەیی بوون، کاروانیان رون دەکردن، باج و گومرگیان لەبازرگان و ڕێبواران دەستاند، دیدوروسی صەقەلی دەربارەی ئەو عەرەبانە دەڵێ: ئەوان شەیدای ئازادین و زەوی رادەخەن و ئاسمان بەخۆیان دا دەدەن، بڕوایان بەئیرادەی ئازادو ئازادی رەها هەیە، (هیردوتس) یش وەصفیات دەکاو دەڵێ: ئەوانە بەرەنگاری هەر هێزێك دەبنەوە کەبیەوێ بیانچەوسێنێتەوەو ئاغایەتییان بەسەرەوە بکا، ئازادی بەلای ئەو عەرەبانە گەورە ترین شیعارەو تایبەتمەندییە کە لەدیدی نووسەرە یونانی و لاتینیە یەکان دا عەرەبەکانی پێ لەکەسانی دی جیا دەکرێتەوە!!

هەروا پەیوەندی نێوان عەرەب و دانیشتوانی هیندو ناسیاری و شارەزاییان لەیەکتری و ئاڵ و گۆڕی بازرگانی و ڕۆشنبیری لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا بەهێزو کۆن و لەمێژینەیە، زۆر پێش هاتنی ئیسلام هەبوە، دەتوانین بڵێین: هیند ناسراو ترین وڵات بووە لەلای عەرەبەکان، لەروی جوگرافی و ئابورییەوە زۆر لێك نزیك بوون، سەرچاوە عەرەبی و هیندی و لێکۆڵینەوە تازەکان هەموویان کە واهیدەری ئەو راستیانەن!.[30]

## پەیوەندی وڵاتی نیوە دوورگەی عەرەب بەپێغەمبەرایەتی و ئایینە ئاسمانییەکانەوە:

جزیرەی عەرەب لانکەی زۆر پەیامی پێغەمبەرانەو ژمارەیەکی زۆری پێغەمبەر تێدا رەوانە کراون، ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتْ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (٢١) سورة الأحقاف.

---

[30] بۆ زێدە زانیاری سەیری کتێبی (الصلاة بين والهند) دانراوی سليمان نەدەوی بکە.

مەبەست بە (أخا عاد) حەزرەتی هودە، کە خودا کردی بەپێغەمبەرو ناردی بۆ سەر گەلی عاد، گەلی عاد بەقسەی مێژوو ناسان لە عەرەبە لەناو چووەکانن (عرب البائدة)، دانیشتوی (الأحقاف) بوون (احقاف) کۆی (حقف)ە حوقوفیش بریتییە لە لمبەلانی بەرز (تەپۆلکە لمب). گەلی عاد دانیشتوی چەند تەپۆلکەیەکی جیا جیا بوون لەباشوری جزیرە ئێستا ئەو دەڤەرە کەوتۆتە باشوری مەیلەو خۆرئاوا لەو ناوچەیەی پێی دەگوترێ (اربع الخالي) نزیك (حضر موت)، دەڤەرێکی چۆڵو هۆڵو بێ ئاوەدانی و وێرانە، کەلەوە پێش ولاتێکی پڕ بایەخ و دارستان و کانی و کانیاوو جۆگەو جۆبار بووە، دانیشتوانەکانی نەتەوەیەکی بەهێزو تواناو کەتەو بەشان و باهو بوون، بەقەومی عاد ناو زەد کراون، خودا بەرەشەبای زیدە ساردو بەهێزو تەوژم کەبووە هۆی زریان و بارینی بەردو زیخ بەسەریان دا لەناوی بردن و ئاسەواری بڕینەوەو کەسیان لێ دەرنەچوو. ئایەتەکە بەرونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کەحەزرەتی هود یەکەم پێغەمبەرو دوا پێغەمبەریش نەبوە کەخودا لەم ولاتەدا کردونی بەپێغەمبەرو رەوانەی کردون، بەڵکو پێش ئەو پێغەمبەری تر لەو ولاتەدا رەوانە کراون و دوا ئەویش پێغەمبەری تر هاتوون. ﴿وَقَدْ خَلَتْ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ (٢١) سورة الأحقاف﴾.

هەروەها حەزرەتی (صالح) پێغەمبەری گەلی ثەمود لەولاتی نیوە دوورگەی عەرەب دا کراوە بەپێغەمبەرو رەوانە کراوە بۆ سەر گەلی ثەمود. ئەم گەلە بەدبەختە دوا براوە، لەرۆژگاری خۆی دا لەناوچەی (حیجر) – کە دەکەوێتە نێوان حیجازو تەبوکەوە– نیشتەجێ بون، گوێ بیستی پەیامی پێغەمبەرەکەیان نەبوون و خودا سەر لەبەری لەناو بردن.

حەزرەتی (ئیسماعیل) یش لەمەککە پێگەیشتبووەو لەوێ ژیانی بەسەر بردوە لەوێش مردوە، ئەگەر ئەو ڕایە راست بێ کە دەگوترێ (مەدیەن) یش

لەچوار چێوە گشتی یەکەی دا داخلی (جزيرة العرب)ە ئەوە حەزرەتی (شعیب) یش کەخودا کردی بە پێغەمبەرو رەوانەی کرد بۆ سەر دانیشتوانی ئەو ولاتە، لەنەتەوەی عەرەب بووە. مەدیەن کەوتبوە قەراخ جزیرەی عەرەب لەسنووری شامەوە، ئیبنو کەثیر، (أبو الفداء) دەڵێ دانیشتوانی شاری مەدیەن لەنەتەوەی عەرەب بوون، مەدیەن شارە گوندێك بوو لەنزیك سەرزەوی معان لەقەراخی ولاتی شام کە هاو سنورە لەگەڵ ناوچەی حیجاز نزیك دەریاچەی قەومی لوط.[31]

ولاتی عەرەب بەگشتی و ولاتانی دەوروبەری لانەو مەڵبەندی زۆر لەپێغەمبەران و خاوەن پەیام و بانگەوازێکەران بوو، ئەو پێغەمبەرو خاوەن پەیامانەی لەولاتی خۆیان دا تەنگیان پێ هەڵچنراو لەلایەن دانیشتوانەکانەوە ئەزیەت دراون، بەناچاری زەوی نیشتمانیان جێ هێشتووەو ناچار پەنایان بردۆتە بەر ئەو ولاتو هەرێمانەی لەو پاشا بێ ویژدان و ستەمکارانە دوور بوون، ئەوەتا حەزرەتی ئیبراهیم بەناچاری هەڵهات و زێدو نیشتمانی خۆی جێ هێشت کەوتە ولاتی مەککەو دەوروبەری. حەزرەتی موسا میصری بەجێ هێشت روی لەشاری مەدیەن کرد!!! ئەمە جگە لەو ئایین و پەیامانەی لەزێدو مەڵبەندی خۆیان دا تووشی چورتم و چەوساندنەوە هاتن و بەناچاری هەڵگری ئەو ئایین و پەیامانە رویان کردۆتە ولاتی عەرەب و تێ یدا حەواونەوە، ئەوەتا ژمارەیەکی زۆر لەجولەکە کاتێك لەلایەن رومانەکانەوە توشی کێشەو چەوساندنەوە هاتن رەویان کرد بۆ وولاتی یەثریب و ولاتی یەمەن. نەصرانیەکانیش لەترسی قەیصەرەکانی رۆم پەنایان بردۆتە بەر ولاتی نەجران و تێ یدا نیشتە جێ بوون.

---

[31] قصص الأنبياء/ عبد الوهب النجار جـ ١ص٢٧٥.

## ئیسماعیل لەمەککەدا:

حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خوای لەسەربێ) لە وڵاتی عێراقی ئێستاوە بەرەو مەککەش کە بەڕێ کەوت، مەککەشکەوتۆتە نێوان چەند کێوو کەژێکی روتەن و رەقەن، شتێکی لێ نەبوو ئادەمیزاد پێ ی بژی، نەئاوی لێ بوو، نەزرعات و بەروبوومی کشت و کاڵی، نەبازاڕو بازرگانی نەپیشەو پیشە سازی.

حەزرەتی ئیبراهیم لەو سەفەرەی دا هاجەرەی خێزانی و ئیسماعیلی کوڕی لەگەڵدا بوو، لە ترسی بتپەرستان و لەرقی بتپەرستی هەڵهاتبوون، لەو ڕۆژگارە دا بتپەرستی سەرتاسەری جیهانی داگیر کردبوو، جیهان لەتاریکایی کوفرو بێدینی دا دەژیا، حەزرەتی ئیبراهیم دەیەوێت مەڵبەندێك دابمەزرێنێ بە راستی بەندایەتی خودای تێدا بکرێ، بانگەوازی تێدا بکرێ بۆ خودا پەرستی، ببێتە مەشخەڵانی هیدایەت و شوێنی گەڕانەوەی ئادەمیزادەکان بۆ لای خۆدا، خاڵی وەرچەرخان بێ بۆ بانگەوازی یەکتا پەرستی، بۆ ئایینی پاك و بێگەردو رەوشتی لێ بوردەیی و ژیانی ئازادو پڕ کامەرانی.

پەروەردگار بەفەضل و گەورەیی خۆی، ویستی حەزرەتی ئیبراهیمی هێنایەدی و هیجرەتی لێ قبوڵ کردو بەرەکەتی خستە ئەو شوێنەوە، ئاوی رەوانی بۆ ئەو خێزانە بچوکە دابین کرد، کەپێکهاتبوو لەدایك و فرزەند، حەزرەتی ئیبراهیم دایك و کورە بچکۆلەی لەو شوێنە دا: کە چۆڵ و کەس تێدا نەبوو دابڕاو لەجیهان بوو بەجێ هێشت، رۆیی بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی کەجیهادو بانگەوازی کردن بوو بۆ لای ئایینی خودا. پەروەردگار بیری زمزمی بۆ ئەو خێزانە خودا پەرستە هەڵقوڵاندو بەرەکەتی خستە ئەو ئاوەوە. هەڵبەتە ئەندازەیەکیش بژیویان پێ هەبوەو قنیاتیان پێ کردوە.

لەلایەکی ترەوە حەزرەتی ئیبراهیم سەرگەرمی جیهادو بانگەوازیکردن بوو، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر هاتوو چۆی دەکردو بەسەر خێڵ و تیرەکان دا دەگەڕاو بانگەوازی دەکردن بۆ یەکتا پەرستی و خودا ناسی. بەیناو بەینێکیش دەگەڕایەوە بۆ مەککەو چەند ڕۆژێك لەگەڵ خێزان و کوڕەکەی دا دەمایەوە، ئەمجار بەجێ ی دەهێشتنەوە.

ڕۆژگار هاتن و ڕۆیشتن، جگەر گۆشەی حەزرەتی ئیبراهیم، ئیسماعیلی کوڕی وردە وردە پێ گەیی، وای لێ هات بتوانێ لەگەڵ باوکی دا کار بکا، یارمەتی بدا، ئالەو کاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم لەخەودا فەرمانی پێ کرا: کە جگەر گۆشەکەی خۆی سەر ببڕێ، ئەویش بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەو کارەو بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار رازی خۆی لای ئیسماعیلی کوڕی درکاندو ناوەرۆکی خەونەکەی پێ ڕاگەیاند، حەزرەتی ئیسماعیل بەبێ چەندو چۆن ئامادە باشی خۆی بۆ ئەو ئەرکە دەربڕی، جا کەباوك و کوڕ هەردوکیان ملکەچی فەرمانی خودا بون و ویستیان بەفیعلی ئەرکەکە جێ بەجێ بکەن، خودای مەزن بەرانێکی گەورەو قەڵەوی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم نارد: کە بیکاتە قوربانی و لەجیاتی سەربڕینی ئیسماعیل بەرانەکە سەر ببڕێ! بۆ ئەوەی ئیسماعیل پێ بگاو هاریکاری باوکی بکا لەبنیاتنانی کەعبەو بانگەوازی کردن بۆ ڕێگای خودا ناسی و یەکتا پەرستی، هەروەهابۆ ئەوەی ببێتە باپیرە گەورەی دوا پێغەمبەرو گەورە ترین پێغەمبەر لەزنجیرەی پێغەمبەران دا، ببێتە باپیرە گەورەی نەتەوەیەك کەلە ڕۆژگاری داهاتوودا ئەرکی بانگەوازی بۆ خودا پەرستی و جیهاد لەپێناو یەکتا پەرستی دا لەئەستۆ بگرن.

جارێکی تر حەزرەتی ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ مەککە، لەگەڵ کوڕە لاوە خۆشەویستەکەی دا دەستیان کرد بەدروستکردنی بینای کەعبە، دوعاو

پاڕانەوەیان لە خودا ئەوە بوو، کەخودا دروستکردنی کابەیان لێ قبوڵ بکاو بەرەکەت بخاتە ئەو دەڤەرە، خۆیان لەسەر ئایینی پاکی ئیسلام بژین لەسەر ئەو ئایینەش بمرن، لەدوا خۆشیان وەچەو نەوەیان لەسەر ئایینی ئیسلام‌و ڕێبازی ئەوان ژیان بەسەر بەرن‌و بەمردنی ئەوان ئیسلام کۆتایی نەیە. لەخودا دەپاڕانەوە نەوەکانیان پابەندی ئایینی ئیسلام بن‌و باوەشی پێدا بکەن، بانگەوازی بۆ بکەن‌و لەهەموو شتێکیان خۆشتر بوێ، دوعایان دەکرد خودا ئەم بانگەوازی یەی ئەوان بەجیهان دا بڵاو بکاتەوە، لەخودا دەپاڕانەوە کەلەوەچەو نەوەی ئەوان خودا پێغەمبەرێك بنێرێ، ئایین‌و بانگەوازی حەزرەتی ئیبراهیم تازە بکاتەوە، ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم دایمەزراندوە ئەو تەواوی بکا، وەکوو قورئان دەفەرموێ ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ، رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ سورة البقرة/١٢٧-١٢٩.

حەزرەتی ئیبراهیم لەخودا پاڕایەوە کەکەعبە پایە داربێ، ئەم خانوە پیرۆزە هەمیشە شوێنی ئاسایش‌و دڵنەوایی بێ، دەپاڕایەوە خودا نەوەکانی بپارێزێ لەبتپەرستی، کەلە راستی دا حەزرەتی ئیبراهیم زۆری رق لەبت‌و بتپەرستی بوو هیچ شتێکی خراپی بەئەندازەی بتپەرستی نەدزاوە، زۆریش لەوە ترساوە نەوەکانی لەداهاتوودا مل لە بتپەرستی بنێن.. بۆیە دوعای کرد خودا لەو بەلا سامناکە بیانپارێزێ.

بێگومان حەزرەتی ئیبراهیم بەچاوی خۆی سەرەنجام‌و ئاکامی چەندین نەتەوەو خێزانی دیتبوو کەدوای لەدونیا دەرچوونی ئەو پێغەمبەرانەی بۆ سەریان رەوانە کرابوون‌و دوای ئەو هەوڵ تێکۆشانەی ئەو زاتانە ئەنجامیان

دا. چۆن ئەو گەل و نەتەوانە لەدوای کۆچکردنی پێغەمبەرە کانیان لەدونیا، بوونە شوێنکە وتەی شەیتانەکان و لەخشتە بەران و گومڕا کاران و دەجاڵەکان و ملیان لەبتپەرستی ناو بەکوفرو بێدینی و هاوەڵدانان بۆ خودا دونیای روناکیان خستە تاریکی یەوە و خۆشی و بەختەوەرییان لەهەموو ئاقارێك هەڵگرت. بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم زۆر دەترسا دوا کۆچکردنی لە دنیا، نەوەکانی روبکەنە بتپەرستی، هەمیشە بەسۆزەوە لەخودا دەپاڕایەوە کە نەوەو وەچەکانی لەو نەخۆشییە سامناکە بپارێزێ!

تەمەننای ئەوەی کرد کەمنداڵ و نەوەو وەچەکانی هەمیشە لەریزی خودا پەرستان دابن و لەورێبازە پیرۆزە لانەدەن و خۆبکەنە سەربازی فیداکاری ئایین و بانگەوازی بۆ بکەن.

چیرۆکی دژایەتیکردن بابەگەورەیان ئیبراهیم بۆ بتپەرستی لەناو خۆیان دا بۆ یەکتری بگێڕنەوە، سەر گوروشتەی ئاخاوتنی ئیبراهیم لەگەڵ باوکی داو دژایەتیکردنی بۆ رێبازی نالەباری نەتەوەکەی و شکاندنی بتی بتخانەی لەمێژینەیان و کۆچکردنی لەو وڵاتە، کەزێدو نیشتمانی بوو، دەستبەردار بوونی لەخزم و کەس و کارو ماڵ و سامانی لەپێناو رەزامەندی خودا دا بکەنە سەر مەشق و پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن. بیر لەوە بکەنەوە بۆ حەزرەتی ئیبراهیم کەزێدو نیشتمانی خۆی جێ هێشت ئەو دەڤەرە چەقەن و رەقەنەی هەڵبژارد بۆ خێزانەکەی؟ بۆچی زیاد لەشارە گەورەکان و ئەو شوێنانەی بەکەڵکی کشت و کاڵ و بازرگانی دەهاتن و هۆیەکانی ژیان و گوزەرانیان تێدا دەستەبەر دەبوو، ئەو ناوچە شاخ و داخ و بێ ئاوو ئاوەدانییەی هەڵبژارد؟ ئەو شوێنە چۆڵ و بێ ئاوو ئاوەدانی یەی هەڵبژاردو داوای لەخودا کرد کەقەورەبووی ئەو کەم و کورپیانەی ئەو شوێنە بکاتەوزە بەوە دڵی کەسانی دی کێش بکا بۆ ئەوەی بێن و تێ یدا نیشتەجێ بن،

خێرو بەرەکەتی بڕژێتە ناوو ئاوەدانی تێ بکەوێ و بازاڕو بازرگانی تێدا پەیدا بێ، لەهەموو لایەکەوە بەروبوم و رزق و ڕۆژی بۆ کێش بکرێ. هەموو کاتێ هەموو میوەو بەروبوومێکی تێدا دەست بکەوێ. وەکوو لەم بارەوە قورئان ئاماژە دەکاو دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ، رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ، رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾سورة إبراهيم/٣٥-٣٧.

## هۆزی قورەیش:

نزاو پاڕانەوەکانی حەزرەتی ئیبراهیم گیرا بوون، پەروەردگار بەرەکەتی خستە وەچەو نەوەی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسماعیل، خێزانی ئیبراهیم زۆر بوو، پەل و پۆی کرد، ئیسماعیلەوە لەخێڵی جورهوم کەلە عەرەبی عاریبە بون ژنی خواست و بوو بە زاوایان خودا بەرەکەتی خستە ناو نەوەی ئیسماعیلەوە هەتا پیاوێکی تێدا هەڵکەوت بەناوی (عەدنان)و وەچەو نەوەی لێ کەوتنەوە.

عەرەبە عەدنانییەکان لەهەموو بەرەکانی تر زیاتر پارێزگاری نەسەبی خۆیان کردووە ریشەو نژادیان راست و بێ هەڵەیە. نەوەی عەدنان زۆر بوون، هەتا لەناو یان دا (مەعەد) هەڵکەوت لەنەوەی (مەعەد) پیاوێك هەڵکەوت بەناوی (مضر) لەنەوەی ئەمیش (فیهری کوڕی مالیك) ناوبانگی دەرکرد، لەم زاتەوە چەند نەتەوەیەك کەوتەوە ناویان ناقورەیش، هەموو عەرەبەکان تێکڕا دانیان نا بە بەرزیی و خاوێنی نژادی هۆزی قورەیش، بەگەورەیی و رێزداری و زمانپاراوی و قسەزانی و لێزانی لەگەیاندنی

مەبەست و رەوشت جوانی و ئازایەتی و مەردایەتی و جوانمەردی دا، دەستەبەر بونی ئەم رەوشتانە بۆ هۆزی قورەیش کۆڕای لەسەرەو کەس بەرهەڵستی نەکردوە.

## قوصەی کوڕی کیلاب و وەچە و نەوەکانی:

لەوەچەی فیهری کوڕی مالیك قوصەی کوڕی کیلاب پەیدا بوو، وەکوو لەمێژوودا باسکراوە کاروباری شاری مەککە لەکۆنەوە بەدەست هۆزی جورهومەوە بوو، دوایی هۆزی خوزاعە بالاّ دەست بون و کاروباری مەککەیان لەئەستۆ گرت و زێوانی و سەرپەرشتیاری کەعبە لەوان بوو، دوایی کە قوصەی پێ گەیی و ناوو شۆرەتی بلاّو بۆوە. زێوانی کابە درا بەئەو، قورەیش هەموویان پاڵیان بەئەو داو پشتگیرییان لێ کردو سەرەنجام توانییان خێڵی خوزاعە لەمەککە وەدەرنێن، ئیتر بەتەواوی کاروباری شاری مەککە بەگشتی و هی کەعبە بەتایبەتی خرایە ئەستۆی قوصەی و هەموو قورەیشی یەکان بەدڵ و بەگیان گوێ بیستی فەرمان و بڕیارەکانی بوون، کارو باری کەعبەی پێ سپێر درا، کلیلەکانی کەعبە درایە دەست ئەو، هیچ کەس بەبێ ئیزنی قوصەی بۆی نەبوو بچێتە ناو کەعبەوە، هەروا سەروکاری کردنی بیری زمزم و (الرفادة) واتە: نان دروستکردن بۆ حاجیان و سەرپەرشتی کردنی هۆڵی ڕاوێژو بیرو ڕاگۆڕینەوە (دار الندوة)، هەروا بڕیاردان دەربارەی شەڕو ئاشتی و جۆری ئالاّ، ئەم شتانە هەموویان خرانە ئەستۆی قوصەی و هەموو شەرەفمەندییەکی تێدا کۆبوەوە.

لەکوڕانی قوصەی دا (عبد مناف) هەڵکەوت، دوا ئەویش هاشم کەکوڕە گەورەی (عبد مناف) بوو بوو بەریش سپی قورەیش و کاروباری بیری زمزم و دابەشکردنی ئاو بەسەر حاجیان کەپێ ی دەگوترێ (الرفادة) گرتە دەست و

بەرێك و پێكی بەرێوەی بردن، هاشم باوكی (عبدالمطلب)ە كەباپیری پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ) (عبد المطلب) لەدوای موطەلیبی مامی كە كوری (عبد مناف) بوو كاروباری (السقاية) و (الرفادة)ی لەئەستۆ گرت، لەناو قورەیشییەكان رێزو حورمەتێكی بێ پایانی پەیدا كرد، بەجۆرێك هیچ كەس لەباوك و باپیرانی خۆی ئەم رێزدارییەیان نەبوە، زۆر خۆشەویست و قسە رۆییشتو بوو.

## نەوەی هاشم (بنو هاشم):

نەوەی هاشم لەناو قورەیشی یەكان دا وەكوو پەتی تەسبیح وابوون هەموویانیان بەیەكەوە بەستبوەوە. ئەگەر سەیری لاپەرەكانی مێژوو بكەین و بەسەر هات و ژینامەی ئەوان لەكتێبە مێژوویی و بایو غرافییەكان دا بخوێنینەوە --هەرچەندە كەمێكیشە لەزۆرو قەترە بەدەریایە- بەڵگەی زۆرمان لەسەر جوانخاصی و مەردایەتی ئەوان دەست دەكەوێ، بۆمان دەردەكەوێ ئەوانە چەند رەوشتی بەرزی مرۆڤایەتی و عەدالەتخوازی عاقڵمەندییان تێدا بووە، دەزانین چەندە رێزی كەعبەیان گرتووە، چەند حەقخوازو دژی ستەمكاری بوون، چەند خاوەن ورەی بەرزو بەزەیی هاتنەوە بەلێقەومان دا بوون، چەند سەخی تەبیعەت و دەست و دڵ فراوان و ئازاو چاو نەترس بوون، هەر مانایەكی باش و پەسەند كە وشەی (فروسیەت) لەزاراوەی عەرەبی دا بیگرێتەوە لەوان دا بەو پەری چری و پری و قوڵی رەنگی دابوەوە، شیاوی ئەوە بوون ببنە باپیرە گەورەی پێغەمبەرو ئەو زاتە پیرۆزەیان تێدا هەڵبكەوێ، هەڵس و كەوت و داب و نەریتیان بگونجێ لەگەڵ ئەو بەها مرۆڤایەتیانەی پێغەمبەر بانگەوازی بۆ دەكردن. وەڵێ ئەوان

کەوتبوونە سەردەمی فیترەت و زۆر لەڕۆژگاری پێغەمبەرانی پێشوو دوور کەوتبوونەوە، ئایینەکان هێندەیان گۆڕانکاری تێدا کرابوو هیچیان بەسەر هیچەوە نەمابوو لەبەر ئەوە بەچاو لێ کەری و موسایەرە لەگەڵ عەرەبەکانی تردا بیرو باوەڕی سەردەمی نەفامییان وەرگرتبوو، هەندێ جۆر لەعیبادەت و بتپەرستی نەتەوەکەیان پەیڕەو دەکرد.

## بتپەرستی لەمەککەدا، کەی پەیدابوو لەکوێوە هات!!

وەکوو مێژوو بۆمانی دەگێڕێتەوە، قورەیشی یەکان دەستبەرداری ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم نەبون و بەردەوام بوون لەسەر پەیڕەوی کردنی ئایینی پیرۆزی ئیبراهیم و ئیسماعیلی باپیریان یەکتا پەرست بوون، عیبادەتیان هەر بۆ خودا دەکردو کەسی تریان بەهاوەڵی خودا نەدەزانی. هەتا رۆژگاری عەمری کوڕی لوحەی (الخزاعي) هاتە پێشەوە، ئەو یەکەم کەس بوو، ئایینی حەزرەتی ئیسماعیلی گۆڕی، بتی دانان و بتپەرستی داهێنا، هەندێ داب و نەریتی رێز لێنانی بۆ ئاژەڵ و بەتایبەتی بۆ حوشتر داهێنا، یاسای بوحەیرە و سائیبە و حەرامکردنی سەر بڕین و خواردنی گۆشتی هەندێ حوشتری داهێنا. داب و نەریتێکی بۆ قورەیشی یەکان داهێنا نەخودا ئیزنی پێ دابوو نەلەشەریعەت و ئایینی ئیبراهیم دا هەبوو، ئەوە بوو لەکاتی خۆی دا ئەو بەد بەختە لەمەککەوە چوو بۆ وولاتی شام، لەوێ دیتی دانیشتوانەکەی بتپەرستی دەکەن، کارە کەیانی بەدڵ دا چوو، هەندێ بتی لەگەڵ خۆی هێنان بۆ مەککەو لەشوێنی تایبەتی دا دانان و

فەرمانی بەدانیشتوانی مەککە کرد پەرستشیان بۆ بکەن‌و ڕێز یان لێ بگرن، ئیتر لەمەککەدا بتپەرستی سەری هەڵدا.[32]

ئەمەش شتێکی سەیر نەبوو چونکە عەمری کوڕی لوحەی لەسەفەری چونیدا بۆ شام بە شاری (بەترا) دا ڕۆیشتوە مێژوو نووسان‌و جوغرافی زانانی کۆن بە (بطراء)یان (بطرة) خوێندو یانەتەوە، ئێستا ئەو شارە دەکەوێتە جنووبی ولاتی ئەردەنی ئێستاوە، لەکاتی خۆی دا لەلای یونانیەکان‌و ڕۆمانەکان بەشارو چکەیەکی عەرەب ناوی دەرکردبوو، هەندێك دەڵێن: ئەو شاروچکەیە پێش هەزاران ساڵ ئەنباطەکان بنیاتیان ناوە، ئەوانیش لەریشەو نژادی عەرەبن.

دانیشتوانی ئەم شاروچکەیە لەپیشەسازی‌و شارەستانیەت دا، گەییشتبوونە ئاستێکی بەرز. شاعیرو پزیشك‌و بازرگانی گەورە یان تێدا هەڵکەوتووە، گەشتی ولاتی میصرو شام‌و (وادي الفرات) عیراقی ئێستاو ڕۆمایان کردوە، وێ دەچێ کەهاتوون بۆ ولاتی عیراق بە حیجازدا هاتبن، جا ئەهلی ئەم شارە لە بتپەرستی دا زۆر ڕۆچوبون، بۆ خۆیان دارو بەردیان دەتاشی‌و عیبادەتیان بۆ دەکردن، دەڵێن (اللات) کە یەکێکە لەبتەگەورەکانی عەرەب‌و دانیشتوانی باکوری حیجاز دەیانپەرست، کاتی خۆی لەشاری

---

(32) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو روداوو دیاردانەی کە لەشەوی میعراج دا بینی بوونی باسی عەمری کوڕی لوحەی دەکا: کەچۆن لەدۆزەخ دا سزا دەدرا دەفەرموێ: (رأيت عمرو بن عامر الخزاعي يجر قصبه في النار، كان أول من سيب السوائب) رواه البخاری ومسلم وأحمد. لەحەد یسێکی تردا موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ریوایەتی کردوەی، هاتووە دەڵێ: (أنه كان أول من غير دين اسماعيل، فنصب الأوثان وبحر البحيرة وسيب السائبة ووصل الوصيلة وحمى الحامي)، سەیری سیرەی ئیبنو کەثیر جـ١/٦٤-٦٥ بکە.

(بـەتڕاوە) هێنابوویـان‌و کردبوویانـە پەرسـتراوی سـەرەکییان، ئـەوەی پشتگیری ئـەم بـۆ چوونە دەکا، ئەو زانیارییەکە لـەکتێبی (تـأريخ سـوريا) دانراوی فیلیب حتی کە دەربارەی ناوچەی نەبەطییەکان (واتـە خـۆر هـەڵاتی ئـەردەنی ئێستا) دەدوێ تـێ یـدا هـاتووە دەڵـێ: سـەرۆکی خوداکـانی ئـەو دەڤەرە (ذو الشرا) بوو، دەق دەشوبهایە کۆڵەکە یەکی موستەطیل یان بـەردە رەشێکی چوار گۆشە، (اللات) یش خوای تایبەتی عەرەبەکان بوو پەیوەندی بـە (ذو الـشرا) وە هـەبوو، بڕێکـی تـر لـەخودا وەنـدەکانی نەبـەطییـەکـان ئەوانەی ناویان لەنووسراوە دێرینەکان داهاتووە بتی (مناه) و بتـی (العـزى) یە، ناوی بتی (هوبەل)یش لەو نووسراوانەدا هاتوە،.

ئـەوەشمان لـەیاد نەچـێ ئـەو سـەردەمانە سـەردەمی بـڵاو بوونـەوەی دیاردەی بتپەرستی بووە لەدەورو بـەری نیـوە دوورگـەی عـەرەب، بەتایبـەتی لـەو وولاّتانـەی کەوتۆنـە حـەوزی دەریـای ناوەڕاسـتەوە. ئـەو کاتـە هێـشتا پـەیامی حـەزرەتی عیـسا پەیـدا نـەبوو بـوو، کەحـەزرەتی عیـسا پەیـدا بـوو خـۆی‌و حەوارییـەکانی دەسـتیان کـرد بەبڵاوکردنـەوەی پـەیامی خـوداو بانگەوازییان کرد بۆ یـەکتا پەرستی، دیـاردەی بتپەرستی لاواز بوو، گـوڕو تینی لەوەپێشی نەما، لەو سەردەمەدا ئایینی جولەکە هـەبوو، بـەڵام وەکـوو لەپێشەوە ئامارژەمان بۆ کرد دینی یەهودی دینێکی بنەماڵەیی‌و سولاّلی بوو، تایبـەت بـوو بەنەتـەوەی بەنوئیـسرائیلی یـەوە، تـەنها بانگـەوازی ئـەو نەتەوەیەی دەکرد بۆ یەکتا پەرستی.

ئەوەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەو بۆ چوونە، ئەو زانیارییەیە کەلـە کتێبـی (العـرب قبـل محمـد) دانـراوی DeLacg دا هـاتوە دەڵـێ: لەراسـتی دوور ناکەوینەوە ئەگەر بگوترێ: پەرستش کردن بۆ پەیکەرە داتاشراوەکان خێرو بیری سوریایە بۆ وڵاتـی جەزیرە یـان نـارد، دیـاردەی بتپەرستی لەشامەوە

تەنیویەتیەوە بۆ وڵاتی (جزیرة)، ئەمەش بەهۆی لاسایی کردنەوەی شامیەکان بۆ یونانیەکان کەلە سوریادا بەزەقی دەبینرا، بەڵکوو دەتوانین بڵێین لەهیچ شوێنێکی تری وڵاتی عەرەب ئەو دیاردەیەی لاسایی کردنەوە نەبینراوە وەکوو لەسوریادا بینراوە. هەروەها بتپەرستی لەدۆڵی فورات (عێراق) و خۆر هەلاتی نیوە دوورگەی عەرەبی دا بلاو بو بووەوە، لەنێوان دانیشتوانی جەزیرەو وڵاتی عیراق و خۆر هەڵاتی جەزیرە دا پەیوەندی بازرگانی و پەیوەندی دۆستایەتی هەبوو، کەوابێ بەدوور نازاندرێ کەوڵاتی عیراق رۆلێکی کاریگەری هەبوو بێ لەبلاوبوونەوەی بتپەرستی لەوڵاتی جەزیرەدا، ئەوەتا (Georges Roux) لەکتێبەکەی بەناوی (العراق القدیم) دا دەڵێ: نووسراوە کۆنینەکان لەوڵاتی عیراق دا ئاماژە بەوە دەکەن: کەبتپەرستی لەو وڵاتەدا لەسەدەی سێیەمی زایینی دا بەر بلاو بووە، بەڵکوو ئەو دەقەرە مەڵبەندی خودا وەندەکان بووە هەندێکیان خوداوەندی خۆماڵی بوون و هەندێکیان لەدەرەوەی وڵات دا راهێنرابوون!

هەندێ لەمێژوو نووسان پێیان وایە بتپەرستی وردە وردە لەناو قورەیشی یەکان دا پەیدا بووە، دیاردەکە خۆماڵی بووە لەدەرەوە نەهێنراوە، ئەوان سەرەتا رێزی بەردە رەشەی کەعبەیان گرتووە، کەلەمەککە دەچوونەدەر لەگەڵ خۆیان دەیان برد بەمەبەستی پارێزگاری کردنی لەفەوتان و رێز گرتن لەحەرەم، هەتا وایان لێ هات رێز گرتنەکەیان لەبەردی حەرەم بوو بەعیبادەت و هەربەردێکی کەعبە سەرنجی رابکێشانایە دەیانپەرست، چەند عەیامێك بەسەر ئەم حاڵە یان دا تێپەری و وەچەو نەوەی تریان پێگەیشتن رابردوی خۆیانیان لەبیر چۆوەو وردە وردە دەستیان کرد بەپەرستنی بت و صەنەم و سەرەنجام کەم تاکورتێکیان نەبێ

ئـەوانی تریـان وەکـوو نەتـەوەکانی تـر ملیـان لەبتپەرسـتی نـاو دیـاردەی بتپەرستی سەرانسەری وڵاتی نیوە دورگەی عەرەبی گرتەوە.

بـەڵام وێڕای ئـەو دیـاردە بـەر بڵاوو گـشتگیرییە هەنـدێ لـە عەرەبـەکان لەهەنـدێ شـت دا لەسـەر ئـاینی حـەزرەتی ئیـبراهیم مابوونـەوەو دژی بتپەرستی بوون، ڕێزی کەعبەیان دەگرت و ساڵانەحەج و عومرەیـان ئـەنجام دەدا، تەوافی کەعبەیان دەکرد!

بێگومـان مێـژووی نەتـەوەکان و ئاینـەکان دەربـارەی گواسـتنەوەیان لەحاڵەتێکـەوە بـۆ حاڵـەتێکی تـر، لـە هۆکـارە کانـەوە بـۆ سـەرەنجام و ئامانجـەکان، لەپێشەکی و بەرکوڵـەوە بـۆ نەتیجـەو مەبەسـت، پـشتگیری بـۆ چـونی ئەوانـە دەکـەن کـەدەربارەی پەیـدابوونی دیـاردەی بتپەرسـتی لـەناو عـەرەب دا بەگـشتی و لـەناو قـورەیش دا بەتایبـەتی، هەنـدێ بەڵگـەیان ڕانواندون، هەروا مێژووی بڕی لەنەتەوە ئیسلامییەکان و گروپەکانیان کەبە تەدریج ملیان لەوێنە پەرستی و گۆڕ پەرستی و سوڕانەوە بەدەوری قسن و ئارامگـای پیـاو چاکان داو زێـدەڕەوی لـەرێز لێ گـرتن و تەقـدیس کردنیـان، ئەمانـە هـەموو گـەواهی ئـەوە دەدەن کەبتپەرسـتی لـەناو عەرەبـەکان دا بەتـەدریج پەیـدا بـووە، هـەر بۆیـە شـەریعەتی ئیسلامی بەجەختـەوە هـەوڵی ئەوەی داوەو دەدا کەهەموو ئەو هۆکارو ڕێچکانە بگرێ کەسـەر دەکێشن بۆ هاوەڵـدانان بـۆ خـوداو و زێـدە ڕەوی لـەرێز گرتنـی بـڕێ کەسـایەتی و گـۆڕو ئارامگاو شتی تر. ئیسلام بۆ ئەوەی ڕێ لەشیرك و هاوەڵدانان بگرێ، هاتووە هەموو ئەو ڕێبازانەی گرتوون کەلەئاکام دا سەردەکێشن بۆ ئـەو کـارە دزێـوە قێزەونە!.

## روداوی فیل:

روداوی فیل روداوێك بوو وێنەی لەمێژووی عەرەب دا پەیدا نەبو بوو، هێندە روداوێکی گەورەو مەزن بوو سەرنجی جیهانی ئەو سەردەمەی راکێشاو بەڵگەیەکی بەهێز بوو لەسەر پەیدا بوونی روداوێکی گەورە تر، ئاماژەی ئەوەی تێدا بوو: کەپەروەردگار خێرو بەرەکەتی بۆ عەرەب دەویٌو ماڵی کەعبە رێزو شکۆمەندی یەکی هەیە هیچ قەصرو باڵەخانەیەکی تری جیهان ئەو رێزەی نیە، هیچ مەڵبەندێکی تری عیبادەتکردن ئەو شکۆمەندییەی پێ نەدراوە، رۆڵێکی تایبەتی دەدرێتێ لەمێژووی ئایینەکانو سەرەنجامی مرۆڤایەتی.

## بڕوای قورەیشییەکان بەرێزداری کەعبە لای خودا:

قورەیشییەکان کەعبەیان لەلا پیرۆز بوو بڕوایان وابوو ئەو خانوە لای خودا رێزی تایبەتی هەیە، بۆ خۆی دەیپارێزێو سەرۆکاری دەکا. ئەم بیرو باوەڕەش بەرونی لەگفتو گۆی نێوان (عبدالمطلب) باپیری پێغەمبەرو (ئەبرەهە) پاشای حەبەشە دا خۆی دەنوێنێ، ئەوە بوو عەبدو لموطەلیب ریش سپیو سەرۆکی قورەیشو لێ پرسراوی کەعبە بوو، کەئەبرەهە هات بۆ روخاندنی کەعبەو گەیشتە دەوروبەری مەککە، وارێ کەوت سوپاکەی لە رێوە دوو سەد حوشتری عەبدولموطەلیبیان زەوت کرد، عەبدو لموطەلیب چو بۆ لای ئەبرەهە ئەبرەهە زۆری رێز لێ گرتو لەسەر تەختو سەریری خۆی دای نیشان ئەمجار وتی: ئیشەکەت چیە؟

(عبدالمطلب) وتی: ئیشەکەم ئەوەیە دوو سەد حوشترم لای ئێوە زەوت کراوە بمدەنەوە. کە ئەبرەهە گوێی لەوە بوو عەبدولموطەلیبی لەپێش چاو بچوك بووە، بەلایەوە سەیر بوو ئەو پیاوە کەخۆی بەگەورەی قورەیشو

خاوەنی کەعبە دەزانێ لەم کاتە چارەنووس سازەدا بێتە لای ئەبرەهە داوای دووسەد حوشتر بکاتەوە!!

بۆیە ئەبرەهە بە (عبدالمطلب)ی گوت ئەوە هەموو داخوازی یەکەت و هۆی هاتنت بۆ لای من بۆ دوو سەد حوشترەکەتە؟ هیچ باسی کەعبەت نەکرد کە رەمزی ئایینی خۆت و باوک و باپیرتەو من هاتوم بیڕوخێنم؟ من وام زانی هاتووی لەو بارەوە گفت و گۆم لەگەڵ بکەی!

(عبدالمطلب) وتی: من خاوەنی حوشترەکانی خۆمم و هەوڵیان بۆ دەدەم، کەعبە خاوەنی خۆی هەیە، خودا یەك هەیە دەیپارێزی، پێویست بەوە ناکا من واکۆکی لێ بکەم. ئەبرەهە وتی هیچ کەس نیە بتوانێ ڕێگەم لێ بگرێ و نەهێڵێ کەعبە وێران بکەم، عەبدو لموطەلیب وتی: ئەوە تۆو ئەوە کەعبەو ئەوە خودای کەعبە. دڵنیابە کەس ناتوانێ هێرشی بۆ بکا، کەس ناتوانی دەست درێژی بکاتە سەر.

وەکوو دەڵێن: ئەبرەهە فەرمانی کرد وشترەکانیان دایەوە بەعەبدو لموطەلیب. ئەبرەهە کار بەدەستی نەجاشی بوو لەسەر وڵاتی یەمەن نەجاشی پاشای حەبەشە بوو، چەند کار بەدەستێکی وەکوو ئەبرەهەی بەسەر وڵاتەکانی ژێر دەستی دا دانا بوو، ئەبرەهە ویستی سەرنجی عەرەبەکان بۆ لای خۆی رابکێشێ و لەشاری صەنعادا کەنیسەیەکی گەورەو بەرچاوی دروست کرد ناوی نا (القلیس)و ویستی وا بکا عەرەبەکان لەجیاتی حەجکردنی کەعبە، حەجی (قولەیس) بکەن، زۆری پێ ناخۆش بوو کەوا کەعبە لای عەرەبەکان ئەوەندە بەرێزەو ساڵانە حەجی بۆ دەکەن و لە هەر چوار لاوە لەدورو نزیك وە بۆی دێن.

کەنیسەکەی وارازاندەوە: کەعەرەبەکان واز لە چۆن بۆ زیارەتی کەعبە بێنن و بۆ حەجکردن ساڵانە بچن بۆ صەنعاو تەوافی کەنیسەی (قولەیس)

بکەن. ئەمەش لای قورەیشییەکان زۆر کارێکی قورس بوو، ئەوان خۆشەویستیان بۆ کەعبەو ڕێزگرتنیان لەماڵی خودا بەشیرەوە مژی بوو، رازی نەبوون کەعبە وەلابخریٚو شوێنی حەجکردن لەمەککەوە بگواسترێتەوە بۆ صەنعا، ئەم کێشەیە دەنگی دایەوەو عەرەبەکانی تەنگە تاو کرد، لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکیان دا باس باسی ئەو کێشەو قەیرانە بوو، ئیتر کابرایەکی عەرەب لە هۆزی کەنانە ڕۆیشت بۆ صەنعاو بەدزییەوە چووە ناو کەنیسەکەوەو تیٚ یدا ڕییاو خۆی خاڵی کردەوە، دوایی زاندرا ئەو کەسەی پیسایی لەکەنیسەکە دا کردوە کابرایەکی عەرەبی کەنانی بووە، ئیتر ئەبرەهە بەوە زۆر رقی هەڵساو سوێندی خوارد دەبیٚ لەشکر ڕێك بخاو بچیٚ کەعبە بڕوخێنیٚ.[33] ئیتر ئەبرەهە سوپایەکی گەورەی پێکەوە ناو تیپێکی لەفیل خستە پاڵ لەشکرەکەیەوەو بۆ خۆی سواری یەکیٚ لەفیلەکان بوو کەفیلێکی گەورەو بەناو بانگ بوو عەرەب ئەم هەواڵەیان بیستو وەکوو بومەلەرزە هەژاندنی، ترس و لەرز دایگرتن نەیانەزانی چی بکەن، ویستیان بەرگری بکەن و پێش بەسوپای ئەبرەهە بگرن، بەلاٌم بۆیان دەرکەوت کەزۆری سوپای ئەبرەهە لەوەدا نیە ئەمان بتوانن پێشی پیٚ بگرن، تەنانەت یەکیٚ لەگەورە پیاوانی عەرەب لەیەمەن دا کەناوی (ذونفر)

---

[33] وێدە چیٚ هۆی هێرش بردنی ئەبرەهە لەوە گەورەترو ستراتیجی تر بیٚ کەدەڵێن: پیسایی کردنی کابرای عەرەب بوو بەهۆی ئەوە ئەبرەهە بڕیاری روخاندنی کەعبەبدا. وێدە چیٚ مەبەستی ئەبرەهە ئەوە بووبی مەککە داگیر بکاو ولاٌتی یەمەن و شام بەیەکەوە ببەستێتەوە، قەڵەمڕەوی حکوومەتی نەصرانی فراوانتر بکا، ئەمەش لەبەرژەوەندی رۆم و حەبەشییەکان بوو: کەهەردوکیان نەصرانی بوون، وێدە چی رۆمەکان هانی ئەبرەهە یان دابیٚ بۆ داگیر کردنی مەککە، مەبەستی سیاسییان هەبوو‌بیٚ بریٚ لەو مەبەستەش لاواز کردنی نفوذی فارسەکان بوو لە (جەزیرە)دا : کەهەردوو لایان دووزلهێزی ئەو ڕۆژگارە بوون لەکیٚ برکیٚ ی یەکتری دابوون.

بوو وەخۆ کەوت و هانی عەرەبەکانی دا کەدژی سوپای ئەبرەهە بجەنگن و لەشکرێکی پێکەوە ناو ڕێگای بە ئەبرەهە گرت، بەلاّم زۆری نەبرد لەشکرەکەی شکاو خۆشی بەدیل گیرا، چەند تیرەو هۆزی تریش لێرەو لەوێ پێشیان بە سوپای ئەبرەهە گرت بەلاّم هیچیان بۆ نەکراو زۆر یشیان لێ کوژراو لێ بەدیل گیرا، سەرەنجام عەرەبەکان بەگشتی و قوڕەیشییەکان بەتایبەتی وازیان لەوە هێنا کەروبەڕوی سوپای ئەبرەهە ببنەوە، ئیشەکەیان حەواڵەی خودا کردو بڕوایان وابوو کەعبە خودایەکی هەیە دەیپارێزێ.

ئیتر قوڕەیشییەکان شاری مەککە یان چۆڵ کردو رویان کردە شیوو دۆڵی دەورو بەری مەککە، دەترسان سوپای ئەبرەهە زیانیان پێ بگەیەنێ، سوپای ئەبرەهە لەمەککە نزیك بووەوە، عەرەبەکانیش لەناو چیاو دۆڵەکانی دەوروبەری مەککە چاوەڕوان بوون پەروەردگار چی بەسەر ئەوانە دێنێ کەدەستدرێژی دەکەنە سەر ماڵی خودا، لەلایەکی ترەوە عەبدولموتەلیب و هەندێ لەقوڕەیشییەکان زیارەتی کابەیان کردو ئەڵقەی دەرگاکەیان راوە شاندو لەخودا پاڕانەوە کەئەبرەهەو سوپای تێك بشکێنێ!

ئەبرەهە بەخۆی و سوپا بێ ژمارەکەیەوە لەنزیك مەککە هەڵی داو ئامادە بوو بێتە ناو شارەوەو هەموو ئامادە باشی یەکی تێدا بوو بۆ ڕوخاندنی کەعبە، فیلە گەورەکە: کەناوی فیل مەحموود بوو ئامادەی کردبوو بۆ روخاندنی کەعبە.بەلاّم فیلی ناوبراو کەروەو شاری مەککەو کەعبە ئاڕاستەیان کرد، چۆکی داداو چەندێك لێیان داو لەگەڵی خەریك بوون روەو کەعبە نەکەوتە ڕۆیشتن، رویان بۆ لای یەمەن و بەرەو دواوە وەرگێڕا کەوتە رویشتن و گورگە لوقە، رویان لەکەعبە کردەوە دوبارە مانی گرت و چۆکی داداو نەڕۆیشت! سوپا بەهۆی مانگرتنی فیلەکەوە حەوق بوو، لەو کاتەدا سوپا چاوەڕوانی رویشتنی فیلەو پیاوانی ئەبرەهە لەبیری ئەوەدان

چارەسەرێك بۆ ئەو تەنگژە بدۆزنەوەو لەدەوروبەری فیلەکەدا دەهاتن‌و دەچوون، پەروەردگار لەدەریاوە باڵندەی پۆل پۆل‌و یەك لەدوایەکی بۆ سەر ناردن، هەموو باڵندەیەك چەند بەردو چیلکەیەکی هەڵگرتبوو، بەردە بارانی سوپاکەی ئەبرەهە یان کرد هەرکەسێك بەردو چلکەیەکی لەو بەردانە وێ بکەوتایە دەمرد، پیاوانی لەشکر کەدەستیان بەهەڵاتن کرد، هەموو ریبازێکیان بەرەو دواوە گرتە بەرو ویستیان خۆیان رزگار بکەن، بەڵام باڵندەکان بەسەریانەوە بون‌و لەکۆڵیان نەبوونەوە هەموویان بەهیلاك بردن، ئەبرەهە بۆ خۆشی بەو بەردەبارانە تووش بوو لاشەی داوەشا، پیاوەکانی ئەبرەهە لەکاتی گەڕانەوەو هەڵهاتن دا بەرەو صەنعا ویستیان هەرچۆنێك بێ ئەبرەهە بگەیەننەوە یەمەن، بەڵام ئەو دەردی کاریگەر بوو، لاشە چەپەڵەکەی بەرەبەرە دەڕزی‌و پەنجەکانی یەك لەدوا یەك هەڵدەوەرین، هەتا گەیاندیانەوە صەنعا لەوێ لەپێش گیان دەرچوونی دا سینگی لەت بوو، جەرگ‌و دڵی هاتنە دەرەوەو بە خراپترین شێوە گیانی پیسی دەرچوو!

بەم پێیە پەروەردگار ئەو سوپا گەورەو جەربەزەیەی لەناو بردو کەعبەی پیرۆزی لەدەستی ناپاکان پاراست.

ئەبرەهەو سوپاکەشی بوونە پەندی زەمانەو چوونە زبڵدانی مێژووە!!. قورئانی پیرۆز ئەم دا ستانەمان ئاوا بۆ دەگێرێتەوەو دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ، أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ، وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ، تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ، فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾.

## رووداوی فیل و کاریگەری و دەلالەتەکانی:

کەخودای باڵا دەست سوپای ئەبرەهەی بەو دەردە بردو نەیهێشت شاری مەککەو خودی کەعبە دەستی ناپاکانەی ئەبرەهەیان پێ بگا،

قورەیشییەکان هێندەی تر لەپێش چاوی عەرەبەکان رێز یان پەیدا کرد، بیرو باوەڕی ئەوەیان لا دروست بوو: کەقورەیش خۆشەویستی خوداو و خودا لەجیاتی ئەوان شەڕی لەگەڵ لەشکری ئەبرەهە کردو لەناوی بردن، هەروا رێزی کەعبەیان لەلا چەسپاو دڵنیا بوون لەوە کەعبە لای خودا رێزێکی تایبەتی هەیە!!

ئەمەش نیشانەیەك بوو لەخوداوەو ڕیخۆشکەرە بوو بۆ رەوانەکردنی پێغەمبەرێك کەخودا لەمەککەدا دەینێرێو کەعبە لەبت و بتپەرستی پاك دەکاتەوە، رێزو نرخی رابوردوویی و بەهاو شکۆی خۆی بۆ دەگێڕێتەوەو ئەو ئایینە پەیوەندییەکی قوڵو چڕو پڕی بەو خانە بەرێزەوە دەبێ.

هەروا ئەم روداوە گەواهیدەری ئەوە بوو کەڕەوانە کردنی ئەو پێغەمبەرە نزیك بۆتەوە!!

لەلایەکی ترەوە عەرەبەکان ئەم روداوەیان بەلاوە گرنگ بوو- لەواقیعیشدا تابڵێ ی گرنگ بوو - بۆیە کردیانە مێژوو، زۆر شتیان پێ مێژوودار کرد، دەیانگوت: ئەو روداوە لەساڵی فیل داروی داوە، فلانکەس ئەوەندە ساڵە پێش ساڵی فیل لەدایك بووە، فیسار پاش ساڵی فیل بەوەندە ساڵە مردوە...هتد ساڵی فیل تەصادوفی ساڵی (٥٧٠) ی زایینی دەکا، خودا تۆڵەی لەحەبەشییەکان ستاند، ئەوە بوو فەرمانڕەواییان لەیەمەن دا لەدەست چوو، جەزیرەی عەرەب هەمووی لەشوێنەواری دەسەڵاتی مەسیحی و ئیستعماری حەبەشییەکان رزگاری بوو، دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتی عەرەب (جەمال سرور) لەکتێبەکەی دا (قيام الدولة العربية) دەڵێ: بزوتنەوەیەکی نیشتمانی لەدەوڵەی (حیمیەر) دا سەری هەڵدا بۆ رزگار کردنی یەمەن لەدەسەڵاتی حەبەشییەکان، ئەوە بوو (سیف ذی یزن) داوای یارمەتی لەفارسەکان کرد، کیسرا "پاشای فارس" ساڵی ٥٧٥ی ز

سوپایەکی بەقیادەی وەهرەز نارده یارمەتی دانی (سیف ذی یزن) ئەم لەشکره توانی لەیەمەن دا حەبەشییەکان بشکێنێ.

## مەککە لەسەردەمی رەوانەکردنی پێغەمبەرو پەیدابوونی ئیسلام:

زۆر لەوانەی ئاگاداری بارودۆخی مەککە نین لە زۆر لەوانەی ئاگاداری بارودۆخی مەککە نین لە رۆژگاری پێش هاتنی ئیسلامو هەروا لەسەردەمی هاتنیشی دا، ئەوانە ئاگاداری رۆژگاری عەرەبو مێژوو شیعرو ئاستی رۆشنبیریو دابو نەریتو هەڵسو کەوتیان نینو نازانن ئاستی ژیارو ئەدەبو شیعری قورەیشی یەکان لە سەرو بەندی هاتنی ئیسلام دا چۆن بووە، پێیان وایە مەککە ئەو کاتە گوندێکی بچوك بووە، واگومان دەبەن ژیان لەوێ دا ئەوکاتانە لەروی عەقڵیو کۆمەڵایەتیو ژیاری یەوە لەقوناغی منداڵی دا بووە، بریتی بووە لەچەند کۆخو کەپرو رەشماڵو خانوە قورینە، ژیان تییان دا ژیانی خێوەت نشین بووە، لێرەو لەوێش تەویلەی حوشترو ئاغەڵی مەرو بزنو پشتیرو ئاخوڕی ئەسپو ماین لە قەراخی شیوو دۆڵەکانی دا بنیات نراون، دانیشتوانی بەژیانی کولە مەرگیو ژیانی زبرو چەرمە سەری رۆژگاریان بەسەربردوە، خواردنیان نانی بێ پێخور، یان گۆشتی نەکولاوو نەبرژاوی حوشتر بووە، پۆشاکیان زبر بوەو و لەخوریو کوڵکی حوشتر بەرهەمیان هێناوە، هیچ گوێیان بەوەنە داوە خواردنو خواردنەوەی بەتامو لەززەت بۆ خۆیان دابین بکەن، پۆشاکی جوانو رازاوە لەبەر بکەن، ژیانی نەرمو نۆڵیان بەخۆوە نەبینیوە هەست ناسكو خەیاڵ بەرفراوان نەبوون!!

بێگومـان ئـەم وێنـە کێشان و دیمـەن رانواندنـە بـەو شێوە پاشکەوتویی یـە، هەرگیزاو هەرگیز لەگەڵ واقیعی مێژوویی و ئەو نووسینە پەرت و بلاوانەی کە لەدوو توێی دیوانە شیعرو ئەدەبیەکانی جاهیلی دا کەدەربارەی وەصفی مەککە تۆمار کراون، یەك ناگرنەوە، ئەو حاڵ و وەزعەی دانیشتوانی مەککە بـەواقیعی تێیـدا ژیـاون لەناوەڕاسـتی سـەدەی شەشـەمی زایینـی دا، ئـەو عـادات و ئادابـەی ئـەوان پـەیڕەو یـان کـردوە، هـەروا زۆر لایـەنی تـری ژیـانی ئەوان کەلە سەرچاوەکانی مێژوودا ئاماژەیان پێ دەکرێ، هەموو ئەمانە ئەو راستییەمان لـەلا چڕ دەکەنـەوە کەکۆمـەڵگای مەککە لەسەرو بەندی هـاتنی ئیسلام دا لەقۆناغی وەرچەرخان دا بـوو. یـان بڵێین قۆناغێکی دورو درێژی بڕیبـوو بـەرەو ژیـارو شارەسـتانیەت، مەککـەش بـۆ خـۆی لـەو سـەردەمەدا گەورە شاربووە، ئەگینا لەگەڵ ئەو وەصفانەی کە قورئان بۆ مەککەی تۆمار کـردون یـەك ناگرنـەوە. ئـەو نـاوو صـیفەتانەی قورئـان بـۆ مەککـەی لـەخۆ گرتـوون شـیاوی گونـدی بـچوك و ژیـانی رەشمـاڵ نـشینی نیـە، بەڵکوو ئـەو ناووصیفەتانە هی شارێکی گەورەو خاوەن سشارستانیەتن. ئەوە تا قورئـان مەککـە بـە (أم القری) نـاو دەبـاو دەفەرموێ: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ، وَطُورِ سِينِينَ، وَهَذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ﴾ سورة التين/١-٣.

یان دەفەرموێ: ﴿لَا أُقْسِمُ بِهَذَا الْبَلَدِ، وَأَنتَ حِلٌّ بِهَذَا الْبَلَدِ. البلد (١-٢)﴾.

لەراسـتی دا مەککـە و دانیـشتوانی مەککـە لەهـەموو رویەکـەوە هـەر لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی زایینـی یـەوە لـەقۆناغی بـەداوەت و رەشمـاڵ نـشینی یـەوە گواسـتبوویەوە بـۆ قۆنـاغی شارەسـتانییەت، هەرچـەندە شارستانییەتەکە سنوور دار بوو، لەدوای ئەو مێژووەوە، دانیشتوانی مەککە بەگشتی پابەندی یاساو نیظامێك بوون کەلەسەر بنـەمای رێك کـەوتن و لێك تێگەیـشتن و پـرس و راو دابەشـکردنی بەرپرسـیارێتی و ئەرکـەکان

دامەزرابوو، هەرکە سەو ئەرکی تایبەتی خۆی لەئەستۆ بوو، ئەم یاساو نیظامانە هەموویان لەسەر دەستی قوصەی کوڕی کیلاب پێنجەمین باپیرە گەورەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دامەزرابوون، هەڵبەتە ئاوەدانی مەککە بەپێی سروشتی بارودۆخەکەی لەچوار چێوەیەکی تەسك داخۆی دەنواند، مەککە کەوتبوە نێوان دوو کێوەوە، یەکێکیان کێوی ئەبو قوبەیس کەبەسەر تەپۆڵکەی صەفادا دەیڕوانی، ئەویتریان کێوێکە پێ ی دەگوترێ: (الأحمر) لەپێش هاتنی ئیسلام دا پێ ی دەگوترا (الأعرف) ئەویش ئەو کێوەیە: کەبەسەر (قصیقعان) دا دەڕوانێ، وەلێ هەبوونی کەعبە لەو دۆڵەداو ئەو ڕێزو نرخەی بۆ دراوسێ یەکانیو مجێورو کاربە دەستانی بەتایبەتیو دانیشتوانی ئەم شێوە (واتە: شیوی مەککە) بەگشتی دەستەبەر بوبو و، ئەو شەڕە فمەندیو شانو شەوکەتو ئەمنو ئاسایشەی بۆ دانیشتوانی شاری مەککە هەبوو، زۆر لەهۆزەکانی هەڵنابوو بەتایبەتی خێڵەکانی دەورو پشتی کەدەستبەرداری ژیانی سارانشینی بنو بگوازنەوە بۆ مەککەو تێیدا نیشتەجێ بن، بەمەش ئاوەدانی مەککە گەشەی کرد، بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار خانوەکانی بەناو شیوو دۆڵەکانی دا پەلیان هاویشتو خانووی بەبەرد یان بەبەردو خشت دروستکراو جێگای ڕەشماڵو خێمەی گرتەوە، گەشە کردنی ئاوەدانیو بەرفراوانبوونی خانوو بەرەوزۆر بوونی دانیشتوانی وای کرد سنووری شارەوانی شاری مەککە لەسەرەوەو لەخوارەو پێوە بچێو لەمەسجید ولحەرامەوە بگاتە (بطحا و مکة)ئەمسەرەو سەری شێوەکە. .

لەسەرەتاوە مەککەیی یەکان لەبەر ڕێز گرتن لەماڵی خودا خانوەکانیان وا دروست دەکرد: کە هۆدەکانیان چوار گۆشە نەبێ، دوایی وردە وردە ڕاهاتنو چ دژایەتیەکییان نەبینی لەوەدا کەخانوەکانیان لەشێوەی چوار گۆشەیی دا بنیات بنێن.

وەڵێ لەگەڵ ئەوەش دا خانوەکانیان لەخانووی کەعبە بەرزتر دروست نەدەکرد.. هەندێ لەمێژوو نووسان ئاماژەیان بۆ ئەوە کردوە کە ئەهلی مەککە بۆ ڕێز گرتن لەکەعبە خانوەکانی خۆیان بازنەیی دروست دەکردن، یەکەم کەس کەخانووی خۆی بەشێوەی چوار گۆشەیی دروست کرد حەمیدی کوڕی زوهەیر بوو، ئەویش قورەیشی یەکان دژی وەستان و ناڕەزاییان بەرامبەر کارەکەی دەربڕی..

خودا پێداوو دەوڵەمەندەکانیان خانوەکانیان بەبەرد دروست دەکردو هەر خانوێکیان لەچەند ژورێك پێك دەهات، هەر ژوورەو دوودەرگای بەرامبەر بە یەکی تێدا بوو، بۆ ئەوەی ئافرەتەکانیان لەکاتی هاتنی میواندا بتوانن لە دەرگاکەی ترەوە دەرچن.

دیمەنی شاری مەککە لەسەر کێوی بەبو قوبەیسەوە کە لەخۆر هەڵاتەوە بەسەر مەککەدا دەڕوانێ، بەشێوەی لاکێشەیی لەباشورەوە بۆ باکور لەدۆڵێکی تەنگە بەردا دێتە بەرچاو کەمرۆڤ لەو بەرزییەوە سەیری دەکا، سەرەتا تاباش لێی ورد نەبێتەوە بەزەحمەت خانوەکان لەئەرزەکە جیا دەکاتەوە. بێگومان ئەو کێوە روت و رەقەن و چەقانانەی دەوری شاری مەککە یان داوە لەنێوان شارەکەو کێوەکان دا هیچ شیناوەردو پەڵە درەخت و بێشەڵانێك نیە لێکیان جیا بکاتەوە، سەربانی خانوەکانی (یان بڵێین: بنە بانی خانوەکانی) بەچەوو بەردی کێوە داڕو خاوەکان داپۆشرابوو ئەو چەو بەردو تاوێرانەی لەکێوەکانی دەوروبەری گلۆر دەبوونەوە دەکەوتنە بنە بانی خانوەکانیان.

وەڵێ دوای ئەوەی کەهەندێ لەدیمەنەکە ورد دەبێتەوە ئەوە وردە وردە دەتوانرێ خانوو ماڵەکان لەزەوییەکە جیا بکەیتەوە. جادەو کۆڵانەکانی دەردەکەون، مرۆڤ لەنکاوێك دیمەنی شارێکی گەورەی بۆ دەردەکەوێ،

سەری لەگەورەیی و پان و پۆڕی و بلاوبوونەوەی بەناو شیوو دۆڵەکانی دا سوڕ دەمێنێ، تا چاو هەتەر بکا هەر شارەو ئەمسەرەو سەری دیار نیە، زۆر جار مرۆڤ گەورە بوونی ئەو شارە بەشێوەیەك لەموعجیزە دادەنێ و بەشێوەیەکی ئاسایی حسێب ناکا، پەنا بەردو کاوە شاخ و ئەشکەوتەکان هەموویان بوون بەخانوو شوێنی تێدا حەوانەوە، قوژبن و قەدپاڵ و شیوو دۆڵەکانی تێکڕا بوونە گەڕەکی پان و بەرفراوان و چەندێك بڕوانی ئەمسەرەو سەری نابیندرێ.

## ئاوەدانکردنەوەی شاری مەککە سەر لەنوێ:

ئاوەدانبوونەوەی مەککەو گەشە کردنی لەسەر دەستی قوصەی کوڕی کیلاب بوو، ئەو بوو قورەیشییەکانی لەشاری مەککەدا گرد کردەوەو لەمەککەدا نیشتەجێ ی کردن، نەخشە و پلانی دروستکردنی خانووەکانی بۆ کێشان، هەر تیرەو بەرە بابێکی هۆزی قورەیشی لەشوێنێکی مەککە دا دامەزراندو گەڕەك و خانوو کۆڵان و ڕێگەکانی دیاری کردن.

کوڕەکانی قوسەی دوای مردنی باوکیان شاری مەککەیان باشتر ڕێکخست و گەڕەك گەڕەك و هۆبە یان کردو خانوو باڵەخانەی چاکترو ڕێك و پێك تریان تێدا بنیات نان و بوونە شار نشین و وازیان لەکۆچ و کۆچباری هێنا، ئەگەر یەکێکیان گەڕەکێکی پێ ناخۆش بایە، دەیتوانی خانوەکەی بفرۆشێ و بچێتە گەڕەکێکی تر. ئیتر لەسەر ئەو بنەمایانە قورەیش لەمەککە دا بێ کێشەو ئەندێشە ژیانیان بەسەر دەبرد!!.[34]

---

[34] هەندێ مێژوو نووس پێیان وایە شاری مەککە تاسەردەمی قوسەی خانووی تێدا نەبوە، دانیشتوانەکانی هەموویان دەوار نشین بوون، بەڕۆژا لەناو مەککەدا بوون و بەشەو چوونە دەوروبەری .

ڕێکخستنی ژیان‌و دابەشکردنی ئەرك‌و بەرپرسیارێتی قوسەی کوڕی کیلاب پیاوێکی ژیرو ئازاو سەخی تەبیعەت‌و دەست‌و دڵ فراوان بوو، لەلای گەل‌و نەتەوەی قورەیش ڕێزێکی تایبەتی هەبوو پیاو ماقوڵ‌و قسە ڕۆیشتو بوو، لەکاروباری دونیادا کاراماو لێزان بوو، دووربین‌و عاقڵمەندو هۆشیار بوو، کاروباری (الحجابة)[35] و (السقاية)[36] و (الرفادة)[37] و (الندوة)[38] و(اللواء)ی[39] گرتە دەست خۆی‌و خۆی سەروکاری دەکردن.

قوسەی بۆ خۆی (دار الندوة) ی لەپەنا کەعبەدا دامەزراند، دەرگاکەی خستە سەر مزگەوتی کەعبە. ئەم (دار الندوة) یە دیوەخانی قوسەی کوڕی کیلاب بوو، لەم دیوەخانەدا قورەیشی یەکان گفت‌و گۆیان دەکرد، بیرو ڕایان دەگۆڕییەوە، فەرمان‌و بڕیاریان دەردەکرد، هەر ئافرەتێك لەمەککەدا مارە بکرایە، هەر پیاوێکی قورەیشی ژنی مارە بکردایە، هەر کێشەو نیزاعێك هاتبێتە پێشیان، هەر بڕیارێك درابێ دەربارەی شەڕو ئاشتی لەگەڵ هۆزو خێڵەکانی کاتی تردا، دەبوایە لەم دیوەخانەدا بکرێ‌و لەم ماڵە دا بڕیاری لەسەر بدرێ، هەرکچێك پێ بگەیشتایە شوی بکردایە پۆشاکی بوکێنی لەبەر بکرایە، دەبوایە لەم خانوەدا پۆشاکی لەبەر بکرایەو لەوێوە بە بووکی ببرایە.

فەرمان‌و بڕیارو ئامۆژگارییەکانی قوسەی لەڕۆژگاری ژیانی داو لەدوا مردنیشی لەناو قورەیشی یەکان دا وەکوو ئایین پەیڕەوی کراوە، هەرچی

---

[35] الحجابة: واتە: زێوانی کەعبە.

[36] السقاية: واتە دابەشکردنی ئاو بەسەر حاجیان دا.

[37] الرفادة: پێشکەشکردنی خۆراك بۆ حاجییان.

[38] الندوة: هۆڵی وت‌و وێژو بیرو ڕاگۆڕینەوە.

[39] اللواء: هەر ئیش‌و کارێك پەیوەندی بەشەڕو ئاشتیەوە هەبێ.

گوتبییەتی ڕەت نەكراوەتەوە، هەرچی دژی بیرو ڕاكانی ئەو بووبێ كاری پێ نەكراوە، هەركەسێك لەبنەماڵەی قوسەی نەبووبێ تاتەمەنی نەگەییشتبێتە چلْ ساڵ بۆی نەبوە بچێتە (دار الندوة) وە. بەلاّم بنەماڵەی قوسەی و هاوپەیمان و سوێند خۆرانیان گەورەو بچوكیان، بۆیان هەبوە بچنە ناو خانووی ڕاوێژەوە (دار الندوة) كە تایبەت بوو بەم بنەماڵە قوڕەیشییانە (بەرەی هاشم، بەرەی ئومەییە، تیرەی مەخزوم، تایەفەی جومەح، لقی سەهم بەرەبابی تەیم، مەحزوم، پێڕی عودەی، نەوەی عەدی، وەچەی ئەسەد، كوڕانی نەوفەل، خانەوادەی زەهرە) ئەمانە دەتاقم بوون دە بەرەو بنەماڵە بوون.

لەدوای مردنی (قوسەی) بەرپرسییەكان لەناو قوڕەیشییەكان خۆیان دا دابەش كران، نەوەكانی هاشم (بنو هاشم) دابەشكردنی ئاو بەسەر حاجیانیان دا بەركەوت. بەنو ئومەییە كاروباری ئالاّی قورەیشیان لەئەستۆ گرت، بەرەی نەوفەل ئەركی دابەشكردنی خواردەمەنی بەسەر حاجیانیان داخرایە ئەستۆ، بنەماڵەی (عبدالدار) ئەركی پەیوەست بە (اللواء)[40] و زێوانی و حیجابەوە یان لەئەستۆ بوو، ئەركی ڕاوێژكاری لەئەستۆی هۆزی (بەنو ئەسەد) دابوو، پیاو ماقولاّنی قوڕەیش هەتا پرس و ڕایان بەعاقڵمەندانی بەنو ئەسەد نەكردایە بڕیارن لەسەر هیچ شتێك نەدەدا، ئەگەر ئەوان ڕایان لەسەر بدایە ئەمجار قوڕەیشییەكان ڕەزامەندی خۆیان لەسەر دەدا.

لەكۆمەڵگای مەككەدا بەرپرسیارێتی لەنێوان پیاو ماقوڵ و عاقڵمەندانی قورەیش دا دابەش كرابوو، ئەم پیاوە بەرپرسانە هەڵبژێردراوی ئەوان بون،

---

[40] لیواء: ئالاّیەك بوو دەكرا بەنووكی ڕمبەوە لەكا تی چون بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمن دەچەقێندرا.

بڕوایان بەڕێزو ڕا دروستی و لێهاتووییان هەبوو، هەرچییەکی ئەو برا گەورە بەرپرسانە بیانکردایە قورەیشییەکان پێوەی پابەند دەبوون. بۆ نموونە کاروباری خوێندان و پیتاك و قەرز بژاردنەوە لەئەستۆی پیاو ماقولێکی تیرەی تەمیم بوو، پشتاو پشت ئەم بەرپرسارییەتییەیان لەئەستۆدا بوو تا گەیشتە ئەبو بەکری صدیق ڕەزای خوای لێ بێ. کەلەم بنەماڵەیە بوو، هەرکاتێ برا گەورەی ئەم بنەماڵەیە قەرز، یان خوێنێکی لەئەستۆبگرتایەو داوای لەقورەیشییەکان بکردایە هەموویان پشتگیرییان دەکردو دەچونە ژێر باری قەرزو خوێنەکەوە، ئەگەر ئەم کارە یەکێکی ترو لە تیرەیەکی تر، لەئەستۆی بگرتایە، کەس هاوکاری نەدەکرد.. هەروەها کاروباری (القبة)و (الأعنة)[41] پشتاو پشت لە ئەستۆی تیرەی (بەنو مەخزوم) دا بوو تاسەرە گەیشتە خالیدی کوڕی وەلید کەلەم هۆزە بوو.

کاروباری شالیاری (سەفارەت) لەئەستۆی بنەماڵەی (عدی) دابوو پشتاو پشت تاسەرە گەیشتە سەر عومەری کوڕی خەتاب کەلەم بنەماڵەیە بوو.

ئەرکی سەفارەت ئەوەبوو هەرکاتێ شەڕو هەرا لەنێوان قورەیش و هۆزی تردا بەرپا بوایە، بۆ کوژانەوەی ئاگری شەڕو دان و سان و وتو وێژ ئەم براگەورەیە: کەسەفیری قورەیش بوو دەکەوتە خۆو بەکاری خۆی هەڵدەستا. ئەگەر هۆزێك شانازی بکردایە بەسەریان دا بەباوك و باپیرو ئاکارو رفتاری هۆزەکەیان خۆیان هەڵبنایەوە ئەوە داوایان لێ دەکرد ئەو بەرپەرچییان بداتەوەو شانازی و سەروەرییەکانی خۆیان رانوێنێ. صەفوانی کوڕی ئومەییە کەلە هۆزی (بەنو جومەح) بوو کاروباری پەیوەست بە (أزلام) تیرو

---

[41] القبة: بریتی بوو لەخێمە یەك هەڵدەدرا بۆ کۆکردنەوەی ئازوخەو پێداویست سوپا لەکاتی شەڕدا. الأعنة: پێداویستی ئەسپ و ولاغە بەرزە لە زین و هاوسار و ئالیك.

پشك، هەر كارێكی گرنگ دەبوایە ئەو تیرو پشكی بۆ بگرێتەوە، كاروباری پەیوەست بەو ملْك و ماڵەی دیاری دەكرا بۆ بتەكانیان خرابوە ئەستۆی ئەلحاریثی كوڕی قەیس.

## جم و جۆڵی بازرگانی و ناردن و هێنانی كاڵا بۆ ناو مەككە:

قورەیشییەكان ساڵانە دوو جۆر كاروانی بازرگانییان دەكرد، هاوێنان سەفەری بازرگانییان بەرەو شام ئەنجام دەدا، زستانیش كاروانی وڵاتی یەمەنیان دەكرد، مانگەكانی حەجیش لەمانگە قەدەغەكراوەكان بوون، مانگی زێڕینی عەرەبەكان بوون، لەو مانگانەدا عەرەبەكان لەقەراخ كەعبەو لەناو سنووری حەرەم دا بازاڕیان دەكردنەوە، كاڵای جۆراو جۆریان تێدا رادەنواند، لەهەر چوار لاوە لەنزیك و لەدوورەوە خەڵك رویان دەكردە ئەو بازاڕانەو پێداویستی خۆیان لەكاڵای جۆراو جۆرە دەكڕی و بەرەو وڵاتی خۆیان دەگەڕانەوە، بێگومان لەكتێبە مێژوویی یەكان دا ناوی زۆر بازاڕی جۆراو جۆرە لەمەككە دا كراون هاتووە، هەبوونی ئەو بازاڕانە نیشانەی ئەوەن كەلەو ڕۆژگارەدا مەككە پێشكەوتن و شارەستانیەتیەكی باشی بەخۆیەوە بینیوە، لەو بازاڕانەی مەككەی ئەو سەردەمە: كە ناویان هاتووە بازاڕی عەطر فرۆشی، بازاڕی میوەی جۆراو جۆر، بازاڕی خورمای تەڕو تازە، هەروا كۆچەو شوێنی كەڵە شاخ گرتن و سەرتاشین و بەجیا هەبووە، گۆڕەپانێكی گەورەو بەرفراوان هەبوو گەنم و جۆ و ڕۆن و هەنگوین و دانەوێڵەی تر كەلە دەرەوەی مەككەوە بەكاروان دەهێنراو رادەنوێنداو دەفرۆشرا، كوچەیەكیش هەبوو بۆ پێڵاو فرۆشتن و چاككردن و دروستكردن، بازاڕێكی تایبەتیش هەبوو بۆ كوتاڵ فرۆشی!!.

دانیشتوانی مەککە لەسەردەمی پێش هاتنی ئیسلام دا سەیرانگایان هەبوون، لەکاتی گەرما دا ئێواران بۆی دەچوون و خۆیان تێدا لەگەرما دەشاردەوە، هەندێ لەدەوڵەمەندەکانی قورەیش زستانیان لەمەککە بەسەر دەبردو هاوین دەچوون بۆ وولاتی (طائف) لەوێ کاتیان بەسەر دەبردو خۆیان لەگەرمای مەککە دەشاردەوە. لەلایەکی ترەوە زۆر لەگەنجەکانیان بەوە بەناو بانگ بوون کە خۆیان قۆز دەکردو پۆشاکی جوان و بەنرخ و رێك و پێکیان لەبەر دەکرد، تەنانەت پۆشاکی هەندێکیان سەدان دیرهەمی تێ دەچوو!!.

جم و جۆڵی بازرگانی لەمەککەدا واپەرەی سەند، بازرگانەکانی قورەیش جگە لەکاروانی شام و یەمەن بۆ زۆر وڵاتی تر لە ئاسیا و ئەفەریقا دەرۆیشتن و ئاڵ و وێریان دەکرد، لەهەر شارێك شتێکیان بەدڵ بوایەو بیانزانیایە سوودی لێ دەکەن دەیانکڕی و باریان دەکرد بۆ بازاڕەکانی مەککە، ئەوە بوو لەئەفەریقاوە صەفع و عاج و ئاڵتون و داری ئابە نووسیان دەهێنا، لەیەمەنەوە پێست و بوخورو پۆشاکیان دەبردەوە بۆ مەککە، لەعیراقەوە (توابل) فلفل و بەهارات و زەردە چەوەو ئەو جۆرە شتانەیان دبردەوە، لەبەرو بوم و کالاّی هیندو ستانەوە ئاڵتون و قصیدیر (زەنگ) و بەردی گرانبەها و عاج و داری صەندەل و تەوابیل و زەعفەرانیان دەگواستەوە بۆ مەککە.

لەمیصرو شامیشەوە زەیت بەهەموو جۆرە کانیەوە، (اغلال) کراسی ژێر زری و چەکی شەڕ بەهەموو جۆرەکانیەوە، قوماشی ئاوریشم و عەرەقی جۆراو جۆریان دەبردەوە بۆ بازاڕەکانی مەککە.

لەهەمان کات دا قورەیشییەکان هەندێ جار کاڵای عەنتیکە و خۆ وڵاتییان بەدیاری دەنارد بۆ پاشاو مەلیکەکان، لەنایابترین ئەو شتانەی بۆ

ئەم مەبەستە هەڵیان دەبژارد پێستی دەباغ کراو بوو، ئەوەتا قورەیشی یەکان کاتێك (عەبدوڵلای کوڕی ڕەبیعەو عەمری کوڕی (العاص)ی کوڕی (وائیل) یان نارد بۆ لای نەجاشی پاشای حەبەشە بۆ ئەوەی ئەو موسوڵمانانەی کۆچییان کردبوو بۆ ئەو وڵاتە بیانگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی قورەیش، لەگەڵ ئەو دووکەسەدا لەکاڵای خۆماڵی مەککە،چەند دیارییەکیان بۆ نەجاشی نارد دیارییەکانیش بریتی بوون لەپێستی دەباغکراو.

جاوە نەبێ بازرگانی کردن لەمەککەدا تایبەت بووبێ بە پیاوەوە، بەڵکو ئافرەتانیش جەو جۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لەم بوارەدا، چەند ئافرەتێکی ساماندار هەبوون کەسەر گەرمی بازرگانیکردن بوون، کاروانیان دەنارد بۆ شام‌و یەمەن‌و شوێنە کانی تریش، لەناو ئەو ئافرەتانەدا خاتو خەدیجەی کچی خوەیلید حەنظەلییەی دایکی ئەبو جەهل ناویان بەزەقی لەمێژوودا تۆمار کراوە. قورئانی پیرۆز کەدەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ (٣٢) سوره النساو، ئاماژە بۆ هەبوونی ئەو ئافرەتە سامانداره بازرگانانە دەکا.

## حاڵەتی ئابوری و چۆنیەتی دراوو ئامێری پێوانەو کێشانە:

وەکوو ئاماژەمان بۆ کرد مەککە لەبواری بازرگانی دا زۆر پێشکەوت، زۆر لەدانیشتوانی دەوڵەمەند بوون، سەروەت‌و سامانیان زیادی کردو گەییشتە ئاستێکی خەیاڵی.

ئەوەتا لەکاتی بەرپابوونی غەزای بەدردا کاروانی قورەیش کەلەشامەوە دەگەڕایەوە پێك هاتبو لەهەزار حوشتر بار، نرخی کالاّ کە ش پەنجا هەزار دیناری رومی بوو.

لەو سەردەمەدا دانیشتوانی مەککە لەبازاڕەکانیان دا مامەڵەیان بە دراوی ئێرانی (ساسانی)و رۆمی یەوە دەکرد[42] لەبازاڕەکانیاندا تەرازویان

---

[42] بەگوێرەی لێکۆڵینەوەو پشکنینەوە دەرکەوتووە کەدراوی سەردەمی پێش ئیسلامو لەسەرەتای پەیدابوونی ئیسلامیش دا دووجۆر (أ) دیرهەم (ب) دینار دیرهەم دوجۆری هەبوە جۆرێکیان نەقشی فارسی بەسەرەوە بووە پێ ی گوتراوە (بغلیە) و (سرداء دامیە) جۆرەکەی تریان نەخشی رومی لەسەر بووە بەزۆری پێ ی گوتراوە (طبریة) و (بیزە نطبیە) هەموو ئەم دراوانە لەزیو دروست کراون کێشەکەیان جودا وازی تێدا هەبوە بۆیە ئەو کاتە دانیشتوانی مەککە بەکێشانە حیسابیان بۆ کردوە نەك بەژمارە، پوختەی راوو بۆ چوونی زانایانی ئیسلام ئەوە دەگەیەنێ دیرهەم کەشەرعی ئیسلام ئیعتباری بۆ کردوە کێشەکەی (٥٥) دنکە جۆی مام ناوندییە، کێشی (دە) دیرهەمیش حەوت مثقال ئاڵتونە. کێشی (١) مثقال لەزێڕی خالص حەفتاو دوو دەنکە گەنمە، ئیبنو خەلدون دەڵێ زانایان لەسەر ئەو حیسابە کوڕایان هەیە.

لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) دراوی زێڕ بەزۆری کاری پێ کراوەو لای عەرەبەکان موتەداوەل بووە، دینار لەزێڕ بووە، لەسەردەمی پێش ئیسلام و سەرەتای ئیسلامیش دا لەشامو لای عەرەبەکانی حیجازیش دینار رۆمی بووەو لەوڵاتی رۆمیش دا سکەی لێ دراوەو وێنەی پاشای رۆمی بەسەردا دراوە کەوە بوو، ناوی ئەوکەسەی لەسەر دراوە کە دەنووسرا بەرۆمی دەنووسرا، دراوی رۆمی زۆر لەکۆنەوە هەبوە، تائێستاش لەهەندێ وڵاتی ئەو روپی دا رەواجی هەیە. لەئینجیلیش دا چەند جارێك دینار باس کراوە، ئەو رۆژگارەی پێش ئیسلام دینار بریتی بووە لە میثقالێك، کیشی میثقالیش وەکوو گوتمان حەفتاو دوو دەنکە جۆ بووە لەدەنکە جۆی مام ناوەندی .

ئەوەی کەمەشهورو بروا پێ کراوە ئەوەیە وەزنی میثقالْ نە لەپێش ئیسلامو نەلە دوا ئیسلام نەگۆڕاوە لەدائیرە تولمە عاریفی ئیسلامی دا هاتووە دەڵێ: دیناری بیزەنتی-

هەبوە، کێشان و پێوانیان ئەنجام داوە دەربارەی ئامێری کێشان و پێوانەر بەو موردو ریطل و حۆقەو میثقالیان بەکار هێناوە، لەبارەی کێشانەوە زۆر موفرەداتیان زانیوە، زانیارییان دەربارەی حیساب زۆر باش بووە.

## دەوڵەمەندەکانی قورەیش و خوشگوزەرانەکانیان:

هەندێ بنەماڵەو خێزانی قورەیش مەشهوور بوون بەسامانداری و دەست ڕۆیشتویی و خۆشگوزەرانی، لەناو ئەم بنەماڵەو خێزانانەدا بەنو

---

=٤,٥٥گرامە. خۆر هەلآتناس (زمبارو) لەو دئیرە تولمەعاریفە دا دەڵێ: میثقاڵی مەککی کێشەکەی ٤,٥٥ گرامە، ڕێژەی نێوان دیرهەم و دینار (٧):(١٠) دیرهەم ٧/١٠ مثقاڵە، لەسەردەمی ئەمەوییەکان دا عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان هەندێ چاکسازی لەبواری ئابووری دا ئەنجام دا کێشی مثقاڵی دا بە زاند بۆ (٤,٢٥) گرام. وەلێ بەرامبەری لەبەهادا -وەکوو لەکتێبی حەدیث و ڕێبازی شەرعزانان دا دیاری کراوە و لەمێژوودا چەسپاوە- ئەوەیە دینار بەرامبەر (دە) دیرهەم بووە، ئەوەتا لەسونەنی ئەبو داودا لەعەمری کوڕی شوعەیب لەباوکییەوە لە باپیریەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: نرخی خوێن واتە خوێنی کوژراو لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) (٨٠٠) دینار یان (٨٠٠٠) دیرهەم بووە. نەتەوەی موسوڵمان هەر لەهاوەڵانی پێغەمبەرەوەو بەرەو دوا تا کۆڕا (إجماع)ی لەسەر چەسپا، بەوە ڕەفتاریان کردووە.. ئەوەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەم ڕێژەیە ئەو ئاماژەو تەصریحەیە کەدەربارەی نیصابی دراوی جۆری دیرهەم کەزەکاتی لێ دەکەوێ و لەگەڵ ئەو بۆ چوون و بڕیارەی زۆربەی زۆری فوقەها دەربارەی ئەندازەی ئەو ماڵەی زەکاتی تێدا واجب دەبێ لەزێڕ، گوتویانە نیصابی زێڕ (٢٠) میثقاڵەو نیصابی زیو دووسەد دیرهەمە. کەوابوو لەسەردەمی پێش ئیسلام و سەرەتای ئیسلامیش دا دینارێکی زێڕ بەرامبەر بە (دە) دیرهەم بووە، ئیمام مالیك لەکتێبی (الموطأ) دا فەرموویەتی: ئەو ڕایەی جێ ی متمانەیە، ئەو ڕێبازەی لای ئێمە هیچ خیلافی تێدا نیە ئەوەیە زەکات لەبیست دینار دا واجب دەبێ هەروەکوو لەدوسەد دیرهەم دا واجب دەبێ.

ئومەیەو بەنومە خزوم دیاریترین ساماندارەکان بوون، هەروا لەنێو ئەو قورەیشییانەی کە مەشهوربون بەسامانداری و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و گەشەپێدانی باری ئابوری خۆیان (الولید) ی کوڕی (المغیرة) و (عبد العزي) ئەبو لەهەب و ئەبو ئوحەیحەی کوڕی سەعیدی کوڕی (العاص)ی کوڕی ئومەییە بوون، تەنانەت ئەم ئەبو ئوحەیحەیە بەسی (٣٠) هەزار دینار هاوبەشی کرد لەو کاروانەی بەسەرۆکایەتی ئەبو سەفیان و عەبدی کوڕی ئەبوربیعە (المخزومی)بۆ شام بەڕێکەوت، هەروا دەوڵەمەندێکی تری قورەیش کەبەناو بانگ بوو، عەبدوڵڵای کوڕی جەدعانی (التیمی) بوو کەلەپیاڵەی زێڕدا نەبوایە شەراب و ئاوی نەدەخواردەوە، پیاوێکی دەست و دڵ فراوان بوو، ژمارەیەکی زۆری فەقیرو هەژار نان دەدا. هەروەها عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی قورەیش، پیاوێکی نانبدەو سەخی سروشت بوو، زۆری یارمەتی هەژاران دەدا، سود خورێکی بەناو بانگ بوو هەتا ئایینی ئیسلام هات و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەتاڵکردنەوەی مامەڵەی ڕێبا ئامێزی ڕاگەیاندو یەکەمجاریش لەماڵ و سامانی عەباسی مامیەوە دەستی پێ کرد، ئەوە بوو لەحەجیماڵئاوایی دا لەوتارەکەی دا فەرمووی (وأول ربا أضعه ربا العباس بن عبد المطلب) لەناو قورەیشی یەکانی مەککەدا کەسانێك هەبوون خەریکی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بوون کۆڕو مەجلیسی ڕابواردنیان ئەنجام دەدا، کورسی و مێزی ڕازاوەیان هەبوون، یانەی خواردنەوەو ڕابواردنیان هەبوون، تێیدا کۆدەبوونەوەو دەیانخواردەوەو سەر خۆش دەبوون. زۆربەی زۆری یانەو ئەنجومەنی پیاو ماقوڵانیان لەبەردەم ماڵەکانیان دا دەبەسترا، شیعریان تێدا دەخوێندەوە، شاعیرە بەناو بانگەکانی ئەو ڕۆژگارە وێنەی لەبیدی کوڕی ڕەبیعە ئامادەی ئەو جۆرە کۆڕو مەجلیسانە دەبوون و شیعریان تێدا دەخوێندەوە.

دەڵێن: عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشم لەسێبەری دیواری کەعبە فەڕشی بۆ ڕادە خراو کوڕەکانی لەدەوری فەڕشەکە دادەنیشتن، چاوەڕێی هاتنی باوکیان دەکرد هیچیان زاتیان نەدەکرد لەسەر فەڕشەکە دانیشن. لەبەر ڕێز گرتنیان لەباوکیان .

## پیشەسازی‌و ڕۆشنبیری‌و ئاداب لەمەککەدا

قوڕەیشییەکان زۆر گرنگیان بەلایەنی پیشەسازی نەدەدا بەڵکوو بەچاوێکی سوکایەتییەوە سەیریان دەکردو پێیان عەیب بوو ئەو جۆرە کاسبی یە بکەن. زۆربەی کات (مووالي) و بنەماڵەی ناعەرەبەکان ئەو کارەیان دەکرد، وەڵێ لەگەڵ ئەوەش دا بڕێ جۆری پیشەسازی کە زۆر پێویستیان پێ بوو دەستیان تێوەر دەدا، هەندێ لەخەڵکی مەککە پێوەی خەریك بوون، ئەوەتا ریوایەت کراوە دەڵێن خەبابی کوڕی (الأرت) شیر گەر بووە، شمشێری دروست کردون، هەندێ جاریش داوایان لێ کراوە ئیشی بەننایییان بۆ بکا، خانوویان بۆ دروست بکا، هەڵبەتە ئەویش کرێکاری ڕۆم‌و فارسی لەبەر دەستا بوون!

هەندێ لەقوڕەیشییەکان نووسین‌و خوێندنیان زانیوە، هەرچەندە بەگشتی نەخوێندەواری دیاردەی هەرە دیار یان بووە، هەربۆیە قورئان بەنەخوێندەواری وەصف کردون‌و دەفەرموێ: (هو الذي بعث في الأميين رسولا منهم). لەناو هەموو وڵاتی جەزیرەدا مەککەو دانیشتوانەکەی وەکوو هەموو گەورە شارێکی تر لەوڵاتان دا نموونەی زەوقی پەسەندو قسە خۆشی‌و نوکتە سازی‌و ڕێك هەندامی بوون. خاوەنی داب‌و نەریت‌و ئادابی بەرز بوون، زمان‌و زاراوەیان تەرازوی زمانی عەرەبی بوو، زاراوەو زمانەکەیان ستاندەر بوو بۆ هەموو دانیشتوانی جەزیرەو دەورو بەری،

لەناو عەرەبەکان دا مەشهور بوون بەزمانپاراوی و قسە شیرینی و تەعبیر دانەوەی وردو راست. دووربوون لەزمان فسکی و نوتق خواری و حەرف گۆڕی، کاریگەری زمانی ناعەرەبیان بەسەرەوە نەبوو، بۆ خۆشبەختییان لەناو هەموو عەرەبەکان دا لەش و لاریان رێك و پێك و سەرو سیما جوان و روخسار شیرین بوون، لەناو ئادەمیزادی دەورو بەریان دا دیارو بەرچاو بوون. ئەو رەوشتە خەلقی و خولقیانەی کەبە گشتی پێیان دەگوترێ: (الفتوة) مەردی و جوانخاصی (المروءة) مرۆڤایەتی، کەشاعیرە عەرەبەکان لەشیعرەکانیان داو خەطیب و قسە رەوانەکانیان لەو تارەکانیان دا پێیان دا هەڵگوتون بەرەوشتی بەرزو مەردانەیان دا ناون، لەوان دا بەزەقی دیار بوون. بۆیە دەتواندرێ بگوترێ: دانیشتوانی مەککە مامۆستای ئادەمیزاد بوون لەشەڕو خێردا.

عەرەبەکانی مەککە زۆر گرنگیان بەریشەو نژادو هەواڵ و بەسەرهاتی رابوردوانیان دەدا، ئەمجار گرنگیان دەدا بەشیعرو ئەستێرە ناسی و کەش و هەوا ناسی و زانیاری عەرافەو قیافەو کەمێکیش گرنگیان دەدا بەتەندروستی کەبە تەجرەبەو ئەزمون فێری ببوون.

دەربارەی رازاندنەوەی ئەسپ و بەخێو کردنی زۆر شارەزا بوون: زانیارییەکی باشیان هەبوو دەربارەی ئەندام و رەوشتەکانی ئەسپ و سوار چاکی، هەندێ رێگا چارەی نەخۆشییەکانی ئەو رۆژگارە یان دەزانی و کاریان پێ دەکرد وەکوو داخکردن، بڕینەوە، خوێن بەردان، کەڵە شاخ گرتن، دەرمان خواردن.

## هێزی سەربازی:

لەروی سەربازییەوە دانیشتوانی مەککە زۆر کۆك نەبوون، زۆر گرنگیان بەم لایەنە نەدەدا، زۆربەی کات قورەیشییەکان ئاشتی و ئارامییان پێ خۆش بوو، شەڕ خوازو شەڕەنگیز نەبوون، ئەمەش دیاردەیەکە لە زۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەی پشت بەکاسبی و بازرگانی دەبەستن و ئاڵ و وێرو کاروان و کەڵەك دەکەن رەنگ دەداتەوە. ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە حەزیان لەئاشتی یەو ژیانی شارەستانی و ئارامی هەڵدەبژێرن و دەیانەوێ لەگەڵ کەسانی دیکە پەیوەندی هەمە جۆر ببەستن و سوودی رۆشنبیری و ئابوری و ئایینی.... هتد بۆ خۆیان دەستە بەر بکەن، لەهەمووشیان گرنگتر باری ئابوری و باری ئەمن و ئاسایشە، بۆیە پەروەردگار: کەمنەت بەسەر قورەیشییەکان دا دەکا، ئەم دولایەنە زەق دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ، الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾. سورة قريش/٣-٤.

بۆیە قورەیشییەکان تا بۆیان کرابێ و دەستدرێژییان نەکرابێتە سەرو هەستی بیروباوەڕو خێڵایەتیان بریندار نەکرابێ، بنەمای ئاشتیخوازییان پەسەند کردوەو ویستوویانە بەئارامی بژین و دوژمنی کەس نەبن و دژایەتی کەس نەکەن. وەلێ وێڕای ئەوەش هێزێکی جەنگی حیساب بۆ کراو بوون، لەشەڕو ئاشتی دا قورسایی خۆیان هەبوو، ئازایەتییان بو بوو بەنمونەو باس دەکرا.

سوار چاکی گۆڕەپانی شەڕو جەنگ بوون، ڕاپەڕین و رق هەڵسانی موچەرییانەی قورەیش (الغضبة المغريە) لەناو جەزیرەدا مەشهور بوو، لەپەندو ئەدەبیان دا ڕەنگی داوەتەوەو بەئاشکرا ئاماژەی بۆ کراوە.

قورەیش لەشەڕو جەنگ دا هەرپشتیان بەخۆیان نە بەستووە بەڵکوو هێزی ئەحباشەکانیشیان بەکار دەهێنا، ئەم ئەحباشانە چەند بەرەباب و

تیرەو لقێك بوون لە هۆزە عەرەبەکانی دەوروبەری مەککە کەلەهۆزی کەنانەو خوزەیمەو مودریکەو خوزاعە بوونو هاوپەیمانو سوێند خۆری هۆزی قورەیش بوون، هاریکارو هەم ئاهەنگی یەکتریان دەکرد، هەروا قورەیشییەکان کۆمەڵێك کۆیلەو موالییان هەبوون کەبۆ شەڕ لەپاڵ قورەیشییەکان دا ئامادە دەبوونو ڕۆڵی کاریگەریان دەگێڕا. بەکورتی قورەیشییەکان بەئاسانی دەیانتوانی شەش حەوت هەزار جەنگاوەر زیاتر بنێرن بۆ شەڕ، بەڵکوو لەشەڕی مەشهور بە (الأحزاب) توانییان دە هەزار جەنگاوەر بنێرن بۆ شەڕ، ئەمەش گەورە ترین هێزی شەڕکەر بوو کەمێژووی دوورگەی عەرەب پێش ئیسلام بەخۆیەوە بینیوە.

## مەککە گەورە شاری جەزیرە و پایتەختی گیانی و کۆمەڵایەتی:

بەهۆی ڕێزی کەعبەو پلەی ئایینیو باری ئابوری و بەدەستەوەگرتنی جڵەوی بازرگانیو پێشکەوتن لەروی شارەستانیو ئەدەبیو زۆر لایەنی تری ژیانەوە شاری مەککە بوو بەگەورە شاری جەزیرەی عەرەبو کێ بڕکێ ی لەگەڵ شاری (صەنعاء)ی یەمەن دەکرد، لەوەدا کامیان ببێتە پایتەختو زەعامەتی جەزیرە بەدەست بێنێ، بەڵام مەککە بەهۆی کەعبەوە هەرزو بەسەر صەنعا دا زاڵ بوو جڵەوی گەورە شاریو پایتەختی لێ ستاند، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە حەبەشەیی یەکان بەسەر یەمەن دا زاڵ بوون، هەروا فارسەکان لەناوەراستی سەدەی شەشەمی زایینی دا یەمەنیان داگیر کردو پیاوی کیسرا بەرێوەی دەبرد. وڵاتی غەساسینەکانیش شکۆمەندی خۆیان لەدەست داو دەوری رابوردویان نەما. بەمەش بوار بۆ مەککە رەخساکە ببێتە پایتەختی گیانیو کۆمەڵایەتی جەزیرەو هیچ شارێکی تری ئەو دەڤەرە شان لەشانی نەدا.

## لایەنی ئەخلاقی و چۆنیەتی هەڵس و کەوتی قورەیش:

عەرەبە قورەیشییەکانی مەککە لەروی ئەخلاق بەرزییەوە دوا کەوتوو بوون، جگە لەهەندێ داب و نەریتی سەردەمی جاهیلی کەبڕوایان پێ هەبوو پێوەیان پابەند بوون، پشتاو پشت بۆیان مابووەوەو باریان پێوە گرتبوو لێیان بوو بوو بەخوو لێیان لانەدەدان. هیچی تری وایان نەبوو شانازی پێوە بکەن، یان جێگای شانازی بێ. بێگومان قومار کردن بەگشتی و قوماری (مەیسیر) لەناویان دا بڵاو بو بووەوە بەرادەیەك بەشێکی زۆری لەماڵ و کات لێ بەفیڕۆ دەدان و شانازییان پێوە دەکرد، مەیخواردنەوە لێ یان بو بوو بەخوو هەمیشە مەیخانەکانیان جمەی دەهات و دەرگاکانیان لەسەر پشت و ئالآیان بەسەرەوە هەڵکرابوو، دیاردەی تیا ترۆیی و سۆزانی بڵاو بوبووەوەو لەهو لەعب زۆرو زەبەندە بوو، لەم کۆڕو کۆبوونەوانەدا عەرەق دەخورایەوە، زۆر جار کاری فاحیشەو داوێن پیسی لەو کۆڕانەدا ئەنجام دەدرا، ستەم و دڵڕەقی، پێشێل کردنی مافی خەڵك و ناحەقیکردن و خواردنی ماڵی خەڵك بەناڕەوا دیاردەیەکی دیاری ئەو کۆمەڵگایە بوو، هیچ کامیرایەك ناتوانێ وێنەی ئەو حاڵەتە رەوشتی یەی دانیشتوانی جەزیرە بەگشتی و دانیشتوانی شاری مەککە بەتایبەتی پێش هاتنی ئیسلام کە تێیدا دەژیان وێنەکێش بکا وەکوو ئەو وێنە کێشانەی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب (کە کوڕی ڕەسەنی شاری مەککە بوو) بۆ ژیانی عەرەبی و رەوشتی سەردەمی نەفامی لەبەردەم نەجاشی دا کێشای، جەعفەر لەبەردەم نەجاشی دا وتی: ئەی پاشای خاوەن شکۆ، ئێمە پێش هاتنی ئیسلام گەلێکی نەفام و ناتێگەیشتو بووین، بتپەرستیمان دەکرد مردارەوە بوومان دەخوارد، کاری فاحیشەو داوێن پیسمان ئەنجام دەدا، صیلەی رەحم و خزمایەتیمان بەرچاو نەدەگرت، ستەممان لەئافرەت دەکرد، زۆر دار بێ دەسەڵاتی دەچەوساندەوە، بەهێز بێ هێزی دەخوارد.

## لایەنی ئایینی دانیشتوانی مەککە:

بێگومان بەهۆی دوورکەوتنەوەی قورەیشی یەکان لەسەر دەمو ڕۆژگاری پێغەمبەرانی پێشوو بلاّو بوونەوەی نەفامی و دەمارگیری لەنێوانیان داو بلاّو بوونەوەی بتپەرستی کە لەنەتەوە هاوسێکانیان وەریان گرتبوو، باری ئایینیان زۆر لاواز بوو، ژمارەیەکی زۆر کەمیان نەبێ بڕوایان بەخودا نەبوو، ملیان لەبتپەرستی نابوو تێیدا نوغرۆ بو بوون، تەنانەت لەناو خودی کەعبەدا سێ سەدو شەصت بت دامەزرێنرا بوو. بتە گەورەکایان ناوی (هبل) بوو؛ ئەو بتەی دوای شەڕی ئوحود ئەبو سەفیان هاواری لێ دەکردو دەیگوت (أعل هبل) بەرز بنوێنە ئەی هوبەل شکومەندی بۆ تۆیە، ئەم بتە بەد فەساڵە لەناو کەعبەدا لەسەر لێوی بیریك دانرابوو، هەر دیارییەك بهاتایە بۆ کەعبە لای ئەو کۆدەکرایەوە، ئەم بتە لە ئاقیقی سور لەسەر شێوەی ئادەمیزادێکی کە دەستی راستی شکابێ دروست کرابوو، قورەیشییەکان بەو شێوەیە دەستیان کەوتبوو ئیتر دەستێکیان لەزێڕ بۆ دروست کرد، لەبەردەم کەعبەش دا دوو بتی تر هەبوون، (اساف) و (نائلە) یەکێکیان بەدیواری کەعبەوە نووسابوو ئەوی تریان لەشوێنی بیری زمزم بوو، قورەیشییەکان ئەو بتەی بەدیواری کەعبەوە لکا بوو گواستیانەوە بۆ لای ئەوی تر، لەلای ئەم دوبتە ئاژەڵیان سەردەبڕی و قوربانییان دەکرد، لەسەر تەپۆلکەی (صەفا) بتێك هەبوو پێیان دەگوت (نهيك مجاود الريح) لەسەر تەپۆلکەی مەروەش بتێکی تر هەبوو پێ ی دەگوترا (مطعم الطير)خۆراك بدەی باڵندە.. لەهەموو ماڵێکی مەککەدا بتێك هەبوو دەیانپەرست. بتی (العزاء) لەنزیك کێوی عەرەفات بوو خانوێکی بەسەرەوە کرابوو، بەلای قورەیشی یە کانەوە گەورە ترین صەنەم بوو، لەلای بتەکانیان بەتیرو پشك و شێوەی قومار گۆشتی سەربڕوایان دابەش دەکرد، بتێکی

تریان هەبوو ناوی (الخلصه) بوو لەخوار مەککە دایان نابوو ملوانکەیان پێدا دەکردن، گەنمو جۆیان بەدیاری پێشکەش دەکرد، ماستو شیریان پێدا دەکرد، قوربانییان بۆ سەر دەبڕی، هێلکە نو عامەیان پێدا هەڵدەواسین، تەنانەت دیاردەی بتپەرستی هێندە بەربڵاو بوو بەناو شاری مەککەدا بتیان دەگێڕان بۆ فرۆشتن سارا نشینەکان لێیان دەکڕینو دەیان بردنەوە بۆ لای خۆیان بۆ عیبادەت بۆ کردن!!

ئابەو جۆرە (هەرچەندە هەندێ رەوشتی پیاوەتیو مەردانەی عەرەبییان تێدا بوون) گەیشتبوونە ئاستێکی زۆر نزمو دوا کەوتوویی و زێدە رۆیی لەبتپەرستی دا، پابەندی بیرو باوەڕی خورافیو خەیاڵپڵاوی سەیرو سەمەرە بوو بوون، لەئایینی راستەقینەی پێغەمبەران دور کەوتبوونەوەو هیچیان لێ نەدەزانی، بەهیچ شێوەیەك لەئایینی پیرۆزی حەزرەتی ئیبراهیم نزیك نەدەکەوتنەوە، وایان سەر لێ شێوا بوو هیچ ڕێگایەکی راستیان بۆ نەدەدۆزرایەوە، نەك هەر ئەوان بەڵکوو لەو ڕۆژگارەدا هەموو گەلو نەتەوەکان تێکڕا ئایینی راستی پێغەمبەرانیان لێ گوم بو بوو، تاکە تاکەیەکی زۆر کەمو ناوازەیان نەبێ کەس پەی بەئایینی پاكو خاوێنی حەزرەتی ئیبراهیم نەدەبرد!

ئائەمە بوو حاڵو وەزعی گەلو نەتەوەکان بەگشتیو حاڵو وەزعی دانیشتوانی شاری مەککە بەتایبەتی لەناوەراستی سەدەی شەشەمی زایینی داو لەکاتی ناردنی پێغەمبەری ئیسلامو هەڵهاتنی خۆری پڕشنگداری ئیسلام لەئاسۆی تاریکی مەککەوە. بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ﴾. سورة یاسین/٩ .

# لەکاتی لەدایکبوونی زاتی پاکی پێغەمبەر تاکاتی پێغەمبەرێتی

## عەبدوڵلاَ و ئامینە:

عەبدولموطەلیب(سەرۆکی قورەیش) دەکوڕی هەبوون، هەموویان شۆخ و شەنگ و جوانخاص بوون، لەناو خەڵك دا دیارو بەرچاو بوون، عەبدوڵلاَ کوڕی نێو نجیان بوو، عەبدولموتەلیبی باوکی، کەویستی ژنی بۆ بهێنێ، ئامینەی کچی (وەهەب)ی بۆ هەڵبژارد، کەکچی گەورە پیاوی بەنو زەهرە بوو، لەو رۆژگارەدا ئامینە رێز دارترین ئافرەتی قورەیش بوو لەروی بنەماڵەو وەجاغزادەیی یەوە، ئافرەتێکی خاوەن حەسەب و نەسەب بوو، دوای ئەوەی عەبدوڵلاَ ئامینەی گواستەوە زۆر پێ نەچوو عەبدوڵلاَ وەفاتی کرد ئامینە حامیلە بوو، حەزرەتی موحەممەدی لەسکا بوو، لەو ماوەیەدا کە ئامینە پێغەمبەری لەسکی دا دابوو زۆر نیشانەوە شتی عەجایبی بینی، هەموو گەوا هیدەری ئەوە بوون کەئەو زارۆکەی لەسکی دایە دواڕۆژێکی پرشنگداری هەیە.

## لەدایکبوونی پێغەمبەرو ریشەو نەژادی پاکی:

لەڕۆژی دووشەممە دوازدەی رەبیعولئەوەل ساڵی (٥٧٠)ی زایینی کەرێکەوتی ساڵی فیلە[43] حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەربێ) لەدایکبوو،

---

[43] زانای ئاسمان سوناشی بەناوبانگ مەحمود پاشای میصری لێکۆلینەوەیەکی لەم بارەوە ئەنجام داوە، گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامە کەڕۆژی دووشەممە نویەمی مانگی

ئەو ڕۆژە پیرۆز ترین ڕۆژێکە کە خۆری تێدا هەڵهاتبێ. حەزرەتی موحەممەد کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدیمەنافلی کوڕی قوصەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالبی کوڕی فیهری کوڕی مالیکی کوڕی (النضر) ی کوڕی کەنانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مودریکەی کوڕی ئەلیاسی کوڕی موضەری کوڕی نزاری کوڕی مەعەدی کوڕی عەدنانە.

ریشەو نژادی عەدنانیش دەچێتەوە سەر حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خوای لەسەربێ)..

کاتێک ئامینە حەملەکەی دانا، ناردی بەدوا عەبدو لموتەلیب داو رایسپارد کەهەواڵی بدەنێ بەوەی کوڕی بووە، عەبدو لموتەلیب هات زارۆکی تازە لەدایکبووی بینیو هەڵی گرت بردی بۆ کەعبەو بەناو ماڵی بەیت دا گێڕای، شوکرانە ژمێریو سوپاسی خودای کرد، گوێزەبانەی بەخشییەوە، زارۆکی ساواشی ناونا (موحەمەد) ئەم ناوە بەلای عەرەبەکانەوە سەرنج راکێش بوو چونکە لەوە پێش ئەم ناوەیان نەبیستبوو.

## شیر خواردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):

یەکەمجار بۆ ماوەی چەند رۆژێک (ثویبە) کەجارییەی ئەبو لەهەب (مامی پێغەمبەر) بوو شیری دا بەمنداڵی تازە لەدایکبوو؛ حەزرەتی (محمد) پاشان عەبدولموتەلیب ویستی بۆ کوڕەزای هەتیوە بێ باوکەکەی کەزۆری لا

---

رەبیعول ئەوەل (٢٠) ی ئیبریل ساڵی (٥٧١) ی زایینیو یەکەم ساڵی فیل پێغەمبەر لەدایك بووە.

خۆشەویست بوو دایەنێك پەیدا بكا، داب و نەریتی دانیشتوانی مەككە وەهابوو: كەمنداڵە ساواكانیان بۆ ماوەی دوساڵ و زیاتر بنێرنە لادێ و لەسارادا دایەنیان بۆ بگرن، بۆ ئەوەی ئەركی بەخێو كردن و شیر پێدانیان لەئەستۆ بگرن، چونكە ئاوو هەوای لادێ پاك و خاوێنترە، ئەخلاق و رەوشتی سارا نشینەكان مۆركی رەسەنایەتی پێوەیەو دوورە لەمەفسەدەو عەیبەكانی شارەستانی، هەروا زاراوەو زمانی لادی یەكان بەساخی دەمێنێتەوە، جا بۆ ئەوەی منداڵەكانیان لەو ئاوو هەوایە هەڵمژن و بەو ئەخلاق و رەوشتە رەسەنەو بەو زمانە پاراوو نەگۆڕاوە گۆش بكرێن، بەزارۆكی و ناسكی، بۆ ماوەیەك بەدایەنی لادێییان دەسپاردن.

لەو سەرو بەندەدا كەبڕیار بوو، عەبدولموتەلیب كوڕەزاكەی بنێرێتە لای دایەن، كۆمەڵێك دایەنی شیر دەر لەهۆزی بەنی سەعد: كەلە زمانپاراوی و چاك دایەنی دا ناوبانگیان هەبوو، هاتن بۆ مەككە، بۆ وەرگرتنی منداڵی شیرە خۆرە، یەكێك لەو دایەنانەی هاتبوون بۆ ئەو مەبەستە، خاتو حەلیمەی (السعدية) بوو، لەگوندی خۆیەوە هاتبوو بۆ مەككە، ئەو ساڵەش ساڵێكی بێ بارانی و تەنگ و چەڵەمە بوو، گوزەران زەحمەت بوو، گرانی باڵی رەشی بەسەر وڵات دا كێشابوو، پێش هاتنی حەلیمە هەموو دایەنەكان ئەوەیان رەت كردبووەوە كە (محمد) وەربگرن و لەگەڵ خۆیان بیبەن چونكە بێ باوك بوو، هومێدی ئەوەیان نەبوو لە باپیرو یادایكی منداڵەكە سودێكی مادییان دەست بكەوێ، خاتو حەلیمەش یەكەمجار هەمان هەڵویستی نواندو رازی نەبوو وەری بگرێ و ببێتە دایەنی، بەڵام ماوەیەك لەمەككە مایەوە، منداڵی تری دەست نەكەوت، پێشی ناخۆش بوو بەبێ منداڵ بگەڕێتەوە بۆ لادێ، بۆیە بەناچاری گەڕایەوە بۆ لای ماڵی ئامینەو حەزرەتی موحەممەدی وەرگرت و لەگەڵ خۆی بردی، دەستی لەخێرو بەرەكەت گیر

بوو، بە لە خۆگرتنی (محمد) و دایەنی کردنی لەلایەن حەلیمەوە، وەزعی ماڵی حەلیمە گۆڕا، لەهەموو لایەکەوە خێرو بەرەکەت روی تێ کردن، حوشتریان بەشیر بوو، شیری مەمکەکانی خۆی کەلەوە پێش منداڵە ساواکەی خۆی پێیان تێر نەدەبوو، ئێستا لەهەردوك منداڵەکە زیادە، خۆشی و ئارامی باڵی خێری بەسەر خێزانەکەیان دا کێشا، هەموو ئافرەت و پیاوی هۆبەکە حەسوودییان پێ دەبردو هەموو دەیانگوت ئەی خاتو حەلیمە! بەختت یار بوو کەئەم شیرە خۆرە پیرۆزەت دەست کەوت!.

بەو شێوەیە دووساڵ بەسەر ژیانی (محمد) دا تێپەڕی لەناو خێڵی بەنو سەعددا، ڕۆژ بەڕۆژ لەگەشە کردن و پێگەیشتن دا بوو، کاتی ئەوەهات حەلیمە لەشیری ببڕێتەوە. ئیتر هێنایەوە بۆ لای ئامینەی دایکی و داوای لێ کرد ڕێگەی بدا ماوەیەکی تر (محمد) بباتەوە بۆ لادێ و بەخێوی بکا، ئامینەش چونکە لەبەخێو کردنەکەی زۆر رازی بوو دڵی حەلیمەی نەشکاند رازی بوو سەر لەنوێ حەلیمە (محمد) بباتەوە بۆ لادێ و لەوکاتەدا کە (محمد) لەناو خێڵی بەنی سەعددا وردە وردە پێ دەگەیی. ڕۆژێك لەڕۆژان دوو فریشتە هاتن سنگیان لەت کردو نوختەیەکی ڕەشیان لێ دەرهێناو دڵیان شوشت و خاوێنیان کردەوەو دوایی سنگیان وێك هێنایەوە خستیانەوە سەرحاڵەتی سروشتی خۆی.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەلادێ لەگەڵ برا شیرییەکانی شوانی بزن و مەڕی کردوە، لەسەر شێوەی ژیانی گوندنشینان و ژیانی ساکارو سروشتی پەروەردە بوو، هەر لەو هۆبەدا، (هوبەی بەنی سەعد) زمانی پڕژاو بەزمانی زکماك و پاراوو ڕەوان کەوتە قسە، خێڵی بەنو سەعد لەناو هەموو خێڵە عەرەبەکان دا مەشهوور بوون بەزمانپاراوی و قسە ڕەوانی. بۆیە لەوەدوا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەهاوەڵانی دەفەرموو(أنا أعربكم، أنا قريشي،

واسترضعت في بني سعد بني بكر) ئەمن لەئێوە باشتر زمانی عەرەبی دەزانم‌و زمان فەصیح‌و قسە ڕەوان ترم، ئەمن بەریشەو نژاد قورەیشیم‌و لەناو خێڵی بەنو سەعددا شیرم مژیوەو زمانم پژاوە.

## لەدونیا دەرچوونی ئامینەو عبدولموتەلیب.

وەکوو لەسیرەدا هاتووە، حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) چوار یان پێنج ساڵ لەناو خێڵی بەنو سەعددا لەژێر سۆزو پەروەردە کردن‌و چاودێری حەلیمەدا ژیانی بەسەربرد، ئەمجار لەسەر داوای خاتو ئامینەی دایکی خاتو حەلیمە حەزرەتی موحەممەدی هێنایەوە بۆ مەککە، بۆ لای دایکی. کاتێك پێغەمبەر تەمەنی گەیشتە شەش ساڵی خاتو ئامینە بەمەبەستی زیارەتکردنی گۆڕی مێردە جوانەمەرگەکەی‌و هەروا بۆ ئەوەی (محمد) گۆڕی باوکە نەدیتوەکەی ببینێ دیدەنی خاڵوانی باپیری بکا بۆ ئەوەی بیناسن‌و بیانناسێ بۆ ئەم مەبەستانە هەموو لەگەڵ موحەممەد دا سەفەری مەدینەی کرد، لەکاتی گەڕانەوەیان بۆ مەککە لەڕێگا لەنێوان مەککەو مەدینە لە شوێنێك کەپێ ی دەگوترێ: (الأبواء) خاتو ئامینە نەخۆش کەوت‌و گیانی دەرچوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەو تەمەنە منداڵی یەوە دووجار هەتیو کەوت لەوغەریبیە، مەرگی دایکی ئازیزی بینی. ئەمەش جۆرێك بوو لەپەروەردەو ئامادە کردن بۆ لەئەستۆ گرتنی ئەو ئەرکە گەورەیەی کەلەداهاتودا خرایە ئەستۆی، بەراستی مردنی باوکی‌و ئەمجار دایکی، نهێنی پەروەردەی خودایی بوو، کارێك بوو هەر خودا نهێنی یەکەی دەزانی. پاش بەخاك سپاردنی ئامینە (ئومو ئەیمەن بەرەکە)ی حەبەشی مەحەممەدی هێنایەوە بۆ مەککەو بەباپیری (عبدالمطلب) سپارد عەبدولموتەلیبیش هێندەی تر سۆزی خۆی دایەو باوەشی گەرمی

باوکایەتی بۆ کردەوە، بیرۆشیی عەبدوڵڵای بەو دەهێنا، بۆ هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەك بچوویایە لەگەڵ خۆی دەیگێڕا، کەدەچوو بۆ کەعبە لەگەڵ خۆی دەیبردو لەژێر سێبەری کەعبەدا لەلای خۆی لەسەر فەڕشەکەی دایدەناو دەیلاواندەوە، تائەندازەیەکی زۆر هەتیوی پێوە دیار نەبوو!

کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵانە عەبدولموتەلیبی باپیریشی مرد، دووبارە حەزرەتی (محمد) هەتیو کەوتەوە، وەڵێ ئازاری هەتیوی ئەمجارەی زۆر لەهی پێشوو کاریگەر تر بوو، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەپێشتر باوکی مردبوو، نەیدیبوو، لەسۆزو خۆشەویستی باوکانەی بەهرەمەند نەبوو بوو، هەستکردنی بەبێ باوکی هەستێکی. عەقڵی تەقلیدی بوو، بەڵام بە لەدەستدانی عەبدو لموتەلیبی باپیری جەرگی ژانی کرد، هەستی کرد پشتیوان و سەرپەرشتیکارو دڵسۆزی لەدەستداوە، قەڵای قایمی ژیانی روخاوە، جودا وازیی نێوان حاڵتی هەتیو بوونی بەهۆی لەدەستدانی باوکی و هەتیو بوونی بەهۆی لەدەستدانی باپیری ئاسمان و ریسمان بوو!

## پێغەمبەر لەگەڵ ئەبوطالیبی مامی دا:

لەدوای مردنی عبدولموتەلیب، ئەبوطالیبی مامی گرتیە لای خۆی، ئەبو طالیب مامی باك و دایکی پێغەمبەر بوو، عەبدولموتەلیب کەلەژیانا بوو زۆر جار ئەبوطالیبی رادەسپارد کەئاگاداری (محمد) بکا، (ئەبو طالیب) یش لەلای خۆیەوە زۆری خۆش دەویست، لەکوڕەکانی خۆی (عەلی و جەعفەرو عەقیل) زیاتر گرنگی پێ دەداو چاودێری دەکرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) زۆر وەگری بو بوو، پێ ی خۆش بوو هەمیشە لای بێ. تەنانەت دەگوترێ: ئەبو طالیب لەگەڵ کاروانێك دا خۆی سازدا بچێ بۆ شام بۆ بازرگانی، لەو

کاتەدا پێغەمبەر (درودى خواى لەسەربێ) تەمەنى نۆساڵ بوو،[43] لێ ی پاڕایەوە لەگەڵ خۆی دا بیبا بۆ سەفەرەکە، هێندەی لێ پاڕایەوە ئەبو طالیب دڵی نەرم بوو لەگەڵ خۆی بردی، کاتێ کاروانەکە لە وڵاتی شام لەشوێنێك: کە پێ ی دەگوترێ: (بصري) کاروانبەزییان کرد لەنزیك ئەو شوێنە رەبەنێکی لێ بوو، لەخەڵوەتخانەکەی خۆی دا خودا پەرستی دەکرد زۆر نیشانەو دیاردەی سەیری لەپێغەمبەر بینی رێزی لێ گرتن و خواردنی بۆ دروستکردن و زۆر گرنگی پێ دان بەجۆرێك کەلەوەپێش ئەو راهیبە ئەم هەڵس و کەوتەی لەگەڵ کەسی تر نەکردوە، لەدوای بینینی ئەو نیشانانە لەحەزرەتی موحەممەد داو دڵنیا بوونی لەوەی کەدیاردەی پێغەمبەرایەتی تێدایە، بەئەبوتالیبی راگەیاند،کە ئەم کوڕە لاوە دوا رۆژێکی گەورەی دەبێ، رایسپارد کە زۆر ئاگاداری بێ. پێ ی گوت برازاکەت بگێڕەوە بۆ مەککەو ئاگات لێ بێ جولەکە دەستی لێ نەوەشێنن، بێگومان ئەم برازایەت کارێکی گەورەی دەکەوێتە ئەستۆ، ئیتر ئەبوطالیب بەپەلە پرۆزە گێڕایەوە بۆ مەککە.

بێگومان ئەم رووداوو چیرۆکە لە (سیرة ابن هشام) و کتێبەکانی تریش دا بەدورو درێژی باس کراوە، زۆر لە رەخنە گرانو حەدیث گێڕەوەکان قسەیان لێ کردوە، لەکتێبی (سیرة النبي) دانراوی زانای بەناو بانگ (شبلي النعماني) دا دەڵێ: هەموو ریوایەتەکانی ئەم چیرۆکە (مورسەلن) هەموو ئەوانەی ئەم چیرۆکەیان گێڕاوەتەوە گوایە لەهاوەڵانی پێغەمبەریان بیستووە، وانیە لەهاوەڵانیان نەبیستووە بەڵکوو لەهی تریان بیستووە ئیمامی تورموزی دوای ئەوەی ئەم حەدیثەی ریوایەت کردوە وتویەتی:

---

[44] سیره ابن هشام جـ ١/١٧٩.

(حديث حسن غريب) جگە لەم شێوەو ریوایەتە بەهیچ شێوەیەکی تری ریوایەت نایناسین.

یەکێك لەریوایەکانی ئەم حەدیثە عەبدورەحمانی کوڕی غەزوانە زۆر لەزانایانی زانستی حەدیث دەربارەی قسەیان کردوە، ئیمامی ذەهەبی دەفەرموێ: عەبدو رەحمانی کوڕی غەزوان کۆمەڵێکی زۆری لەحەدیثی مونکەر ریوایەت کردون، لەهەموان مونکەر تر ئەم حەدیثە یە کە چیرۆکی بوحەیرای تێدایە، ئەوەی کەوا زۆر جێگای رەخنەیە لەم حەدیثەدا ئەو بەشەیەتی: کە دەڵێ: ئەبو طالیب پێغەمبەری پێغەمبەری لەگەڵ بیلال دا ناردەوە، ئیبنولقەیم لەکتێبی (زاد المعاد) دا دەڵێ: لەکتێبی (تیرمیذی) و کتێبی تریش دا هاتووە دەڵێ: ئەبوطالیب لەگەڵ پێغەمبەردا بیلالی ناردەوە، ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە، چونکە ئەو کاتە لەوانەیە بیلال هەر لەدایك نەبووبێ ئەگەر هەشبووبێ نەلەگەڵ ئەبو طالیب بووە نەلەگەڵ ئەبو بەکر بووە.[44]

کۆتایی ئەم رەخنە بەو قسەیەی ذەهەبی دێنین کەدەربارەی چیرۆکی بوحەیرا دەڵێ: ئەو حەدیثە حەدیسێکی مونکەرە بەمەعنای واتا، کوا ئەبوبەکر ئەو کاتە لەوێ بووە؟ کوا ئەبو بەکر ئەوکاتە دە ساڵانە بوو؟ خۆ ئەو بەدووساڵ و نیو لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بچوکتر بوو؟ کوا ئەوکاتە بیلال لەوێ بووە؟ بێگومان ئەبو بەکر تادوا رەوانەکردنی پێغەمبەرو ئیمانهێنانی ئەبو بەکر پێ ی بیلالی نەکڕیبووەوە، بەڵکوو دەتوانین بڵێین ئەوکاتە بیلال هەر لەدایك نەبوە!!!

---

[44] زاد المعاد جـ١/١٨ لێرەدا قسەی نعمانی تەواو بوو.

دووباره ئەگەر راست بێ پێغەمبەر هەوری لەسەر بووبێ چۆن دەتوانین تەصەوری ئەوە بکەین کەسێبەری درەختەکە بۆ لای پێغەمبەر چووە؟ چونکە سێبەری هەورەکە وایکردوە کەسێبەری ئەو درەختەی کەپێغەمبەر لەژێریا دانیشتووە هەستی پێ نەکرێ!! سەرباری ئەوەش ئێمە نەمان دیوەو نەمان بیستووە جارێك لەجاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قسەی بو حەیرای راهیب بیر ئەبوطالیبی مامی بێنێتەوە، هەروا قورەیشییەکان لەناو خۆیان دا هەرگیز باسی ئەم روداوەیان نەکردوە، پیاوی پیرو پیاو ماقوڵانیشیان ئەم چیرۆکەیان نەگێڕاوەتەوە، هەرچەندە ئەمە مەوزوعێکە بەلایانەوە گرنگ بووەو ئەگەر شتی وابوایە دەبوایە بیانگێڕایەوە.[45]

## ❧ نموونەیەکی ناوازە دەربارەی دەمارگیری ئایینی رۆچۆن لەقسەی بێ بناغەو نامەعقول:

خۆر هەڵاتناسە داخ لەدڵەکان ئەم چیرۆکەیان قۆستۆتەوە، هاتون هەودایان کردوە بەگوریس و حەببەیان کردوە بە قوببە، دیتنی پێغەمبەر بەراهیبێکی مەسیحی کە کەسایەتی و پلەو پایەی نادیارە، کردویانە بەبناغە بۆ بڕی فەرەضیات و مەزندەکردنی نامەعقول، ئەوەتا ئەم بەیەکگەیشتنەی پێغەمبەرو بوحەیرای راهیبیان کردوە بەبنەما بۆ ئەوەی گوایە حەزرەتی موحەممەد بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی خاڵ بەخاڵ لەزانایەکی مەسیحی وەرگرتووە، لەوەش سەیرتر زانای فەرەنسی Carrabe Vaux کتێبێکی/سەربەخۆی داناوە ناوی ناوە (مؤلف القرآن)، واتە: دانەری قورئان، لەو کتێبە دا هەوڵی ئەوەی داوە، کەبیسەلمێنێ

[45] السيرة النبوية للذهبي (طبع دار الكتب العلمية ص ٢٨-٢٩).

بوحەیرای راهیب لەم بەیەکگەییشتنە کورتەدا هەموو قورئانی فێری موحەممەد کردوە!!!

ئەمە (ئەگەر ئەم ریوایەتە راست بێ) هەر کەسێك تۆزقاڵێك عەقڵ و هۆشی هەبێ و خاوەنی کەمێك ویژدان بێ، قسەی واناکا. چۆن تەصەور دەکرێ منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵە یان لاوێکی دوانزە ساڵە لەو ماوە کورتەدا ئەو هەموو مەسائیلە وردو لێکۆڵنەوە قوڵانە، ئەو هەموو رەخنە کاریگەرانە دژی بتپەرستی و ئایینی مە سیحی و یەهوودی لە مامۆستایەك وەربگرێ کەلەزمانی حاڵی نەبوەو بەهۆی تەرجەمەوە لەیەك گەیشتون، چۆن موحەممەد توانی لەو ماوە کورتەدا ئەو قورئانە فەصیح و بەلیغە کەلە ئاستی هەرە پلەی بەرزی دا خۆی دەنوێنێ لەبوحەیرا وەربگرێ، چۆن بوحەیرا توانی لەو دانیشتنە کورتەدا لەسەر سفرەی نانخواردن ئەو مەسەلە وردو قوڵانە کەتائێستاش گەورە رەخنەگران و چاکسازو چاکخوازە ناودارەکانی جیهانی مەسیحی پەییان پێ نەبردوە، ئەو جیا کردنەوە وردو زانستیانەی قورئان لەنێوان بیرو باوەڕە جیاجیاکانی مەسیحیەکان دا کردویەتی کەی لەتوانای رەبەنێکی مەسیحی نیوەی سەدەی شەشەمی زایینی دایە؟ زیاد لەوە قورئان باسی هەندێ روداوی کردوە کەسی ساڵ یان چل ساڵ لەوە دوا هاتوونە جێ، کاتێك هاتوونەجێ ئێسقانی بوحەیڕا پۆڵکاون. وەکوو تێشکانی رۆمەکان لەبەردەم سوپای فارس لە ساڵەکانی سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایینی (٦٠٣-٦١٦)ز رۆمەکان تێشکان و پاشە کشەیان کرد تاوای لێهات ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی کەوتە گیانەلاوەوە بوو بە موستەعمەرەیەکی بچوکی بێ هێزی ساسانی، کەس بەهیوای ئەوە نەبوو جارێکی تر دەوڵەتی بێزەنتی هێز پەیدا بکاتەوەو بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی پێشووی، بەلام هێندەی پێ نەچوو رۆمەکان بەسەر فارسەکان

زاڵبوونــەوە، بــەجۆرێك ســوپای روم هاتــە قــوڵایی خــاکی ئێرانــەوە، ئــاڵای سەرکەوتنی لەناوەڕاستی ئێران دا چەقاند، نەتەوەی ئێرانی غەرقی خوێن و فرمێسك کرد، سوکایەتییان بە ئاتەشگەدەو عیبادەتخانەکانی گەلانی ئێران کرد، ئـەمجار ســوپاکەیان بەســەر کـەوتویی لەپایتــەختی ساسـانیەکانەوە گەڕایـەوە، ئـەم روداوانـە هــەموویان لـەماوەی نـۆ سـاڵ دا رویـان دا[46] دەی دەق ئەوەیە کەقورئان رایگەیاندوە کەدەفـەرموێ: ﴿الم. غُلِبَتِ الرُّومُ. فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ. يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ. سورة الروم (١-٧)﴾.

دەی ئەمـە هـەواڵ دانێکـی غـەیبی یـە، خـودا نـەبێ کەسـی تـر نایزانـێ و دەسەڵاتی بەسەر دا ناشکێ، ئەمە تـەنیا لـە دەسـەڵاتی ئـەو خودایـە دایـە کـە گۆڕانکاری لەشەوو رۆژدا دەکا، بەشێ لەشەو دەخاتە سەر ڕۆژ، یـان بەشـێ لـەڕۆژ دەخاتــە ســەر شــەو، زینــدو لــەمردو وەدی دەهــێنێ مــردو لەزینــدو دەردەهێنێ، هیچ شتێك لەو ڕۆژەدا لەو هەواڵە خەیاڵی تر نەبوو، لەکاتێك دا قورەیشییە موشریکەکان پێخۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بەرامبـەر سـەرکەوتنی فارسە ئاگر پەرستەکان بەسـەر رۆمـە مەسیحیەکان دا، ئالـەم کاتـەدا قورئـان تەحـەددای ئـەو واقیعـەی کـردو فـەرمووی (وهـم مـن بعـد غلـبهم سيغلبون في بضع سنين) وشـەی (بضـع) لـەخوار ژمـارە (دە)وە دەگەیـەنێ، لـەنێوان ژمـارە حـەوت بـۆ ژمـارە نـۆ. سـەرکەوتنی رۆمـەکان بەسـەر فارسـەکان دا لەدیـدی قورەیشییەکانەوە زۆر دوور بوو تەنانەت گرەویان لەسەر کرد، چونکە پێیان وابوو جارێکی دی رۆمەکان هەڵناستنەوەو سەر کەوتن بەدەست بێنن.

---

[46] المدخل الى الدراسات القرآنية (حسن الندوي) طبع دار الصحوة للنشر – القاهرة سنة ١٩٨٦ ص ٧٥-٩٣.

**مێژوو نووسی ئینگلیزی (ئەدوارد جبون Edward Gibon) دەڵێ:** لەکاتێك دا سەرکەوتنی فارسەکان بەسەر ڕۆمەکان دا گەیشتە لوتکە، ئالەو کاتەدا (محمد) هەواڵی ئەوەی ڕاگەیاند، کەلە ماوەی کەمتر لە دەساڵی داهاتوودا ڕۆمەکان هەڵدەستنەوەو فارسەکان دەشکێنن‌و ئاڵای سەرکەوتنیان بەسەر وڵاتی خۆیان‌و وڵاتی فارس دا دەشەکێنەوە، وەدی هاتنی ئەم هەواڵە هێندە دورو غەریب بوو قورەیشییەکان لەگەڵ حەزرەتی ئەبو بەکردا گرەویان لەسەر کرد کەشتی وانابێ، چونکە لەدیدی خەڵکی ئەو سەردەمەدا هیچ شتێکی تر هێندەی وەدی هاتنی سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان دادوورو خەیاڵی نەبوو، چونکە لەو کاتەدا ئیمپراتۆرییەتی ڕۆم کەوتبوە گیانەڵاوەوە، دوازەدە ساڵی یەکەمی فەرمانڕەوایی هیر قەل بەئاشکرا ئەوەی دەگەیاند کە ئیمپراتۆرییەتی ناوبراو بەتەواوی لێك هەڵدەوەشێ و کۆتایی بەروخانی دێ[47] وەلێ ساڵی (٦٢٥ز) = ساڵی دووەمی کۆچی لەکاتی غەزای بەدردا ئەو هەواڵە غەیبی یەی موحەممەد ڕایگەیاند بوو بەشێوەیەکی غەریب‌و سەرنج ڕاکێش وەدی هات، ڕۆمەکان فارسەکانیان شکاندو سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

جبون ئەدوارد بەشێوازێکی ئەدەبی بەرزو ناسك دەڵێ: چۆن تەم‌و مژی بەیانی بەتیشکی خۆری پرشنگدار تەفرو تونا دەبێ، هەر بەوشێوە پاشای تەنپەروەری هەوەسباز، کەجگە لەرابواردن‌و دڵداری‌و مەیخۆری و تەنپەروەری هیچی تری نەدەزانی و نەدەکردو بۆ ژیانی تەنپەروەری و هەوەسبازی شانی لەشانی (ئەرکا دیوس)ی ڕۆژگاری خۆی دەدا[48]

---

[47] تأريخ انحطاط روماو سقوطها ج٣ص ٣٠٢-٣٠٣ طبع ١٨٩٠ ز .

[48] ئەرکا دیوس پاشایەکی رومی هەوەسبازو خەلاعی بووە لەمێژووی ئەوروپا بۆتە نمونەی تەنپەروەری‌و هەوەسبازی لەرادەبەدەر .

لەپڕێکا بوو بەجەنگاوەرێکی بێ وێنەو سوپا سالارێکی ورەبەرزو لێزان، سەرکردایەتی سوپای رومای کرد سەرکەوتنی بە دەست هێناو وەکوو (سیزر)[49] چووە ناو مێژووەوە. بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش کەرامەت و سەروەری بۆ هیر قەڵ و روما گێڕایەوە، خستنییەوە ئاستێك وەکوو پێشو حیساب و ئیعتیباری خۆیان بۆ بکرێ.[50] ئەمە جگە لەچەند راگەیاندنی هەواڵی غەیبی تر. کەهەموویان بە (قیاس) و قەرینەو نیشانە زۆر لەواقیع دووربوون، وەکوو سەرکەوتنی ئاشکرای (پەیمانی حودیبییە) کەلەدیدی زۆر لەموسوڵمانەکانیش دا بەشکست دەژمێردرا[51] هەروا هەواڵی موسوڵمانبوونی خەڵك پۆل پۆل[52] هەروا هەواڵدان بەوەی کەئایینی ئیسلام بەسەر هەموو ئایینەکان دا باڵا دەست دەبێ و موسوڵمانان دەبنە خاوەن هێزو سەروەری ئەمەلە کاتێك دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەم هەواڵانەی راگەیاندن کەموسوڵمانان لەوپەڕی بێ هێزی دا بوون، دەترسان دوژمنەکانیان بیان رفێنن، هەروا هەواڵی ئەوە: کەقورئان پارێزراو دەبێ و دەخوێندرێتەوەو تەفسیر دەکرێ و زۆر ترین ژمارەی ئادەمیزاد لەبەری دەکەن[53] هەروا زۆری تر لەم جۆرە هەواڵە نهێنی و نبواتە غەریب و راگەیاندنە سەرنج ڕاکێشانەی کەتەحەدای عەقڵ و قیاسیان کردو قورئان

[49] ئیمپراتورێکی رۆمی بوو لەو ڕۆژگاری خۆی دا زۆر وڵاتی گرتون و سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناون.

[50] انحطاط روما/٣٠٥ ص/٣٠٤ طبع/١٨٩٠

[51] سەیری سورەتی (الفتح) بکەو بیخوێنەوە.

[52] سوره النصر.

[53] سورة القیامة وسورة الحجر.

پڕیەتی لێیان .[54] هەڵبەتە کەسێك دەمارگیری ئایینی کوێری نەکردبێ و نە کەوتبێتە پێ مەلە لەدەریای خەیاڵ داو رۆنە چووبێ لە دروستکردنی فەرەضیات و مزەندە کردنی بێ جێ و ڕێو ئاڕاستە کردنی بیرو باوەڕی گاڵتە بازاری و قوڵبوونەوە لەدژایەتیکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دا نایە ئەو دەنکە گەنمە بچکۆلە بکاتە ئەو گوممەزە گەورەیە، کەسێك وانەبێ نایە لەچیرۆکی بوحەیرای راهیب ئەوە مەزەندە بکا کەلەوماوە کورتەی بەیەکگەییشتنی حەزرەتی موحەممەدی تەمەن نۆ ساڵو بوحەیرای راهیب لەسەر سفرەی نان خواردن، بڵێ: موحەممەد هەموو قورئانی لەبوحەیرا وەرگرت!!!. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەچیرۆکی بوحەیرای راهیب لەزۆربەی کتێبەکانی سیرەدا باس کراوە ئێمە لێرەدا نەمان دەهێناو رەخنەشمان لێ نەدەگرت!!!.

## پەروەردەی خودایی (التربية الألهية):

بەڵێ ئاشکرایە لەژێر چاوەدێری پەروەردگاردا حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) پێگەیی و نەش و نمای کرد، دوور لەبیرو باوەڕی پۆخەڵی سەردەمی نەفامی و داب و نەریتی ناشرینیان پەروەردە بوو، بووە پیاوێك لەناو نەتەوەکەی دا لەهەمووان پیاو ترو بەمرووەت تر، لەهەموان رەوشت جوانترو بەرزتر، لەهەموان بەحەیاترو راستگۆترو دەست و داوێن پاکتر، تەنانەت وشەی (الأمين) یان بۆ کردبوو بەئاوەڵناوو پێیان دەگوت (محمد

---

[54] دەتوانی لەبەرگی سێ ی کتێبی (السيرة النبوية) ی سلێمان نەدەوی لەژێر سەرە باسی (الأخبار الغيبية) ئەم هەواڵانە بەدرێژی بخوێنیەوە.

الأمـين)[55] خـودا پاراسـتی لـەوەی بکەوێتـە نـاو زلکـاوی داب و نـەریتێك کەشـیاوی ئەونـە بـوو، خـودا پاراسـتی لـەوەی پابەنـدی داب و نـەریتی سـەردەمی نـەزانی ببـێ، داب و نـەریتێکی زۆر ناشـیرین و قێـزەون، کـە ئـەوان بەلایانـەوە ناشـرین نـەبوو سـەریان بـۆ هەڵنـەدەبڕی. صـیلەی رەحمـی بـەجێ دەگەیانـدو خـەم و خەفـەتی نەتەوەکـەی هـەڵگرتبوو، رێـزی میـوانی دەگـرت و هاریکاری دەکرد لەسەر چاکەو تەقوا،[55] لەبەرو بوومی دەستی خۆی قوتی ژیـانی خـۆی دابـین دەکـرد، قنیـاتی بەبـژێوی خـۆی هـەبوو، کاتـێ تەمـەنی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) گەیـشتە ١٤-١٥سـاڵ جـەنگی فیجـار لـەنێوان قورەیش و هـۆزی قـەیس دا بـەرپابوو پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) چـەند ڕۆژێـك هاوبەشـی ئـەو جەنگـەی کـرد.ئـەو تیرانـەی دوژمـن دەیهاویـشتن هـەڵی دەگرتنـەوە دەیـبردن بەسـەر مامـەکانی دا دابەشـی دەکـردن، بەمـەش فێـری جەنگ بوو سوار چاکی و مەردایەتی جەنگ فێـر بوو،[56] کاتێك پـێ گـەیی روی کـردە کاسـبی و ئیـشکردن، شـوانی بـزن و مـەڕی کـردووە، ئـەوەش کاسبییەکی شەریفانە بوو، رام کردنی نەفس بوو، فێری ئەوە دەبوو بـەزەیی بـەزەعیف و بـێ دەسـەلات دا بێتـەوە چۆنیەتی هـەڵس و کـەوت و خۆپاراسـتن لەحەیوانـە کێویـەکان. هـەوای پـاکی هەڵـدە مـژی و جەسـتەی خـۆی دا دادەرِشـت، سـەرباری ئەمانـە هـەموو شـوانی پـەیڕەویکردنی رێبـازی

---

[55] سیرة ابن هشام ج ١٨٢/١.

[56] شـایەتیدانی خەدیجـە دەربـارەی پێغەمبـەر بخوێنـەوە کەلـە ئەشـکەوتی حـیرا گەڕایەوەو ترسا تووشی نەخۆشی سامناك بوو بێ.

[57] سیرة ابن هشام ج١٦٨/١.

پێغەمبەران بوو، ریوایە تکراوە کەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دوای ئەوەی کرا بەپێغەمبەر فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێك ماوەیەك شوانی کردوە، عەرزیان ئەتۆیش ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی بەڵێ منیش.

بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەمندالی لەخێڵی بەنو سەعددا لەگەڵ برا شیرییەکانی شوانی بزن و مەڕی کردوە، شوانی کارێك بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) باشی دەزانی ئەنجامی بداو پێ ی هەڵسێ، لەکتێبەکانی حەدیث (الصحاح) دا هاتووە کەتەشریفی لەمەککە ماوەیەك شوانی بزن و مەڕی کردوە بەکرێ و چەند (قەراریط)ێکی لەخاوەن ئاژەڵەکان وەرگرتووە.[58]

## مارەکردنی خەدیجە لەلایەن پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ):

کاتێك حەزرەتی موحەممەد تەمەنی گەیشتە بیست و پێنج ساڵی خوازبێنی خەدیجەی کچی خوەیلیدی کردو هاوسەرگیرییەتی لەگەڵ دا بەست و گواستیەوە..

---

[58] زانایانی ئیسلام دەربارەی وشەی (قراریط) کەوتوونە راجیایی یەوە (شێخ ابن ماجە سوید بن سعید) پێ ی وایە (قراریط)کۆی (قراط)ەو بەشێکە لە دیرهەم یان لەدینار، لەسەر ئەم رایە مانای حەدیثە کە ئەوەیە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەکرێ شوانی کردوە، لەم روەوە بوخاری حەدیثەکەی هێناوەو لە (باب الأجارة) دا تۆماری کردوە. ئیبراهیمی حەربی دەڵێ (قراریط) ناوی شوێنێکە لەنزیك الأجیاد، ئیبنولجەوزی ئەم رایەی بەلاوە پەسەندەو عەلامەی العینی پشتگیری ئەم رایەی کردوە بەڵگەی زۆرو بەهێزی هێناونەوە خاوەنی کتێبی (نور النبراس) یش دوای لێکۆڵینەوەیەکی دورو درێژ ئەم رایەی پەسەند کردووە.

خەدیجە لەگەورە ئافرەتەکانی قورەیش بوو، ژنێکی بەڕێزی خاوەن عەقڵو فامی تەواوو ڕەوشت بەرزو دەستو داوێن پاکو ساماندار بوو، لەبنەماڵەیەکی خانەدانی قورەیش بوو، بێوەژن بوو ئەبو هالەی مێردی مردبوو، کەبوو بەهاوسەری پێغەمبەر تەمەنی چل ساڵ بوو تەمەنی پێغەمبەریش (٢٥) ساڵ بوو!!

خەدیجە ئافرەتێکی خاوەن سامان بوو بازرگانی دەکرد، پیاوی بەکرێ دەگرتن دەیناردن بەماڵو سامانی ئەو کاڵا بەرنو بیهێنن، بەشێکی لەقازانجەکە بۆ دیاری دەکردن، وەکوو ئاماژەمان بۆ کرد قورەیشییەکان بۆ خۆیان تێکڕا خەریکی بازرگانی بوون، کاروانی گەرمێنو کوێستانیان بەزستانو هاوین بۆ وڵاتی یەمەنو شام دەکرد، لەوەپێش حەزرەتی محمد بەماڵو سامانی خەدیجە لەگەڵ غولامی خەدیجە کەناوی مەیسەرە بوو سەفەری شامی کردبوو، قازانجی باشی بەدەست هێنابوو، ڕاستگۆییو لێهاتوویی ڕەوشت بەرزی حەزرەتی موحەممەدی بۆ ئاشکرا بو بوو، بەتایبەتی (مەیسەرە) کە نۆکەرو بڕوا پێکراوی خەدیجە بوو بە دورو درێژی باسی هەڵسو کەوتی موحەممەدی بۆ کردبوو، پیاوەتیو دەستو داوێنپاکی حەزرەتی موحەممەدی بۆ دەرکەوتبوو، خۆشەویستی ئەوی لەدڵدا ڕوابوو.. بۆیە خۆی موفاتەحەی پێغەمبەری کرد کەبیخوازێ، هەرچەندە لەوەپێش چەند پیاو ماقوڵو ئەشرافی قورەیش خوازبێنیان کردبوو داواکەیانی ڕەتکردبوونەوەو وتبووی شووناکەمەوە. حەمزەی مامی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خوازبێنی یەکەی لەخەدیجە کردو ئەبو تالیب خوازبێنی لەمامی خەدیجە کردو ڕەزامەندی لەسەر دراو بەگوێرەی

شەریعەتی حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خوای لەسەربێ) خاتوو خەدیجە لەحەزرەتی موحەممەد مارە کرا[٥٩] بەگوێرەی داب و نەریتی تایبەتی ئەو ڕۆژگارە حەزرەتی موحەممەدو خاتو خەدیجە بوون بەهاوسەری یەکتری و بەئەو پەڕی ڕێزو خۆشەویستی یەوە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ یەکتری دەکرد، هەتا خاتو خەدیجە لەتەمەنی شەست و پێنج ساڵی دا لەپێش ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆچ بکا بۆ مەدینە لەدونیا دەرچوو، خاتوو خەدیجە یەکەم ئافرەتێك کە پێغەمبەر مارەی کرد، هەتا خاتو خەدیجەشی هاوسەر بووە ژنی تری نەهێناوەهەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) جگە لەئیبراهیم هەموویان لەخەدیجە بوون.

## چیرۆکی بنیاتنانەوەی کەعبەو کوژاندنەوەی فیتنەیەکی گەورە:

کاتێك پێغەمبەر تەمەنی گەیشتە سی و پێنج ساڵ لافاوێك هاتبوو هەندێ لەدیوارەکانی کەعبەی روخاندبوو، قورەیشییەکان ویستیان کەعبە تێك بدەن و سەر لەنوێ دروستی بکەنەوە (سەقف) یشی بۆ دروست بکەن، لەوەپێش دیوارەکانی بەوشکە کەڵەك هەڵچنرابوون، بەرزی دیوارەکانی کەمێك لەبالاًی پیاوی مام ناوەندی بەرزتر بوو، سەر لەنوێ بناغەیان دانایەوەو دیوارەکانیان بەشێوەیەکی رێك و پێك هەڵچنی یەوە، کاتێك گەییشتنە ئەوەی بەردە رەشەکە بخەنەوە شوێنی خۆی، لێیان بوو بەکێشە هەر بەرەباب و هۆزێك دەیویست شەرەف و رێزی بەرزکردنەوەو دانانی بەردە

---

[٥٩] سیرە ابن هشام جـ ١٨٩/١-١٩٠.

رەشەکە لەشوێنی خۆی بەربکەوێ، لێیان بوو بەکێشەیەکی گەورەو کار گەیيشتە ئەوەی شەڕێکی خوێناوی لەناویان دا بەر پابێ، خۆ لەسەردەمی نەفامی دا لەسەر کاری زۆر بچوکتر شەڕ لەناویان دا دروست دەبوو، هەرتیرەو بەرەبابە لەعاست خۆیەوە خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ بەنو (عبد الدار) جامێکیان خوێن هێنایە گۆڕێو پەیمانیان لەگەڵ بەنو عەدی دا بەست لەسەر مردنو ژیان هەریەکەیان قامکی خۆی خستە ناو قاپە خوێنەکەوە، ئەمەش ئاماژە بوو بۆ پەیمانی مردنو شەڕو کوشتار، قورەیشییەکان بەو شێوە چەند ڕۆژێك شیرو تیریان لێك دەسوو بەرامبەر بەیەك وەستان، دوایی لەسەر ئەوە رێك کەوتن کەناو بڕیکەرێك دابنێن ئەو چی گوت لەقسەی دەرنەچن، وتیان: کێ یەکەمجار لەلای صەفاوە لەدەرگای مزگەوت هاتە ژوورەوە بائەو حەکەم بێ، چی گوت: بەگوێی بکەین، بەفەرمانی خودا یەکەم کەس کە لەو دەرگایەوە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر بوو، کاتێ دیتنیان، وتیان: بەخوا باشە ئەوە (محمد الأمين)ەو هەمووما‌ن بەناو بڕیکردنی ئەو رازین. جاکە پێغەمبەر لەکێشەکە حاڵی بوو، کەمێ بیری کردەوە، فەرمووی چارەکە یەکم بۆ بێنن، پارچە قوماشێکی چوار گۆشەیان بۆ هێنا بەدەستی خۆی بەردەکەی خستە سەر پارچە قوماشەکە، ئەمجار باهەریەکە لەهۆزێك بێ لکێکی قوماشەکە بگرێو تێکڕا بەرزی بکەنەوە، هەموویان تینیان دایەو بەرزییان کردەوە، تاگەیاندییانە شوێنی خۆی.. ئەمجار بەدەستی موبارەکی خۆی بەردە رەشەکەی دامەزراند، پاشان دەستیان کردەوە بەدروستکردنی دیوارەکان[٦٠] بەو شێوەیە

---

[٦٠] سيره ابن هشام جـ ١/١٩٢-١٩٧.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو فیتنە گەورەی کوژاندەوە شەڕی خوێناوی لەقورەیش دوور خستەوە، عەقڵ و حیکمەتێکی ژیرانەی بەکار هێنا، ئەم کارەی سەرەتای کاری فیتنە کوژاندنەوەو دوورخستنەوەی شەڕو ئاژاوە لەگەڵ و نەتەوەکان بوو، دوای پێغەمبەرایەتی بەحیکمەت و دانایی خۆی، بەهێدیەتی و وردبینی خۆی بەردەوام بوو لەکارەکانی داو چاکسازی و چاکخوازی لەنێوان ئادەمیزاد دا دەکرد بەگشتی، بۆ ئەوەی ببێتە رەحمەت بۆ جیهان وەکوو چۆن رەحمەت و فیتنە کوژێنەوە بوو لەنێوان کێشەکاران و شەڕ کەران دا لەناو نەتەوەیەکی ساکارو نەخوێندەواردا.

## سوێند خۆریی الفضول (حلف الفضول):

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەپەیمانی فضول دا ئامادە بوو، ئەم پەیمان و سوێند خۆرییە رێزدارترین پەیمان بوو کەلەسەر دەمی جاهیلی دا بیسترابێ و بەسترابێ، هۆی بەستنەی ئەم سوێند خۆرییە ئەوە بوو، پیاوێکی زوبێدەیی بۆ بازرگانی کردن هەندێ کاڵای هێنا بوو بۆ مەککە، عاصی کوڕی وائیل (کەیەکێك بوو لەپیاو ماقوڵانی قورەیش) کاڵاکەی لێ کڕی بوو پارەکەی نەدەدایە، هەردەستی دەستی پێ دەکرد، کابرای زوبێدەیی هانای بۆیەکە بەیەکەی پیاو ماقوڵانی قورەیش بردو داوای لێ کردن یارمەتی بدەن، پارەکەی بۆ لە (عاص) وەربگرن، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە پلەو پایەی عاص لای قورەیشییەکان زۆر گەورە بوو، ئیتر کابرای زوبیدەییان پاڵ پێوە ناو ناهۆمێدیان کرد، ئەمجار کابرا هونراوەیەکی لەبارەی خۆی و قورەیشەوە دانا بوو، لەبەیانییەك دا کەقورەیشییەکان

لەیانەکەیان دا بوون سەرگەرمی گفتو گۆو مشتو مڕ بوون، کابرا هاتە لای کەعبـەو بەحەماسـەتەوە هونراوەکـەی خوێنـدەوە، ئـەم هۆنراوەیـە کاریگەریەکی زۆر گەورەی کردە سەر قورەیشو هەژاندنی، زوبەیری کوڕی عەبدولمەتەلیب هەستایە سەر پێو وتی: ئەمە ستەمێکی گەورەیە نابێ لێ ی بێدەنگ بین، غیرەتو پیاوەتی هەندێ لەپیاوانیان جولاو کۆمەڵێك لەبەنو هاشمو بەنومەتـەلیبو بـەنو ئەسـەدو زوهـرەو تەیمییـەکان کۆبوونـەوەو رۆیشتن بۆ مـاڵی عەبدوڵلای کـوڕی جـەدعانو لـەماڵی ئـەودا کۆبوونـەوە خواردنیـان لـەماڵی عەبـدوڵلادا بـۆ ئامـاکراو نانیـان خـواردو بڕیاریـان داو پەیمانیان بەست، کەهەموویان بەیەك دەنگو یەك هەڵوێست دژی ستەمکار دەوەستنو پشتگیری ستەم لێ کراوان دەکەن، تا مـافی خۆیـان وەردەگرن، قورەیش ئەم پەیمانە یان ناو نا پەیمانی فوضول، وتیان ئەمانە هاتوونە ناو پەیمانێکی گەورەوە، ئەرکێکی پیرۆزیان خراوەتە ئەستۆ، ئەمجار هەموویان رۆیشتن بۆ لای ماڵی عاصی کوڕی وائیلو بەگەلە کۆمەکی کالای کابرای زوبەیدە ییيان لێ سەندەوەو دایانەوە بەکابرا.[٦١] لەوە دوا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەرکە باس بکرایە شانازی بەو پەیمانە دەکردو پابەند بوو پێیەوە تەنانـەت دوای ئـەوەی کـرا بەپێغەمبـەرو بانگەوازیـشی دەسـت پـێ کـرد، هەمیشە دەیفـەرموو: لـەماڵی عەبـدوڵلای کـوڕی جـەدعان ئامـادەی سوێند خۆریو پەیمانێك بوم ئەگەر ئێستاش بۆ پەیمانێکی ئاوەها بانگ بکرێم بەخۆشحاڵی یەوە دەچم، لەو پەیمانەدا بڕیار درا کەماف بدرێتەوە بەخاوەن مافو هیچ کاتی ستەمکار بالا دەست نەکرێ بەسەر ستەم لێکراودا.

---

[٦١] سیرة ابن کثیر جـ ١/ ٢٥٧-٢٥٩.

هەرکەسێ بەوردبینی یەوە لەبارودۆخی ناو جەزیرە بەگشتی و هی مەککە بەتایبەتی بکۆڵێتەوە، بڕوانێتە مەککە لەڕوی ئایینی و ڕۆشنبیری و سیاسی و...هتد ئەو واقیعە کە لەو ڕۆژگارەدا مەککە لەهەموو روێیکەوە پایتەختی جەزیرە بووە. بۆی دەردەکەوێ کەهۆی بەستنی ئەم پەیمانە لەلایەن هەندێ ویژدان زیندوو خاوەن هەستی مرۆڤایەتی یەوە تەنیا ئەو روداوەی کابرای زوبەیدەیی و عاصی کوڕی وائیل نەبوە، لەبەر ئەوە نەبوە کەما فی هەندێ کەس لەلایەن هەندی کەسی ترەوە پێشێل کراوە! بەڵکوو هۆکاری بەهێزو کاریگەر بۆ بەستنی ئەو پەیمانە هەبوونی دڵە راوکێ و بەرپابوونی فەوزاو نەمانی متمانە بەیەکتری کەسەر تاپای مەککەو دەوروبەری مەککەی گرتبوەوە، هەموو دانیشتوانەکەی هەستیان دەکرد کە زۆر پێویستییان بەئاسایس و ئارامبوونەوە هەیە، بەتایبەتی دوای شەڕی فیجار- هەستیان بەوە کرد کەپێویستە ڕێزی ئادەمیزاد بگیرێ، پارێزگاری ئەوانە بکرێ کەلە دەرەوە دێن بۆ مەککە بەمەبەستی بازرگانی و ئیشکردن،

## دڵە راوکێ یەکی بێ سەرو شوێن و چاوەڕوان نەکردنی پێغەمبەرایەتی:

حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەرو بەندی پێش ئەوەی بکرێ بەپێغەمبەر هەمیشە دڵەراوکێ یەکی بێ سەرو شوێنی لەدەروون دا هەبوو، هەستی بەو دڵەراوکێ یە دەکردو نەشی دەزانی سەرچاوەکەی لەکوێوە یەو ئاکامەکەی بەچی دەگا. ساتەوە ختێکیش بەخەیاڵی دانە هاتووە کەڕۆژی لەڕۆژان خودا نیگای بۆ دەکاو پلەی پێغەمبەرایەتی پێ دەبەخشرێ، هیچ

کاتێکیش بەهیوای ئەوە نەبوە، لەم ڕووەوە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ. سورة الشورى(٥٢)﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَى إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَافِرِينَ. سورة القصص(٨٦)﴾.

ئەتۆ ئەی پێغەمبەر بەهیوای ئەوە نەبووی کەنیگات بۆ بکرێو نامەی ئاسمانیت بۆ ڕەوانە بکرێ، حیکمەتو بڕیاری خودا وەهابوو کەبەنەخوێندەواری پێ بگا نەبزانی بخوێنێتەوە، نەبزانێ بنووسێ، بەمەش تۆمەتی دوژمنانی لێ دوور خرابووەوە، گومانی بوختانکەرانی لێ دوور بوو، لەم بارەوە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ. سورة العنكبوت (٤٨)﴾. تۆ ئەی پێغەمبەر! لەوەپێش خوێندەواریت نەبوە نەتزانیوە هیچ نامەیەك بخوێنیەوە، نووسینشت نەزانیوە هەرگیزاو هەرگیز بەدەستی ڕاستت هیچت نەنوسیوە، خۆ ئەگەر خوێندنەوەو نووسینت بزانیایە بێ بڕوایان دەکەوتنە گومانەوەو دەیانگوت موحەممەد بۆ خۆی ئەم قورئانەی داناوە.

قورئان بەدەق ئاوەڵناوی نەخوێندەواری بۆ پێغەمبەر دەست نیشان کردوەو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ. سورة الأعراف (١٥٧)﴾.

# لەدوای پێغەمبەرایەتی و نیگا بۆ ناردن

## موژدەی روناکبوونەوەی ئاسۆو پێشە تای بەختەوەری:

تەمەنی پێغەمبەر چل ساڵی تەواو کرد، جیهان بەتێکڕا لەسەر لێواری چاڵی ئاگر بوو، مرۆڤایەتی خێرا خێرا بەرەولەناو چون هەنگاوی دەنا، سەرانسەری جیهان لە تاریکی کوفرو نەفامی دابوو، ئالەم کاتەدا موژدەی هەڵهاتنی ئاسوی رون و پێشە تای بەختەوەریی دەرکەوت، کاتی ئەوە هات پێغەمبەرێك پەیدا ببێ دڕ بەتاریکی بدا، ئەمەش داب و نەریتی پەروەردگارە لەبونەوەردا، هەرکاتێ تاریکی چڕ بوو نەفامی پەرەی ساند فروستادەی خۆی دەنێرێ بۆ هیدایەتدانی ئادەمیزادەکان و قەڵاچۆکردنی شیرك و نەفامی.

دڵەڕاوکێی پێغەمبەرو غەم و ئەندێشەی لەو بارودۆخەی بەچاوی خۆی دەیبینی لەنەفامی و بیروباوەڕی خورافی و بتپەرستی، هەروا چاوەڕوانی پێغەمبەر بۆ هیدایەت و رەهنومایی کردنی ئادەمیزاد لەلایەن بەدیهێنەری بونەوەرو دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی گەیشتبوە لوتکە، دەتگوت بانگکەرێك بانگی دەکاو شتێکی نهێنی کێشی دەکا، پێ ی خۆش بوو هەمیشە لەسارادا بژی و گۆشە گیربێ و بەتەنیا بیر بکاتەوە، ئەوەبوو هەموو رۆژێ لەمەککە دەردەکەوت و دوور دەکەوتەوە تاخانوەکانی لێ نەدیوە دەبوون خۆی دەخزاندە ناو شیوو دۆڵ و پەناپاساری دەوروبەری مەککە بەلای هەربەردو درەختێك دابڕۆیشتایە سەلامیان لێ دەکرد، دەیانگوت: (السلام علیك یارسول الله!) پێغەمبەریش کە گوێی لەم جۆرە دەنگانە دەبوو، بەملاو بەولای خۆی دا ئاوڕی دەدایەوە، بۆ پێش و پاش و راست و چەپی

خۆی دەیڕوانی جگە لەدرەخت و بەرد هیچی تری نەدەبینی.[٦٢] یەکەمجار کەنیگای بۆ دەکرا لەشێوەی خەوبینینی راستەقینەدا نیگاکەی بۆ دەهات. هەر خەونێکی دەبینی وەکوو ئاسۆی رونی بەیانی وابوو.

## لەغاری حیرادا:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆربەی کات لەئەشکەوتی حیرادا خۆی گۆشەگیر دەکرد، جاری وا دەبوو چەند شەوێکی یەك بەدوا یەك دا لەناو ئەو ئەشکەوتەدا دەمایەوە، کەدەچوو بۆ ئەو خەڵوەتە تێشووی لەگەڵ خۆی دەبردو لەوێ دەمایەوە لەسەر شێوەی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم لەخودا دەپاڕایەوەو عیبادەتی دەکرد[٦٣].

## ڕەوانەکردنی پێغەمبەرو نیگا بۆ کردنی:

لەجارێك لەوجارانەی حەزرەتی موحەممەد لەخەڵك گۆشە گیر دەبوو دەچوو بۆ ئەشکەوتی حیرا، کاتی ئەوە هات سروشی بۆ بێ و سەرەتای پێغەمبەرێتی دەست پێ بکا، ئەوە بوو لەحەڤدەی مانگی رەمەزان لەتەمەنی چل و یەك ساڵی دا بەرامبەر بەڕۆژی شەشەمی مانگی ئەغسطوسی ساڵی (٦١٠)ی زایینی لەکاتی بەخەبەری و ئاگا لەخۆبوون دا، لەناو ئەشکەوتی حیرادا فریشتەی سروش هاتە لای و پێ ی گوت: بخوێنە، وتی: من

---

[٦٢] سیره ابن هشام ج ١/ ٢٣٤-٢٣٥ لەصەحیحی موسلیم دا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: بەردێك دەناسم لەمەککە پێش ئەوەی ببمە پێغەمبەر سلاوی لێ دەکردم ئێستا من دەزانم ئەو بەردە کامەیەو لەکوێ یە!.

[٦٣] بڕوانە ئەو حەدیثە خاتو عائیشە لە (باب) ی (کیف کان بدو الوحی الی رسول الله (ص)) ریوایەتی کردوە.

خوێندەوار نیم. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئیتر گرتمی و گوشیمی تاتەواو نارەحەت بوم، ئەمجار بەرەڵلای کردمو وتی: بخوێنە، وتم: خوێندەواریم نیە دوبارە گرتمیەوەو گوشیمی تاتەواو تینم بۆ هات ئەمجار بەرەڵلای کردمو وتی: بخوێنە، وتم: من خوێندەوار نیم، ئەمجار بۆ جاری سێیەم گرتمی و بەخۆیەوە گوشیمی پاشان بەرەڵلای کردمو فەرمووی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ. خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ. اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ. الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ. عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ. سورة العلق (١-٥)﴾.

بخوێنە بەناوی خودای خۆت ئەو خودایەی بونەوەری بەدی هێناوە، ئادەمیزادی دروست کردوە لەگۆشتپارە، بخوێنە خودای تۆ زۆر گەورەو بەرزو شکۆمەندە، ئەو خودایەی ئادەمیزادی بەهۆی قەڵەمەوە فێری خوێندەواری کردوە،... ئەمە یەکەم ڕۆژی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد بوو، یەکەم نیگاو سروشی خودایی کە بۆ موحەممەد هات[٦٤].

---

[٦٤] ئەوەی سەرنجی فەیلەسوف و بیردوزەکانی جیهانی راکێشاوە مێژوو نووسی ئایینەکان و لێکۆڵینەوە لەژیانی زانستی خستۆتە بەردەم چەند پرسیار ئەوەیە کەلەیەکەم جاری نیگا کردن بۆ پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بۆ سەر نەتەوەیەکی نەخوێندەوار باسی پێنووس کراوە، لەکاتێك دا لەو کۆمەڵگایە دا هەبوونی قەڵەم زۆر دەگمەن بوو، ژمارەی ئەوانەی نووسین و خوێندنەوەیان دەزانی لەژمارەی پەنجەی دەست تێپەڕیان نەدەکرد، ئەمە هێمایە بۆ ئەوەی ئەم دینەو ئەو نەتەوەی ئەم دینە وەردەگرێ و ئەرکی گەیاندن و بلاوبوونەوەی دەکەوێتە ئەستۆ، زۆر پابەندی نووسین و خوێندنەوە دەبن هەمیشە پەیوەندی نێوان ئەم نەتەوەو ئایینە لەگەڵ قەڵەم دا پەیوەندییەکی بەهێزو پتەو دەبێ بەپێچەوانەی ئایینەکانی پێشووە. ئەمەش نهێنی بلاو بوونەوەی ئەو بزوتنەوە زانستی یە جیهانی یە یە کە لە مێژووی هیچ گەل و نەتەوەو ئاینێکی تردا دەست ناکەوێ.

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەماڵی خەدیجەدا:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو روداوە زۆر ترسا بوو تاسابوو گەڕایەوە ماڵەوە، دڵی تەپە تەپی بوو، چونکە لەوە پێش شتی وای نەدیبوو، نەشی بیستبوو، رۆژگاری فیترەتو بێ پێغەمبەری درێژەی کێشابوو، ئاشنایەتی عەرەب بە پێغەمبەرانو پێغەمبەرێتی زۆر دوور کەوتبوەوە، یەکەمجاربوو حاڵەتی ئاوای بەسەر بێ، ترسو بیمێکی واچووە دڵیەوە کە گەڕایەوە، ماڵەوە لەشی دەلەرزی بەخەدیجەی خێزانی گوت داپۆشن داپۆشن توشی شتێك بووم ترسم لەخۆم هەیە، ئەوانیش خێرا دایانپۆشی هەتا کەمێك ئارامی گرتو ترسو خۆفەکەی لێ رەوییەوە.

خاتو خەدیجە پێ ی گوت: ئەوە چیتەو بۆ وات بەسەر هاتووە؟ ئەویش لەنوکەوە روداوەکەی بۆ گێڕایەوە، خەدیجە ئافرەتێکی عاقڵو رەزان بوو، لەوە پێش باسی پێغەمبەرانو پێغەمبەرێتیو هاتنی فریشتە بۆ لایان لەمو لەوی بیستبوو ئامۆزایەکیشی هەبوو ناوی وەرەقەی کوڕی نەوفەل بوو، بو بوو بەمەسیحیو کتێبی خوێند بوونەوە، لەئەهلی تەوراتو ئینجیل شتی بیسبوو، زۆر رقی لەو دابو نەریتو هەڵسو کەوتەی دانیشتوانی مەککە بوو، بەسروشت دەیزانی کەئەوانە گومڕانو بیرو باوەڕیان بەتاڵو پوچە، تائەندازە یەك خۆی گۆشەگیر کردبوو، خەدیجە زوزو سەردانی ئەم ئامۆزایەی خۆی دەکردو هەواڵ پرسی لێ دەکرد، لەلایەکی تریشەوە خاتو خەدیجە بەهۆی ئەوەی کەخێزانی پێغەمبەر بوو، ماوەی پانزە ساڵ بوو پێکەوە ژیانیان بەسەر دەبرد، لەهەموو کەس زیاتر پێغەمبەری دەناسیو ئاشنای ئەخلاقو رەوشتی بوو، ئاگاداری نهێنیو ئاشکرای بوو، لەو ماوەی ژنو مێردایەتیەی دا ئەوەندەی ئەخلاقی جوانو رەوشتی بەرزو هەڵسو کەوتی مرۆڤانەی لێ بینیبوو، دڵنیابوو، کەئەم پیاوە سەرکەوتوو

دەبێ و لەخوداوە یارمەت دراو دەبێ، هەرکەسێك خاوەنی ئەو رەوشتانە بێ، ترسی ئەوەی لێ ناکرێ جندۆکە دەستی لێ بوە شێنێ، بۆیە بەو پەڕی دڵنیایی یەوە روی کردە پێغەمبەرو وتی: نەخێر دڵنیابە هەرگیز خودا تۆریسوا ناکا، تۆ صیلەی رەحم بەجێ دێنی یارمەتییان دەدەیت، بەهاواری لێ قەوماوانەوە دەچێ، کۆمەکی بەفەقیرو هەژاران دەکەی، میوانداری میوان دەکەی پشتگیری حەق و راستی دەکەیت.

## لەبەردەم وەرەقەی کوڕی نەفەل دا:

ئەوەی خاتو خەدیجە وتی: زادەی عەقڵی سەلیم و سروشتی پاك و فیترەتی راست و نەشێواو بوو، ئاکامی ئەزمون و تەجرەبەی خۆی و ناسینی ئادەمیزادان بوو. وەلێ کارەکە لەوە گەورەتر بوو، بەم وتەیەی خەدیجە بێدەنگی لێ بکرێ، پێویستی بەوە بوو بچنە لای یەکێك شارەزایی لەئایینەکان دا هەبێ، مێژووی دینەکان بزانێ، لەچۆنیەتی نیگاو سروش و داب و نەریت و رێ و رەسمەکانی پێغەمبەرایەتی ئاگاداربێ، کەسێك بدۆزنەوە ئەهلی کیتاب بناسێ و شارەزابێ لەوانەی هەواڵ و بەسەرهاتی پێغەمبەرانی رابردو دەزانن، بۆ ئەم مەبەستە خەدیجەوای بەباش زانی هانا بۆ ئامۆزاکەی (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) بەرن، بزانن ئەو چی دەڵێ! ئیتر خاتو خەدیجە لەگەڵ پێغەمبەردا چۆن بۆلای وەرەقە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەدورو درێژی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، چی بینی بوو بۆی باسکرد، (وەرەقە) وتی: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەتۆ پێغەمبەری ئەم نەتەوەیەی، ئەوەی تۆ دیوتە ئەوە فریشتەی نیگا هێنانە بۆ پێغەمبەران، ئەوە حەزرەتی جوبرائیل بووە ئەوەی کە نیگای بۆ موساو بۆ پێغەمبەرانی تر هێناوە، ئەتۆ کەپەیامەکەت رادەگەیەنێ گەلەکەت بەدرۆت دەخەنەوە، ئەزیەتت دەدەن، لەوڵات دەرت دەکەن،شەڕت لەگەڵ دەکەن!

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەقسەی وەرەقە سەری سوڕما کەوتی: نەتەوەکەت لەمەککە دەرت دەکەن! چونکە ئەو دەیزانی قورەیشییەکان چەند ڕێزی لێ دەگرن و بە (محمد الأمين) ناوزەدەیان کردوە، بەوشەی (الصادق) و (الأمين) نەبێ بانگی ناکەن بۆیە بەسەر سوڕمانەوە وتی: (أو مخرجي هم) بۆچی ئەوان وایان لێ دێ من لەمەککە دەرکەن؟!!.

وەرەقە وتی: بەڵێ هەرکەسێك پەیامێکی وەکوو تۆ ڕابگەیەنێ ئیللا دژایەتی کراوە، ئەزیەت دراوە، ئەگەر من بگەمە ئەو ڕۆژگارەو مەرگ مۆڵەتم بدا، بەهەموو هێزمەوە یارمەتیت دەدەم[٦٥] ئیتر ماوەیەك نیگا پچڕا دوایی دەستی پێ کردەوە، وردە وردە قورئان نازڵ بوو.

## ئیسلامبوونی خەدیجەو ڕەوشتی ئەو خاتوونە:

یەکەم کەس کەئیمانی بەپێغەمبەر هێنا خاتو خەدیجەی خێزانی بوو، بڕوای بەتاك و تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد هێنا، پشتگیری دەکرد، دڵنەوایی دەکرد، ئێش و ئازاری لەسەر کەم دەکردنەوە، ئەزیەتدانی کافرەکانی لەسەر سوك دەکرد.

## ئیسلامبوونی عەلی کوڕی ئەبوتالیب و زەیدی کوڕی حاریسە:

دوای عەلی کوڕی ئەبوتالیب ئیمانی بە پێغەمبەر هێنا، عەلی ئەوکاتە تەمەنی دەساڵ بوو، لەوەپێش لەلای پێغەمبەر بوو ئەو سەرپەرشتی

---

[٦٥] لەصەحیحی بوخاری (باب كيف كان بدو الوحي الى رسول الله) وەرگیراوە هەروا سیرە بن هشام ج ١/ ٢٣٨.

دەکردو بەخێوی دەکرد، چونکە ئەبوتالیب پیاوێکی خێزانداری هەژار بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەکاتی گرانی دا عەلی بردە لای خۆی.[66] زەیدی کوڕی حاریثە کەلەپێش دا کۆیلە بوو پێغەمبەر ئازادی کردو کردیە کوڕی خۆی. ئەویش ئیمانی پێ هێناو موسوڵمان بوو، موسوڵمانبوونی ئەم کۆمەڵە کە لێیەوە نزیك بوون، لەئەخلاق و رەوشت و مێژوو هەڵس و کەوتی ئاگادار بوون، شایەتیدانێکی راستەقینە بوو لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیەکەی.

## موسوڵمانبوونی ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافەو رۆڵی لەبانگەوازی ئیسلامیی دا:

یەکەم کەس لەپیاوان کەئیمانی بەپێغەمبەر هێنا حەزرەتی ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە بوو،ئەم زاتە پلەو پایەیەکی دیاری کراوی هەبوو لەناو قورەیشییەکان دا، چونکە پیاوێکی عاقڵ و میانە ڕەوو خاوەن ویژدان و پیاوەتی بوو، موسوڵمانبوونی خۆی ئاشکرا کرد، حەزرەتی ئەبو بەکر لەناو دانیشتوانی مەککەدا خۆشەویست بوو پیاوێکی سادە بوو، دەربارەی ریشەو نژادی عەرەبەکان شارەزا بوو، زۆری دەربارەی بەسەرهاتی عەرەبەکان دەزانی، بازرگانێکی دەست پاك و خاوەن رەوشتی جوان و سەخی سروشت بوو، ئیتر لەلای خۆیەوە دەستی کرد بەبانگەوازی کردنی هەرکەسێك متمانەی پێ بکردایەو بیزانیایە بەپیر قسەکانیەوە دێ. بانگەوازی دەکرد بۆ ئیمانهێنان..

---

[66] سیرة ابن هشام جـ ١/ ٢٤٥.

## ئیسلامبوونی پیاو ماقوڵانی قورەیش:

موسوڵمانبوونی حەزرەتی ئەبو بەکر ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو، لەبانگەوازی ئیسلامی دا، بەبانگەوازیکردنی حەزرەتی ئەبو بەکر زۆر لەپیاو ماقوڵانی قورەیش موسڵمان بوون، لەوانە عوثمانی کوڕی عەفان و زوبەیری کوڕی (العوام) و عەبدو رەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و طەلحەی کوڕی عوبەیدوللا، ئەمانە هەموویان حەزرەتی ئەبوبەکر هێنانی بۆ لای پێغەمبەرو موسوڵمانبوون. بەشوێن ئەوان دا چەند پیاو ماقوڵێکی تری قورەیش موسوڵمان بوون، لەوانە ئەبو عوبەیدەی کوڕی (الجراح) ء (الأرقم) ی کوڕی ئەبو لئەرقەم و عوثمانی کوڕی مەظمون و عوبەیدەی کوڕی (الحارث) ی کوڕی (موطلیب) ی کوڕی عەبدی مەناف و سەعیدی کوڕی زەیدو خەبابی کوڕی (الأرت) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو عەمماری کوڕی یاسیرو صوهەیب و هی تریش. خودا لەهەموویان رازی بێ، ئیتر لەوەدوا خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ لەژن و پیاو موسوڵمان بوون، بەجۆرێك ناوبانگی ئیسلام لەمەککەدا بلاو بۆوەو هەموو خەڵك پێ ی زانی و لەناو خۆیان دا باسیان دەکرد[٦٧].

## بانگەوازی کردن بەئاشکرا لەسەر کێوی صەفا:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەرەتا بانگەوازی یەکەی بەنهێنی دەکرد ماوەی سێ ساڵ بەم جۆرە تێپەڕی و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەنهێنی پەیوەندی بەخەڵکەوە دەکرد، دوای سێ ساڵ پەروەردگار فەرمانی پێ کرد کە بەئاشکرا بانگەوازی خۆی بلاو بکاتەوەو ئایینی خۆی ئاشکرا بکا، نیگای بۆ نازڵ بوو، پێ ی فەرمووو: [فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ. سورة الحجر(٩٤)].

---

[٦٧] سیره ابن هشام جـ ١/٢٦٢.

ئـەی پێغەمبـەر! ئـەو پەیامـەی بـۆت نێـردراوەو فـەرمانت پـێ کـراوە، ئاشـکرای بکـەو چـی دی بـەنهێنی بانگـەوازی مەکـە، ڕو لەبتپەرسـتەکان وەرگێـڕە گرنگیـان پـێ مـەدە. یـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَنـذِرْ عَـشِيرَتَكَ الْـأَقْرَبِينَ. وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ. سورة الشعراء (٢١٤-٢١٥)﴾.

ئـیتر پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) چووە سـەرکێوی صـەفاو تـاهێزی تێـدابوو هاواری کرد (یاصباحاه) ئەمە جۆرە هاوارێك بوو لـەکاتی خەتـەردا ئـەنجام دەدرا، هـەر کاتـێ مرۆڤێـك هەسـتی بەخەتـەرێك بکردایـە، بیزانیایـە دوژمـن هێرش دێنێتە سەر وڵاتەکەی یان هۆزەکەی و گەل و نەتەوەکەی و ئاگاداری ئـەم هێرشـە نـین ئـیتر پـڕ بـەدەنگی بـەرز هـاواری دەکـرد (یاصـباحاه) جاکـە پێغەمبەر ئـەم هـاوارەی کـرد، هـەموو قورەیش راجمین و لـەدەوری پێغەمبـەر کۆبوونەوە، ئەوی بۆی نەکرا بچێ نوێنـەرێکی خـۆی نـارد، ئـەمجا پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـەی بـەرەبابی عەبدولموتـەلیب! ئـەی بـەرەی بەنوفەهر، ئەی تـیرەی کـەعب! ئـەرێ ئەگـەر مـن هـەواڵتان بـدەمێ کـەهێزێکی دوژمـن وا لەپـشت ئـەو کێـوەوە خـۆی ئامـادە کردوەهێـرش بکاتـە سـەرتان، ئێوە پێم باوەڕ دەکەن؟! هـەموو وتیـان: بـەڵێ چونکە تائێستا ئێمـە درۆمـان لەتۆ نەدیوە..

عەرەبەکان تائەندازەیەك واقیعی بوون ئەوان پیاوێکیان دیتـوە، راسـتگۆو ئـەمین و ئامۆژگـاری کـار، ئـەوە ئێـستا لەسـەر ئـەو کێـوە راوەسـتاوەو چـاوی لەبـەردەم و دوا خۆیەوەیـەتی، ئـەوان تـەنها بـەردەم خۆیـان دەبیـنن و بـەس، ئەوی ئەو دەیبینێ ئەوان نایبینن.

ئـیتر زیرەکـی و ویـژدان هـەڵی نـان بـۆ ئـەوەی تەصـدیقی ئـەم هەواڵـدەرە راستگۆیـــە بکەن و وتیان: بەڵێ بڕوات پێ دەکەین. ئیتر پێغەمبـەر (درودی خوای

لەسەربێ فەرمووی دەبزانن من ترسێنەرتانم پێتان رادەگەیەنم کەسزایەکی سەخت لەپێشتانەوەیە، ئەگەر بڕوام پێ نەکەن‌و شوێنم نەکەون توشی ئەو سزا سەختە دەبن، لەراستی دا ئەمە پێناسە یەك بوو بەپلەو پایەی پێغەمبەرایەتی‌و راگەیاندنی ئەوەبوو کەزانیاری دەربارەی حەقیقەتە نهێنی یەکان‌و زانستە خودا دادەکان تایبەتن بەئەوەوە، خودا فێری کردوەو بەسروش بۆی ناردوە، ئامۆژگاری کردن‌و ترساندن بوو بەئەوپەڕی حیکمەت‌و دانایی‌و بەشێوەیەکی بەلیغ‌و کاریگەر کەوێنەی ئەو حیکمەت‌و بەلاغەتە لەمێژووی هیچ ئایین‌و پێغەمبەرایەتی هیچ پێغەمبەرێك دا نیە، هیچ رێبازو ئوسلوبێك کورت ترو کاریگەر ترو ئاشکراتر نەبوو لەو شێوەیەی پێغەمبەر گرتیە بەر، بۆیە قورەیشییەکان بێ دەنگ بوون هیچ بەرەنگاری کردنێکیان نەنواند، وەلێ ئەبو لەهەب راست بووەو وتی: دەك داوەشێ ی هەمیشە کۆستت کەوێ ئەوە بۆ ئەمەت بانگ کردین‌و بۆ ئەم قسە بێ سەرو بەرانە کۆت کردینەوە؟؟؟ (٦٨)

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەو شێوە حیکمەت ئامێزە ئاگاداری کردن کەدوژمنی سەرسەختیان وا لە دڵ‌و دەروونی خۆیاندایە، ئەو دوژمنە زۆر شیاو ترە بەوەی لێ ی بترسن‌و کەرەسەی بەرگری بۆ دەستە بەر بکەن، بێ ئاگایی لەخودای تاك‌و تەنیاو بەدیهێنەری بونەوەرو خاوەنی عالەم، بێ ئاگایی لەصیفات‌و ناوە جوانەکانی، گیرۆدە بوون بەتۆڕی شیرك‌و بتپەرستی‌و بەندایەتی کردن بۆ نەفس‌و ئارەزوو شوێنکەوتنی خەیاڵ پلاوو

(٦٨) سەرگوورشتەکە لە ئیبنو کەثیر دایە جـ١/٤٥٥-٤٥٦، ئیمام ئەحمەد لەئیبنو عەباسەوە نەقڵی کردووە.

بیرو باوەری خورافی و سنور بەزاندن و هەتك كردنی حورومات، ئەمانە زۆر قێزەونترو خەتەر ترن لەسوپایەكی ئامادەباش بۆ هێرش هێنان، زەرەرو زیانی ئەو شتانە زۆر گەورەترو سامناكترن لەدەستەیبەكی دوژمن كەخۆیان مەلاس دا بێ و لەهەوڵی ئەوەدابن هەلێك بقۆزنەوە بۆ پەلاماردان كەئەمیان هەموو حیسابێكی بۆ دەكرێ و بەهەموو مانا لێی دەترسێن و دەیانخاتە دڵە لەرزەوە.

## قورەیشییەكان دوژمنایەتی خۆیان رادەگەیەنن و ئەبوتالیب پشتگیری پێغەمبەر دەكا:

كاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەفەرمانی خودا بانگە وازییەكەی خۆی ئاشكرا كرد، دەنگی حەقی بەرزكردەوە، قورەیشییەكان هیچ بەر هەڵستیەك و بەرەنگارییەكیان نەكرد، لێ ی بێدەنگ بوون تاباسی خودا كانی كردن و رەخنەی لەبتەكانیان گرت و بیرو باوەڕیانی بەبەتاڵ و پوچ دانا، كەئەمەی كرد ئیتر دوژمنایەتی تاوی ساندو لێ ی وەخۆ كەوتن، دژی وەستان و گەلە كۆمەكییان لێ كرد، كەوتنە ئەزیەتدانی و خراپە لەگەڵ كردنی، ئەبوتالیبی مامی لەروی خزمایەتی یەوە پشتگیری لێ كرد نەیهێشت قورەیشییەكان دەستدرێژی بكەنە سەر، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازی ئیسلامی و بلاوكردنەوەی پەیامی خۆی و هیچ لەمپەرێك نەیدەتوانی ئەو بێدەنگ بكاو نەهێڵێ بانگەوازی خۆی بلاو بكاتەوە، قورەیشییەكان بەتوندی بەرپەرچییان دەدایەوەو ئەبوتالیب پارێزگاری لێ دەكردو نەیدەهێشت دەست درێژی بكەنە سەر! ئەم حاڵە ماوەیەك درێژەی كێشاو بانگەوازی كردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەنگە تاوی كردن، كۆمەڵێك لەپیاوانی قورەیش بەكۆمەڵ چوونە لای ئەبوتالیب و

وتیان! ئەوە ماوەیەکەی برازاکەت جنێو بەخوداکانمان دەداو رەخنە لەئایینەکەمان دەگرێ. بەبێ عەقڵو بەنەفامو سەر لێ شێواو مان دەزانێ، باوكو باپیرمان بەگومڕاو کاڵفام لەقەڵەم دەدا، جا یان دەبێ داوای لێ بکەی واز لەو هەڵوێستەی بێنی، یان دەستی لێ بەردەو حەقت بەسەریەوە نەبێ ئێمە خۆمان چاری دەکەین، تۆیش بیرو باوەڕو ئاینت وەکوو ئێمەیە، ئەبو تالیب بەشێوەیەکی عاقلانەو لەسەرە خۆقسەی لەگەڵ کردنو بەشێوەیەکی جوان رەدی دانەوە ئەوانیش گەڕانەوە.

## وت و وێژی نێوان پێغەمبەرو ئەبو تالیب:

قورەیش تا دەهات زیاتر تەنگە تاو دەبوون، لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکیان دا، لەهەموو کۆچەو کۆڵانێکیان دا باس هەرباسی پێغەمبەر بوو، هەندێکیان هەندێکیانی هەڵدەنا بۆ ئەوەی دەستی لێ بوەشێنێ، بەلام هەر کە بیریان لەشتێکی وا دەکردەوە، ئەبوتالیبیان دەهاتە بەرچاوو حیسابیان بۆ دەکرد، بۆیە ئەمجارەش بەکۆمەڵ چوونە لای ئەبو تالیبو پێیان گوت: ئەی ئەبو تالیب! ئەتۆ پیاوێکی ریش سپیو خاوەن رێزو پلەو پایەی لەناومان دا، داوامان لێ کردی برازاکەت دەمکوت کەیو نەهێڵی چیدی ئاوا رەخنە لە خوداکانمان بگرێو دژی بیرو باوەڕمان بجوڵێتەوە.

بەلام هیچت نەکرد بەخودا ئێمە ئیتر چیدی ناتوانین دان بەخۆمان دا بگرینو لەبەرامبەر جنێو دان بە خودا کانمانو رەخنە گرتن لەبیرو باوەڕمان بێدەنگ بین، جا یان وا دەکەی واز دەهێنێو بێدەنگ دەبێ، یان بەگژی دا دەچینو دەکەوینە شەڕ لەگەڵی دا، هەتا لایەکمان لایەکەی تر لەناو دەبا.

ئەبو تالیب کەوتە بەردەم دووڕیانێکی خەتەر، لایەك زۆری بەلاوە گران بوو لەهۆزو تیرەی خۆی جیا بێتەوەو دوژمنایەتییان بکا، بانگەوازی ئیسلامیشی نەچوبوە دڵەوە تا لەپێناو یا هەموو قوربانییەك بدا. بۆیە وای بە چاك زانی بەدوو پێغەمبەر دا بنێری و وت و وێژی لەگەڵ بکا. بەڵکوو هەرچۆنێك بێ لەهەڵوێستی خۆی پەشیمانی بکاتەوە.

کەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هاتە لای روی تێکردو وتی: ئەی برازای خۆشەویستم! ئەوە دووبارە خزمو هۆزە کەمان هاتبوونە لام لەبارەی بانگەوازی تۆوە ئاواو ئاوایان گوت. تکات لێ دەکەم نەخۆت بفەوتێنەو نەمنیش ماڵوێران بکە وامەکە هەردوکمان سەرمان تێدا بچێ، پیاوی چاك بە شتێك مەخەرە ئەستۆم بۆم هەڵنەگیرێ، چونکە من ناتوانم بەتەنیا دژایەتی هەموو قورەیش بکەم! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وای زانی ئەبو تالیب دوو دڵ بووە لەیارمەتیدانی و چی دی پشتگیری ناکاو لەقورەیشییەکان ناپارێزێ.

خۆ کەسێکی تریش نیە لەخزمو کەسەکانی پشتگیری بکات موسوڵمانانیش کەم دەست و بێ دەسەڵاتن ناتوانن بەرامبەر قورەیشییەکان بوەستن! بەلام لەگەڵ ئەوەش دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دڵنیابوو لەپەیامەکەی و یەقینی هەبوو: کەخودا لەپشتیەتی و دەبێ بەردەوام بێ لەسەر بانگەوازی خۆی و فەرمانی خودا رابگەیەنێ، دوای لێکدانەوەیەکی کورت لەدڵی خۆی داو ئەمسەرەو سەرکردنی بارو دۆخەکە روی کردە مامی و وتی: ئەی مامی خۆم! دڵنیابە ئەگەر ئەو خزمانە خۆر بهێنن بیخەنە ناو دەستی راستمەوەو مانگ بخەنە ناو دەستی چەپمەوە بەهیوای ئەوەی واز لەم کارە بهێنم، دڵنیابە وازی لێ ناهێنم، بەردەوام دەبم لەسەری هەتا خودا سەرم دەخا یان لەپێناو یا لەناو دەچم، ئەمەی وت و فرمێسکی دا

بارینو دڵی پڕ بوو، دەستی کرد بەگریانو هەستا ڕۆیی، ئەبو تالیب بانگی کرد وەرە برازای خۆشەویستم مەڕۆ تۆ ڕاوەستە باتێت گەیەنم.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەڕایەوە بۆ لای، ئەبو تالیب وتی بڕۆ چیت پێ خۆشە بیڵێو سڵ لەکەس مەکەوە، سوێند بێ من کارێکی واناکەم تۆ پێت ناخۆش بێ، هەرگیز پشتت تێنا کەمو دەستت لێ بەرنادەم.(٦٩)

## ئەزیەتدانی قورەیش بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانی:

قورەیشییەکان نائومێد بوون لەوەی کەپێغەمبەر واز لەبانگەواز خۆی بێنێ دڵنیاش بوون کە ئەبو تالیب واز لەپشتگیری کردنی ناهێنێو دەستی لێ بەر نادا، ئیتر ئەمجار کەوتنە وێزەی ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو، دەستیان کرد بەسزادانیان کەسیش نەبوو پشتگیرییان لێ بکا، چونکە هەر تیرەو بەرەبابێك پەلاماری ئەوانەیان دەدا کەلە هۆزەکەیان دا ئیمانیان هێنا بوو، کابرا ئەزیەتی خزمی خۆی دەدا کەسێکی تر بۆی نەبوو لەسەری وە دەنگ بێ. بەم جۆرە تەعزیبو سزادان پەرەی سەندو ڕۆژ لەدوا ڕۆژ لەزیاد بوون دابوو، هەرە بەرەبابە دەهات موسوڵمانانی تیرەکەی خۆی سزا دەدا حەبسیان دەکردن، لێیان دەدان، برسیو تینوویان دەکردن، دەیان بردن لەناو زیخەڵانو گەرمەڵانی مەککەدا پاڵیان دەخستنو سزایان دەدان. بیلالی حەبەشی کۆیلە بوو، موسوڵمان بو بوو ئومەییەی کوڕی خەلەف کەئاغا کەی بوو لەگەرمای نیوە ڕۆدا دەیبردە دەرەوەی مەککە لەناو زیخەڵانو لمبەڵانی گەرم دا لەسەر پشت ڕای دەکێشاو بەردێکی گەورە شی دەخستە سەر سنگی، ئەمجار پێ ی دەگوت سوێندم وابێ لەسەر ئەو حاڵە

(٦٩) سیرە ابن هشام ج١/٢٦٥-٢٦٦.

دەتهێڵمەوە تا دەمری یان دەبێ لەئایینی موحەممەد پەشیمان ببیەوەو عیبادەت بۆ (اللات) و (العزی) بکەی. (بیلال) یش بەدەم ئەم تەعزیب و سزادانەوە هەر دەیگوت (أحد، أحد) حەزرەتی ئەبو بەکر بەلایا تێپەڕی کۆیلەیەکی چوار شانەی رەش پێستی بەهێزو توانا تری دا بە ئومەییەو لەجیاتی ئەوە بیلالی لێ وەرگرت و ئازادی کرد،

تیرەی (بەنو مەخزوم) یش عەمماری کوڕی یاسرو باوکی و دایکیان بەجۆرەها سزا سزا دەدان، بەچلەی هاوین لەکاتی گەرمای نیوە ڕۆدا ئەم خێزانە موسوڵمانەیان دەبردە لمبەلآنی مەککەو لەناو ئەو زیخ و لمبەلآنەدا سزایان دەدان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلایان دا تێدەپەڕی و بەدڵی پڕ لەناسۆرەوە پێ ی دەفەرموون: خۆ بگرن ئەی بنەماڵەی یاسر صەبرتان هەبێ، پاداشی ئێوە بەهەشتی رازاوەیە. بەو شێوە سزادران، هەتا یاسر لەژێر ئەشکەنجەو سزادا گیانی سپارد، دایکیشی کەهەر لەئیسلام پەشیمان نەبوەوە، ڕۆژێکیش بەتوندی بەر پەرچی ئەبو جەهلی دایەوە، ئەویش نێزەیەکی بەورگیا کردو گیانی دەرچوو بو بە یەکەم شەهید لەئیسلام دا، یەکەم دڵۆپە خوێنێك کەلەسەر موسوڵمانبوون رژابێ خوێنی (سمیە) ی خێزانی یاسرە. عەمماری کوڕیشیان تا دەهات سزای سەخت تر دەبوو، دەمێك بەئاگر داخیان دەکردو کاتێکیش لەناو ئاودا نوقمیان دەکرد، هەڕەشەی سزادانی زیاترو درێژە کێشانی نارەحەتییان لێ دەکرد، دەیانگوت: دەبێ قسە بەموحەممەد بڵێ ی و دژی ئایینەکەی بدوێ ی، ئەگینا وازت لێ ناهێنین، تاکار گەیشتە ئەوەی ڕۆژێك وتەیەکی ناشیرین دژی پێغەمبەرو ئایینەکەی بەدەم دا هات، ئەوانیش بەرەڵلآیان کرد، بەگریانەوە هاتە لای پێغەمبەرو وتی ماڵی خۆم وێران کرد پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی چیت گوت؟! وتی وەهاو وەهام گوت: فەرمووی دڵت چۆن

بوو وتی: بەخودا دڵم لەسەر باوەڕێکی پتەوەو هیچ نەگۆڕاوە، کەخەڵکی وتیان:

عەممار کافر بۆتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نەخێر عەممار دڵی پڕە لەئیمانو باوەڕ. ئایەتی: ﴿مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ. سورة النحل(١٠٦)﴾ دەربارەی ئەو نازڵ بووە.

موصعەبی کوڕی عومەیر کوڕە جوانخاصی مەککە بوو، گەنجو قۆزو شۆخو شەنگ، باوكو دایکی زۆریان خۆش دەویست، دایکی ئافرەتێکی ساماندارو دەوڵەمەند بوو، جوانترین پۆشاکی بۆ لەبەر دەکرد، چ قوماشێك جوانو گرانبەها بوایە دایکی قاتێکی بۆڵێ دروست دەکرد، چ بۆنێك خۆش بوایە موصعەب لەخۆی دەدا جگە لە پێڵاوی حەضرەمیە کە بەناوبانگ بوون هیچی تری لەپێ نەدەکرد، زۆر جار پێغەمبەر باسی دەکردو دەیگوت: لەناو شاری مەککەدا لەموصعەب قۆزترو پاكو خاوێن ترو پۆشناخ تر، خۆشگوزەرانتر نیە.

موصعەب بەوەی زانی کەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەخانووی (الأرقم) ی کوڕی ئەبولئەرقەم دا بانگەوازی خەڵکی دەکا بۆ ئیمانهێنان، چووە خزمەتیو موسوڵمان بوو، دەستی خستە ناو دەستی پێغەمبەرەوەو بەیعەتی پێ کردو هاتە دەرەوە، لەترسی دایکیو خزمەکانی موسوڵمانبونی خۆی شاردەوە، ناوە ناوە دەچوە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ڕۆژێك عوثمانی کوڕی طەلحە چاوی لێ بوو نوێژی دەکرد، لای دایکیو خزمەکانی شکاتی لێ کرد، گرتیانو بەندیان کرد، بەبەندکراوی مایەوە تادەرفەتی بۆ

هەڵكەوت لەكۆچكردنی یەكەم جاردا لەگەڵ موسوڵمانەكان دا كۆچی كرد بۆ حەبەشـە كاتێـك موسـوڵمانەكان لەحەبەشــە گەڕانــەوە ئــەویش گەڕایــەوە سەروسـیمای تێكـچو بـوو، ئـیتر دایكـی وازی لەلۆمـەكردن هێنـا هەنـدێ لەموسوڵمانەكان خۆیان خستبوە پەنای بڕێ لـەپیاو ماقوڵانی قوڕەیشەوە، پـەیمانی جیـوارو پـەنادانیان لەگـەڵ دابـە سـتبوون، ئـەوانیش حیمایـەیان دەكـردن و نـەیان دەهێـشت ئـازار بـدرێن، عـوثمـانـی كـوڕی مـەظمـون چـوبوە جیـواری (الولیـد)ی كـوڕی (المغـیرة)وە دوایـی عوسمـان غـیرەت و پیـاوەتی قبووڵی نەكرد لەپەنا (الولید) دا پارێزراوبێ پەنا دانەكەی هەڵوەشاندەوەو پـەیمانی جیوارەكـەی بـە سـەر (الولیـد) دا دایـەوە، (الولیـد) زۆر پابەنـدی پـەیمانی جیـوار بـوو، لـەعوسمانی پرسـی بۆچـی پەیمانەكـەت بـە سـەر دا دامەوە؟! وتـی: پێم خۆش بوو جگە لـەخودا خۆنەخەمە پـەنای هـیچ كەسـی ترەوە. جارێك لەگـەڵ یـەكێك لـە موشـریكەكانی مەككە دەم بەقاڵییان بـوو، كـابرای موشـریك رقـی هەڵـساو بـۆی هەڵـسا مـستە كۆڵەیـەكی لەچـاوی دا كوێری كـرد، (الولیـد) ی كـوڕی (المغـیرة) لـەو شـوێنە نزیك بـوو، ئاگـای لـەم تێك هەڵـچونە بـوو، وەلیـد وتـی: سـوێندم وابـێ ئـەی بـرازای خـۆم! چـاوت پێویستی بەوە نەبوو ئاوای لێ بێ، تۆ بۆ خۆت لەپەنای كەسێك دا بووی لەو شـتانە دەیپاراسـتی، عوسمـان لـەوەلام دا وتـی: وەڵڵاهـی چـاوە سـاغەكەم زۆری پێویـستە وەكـوو ئـەوی ترمـی لێ بـێ، لـەڕێگای خـوادا، ئـەمن ئێـستا لەپـەنای كەسـێك دام لـەتۆ بـەهێز تـرو خـاوەن دەسـەڵات تـرە ئـەی ئـەبو عەبدوشەمس! كاتێك عوسمانی كوڕی عەففان (رەزای خوای لەسەربێ) عوسمـانی كـوڕی ئومەییە بەگوریسێكی پتەو بەستیەوە وتـی: ئەوە لـەئایینی باوك و باپیرت

ژیوان بویەوە چویەسەر ئاینێکی تازە پەیدا بوو؟ سوێندم بەخودا بەرەڵلات ناکەم هەتا واز لەو ئایینە دێنی. عوسمان وتی: وەڵلاهی هەرگیزاو هەرگیز وازی لێ ناهێنمو لێ ی پەشیمان نابمەوە، جاکە (الحکم) ئەم هەڵویستە توندو تۆڵەی لەعوسمان بینی ئیبتر وازی لێ هێنا[٧٠] خەبابی کوڕی (الأرت) دەڵێ: ڕۆژێك گرتیانم ئاگرێکیان بۆ هەڵکردم، پاشان بەو ئاگرە سووریان کردمەوە، پاشان پیاوێکیان قاچی خستە سەر سنگم پشتیشم بەروتی لەسەر زەوییەکە بوو، توێخێکی پشتم بەزەوییەکەوە ڕۆیشت، دوایی بۆ راستی قسەکەی پشتی خۆی روت کرد، هەموو پشتی پەڵە پەڵە بوو[٧١].

## دژایەتیکردنی قورەیش بۆ پێغەمبەرو لیزانییان لەئەزیەتدانی دا:

کاتێك قورەیشییەکان سەرکەوتوو نەبوون لەژیوان کردنەوەی ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو، پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەربێ) هیچ نەرمو نیانیەکی لەگەڵ نەنواندن ڕۆژ بە ڕۆژ بانگەوازی ئیسلامی بڵاودەبوەوە، خەڵك موسوڵمان دەبوون، قورەیشییەکان تەنگە تاو بوون، ناچار هەندێ هەرزەو کاڵفامیان هەڵنان بکەونە خۆ بۆ ئەزیەتدانی، بۆ بەدرۆ خستنەوەی، وتیان جادو بازە، شاعیرە، کاهینە، شێتە، بەهەموو شێوەیەك کەوتنە ئەزیەتدانی و بەر پەچدانەوەی... ڕۆژێك پیاو ماقوڵانی قورەیش لەو شوێنەی کەپێ ی دەڵێن: حیجری ئیسماعیل کۆبوبونەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هات بەلایان دا

---

[٧٠] طبقات ابن سعد جـ ٣ /٣٧ .

[٧١] طبقات ابن سعد جـ ١١٧/٣.

تێپەڕیو دەستی کرد بەتاوافکردن، ئەوانیش هەندێ تانەو تەشەریان لێدا، قسەی ناشرینیان پێ گوت سێ جار ئەم تانەو تەشەرو قسە ناشیرینانەیان دووبارە کردەوە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) راوەستاو پاشان فەرمووی: ئەوە گوێتان لێ یە ئەی کۆمەڵی قورەیش؟!.

سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە من ئایینی حەق‌و ڕاستم بۆ هێناون، ئیتر خەڵکەکەی بێ دەنگ کردو کەسیان جوڵەی لێوە نەهات، دوایی دەستیان کرد بەقسەی نەرم‌و نیان لەگەڵی دا.

جا بۆ ڕۆژی دوایی لەکاتێك دا قورەیشییەکان لەهەمان شوێن کۆبوبوونەوە، پێغەمبەر یان لێ دەرکەوت، هەموویان بەقلمباز راجمین بۆ لای‌و دەورەیان دا، کابرایەکیان: عقبەی ناوبوو یەخەی عەباکەی گرت‌و لەملی دا بای دا، خەریك بۆ بیخنکێنێ، ئەبو بەکر هات قۆڵی گرت‌و لێی دوور خستەوە، کوڵی گریانی هەڵسا وتی: ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن: کە دەڵێ: (الله) خودای حەقمەو ئێوەش وەکوو من بەندایەتی بۆ بکەن؟! ئیتر وازیان لێ هێناو ڕۆیشتن، ئەبو بەکریش گەڕایەوە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ناوچەوانی شکابوو ریشیان راتە کاندبوو.

ڕۆژێکی تر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەماڵ چووە دەرەوە بۆ بانگەوازی کردن، ئەو ڕۆژە تائێوارە کەسی دەست نەکەوت بڕوای پێ بکا، هەرچی پەیوەندی پێوە کرد پشتی هەڵکرد، هەموویان بەدرۆیان خستەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەڕایەوە ماڵەوە، هێندە دڵتەنگ بوو چووە ژێر لێفەو پێخەفەوە خودا ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنذِرْ...... سورة المدثر﴾ی نازڵ کردە سەر.

## قورەیشییەکان ئەزیەتی ئەبو بەکر دەدەن:

ڕۆژێك حەزرەتی ئەبو بەکر چووە ناو خەڵکەکەوە دەستی کرد بەبانگەوازی کردن، قورەیشییەکان پەلاماریان دا، خستیانە ژێر پێییانەوە هەرکەسە لەعاست خۆیەوە تێی دەسراواند، عەتەبەی کوڕی ڕەبیعە هەردوو نەعلەکانی گرتبوو بەیەکەوە لەدەمو چاوی دەدا تاوای لێ کرد نە دەزاندرا کامە لوتیەتی و کامە دەم چاویەتی، بەنوتەمیم هاتن خەڵکەکە یان لێ دوور خستنەوە ئەبو بەکریان بردەوە بۆ ماڵەوە پێییان وابوو مردووە، لەماڵەوە بێ هۆش رایان کێشا، ئەمجار چوون بۆ کەعبە وتیان: ئەگەر ئەبو بەکر بمرێ ئێمە عەتەبە دەکوژینەوە دەمەو ئێوارە ئەبو بەکر وەهۆش خۆ هاتەوە، یەکەم قسەی ئەوە بوو وتی پێغەمبەری خودا چی بەسەر هات و لەکوێیە؟! ئیتر خزمەکانی کەلە دەوری کۆبو بوونەوە دەستیان کرد بەلۆمەکردنی و زۆر یان قسە پێ گوت، دوایی (أم جميل) کەئافرەتێکی موسوڵمان بوو هاتە لای و ئەبو بەکر هەواڵی پێغەمبەری لەئەو پرسیار کرد، وتی ئەوە دایکت لێرەیە و گوێی لێ دەبێ، ئەبو بەکر وتی: قەیناکا قسەم بۆ بکە مەترسێ، ئەمجار ئوموجەمیل وتی: سوپاس بۆ خودا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ساغ و سەلامەتە، ئەبو بەکر وتی: سوێندم بەخودا من دەم لەهیچ خواردن و خواردنەوەیەك نادەم هەتا نەچمە خزمەت پێغەمبەر بەچاوی خۆم نەیبینم، چاوەڕوانییان کرد تا هەندێ ئەبو بەکر هاتەوە سەرە خۆو شەو داهات و ڕێگەو بان چۆڵ بوون، ئەمجار دایکی و ئوموجەمیل چوونە ژێر باڵی و بردیانە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەریش کەبەو شێوە بینی زۆری بەزەیی پێ داهات و دوعای کرد بۆ دایکی موسوڵمان ببێ، بانگەوازی کرد بۆ ئیمانهێنان دایکیشی ئیمانی هێنا.[٧٢]

---

[٧٢] سيرة ابن كثير جـ ١ ٤٣٩-٤٤١.

## سەرسوڕمانی قورەیش دەربارەی دۆزینەوەی وەصفێك بۆ پێغەمبەر:

قورەیشییەکان دەربارەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەریان لێ شێوا بوو نەیاندەزانی چ صیفەتێکی زەقی بۆ بدۆزنەوە، چون خەڵکی لێ بتەکێنەوە، بەچی لەکەداری بکەن‌و لەپێش چاوی خەڵك ناشیرین بێ‌و پێی بڕوا نەکەن، چ ناوو ناتۆرەیەکی بۆ بدۆزنەوە بۆ ئەو وەفدانەی لەدەرەوەی مەککەوە دێن بۆ حەج بەدوورو نزیك توخنی نەکەون.! بۆ ئەم مەبەستە هەموویان لەلای (الولید) ی کوڕی (المغیرة) کۆبوونەوە، کەپیاوێکی بەتەمەن‌و عاقڵمەندییان بوو، ئەویش ئامادەی مەوسیمی حەج بوو، وتی: ئەی جەماوەری قورەیش ئەوە وەرزی حەجکردن هاتووە، وەفدەکانی عەرەبیش لەم وەرزەدا دێن‌و دەنگ‌و باسی بانگەوازییەکەی کابرای لەمەڕ خۆمانیان بیستووە پرسیارتان لێ دەکەن دەربارەی، هەمووتان یەك قسە بن‌و یەك هەڵویست بنوێنن، ئەگەر لێیان پرسیار کردن‌و وەڵامەکانتان یەك بێ، وانە بێ قسەی ئەمتان قسەی ئەوتان بەدرۆبخاتەوە، لەم بارەوە زۆریان بیرو ڕا ئاڵ‌و گۆڕ کردو پێشنیاریان خستە ڕو (الولید) بەهیچ کام لەپێشنیارەکانیان رازی نەبوو، هەرچی گوتیان هەڵی وەشاندەوە، قورەیشییەکان وتیان: دەیبا شەجەنابت رات چیەو چیت بەلاوە باشە بیڵێین ئەی ئەبو (عبد شمس) ؟! وەلید وتی: باشترین قسە دەربارەی (محمد) ئەوەیە: بڵێن جادو بازەو سیحری هێناوە، بەو سیحر بازییە کوڕو باوك لێك دەکا، برا دەکاتە دوژمنی برا، ژن‌و مێرد لێك جیا دەکاتەوە، پیاو لەخزم‌و کەسی دەتۆرێنێ. هەموویان ئەمەیان پەسەند کردو لەلای مام وەلید هەڵسان، هەر کۆمەڵە‌و تاقمێکیان چووە سەر رێی کاروانی حاجیان‌و سەرە رێیان لەرێبواران گرت، هەرچی بیاندییایە ئامۆژگاری ئەوەیان دەکرد کەئاگای لەخۆی بێ موحەممەد هەڵی نەخەڵەتێنێ، وریابێ بەقسەی شیرین‌و زمانی لووسی لەخشتەی نەبا.

## تونـدو تیـژی قورەیـشییەکان دەربـارەی ئەزیەتـدانی پێغەمبەر:

قورەیـشییەکان بەمەبەسـتی کـپ کردنـی بانگـەوازی پێغەمبـەر جۆرەهـا شێوازیان دۆزینـەوەو بەکار یـان هێنـا بـۆ ئەزیەتـدانی، لـەم بـارەوە لایـەنی خزمایـــەتی و هوزایـــەتی و ئادەمیزادیـــەتی یـــان پێـــشل کـــردو هـــەموو سنووڕێکیان بەزاند، هەرچی نا پیاوی و بێ ویـژدانی بـوو لـەدژی پێغەمبـەر ئـەنجامیان دا، بـۆ نموونـە ڕۆژێـك پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) لـەناو مزگـەوتی کەعبـەدا نوێـژی دەکـرد، کۆمـەڵێکیش لەقورەیـشییەکان لـەدەرەوەی بـوون، کاتێك دا چووەسوژدە عوقبەی کوڕی ئەبو میعیـەط هـات پزدانـە بۆ گـەنێکی ئاژەڵی فڕی دایە سەر پشتی پێغەمبەر، ئـەویش سـەری لەسـوژدە هەڵنـەبڕی فاطیمەی کچی هات پزدانەکەی لابردو دوعـای لـەو کەسە کرد کە ئـەم شتە پیسەی خستۆتە سەر پشتی باوکی. دوایـی پێغەمبـەریش دوعـای شـەڕی لێ کردن.

## موسوڵمانبوونی حەمزەی کوڕی عەبدو لموتەلیب:

ڕۆژێـك ئـەبو جـەهل لـەلای تەپۆلکـەی صـەفا بـەلای پێغەمبـەردا تێپـەڕی، جنێـوی پـێ دان و ئەزیـەتی دا، پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەڵامـی نەدایـەوە، ئـــەویش ڕۆیـــی. هێنـــدەی پـــێ نەچـــو حـــەمزەی کـــوڕی عەبدولمەتـــەلیب لەڕاوەشـــکار گەڕایـــەوە قەوســـەکەی لەشـــانی کردبـــوو، حـــەمزە ئـــازاترین و بەسـامترین گـەنجی قـورەیش بـوو، بەنـدە ئـازاد کراوێکـی عەبـدوڵڵای کـوڕی جودعـان ڕوداوەکـەی نێـوان ئـەبو جـەهل و پێغەمبـەری بـۆ گێڕایـەوە، حـەمزە ڕقـی هەڵـساو چـاوی لێ چـوونە پـشتی سـەر، بـەرق هەڵـساوی چـوو بـۆ ناوکەعبـە، ئەبوجـەهلی بینـی لـەنیو قورەیـشییەکان دا دانیـشتبوو، حـەمزە

خۆی لێ نزیك كردەوە، تاگەیشتە پشت سەری، قەوسەكەی بەرزكردەوەو پێ ی كێشا بەخراپی سەری شكاند، ئەمجار بەئەبو جەهلی گوت: ئەتۆ چۆن دەتوانی جنێو بەپێغەمبەر بدەی لەكاتێك دا من لەسەر ئایینی ئەوم، هەرچی ئەو بیڵێ من پشتگیری دەكەمو پابەندی فەرمودەكانی دەبم. ئەبو جەهل بێ دەنگ بوو، ئیتر حەمزە موسوڵمان بوو، قورەیشییەكان زۆریان پێناخۆش بوو چونكە حەمزە پلەو پایەی تایبەتی خۆی هەبوو لەناو قورەیشییەكان داو تا ئەو پەڕی سنوریش ئازاو مەردو نەبەرد بوو.

## ئەو گفت و گۆیەی لەنێوان پێغەمبەرو عوتبەی كوڕی رەبیعەدا روی دا:

كاتێك قورەیشییەكان دیتیان هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕۆژ بەڕۆژ لەزیاد بووندانو هەر ڕۆژە چەند كەسێك موسوڵمان دەبن، عوتبەی كوڕی رەبیعە ئیزنی لە قورەیشییەكان خواست كەبێ بۆ لای پێغەمبەر وتو وێژی لەگەڵ دا بكاو هەندێ پلەو پایەو ماڵو سامانی لەدەم نێ، ئەگەر پێیان رازی بوو بیدەنێ و واز لەم بانگەوازەی بهێنێ و چی دی رەخنە لەخودا كانیان نەگرێ، ئەوانیش رازی بوونو وتیان بڕۆ بۆ لایو چی پێ دەڵێ ی ئێمە لەقسەت دەرناچین.

عوتبە هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لای دانیشت، وتی ئەی برازای خۆشەویستم! ئەتۆ بۆ خۆت دەزانی لەناو ئێمە دا چ پلەو پایەو رێزێكت هەیە، ئێستاش ئەتۆ كێشەیەكی گەورەت بۆ نەتەوەكەت دروست كردوە، دوو بەرەكیت خستۆتە ناو خزمەكانتەوە، بەبێ عەقڵو كاڵفام وەصفیان دەكەی، رەخنە لەخودا كانیان دەگری، باوكو باپیرانیان بەكافرو گومرا لەقەڵەم دەدەی ئێستاش گوێم بۆ رابگرە هەندێ خاڵت دەخەمە بەردەم لێیان

وردبیەرەوە، بەڵکوو هەندێکیانت بەلاوە پەسەند بن. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەبو وەلید دەبڵێ بزانم ئەو شتانە چین؟! وتی: برازای خۆشەویستم! ئەگەر تۆ دەتەوێ بەهۆی ئەم بانگەوازی یەوە ماڵی دونیات دەست کەوێ‌و دەوڵەمەندبی ئەوە ئەوەندەت ماڵ‌و سامان بۆ کۆ دەکەینەوە لەهەموومان دەوڵەمەندتربێ، ئەگەر مەبەستت ئەوەیە ببیتە سەرۆك‌و رێزو ئیعتیبار پەیدا بکەی ئەوە لەئێستاوە دەتکەینە گەورەو ریش سپی خۆمان هیچ ئیشێك بەبێ تۆ نابڕێنینەوە، ئەگەر دەتەوێ ببیتە پاشاو مەلیك ئەوە لەئێستاوە دەتکەین بەمەلیکی خۆمان‌و هەموو دەسەڵاتێکت دەدەینە دەست، ئەگەر ئەو پەیامەی دەڵێ ی بۆم دێ دەست لێ وەشاندنی جندۆکەیەو ناتوانێ خۆتی لێ رزگار بکەی، ئەوە هەوڵ دەدەین پزیشکی چاك‌و لێزان پەیدا دەکەین هەرچی ماڵ‌و سامانی خۆمان هەیە لەپێناو رزگار کردنت دا خەرجی دەکەین.

کەعوتبە لەقسەکانی بووە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا ئەبو لوەلید لێ بوویەوەو قسەی خۆت تەواو کرد؟ وتی: بەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی دەگوێ رابگرە، وتی‌و دەی بزانم چی دەڵێ ی: ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چەند ئایەتێکی لەسورەتی (فصلت) تا (سەجدە) خوێند، کەعوتبە ئەمەی گوێی لێ بوو بەتەواوەتی دڵی دایەو گوێی راگرت، هەردوو دەستی خستنە دوا خۆیەوەو خۆی خستە سەریان، گوێی راگرت تا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشتە ئایەتی سەجدەو سوجدەی برد، پاشان وتی: ئەی ئەبولوەلید خۆ گوێت لێ بوو،دەبڕۆ کەیفی خۆتە چۆن لێکی دەدەیەوە لێکی دەوە عوتبە چووە بۆ لای هاوەڵانی، هەندێکیان بەهەندێکیانیان گوت سوێند دەخۆین: ئەبو لوەلید کەرویی دەم‌و چاوی جۆرێکی تر بوون ئێستا کەگەڕاوە تەوە جۆرێکی ترە. جاکە عوتبە لایان

دانیشت وتیان: ئەوە چیت بینی و چیت لایە ئاوا گۆڕاوی. وتی: بەخودا من کەلامێکم گوێ لێ بوو هەرگیز کەلامی وام گوێ لێ نەبوە، وەڵڵاهی ئەو کەلامە شیعر نیە، سیحر نیە، کۆڵەوە نانی نیە، ئەی کۆمەڵی قورەیش! پیاوی چاکبن بەقسەم بکەن واز لەو کابرایە بهێنن با پەیامی خۆی بلاو بکاتەوە، هەموو لەلای هەستان و وتیان: بەخودا دیارە بەزمانی لووسی سیحرو جادوی لێ کردوی ئەگینا قسەی واناکەی!! عوتبە وتی ئەمەراو بۆ چونی منە دەربارەی ئەو پیاوە، ئێوە چیتان بەلاوە پەسەندە ئەوە بکەن.

## کۆچی موسوڵمانان بۆ حەبەشە:

کاتێک پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بینی موسوڵمانان ئەزیەت دەدرێن ناشتوانێ بەرگرییان لێ بکا، پێ ی وتن: ئەگەر بچن بۆ ولاتی حەبەشە شتێکی باشە، مەلیکێکی لێ یە دادپەروەرو مرۆڤ دۆستە، کەس لای ئەو ستەمی لێ ناکرێ، بچن بۆ ئەوێ تابزانین خودا چمان بۆ بڕیار دەدا، بەڵکوو لەو تەنگانەیە رزگارتان ببێ. ئیتر کۆمەڵێك لەموسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، ئەمەش یەکەم کۆچکردن بوو لەپێناو ئیسلام داو لەئیسلام دا. سەرەتا ژمارەی کۆچکەران دەپیاوو چوار ئافرەت بوون، عوثمانی کوڕی عەفان و خێزانەکەی خاتو روقیە کە کچی پێغەمبەر بوو لەناویان دابوون، عوثمانی کوڕی مەظعون بوو بە سەرۆکیان، دوایی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب کۆچی کرد، ئەمجار موسوڵمانان یەك بەدوا یەکدا کۆچیان کرد بۆ خاکی حەبەشە، هی وا هەبوو ماڵ و منداڵیشی لەگەڵ خۆی برد، هی واهەبوو هەرخۆی بوو، هەموو ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە ژمارەیان گەیشتە هەشتاو سێ پیاو، مەبەست لەو کۆچکردنە تەنها ئەوە نەبوو موسوڵمانەکان لەئەزیەتدانی قورەیشییەکان رزگاریان بێ، بەڵکوو لەپاڵ

ئەوەدا مەبەستێکی تر هەبوو کەبانگە وازیکردنە بۆ ئیسلامو کەمکردنەوەی خەمو خەفەتی پێغەمبەر بوو (درودی خوای لەسەربێ) رانواندنی لیستی کۆچکەران نیشانەی ئەوە بوو کە بانگەوازی ئیسلامی لەناو کۆمەڵگای مەککەدا باش بڵاوبووەوە هەموو کۆچەو هۆبەیەکی گرتبووەوە، لەهەموو ئاستێکی تێدا بوو دەوڵەمەندو هەژار، پیرو گەنج، پیاووئافرەتی تێدا بوو زۆربەی زۆری ئەو کۆچکەرانە سەر بەبنەماڵەو خێزانە رەسەنەکانی مەککەبوون، ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو کە بانگەوازی ئیسلامی بەهێزو گشتگیرو کاریگەر بووە.

## بەدووا داچوونی قورەیشییەکان بۆ موسوڵمانە کۆچکەرەکان:

قورەیشییەکان کە دڵنیا بوون لەوەی موسوڵمانە کۆچکەرەکان لەخاکی حەبەشەدا جێگیر بوونو حەواونەوە، (عەبدوڵلای کوڕی ئەبو رەبیعەو عەمری کوڕی (العاص) ی کوڕی (وائل) یان ناردن کۆمەڵێ دیاری نایابیشیان پێدا ناردن بونە جاشیو بطریقەکانی[٧٣] کە گەییشتنە حەبەشە دیاریەکانیان پێشکەشی فەرماندەو کار بەدەستە گەورە کانی ئەوێ کرد، دیاریەکانیان دیاری بەنرخ بوون، دڵی کار بەدەستە کانیان بۆ لای خۆیان کێش کرد، جاکە شاندی قورەیشییەکان چوونە لای نەجاشی وتیان: جەنابی پاشا برێك هەتیوەو بێ عەقڵو نەفام پەنایان هێناوە بۆ ژێر دەسەلاتی تۆ، لەئایینی گەلی خۆیان هەڵگەڕاونەوە، ئایینی ئێوەشیان قبوڵ نیە، بۆ خۆیان ئاینێکی تازەیان هەڵبژاردوە، نەئێمە دەزانین ئایینەکەیان چیە نەئێوە دەزانن،ئێستاش پیاو ماقوڵو ریش سپی نەتەوەکەی خۆیان لە

---

[٧٣] بطريق: فەرماندەی سوپاو لێزان لەشەڕ.

باوكو مامو خزمو كەسو كاری عەشایەریان ئێمە یان ناردۆتە خزمەت ئێوە بۆ ئەوەی ئەم كۆمەڵە هەڵخەڵەتاوە بگێڕیەوە بۆ ناو عەشیرەتو نەتەوەی خۆیان، (بطريق) فەرماندە سوپایەكانی نەجاشی كەبەدیارییەكان نەرم بو بوون، هەموو وتیان: پاشا ئەمانە راست دەكەن ئەو پەناهیندانەیان لەگەڵ دا بنێرەوە. نەجاشی لەم قسانە رقی هەڵساو وتەی بطریقەكانی پێ ناخۆش بوو سوێندی خوارد كەبەهیچ جۆرێك كەسێك پەنای بۆ وڵاتی ئەو هێنابێ تەسلیمی ناكاتەوە، دەیانپارێزێو پشتگیرییان دەكا. ئەمجار بانگی موسوڵمانەكانی كردو بانگی قەشەكانی خۆشی كردو كۆڕێكی بەرفراوانی بۆ بەستن، روی كردە موسوڵمانەكان وتی: ئەم ئایینە چی یە ئێوە زێدە لەهەموو نەتەوەكەتان وازتان لەئایینی باوكو باپیری خۆتان هێناوەو ئەو ئایینە تازەتان وەرگرتووە؟ نەهاتوونە ژێر چەتری ئایینی ئێمەو ئایینەكانی تریش؟

جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب كەئامۆزای پێغەمبەر بوو هەڵسایە سەرپێو وتی جەنابی پاشا،ئێمە نەتەوەیەكی نەفام بووین بتو صەنەممان دەپەرست، مردارەوە بوومان دەخوارد، كاری ناموس بەرەو قێزەونو فاحیشە ئامێزمان ئەنجام دەدان، صیلەی رەحممان دەپچڕاند، هێرشمان دەكردە سەر دراوسێو بەهێز بێ هێزی دەچەوساندەوە، ئێمە لەو بارو دۆخەدا بووین هەتا خودا لەخۆمان پێغەمبەرێكی بۆ سەر رەوانە كردین بنەماڵەو ریشە و نژادی دەناسین، راستگۆو ئەمینو داوێن پاكو رەوشت بەرزە، بانگەوازی كردین بۆ لای خودا بۆ ئەوەی یەكتا پەرستی بكەین تەنها خودا بناسینو بەندایەتی هەر بۆ ئەو بكەین، واز لەو عیبادەتو ئایینە بهێنین كەئێمەو باوكو باپیرمان لەوەپێش پابەند بووین پێوەی. داوای لێ كردین واز لەبتپەرستی بێنینو خودا بپەرستین، فەرمانی پێ كردین

بەراستگۆیی، پارێزگاری ئەمانەت بەجێ گەیاندنی صیلەی رەحم، جیراندوستی و خۆپاراستن لەکارو ئاکاری حەرام و خوێنڕشتنی بەناحەق، نەی لێ کردین لەکاری فاحیشە ئامێزو قسەی بوختان و درۆ، نەی لێکردین لەخواردنی ماڵی هەتیوو بوختانکردن بەئافرەتی داوێنپاك، فەرمانی پێ کردوین کەتەنها بەندایەتی خودا بکەین و کەس نەکەین بەهاوەڵ و هاوبەشی، فەرمانی پێ کردین کەنوێژ بەجێ بێنین زەکات بدەین بەڕۆژو بین.. بەوجۆرەجەعفەر یەکە یەکە ئەرکانەکانی ئیسلامی بۆ باسکردن، ئەمجار وتی: ئێمەیش کەبینیمان ئەم پێغەمبەرە ئەوە پەیام و ئەوە ئەخلاق و رەوشتی یەتی، بڕوامان پێ کرد، ئیمانمان پێ هێنا، شوێن پەیامەکەی کەوتین، خودا پەرستیمان کرد، تەنها بۆ خودا عیبادەت دەکەین، کەس ناکەینە هاوەڵ و هاوشانی، خودا چی بۆ حەڵاڵ کردوین بەحەڵاڵی دەزانین، ئیتر لەپای ئەمە، نەتەوە کەمان، عەشیرەت و کەس و کارمان دژایەتییان کردین، ئەزیەتیان داین، لەسەر ئایینەکەمان جۆرەها گێچەڵ و بیانوویان پێ گرتین هەوڵیان دا لەئایینەکەمان ژێوان ببینەوە، بگەڕێ ینەوە بۆ سەر بتپەرستی و واز لەخودا پەرستی بهێنین؟ ئەو شتە پیسانەمان بەلاوە حەڵاڵ بێ کەلەوە پێش بەحەڵاڵمان دەزانی، جاکە ئاوا شکاند یانین، ستەمیان لێ کردین تەنگیان پێ هەڵچنین، ویستیان لەئایین پەشیمانمان بکەنەوە، پەنامان هێنا بۆ وڵاتی ئێوەو بوینە پەنا هێندە لای ئێوەی خاوەن شکۆ، لای ئێوەمان هەڵبژارد، حەزمان لەوە بوو بێینە ژێر سایەی تۆوە، هومێدەوارین لای خاوەن شکۆتان ستەممان لێ نەکرێ ئەی پادشای بەڕێز.

نەجاشی زۆر بەهێدی و لەسەرە خۆیی گوێی بۆ ئەم وتارە گرت، ئەمجار نەجاشی وتی: ئایا هیچت لەو کەلامە لەبەرە کە دەڵێ ی پێغەمبەرەکەمان لەخوداوە هێناویەتی جەعفەر وتی بەڵێ، نەجاشی وتی دەبیخوێنەوە، جەعفەریش لەسەرەتای سورەتی مەریەم هەندێکی بۆ خوێند، نەجاشی

گریـاو فرمیـسك بەریـشی دا هاتنـە خـوارەوە، قەشـەکانی دەورو بەریـشی هەموو دەستاین کرد بەگریان هەتا پەڕاوەکانی بەردەمیان هـەموو تـەڕ بوون بێگومـان وتارەکـەی جەعفـەری کـوڕی ئـەبو تالیـب لەبـەردەم مـەلیکی حەبەشـەداو رانوانـدنی نـاوەرۆکی ئیسلام بـۆ ئـەو کـۆڕە بەرفراوانـە، وتـاری پیـاوێکی عاقـڵ‌و دانـا بـوو لـە کـات‌و شـوێنی خـۆی دابـوو، نیـشانەی زمانپـاراوی‌و قـسەرەوانی و هۆشـیاری وتـار بێژەکـە بـوو پـێش ئـەوەی نیشانەی قسە ڕەوانی زمانەوانی بێ. بایسی ئەمەش هەر ئەوەیە بڵێین خودا پشتگیری کردو بە ئیلهام ئەو قسانەی فێر کردن.

نیشانەی ئـەوە بـوو کەخودا دەیـەوێ رونـاکی ئـەم ئایینـە بـالاّ دەسـت بـێ بەسەر هەموو ئایینەکان دا، هەروەها نیشانەی ساغیەتی فیترەتـی جەعفەرو عاقلّ مەندی بوو ئەو فیترەت‌و عەقڵەی کەلەناو قوڕەیشا بەنو هاشم زۆر یـانَ بەرکـەوتبوو، لـەناو عـەرەبیش دا قورەیـشییەکان بـالاّ دەسـت بـوون، جەعفـەر لەکاتی خوێندنەوەی وتارەکـەی دا وای بـەباش زانـی وەلاّمەکـەی حیکایـەتی حاڵ‌و ئاوێنەی بالاّنمابێ بۆ حاڵی عەرەب لـە سـەردەمی جاهیلی داو لـەنیوە دوورگـەی عـەرەب داو ئـەو گـۆڕانکارییـەی بەسـەریان داهـات لـەدوای هـاتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بڵاوبوونەوەی بانگـەوازی بـۆ ئـایینی پـاك‌و ئاسـانی، بۆ خوو ڕەوشتی جوان‌و پەسـەندی، ئاشکراشـە حیکایـەتی حـاڵ بەتایبـەتی کەخاوەن وتار لەواقیع لانەدا کەمتر موناقەشەو موناظـەرە هەڵـدەگرێ، باشتر دەتوانێ مانای مەبەست لەدەرروونی گوێگردا بچەسپێنێ‌و مەبەست بپێکێ‌و گوێی بۆ بگیرێ‌و لەقسەی وردببنەوە.

## وەفدی قورەیش بەنا هومێدی دەگەڕێنەوە:

پاش وتارەکەی جەعفەر نەجاشی، وتـی: بێگومـان ئـەم پەیامـەو ئـەوەی حەزرەتی عیسا هێنـا بـووی سەرچاوەکەیان یـەك کـۆی نـوورە، ئـەمجار روی

کردە دوو نێردراوەکەی قورەیش و پـێی گـوتن بڕۆنـەوە بۆ شوێنی خۆتـان سوێندم بەخودا ئەمن ئەم موسوڵمانانەتان تەسلیم ناکەمەوە...

عەمری کوڕی عاص ویستی دوا تیری ژەهـراوی خـۆی بهـاوێ، بۆ بەیانی زوو چووە بۆ لای نەجاشیو وتـی: ئەی مـەلیکی خـاوەن شـکۆ! بوختـانی گـەورە دەکـەن، مـەلیك روی کـردە موسـوڵمانەکانو وتـی ئێـوە دەرحـەق بـە عیسای کوڕی خاتو مەریەم چی دەڵێن: جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب وتـی: ئەوە دەڵێین: کەپێغەمبەرەکەمان بۆی هێناوین ئەویش ئەوەیە:

عیـسا بەنـدەی خودایـە روحـی پـەروەردگارە، وشـەی پـەروەردگارە ئاڕاسـتەی مەریـەمی کـچە شـونەکردوی پـاك دامێنـی کـرد، ئیتر نەجاشـی دەستی لەزەوییەکەی بەردەمی گێڕا چیلکۆڵەیەکی دۆزییـەوە، ئەمجار وتـی: دەسوێندم بەخودا عیسای کوڕی مەریەم بۆ خـۆی بەئەنـدازەی ئـەم چیلکۆڵە لەوەی ئێوەی زیاتر نەگوتووە.

موسوڵمانەکان هەموویان سوپاسی پاشایان کرد لەسەر ئەو هەڵوێستو بیرو بۆ چونەییو دەست خۆشییان لێ کرد، ئەویش جـارێکی تـر دڵنیـایی کردنەوە کەدەیانپارێزێو نایـان گێڕێتـەوە بـۆ لای قوڕەیشییەکان، دوو نێـر دراوەکـەی قورەیـشیش بـە بـۆڕ دراویو سـەر شـۆڕیو هـیچ بەدەسـت نەهاتوویی هەڵسان وەدەر کەوتن. موسوڵمانە کانیش لەپەنا پاشـای خـاوەن هەڵوێـستو وڵاتـی ئاسـایشو عەداڵـەت دا مانـەوە. لـەوەدوا جارێـك دوژمـن هێرشی هێنایە سەر وڵاتی حەبەشەو فەرمانڕەوایی نەجاشـی، موسـوڵمانە کۆچکەرە کان لەوێ چەکیان هەڵگرتو دژی دوژمن راوەستان ئەمەش لەپای ئـەو هەڵوێـستە مەردانـەی نەجاشـی کەنوانـدی دەربـارە یـان.. هەڵبەتـە ئەمەش جۆرێکە لە تەعلیماتی ئیسلامو دەبێ موسوڵمان چاکەی لەبەر چاو بێ و خاوەن هەڵوێست بێ.

ئەم کۆچکردنەی موسوڵمانان بۆ وڵاتی حەبەشە ساڵی پێنجەمی دوا پێغەمبەرایەتی بوو، جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوەڵانی تاساڵی حەوتەمی کۆچی مانەوە ئەوەبوو جەعفەر دوای ئەو دابڕانە دورو درێژە لە غەزای خەیبەردا هاتە خزمەت پێغەمبەر واتە: جەعفەر پانزە ساڵ لەحەبەشە ماوەتەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەجەعفەر لەو وڵاتە خەریکی بانگەوازی ئیسلامی بووە حەتمەن مانەوەی جەعفەر لەو وڵاتە سودی بانگەوازی ئیسلامی تێدا بووە، چونکە وڵاتی حەبەشە زێدە لەهەموو وڵاتە مەسیحییەکانی تر بەوە ناسراوە کەلێ بوردنی تێدا بووە و پەنای لێ قەو ماوان بووە، مەلیکە کەشی بەعەداڵەتکارو مرۆڤ دۆست ناسراوە، ولێ بەداخەوە ئەو سەردەمە سەردەمێك نەبووە رو داوەکانی تێدا تۆمار بکرێن، بۆیە ئێستا ئێمە هیچ بەڵگەنامەیەکی مێژووییمان لەبەر دەست دا نیە ئەو لایەنەمان بۆ رون بکاتەوە وەلێ قیاس و قاعیدە ئەوە دەخوازێ کەمانەوەی جەعفەر لەو وڵاتە ئەو هەموو ماوە دورو درێژە بەبێ هۆ نەبوە.

## ئیسلام بوونی عومەری خەتتاب:

پەروەردگار ئیسلامو موسوڵمانانی بەهێز کردن بە موسوڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتتاب، عومەر پیاوێکی بەسامو هەیبەت، بەهێزو ورە بەرزو چاو نەترس بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) زۆری مەبەست بوو عومەر ئیمان بهێنێ، زۆر جار لەخودا دەپاڕایەوە کەدڵی عومەر نەرم بێ موسوڵمان ببێ، سەر گورشتەی ئیسلام بوونی عومەر وەکوو ریوایە تکراوە خوشکەکەی کەناوی (فاطمة)ی کچی خەتتاب بوو لەوەپێش موسوڵمان بو بوو، مێردەکەشی کەسەعیدی کوڕی زەید بوو ئیمانی هێنا بوو، ئەم ژنو مێردە لەترسی عومەر موسوڵمانبوونی خۆیان شاردبوەوە، چونکە وەکوو

وتمـان بەسـامو هەیبـەت بـوو، زۆریـشی رق لەئیـسلامو موسـوڵمانان بـوو، ئەگـەر بیزانیایـە خوشـکە کـەیو زاواکـەی موسـوڵمانبوون ئەزیـەتی دەدان. خەبابی کوڕی (الأرث) بەدزیەوە دەچوە ماڵی فاطمەو قورئانی فێر دەکردن.

ڕۆژێـك لـەڕۆژان عومـەر شمـشێری هـەڵگرتو ویـستی بـچێ پـەلاماری پێغەمبـەرو هـاوەڵانی بـدا کەبیـستبوی لـەماڵێکی نزیـك گردۆڵکـەی صـەفا کۆبوونەوە، لـەڕێگا نوعـەیمی کـوڕی عەبـدوڵلای تـوش بـوو کەبەخزمایـەتیو بەرەباب لێك نزیك بوون، ئەویش لەوە پێش موسوڵمان بوو بوو، وتـی: ئـەوە بۆ کوێ دەچی ئەی عومەر! وتی: دەچم بۆ فلان ماڵ، دەڵێن: موحەممەد ئـەو نەفامەی هۆزی قوڕەیشی لێك هەڵوەشاندوە، لەوێیە، دەچم دەیکوژم چونکە رەخنـە لـەئایینی بـاوكو باپیرمـان دەگـرێ، بـەبێ عاقـڵو گومڕامـان لەقەڵـەم دەدا.

نوعەیم وتی باش لەخۆت بایی بویو بەهەڵە چووی ئەی عومەر! ئەگـەر تـۆ ئەوەنـدە بەخـەم ئـایینی بـاوكو باپیرانـەوەی بـڕو جـارێ چـاری مـاڵو خێزانـی خـۆت بکـە، عومـەر وتـی: کـام مـاڵو خێـزانم؟ وتـی: فـاطیمـەی خوشـکتو سـەعیدی زاواتو ئـامۆزات، باقـسەی راسـتت لـە مـست نـیێم هەردووکیان موسوڵمان بوونو شوێن (محمد) کەوتوون دەبڕۆ چاری ئـەوان بکە.

عومەر بەپەلەو شمشێر بەدەستەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی فاطمەی خوشکیو سـەعیدی زاوای، لـەو کاتـەدا (خـەباب) ی کـوڕی (الأرت) لـەلایان بـوو سـیپارەیەکی پـێ بـوو، سـورەتی (طـاهـای) تێـدا نووسـرابوەوە بـۆی دەخوێندنـەوە کەهەسـتیان کـرد عومـەر هـات، خـەباب لـەقوژبنێك خـۆی شاردەوە، فـاطیمـەش جزمـە قورئانەکـەی خستە ژێـر رانـی خۆیـەوە، عومـەر کاتێ لێیان نزیك بو بوەوە گوێی لەقورئاننخوێندنی خەباب بوو، بۆیـە کە

چووە ژوورەوە وتی: ئەو پرتە پرتو دەنگە دەنگە چی بوو؟ فاطیمەو سەعید وتیان: هیچمان نەبیستووە، وتی نەخەیر وانیە، راستم پێ بڵێن: خەبەریشیان داومێ کەئێوە هەردوکتان چوونە سەر ئاییني موحەممەدو شوێن ئەو کەوتوون ئەمەی گوتو پەلاماری سەعیدی دا، فاطیمە هەستا نەهێڵێ کاکی لەمێردەکەی بدا، مستە کوڵەیەکی دا بە ناو دەمی فاطیمە داو دەمی پڕ کرد لەخوێن، ئیتر ژنو مێرد بە تورەیی یەوە هاواریان کرد بەڵێ موسوڵمان بووین ئیمانمان بەتاکو تەنهایی خوداو پێغەمبەرێتی موحەممەد هێناوە، دەتۆیش چیت لەدەست دێ بیکە.

عومەر کە دیتی خوشکەکەی واخوێن لەدەمو چاوی دێتە خوار لەکردەوەکەی خۆی پەشیمان بووەوە، شەرمەزار بوو، هەڵوێستەیەکی کرد، ئەمجار بەخوشکەکەی گوت ئەو سیپارەی دەتانخوێند کوا لەکوێیە بمدەرێ، بزانم ئەوەی موحەممەد هێناویەتی چیە؟ عومەر بۆ خۆی خوێندەوار بوو- کەعومەر ئەوەی گوت، خوشکەکەی وتی: دەترسین لەناوی بەری، بیدڕێنی، بیسوتێنی، عومەر وتی: نا مەترسە، سوێندی بۆ خوارد کەهیچی لێ ناکا، ئیتر خوشکەکەی هومێدی ئەوەی لێ کرد کەعومەر دڵی نەرم بووبێ، وتی کاکە گیان! ئەتۆ پیسی چونکە بتپەرستی، ئەم کەلامەش مرۆڤی دەست بەدەست نوێژ نەبێ نابێ دەستی لێ بدا، عەمەر چو خۆی شتو غوسڵی کرد، ئەمجار فاطمە جزمەکەی دایە دەستی، سورەتی (طه) ی تێدا بوو، کاتێ لەسەرەتا کەیەوە لێ ی خوێندەوە وتی: ئای لەو کەلامە جوانە؟ چەند شیرین و فەصیحو پڕ ماناو هەست هەژێنە، کەخەباب گوێی لەم وتو وێژە بوو خۆی ئاشکرا کرد، وتی: ئەی عومەر! سوێندم بەخودا من هیوادارم کە پەروەردگار نزاکەی پێغەمبەری خودای تایبەت کردبێ بەتۆوە، چونکە گوێم لێ بوو دوێنێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەپاڕایەوە دەیگوت: خودایە ئاییني

ئیسلام بەهێز بکە بەهۆی ئەبولحەکەمی کوڕی هشام (واتە: ئەبو جەهل) یان بەهۆی عومەری کوڕی خەتتاب!

لەوکاتەدا عومەر وتی: ئەی خەباب پێم بڵێ موحەممەد لەکوێیە؟ هەتا بچمە خزمەتی و ئیمان بهێنم، خەباب وتی: ئەو ئێستا تەشریفی لەماڵێکە نزیك گردی (الصفا) و چەند هاوەڵێکی لەگەڵدایە، ئیتر عومەر شمشێرەکەی خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرو هاوەڵانی، لەدەرگای داو کاتێك هاوەڵان گوێیان لەدەنگی عومەر بوو یەکێکیان هەڵسا لەکونی دەرگاکەوە ڕوانی عومەری بینی بەچەکەوە لەبەر دەرگایە، گەڕایەوە ترسی لێ نیشتبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە لەبەردەرگایە بەشمشێرەوە، حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب وتی: دەرگای لێ بکەنەوە با بێتە ژوورەوە، ئەگەر نیازی خێری هەبوو، ئەوە بەخێر هاتنی دەکەین، خۆ ئەگەر نیازی شەڕی هەبوو، بەشمشێرەکەی خۆی دەیکوژین، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ڕێگەی بدەن بابێتە ژوورەوە، پیاوەکە دەرگای لێ کردەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەرەو پیری چوو، لەدالانەکەدا بەیەك گەیشتن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یەخەی گرت و توند ڕایتەکاند، وتی ئەی عومەر تاکەی واز ناهێنن لەکوفرو بتپەرستی، پێم بڵێ چی تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟ بەخوا پێم وانیە بەئاسانی لێرە ڕزگارت بێ، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا هاتووم موسوڵمان ببم هاتووم ئیمان بێنم بەخوداو بەپێغەمبەرەکەی و بەو پەیامەی هێناویەتی. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەدەنگی بەرز (الله اکبر)ی کرد، دانیشتوانی ماڵەکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەموو زانییان کە عومەر ئیمانی هێناوە!!

موسوڵمانەکان لەناخی خۆیان دا زۆریان پێ خۆش بوو کە عومەر ئیمانی هێنا، هەستیان بەسەر کەوتن کرد، لەوە پێشیش حەمزە کەپیاوێکی ئازاو

چاو نەترس بوو ئیمانی هێنابوو، موسوڵمانبوونی ئەم جوتە پاڵەوانە لەوانە بوو قورەیشییەکان بخاتە لەرزە. هاوەڵان دەیانزانی ئیمانهێنانی عومەر چەند لەدڵی قورەیشییەکان دا کاریگەرەو چۆن کار دەکاتە سەر ژیانی مەککەیی یەکان، هەڵبەتە بۆ چونەکەشیان راست بوو چونکە موشریکەکان بەموسوڵمانبوونی کەس هێندەی موسوڵمانبوونی عومەر دڵگران نەبوون، بۆ موسوڵمانبونی کەس ئەوەندە نەشڵە ژان، زۆر لێکدانەوەو حیساباتیان بۆ موسوڵمانبونەکەی کرد.

عومەر موسوڵمان بوو، موسوڵمانبوونەکەی وەکوو هەورە تریشقە قورەیشی راچڵەکاند، مەترسییان لێ پەیدا بوو، بۆیان مەعلوم بوو کەتازە چاریان ناکەن هەوڵی ئەوەیان دا عومەر بکوژن، چەند نەخشەو پلانیان بۆ ئەو مەبەستە دانا بەڵام هیچیان سەر کەوتوو نەبوون.

## قورەیشییەکان گەمارۆی ئابووری و سیاسی دەخەنە سەر بەنو هاشم و بەنو مطلب:

لەدوای ئیسلامبوونی عومەری کوڕی خەتتاب، ئایینی ئیسلام بەناو هۆزەکان دا بڵاو بووە قورەیش تەنگە تاو بوون، ویستیان هەرچۆنێك بێ ئەو دەنگە حەقە کپ بکەنەوە، بۆیە کۆبوونەوە یەکیان ئەنجام دا، لەناو خۆیان دا بڕیاریان دا بەنو هاشم و بەنو موتەلیب لەکۆمەڵگا دا ببڕن و بەتەواوی گۆشە گیریان بکەن و گەمارۆی ئابوورییان بخەنە سەر، بۆ ئەم مەبەستە پەیماننامەیەکیان نووسی کەژنیان لێ نەهێنن ئافرەتیان نەدەنێ، هیچیان پێ نەفرۆشن و هیچیشیان لێ نەکڕن، بەتەواوی لە کۆمەڵگای مەککەیان دا بیڕن، ئەم پەیماننامەیەیان مۆر کردو هەموویان جەختییان

لەسەر ئەوە کردەوە کەپابەندی ناوەرۆکی ئەو پەیمانە بن و بەمولێ ی لانەدەن. بۆیە پەیماننامەکەیان لەناو کەعبەدا هەڵواسی!!!

کەقورەیشییەکان ئەمەیان کرد بەنو هاشم و بەنو موتەلیب پاڵیان بەئەبو تالیبەوەدا، ئەم دوو بەرەبابە بەموسوڵمان‌و بتپەرستیانەوە چوونە شیوی ئەبوتالیبەوە تەنها ئەبو لەهەب نەبێ کەئەو پاڵی دایە قورەیشییەکان . بەنو هاشم‌و بەنو موتەلیب لەو شێوە دا مانەوە دابڕانەکە درێژەی کێشا گەمارۆ ئابورییەکە بەتەواوی تینی بۆ هێنان، خواردن‌و خۆراکیان لێ بڕا وایان لێ هات گەڵادار بخۆن،منداڵەکانیان لەبرساندا دەکڕووزانەوە، لەدەرەوەی شیوەکە وە دەنگی گریان و کڕوزانەوەیان دەبیستر‌ا، قورەیشییەکان زەختیان لەبازرگانەکان دەکرد کەهیچیان پێ نەفرۆشن، یان ئەوەندەیان لێ گران دەکردن کەبەهیچ جۆرێك بۆ یان نەکڕ درێ. بەم شێوە بەنو هاشم‌و بەنوموتەلیب ماوەی سێ ساڵ لەو شیوە دامانەوە، بەتەواوی لەکۆمەڵگای عەرەب دا بڕابوون، بەدزی نەبوایە هیچیان پێ نەدەگەیی، هەرکەسێك بیویستایە لەگەڵ قوڕەیشییەکان پەیوەندی هەبێ دەبوو بەتەواوی پشتگیری گەمارۆکە بکاو هیچ پەیوەندییەکی بەوانەوە نەبێ کەلەشێوەی ئەبوتالیب دابوون، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەمیشە دڵی دەدانەوەو ئامۆژگاری دەکردن لەسەر خۆ گری‌و پشوو درێژی، مێشکی زاخاو دەدانەوەو باوەڕو ئیمانی بەهێزتر دەکردن.

## هەڵوەشاندنەوە پەیمانی دەنگ دابڕین:

گەمارۆی قورەیشییەکان بۆ سەر شیوی ئەبوتالیب بەتەواوەتی تینی بۆ بەنو هاشم‌و بەنو مەتەلیب هێنا، برسیایەتیەکی وای تێدا بلاو کردنەوە

ناچار بن ڕەگە دارو گەڵادارو چەرمە وشکەڵ بخۆن[٧٤] ئیتر کەکار گەیشتە ئەوە هەندێ لەخاوەن ویژدانانی قورەیش و ریش سپییەکانیان، لەپێش هەمووشیانەوە هیشامی کوڕی عەمری ڕەبیعە رقیان لەم پەیمان و گەمارۆ خستنەی قورەیش بوو، بەزەییان بەحاڵ و بارو دۆخی منداڵە ساواکانی ناو شیوی ئەبوتالیب دا هاتەوە، هیشام بۆ خۆی پیاوێکی خزم دۆست بوو صیلەی ڕەحمی بەجێ دێنا، لەناو بنەماڵەکەی خۆشیان دا قسە ڕۆیشتوو بوو، هەڵسا چوو بۆ لای هەندێ لەپیاو ماقوڵانی قورەیش قسەی بۆ کردن و ویژدانی جوڵاندن و خزمایەتی و هۆزایەتی و مرۆڤایەتی تێدا هاندان بۆ ئەوەی پێ لەکەللەی شەیتان بێننە خوارێ و ئەو پەیمانی گەمارۆیە هەڵوەشێننەوە ئەم دابرین و گۆشە گیر کردنە بێ ڕەحمانەی قورەیش بۆ بەنو هاشم و بەنو موتەلیب بەکۆتا بێنن، جاکە پێنج کەس یەکیان گرت، بڕیاریان دا پەیمانەکە هەڵبوەشێننەوە، بۆبەیانی قورەیشییەکان لەیانەکەیان دا سەرگەرمی وت و وێژی خۆیان بوون، زوهەیری کوڕی ئەبو ئومەییە کە عاتیکەی کچی (عبد المطلب) دایکی بوو هەڵسا و ڕوی لەخەڵکەکە کرد وتی: ئەی دانیشتوانی مەککە، ئەوە چ ویژدانێك قبووڵی ئەوە دەکا؟ ئێمە بەئارەزوی خۆمان بخوێن و بخۆینەوە، پۆشاکی جوان بپۆشین، لەحاڵێك دا بەنو هاشم و بەگەورەو بچوك و پیاوو ئافرەتیانەوە خەریکە تێدا بچن؟ کەس شتیان لێ ناکڕێ و پێ نافرۆشێ؟ سوێندم بەخودا من دانانیشم تا ئەم سیپارە ڕەشە پڕ لەستەمە ونجڕ ونجڕ نەکەن!!

---

[٧٤] سەعدی کوڕی وەققاص دەگێڕێتەوە دەڵێ شەوێ بۆ کارێکی خۆم لەماڵ دەرکەوتم پارچە چەرمێکی وشکەوە بووم دۆزییەوە هەڵم گرت و پاك شۆریم و دوایی برژاندم و بەئاوەوە خواردم سێ ڕۆژ بەوە ژیام.

ئەبو جەهل ویستی قسە بکا هەندێ فلْتە فلْتی کرد بێ سوود بوو (موطعیم)ی کوڕی عەدی هەڵسا پەلاماری پەیماننامە شومەکە بداو بیدڕێنێ، کەدەستی لێ دا زانی مۆرانە هەمووی هەلا هەلا کردبوو جگە لەرستەی (باسمك اللهم) هەمووی داڕزا بوو، لەوە پێشیش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی ئەو مۆرانە لێدانەی پەیماننامەکەی بەئەبو تالیب مامی راگەیاند، وتی: سیپارەکە مۆرانە لێی داوەو هەلا هەلا بووە.

## مردنی ئەبو تالیب و خەدیجە:

پێغەمبەرو موسوڵمانەکانو بەنو هانشم لەو گەمارۆ شومە رزگاریان بوو، هەرکە سەو هاتەوە سەرماڵو جێگاو ڕێگای خۆی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە بانگەوازیو بلاْوکردنەوەی ئایینی پیرۆز. بەلاْم زۆری پێ نەچوو لەو ساڵە دا کەساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتی بوو دوو کۆسپی گەورە رویان کردە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دوو پشتیوانو یارمەتیدەری دڵسۆزی لەکیس چون، ئەوە بوو ئەبو تالیبی مامیو خەدیجەی خێزانی یەك لەدوویەك کۆچی دواییان کرد، هەرچەندە ئەبو تالیب موسوڵمان نەبو بوو بەلاْم لەروی مامو برازایەتیەوە پشتی گرتو هەموو تاڵیو سویریو ناخۆشی یەکی لەپێناودا چەشت..

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەمردنی ئەم دوو کەسە دڵسۆزەی هێندە نارەحەت بوو ساڵەکەی ناو نا ساڵی ماتەمی (عام الحزن) ئیتر لەوە دوا ئەزیەتدانو غەمو نارەحەتی لەهەموو لایەکەوە روی کردە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)، قورەیشییەکان بەمردنی ئەبو تالیب رێگەیان بۆ ئاچوخ بوو، کەس نەما شەرمی لێ بکەن، بێ شەرمانە بەهەموو جۆرێك ئەزیتان دەدا.

## کاریگەری قورئان لەدڵە ساغەکان دا:

طوفەیلی کوڕی عەمری (الدوسی) هات بۆ شاری مەککە ئەم پیاوە پیاوێکی ڕێزدارو سەنگینی ناو هۆزی خۆی بوو، لەهەمان کات دا شاعیرو وێژەوانو قسە ڕەوانو زمانپاراو بوو، قورەیشییەکان لەوە ترسان موحەممەد دەمی بگاتێو موسوڵمان ببێ. بۆیە دەست پێشخەرییان کردو زو چوونە لایو وتیان: موحەممەد جادو گەرو سیحر بازە نەکەی توخنی بکەوی، گوێ لەقسەو ئاخاوتنی مەگرە، ئێمە ترسی ئەوەمان هەیە ئەو پەتایەی موحەممەد خستویە تیە ناو دانیشتوانی مەککەوە، بکەوێتە ناو هۆزو خزمەکانی تۆوە.

طوفەیل بۆ خۆی دەڵێ: سوێندم بەخودا قوڕەیشییەکان هێندەیان لەو بارەوە لەگەڵ گوتم هەتا لەناخەوە بڕیارم دا هیچ وتەیەك لەپێغەمبەر نەبیسمو قسەی لەگەڵ نەکەم تەنانەت جارێك چوم بۆ مزگەوتی کەعبە گوێی خۆم بە لۆکە هاخنی بۆ ئەوەی گوێم لەقسەی موحەممەد نەبێ، کەچوم بینیم پێغەمبەر لەلای کەعبە نوێژ دەکا، کەمێك لێ ی نزیك بوومەوە، خوداویستی بڕێ لەوتەکانی ببیسم. ئیتر گوێم لەوتەیەکی جوانو شیرین بوو لەدڵی خۆم دا وتم: دەك داوەشێمو دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆ بکا، باشە خۆ من لەلای خۆی پیاوێکی دەمو گفت شیرینو شاعیرو هەستیارم، جودا وازی نێوان قسەی جوانو ڕەوان لەهی قسەی ناشیرین دەکەم، بۆچی گوێی خۆم نەکەمەوە گوێم لێ بێ بزانم ئەم پیاوە چی یەژێ؟ ئەگەر قسەکانی جوانو ڕێكو پێك بوو ئەوە وەریان دەگرم ئەگەر قسەکانی نارێكو پێك بوون ئیهمالیان دەکەم.

بەڵێ طوفەیل چو بۆ ماڵی پێغەمبەرو لەوێ بەخزمەتی گەیشت، سەر گوروشتەی خۆی بۆ گێڕایەوە، ئەمجار پێغەمبەر هەندێ باسی ئیسلامی بۆ

کردو داوای لێ کرد موسوڵمان ببێ، هەندێکی قورئان بەسەردا خوێندەوە ئەویش ئیمانی هێناو گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی و بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان، بەخاوو خێزانی خۆیشی وت: هەتا موسوڵمان نەبن لەگەڵتان دانانیشم ئەوانیش هەموویان موسوڵمان بوون ئەمجار بانگی هەموو هۆزەکەی کرد بۆ موسوڵمان بوون و ئیسلام لەناویان دا بلاو بووەوە.

ئەبو بەکری صدیق لەماڵی خۆی دا خودا پەرستی دەکردو لە نوێژەکانی دا دەنگی بەرزنە دەکردەوە، دوایی لەحەوشەکەی ماڵی خۆی دا شوێنێکی دیاری کرد بۆ نوێژ کردن وەکوو مزگەوتێکی بچکۆلە، نوێژی تێدا دەکردو قورئانی تێدا دەخوێند ژنی قورەیشییە موشریکەکانو منداڵەکانیان دەورەیان دەگرتو لێ ی کۆدەبوونەوە، قرقشیلەیان لێ دەکرد، پێ ی سەرسام دەبوونو سەیریان دەکرد حەزرەتی ئەبو بەکر بۆ خۆی پیاوێکی دڵنەرمو گرینۆك بوو کەقورئانی دەخوێند خۆی بۆ رانەدەگیرا گریانی دەهات.

ئەمەش ترسو بیمێکی زۆری لەدڵی قورەیشییەکان دا پەیدا کرد بەتەواوی تەنگە تاو بوون، بۆیە ناردیانە لای ئیبنو دەغنە کەحەزرەتی ئەبو بەکری پەنا خۆی دا بوو لەسەری دەکردەوە، ئیبنو دەغنە هاتە لایان، وتیان ئەوە ئێمە بەهۆی تۆوە کەپەنای ئەبو بەکرت داوە وازمان لێ هێناوە بەو مەرجەی لەماڵی خۆی دا خودا پەرستی بکا، بەلآم ئەوە پابەندی ئەو مەرجە نەبوەو سنوور بەزێنی کردوە، هاتووە لەحەوشەی ماڵی خۆی دا مزگەوتی بنیات ناوە بەئاشکرا نوێژی تێدا دەکاو قورئانی تێدا دەخوێنێ، ترسی ئەوەمان هەیە ژنەکانمان، منداڵەکانمان هەڵخەڵەتێنێ، دوایی بچۆ پێ ی بڵێ: واز لەو کارانە بێنێ، جا ئەگەر بەگوێی کردیو رازی بوو بەوەی کەلە ماڵی خۆی دا بەبێ دەنگی خودا پەرستی خۆی بکا ئەوە باشە، ئەگەر

بەقسەی نەکردی‌و هەر بە دەنگی بەرز قورئانی خوێندو بەئاشکرا نوێژی کرد ئەوە تۆ داوای لێ بکە با پەیمانی جیوارەکەت بداتەوەو عەهدو پەیمانی نێوانتان هەڵبوەشێتەوە، چونکە ئێمە پێمان ناخۆشە راستەو خۆ لەخۆمانەوە، پەیمانی جیواری تۆ پوچەڵ بکەینەوە. بەهیچ شێوەیەك رازی نابین ئەبو بەکر بەو شێوە خودا پەرستی خۆی ئاشکرا بکا. جاکە ئیبنو دەغنە ئەم داوایەی قورەیشییەکانی پێ راگەیاند، ئەبو بەکر بەورەیەکی بەرزەوە وتی: ئەوامن جیوارەکەتم بۆ رەتکردیتەوە، من لەجیوارو پەنای خودا دامو ئەوم بەسە.

## چوونی پێغەمبەر بۆ طائیف و ئەو ئەزیەت و نارەحەتیەی توشی هات:

کەئەبو تالیب مرد لەناو قورەیشییەکان دا کەسی وا نەبوو پشتگیری پێغەمبەر بکاو شەرمیشی لێ بکەن، بۆیە کەئەبوتالیب نەما ڕێگە بۆ کافرەکان ئاچوخ بوو ئەزیەتێکی وەهای پێغەمبەر بدەن کەلەژیانی ئەبو تالیب دا نەیاندەوێرا بیریشی لێ بکەنەوە، تەنانەت جارێکیان یەکێ لەنەفامەکانیان بەری ڕێگای پێ گرت‌و مشتێ خۆڵی بەسەردا کرد. جا ئەزیەتدان‌و دژایەتیکردنی قوڕەیشییەکان بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەرەی سەندو گەییشتە تۆ پەلاك، لەهەمان کات دا گوێیان بۆ ئامۆژگاری‌و بانگەوازی ئیسلامی نەدەگرت‌و هیچ لایان لێ نەدەکردەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەشاری مەککە دەرکەوت‌و بەرەو طائیف کەوتە ڕێ بەهیوای ئەوەی هۆزی ثەقیف پشتگیری بکەن‌و موسوڵمان بن، هیوایەکی زۆری بەدانیشتوانی طائیف بوو کە بەپیریەوە بێن‌و پێشوازی لێ بکەن، ئەمەش

سەیر نەبوو چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەمنداڵی لەناو هۆزی بەنی سەعددا شیری خواردوەو پەروەردە بووە، ئەوانیش لەشاری طائیفەوە نزیك بوون، شیر دەرو بەخێوکارانی لەوێ بوون.

## تیشکێك بۆ سەر طائیف:

شاری طائیف دوای شاری مەککەو شاری یەثریب سێیەم شاری گەورەی جزیرە بوو، ئەو شارەی بە چوونی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ ناوی بەختەوەر بوو، بەرەکەت روی تێکرد بەڵام دانیشتوانەکەی رەتیان کردەوە، بێگومان ئەم سەفەرەی پێغەمبەری خودا بۆ ئەوێ لە پێناو بانگەوازی ئیسلامی دا روداوێکی گەورە بوو، نەك لەژینامەی پێغەمبەر داو بەس، بەڵکوو لەمێژووی پێغەمبەرایەتی و بانگەوازی بۆ خودا پەرستی دا بەگشتی، پێغەمبەری خودا دووجار چووەتە شاری طائیف جاری یەکەمیان لەمانگی شەوالی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی داو جاری دووەمیش لەمانگی شەوالی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا بووە، بۆیە پێویستە زیاد لەشارەکانی تری جەزیرە تیشکێکی بخەینە سەر بۆ ئەوەی شارەزای گرنگی و مەکانەتی مێژوویی و جوگرافی و کۆمەلایەتی ئەو شارە دێرینە ببین، ئەمەش هەندێ زانیاری دەربارەی طائیف بۆ خوێنەری ئازیز..

شاری طائیف بەدووری نزیکەی حەفتاو پێنج میل لەجنوبی خۆر هەلاتی مەککەوەیە، کەوتۆتە پشت کێوی (غەزوان) ە وە کە لەئاستی دەریاوە شەش هەزار پێ بەرزە، ناوی لەو دیوارە شورا ئامێزە وە هاتووە کەدەوری شارەکەی داوە، ناوی دێرینی ئەم شارە (هـووەج) ە. لەکاتی خۆی دا دەوڵەمەندەکانی قورەیش لەو شارەدا قەصرو باڵەخانەیان رابەستبوون، مانگە گەرمەکانی هاوینیان لەوێ بە سەر دەبرد، عەبباسی کوڕی عبد

المطلب زەوی‌و زارێکی زۆری لەوێ هەبوو، بەلازری دەڵێ: زۆربەی زۆری قورەیشییەکان مڵك‌و ماڵیان لەطائیف هەبوو لەمەککەوە دەهاتن سەریان لێ دەداو سەروکارییان دەکرد،[٧٥] ئەم دەوڵەمەندی‌و خۆشگوزەرانی یەی دانیشتوانی طائیف سەری کێشا بۆ داڕزانی باری کۆمەڵایەتی، دەوڵەمەندەکانی طائیف بەوە مەشهور بوون کە سوو خۆرو داوێن پیس‌و عەرەقخۆر بوون، لەشاری طائیف دا دروستکردنی عەرەق‌و بەخێو کردنی رەزو پیست دەباغکردن‌و عەتر دروستکردن باو بوو، ئاوی زۆرە، زەوی یەکەی بەپیتە، باغ‌و بێستانی زۆرە، بەروبوومی جۆراو جۆرە میوەی بەتام‌و خۆشە، کشت‌و کاڵی زۆری تێدا دەکرێ درەختی بەرداری زۆرە‌و تائێستاش هەروایە.

لەو ڕۆژگارەداو دواییش هاوینە هەواری دەست رۆیشتوو سامانداره تەنپەروەرەکان بووە عەمری کوڕی رەبیعە شاعیرێکی سەردەمی ئەمەوییە دەڵێ: (تشتو بمكة نعمة ومصيفها بالطائف) جا چونکە دانیشتوانی طائیف خاوەن زەوی زارو باغ‌و باغات بوون، دەوڵەمەندو ژیان نەرم‌و نۆڵ‌و خۆشگوزەران بوون، هەموویان رەوشتی خۆبەزلزانی‌و لەخۆ بایی بوونیان تێدا بەرجەستە بو بوو، دەق ئایەتی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ. وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ. سورة سبأ (٣٤-٣٥)﴾. دەبێتە ئاوێنەی بالآ نما بۆیان.

هۆزی ثەقیف لەطائیف دا خۆیان ئاغاو کوێخا بوون، گەورەترین هۆزی عەرەبەکان بوون، ئازایەتی‌و هێزو توانای ئەم هۆزە بەنموونە دەهێنرایەوە،

---

[٧٥] فتوح البلدان ص ٦٨.

لەهۆزە عەرەبە موستەعرەبەکان بوون، واتە: عەرەبی عەدنانی بوون، هەمیشە لەنێوان هۆزی ثەقیفو هۆزی قورەیش دا لەبواری ئایینو سەروکایەتی بتەکان دا کێ برکێ هەبوو، بتی تایبەت بەهۆزی ثەقیف کە (اللات) بوو بە هاوشانی بتی (هبل) ی قورەیشییەکان دەژمێردرا تەنانەت بەهاو شانی کەعبەیان دادەنا، بەدەوری نزرگەی دا بەستو حەرەمێکیان رابە ستبوو، ئەو دیاردەو تەقدیسو شیعاراتە ئایینیانەی بۆ کەعبە ئەنجام دەدرا هۆزی (ثەقیف) یش بۆ بتی (اللات) ئەنجامیان دەدا، کاتێکیش ئەبرەهە بەسوپاکەیەوە هێرشی هێنایە سەر مەککە بەمەبەستی روخاندنی کەعبە، لەناو هۆزە عەرەبە کان دا تەنها هۆزی ثەقیف پشتگیری ئەبرەهەیان کرد، ئەبو ریفالیان کرد بەدەلیلو رێ نیشان دەری سوپای ئەبرەهە بۆ سەر مەککە، قەدەری خودا وای هێنا لەرێگا ئەم رێ پیشاندەرەکە ئەبو (رغال) بوو مرد، لەو کاتەوە عەرەب رقیان لێ یەتی گۆڕەکەی بەردباران دەکەن.

لەروی خۆشگوزەرانییەوە هۆزی ثەقیف لەناو هۆزە عەرەبەکان دا بەناو بانگن، دۆستایەتییان لەگەڵ بەنو ئومەییە بوو، وەکو یەك حەزیان لەدەوڵەتو سامانو ناوو ناوبانگ دەکرد، حەزیان لەبازرگانیو ئاڵو وێر دەکرد، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: قورەیشو ئەنصار هاو پەیمانن، بەنو ئومەییەو (ثەقیف) یش هاوپەیمانن[٧٦] عوروەی کوڕی مەسعود (کەسەرۆکی هۆزی ثەقیف) بوو مێردی ئامینەی کچی ئەبو سوفیان بوو، عوروە لەئامینە کوڕێکی هەبوو ناوی داودی کوڕی عوروە بوو. زۆر لە راڤەکارانی قورئان پێیان وایە: کە قورئان لەزمان قورەیشییەکانەوە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ سورة

---

[٧٦] بلوغ الأرب في معرفة احوال العرب/ محمود شكرى الألوسى جـ ٣/ ٣٣.

الزخرف (٣١). مەبەستی بەو پیاوە عوروەی کوڕی مەسعودە.[٧٧] (الحارث) ی کوڕی کەلدە لەناو هۆزی ثەقیف دا هەڵکەوتووە، ئەم پیاوە یەکێکە لەپیاوە هەڵکەوتووەکانی عەرەب، سەفەری کردوە بۆ وڵاتی فارس، فێری زانیاری پزیشکی بووە، پزیشکایەتیەکەی لەناو عەرەبەکان دا بەناو بانگ بووە، لەدوای خۆیشی (النضر) ی کوڕی ناوبانگی دەرکردوە، ئەم پیاوە دەبێتە پورزای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەناو چەند وڵات دا گەڕاوە، ڕەفاقەتی چەند مالم و قەشەو کاهینێکی کردوە، شارەزایی لەزانستی فەلسەفەو زانستی حیکمەت دا هەبووە، لەباوکی یەوە فێری پزیشکی بووە، ئەم (النضر)ە کە کوڕی خوشکی دایکی پێغەمبەر بوو، زۆری رق لەپێغەمبەر بوو، حەسوودی پێ دەبرد، ئومەییەی کوڕی (الصلت) یش یەکێکە لەپیاوە بەناوبانگەکانی هۆزی ثەقیف، یەکێکە لە شاعیرە (مخضرم)ە کان، ئەوانەی لەپێش هاتنی ئیسلام دا لەژیان دا بوون سەردەمی ئیسلامیشیان بینیوە. واتە: هاوچەرخی سەردەمی جاهیلی و سەردەمی ئیسلامی بوون، ئاگاداری کتێبە ئایینی یەکانی پێشوو بووە، بەتایبەتی زۆر شارەزای تەورات بوو، یەکێك بوو لە پێشەنگی تاقمی حونەفاکان، کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕەوانەکراو بانگەوازی پێغەمبەرێتی خۆی ڕاگەیاند ئومەییە دەستی لەهەمبانەکە دەرچوو، لەروی حەسوودی و دڵ پیسی یەوە ئیمانی پێ نەهێنا، بەڵکوو خەڵکی هان دەدا بۆ ئەوەی دژایەتی پێغەمبەر بکەن، کوژراوی دوژمنانی پێغەمبەری دەلاواندەوە، بەتایبەتی لەروداوی (بەدر) دا! دەربارەی یەکتا پەرستی و حیکمەت شیعری زۆری گوتووە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەربارەی دەفەرموێ: بەشیعرەکانی بێ ئیماندارە، وەلّی بەدڵ کافر بووە (آمن شعره وكفر قلبه).

---

[٧٧] الاصابة في تميز الصحابة جـ ٤٧٧/٢.

ئەوەی کە بۆ هۆزی ثەقیف بەسەروەری دەژمێردرێ ئەوەیە کە لەدوای لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) زۆربەی هۆزە عەرەبەکان لەئیسلام پاشگەز بوونەوە جگە لە هۆزی قورەیش و هۆزی ثەقیف ئەوان لەئیسلام پاشگەز نەبوونەوە. ئیبنو کەثیر دەڵێ: هۆزی ثەقیف لەشاری طائیف لەدوای لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئیسلام مانەوە، بەرەی ئیسلامیان بەرنەداو لەئیسلام پاشگەز نەبوونەوە،[78] ئەم هۆزی ثەقیفە لەشەرە بەناو بانگەکانی ئیسلام دا رۆڵێکی ئیجابیانەی کاریگەریان هەبووە، زۆر هەڵویستی مەردانەو پاڵەوانانەیان نواندوە،

بێگومان پێغەمبەری خودا کەبڕیاری دا بچێ بۆ طائیف یا لەبەر ئەوە بوو پێ ی وابوو کەطائیف لەدوا مەککە دووەم مەڵبەندی هێزو تواناو سەرۆکایەتی یە لەحیجازدا یان چونکە خاڵەکانی لەهۆزی ثەقیف بوون، ویستی بچێ بۆ طائیف بۆ ئەوەی هۆزی ثەقیف پشتیوانی لێ بکەن و نەهێڵن قورەیشییەکان زیانی پێ بگەیەنن.

بەڵام خۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەمەککەدا پەروەردە بووەو پیاوێکی وریاو تێگەیشتوو بوو، بێ ئاگا نەبوو لەپەیوەندی پتەوی نێوان مەککەو طائیف و هاتوو چۆی نێوانیان، دەیزانی کەهەواڵی بانگەوازی یەکەی و رەتکردنەوەی پەیامەکەی لەلایەن قورەیشییەکانەوە، گەییشتۆتە طائیف، وەلێ ئەرك و نارەحەتی ئەو سەفەرەی خستە ئەستۆی خۆی و ئەو رێگە دوورەی نێوان مەککەو (طائیف)ی بڕی، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئەو چەند سورە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی و چەند دڵسۆزە بۆ بڵاوبوونەوەی بانگەوازی یەکەی. ئەمەش خۆی لەخۆی دا نیشانەی بەرزی ورەی

---

[78] البدایه والنهایه جـ ٦/٣٠٤.

پێغەمبەرێتی و توندو تۆڵی و پشت بەستنی بەخواو هەبوونی هیوای زۆری بەفیترەتی ساخلەمی ئادەمیزاد.

بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمانگی شەوالی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی دا لەمەککە دەرچوو بەرەو طائیف کەوتەڕێ دەڵێن: پێغەمبەری خودا لەم سەفەرەی دا بۆ طائیف زەیدی کوڕی حاریثی لەگەڵ خۆی بردوە.

## پێغەمبەری خودا لە طائیف:

شاری طائیف لەدوا شاری مەککە گرنگترین شاری وڵاتی جەزیرە بوو، لەڕوی ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی دانیشتوانی و قورسایی سیاسی یەوە بەربەرەکانی مەککەی دەکرد. ئەوەتا قورئان وتەی قوڕەیشییەکان نەقڵ دەکا کە دوژمنی سیاسی و ئایینی دانیشتوانی طائیف بوون. جاکە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ. سورة الزخرف (٣١)﴾ مەبەستی شاری مەککەو شاری (طائیف)ە، قوڕەیشییەکان پێیان وابوو پلەو پایەی پێغەمبەرێتی دەبێ بدرێ بەگەورە پیاوی مەککە یان گەورە پیاوی طائیف. کەوابوو قورەیشییەکان حیسابێکی تایبەتییان بۆ شاری طائیف و دانیشتوانەکەی دەکرد. چونکە طائیف مەڵبەندی پەرستنی بتی (اللات) بوو کەبتێکی ناو دار بوو حەجی بۆ لا دەکرا، لەم رووەوە بەربەرەکانی مەککەی دەکرد کەمەڵبەندی پەرستشکردنی بتی (هوبەل) بوو کە گەورە بتی قورەیش بوو. جاکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشتە طائیف پەیوەندی بەچەند کەسێکەوە کرد، لەوانە هەندێکیان ریش سپی و پیاو ماقوڵی هۆزی ثەقیف بوون، دانیشتنی لەگەڵ دا کردن و بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان و خودا پەرستی، بەڵام گوێ بیسی

بانگەوازییەکەی نەبوون و ولامێکی شەڕ ئامێزو ناشیرینیان دایەوە، گاڵتە یان پێ کرد، بێ عەقڵ و نەفام و هەتیوو کۆیلەکانی خۆیان راسپارد جنێوی پێ بدەن، هوهای بۆ بکێشن چەقەنەی بۆ لێ بدەن بەردە بارانی بکەن، ئەوانیش بەناشیرین ترین شێوە ئەزیەتنیان دا وەکوو سەگە خوێڕی لەهەموو لایەکەوە پەلاماریان دا، جەستەی پیرۆزی بریندار بووقول و قاچی خوێنیان لێ دەتکا، بەم جۆرە لەشار دەریان کرد، منداڵە وردکە بەدوایەوە بەردیان تێ دەگرت و وازیان لێ نەدەهێنا، هەتا لەقەراخ شار خۆی خستە ناو باخە خورمایێکەوە کە هی عوتبەو شەیبەی کوڕانی رەبیعە بوو، لەگەڵ زەیدا چوون بن دارخورمایەک و خاوەن باخەکەش هەرچەند کافر بوون بەزەییان پێدا هاتەوەو منداڵەکانیان لێ دوور خستنەوە.

ئەو ئەزیەتدانەی کە لەطائیف توشی پێغەمبەری خودا بوو زۆر گرانتر بوو لەوەی لەقورەیشی یەکانەوە لەوەپێش توشی بوو، دانیشتوانی طائیف زۆر نەفامانە بەرەو روی بانگەوازییەکەی بوونەوە، سەرباری ئەوەی کەسیان ئیمانی پێ نەهێنا، دەریشیان کرد، بەو شەوە نەوەستان منداڵە وردەکەو هەتیوو خوێڕی خۆیان لێ هاندان ئەم بەرو ئەو بەری رێگایان لێ گرتن: کەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەشار دەرکەوت هەریەکەیان لەئاست خۆیەوە بەردی تێدەگرت، هەتا وای لێ هات هەموو قوڵ و قاچی خوێنیان لێ دەتکا، بەدڵ و بەزوبان کەوتە دوعا کردن و نزاو پاڕانەوە شکایەتی زەعیفی و بێ کەسی خۆی لەلای خودا دەکرد، پەنای دەگرت بەخوداو داوای لێ دەکرد یارمەتی بدا، دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (اللهم اليك اشكو ضعف قوتي و قلة حيلتي، و هواني على الناس، يا أرحم الراحمين! انت رب المستضعفين، وانت ربي، الى من تكلني؟ الى بعيد يتجهمني؟ ام الى عدو ملكته أمري؟ ان لم يكن بك غضب علي فلا ابالي، غير ان عافيتك هي اوسع لي اعوذ بنور وجهك

الذي أشرقت له الظلمات، و صلح عليه أمر الدنيا و الآخرة، من أن تنزل بي غضبك، أو يحل علي سخطك، لك العتبي حتى ترضى ولا حول ولا قوة إلا بالله).

خودایە من زەعیفی و بێ دەرەتانی و بێ فێڵی و بێ نرخیم لای خەڵك بۆ تۆ دەدرکێنم، ئەی ئەو کەسەی لەهەموو کەس بەبەزەیی تری ئەتو خودای بێ هێزانی، ئەتۆ خودای منی و تاك و تەنها و بێ هاوەڵی، بەکێم دەسپێری؟ بەبێگانەیەك کە بەڕوی گرژو مۆنەوە سەیرم بکا؟ یان دەمسپێری بەدوژمنێك و کارو بارم دەخەیە ژێر دەستییەوە؟؟ سەرباری ئەمانەش هەموو ئەگەر تۆم لێ رازی بێ هەموو شتێك ئەخەمە لاوە، تۆم لێ نەرەنجێی باکم نیە، ئەوەندە هەیە خۆشنودی تۆ بۆ من لەهەموو شتێك فراوانترە، پەنا دەگرم بەروناکی روت کەهەموو تاریکیەك لادەبا، بەختەوەری دونیاو قیامەت لەسەر رەزامەندی تۆ بەندەو پەیوەستە بەروناکی روت، پەنا دەگرم لەوەی کە قارو قینی خۆتم بەسەردا برژێنی، یان لێم زویر ببی و نارازی بێ لێم. هەمووکەس شایانی سەرزەنشتکردنە تاتۆی لێ رازی دەبێ، هیچ پەناو هێزێك نیە جگە لەپەناو پشتگیری تۆ، پەروەردگار فریشتەی تایبەت بەکێوو کەژی بۆ لانارد، داوای لێ کرد رێگەی بدا ئەو دوکێوەیان بەسەردا بداو لەناویان بەرێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەو حاڵە شەوە فەرمووی: نا بەڵکوو من هیوادارم لەپشتی ئەمانە کەسانێك پەیدا بن کەعیبادەتی خودا بکەن و یەکتا پەرست بن و کەس نەکەن بەهاوەڵی خودا.

جاکە عوتبەی کوڕی رەبیعە و شەیبەی کوڕی رەبیعە پێغەمبەریان بەو حاڵەوە بینی، ویژدانیان جوڵاو بەندەیەکیان هەبوو نەصرانی بوو ناوی عەدداس بوو بانگیان کرد، وتیان ئەو ترێ یە بخەرە ناو ئەو سەبەتەوەو بیبە بۆ ئەو پیاوە، پێی بڵێ بابیخوا عەدداس چۆنیان پێ گوتبوو وای

کرد، جا کە گەییشتە لای پێغەمبەرو ترێ یەکەی خستە بەردەمی پێغەمبەر دەستی بۆ بردو فەرمووی (بسم الله) عەدداس وتی: ئەم رستەیە دانیشتوی ئەم دەڤەرە نایڵێن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ تۆ خەڵکی کوێی؟ وتی: من نەصرانیمو خەڵکی نەینەوام، فەرمووی خەڵکی شاری (یونسی کوڕی مەتێ)ی. ئیتر وتو وێژی نێوان پێغەمبەرو عەدداس درێژەی کێشا، سەرەنجام عەدداس موسوڵمان بوو.

دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەطائیفەوە بەرەو مەککە کەوتە رێ کەگەییشتە ئەوێ نەتەوەکەی لەجارانی پێشوو سەر رەق ترو دوژمن تری بوون بەهەمان شێوە دەستیان کردەوە بە سوکایەتی پێکردنیو ئەزیەتدانی.

## شەو ڕەوی کردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):

دوای ئەو هەموو ئەزیەتو سوکایەتی پێکردنەی بە پێغەمبەر کرا، ئەو هەموو دژایەتیکردنو بەدرۆخستنەوەو دەنگ لێ دابڕینو گۆشە گیر کردنو زبڵو زاڵ پێداکردنو گاڵتە پێ کردنو بەردە باران کردنو بریندار کردنەی توشی پێغەمبەر هات لەلایەن دانیشتوانی مەککەو دانیشتوانی طائیفەوە، پەروەردگار ویستی دڵنەوایی پێغەمبەرەکەی بکاو ئێشو ئازار لەسەر دەروونی پاکی لابەرێ، ویستی لاپەڕەیەکی تر لەژیانی پێغەمبەرایەتی دا بەگشتیو لە ژیانی پێغەمبەری ئیسلام دا بەتایبەتی هەڵبداتەوە، ویستی خودا وا بوو پێغەمبەرەکەی بەرز بکاتەوە بڕێ لەملكو مەلەکوتی نیشان بدا، هەندێ شتی نیشان بداو تێی بگەیەنێ کەلە وەپێش تێیان نەگەییشتبوو، ویستی بەرزی بکاتەوە بۆ مەقامێك کەفریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەسیش پێ ی ناگەن، بۆ ئەم مەبەستانەو چەندەها مەبەستی تر کە هەر خودا خۆی دەزانێ، شەوڕەوی بە پێغەمبەر کرا لەمەسجیدو لحەرامەوە بۆ

مەسجیدو لئە قصاو لەوێشەوە بەرزکرایەوە بۆ ئەو مەقامەی جگە لەخودا خۆی کەس چۆنیەتیەکەی نازانێ، بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانەکانو ملكو سەڵتەنەتی بێ سەرو بنی پەروەردگاری بینی، بەهەشتو دۆزەخی چاوپێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەران دا کۆبوەوە چەندەها و چەندەها ئایەتو نیشانەی گەورەیی خودای بینی، بەچاوی سەر بینینی، ﴿مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى، لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى. سورة النجم (١٧-١٨)﴾. میوانداریەکی رێز لێنان بوو لەخوداوە بۆ بەندەی خۆی حەزرەتی موحەممەد. دڵدانەوەو تەسەللادانەوەی بوو لەو هەموو ئەزیەتو نارەحەتیەی تووشی هاتبوو، لەپێناو بانگەوازی یەکەی دا.[٧٩]

جابۆ بەیانی چووە لای قورەیشییەکانوهەواڵی شەوڕەوی خۆی پێ ڕاگەیاندن، بەبیستنی ئەم هەواڵە قورەیشییەکان شێلگیر بونو کەوتنە بەدرۆخسنەوەییو گاڵتە پێکردنی، هێندەیان شتەکە بەلاوە دورو نەگونجاو بوو، خێرا ناردیان بۆ لای ئەبو بەکرو بۆ ئەوەی ئەم هەواڵەی بدەنێ سا بەڵکوو ئەویش بەدرۆی بزانێو لەئایین پەشیمان بێتەوە، بەلاّم

---

[٧٩] ئیمامی بەیهەقی لەئیبنو شیهابی (الزهری) یەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: شەو ڕەوی بەپێغەمبەر لەساڵی پێش ساڵی کۆچکردنی بووە (الحاکم) دەڵێ شەو ڕەوییە شانزە مانگ پێش کۆچکردن بۆ مەدینە بووە.. دەربارەی ئەو مانگەی شەورەوی تێدا ئەنجام درا زانایان رای جیا جیا یان هەیە، هەندێ وتوویانە شەورەوی بەپێغەمبەر لەمانگی ذیلقەعیدە دابووە، هەندێ وتوویانە لەمانگی رەبیعول ئەوەل دابوو، هەندێکی کەمانگی تر دیاری دەکەن. ئەوەی کەمەشهورو باوە شەو رەوی بەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەشەوی بیستو حەوتی مانگی رەجەب دابووە، حافظ ئیبنو سرور (المقدسی) ئەمەی پەسەند کردوە، بەلاّم زانایان هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کەئەم روداوە گرنگە دوای چوونی پێغەمبەر بووە بۆ طائیف. وەرگیراوە لەکتێبی (خاتم النبين) دانراوی محمد أبو زهره جـ ١/٥٩٦.

کەهەواڵەکەیان بەئەبو بەکر ڕاگەیاند، فەرمووی سوێندم بەخودا، ئەگەر ئەو هەواڵە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گوتبێتی ئەوراست دەکا، جا ئەوە چیە، وەڵلاهی ئەگەر لەوەش شتی گەورەتر بڵێ من بڕوای پێ دەکەم، ئەو تەشریفی ڕۆژانە خەبەرم پێ دەدا کە لە سەعاتێکی شەودا یان ڕۆژدا هەواڵی لەئاسمانەوە بۆدێ بۆ سەرزەوی من یەکسەر بێ چەندو چون بڕوای پێ دەکەم، خۆ ئەمەزۆر سەرسوڕهێنەرترە لەوەی ئێوە سەرتان لێ سوڕماوە.[80]

---

[80] جەماوەری ئەهلی سوننەپێیان وایە شەوڕەی بەپێغەمبەر بەجەستەو گیان بووە، بەهێز ترین بەڵگە لەسەر ئەوە ئەوەیە: کاتێك پێغەمبەر ئەو شەو ڕەوییەی خۆی ڕاگەیاند لەناو قورەیشییە کان دا هەندێ لەوانەی موسوڵمان بوون کەوتنە گومانەوەو لە ئایین هەڵگەڕانەوە، قورەیشییە کانیش سەر لەبەرکەوتنە گاڵتە پێ کردنی و بەدرۆ خستنەوەی، دەی ئەگەر شەوڕەوی یەکەی تەنها بەگیان بوایە یان خەونی ببینیایە، ئەوە هیچ بەلایانەوە غەریب نەدەبوو، چونکە نەك پێغەمبەر بەڵکوو زۆر ئادەمیزادی ئاسایی بەخەون شتی وەها دەبینی کە لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ یان بەخەیاڵی کەسدا ڕانابورێ، هەر لەکۆنەوە لەهەمووکات و شوێنێك دا ئادەمیزاد ڕاهاتووە خەونی سەیروسەمەرە ببینێ و کەسیش نەهاتووە ئەو جۆرە خەونە خەیاڵیانە بەدرۆبخاتەوە، کتێبی ئایینەکان و هەواڵی گەورە پیاوان و ڕەبەن و دێرنشینەکان پڕە لەریوایەتکردن و گێڕانەوەی ئەو جۆرە خەونانەوکەسیش گاڵتە یان پێ ناکاو بەلایەوە سەیر نین. جا ئەگەر شەوڕەوی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەنها بریتی بوایە لەبەرزبوونەوەیەکی گیانی، یان بەخەو ئەو دیاردەو ڕوداوانەی بدیتایە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی دەدانێ کەئەوە نیگا بووە بۆی هاتووە یان بەخەون ئەو شتانەی دیتوە، ئیتر ئەو کاتە قورەیشییەکان ئەوەشیان دەخستە پاڵ ئەو قسانەی تری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەبەیانی و ئێوارێ بەشەوو بەڕۆژ لێیان دەبیست کەدەیفەرموو فریشتە دێتە لام و سروشم بۆ دێنێ...هتد. هیچ پێویست نەبوو، ئەو هەموو سەرسورمان و دەهشەتە بیان گرێ. هەرکەسێ دەیەوێ پتر لەم بارەوە بچێتە ناو نهێنی و حەقائیقی شەوڕەوی

## مانا قوڵەکانی شەورەوی و بڵند بوونەوە بۆ ئاسمانەکان و مەبەستە دوورەکانی:

شەورەوی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەنها روداوێکی ساناو بەسیت نەبوو بریتی بێ لەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نیشانەی گەورە گەورەی بینیبێ و ملك و مەلەکوتی زەوی و ئاسمانەکانی بەچاوی سەرو بەئاشکرا دیتبێ و بەس! بەڵکوو وێڕای ئەوانە هەموو ئەم گەشتە پێغەمبەرایەتیە نهێنی یە سەر سوڕهێنەرە زۆر مانای قوڵ و وردەکاری زۆرو جۆراو جۆرو ئامـاژەی حیکمەت ئامێزودوور هاوپێژی لەخۆ گرتوون، بێگومان سەر گوروشتەی شەورەوی و هەر دو سورەتی (الأسراء) و (النجم) ئەوەیان لەخۆ گرتووە کەموحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەری دوو قیبلەیە ڕوو دەکاتە دوو رۆگە، پێغەمبەرو رابەری خۆرهەلاّت و خۆرئاوایە، میراتگری پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، رابەرو پێشەوای چینەکانی داهاتووی ئادەمیزادە بەگشتی، لەشەورەوی و کەسایەتی پێغەمبەردا مەککەو قودس و کەعبەو بەیتو لمەقدیس یەکیان گرت، پێغەمبەران لە دوایەوە نوێژیان کردوّتە شریفی بوو بەپێشنوێژیان، ئەمە نیشانەی ئەوەبوو کەپەیامەکەی گشتی یەو پێشەوایەتیەکەی و تەعلیمات و تەشریعاتی بۆ هەتا هەتایی یەو بەکەڵکی هەموو کات و شوێنێك دێ و بۆ هەموو گەل و نەتەوەکانی سەرزەوییە...

روداوی شەورەوی بوو بەهێڵێکی جودا کەرەوەی سەرەکی و وەرچەرخانێکی ئاشکرا لەنێوان لایەنی ناوچەیی تەنگەبەری کاتی و لایەنی

---

پێغەمبەرو حیکمەتی خودایی و ئامـاژەی وردو ناسك و سودی بۆ شەریعەت و بانگەوازی شارەزابێ بابگەڕێتەوە بۆ سەرەباسی (الأسراء الی المسجد الأقصی ومنه الی سدرة المنتهی) لەکتێبی حجه الله البالغه جـ ٢ دانراوی مامۆستای پایە بەرز ئەحمەدی کوری عبدالرحیم دەهلەوی کۆچکردوی ساڵی ١١٧٦کۆچی.

کەسایەتی پێغەمبەرێتی هەمیشە زیندوو جیهانی. جا ئەگەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) سەرۆکی نەتەوەیەك بێ، یان پێشەوای ناوچەیەك، یان رزگار کەری سەردەمێك، یان دامەزرێنەری شکۆمەندی یەك بێ، ئەوە هیچ پێویستی بەشەو ڕەوی و بەرزبوونەوە نەدەبوو، پێویستی بەوە نەبوو ئەو گەشتە بەناو جیهانی مەلەکوت دابکا، پێویستی بەوە نەبوو زەوی و ئاسمان سەر لەنوێ بەهۆی ئەوەوە پەیوەندی پێکەوە بکەنەوە، بێگومان لەو خاکەی کەپێغەمبەری تێدا پەروەردە بو بوو تێ یدا دەژیاو لەو دەورو بەرەی ئەو تێکۆشانی تێدا دەکردو لەو کۆمەڵگایەی ئەو هەوڵی دەدا بەختەوەری بۆ دەستەبەربێ، کەرەسەی ئەوە هەبوو، پێویست بەوە نەکا بچێتە قودس، کەزۆر لەمەککە دوور بوو بەشێك بوو لەحکوومەتی رۆمی بیزەنتی یان بچێتە خاکێکی تر، چ جایی بچێتە ئاسمانەکان و بەعالەمی مەلەکوت دا بگەڕێ. هیچ پێویستی بەوە نەبوو بگاتە (سدرة المنتهي)!! شەوڕەوی روداوێك بوو روی دا، حەزرەتی موحەممەد ئەوەی راگەیاند کە ئەو لەپێری ئەوپێشەواو سەرۆکانە نیە کەهەوڵ و تێکۆشانیان لەسنوری ولاتی خۆیان و نەتەوەی خۆیان تێپەڕ ناکا، تەنها گەل و نەتەوەکانی خۆیان یان ئەو هەرێم و ناو چانەی تێ یدا پەروەردە دەبن لێیان سود مەند دەبن، بەڵکوو ئەو لەپێری ئەو پێغەمبەرانەیە کەپەیامی ئاسمانیان لەئەستۆیەو راسپێراون بیگەیەنن بەزەوی، پەیامی خودایان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی خەڵکی رابگەیەن، ئادەمیزاد بەختەوەر بکەن، مرۆڤایەتی وێڕای جیاوازی نێوان نەتەوەکانی و چینەکانی و سەردەمەکانی و پێرەکانی سەر لەنوێ زیندو بکەنەوەو بیبوژێننەوە.

## فەرز بوونی نوێژ:

لەشەوی میعراج دا نوێژ لەسەر خۆی و ئوممەتەکەی فەرز کرا. لەسەرەتاوە لەشەوو ڕۆژێك دا پەنجا نوێژ فەرزکرا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هێندە پاڕایەوەو داوای سووککردنی ئەو ئەرکە قورسەی کرد هەتا پەروەردگار کردنی بەپێنج نوێژ لەشەوو ڕۆژێك دا، هەرکەسێ بەڕێك و پێکی بەجێیان بگەیەنێ و خالیص بۆ خودا ئەنجامیان بدا خێری پەنجا نوێژی دەگاتێ.

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەیوەندی بەهۆزەکانەوە دەکا و بانگەوازییان دەکا بۆ ئیمانهێنان:

لەدوای ڕوداوی شەو ڕەوی و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمانەکان و بینینی جیهانی مەلەکوتی بالاو گەیشتن بەپلەو پایەی ئاخاوتن لەگەڵ پەروەردگار ڕاستەوخۆو وبەدووری (قاب قوسین) کەهەر خودا چۆنیە تیەی کەی دەزانێ و بەس! ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) درێژەی دا بەبانگەوازی کردن و پەیوەندی کردن بەهۆزو تیرە عەرەبەکان لەوەرزە تایبەتیەکان دا بەتایبەتی لەوەرزی حەجکردن دا، پەیوەندی پێوە دکردن و بانگی دەکردن بۆ موسوڵمانبون، بۆ ئەوەی لە دوژمنان بیپارێزن، بانگی دەکردن دەیفەرموو: ئەی بەرەی فلان! من پێغەمبەری خودام بۆ سەر ئێوە، خودا فەرمانتان پێدەکا کەتەنها بەندایەتی بۆ خودا بکەن و یەکتا پەرست بن کەس مەکەن بەهاوشان و هاوەڵی، واز لەبتپەرستی و هاوەڵدانان بۆ خودا بێنن، ئیمان بەخودا بێنن، پێغەمبەر بەراستگۆ بزانن، پشتگیریم بکەن هەتا بتوانم ئەوەی خودا بەنیگا بۆم دەنێرێ بۆتانی شی بکەمەوە.

جـا هــەموو جـارێ کەپێغەمبــەر لەقـسەکانی دەبــووەوە، ئـەبو لەهــەب هەڵدەسـاو رەددی پێغەمبـەری دەدایـەوەو دەیگـوت: ئـەی بـەرەی فـلأن؟ ئـەم کابرایە بانگتـان دەکـا بـۆ ئـەوەی واز لـە (الـلات) و (العـزی) بێنن، بەندایـەتی ئـەوان لەئەسـتۆی خۆتـان دارنـن، واز لەهاوپەیمانـە جندۆکـە کانتـان بێـنن و بـچنە سـەر ئـەو رێبـازە بیدعـەت و گـومڕایی یـەی کـەلافی پێـوە لێ دەدا، دەخیلتان بم نەگوێی لێ بگرن و نەفەرمانبەر داری بن.

## بەرەو رێبازی ئیسلام:

رێبـاز بـۆ گەیـشتن بـە پێغەمبـەرو تێگەیـشتن لەئیسلام بەچـەند لەمپـەرو بەربەست تەندرابوو بەچقڵ و چاڵ چێنرابوو، زۆر ترس و بیمـی تێـدا رەچـاو دەکرا، رێبوای ئەو رێبازە زرۆ خەتەرو ناخۆشی لـەرێ دا دەبـوو، هەرکەسـێ بیویستایە لەو حەقیقەت و راستی یە شارەزابێ دەبوایە گیـانی خـۆی بخاتـە خەتـەرەوە بەڵگـەی ئەوەئـەو سەرگوروشـتەیە کـە ئیبنـو عـەبباس دەربـارەی هــاتنی ئــەبو زەڕی غــەففاری بــۆ مەککــەو گەیــشتنی بەپێغەمبــەرو موسوڵمانبوونی بۆمانی دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) لـەم بـارەوە دەفەرموێ: کاتێك هەواڵی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەربێ) بەئـەبو زەڕ گەییـشت، بەبراکـەی خـۆی گـوت: بـڕۆ بـۆ ئـەو دۆڵـە (مەبەسـتی دۆڵـی مەککەیـە) بزانـە هـەواڵی ئـەم پیـاوە چیـە کـەپێ ی وایـە پێغەمبـەرەو لەئاسمانـەوە نیگـای بـۆ دێ، بـچۆ هەنـدێ لـە وتـەکانی ئـەوت گـوێ لـێ بێ و دوایی وەرەوە بۆم بگێڕەوە، براکەی ئەبو زەڕ رۆیـشت و گەیشتە پێغەمبـەرو هەندێ لەقسەکانی بیست و دوایـی گەڕایـەوە بـۆ لای ئـەبو زەڕو وتـی: کاکـە! چـۆم ئـەو پیـاوەم بینـی فـەرمان دەکـا بەرەوشـتی بـەرزو کتێبێـك دەخوێنـێ شـیعر نیـە، ئـەبو زەڕ وتـی: مەبەسـتی منـت نەهێنایـەدی دڵـم بەقـسەکانت بەتەواوی ئاوی نەخواردەوە!!!

سـەر لـەنویٚ لەسـەر داوای ئـەبو زەڕ، براکـەی تیـشوی ریٚگـای هـەلگرتو کونده ئاوێکی لەشانی کردو کەوتەوە ڕێ بەرەو مەککە، تا گەیشتە ئەویٚو چـووە مزگـەوت ویـستی پیٚغەمبـەر بـدینیٚو نەیدەناسـی، نەشـی دەویـست لەخـەڵکی تـر پرسـیار بکـا، مایـەوە تاشـەوی بەسـەرهات، عـەلی زانـی ئـەوە غەریبو بیٚ نەوایە بردیەوە ماڵەوە تابەیانی لـەویٚ بـوو کەسیان پرسیاری هیچ شتێکی لـەوی تـر نـەکرد دوای کونـدەو تێشوەکەی هـەڵگرتو چوو بۆ مزگـەوت، ئـەو ڕۆژەش مایـەوە پیٚغەمبـەری نـەبینی ئێـوارەی لیٚ هات،چـوو لەقوژبنێکەوە پاڵی لیٚ دایەوە، عەلی بەلای دا تێپەڕی، وتـی: ئەوە بۆ تـۆ خانـە خویٚ ی خۆت نەناسیو تائێستا شارەزای ماڵی خۆت نەبووی؟ هەڵی ساندو لەگـەڵ خـۆی بـردی، ئیتر ئـەو شـەوەش هیـچیان پرسـیاریان لەیـەکتر نـەکرد، هەتا ڕۆژی سێیەم هات بەهەمان شێوەی ڕۆژی پێشوو عـەلی کـابرای بـردەوە بۆ ماڵەوە دوایـی پـیٚ ی گـوت ئـەوە تـۆ پـێم نـاڵی ی بـۆ چـی هـاتووی؟ وتـی: ئەگـەر پـەیمانم دەدەیتـیٚ بـۆ ئـەو شـوێنەی دەمـەویٚ شـارەزاییم بکـەی ئـەوە رازی دڵـی خۆمـت پـیٚ دەڵـێم عـەلی پـەیمانی دایـەو ئـەویش مەبەسـتی خـۆی درکاند وتـی: وەرە دوام بکەوە عەلی پێشی کەوت تابردیە لای پیٚغەمبـەر (درروودی خوای لەسەربێ) لەویٚ پاش چـەند گفتو گۆیـەك موسـوڵمان بـوو، ئـەمجار پیٚغەمبـەر (درروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی بـڕۆوە بـۆ نـاو قەومەکـەی خـۆت هـەواڵی هـاتنی ئـەم ئایینەیان پیٚ بـدە، هـەتا فـەرمانی منـت پـیٚ دەگـا. کـابرا وتـی: سـوێندم بـەو کەسـەی گیـانی منـی بەدەسـتە موسـوڵمانبوونی خـۆم ناشـارمەوە، ئێـستا دەچم بۆ کەعبەو پڕ بەدەمی خۆم هاوار دەکەم، ڕۆیی بـۆ مزگـەوتو تـاهێزی تێـدا بـوو هـاواری کـرد أشـهد أن لاالـەالاالله وأن محمـد رسـول (الله) پاشـان قوڕەیشیەکان بۆی هەڵسانو دەسـتیان کـرد بەلێدانی هـەتا نیـوە مـردو یـان کـرد، عـەبباس هـات خـۆی بەسـەر داداو وتـی ماڵوێرانینـە ئـەوە نـازانن ئـەم

پیاوە لەبەرەبابی غەففارە، ڕێگەی کاروانی بازرگانیتان بۆ شام بەسەر ناوچەی ئەوان دا تێدەپەڕێ، هەرچۆنێ بوو لەدەستی ئەوانی ڕزگار کرد. بۆ بەیانی کابرا هاتەوە بەهەمان شێوە هاواری کردەوەو قوڕەیشییەکان کەوتنەوە وێزەیو عەبباس هات رزگاری کردەوە.[٨١]

## دەست پێکردنی موسوڵمانبوونی یاریدەدەران (الأنصار):

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەکاتی حەج دا هەوڵو تێکۆشانی خۆی زیاتر چڕو پڕ دەکردەوە، پەیوەندی دەکرد بەو شاندانەی دەهاتن بۆ حەج،جاڵەکاتێك دا تەشریفی لەلای (عەقەبە) بوو توشی کۆمەڵێك لەهۆزی خەزرەج بوو، پەیوەندی پێوە کردنو بانگی کردن بۆ ئیمانهێنان، هەندێ قورئانی بۆ خوێندن. ئەم خەزرەجیانە جیرانی جولەکەکان بوون لەناو شاری مەدینەدا، زۆر جار گوێیان لێ بوو بوو جولەکەکان باسی هاتنی پێغەمبەرێکیان دەکرکە نزیکە ڕەوانە بکرێ، جاکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بانگەوازی شاندەکەی خەزرەجی کرد بۆ ئیمانهێنان، هەندێکیان بە هەندێکیان گوت: وەڵڵاهی هەبێو نەبێ ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کەجولەکەکان هەڕەشەیان پێ لێ دەکردین. دەیانگوت: لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە هات ئێمە نیشانەکانی دەزانین یەکسەر ئیمانی پێ دێنین. ئەمجار دوا وتو وێژو ڕاگۆڕینەوە وتیان: خزمینە بائەو جولەکانە پێشمان نەکەون، ئێمە دەست پێشخەری خۆمان بکەین، ئیتر هەموو شاندەکە ئیمانیان پێ هێناو موسوڵمان بوون، ئەمجار وتیان: بەخودا ئێمە خزمەکانمان (ئەوسو خەزرەج) بەجێ هێشتوە، هیچ کۆمەڵێك نیە بەئەندازەی ئەوان دژایەتیو

---

[٨١] الجامع الصحیح للبخاری باب اسلام ابي ذر الغفاری.

ناکۆکی لەناویانا بێ، ئەگەر بێتو خودالەسەر دەستی تۆ ئەی پێغەمبەری خودا ئاشتیان بکاتەوەو یەکیان بخاتەوە، هیچ کەس لەتۆ بەدەسەلاَت تر نابێ.ئێمە کەچوینەوە ئەم ئایینەیان بۆ رون دەکەینەوەوبانگیان ەکەین بۆ ئیمانهێنان، سا بەڵکوو خودا بکا بەدەنگمانەوە بێن. پەیمانیشیان دا بەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەساڵی داهاتوو بێنەوە لای و پەیوەندی پێوە بکەنەوە، هەتا ئەو وەختەش لەمەدینەدا ئیسلامەتی بلاَو بکەنەوە، ئیتر خودا حافیزییان کردو گەڕانەوە بۆ ولاَتی خۆیان، کەگەیشتنەوە مەدینە ئەم دەنگو باسانەیان بۆ کەس و کاریان باس کردو بانگەوازییان کردن بۆ ئیمانهێنان، زۆربەی زۆری هۆزی ئەوس و خەزرەج مەبدەئیەن ئامادە باشییان تێدا بوو بۆ بەپیرەوە چوونی بانگەوازییەکەی پێغەمبەر. هەتا وای لێ هات هیچ ماڵێ نەما لەناو هۆزی ئەوس و خەزرەج دا ناوی پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەربێ) تێدا نەبرێ..

## پەیمانی یەکەمی عەقەبە:

کەساڵ تێوەر سوڕایەوەو کاتی حەجکردن هاتەوە پێشەوە، دوانزە کەس لەموسوڵمانەکان بەناوی حەجکردنەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەعەقەبەی یەکەم دا چاویان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەوت، پەیمانیان لەگەڵ بەست و بەیعەتیان پێ کرد: کەیەکتا پەرستی بکەن، داوێن پاك بن، دزی و زینا نەکەن، منداڵ زیندە بەچاڵ نەکەن لەکاری چاکە دا فەرمانبەر داربن.

جاکە ویستیان بگەڕێنەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) موصعەبی کوڕی عومەیری لەگەڵ ناردن و فەرمانی پێ کرد کەقورئانیان بۆ بخوێنێ و فێری قورئانیان بکا و ئایینی ئیسلامیان بۆشی بکاتەوە، ئاینیان تێ بگەیەنێ،

لەوە دوا بە (مصعب) یان دەگوت: قورئانخوێنی مەدینە. (مصعب)لەمەدینە میوانی ئەسعەدی کوڕی زرارە بوو، لەماڵی ئەودا نوێژی پێ دەکردن، ئایینی بۆ شی دەکردنەوە،

## هۆی ئامادە باشی یاریدە دەران بۆ ئیمان هێنان:

ویستی پەروەردگار وابوو کەئەوس و خەزرەج ئامادە بکا بۆ بەپیرەوە چوونی بانگەوازی ئیسلامی و پشتگیری کردنی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) هۆزی ئەوس و هۆزی خوزرەج دو هۆزی گەورەی عەرەب بوون لەمەدینەدا نیشتەجێ بوون، ئامادە باشی تێدا خولقاندن، بۆ ئەوەی ئەو سەر وەرییەیان دەست بکەوێ، کەهیچ سەروەرییەکی ناگاتێ، ئەو نیعمەتە گەورەیان بەنسیب بێ کەنیعمەت لەو گەورەترنیە. خودا ڕێزی ئەوەی پێدان کەپێشەنگی ئادەمیزادانی سەردەمی خۆیان بن، لەناو دانیشتوانی جەزیرەدا دەست پێشخەر بوون بۆ موسوڵمانبون و پێشوازی کردن لەئیسلام، لەکاتێك دا هۆزە عەرەبەکانی تر لەسەرو هەمووشیانەوە هۆزی قورەیش بانگەوازییەکەیان ڕەتکردەوە، دژایەتی پێغەمبەریان دەکردو بەدرۆیان دەخستەوە، ﴿وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ پەروەردگار هیدایەتی کەسانێك دەدا کەبیەوێ هیدایەتیان بدا بۆ ڕێبازی ڕاست.

زۆر هۆکار هەبوون کەخودارەخساندبوونی بۆ ئەو ئامادە باشی و پێشوازی کردنەی یاریدە دەران لەئایینی ئیسلام، ئەو هۆکارە ڕەخساوانە هێڵی جیاکەرەوە بوون لەنێوان قورەیش و دانیشتوانی مەککەو نێوان هۆزەعەرەبە کانی یەثریب بەتایبەتی هۆزی ئەوس و خەزرەج، لەو هۆکارانە دڵنەرمی و میانەڕەوی و ملکە چکردن بۆ حەق و ڕاستی، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو دیاردە نژادی و ڕەچەڵەکیەی کەلە یە مەنیەکانەوە بۆیان مابوەوە،

چونکە باپیرانی هۆزی ئەوس و خەزرەج لەڕۆژگارێکی دێرین دا لەیەمەنەوە هاتوونە ولاتی یەثریب و دەوروبەری، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەفەرموودەیەکی دا لەکاتی هاتنی شاندێکی یەمەنی بۆ لای ئاماژە بۆ ئەو رەوشتە جوانانەی یەمەنیەکان دەکاو دەفەرموێ: (أتاكم أهل اليمن أرق افئدة ألين قلوبا) ئەهلی یەمەن هاتن بۆ لاتان ئەوان لەخەڵکانی تر هەست ناسکترو دڵنەرم ترن.

قورئانی پیرۆز یش لەمەدحی یاریدە دەران دا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ. سورة الحشر (٩)﴾. ئەوانەی لەمەدینەدا نیشتەجێ بوون و بیرو باوەڕی ئیسلامی لەدڵیان دا جێگیر بووە پێش کۆچکردنی کۆچکاران بۆ لایان کەئەنصارەکانن، ئەوان کۆچکەرەکانیان خۆش دەوێن، بەماڵ و سامان هاوکارییان دەکەن، دڵیان دەدەنەوە، لەدڵ و دەروونیان دا هیچ قین و کینەیەك نیە دەربارەی ئەوەی کەپێغەمبەر لەماڵی غەنیمەت و فەیئ بەشی بۆ کۆچکەرەکان داناو بۆ ئەوانی دانەنا.

بەڵکوو بەدڵ پێیان خۆش بوو، ئەوان لەبەش و باری دونیایی دا هەرچەند پێویستیشیان بێ، برا کۆچکەرەکانیان پێش خۆیان دەخەن یەکێکی تر لەو هۆکارانەی وایکرد ئەوس و خەزرەج دەست پێشخەربن بۆ موسوڵمانبون، هەبوونی ناکۆکی و بەرپابوونی شەڕی ناوخۆیی و برا کوژی لەنێوانیان کە بەتەواوی برستی لێ بڕی بون و ماندوی کردبون، تاڵی و سوێری پێ چەشت بون و تەواو بێ زار بو بوون، هێشتا شوێنەواری شەڕی



بەعاث مابوو روداوەکانی ئەو ڕۆژە شومەیان لەبیر نەچووبوونەوە.[٨٢] بۆیە لەناخەوە ئاواتە خوازی ئەوە بوون هەلێك بڕەخسێ هەموویان یەك بگرن‌و شوێنەواری شەڕی ناو خۆنەمێنێ‌و لەژێر خێمەی یاساو ئاینێك دا ببنە یەك هێزو یەك هەڵوێستیان هەبێ، وەکوو لەیەکەم دیداری شاندەکەیان لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە مەوسیمی حەجدا ئاماژەیان پێکردو وتیان (بەخودا ئێمە لەمەدینەدا خزمەکانی خۆمان بەجێ هێشتوە هیچ کۆمەڵێك نیە بەئەندازەی ئەوان ناکۆکی‌و دژایەتی لەناو یانەبێ..) هۆکارێکی تر ئەوەبوو قورەیش‌و عەرەبەکانی تر زۆر لە سەردەم‌و ڕۆژگاری پێغەمبەرایەتی دوور کەوتبوونەوە، لەبەر دێر زەمانی مانای پێغەمبەرایەتی‌و پێغەمبەریتییان نەدەزانی، هەروا بەهۆی نەخوێندەواری‌و روچون لەبتەپەرستی داو دووری لەو گەل‌و نەتەوانەی پێغەمبەریان تێدا رەوانەکراون‌و کتێبی ئاسمانییان لا هەیە، هەرچەندە کتێبەکان گۆڕانکارییان تێدا کرابێ. بۆیە قورئان دەربارەی قورەیشییەکان دەفەرموێ: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ. سورة یس (٦)﴾ بەلام ئەوس‌و خەزرەج جیرانی جولەکەکان بوون، هەموو کاتێ باسی پێغەمبەرایەتی‌و

---

٨٢ ڕۆژی بوعاث دوا شەڕو بەناو بانگترین جەنگی نێوان ئەوس‌و خەزرەجە. بوعاث شوێنێکە لەدەوری شاری مەدینە، ئەم شەڕە بەویست‌و پلان بۆ دانانی جولەکەکانی مەدینە بوو، لەگەڵ ئەوس‌و خەزرەجدا چەند هۆزو تیرەیەکی تری عەرەب‌و جولەکە لەو شەڕەوە گلان، چل ڕۆژ پێش هەڵگیرسانی خۆیان بۆ حازر کرد، ئەمجار لەبوعاث دا کەوتنە ویزەی یەکتری، شەڕێکی خوێناوییان ئەنجام دا، هەردو لایان ئازاو خۆگربون، لەبەیانی‌و سەرەتای شەڕەکەدا ئەوس تێشکان، بەلام دەمەو ئێوارە بەسەر خەزرەجیە کان دا زاڵبون‌و کوشتارێکی باشیان لێ کردن، هەرچی ماڵ‌و خانووی خەزرەجیەکان بوو بەدەستی ئەوسییەکان سوتا. ئەم شەڕە خوێناوی یە پێنج ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر بووە بۆ مەدینە- فەتحولباری ج ٨٥/٧.

پێغەمبەرانیان لەوان دەبیست، نامەی تەوراتیان دەخوێندەوەو راڤەیان دەکرد، بەڵکوو زۆر جار جولەکەکان هەڕەشەی ئەوەیان لەئەوس و خەزرەج دەکردو دەیانگوت: پەروەردگار لەئاخرزەمان دا پێغەمبەرێك دەنێرێ ئێمە نیشانەکانی دەزانین لەگەڵ رەوانە کرا خێرا ئێمە ئیمانی پێ دەهێنین و لەگەڵی دەکەوین، ئەمجار شەڕتان لەگەڵ دەکەین، وەکوو گەلی عادو ئیرەم دەتان بڕینینەوە.

بۆیە قورئان دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ. سورة البقرة (٨٩)﴾.

کاتێ ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوە هات و قورئانیان لەلایەن خوداوە بۆ هات کە تەصدیقی کتێبەکەی ئەوانیشی دەکرد، لەحاڵێك دا ئەوان لەپێش هاتنی پێغەمبەرو قورئان، هەمیشە داوای سەرکەوتن و زاڵبونیان دەکرد بەسەر کافرەکان داو دەیانگوت خودایە سەرمان بخە بە ناردنی ئەو پێغەمبەرەی کەباش دەیناسین و نیشانەی کانی دەزانین کە (محمد)ە کەچی کەموحەممەد رەوانەکرا بۆ سەریان و بانگەوازی کردن بۆ موسوڵمانبوون بڕوایان پێ نەکرد، لەبەر ملهوڕی حەسوودی و تەماعی سەرۆکایەتی، بەڵێنەکانی پێشوویان لەبیر خۆیان بردەوە، سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو ئیمانیان بەپێغەمبەری ئیسلام و پەیامەکەی نەهێنا، نەفرینی خودا لەسەر بێ بڕوایان بێ.

کەوابوو باس و خواسی پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران و پەیامی ئاسمانی لەلایەن دانیشتوانی مەدینەوە جار جارە دەبیستراو شتێکی نامۆ نەبوو، ئەو کەللەرەقی و نەفامی و نەزانی و ئاشنا نەبوون بەمە فاهیمی ئایینی و داب و نەرێتی پەروەردگار کەلەلای دانیشتوانی مەککە بەزەقی دەبینرا، لەناو

هـۆزی ئـەوس‌و خـەزرەج‌و دانیـشتوانی تـری عـەرەبی مەدینـەدا نـەبوو، مەدینـەیی یـەکان تائەندازەیـەکی زۆر بـەهۆی جولەکەکانـەوە بـە بـاس‌و خواسـی پێغەمبـەران‌و پـەیامی ئاسمـانی‌و مەفهوومـە ئایینی یـەکان ئاشـنا بـوون، چـونکە ئـەوان بـەهۆی هـاو شارنـشینی‌و تێکەڵاوی‌وشـەڕو ئاشـتی‌و هاوپـەیمانی لەگـەڵ جولەکـەکان زۆر جـار باسـی هـاتنی پێغەمبـەری ئـاخر زەمانیان بیستبوو، جاکە پێغەمبەر پەیوەندی پێوە کردن‌و بانگی کردن بۆ موسـوڵمانبوون، پـەردە لەسـەر چـاویان لابـراو دەتگـوت ئـەوان لەگـەڵ ئـەم پەیامەدا پێش وەخت وادەیان داناوەو وادەکە هاتۆتـە جـێ. بۆیە ئاوا بەپیر بانگەوازی یەکەی پێغەمبەرەوە چون!!!

## ❧ تایبەتمەندییەکانی شاری یەثریب:

حیکمەت‌و ویستی خودا وابوو: کە شاری یەثریب بکاتە شوێنی کۆچ بۆ کردنـی پێغەمبــەرو موسـوڵمانان‌و مەڵبەنـدی بـڵاو کردنـەوەی بانگـەوازی ئیسلامی، جگـە لـەوەی خـودا ویـستی ڕێـزی دانیـشتوانەکەی بگـرێ‌و چـەند نهێنـی یـەکی تریـشی تێدایـە کەهــەر خـودا دەیانزانـێ، وێـڕای ئەوشـتانە هەموو، شاری مەدینە تایبەتمەندی ئەوەی هەیە بە سروشت وەکوو نیمچە قەڵایەك وایەو بۆ بەر گری کردنی دوژمن دەوران دەوری شارەکە. جگە لەلای باکوری- هەمووی شاخ‌و چەقەن‌و دڕو کەژە. هیچ شارێکی تـری نزیك لـەو دەڤـەرە ئـەو تایبەتمەندییـەی تێـدا نیـە، ئـەوەتا لـەلای خۆرئاوایـەوە (حـرە الـوبرە) شاخ‌و چەقەن‌و خڕو بەردەڵانی وەبڕە گرتویـەتی لـەخۆر هەڵاتیـەوە (حـرە واقـم) شـاخ‌و چـەقەن‌و خـڕو بـەردەڵانی واقـیم بووەتـە سـەنگەرو شورایەکی پتـەو. تـەنها ناوچـەی شیمالی نـەبێ کـەتا ئەندازەیـەك پێدەشت‌و بەئاسـانی ڕێـڕەوی پێـدا دەکـرێ، هـەر ئـەم لایەشـی بـوو کەسـاڵی پێنجـەمی



کۆچی لەکاتی غەزای ئەحزاب دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە هەڵکەندنی خەندەق قایمی کرد، بەڵام لایەکانی تری دەورە دراوە بەباخە دارخورما و شیناوەر دو درەخت باخی کشت و کاڵی چڕو پڕ کەسوپا ناتوانێ پێ یدا گوزەر بکا مەگەر بەرێچکەو باریکەرێی ناو ئەو باخانەدا کەبۆ یاسای سوپایی و ڕێکخستنی ریزەکانی دەست نادا. خەفەرو چاودێریەکی سوپایی بەس بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی پلانی هێرشی دوژمن و بەربینگ پێ گرتن و مەنع کردنی لەپێشڕەوی! ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: لایەکی مەدینە (عورە) بوو بەخۆشی پێشڕەوی لێ دەکرا باقی لایەنەکانی تری شار بەدار خورما و دیوار تەنرابوو بە ئاسانی دوژمن نەیدەتوانی هێرشی لێوە بێنێ و پێشڕەوی بکا.

وێدەچێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئاماژەی بەو حیکمەتە خودایی یە کردبێ دەربارەی هەڵبژاردنی شاری مەدینە بۆ کۆچ بۆ کردنی موسوڵمانان بۆی، کە پێش کۆچ بەهاوەڵانی فەرموو:(إني رأيتُ دار هجرتكم ذات نخل بين لابتين وهما الحرتان )[83] من ئەو شارەی ئێوە کۆچی بۆ دەکەن دیتومە بەباخە خورما دەورە دراوەو کەوتۆتە نێوان دوو شاخ و چەقەنەوە. جاوردە وردە هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

دانیشتوانی مەدینە لەئەوس و خەزرەج خاوەنی رەوشتی مرۆڤایەتی و مەردایەتی و سوار چاکی و ورە بەرزی و خۆڕاگری بوون، خویان بەئازادی یەوە گرتبوو، ملکەچی کەس نەبو بوون، سەرانەو مەڕانەو زەریبەیان نەدابوو بەهیچ هۆزو حکوومەت. ئەمە بەئاشکرا لەوتەکانی سەعدی کوڕی مەعاذ (سەرۆکی ئەوس کە بە پێغەمبەری گوتن) دەردەکەوێ کەدەڵێ: ئێمەو ئەو هۆزو تیرانە بتپەرست بوین و هاوەڵمان بۆ خودا دادەنا، خودا مان

---

- صحيح البخاري باب هجره النبي ص.

نەدەناسی و بەندایەتیمان بۆ نەدەکرد، ئەو هۆزو تیرانە تەماعی ئەوەیان تێ نەکردوین دەنکە خورمایەکمان بخۆن مەگەر لەرێی میوانداری یان کڕینەوە نەبێ.[٨٤]

ئیبنو خەلدون دەڵێ بەردەوام هەر لەکۆنەوە ئەم دوو هۆزە باڵا دەست بوون بەسەر جولەکەکانی یەثریب دا، بەپیاوەتی و مەردایەتی ناسرابوون، هەرکەسێ جیرانی ئەوان بووبێ لەهۆزەکانی موضەر پاڵی داوە بەوانەوە،[٨٥] لەکتێبی (العقد الفرید)دا دەڵێ: یاریدە دەران بەرەچەڵەك دەچنەوە سەر هۆزی (الأزد) کەواتە ئەوس و خەزرەج دەچنەوە سەر حاریثەی کوڕی عەمری کوڕی عامیر، ئەوان لەهەموو کەس زیاتر نەفس بەرزو ورە بەرزن، بەهیمەت و چاو نەترسن، هەرگیزسەرانەو مەرانەیان نەداوە بەهیچ پاشاو مەلیکێك.[٨٦] لەسەرێکی ترەوە بەرەبابی (عدي)کوڕی النجار خاڵوانی پێغەمبەر بوون دایکی عبدالمطلبي کوڕی هاشم لەم بنەماڵەیە بووە، مێژوو دەڵێ: هاشم سەلمای کچی عەمر کەپیاوێکی بنەماڵەی (عدي) کوڕی النجار بوو مارە کرد، هاشم لەم ئافرەتە (عبد المطلب)ی بوو، ئیتر هاشم ئەم لەلای خێزانەکەی جێ هێشت تاپێگەیی، ئیتر (عبد المطلب)ی مامی چوو هێنایەوە بۆ مەککە، لەناو عەرەبەکان دا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە خاڵ و خوارزایی حیسابێکی تایبەتی بۆ دەکرێ، ئەبو ئەیبوبی ئەلئەنصاری کەپێغەمبەر گەیشتە مەدینە لەماڵی ئەودا میوان بوو، یەکێکە لە بنەماڵەی

---

٨٤ سیره ابن هشام جـ ٢٢٣/١.

٨٥ تأریخ ابن خلدون جـ ٢٨٩/٢.

٨٦ العقد الفرید جـ ٣٣٤/٣.

(عدي) هۆزی ئەوس‌و هۆزی خەزرەج لەقەحطانییەکانن، کۆچکاران ئەوانەی لەوە پێش لەمەککەو دەوری بەری دا موسوڵمان بو بوون لەعەدنانیەکانن. جاکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو ئەنصارەکان پشتیوانییان لێ کرد، ئیتر لەم روەوە قەحطانییەکان‌و عەدنانییەکان بەیەکەوە چونە ژێر ئالاّی ئیسلام، بوونە یەك جەستەو نموونەی تەبایی‌و هاریکاری‌و یەك هەڵوێستی بوون.

لەپێش هاتنی ئیسلام دا کێ بڕ کێ‌ی هۆزایەتی‌و دەمارگیری دیاردەیەکی دیارو باو بوو لەناویان دا، بەلاّم لەژێر سایەی ئیسلام دا شەیتان نەیتوانی ئەم حیقدو کینەو دەمارگیری یە لەناو دڵیان دا بچێنێ. لەشوێنی دەمارگیری قەحطانی‌و عەدنانی ئیسلام شوناسنامەیان بوو، لەبەر ئەم هۆکارانە هەموو، شاری یەثریب گونجاوترین شوێن بوو کە پێغەمبەرو هاوەڵانی کۆچی بۆ بکەن‌و بیکەنە مەڵبەندو پایتەختی بانگەوازی ئیسلامی، بۆ ئەوەی ئەم ئایینە گەشە بکاو بەهێز ببێ‌و بلاّو بێتەوەو بەرەو پێش بچێ‌و هەموو جەزیرە کۆنترۆڵ بکاو ئەمجار بەهەموو لایەکی جیهان دا پەل بهاوێ. هەموو جیهانی شارەستانی ئەو ڕۆژگارە بگرێتەوە.

## ❧ بلاّو بوونەوەی ئیسلام لەناو شاری مەدینەدا:

بەشێوەیەکی لەسەرە خۆیی‌و سروشتی ئایینی ئیسلام بەناو خێزان‌و ماڵەکانی ئەوس‌و خەزرەج دا بلاّو بۆوە، سەعدی کوڕی مەعاذو ئوسەیدی کوڕی حوضەیر: موسوڵمان بوون هەردوکیان سەرەك هۆزو ریش سپی نەتەوەکەیان بوون لەبەرەبابی (عبد الأشهل) بوون لەهۆزی ئەوس.

بەحیکمەتو لێزانی ئەوانەی لەوە پێش موسوڵمان بو بوون ئەمانیش خودا هیدایەتی دان، هەڵبەتە هەوڵو تەقەڵلای موصعەبی کوڕی عومەید لەگەڵیان ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو، هەر زوو سەرجەم بەرەبابی (عبد الأشهل) موسوڵمان بوون، هیچ ماڵێکی ئەوس و خەزرەج نەمابووەوە کەپیاو و ئافرەتی موسوڵمانی تێدا نەبێ.

## پەیمانی عەقەبەی دووەم:

لەساڵی داهاتوودا موصعەبی کوڕی عومەید گەڕایەوە بۆ مەککە ژمارەیەك لەموسوڵمانە یاریدە دەرەکان لەگەڵ حاجییەکانی تری ئەوس و خەزرەج هاتن بۆ حەج، گەییشتنە مەککەو وادەیان بەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دا پاش حەج لەعەقەبە بەیەکتر ببینن، جاکە لەحەجکردن بوونەوەو شەو داهاتو سێیەکێکی ڕۆیی، لەشیوێکی لای عەقەبەدا لەگەڵ پێغەمبەر کۆبوونەوە، یاریدە دەرەکان حەفتاو دوو پیاوو دوو ئافرت بوون، پێغەمبەریش عەبباسی مامی لەگەڵ دا بوو هێشتا موسوڵمان نەبوو بوو....

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) قسەی بۆ کردن، قورئانی بۆ خوێندن، بانگەوازی کردن بۆ پابەند بوون بەئایینی خوداوەو هەوڵدان بۆ بلاو بوونەوەیو هەڵی نان بۆ خزمەتکردنی ئیسلام، پاشان فەرمووی من پەیمانتان لەگەڵ دەبەستم لەسەر ئەوەی چۆن بەرگری لەخۆتانو ماڵو خێزانی خۆتان دەکەن ئاوا بەرگری لەمن بکەن، ئەوانیش بەڵێنیان پێداو پەیمانیان لێ وەرگرت کە تەشریفی هاتە مەدینە ئیتر بەجێیان نەهێڵێو نەگەڕێتەوە بۆ ناو قەومەکەی خۆی. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) لەلای خۆیەوە پەیمانی ئەوەی پێدان، فەرمووی: من لەئێوەمو ئێوە لەمنن، شەڕ لەگەڵ هەرکەسێك دەکەم ئێوە

شەڕی لەگەڵ بکەن، ئاشتی دەکەم لەگەڵ هەرکەسێك ئێوە لەگەڵی ئاشت بن، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دوانزە پیاو ماقوڵی لێ هەڵبژاردن نۆ کەس لەخەزرەجییەکان و سێ کەس لەئەوس.

## رێپێدانی کۆچکردن بۆ مەدینە:

پاش ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پەیمانی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە یاریدەدەرانە بەست و پەیمانی یارمەتیدانی لێ وەرگرتن کەپارێزگاری لەخۆی و هاوەڵانی بکەن وەکوو چۆن ماڵ و منداڵی خۆیان دەپارێزن، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانی بەهاوەڵانی کرد کەلە مەککەوە کۆچ بکەن بۆ مەدینە، پەیوەندی بکەن بەبرا موسوڵمانە یاریدەدەرەکانیان، پێی فەرموون: (ان الله عز وجل قد جعل لكم اخوانا ودارا تأمنون بها) پەروەردگار چەند برایەکی موسوڵمانی بۆ رەخساندون یارمەتیدەرتانن شوێنی حەوانەوەشی بۆ داناون تێیدا ئارام دەگرن، ئیتر موسوڵمانان پۆل پۆل تاق و جوت مەککەیان جێ هێشت و کۆچیان کرد بۆ مەدینە. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی لەمەککە مایەوە چاوەڕێی ئەوە بوو خودا رێی پێ بدا ئەویش لەمەککەوە کۆچ بکا بۆ مەدینە.

هەڵبەتە کۆچکردنی موسوڵمانان لەمەککەوە بۆ مەدینە ئاسان نەبوو، ئەگەر قورەیشییەکان بیانزانیایە یەکێك لە موسوڵمانەکان کۆچ دەکا جۆرەها ئاستەنگ و رێ گرییان لێ دەکرد، بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا نەهێڵن دەرباز بن، دەیانگرتن، ژنیان لێ دەستاندن، ماڵیان داگیر دەکردن، بەڵام بەهیچ شتێك موسوڵمانەکان وازیان لە هەڵوێستی خۆیان نەدەهێنا و لەمەککەدا نەدەمانەوە چەندێك توشی نارەحەتی و تەنگ و چەڵەمە بوونایە، ئازارو ئەشکنجەیان بچەشتایە گوێیان پێ نەدەدا، بەهەر نرخێك بوایە

دەیانویست مەککە جێ بێڵن‌و خۆ بگەیەننە مەدینە، هەیانبوو ناچار دەبوو واز لەژن‌و کوڕو کچی بێنێ‌و سەری خۆی دەربکا. وەکوو ئەومالەی تووشی ئەبو سەلەمە بوو هەیان بوو وازی لە هەموو موڵك‌وماڵی خۆی هێنا، هەرچی هەیبوو کافرەکان لێیان ستاندو خۆی بەدەستی بەتاڵ روی کردە مەدینە وەکوو سوهەیب کردی.

ئوموسەلەمە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ کاتێك ئەبوسەلەمە (رەزای خوای لێ بێ) کاتێك بڕیاری دا کۆچ بکا لەمەککەوە بۆ مەدینە وشترەکەی خۆی ئامادە کرد، ئەمجار منی خستە سەر وشترەکەی‌و سەلەمەی کوڕمی خستە باوەشمەوە ئەمجار رێشمەی حوشترەکەی گرت‌و کەوتینە ڕێ کاتێك هەندێ پیاوی بنەماڵەی (المغیرة) ئێمەیان بینی لێمان ڕاپەڕین‌و وتیان: ئەبو سەلەمە تۆ بۆ خۆت دەڕۆی کەیفی خۆتە، بەلأم ئەم ئافرەتە خزمی ئێمەیە‌و هەرگیز ناهێڵین بیبەی، ئوموسەلەمە دەڵێ: ئیتر هەوساری حوشترەکەیان لە ئەبوسەلەمەی مێردم ستاندو منیان گێڕایەوە کوڕەکەشم لەباوەشم دابوو.

دەڵێ: لەو کاتەدا تاقمی (بنو عبد الأسد)کەخزمی ئەبوسەلەمە رقیان هەڵساو وتیان: سابە خوا ئێمەیش ناهێڵین کوڕەکەمان لای ئوموسەلەمەبێ، ئیتر ئەوان پەلی سەلەمەیان گرت‌و بۆ لای خۆیان کێشیان کرد، بنەماڵەی (المغیرة)ش بۆ لای خۆیان پەلیان راکێشاو بوو بەکێشمە کێشم‌و لەوناوەدا کوڕەکەم (سەلەمە) دەستی لەجێ چوو، سەرەنجام بنەماڵەی (بنو عبد الأسد) کوڕەکەمیان بردو لای خۆیان گلیان دایەوە، ئەبو سەلەمەی مێردم بە تەنیا خۆی کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەو جۆرە خێزانی ئێمەیان لێك کرد. ئەبو سەلەمە چوو بۆ مەدینە‌و من چوومەوە ماڵە باوانی خۆم‌و سەلەمەی کوڕیشمیان کەوتە لای خزمەکانی باوکی. ئیتر کەوتمە حاڵەتێکی ناخۆش‌و نائاسایی یەوە، هەموو ڕۆژێ بەیانی دەردەچووم بۆ دەرەوەی مەککە لەسەر

چەوو لم بەلأنی شیوی خوار مەککە هەتا ئێوارە دەمامەوە دەگریام ماوەی سالێك یا کەمتر بەو حالە مامەوە: هەتا ڕۆژێك پیاوێکی بەنو موغەیرەیی لەخزمەکانم بەلاما تێپەڕی، حالو وەزعی منی بینی، بەزەیی پێم دا هاتەوە، چوو بە بەنوموغەیرەیی یەکانی وت: خودا بتانگرێ ئەوە بۆ ناهێلن ئەم ئافرەتە چارە ڕەشە بڕوا بۆ لای مێردی خۆی کوڕەکەشی بەرێ.؟!

لەپای چی لەمێردو تاقە کوڕەکەیتان دوور خستۆتەوە؟ لێکتان کردون؟! قسەی کابرا کاری تێ کردن، وتیان دەئەگەر حەزدەکەی بڕۆ بۆلای مێردەکەت ئێمە ڕێگریت لێ ناکەین. بنەمالەی بەنولئەسەدیش کەوایان زانی کوڕەکەیان بۆ هێنامەوە، منیش ئیتر بڕیاری کۆچکردنم دا، حوشترێکم ئامادەکردو سوار بووم‌و کوڕەکەم گرتە باوەشم لەمەککە دەرچووم بەرەو مەدینە بۆ لای ئەبوسەلەمەی مێردم، لەخودا زیاتر کەسم لەگەل نەبوو، هاتم هەتا گەیشتمە (التنعیم) لەوێ عوسمانی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبو طەلحە برای بەنو (عبد الدار)م توشبوو وتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی ئەی کچی ئەبوئومەییە؟ وتم: وەلـلا دەچم بۆ لای مێردەکەم لەمەدینە، وتی: ئەوە بۆ کەست لەگەل نیە؟؟ وتم جگە لەخوداو ئەم کوڕە بچکۆلەیەم کەسم لە گەل نیە، وتی: کچێ مالوێران ئەوە چۆن دەبێ تۆ ئاوا بەبێ کەس کەوتویە ئەم چۆلەوانی یەی؟ ئیتر هەوساری حوشترەکەمی گرت‌و کەوتە پێشم‌و کەوتینە ڕێ، سوێندم بە خودا تائێستا هاوڕێیەتی پیاوی وابەڕێزم نەکردوە لەناو عەرەب دا، هاتین هەتا گەییشتینە قۆناخ‌و وشترەکەی بۆ یخ دام‌و لێم دور کەوتەوە ئەمجار دابەزیم‌و هات حوشترەکەی برد بارو بارگەنەی لێ کردەوە لەژێر درەختێك دا بەستیەوە بۆ ئەوەی ئەویش بلەوەڕێ‌و ماندوی بحەسێتەوە، ئەمجار بۆ خۆشی چووە بن درەختێك‌و ڕاکشا، کە کاتی وەڕێکەوتن هات، هەلسا چوو حوشترەکەی ئامادە کردەوەو هێنای سواری

بوم‌و هەوساری گرت‌و پێشم کەوت هاتین تاگەییشتینە قۆناخ، بەو جۆرە لەگەڵم هات تاگەیاندمیە مەدینە، جاکە سەیری کوچەو گەڕەکی بنەماڵەی عەمری کوڕی عەوفی کرد لە(قوباء) وتی: ئەبو سەلەمەی مێردت لەو گەڕەکە دانیشتەجێ یە، فەرمووی بچۆ بۆ لای ئیتر منت پێویست نیە، ئەمجار گەڕایەوە بۆ مەککە، جالەوەدوا ئومموسەلەمە دەیگوت: بەخودا بڕوا ناکەم ئەوەی لەپێناو ئیسلام دا توشی بنەماڵەی ئەبوسەلەمە بوو توشی هیچ کەسی تر هاتبێ ئای چمان دی‌و چمان بەسەرهات؟ بەخودا هاوڕێشم نەدیوە هێندەی عوسمانی کوڕی طەلحە بەڕێزو بەناموس بێ[٨٧] کاتێکیش صوهەیب ویستی کۆچ بکا بۆ مەدینە، کافرەکانی قورەیش پێیان وت: ئەتۆ هاتیە ناو ئێمە روت‌و رەجاڵ بوی کەس نەیدەناسی، ئەتۆ هاتیە ناو ئێمە روت‌و رەجاڵ بوی کەس نەیدەناسی، لەناو ئێمەدا دەوڵەمەند بووی‌و گەییشتویە ئەم گوزەرانە خۆشە، ئێستا دەتەوێ خۆت‌و ماڵ‌و سامانەکەت دەرکەی بۆ مەدینە بڕۆی؟ بەخودا ناهێڵین پێت کلابکەی یان هەموو ماڵ‌و سامانەکەت لێ‌دەستێنین بۆ خۆت بەسەڵتی بڕۆ صوهەیب وتی: ئەگەر هەموو ماڵ‌و سامانەکەمتان بدەمێ ڕێگەم دەدەن بڕۆم؟ وتیان بەڵێ، وتی: دەوا من دەستبەرداری هەموو ماڵ‌و سامانەکەم بوم هەمووی بۆ ئێوە، ئیتر بەرەوە مەدینە کەوتە ڕێ. ئەم بەرسەر هاتە بەپێغەمبەر گەیشتەوە، فەرمووی: صوهەیب قازانجی کردوە.[٨٨]

---

[٨٧] ئەم عوسمانی کوڕی طەلحەیە لەدوای پەیمانی (الديبيه) موسوڵمان بوو کۆچی کرد بۆ مەدینە، ڕۆژی رزگار کردنی مەککە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کلیلەکانی کەعبەی بەو سپاردن، ابن كثير ج ٢/٢١٥-٢١٧.

[٨٨] ئیبنو کەثیر لەسیرەی ئیبنو هیشامی وەرگرتووە ج ٢/ ٢٢٣.

ئیتر ئەمجار عومەری کوڕی خەتتاب، طەلحە، حەمزە، زەیدی کوڕی حاریثە، عەبدو رەحمانی کوڕی عەون، زوبێری کوڕی عەوام، ئەبو حوزەیفە، عوثمانی کوڕی عەففانو هی تریش (خودا لەھەموویان رازی بێ) کۆچیان کرد، ئەمجار موسوڵمانەکان یەك بەدوا یەك دا کۆچیان کرد، جگە لەوانەی ڕێگەیان لێ گیرا، یان بەند کران کەسیان لەمەککەدا نەمایەوە جگە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبو ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە ئەم دوانە مانەوە[89].

## دوا پیلانی قورەیش دژی پێغەمبەر سەرنەکەوتنیان لە پیلانەکەیان دا:

کەقورەیشییەکان زانییان ئەوا پێغەمبەر لەمەدینە دا هاوەڵو یارمەتیدەری بۆ پەیدا بوون، دەسەڵاتیشیان بەسەر مەدینەدا ناشکێ، زۆر لەوە ترسان پێغەمبەر کۆچ بکا بۆ مەدینە، بۆیان دەرکەوت ئەگەر بێتو ئەوە روبدا ئیتر بەتەواوی دەستیان لەبن هەمبانەکەوە دەردەچێ، بۆیە بڕیاریان دا کۆببنەوەو لەم بارەوە وتو وێژ بکەن، لە (دار الندوة) کەماڵی قوصەی کوڕی کیلاب بوو کۆبوونەوە، قوڕەیشیش عادەتیان وابوو بۆ هەموو کارێکی گرنگ لە (دار الندوة) دا کۆ دەبوونەوە، پیاو ماقوڵانی قورەیش لەو ماڵەدا کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بزانن دەربارەی پێغەمبەر چی بکەن و چی نەکەن.

دوای راوێژو لێکۆڵینەوە، هاتنە سەر ئەوە لەهەر بنەماڵەو هۆزێك، کوڕێکی گەنجی ئازاو چاو نەترس دیاری بکەن ئەم گەنجانە لەشەوێك دا هێرش بکەنە سەر پێغەمبەرو لەناوی بەرن، خوێنەکەشی دەکەوێتە سەر

---

[89] سیره ابن هشام ج٤٧٠/١-٤٧٩.

هەموو هۆزەکانو بکوژێکی دیاریکراوی نابێ، ئەو کاتە بنەماڵەی (عبد مناف) ناتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو قورەیشییەکان بکەن، ئەمەیان بڕیار داو لەسەر ئەم رایە بلاوەیان لێ کرد پەروەردگار چۆنیەتی ئەم پیلانەی بەپێغەمبەر گەیاند، ئەویش ئەوشەوە فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەبوتالیب کرد کەلە جێگای ئەو بخەوێو بوردەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەخۆی دا بدا، بەعەلیشی فەموو دڵنیابە هیچی ناخۆش نایەتە ڕێگات..

گەنجە دیاریکراوەکان بەردەرگای ماڵی پێغەمبەریان ئابلۆقە داو ئامادەبوون پەلاماری بدەن، لەو کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هاتە دەرەوەو مستێ خۆڵی بەسەردا بلاوکردنەوە، خودا چاوی کوێر کردنو کەسیان نەیبینی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ خۆڵ بەسەردا بلاو کردنەکەدا، لە سەرەتاوە سورەتی (یس)ی بەسەردا خوێندن تاگەییشتە ﴿فأغشيناهم فهم لايبصرون﴾.

یەکێك هات پرسیاری لەگەنجەکان کرد وتی: ئەوە بۆ چی لێرە گردبوونەوە؟ چاوەڕێی چی دەکەن، وتیان چاوەروانی (موحەممەد) دەکەین. وتی: خودا رەنج بەخەسارتان بکا، ئەوە ئێوە دەڵێن چی بەخودا من موحەممەدم بینی ئەوانیش لەکونی دەرگاکەوە دەیانڕوانی وایەکێك لەجێگاکەدا نووستووە هەتا بەیانی چاوەڕێ بون کەبەیانی هەڵسا هاتە دەرەوە ڕۆیی، تەماشایان کرد ئەوە عەلی کوڕی ئەبوتالیبە لەجێگاکەی پێغەمبەردا نووستووە، ئیتر خەجاڵەت بوونو بەشەرمەزاری بلاوەیان لێ کرد.[٩٠]

---

[٩٠] سيره ابن هشام جـ ١/ ٤٨٠-٤٨٣.

## کۆچکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ مەدینە:

پاش ئەوەی پەروەردگار رێی بە پێغەمبەری خۆی دا کۆچ بکا بۆ مەدینە، تەشریفی هاتە لای ئەبوبەکر پێی فەرموو: پەروەردگار ئیزنی داوم کۆچ بکەم بۆ مەدینە، ئەبو بەکر (رەزای خوای لێ بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من لەم سەفەرەدا لەخزمەتت دا دەبم؟ فەرمووی: بەڵێ تۆ هاورێی سەفەرم دەبی، ئەبو بەکر لەخۆشیانا گریا، ئەمجار ئەبو بەکر دوو حوشترو بارو بارگەنەی کەلەوە پێش حازری کردبوون هێنانی، عەبدوڵڵای کوڕی (ئورة یغیط)یشی بەکرێ گرت بۆ ئەوەی رێگایان نیشان دا.

## واقیعێکی سەیرو ناوازە:

قورەیشییەکان هەرچەندە زۆر دژی پێغەمبەر بوون و بەهەموو شێوەیەك دژی دەوەستان و بوختانیان بۆ هەڵدەبەستن، کەچی لەهەمان کات دا زۆر متمانەیان پێ دەکردو دڵنیا بوون لەراستگۆیی و دەستپاکی و جوانمەردی، هەرکەسێك لەمەککەدا شتێکی بەنرخی لا هەبوایەو ترسی لێ بوایە دەیبردە لای پێغەمبەر بەئەمانەت دایدەنا، بۆیە ئەوکاتەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ویستی کۆچ بکا زۆر سپاردەی بەنرخی دانیشتوانی مەککەی لەلا بوو، فەرمانی بە عەلی کرد کەلەمەککەدا بمێنێتەوە تاسپاردەکان دەگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، پەروەردگار راستی فەرمووە: کەدەفەرموێ: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ. سورة الأنعام (٣٣)﴾ ئێمە زانیومانەو دەزانین کەئەو کافرو خوانەناسانە تۆ بەدرۆ دەخەنەوەو پەیامەکەت رەت دەکەنەوە، ئەتۆش بەو هەڵویستەیان دڵتەنگ دەبی و غەم و پەژارە دات دەگرێ، لەراستی دا ئەوان تۆ بە درۆزن نازانن، ئەتۆ لەدیدی ئەوانەوە راستگۆو متمانە پێ کراوی و لەوە پێش درۆیان لێ

نەبیستویو خیانەتیان لێ نەدیوی، هەموو کردارو گوفتارێکت لەناویان دا ئەمانەتو راستی بووە، وەلێ ئەو ستەمکارانە لەبەر کورتە ناموس و لەدەستدانی بەرژەوەندی خۆیان بڕوات پێ ناکەن بەربەرەکانیت دەکەن.

## وانەیەك لەكۆچكردن:

بێگومان كۆچكردنی پێغەمبەرو موسوڵمانان لەمەککەوە بۆ مەدینە ئەوەی سەلماند کەبانگەوازی ئیسلامیو بیرو باوەڕی ئیسلامی دوو تەوەری گرنگنو لەپێناویان دا واز لەهەموو خۆشەویستێك دەهێنرێ، هەموو ملكو ماڵو نیشتمانو بەرژەوەندییەك لەپێناویان دەستیان لێ هەڵدەگیرێ، بۆ هیچ شتێك واز لەو دوو شتە ناهێندرێ، مێژووی هەموو بانگەوازی یەکی گەورەو ئایینە کۆنەکان پڕن لەدیاردەی هەوڵو تێکۆشانو هەمیشە وابەستەی جمو جوڵی تاكو کۆمەڵ بوون. هیچ بانگەوازیو بیرو باوەڕێك بەبێ خەباتو ماندو بوون بەرهەمی نابێ و سەرناکەوێ!

شاری مەککە وێڕای ئەوەی زێدی پێغەمبەرو هاوەڵانی بووەو لەوێ دادپەروەر دەبوونو بەئاوو هەوای ئەو شارە راهاتبوون، دڵکێشو دڵگیریش بووە هەموو دڵێك بۆی دەکورکێنێو تێیدا ئارام دەگرێ، کەعبەی تێدایە کەخۆشەویسی ئەو لەدڵان دا وەکوو گیانو خوێن وایە لەجەستەدا، کەچی هیچ شتێك لەمانە نەبوونە لەمپەڕ لەبەردەم موسوڵمانان داو لە کۆچکردن ساردی نەکردنەوە، کاتێك موسوڵمانان لەمەککەدا، لەوشارە خۆشەویستە دڵگیرەدا کەبەلایانەوە خۆشترین بستە زەوی دونیا بوو، تەنگیان پێ هەڵچنراو بیرو باوەڕیان کەوتە مەترسییەوە، دەستبەرداری هەموو شتێك بوونو ماڵو منداڵو خێزانو بەرژەوەندی خۆیان خستە ئەو لاوەو بەسەڵتی کۆچیان کرد.

بێگومـان ئـەم سـۆزە تێکەڵـە لـە سـۆزی خۆشەویـستی مرۆڤانـەو سـۆزی خۆشەویستی ئـاینی لەوتـە بەنرخەکـەی پێغەمبـەردا کەئاراستە مەککـەی کـرد، بـەروونی دەردەکـەوێ، ئـەوەتا کەلەشـاری مەککـە دەرکـەوت ئـاوڕی دایەوەو فـەرمووی: ئـای چەند ولاتێکی دڵگیرو خۆشەویـستی بەلای منـەوە ئەگـەر خزمـەکانم بـەزۆر لـەناو تـودا دەریـان نەکردمایـە هـەرگیز جگـە لێـرە لـەهیچ ولاتێکـی تـردا نیشتەجێ نـەدەبووم. بـەڵێ پێغەمبـەرو موسـوڵمانان کەتەنگـە تـاوکران و نـەیانتوانی ئەرکـەکانی سەرشـانی وەکـوو پێویـست بەئـەنجام بگەیـەنن لـەپێناو ئایینەکەیانـدا کۆچـیان کـرد ئەمـەش بـەپێی فەرمودەی قورئان: کە دەفەرموێ: ﴿يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ. (٥٦) سورة العنكبوت﴾.

ئـەی بەنـدەکانم ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوەو خـاوەنی بیرو بـاوەڕی ڕاستەقینەن، هـەرکاتێ تـەنگتان پـێ هەڵچنراو نەتانتوانی ئەرکەکانی ئـاین جێ بە جێ بکەن، ئەو ولاتە بەجێ بێڵن، بچنە شوێنێك بیرو باوەڕتـان ئـازاد بێ بێگومان زەوی من بەرفراوانە بەس من بپەرستن.

## بۆ ئەشکەوتی ثەور:

پێغەمبەرو ئەبو بەکر بەشێوەیەکی قاچاغ و نهێنی لەمەککە وەدەرکەوتن، ئـەبو بـەکر فـەرمانی بەعەبـدوڵلای کـوڕی کـرد، کەلەمەککـەدا گـوێ هـەڵخاو بزانێ قوڕەیشییەکان دەربارەیان چی یـەژن، زەنـدو خوردیان چۆنەو چیە؟ بەشـەو بـچێ بـۆ لایـان و بۆیـان بـاس بکـا، فـەرمانی بەکۆنـە بەنـدەی خـۆی عـامیری کـوڕی فوهـەیرە کـرد کەبـەڕۆژ ڕانەمەڕەکـە رادا بـۆ دەورو بـەری ئەشـکەوتەکەو لـەوێ مـۆڵی بـدا، بـۆ ئـەوەی بتـوانن سـود لەشـیرەکەیان وەربگـرن، ئـەسمای کـچی ئـەبو بـەکریش بەشـەو بـەنهێنی خواردەمـەنی بـۆ

دەبردن. بەم جۆرە پێغەمبەرو ئەبو بەکر سێ ڕۆژ لەئەشکەوتەکەدا مانەوە، لەوێ دا خۆیان لەمەکۆداو کەس بەم مەکۆیە یانی نەزانی. جگە لەخێزانی ئەبو بەکرو ئەسمای کچی و عەبدوڵڵای کوڕیو عامیری کوڕی فوهەیرە.

## خۆشەویستی یەکی ناوازە و کەم وێنە:

لەو ڕۆژەوەی خودا ئادەمیزادی هێناوەتە گۆڕەپانی ژیانەوە، خۆشەویستی نێوان دووکەس یان زیاتر ئیلهام بەخش بووە بۆ زۆر وردەکاری سەیرو سەمەرە، هەڵنەر بووە بۆ ئەوەی دڵسۆز بێ بۆ خۆشەویستەکەی هەڵبەتە خۆشەویستی ئەبو بەکر بۆ پێغەمبەر گەییشتبوە تۆپەلاکی خۆشەویستیو دڵسۆزی ڕاستەقینە. لەم سەفەرەدا ئەبو بەکر وەکوو چاوی خۆی دەیویست چاودێری پێغەمبەر بکاو نەهێڵێ توشی هیچ چورتمو ناخۆشییەك ببێ. دەگێڕنەوە کەکاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەرەو ئەشکەوتی ثەور کەوتە ڕێو ئەبو بەکری لەگەڵ دابوو، ئەبو بەکر دەمێك پێش پێغەمبەر دەکەوتو جارێك لەدواوەی دەڕۆیشت، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەبو بەکر ئەوە بۆ ساتێك پێشم دەکەویو ساتێك لەدوواوەم دەڕۆی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کاتێ بەدڵم دادی کەسانێك هەبن دومان کەوتبنو بیانەوێ زیانت پێ بگەیەنن، لەدواتەوە دەڕۆم بۆ ئەوەی پارێزگاریت لێ بکەم، پاشان کەبیر دەکەمەوە بەدڵم دادێ کەمینیان بۆ دانابێ خێرا دەکەومە پێشت بۆ ئەوەی نەهێڵم دەستی پیسی ناحەزانت زیانت پێ بگەیەنن!

جاکە گەییشتنە ئەشکەوتەکە، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ لەشوێنی خۆت مەجوڵێ هەتا من بەباشی ناو ئەشکەوتەکە پاك دەکەمەوەو کونو کەلەبەری دەپشکنمو دەیانگرم، ئیتر دەستی کرد بەپڕکردنەوەی

هەموو کونو کەلەبەرێکی ناو ئەشکەوتەکە، پاشان بیری کەوتەوە کەکونە کەڵەکێك ماوە نەیگرتووە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا لەشوێنی خۆت مەجوڵێ بائەو کونەش بگرم، ئەمجار کە کونەکەی پڕ کردەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەجار وەرە ژوورەوە. کە پێغەمبەرو ئەبوبەکر بەتەواوی چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە پەروەردگار جاڵجاکۆکەی نارد نێوان ئەو درەختەی لەبەردەم ئەشکەوتەکە دابوو لەگەڵ دەرگای ئەشکەوتە کەی تەنی، بەجۆرێك پێغەمبەرو ئەبو بەکر دیار نەبن، لەهەمان کات دا فەرمانی بەدوو کۆتر کێوی کرد هاتن لەسەر درەختەکە هێلانەیان کرد، (یان بەباڵە فرە هاتن لەنێوان تەونی جاڵجاڵۆکەکەو درەختەکە دا هەڵبەزو دابەزیان دەکرد)[٩١] کافرەکان کەئەمەیان بینی دڵنیا بوون لەوەی کەس نەچۆتە ناو ئەشکەوتەکەوە ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا. (٤) سورة الفتح﴾ .

## ناسکترین کات کە مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕی:

وەکوو گوترا پێغەمبەرو ئەبو بەکر لە ناو ئەشکەوتەکەدا خۆیان لەمەکۆدا، قوڕەیشییەکان شوێن پێیان هەڵگرتن تابەردەمی ئەشکەوتەکە هاتن بەدویان دا! بەراستی ئەم ساتەوەختە ناسکترین چرکە سات بوو، کەمرۆڤایەتی لەکاروانی دوورو درێژی دا پێ یدا تێپەڕی. مرۆڤایەتی بەگشتی کەوتە دووڕێیانی ئەوە یان شەقاوەتو نەفامی هەتا هەتایە بەردەوام دەبێ، یان بۆ هەتا هەتایە دەرگای خۆشبەختی لێدەکرێتەوە، ئەو کاتەی کافرەکان گەیشتنە بەردەم ئەشکەوتەکە مرۆڤایەتی هەناسەی پێ

[٩١] رواه الحافظ ابن عساكر بسنده عن جماعة من الصحابة.

سوار بوو، بەترسەوە هەڵوێستەی کردو، روانی، هەر ئەوەندە قورەیشییە داخ لەدڵو شمشێر بەدەستەکان تەماشای ژێر قاچی خۆیان بکردایە پێغەمبەرو ئەبو بەکر یان دەبینی نێچیری خۆیان دەدۆزییەوە، ئەوەی عەودالی بوونو بەدوای دا دەگەڕان دەکەوتە بەردەستیان. بەلأم خودا سەری لێ شێواندن، لەنێوان ئەوانو پێغەمبەرو ئەبو بەکردا لەمپەرێکی دروست کرد خەیاڵو هۆشی پەرتەوازە کردن، کاتێك بینییان دەرگای ئەشکەوتەکە جاڵجاڵۆکە تەنیویەتیو کوترە کێوی هێلانەی لەسەر درەختی بەردەم ئەشکەوتەکە کردوە، یەکسەر گەڕانەوەو نەچوونە ناو ئەشکەوتەکەوە. قورئان کەدەفەرموێ: ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ. (٤٠) سورة التوبة﴾. ئاماژە بۆ ئەو ساتە وەختە زۆر ناسکە چارەنووسازە دەکا.

لەکاتێك دا، کە پێغەمبەرو ئەبو بەکر لەئەشکەوتەکەدا بوون ئەبو بەکر قورەیشییەکانی بینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر یەکێك لەوان قاچ هەڵبڕێو سەیری ژێر قاشی خۆی بکا ئێمە دەبینی! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەبو بەکر تۆ گومانی چی دەبەی لەدوکەس خودا سێهەمیان بێ؟ مەترسە ئێمە خودامان لەگەڵە.[٩٢]

کە قورئان دەفەرموێ: ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا. سورة التوبة(٤٠)﴾ ئاماژە بۆ ئەو وتو وێژەی نێوان پێغەمبەرو حەزرەتی ئەبو بەکر دەکاو دڵنیایی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر کەوتنی پەیامەکەیو پشت بەستنی بەخودا تائەو پەڕی سنوور دیاری دەکا.

---

[٩٢] الجامع الصحيح للبخاری باب قوله تعالى ثاني اثنين اذهما في الغار، كتاب التفسير.

## سوراقە دەیەوێ خەلاَتی گرتنی پێغەمبەرو ئەبو بەکر بەدەست بێنێ و بۆی نەکرا:

قوڕەیشییەکان بەکۆچکردنی پێغەمبەر زۆر تەنگە تاو بوون، ویستیان بەهەر نرخێك بێ دەستگیری بکەن و نەهێڵن بە مەبەست بگا، بۆیە خەلاَتێکی باشیان دانا (هەندێك دەڵێن سەد حوشتر بووە) بۆ هەرکەسێك بیانگێڕێتەوە بۆ مەککە، پێغەمبەرو ئەبو بەکر سێ ڕۆژ لەئەشکەوتەکەدا مانەوە، دوایی کەوتنە ڕێ بەرەو مەدینە، عامیری کوڕی فوهەیرەو کابرایەکی شارەزاشیان لەگەڵ بوو بێ بڕوا بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەکرێی گرتبوو، بەکەنار دەریادا بردنی!!

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جەعشەم تەماع گرتی و ویستی ئەو خەلاَتەی قورەیشییەکان دایان ناوە بۆ خۆی دەستە بەری بکا، سەد حوشتر یان لێ وەرگری، سواری ئەسپەکەی بوو شوێن پێغەمبەر کەوت دەستی کرد بەئاو زەنگی لێدان و ئەسپی تاودا، لەشوێنێك پێیان گەیشت و لێیان نزیك بووە، ئەسپەکەی نسکۆی بردو سوراقە گلا، هەر خێرا سوار بووەو کەوتە شوێنیان و سور بوو لەسەر ئەوەی بیان گێڕێتەوە، دوبارە ئەسپەکەی نسکۆی بردو سوراقە گلایەوە، خێرا هەستایەوەو سوار بووەو سوور بوو لەسەر شوێنکەوتنیان، کاتێ چاوی پێیان کەوت و پێغەمبەرو ئەبو بەکریش دیتیان، بۆ جاری سێیەم ئەسپەکەی نسکۆی بردو هەردو دەستی بەزەوی دا ڕۆیشتنە خوارو سوراقە لەسەر پشتی کەوتە خوارەوە، ئیتر تەپ و تۆزو چرە دوکەڵێك لەشوێن پێغەمبەرو ئەبوو بەکر پەیدا بوو، کاتێ سوراقە ئەوەی بینی بۆی ئاشکرا بوو کە موحەممەد پێغەمبەری خودایەو خودا

پارێزگاری دەكاو سەركەوتنی مسۆگەرە، بانگی لێ كردن وتی: من سوراقەی كوڕی جەعشەمم، كەمێ ڕاوەستن باڵێتان نزیك ببمەوە دوو قسەتان لەگەڵ بكەم، سوێندم وابێ هیچی خراپە لەمن نابینن، شتێك ناكەم پێتان ناخۆش بێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەئەبو بەكری گوت: پێی بڵێ چیت لەئێمە گەرەكە؟ سوراقە وتی: نووسینێكم بۆ بنووسن ببێتە نیشانە لەنێوان منو ئێوەدا، عامیری كوڕی فوهەیرە نووسینێكی بۆ نووسی لەسەر ئێسقانێك یان لەسەر پارچە شتێك.

## پێغەمبەرایەتیەك كەعەقڵی مادی پێ ی هەزم ناكرێ:

لەم بارودۆخە نالەبارە دا كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەرواڵەت پێیدا تێدەپەڕی، ئەم حاڵەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەككەدا وای لێ كرد ناچار كۆچ بكاو شاری مەككە جێ بێڵێ، خزمەكانی ڕاوە دویان دەنا، خەڵكیان هەڵدەنا بەشوێنی دا بڕونو بیگرن، ئالەم بارو دۆخەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەچاوی دڵ دەیڕوانییە دوا ڕۆژێكی دوور: كەتاجی كیسراو تەختی قەیصەر دەكەوێتە ژێر قاچی، ئەوەی ڕاگەیاند كەلە داهاتوودا تاجی كیسراو تەختی قەیصەر كۆنترۆڵ دەكا، گەنجینەی زەوی هەمووی دەكەوێتە ژێر دەستی، لەوتاریكە ئەنگوستە چاوەدا بەنووری چاوی دڵ ئەو حاڵەتەی بینی، بۆیە لەو كاتەدا بەسوراقەی فەرموو: چۆن دەبێ ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان بازنەی زێڕی كیسرا لەدەست بكەی!!؟

بێگومان پەروەردگار وادەی سەركەوتنو باڵا دەستی ئایینەكەی بەسەر ئایینەكانی تردا دا بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ

رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ. سورة التوبة(٣٣)﴾ ئەو کاتە مرۆڤە کورت بینەکانو عەقڵ سوکەکان وەدی هاتنی ئەو بارو دۆخەدا هاتوە یان ئینکار کردو قورەیشییەکان بەدووریان زانی. بەڵام چاوی پێغەمبەرایەتی شتی دوور بەنزیك دەبینیو، دڵنیا بوو لەوە کە ئەو بەڵێنەوادەی خودایەو (ان الله لایخلف المیعاد) بێگومان پەروەردگار وادەی خۆی هەڵناوە شێنێتەوە. داهاتوش ئەو راستی یەی چەسپاند.. ئەوەبوو: کە رۆژگاری جێ نشینی ئیمامی عومەر هات، لەدوای جەنگی قادسیە، بازنەو پشتێنو تاجی کیسرایان هێنایە خزمەت عومەر ئەویش سوراقەی بانگ کرد بازنەکەی کیسرای لەدەستی کردو پشتێنەکەی لەپشت بەست.[٩٣]

شایانی باسە ئەو کاتەی سوراقە دوو پێغەمبەرو ئەبو بەکر کەوتبوو دوایی زانی کەناتوانێ هیچیان لێ بکا لەهەڵوێستی خۆی پەشیمان بۆوە، ئەمجار داوای لە پێغەمبەر کرد کە تێشوو ئەسبابی سەفەرەکەی لێ وەربگری، بەڵام پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لێی قبوڵ نەکر، تەنها ئەوەندەی پێ فەرمووو: کەراستیان لێ نەڵێ و دەنگو باسیان بزر بکا. پێغەمبەرو ئەبو بەکر درێژەیان بەگەشتی خۆیان داو بەرەو مەدینە رۆیشتن، لەرێرەوی خۆیان دا بەلای (أم معبد) ی خوزاعی دا تێپەرین، ئەم ئافرەتە مەرێکی هەبوو لەبەر پیریو لاوازی لەجەڵەب دوا کەوتبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستی موبارەکی بەگوانی مەرەکەدا هێناو ناوی خودای لەسەر بردو لەخودا پاڕایەوە بەرەکەت بخاتە گوانی ئەو مەرەوە، گوانەکانی شیریان تێ هاتو

---

[٩٣] الأستيعاب في معرفة الأصحاب لابن عبد البر ج ٢/٥٩٧.

دۆشـییان پێغەمبـەرو هـاوەڵانی تێریـان لەشـیرەکەی خـواردەوە دوایـی دۆشیانەوە مەنجەڵـە شـیریان لێ پـڕ کـرد، کاتـێ ئـەبو مەعبـەد گەڕایـەوە بـۆ ماڵەوە پرسیاری کردو هەواڵی زۆر بوونی ئـەو شیرەی پرسـی، ئـوم مەعبـەد وتـی:بـەخودا هۆکـاری ئـەمـە نـازانم، ئەوەنـدە هەیـە پیـاوێکی پـیرۆز بـەلای ئێمەدا تێپەڕی ئاواو ئاوای گوتو ئەوەی کـرد، ئـەمجار وەصـفێکی جوانی پێغەمبەری بۆ کـرد، ئـیتر ئـەبو مەعبـەد وتـی: بەخـودا هـەبێ نـەبێ ئـەوە ئـەو پیاوەیە کە قورەیشییەکان دەیانەوێ دەستگیری بکەن.[٩٤]

ئیتر پێغەمبەرو ئەبو بەکر درێژەیان بەگەشتی خۆیان دا چاو ساغەکەیان لەگەڵ دابوو هەتا گەیاندنیە (قباء) کە گوندێك بوو (هۆبەیـەك بـوو) لـەدەورو بـەری مەدینـە ئەمـەش ڕێکـەوتی ڕۆژی دووشـەممە دوازدەی مـانگی رەبیعـو لئـەوەلی کـردو سـەرەتای مێـژووی ئیـسلامی لـەم ڕۆژو سـاتەوە دەسـت پـێ دەکا.

---

[٩٤] زاد المعاد جـ ٢/٣٠٩.

# باروو دۆخی مەدینە لەکاتی کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ ئەوێ

## جـودا وازی لـەنێوان کـۆمەڵگای مەککـە و کۆمـەڵگای مەدینەدا:

بۆ ئەوەی وێنەیەکی پوخت و کورت و راستی شاری یەثریب وەربگرین چۆنیەتی و واقیعەکەی بزانین لەو ڕۆژگارەدا، بزانین ئەو شارەی کەخودا هەڵی بژارد بۆ ئەوەی بیکاتە شاری کۆچ بۆ کراوی پێغەمبەرو مەڵبەندی بانگەوازی ئیسلامی لەجیهان داو لانەی یەکەم کۆمەڵگای ئیسلامی کەپێك دێ دوای پەیدابوونی ئایینی ئیسلام جا بۆ ئەوەی ئاگاداری ئەو شتانە بین پێویستە بزانین ئاخۆ باری شارەستانی و کۆمەلأیەتی و ئابورێ و پەیوەندی ئەو هۆزانەی تێیدا نیشتە جێن بەیەکتری یەوە چۆن بووەو لەچ ئاستێك دا بووە؟

هەروا بزانین مەرکەزی جولەکەکان لەمەدینەدا لەروی کۆمەلأیەتی و ئابوری جەنگی یەوە چۆن بووە، ئاگاداربین بەسەر ئەو واقیع و بارو دۆخەی شارەکە تێ یدا دەژیا، ئەو شارە دەوڵەمەندە خاك بەپیتەی چەند ئایین و کۆمەڵگاو جۆری ڕۆشنبیری جودا جودای لەخۆ گرتبوو، بەپێچەوانەی شاری مەککە کە دانیشتوانە کانی یەك سروشت یەك نەتەوەو یەك ئایین بوون و تا ئەندازەیەکی زۆر طەبیعەت وشك و سەر ڕەق بوون. با خوێنەری ئازیز لەگەڵما بێ هەندێ روناکایی بخەینە سەر دیاردەکانی کۆمەڵگای شاری مەدینەو پێکهاتەکانی.

١- جولەکەکان: مێژوو بۆ مانی سەلماندوە: کە زۆربەی ئەو جولەکانەی ناو جەزیرە بەگشتیو ناو مەدینە، بەتایبەتی لەسەدەی یەکەمی زایینی دا لەو ولآتو دەڤەرانە دانیشتە جێ بون!! دکتور ئیسرائیل ولفنسون دەڵێ: لەپاش جەنگی نێوان جولەکەو رومان سالی (٧٠) ی زایینی، ئەو شەڕەی ئاکامەکەی وێرا نبوونی ولآتی فەلەستینو روخانی هەیکەلی بەیتو لمەقدیسو پەرتەوازە بوونی جولەکە بوو بەناو ولآتان دا.

٢- ئالەو سەروبەندەدا کۆمەڵانێکی زۆر لەجولەکەکان رویان کردە ولآتی جەزیرە وتێ یدا نیشتەجێ بوون، ئەمەش بەپێی ئەو ریوایەتەی مێژوو نووسی جولەکە نژاد (یوسی فوس) بۆمان دەگێڕێتەوە کە خۆی لەگەڵ روداوەکانی ئەو جەنگەدا ژیاوەو فەرماندەی لقێکی ئەو هێزە ەڕکەرە جولەکانە بووەو هەموو سەرچاوە مێژوویی یە عەرەبیە کانیش ئەم روداوانە دەسەلمێنن.[٩٥] لەمەدینەدا سێ هۆزی گەورەی جولەکە هەبوون، ژمارەی پیاوە کامڵە کانیان زیاد لە دوو هەزار کەس بوو، ئەو سێ هۆزە سەرەکییەی جولەکە (قەینوقاع، ئەلنەضیر، قورەیظە) بوون ژمارەی پیاوە شەڕکەرەکانی بەنو قەینوقاع دەگەیشتە حەوت سەد کەس، ژمارەی پیاوە جەنگاوەرەکانی (بەنو نەضیر) یش دەگەیشتە ئەو ژمارەیە، پیاوە کامڵەکانی بەنو قوڕەیظەش دەگەیشتنە حەوت سەد تانۆ سەد کەس ![٩٦] پەیوەندی نێوان

---

[٩٥] تأريخ اليهود في بلاد العرب في الجاهليه وصدر السلام/ الدكتور اسرائيل ولفنسون أبو ذؤيب ص/٩ .

[٩٦] ئەم مەزەندەو ژمارەیە لەسیرەی ئیبنو هشام وەرگیراوە هەر لەو ژمارانەی لەکاتی رو داوو جەنگەکان دا تۆمار کراون وەکوو دەرکردنی بەنو نەچیر وەکوو کوشتنی پیاوەکانی بەنو قورە یظەو زۆر روداوی تر. قەینوقاعو نەچیرو قورەیظە ئەم سێ‌هۆزە هۆزی سەرەکی جولەکە بوون، ئەمانیش هەریەکەیان چەند تیرەو هۆزی بچکۆلەی تری

ئەم هۆزە جولەکانە هەمیشە کێشەو شەڕو دوو بەرەکی بوو، هەندێ شەڕی خوێناوی لەناویان دا قەوما بوو.. دوکتور ئیسرائیل ولفنسون دەڵێ: بێگومان دوژمنایەتیەکی دژوار لەنێوان قەینوقاع و جولەکەکانی تردا هەبوو، هۆیەکەشی ئەوە بوو بەنو قەینوقاع لەگەڵ هۆزی خەزرەج دا هاریکار بوون لەشەڕی ڕۆژی (بعاث)دا، بێگومان بەنو نەضیرو بەنو قورەیظە کوشتارێکی زۆریان لێ کردن، تاروماریان کردن، کەچی وێڕای ئەوە ئەگەر جولەکەیەك دیل بکرایە، جولەکە دوژمنەکانیشی فیدیەیان بۆ دەداو لەکۆیلەیی ڕزگاریان دەکرد، سەیر بوو کوشتاریان لەیەکدی دەکردو فیدیەیان بۆ دیلی یەکتری دەدا.

لەدوای شەڕی ڕۆژی(بعاث) دوژمنایەتی نێوان تیرەو هۆزەکانی جولەکە بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژەی شەڕ لەنێوان یاریدەدەران و بەنو قەینوقاع دا بەرپابوو، ئیتر کەس لەجولەکەکانی تر پشتگیری بەنو قەینوقاع نەکردو لەدژی ئەنصار نەوەستا.

---

جولەکە خۆیان پێوە هەڵواسی بوون و خۆیان پاڵ یەکێ لەوسێ هۆزەدەدا، وەکوو (بەنو هەدل) کەخۆیان پاڵ بەنو قورەیظە دا بوو، بڕێ لەم هۆزە شوێنکەوتە پاشگرە موسوڵمان بوون و بەگەورە هاوەڵی پێغەمبەر دەناسرێن. هەروا (بەنو زنباع) ئەمانیش بەشێکن لە بەنوقورەیظە، هەروا ناوی چەند کۆمەڵی جولەکە هاتووە لەو پەیمانەی کەلەنێوان پێغەمبەر و جولەکەکان دا نووسرا، وەکوو (یەهودی بەنی عەوف، یەهودی بەنی نەجار، یەهودی بەنی ساعدە، یەهودی بەنی ثەعلەبەو بەنی جوفنەو بەنو الحارث وهی تریش، لەم پەیمانەدا پاش ریز کردنی ئەم کۆمەڵانە ئەوە هاتووە دەڵێ: (بطانە) ی یەهود وەکوو خۆیانن، بۆیە خاوەنی کتێبی (وفاء الوفاء في اخبار المصطفى) دەڵێ جولەکەکانی مەدینە بیست و ئەوەندە هۆز بوون:

قورئانی پیرۆز لەدوو ئایەت دا ئاماژە بۆ دوژمنایەتی نێوان هۆزە جولەکەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لاَ تَسْفِكُونَ دِمَاءكُمْ وَلاَ تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَارِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ. ثُمَّ أَنتُمْ هَؤُلاء تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقاً مِّنكُم مِّن دِيَارِهِمْ تَظَاهَرُونَ عَلَيْهِم بِالإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَإِن يَأتُوكُمْ أُسَارَى تُفَادُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ. سورة البقرة(٨٤-٨٥)﴾ بیر لەوە بکەنەوە ئەو کاتەی وادەو پەیمانمان لێ وەرگرتن کەخوێنی یەکتر نەرێژن، کەس کەس لەماڵی خۆی وەدەرنەنێ، کەس شانازی بەسەر کەس دا نەکا، پاشان ئێوە بۆ خۆتان پێتان لێ ناو سەلماندتان، کەچی بەکردەوە سەرپێچی لێ دەکەن‌و پابەندی هیچ وەعدو پەیمانێك نابن.

لەسەردەمی سەرەتای کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە لەشاری مەدینەدا دوو تاقم جولەکە هەبوون، بەشێکیان بەنو نەضیر بوون هاوپەیمانی هۆزی خەزرەج بوون، بەشی دووەمیان کە بریتی بوو لە بەنوقەینوقاع‌و بەنو قورەیظە ئەمانیش هاوپەیمانی هۆزی ئەوس بوون، جاکە لەوە پێش هۆزی ئەوس‌و خەزرەج شەڕیان دەبوو (بەنو قەینوقاع) و (بەنو قورەیظە) لەگەڵ هۆزی خەزرەج خۆیان ئامادە دەکردو دەچوونە شەڕ، (بەنو نەضیر)یش لەگەڵ هۆزی ئەوس دەچوونە شەڕ، هەریەکێ لەم جولەکانە شەڕی لەگەڵ براکەی خۆی‌و نەتەوەکەی خۆی دەکردو خوێنی یەکتریان دەرشت، تەوراتیان ئاگا لێ بوو، دەیانزانی چی تێدایەو چی پێویستە بیکەن‌و چی نەکەن، هۆزی ئەوس‌و خەزرەجیش کافرو خوانەناس بوون، نەیاندەزانی بەهەشت‌و دۆزەخ چیەو چی نیە، قەبرو قیامەت هەیە یان نیە، حەرام‌و حەڵاڵ چیە. جولەکە جولەکەی دەکوشت‌و ماڵی یەکتریان داگیر دەکرد،

یەکتریان وەدەر دەنا، خانووی یەکتر یان دەروخاند ئەمەش بەپێ ی یاسای تەورات حەرام بوو. ئەمجا کەشەڕ دەوەستا بارتەقای جولەکە دیلەکانیان دەدا، هەر ئەو جولەکانەی کە لەگەڵ لایەنە سەرکەوتووە کەبوون و هاوپەیمان بوون دەهاتن بەپارەی خۆیان ئەو جولەکە دیلانەیان ڕزگار دەکردن.

عەرەبەکانیش گاڵتە یان پێ دەکردن و پێیان دەگوتن: چۆن شەڕیان لەگەڵ دەکەن و دوایی فیدیە یان بۆ دەدەن؟؟

دەیانگوت تەورات فەرمانمان پێ دەکا فیدیە یان بۆ بدەین ئەمەیاسای ئایینی خۆمانە، پێویستە فیدیە بدەین بۆ ڕزگار کردنی دیل و نەهێڵین بەدیلی بمێننەوە، شەڕ کردنیشمان پێ حەرامە، بەڵام بەلامانەوە عەیبە هاوپەیمانەکانمان تێ بشکێن...[97] ئەم جولەکانە تێکرا لەناو چەند هوبەو گوندێکی جیا جیای تایبەت بەخۆیان دا دەژیان، بەنو قەینوقاع لەناو مەدینەدا، لەگەڕەکێکی تایبەت بەخۆیان دا دەژیان، ئەمەش دوای ئەوەی لەلایەن بەنو نەضیرو بەنو قورەیظە وە لەدەرەوەی مەدینەوە دەرکران و خانوو بەرەیان وێران کرا، شوێنی نیشتەجێ بوونی بەنو نەضیرو بەنو قورەیظە بەرزایی یەکانی دۆڵی (بەطمان) بوو دوسێ میل لەمەدینە دوور بوون، ئەو وڵاتە زۆری دار خورمای تێدا بوو، بەنوقورەیظە لەدەڤەری مەهزور کەبەچەند میلێك لەمەدینەوە دوور بووەو کەوتۆتە جنوبی شارەوە.

ئەم جولەکانە لەدەوروبەری مەدینە چەند قەڵاو شوراو بنکەو گوندیان هەبوون تێ یدا دەژیان، بو بوونە چەند کۆمەڵ و پێڕێك، هەر کۆمەڵە بۆ خۆی سەربەخۆ بوو، بەدرێژایی ڕۆژگار ئاوایان هێنا بوو نەیان توانیبوو

---

[97] بڕوانە تە فسیری رە وان جـ١/١١٥.

حکومەتێك بۆ خۆیان پێکەوە بنێن یەکد یگیریان بکاو بەناوی حکومەتی یەهودەوە فەرمانڕەوایی بکا. بەڵکوو هەر هۆزو کۆمەڵێکیان سەربەخۆ لەژێر پارێزگاری سەرەك هۆزە عەرەبەکان دا بوون، هەموو ساڵێ لەپای ئەو پارێزگاری و بەرگری لێ کردن و حەوانەوەیان دا سەرانەو مەڕانەو باج خەرجیان دەدایە سەرەك هۆزەکان ئەوانیش نەیان دەهێشت عەرەبە دەشتەکی و کەسانی دیکە دەست درێژی بکەنە سەر گیان و ماڵ و ناموسیان، زۆر جار بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ سەرەك خێڵە عەرەبەکان دا پەیمانیان دەبەست، هەموو سەروك و پیاو ماقوڵێکی جولەکە هاوپەیمانێکی لەسەرەك خێڵێکی عەرەب و ئەعراب هەبوو.(٩٨)

جولەکەکان وایان خۆ نیشان دەدا کەخوێندەوارو شارەزان لەبواری ئایین شەریعەتە ئاسمانییەکان دا، چەند قوتابخانەو خوێندنگایەکیان هەبوو زانیارییە ئایینی یەکانی خۆیانیان تێدا دەخوێندو ئەحکام و یاسای تایبەت بەشەریعەتی خۆیانیان تێدا شی دەکردەوە، تأریخ و مێژووی تایبەت بەخۆیان و هەواڵی تایبەت بە پێغەمبەرو پیاوچاکانی رابردویان تێدا بەدەرس دەگوتنەوە، هەروا شوێنی تایبەتیان هەبوو بۆ ئەنجامدانی عیبادەت و شەعائیرە ئایینی یەکانیان، بەمانەیان دەگوت (المدارس) خوێندنگا(٩٩) لەم جۆرە خوێندگایانەدا کۆدەبوونەوە بۆ راوێژ کردن دەربارەی وەزع و حاڵی ئایینی و دونیایی. جولەکەکان بەگشتی لەناو کۆمەڵگای مەدینەدا تەشریعات و یاسای تایبەتی خۆیان هەبوو، هەندێکیان لەکتێبەکانی خۆیان وەرگرتبوو هەندێکیش لەو یاساو تەشریعاتانەی مالم و

---

٩٨ ملخص من تأريخ العرب قبل السلام د. جواد علي ج ٢٣/٧.

٩٩ سەرچاوە یەهودی یەکان پێیان وایە ئەم خوێندنگایانە شوێنی فێرکردنی خوێندنی باڵا بون وەکوو کۆلیج و زانکۆ... سەیری ئیسکلوبیدیای جولەکە بکە.

کاهینەکانیان لەخۆیانەوە بۆ یان دانابوون، جەژنی تایبەتی خۆیان هەبوو، رۆژی تایبەتی خۆیان هەبوو تێ یدا بەڕۆژو دەبوون، وەکو ڕۆژی عاشوڕا.[١٠٠] وادیارە پەیوەندیان بەئایینە ئەصلیو رەسەنەکەی خۆیانەوە لاواز بووە، تائەندازەیەك لەو تەعلیماتو یاساو رێسایانە دورکەوتبوونەوە کەلە سیپارەو پەڕاوەکانیان دا هەبوو، بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار زۆر خوی هاوسێ عەرەبەکانیان گرت وایان لێهات لەعەرەبەکان جیا نەدەکرانەوە، مەگەر بەوە نەبێ کەتارمایی یەکی یەکتا پەرستییان تێدا مابوو، کەم تاکورتێك جوداوازی نێوان حەڵاڵو حەرامیان دەکرد، کەئایینی ئیسلام پەیدا بوو عەقیدەی یەکتا پەرستی خاوێنی هێنا وەکوو قورئان ئاماژەی بۆ دەکا، ئیتر ئەو جوداوازییەکەمە شیان لەدەست دا!!!.

ئیتر لەبارەی رەوشتو ئەخلاقەوە روخانو هیچ بنەمایەکیان نەما، وایان لێ هات بۆ جێ بەجێ کردنی ویستەکانی خۆیان پەنایان دەبردە بەر شتی نەشازو نامەعقول وەکوو سیحر بازیو زەهر خواردوکردنی نەیارەکانیان رازی کردنی نەفسو ویجدانی خۆیان بەشتی بێ بنەماو بەکار هێنانی وشەی گومانـاویو دووسەرەو دوو مانا هەڵگر، حاڵو وەزعیان وەکوو هەموو ئەو کۆمەڵگایە داخ لەدڵو چەوساوەو ژێر دەستانە وەهابوون، کەلەژێر نیری چەوسانەوەدا ژیان بەسەر دەبەن. لەسەرێکی ترەوە یەهود زۆر کاراماو لێهاتوو بوون لەفەنی سیحر بازی دا، سیحر زانیو کۆڵەوە نانی جولەکە راستییەکی حاشا هەڵنەگرە لەمێژوودا، بەدرێژایی مێژوو سەرکردەو زاناو مالمەکانیان دان بەسحر بازیو کەهانەتی خۆیان دا دەنێنو بەشانازییەوە باسی دەکەن، قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەو لایەنە سیحر بازییەی جولەکە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ

[١٠٠] بنو اسرائيل فى القرىٓن والسنه . ص ٨٠-٨١.

سُلَيْمَانُ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ. سورة البقرة(١٠٢)﴾ ئەم جۆرە فەننە بەردەوام بوو تاسەردەمی پەیدابوونی پێغەمبەری ئیسلام.

ڕۆژ هەڵاتناسی جولەکەی بەناوبانگ مارجیلوث، کەبەوە ناسراوە دوژمنی ئیسلامەو زۆری رق لە پێغەمبەرە لەکتێبێکی دا بەناوی (عن رسول الله) دەڵێ: ئەو جولەکانە زۆر کارامـاو لێهـاتو بـوون لەفـەننی سـیحردا، هەمیشە بەکار هێنانی چەکی رەش (سیحروجادو بازی) یان بەلاوە باشتر بوو لەشەڕی بەرامبەری‌و بەکار هێنانی چەکی رواڵەتی.

لەوە بەولاوەش کەباسی غەزای خەیبەر دەکەین، سەرگوروشتەی ئەوە دێ کەچۆن هەوڵیان دا پێغەمبەر ژەهر خواردو بکەن. ئەوە بوو ژەهریان کردە ناو گۆشت بەرخی سورەوە کراوو پێشکەشی پێغەمبەریان کرد بۆ ئەوەی رزگاریان بێ لەدەستی، پێغەمبەر دەستی برد بۆ باڵ‌و شانەکەی تیکەیەکی لێ هەڵگرت، خستیە دەمیەوەو تفی دایەوە فەرمووی ئەم ئێسقانە پێم دەڵێ: ژەهرم پێوە کراوە، بیشری کوڕی بەراء تیکەیەکی لێ هەڵگرتبوو قوتی دابوو، لەئاکام دا بیشر بەو ژەهرە مرد.[101] بەکار هێنانی وشە و رستەی دوو سەرەو دوو مانا بەخشی بەشێوەیەکی تایبەتی‌و ئیرادە کردنی مانا ناشیرینەکەی. وەکوو لەقورئان دا هاتووە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقُولُواْ رَاعِنَا وَقُولُواْ انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ. سورة البقرة(١٠٤)﴾

---

[101] الجامع الصحيح للبخاري باب الشاه التی سمت للنبی ص بخيبر.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان بە پێغەمبەر هێناوە، هەرگیز لەروی ئەو پێغەمبەرەدا وشەی (راعنا) بەکار مەهێنن، ئەم وشەیە بەتۆزێك دەم بۆ خوارکردنەوە دەبێتە (راعینو) ی عیبری کەجنێوێکی ناشرینە، هەرچەندە لەزمانی عەرەبی دا بەمانای چاودێری کردن و گوێ بۆ راگرتن دێ و لەسەرە خۆیی دەگەیەنێ، واتە: گوێ بگرە بۆ مان تابتوانین ئەوەی دەمانەوێ لێت بپرسین و ئەنجامی بدەین و لێت حاڵی ببین، جاکە جولەکەکان گوێیان لێ بوو موسوڵمانەکان لەگەڵ پێغەمبەردا وشەی (راعنا) بەکار دێنن بەهەلیان زانی ئەوانیش ئەم وشەیەی لەگەڵ دا بەکار بێنن بەرواڵەت دەیانگوت مەبەستمان مانا عەرەبیەکەیەتی، بەلأم لەراستی دا مانا عیبرییەکەیان مەبەست بوو، ئیتر ئەوە بوو پەروەردگار گوتنی ئەو وشەیەی لەموسوڵمانان قەدەغە کرد کەلەروی پێغەمبەردا بیکەن، بەڵکوو فەرمانی پێ کردن: کەلە شوێن ئەو وشەیە وشەیەکی تر بڵێن: پێیانی فەرموو (قولوا انظرنا) بڵێن رومان تێبکەو سەیرمان بکە سەرنجمان لێ بدە، بزانە ئاخۆ فەرمایشتەکانت حاڵی بووین یان نا. (واسمعوا) فەرمانبەرداری خودابن گوێ رابگرن پێغەمبەر چیتان پێ دەڵێ دەربارەی شەرعی خودا بیقۆزنەوە. جالەبەر ئەوەی جولەکەکان بێ ئەدەبییان لەخزمەت پێغەمبەردا کرد وشەی (راعنا) یان بەمانا مەبەستەکەی خۆیان (کەشەڕانی و نەگبەتی و شوم دەگەیەنێ) لێ داوەتەوە ئەمەش کوفرێکی ئاشکرایە.[١٠٢].

ئەبو نەعیم لەکتێبی (الدلائل) دا لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: جولەکەکان بەنهێنی بە پێغەمبەر یان دەگوت: (راعنا) ئەم وشەیەش بەزمانی عیبری جنێوێکی ناشرینە، ئەمجار لەناو خۆیان دا ئەم وشەیەیان دوپات دەکردەوەو لەقاقای پێکەنینیان دەدا. ئیتر پەروەردگار

---

[١٠٢] مانای ئایەتەکە لەتەفسیری رەوان جـ ١٣٣/١-١٣٤ وەرگیراوە.

ئەم ئایەتەی نازڵ کردو نەی لەموسوڵمانان کرد کەئەو وشەیە بەکار نەهێنن، ئەمەش بەمەبەستی دەرگا داخستن لێیان و ڕێ گرتن لەوتنی ئەو وشەیە، مانای ئەم وشەیە لەلای جولەکەکان، ببیسە- کەڕبی. هەندێکیش پێیان وایە: ویستویانە ئەو وشەیە پاڵ بە پێغەمبەر بدەن، لەم ڕووەوە کە (راعنا) لەچاوگی (رعونە) وەرگیراوە (رعونە)ش بەمانای نەفامی و ئەحمەقی دێ. ئەوکاتە ئەلفی کۆتایی وشەکە بۆ درێژ کردنەوەی دەنگەکەیە.[١٠٣] شێخی بوخاری بەرشتەی خۆی لەعوروەوە ئەویش لەعائیشە وە ریوایەت دەکا دەڵێ: عائیشە فەرمووی: جولەکەکان سڵاویان لە پێغەمبەر دەکرد دەیانگوت: (السام) بەمانا مردنە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمویەتی (لكل داء دواء الا السام) هەموو دەردێك دەرمانی هەیە جگە لەمردن، قورئان کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَى ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاؤُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ. سورة المجادلة(٨)﴾ ئاماژەبەو جۆرە سڵاو کردنەی جولەکەکان دەکا. هەروا جولەکە دوچاری بێ ئەخلاقی جینسی بوون، چەقینە زەلکاوی بێ ڕەوشتییەکی وەهاوە: کە شیاوی کۆمەڵگای بەرزو یەککگرتوو نەبوو، شیاوی کۆمەڵگایەك نەبوو کە لەسەر بنەمای شەریعەت و تەعلیماتی دابمەزرێ، ئەمەش بەئاشکرا لەچیرۆکی ئەو ژنە عەرەبەی کەلە بازاڕی بەنو قەینوقاع بەسەر پشت دا کەوت دەردەکەوێ. ئەوە بوو ژنێکی عەرەب چووە بازاڕی قەینوقاع لەلای زێڕینگەرێکی جولەکە دانیشت زێڕ بکڕێ، جولەکەکان دەیانویست چارشێوی سەردەم و چاوی لابداو ڕوخساری دەربکەوێ، ئەویش ڕازی نەبوو، کابرای زێڕینگەر لایەکی چارشێوەکەی گرت و بۆ لای پشتی هەڵی

---

[١٠٣] تەفسیری روحولمە عانی/ للآلوسی جـ ٣٤٨/١-٣٤٩.

دایەوە، کەهەڵسا عەورەتی دەرکەوت جولەکەکانیش پێ ی پێکەنین، ژنەکە هاواری کرد، پیاوێکی موسوڵمان پەلاماری ئاڵتون چییەکەی داو کوشتی، جولەکەکانیش پەلاماری موسوڵمانەکەیان داو شەهیدیان کرد،[١٠٤] وادیارە ئەم روداوە یەکەم روداو نەبوە لەو جۆرە، بەڵکوو روداوی تریش لەو جۆرە لەبازارەکانی عەرەب دا رویان داوە. لەلایەکی ترەوە زۆربەی مامەڵەی جولەکەکان لەگەڵ کەسانی تردا بەشێوەی رەهن کردن و گرەوو سود خۆری بەرێوە چووە، سروشتی هەرێمی مەدینە کەناوچەیەکی کشت و کاڵی یە هەلی رەخساندبوو بۆ جولەکەکان کەمامەڵەی رێبا ئامێز بەرفراوان بکەوە. چونکە بەرواڵەت فەلاو کشتیار پێویستیان بەوە هەیە قەرزو قوڵە بکەن بۆ کاتی دروێنەو هەڵگرتنەوەی بەرو بوم.[١٠٥] جا وەنەبێ رەهن کردن تەنها تایبەت بووبێ بەبارمتەی ماڵی یەوە، بەڵکوو زۆر جار رەهن ژن و منداڵیشی گرتۆتەوە، لەسەر گوروشتەی کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف ئەلنەضری، کەئیمامی بوخاری رەزای خودای لێ بێ، لەصەحیحەکەی دا بۆمانی دەگێڕێتەوە... موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بەکەعب دەڵێ: دەمانەوێ ویسقێ دوویسق خۆراکمان بەقەرز پێ بدەیت، کەعب گوتی باشە بەلاَم دەبێ بارمتەم پێ بدەن، وتیان چیت دەوێ کەلە بارمتەدا دای بنێن؟ وتی: ژنەکانتانم بەبارمتەك لا دابنێن، گوتیان: تۆ جوانترین پیاوی عەرەبی چۆن ژنت بەبارمتە لەلا دابنێین؟ تووشی سەر شۆڕی دەبین، گوتی دەی کورەکانتانم بەبارمتە بدەنێ، وتیان ئەویش هەرنە گونجاوە چونکە سبەی جنێویان پێ دەدەن و پێیان دەڵێن: ئەی بارمتەی تەغارێ خۆراك، ئەمە بۆ ئێمە ریسوایی یە، بەلاَم دەتوانین زریەکانمان واتە چەك و شتی وات لەلا

---

[١٠٤] سیره ابن هشام ج ٤٨/٢.

[١٠٥] بنو اسرائیل فی القرئن والسنه.

بەبارمتە دابنێین[١٠٦] ئاشکراشە لەبەستنی ئەم جۆرە رەهنانەدا بەتایبەتی ئەگەر بارمتەکان ئافرەت و کوڕ بن جۆرە دژایەتی و قین و کینێك لەنێوان راهن و مرتهن) بارمتە لا دانراوو بارمتە دانەردا پەیدا دەبێ، بەتایبەتی کە عەرەب بەوە بەناو بانگن کەغیرەیان زۆرە بەسەر ژنەکانیانەوەو زۆر نەمارگیرن. تەنانەت ئەوان جاری وا هەبوە کچی خۆیان زیندە بەچاڵ کردوە بۆ ئەوەی گەورە نەبێ و بیدەن بەشو!!!

لەئاکامی بالاّ دەستی جولەکەکان بەسەر لایەنە ئابورییەکانی مەدینەو دەورو بەریدا، وایان لێ هات هێزی ئابوریان پەرەی سەندو بەئارەزۆی خۆیان لەبازاڕەکان دا حوکمیان دەکرد، داشکاندن و بەرزکردنەوەی نرخی کالاّکان لەبازاڕدا بەدەست ئەوان بوو، بۆ بەرژەوەندی خۆیان کالاّیان پەزمەندە دەکردو دەشاردەوە بۆ ئەوەی داخوازی زۆر بێ و ئەمجار بەگران بیفرۆشن ئیتر زۆربەی رەشە خەڵکەکە رقی لێیان بوو بەهۆی ئەو خۆپەرستی و سود خۆری و دەوڵەمەند بوونە ناشەرعی و نائاسایی یەی کەعەرەبەکان پێیان هەزم نەدەکراو قێزیان لەو جۆرە بازرگانی و مامەڵەیە بوو، هەروا بەهۆی ئەو هەڵپە کردنەیان بۆ ماڵ کۆکردنەوەو قۆرغکردنی سامان بۆ خۆیان و پەرەپێدانی سیاسەتی پاوانخوازییان بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکان...

دیلاسی ئولیدی De Lacy O'Leary لە کتێبەکەی دا بە ناوی (العرب قبل محمد) دەڵێ: لەسەدەی حەوتەمی زایینی دا پەیوەندی نێوان عەرەبە مەدەنییەکان و جولەکە پاوان خوازو ساماندارەکان گرژ بوو، چونکە ئەو جولەکانە زەوییە کشت و کاڵیەکانی خۆیان بەرفراوان کرد تالەوەڕگاو

---

[١٠٦] الجامع الصحيح للبخاری کتاب المغازی باب قتل کعب بن الأشرف.

پاوانی خێڵە عەرەبەکانیشی گرتەوە، پەیوەندی نێوان جولەکەکانو هۆزی ئەوسو هۆزی خەزرەج کەدانیشتوی سەرەکی شاری مەدینە بوون، بەگوێرەی سودی شەخصیو دەسکەوتە مادییەکان دەگوزەرا، هەرکاتێ بیانویستایە ئەوسو خەزرەج بەشەڕ بدەنو شەڕ هەڵگیرسان لەناو یان دا بۆ ئەوان سودی هەیە ئەوسو خەزرەجیان بەگژیەک دا دەکردنو خۆیان لەدوورەوە سەیریان دەکردن، ئەو شەڕە خوێناویوماڵوێرانکەرانەی کە بەدرێژایی مێژوو لەنێوان ئەوسو خەزرەج دا رویان داوە زۆربەیان بەپیلانو دەسیسەی جولەکەکان هەڵگیرساون. لەروی بازرگانیو ساماندارییەوە بازاڕەکانی مەدینە بۆ خۆیان کۆنترۆڵ بکەن قسە کردنیان دەربارەی پێغەمبەری چاوەڕوانکراوو شانازی کردنیان بەوەی کەئەوان نیشانەکانی دەناسنو زوو دەست پێشخەری دەکەن بۆ ئیمان پێ هێنانی، هۆزی ئەوسو هۆزی خەزرەجی هەڵنا بۆ ئەوەی زوو موسوڵمان ببن.

زمانی جولەکەکانی وڵاتی عەرەب ئاشکرایە عەرەبی بووە بەلاَم عەرەبییەکی پاكو خاوێن نا، بەڵکوو زمانێکی خوارو خێچو شێوە عیبری، چونکە ئەوان زمانی رەسەنی خۆیان کەعیبری بوو بەتەواوی وازیان لێ نەهێنابوو، لەخوێندنگاو وانە وتنەوەکان داو لەنوێژو طقوسە ئایینی یەکانیان دا زمانی عیبرییان بەکار دێنا.[107]

دەربارەی لایەنی ئایینی بانگەوازی یان توندو تۆڵ نەبوو. د. ئیسرائیل ولفنسون، دەڵێ: گومان لەوەدا نیە یەهودییەکان لەتوانایان دا هەبوو دەسەلاَتی ئایینی خۆیان لەناو عەرەبەکان دا بەرفراوان بکەنو بیگەیەننە پلەو پایەیەکی بەرزتر لەوەی کەهەبوو، بەمەرجێك بۆ خۆیان نیازو

---

مكة والمدينة في الجاهلية وعهد الرسول/ احمد ابراهيم شريف ص٢٠٣.

مەبەستیان بڵاو کردنەوەی ئایینەکەیان بوایە، وەلێ ئەوەی لەمێژوودا چەسپاوەو گەواهی ئەوە دەدا کەنەتەوەی ئیسرائیل بەشێوەیەکی گشتی مەیلی لەوە نەبووە گەل‌و نەتەوەی تر ناچار بکەن بێنە ناو ئایینە کەیانەوە، تەنانەت لەهەندێ ڕووەوە بڵاو کردنەوەی ئایینی جولەکە بەناو نەتەوەی تردا لەسەر خوودی جولەکەکان قەدەغە بوو، بەتایبەتی کەئایینی جولەکە ئایینێکی تایبەت بوو بەنەوەی ئیسرائیلەوە. جولەکە وەکوو عادەت‌و داب‌و نەریتی هەمیشە ییان نەیانتوانی خۆیان‌و کۆمەڵگاکەیان لەگەڵ کۆمەڵگای تازەی مەدینەو گۆڕانکارییە تازەگەری‌و حەقیقەت‌و واقیعەکان دا بگونجێنن، لەهەلە بۆ رەخساوەکانیان سود وەربگرن‌و واز لەئایینی خۆیان بێنن‌و قبوڵی ئایینی تازە بکەن.. کە ئایینی ئیسلامە، شوێنی شیاوی خۆیان وەربگرن‌و سود لەڕۆشنبیری‌و عەقڵ‌و ئەزمون‌و هێزە دەروونی یەکانی خۆیان ببینن، بەڵام وایان نەکردو ئەوەی بەسەریان هات بەسەریان هات! ئەمەش سەرەنجام‌و ئاکامی هەموو کۆمەڵ‌و پێڕێکە کە بیانەوێ لەسەر مێژوو بژین‌و شانازی بەڕەچەڵەک‌و رابردوویانەوە بکەن‌و بەهیواو ئاواتی هەنگوێناوی بژین‌و گرەو لەسەر خڵتەو پڵتەی رابردوویان‌و سەرانی موفلیس‌و روخاویان بکەن.

بێگومان جولەکەکان نەیانتوانی هەبوونی خۆیان بچەسپێنن، ئیثباتی ئەوە بکەن کەنەتەوەیەکی خاوەن بەرنامەو نامەی ئاسمانین‌و باڵا دەست‌و گونجاون بۆ ئەوەی ببنە فەرمانڕەوا ئەوە بیسەلمێنن کەمیراتگرو جێ نشینی پێغەمبەرانی پێشوون، ئەوان بەلای خۆیانەوە یەکتا پەرست بوون، کەچی هیچ بەوە نارازی نەبوون کە عەرەبەکان بتپەرست بوون، هیچ هەوڵێکیان نەدا لەگەڵیان بۆ ئەوەی لەو بتپەرستی‌و نەفامییە رزگاریان بکەن، تەنات هیچ بانگەوازی یەکیان نەکرد بۆ یەکتا پەرستی، لەکاتێك دا

ئەوان بەو یەکتا پەرستی یە لەنەتەوەکانی دی جیا دەکرانەوە هەرچەندە لەبارەی ئەخلاقەوە روخابوونو زۆر خاڵی لاوازیان تێدا بوون.

وێدەچی هۆی سەرەکی بۆ بێدەنگی و بانگەوازی نەکردنیان بۆ یەکتا پەرستی ئەوە بوو بێ، کەئەوان بانگەوازی کردنی غەیری نەتەوەی ئیسرائیلی یان لەئەستۆ نەبوە، بەئەرکی سەرشانی خۆیانیان نەزانیوە کەبانگەوازی نەتەوەکانی تر بکەن بۆ ئایینی پێغەمبەرانی خۆیان، بەڵکوو بەقسەی د. ئیسرائیل ولفنسونو مەریەم جەمیلەی (بەنژاد جولەکەو هاو وڵاتی ئەمریکی و تازە موسوڵمان بوو)، نەتەوەی جولەکە بەدرێژایی مێژوو لەو ئەرکە خۆیان پاراستووەو خۆیان توشی ئەو نارەحەتیە نەکردوە رویان کردۆتە کاسبی کردنو ماڵو سامان کۆکردنەوە، ئەمەش خوو سروشتی جولەکەیە.

بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە ژمارەیەك لەو عەرەبانەی سەربەهۆزی ئەوسو خەزرەج و هۆزی تر بوون، بەشێوەیەکی ئارەزو مەندانەو ویستی خۆیان یان بەهۆی ژنو ژنخوازی یەوە یان بەهۆی پەروەردەبوونیان لە ناو هۆبەو گەرەکی جولەکە نشیندا چوو بوونە سەر ئایینی جولەکەو پەیرەوی ئەو ئایینەیان دەکرد.

بێگومان لەناو جولەکە عەرەبەکان دا هەموو ئەم جۆرە جولەکانە هەبوون، ئەوەتا گەورە بازرگانی جولەکەو شاعیری ناودار کەعبی کوڕی ئەشرەف. کەبە (النضری) دەناسرێ لەهۆزی (طيء) ە باوکی ژنی لەهۆزی (بنو النضير) هێناوە، کەعب باوك عەرەب و دایك جولەکەیە بەجولەکەیی پەروەردە بووەو زۆر لایەنی جولەکایەتی پێوە دیار بووە، ئیبنو هیشام دەڵێ: کەعب پیاوێك بوو لەهۆزی (طيء) و یەکێك بوو لەبنەماڵەی (بەنی

ــهــ ـ دایکــی لــەهۆزی (بنــو النــضیر) بــوو،[١٠٨] هــەروەها هەنــدێ لــەو ئـەرەبانەی کەمندالْیان بۆ نەدەژیا، لەسەر خۆیان نەزر دەکرد ئەگەر کوڕیان ـــێ و بـژی، بیکەنــە جولەکــە، لــەناو شــاری مەدینــە دا ژمارەیــەك عــەرەب ـەبوون لــەم رێگــەوە ببوونــە جولەکــە . ئیمــامی ئــەبو داود (السجــستانی) ـەرشتەی خۆی لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ریوایـەت دەکاو دەڵێ: ئافرەت هـەبوو ـنـدالْی بۆ رانەدەوەستا، ئیتر لەسەر خۆی نـەزر دەکرد ئەگـەر منـدالْی ببـێ و ـژی بیکاتە جولەکە،جاکە (بنو النضیر) لە مەدینـە وەدەرنـران، لـەناویان دا ـۆر منــدالْی ئەنــصارەکان هــەبوون، بۆیــە ئەنــصارەکان رەخنــە یــان گــرت و وتیان ئێمە دەستبەرداری کوڕەکانی خۆمان نابین و نابێ دەرکردنەکە شمولی ـەوان بکا، ئیتر پەروەردگار ئایەتی: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ. (٢٥٦) سورة البقرة﴾.

## هۆزی ئەوس و هۆزی خەزرەج:

بنەماڵــەکانی ئــەوس و خــەزرەج کــە دانیــشتووی مەدینــە بــوون، بەنــژاد دەچــنەوە ســەر هۆزەکــانی ئــوزدی یەمــەنی، شــەپۆلەکانی کۆچــکردن لــە یەمەنــەوە بــۆ مەدینــە لەچــەند ســەردەم و کــاتی جیــا جیــادا ئــەنجام دراون و هۆکارەکانیشیان جوداواز بوون، هەندێ لەو هۆکارانە پشێوی وەزع و حاڵی ناو یەمەن و هێرش کردنی حەبەشییەکان بۆ سەر یەمەن و پاشگوێ خستنی لایەنی ئاوە رۆو ئاودێری بەتایبەتی دوای روخانی بەنداوی مەئریب، بەم پێیە دەتوانین بڵێین هاتنی ئەوس و خەزرەج بۆ مەدینە دوا هاتنی جولەکە

---

[١٠٨] ابن هشام جـ ٢/٥١.

کان بووە واتە: نیشتە جێ بوونی جولەکە لەمەدینەدا پێش نیشتە بوون هۆزی ئەوس‌و خەزرەج بووە،[١٠٩] بنەماڵەکانی هۆزی ئەوس لەناوچەی باشورو خۆر هەڵاتی مەدینە نیشتەجێ بوون کەناوچەی (العوالی) ی یەثریبە، لەکاتێك دا بنەماڵەکانی خەزرەج لەناوچەی ناوەڕاست‌و ناوچەی باکوری مەدینە دا نیشتەجێ بوون، ئەمە ناوچەی خواروی مەدینە دەگرێتەوە، لەدوایانەوە بەروی خۆر ئاوادا هیچ شتێك نەبوو جگە لە (حرة الوبرة). خەزرەجییەکان دەبنە چوار تیرەو بنەماڵە ئەوانیش (مالیك، عدی، مازن، دینار) بوون ئەمانە هەموویان لە بەنی نەجار بوون کە بە (تیم اللاث) ناسراون، بێگومان بنەماڵەی بەنو نەجارییەکان هەموویان لەناوچەی ناوەڕاست کە دەکەوێتە دەورو بەری مزگەوتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نیشتەجێ بوون.

ئەوسییەکان لەناوچە کشت‌و کاڵی‌و بەپیت‌و دەوڵەمەندە کان دا نیشتەجێ بوون، هاوسێ ی گەورەترین‌و گرنگترین هۆزی جولەکە بوون، خەزرەجییەکان لەناوچەیەك دا نیشتەجێ بوون پیت‌و بەرەکەتی کەم تر بوو، هاوسێ ی هۆزێکی گەورەی جولەکە بوون، ئەویش هۆزی بەنو قەینوقاع بوو. هەڵبەتە شتێکی ئاسان نیە ئێستا بتوانین سەرژمێرێکی ورد بکەین دەربارەی ژمارەی پیاوانی ئەوس‌و خەزرەج، وەلێ کەسێك بیەوێ بە شوێن روداوەکانی دا بگەڕێ، لەڕێگەی ئەو شەڕانەی بەشدارییان تێدا کردوە دەتوانێ ژمارەی جەنگاوەرو هێزی جەنگییان دیاری بکا، ئەوەی ئاشکرایە ڕۆژی ڕزگار کردنی مەککە ژمارەی شەڕ کەرانی ئەوس‌و خەزرەج چوار هەزار کەس بووە.[١١٠] ئاشکراشە لەکاتی کۆچکردنی پێغەمبەر (درودی

---

[١٠٩] مكه والمدينه /ص ٣١٥-٣١٦.

امتناع الأسماع بما للرسول من الأنباء والأحوال والحفرة والأتباع للمقديزي.

عوای لەسەربێ) بۆ مەدینە خاوەن قسەو دەست ڕۆییشتوو بالاً دەست بوون لەناو مەدینەدا، جلەوی هەمووکارو بارێکیان بەدەستەوە بوو، لەبەرامبەر ئەوەدا جولەکەکان نەیان توانیوە خۆیان ڕێك بخەن و قسەیان بکەن بەیەك و یەکیەتی خۆیان رابگەیەنن یەکریز لەبەرامبەر دوژمنەکانیان دا ڕابوەستن ئیتر تیرەو بنەماڵەکانیان لەبەرامبەر دوژمنەکانیان پەرتەوازەبون، هەندێکیان پەیمانیان لەگەڵ ئەو سییەکان دا بەستووەو بوونە سوێند خۆرو پاشکۆی ئەوان، هەندێکیشیان لەگەڵ خەزرەجیەکان پەیمانیان بەستووەو سوێند خۆرو هاوپەیمانی ئەوان بوون، لەشەڕو پێکدادانەکان دا زۆر لەعەرەبەکان بێ بەزەیی تر بوون بۆ جولەکە هاو پەیمانەکانی بەرامبەر یان. دژایەتی و دوژمنایەتی و رقەبەری نێوان (بنو القینقاع) و (بنو النضیر) و(بنو قریظە) گەیشتبوە ئەو پەڕی سنورو هەمیشە بەخوێنی سەری یەکتر تینو بوون. سەرەنجام وای لێ هات (بەنو قەینوقاع) زەوی کشتو کاڵیەکانیان واز لێ هێناو رویان کردە پێشەسازی.[111] هەروا لەنێوان هۆزی ئەوس و خەزرەج دا چەندەها شەڕو جەنگی خوێناوی رویان داوە، یەکەمیان شەڕی (سمیر)و دوا شەڕیشیان شەڕی (بوعاث)کە پێنج ساڵ پێش کۆچکردن روی دا.[112] بێگومان هەمیشە جولەکەکان ڕۆڵی فیتنەیی و دوو زمانییان دەگێڕا لەنێوان هۆزی ئەوس و خەزرەجدا تابۆیان بکرایە هەوڵیان دەدا ئەم دوو هۆزە عەرەبە لێك دوور بخەنەوەو پێکەوەیان شەڕو هەرابێ هەمیشە دوژمنی یەکتر بن و شیرو تیر لێك تر بسوون، بۆ ئەوەی نەیانپرژێتە سەر ئەوان. عەرەبەکانیش هەستیان بەم واقیعە کردبوو، بۆیە ناز ناوی (ڕێوی)یان بۆ بەکار دەهێنان، چونکە فێڵی وایان دەکرد ڕێوی فێڵباز پەی پێ نەدەبرد.

---

[111] مكة والمدينة ص ٣٢٢.

[112] مكة والمدينة ص ٣٢٢-٣٢٣.

## بارودۆخی سروشتی:

شاری مەدینەو دەوروبەری لەکاتی کۆچکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دابەش بو بوو بۆ چەند یەکە یەکی کارگێڕی (وحدات اداریه) لەم دائیرانە دا بنەماڵەی عەرەبی و یەهودی دەژیان و هەر دائیرەیەك بۆ بنەماڵەیەك لەبنەماڵەکان بوو، هەموو دائیرەیەك دەبوو بەدوو بەش، بەشی یەکەم بریتی بوو لەزەوی کشتو کاڵی بەخانوو بەرەو دانیشتوانیەوە، بەشی دووەم بریتی بوو لەقەلاّو سەنگەرو پەناگەی پتەو.[١١٣] قەلاّو سەنگەرو پەناگەی جولەکەکان لەمەدینەدا گەیشتبوە پەنجاو نۆ قەلاّ. دوکتور ولفنسون لەبارەی ئەم قەلاّیانەوە دەڵێ: گرنگی ئەم قەلاّیانە لەشاری یەثریب زۆر بوو چونکە لەکاتی هێرشکردنی دوژمن دا ئافرەتو منداڵو پیرو پەککەوتەکان بەئارامی خۆیان تێدا دەحەواندەوەو پیاوە کانیشیان دەچون بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمن، لە ئەم قەلاّو پەناگایانەدا خواردەمەنی و بەرو بومیش تاقەت دەکراو قایم هەڵدەگیرا، چونکە ئەگەر لەدەرەوە بوایە لەوانە بوو بەر هێرشی تالاّن بڕۆ بکەوێ، بۆیە هەمیشە ئەم قەلاّو پەناگایانە شوێنی هەڵگرتنی ماڵو سامانو چەكو بەرو بوم بوو، کاروانی بازرگانییان کەدەگەڕایەوە بارەکانیان لەنزیك ئەم قەلاّیانە دەخستن بۆ ئەوەی لەکاتی تەنگانەدا بتوانن زوو تاقەتی بکەن، لەبەر دەرگای قەلاّکانیش دا بازاڕیان رادەبەستن. قەلاّکان- وەکو زانیومانە- پەرستگایان تێدا بوون، قوتابخانەو پەیمانگاشیان لەخۆ گرتبوون، راخەرو کەلو پەلی ناو ماڵی باشیان تێدا بوون، پێداویستی ژیان، قاپو قاچاغو ئامێری جۆراو جۆریان تێدا دەست دەکەوتن، پڕ بوون لەنوسخەو پەڕاوی تەوراتو شەرحو شیکردنەوەی دەقەکانی. ریش سپی و پیاو ماقولاّنیان تێیان دا کۆدەبوونەوەو گفتو گۆو راوێژی خۆیان تێدا

---

[١١٣] تأريخ اليهود في بلاد العرب د. اسرائيل والفنسون ص ١١٦.

ئەنجام دەدان، هەرکاتێ بیانویستایە پەیمانێك ببەستن رێکەوتنامەیەك مۆر بکەن بۆ جەختکردنەوە دەبوایە سوێندی یاسایی بەو کتێبە پیرۆزانە بخۆن!! (..............)[114] بەدەوری قەڵاکانیان دا دیوارێکی ئەستور هەبوو، دەیانتوانی هەموو کاتێك لەناوەوە دەرگاکانی دابخەن، لەدەرەوەش چەند پەنجەرەیەکیان هەبوو لەناوەوە دەکرانەوە، شاری مەدینە لەم قەڵاو دائیرە قایم و پتەوانە پێك هاتبوو، بەڵکوو دەتوانین بڵێین شاری مەدینە ئەو کاتە بریتی بوو لەکۆمەڵێك گوندی لێك نزیك و لێکەوە دیار، بۆیە قورئان جاری واهەیە شاری مەدینە بە (قری) کە کۆی (قریە) یە ناوزەد دەکا. دەفەرموێ: ﴿مَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى. سورة الحشر (٧)﴾ یان دەفەرموێ: ﴿لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَاءِ جُدُرٍ. سورة الحشر (١٤)﴾[115] (مرة واقم) کەلە خۆر هەڵاتەوە سنووری مەدینەی دیاری دەکرد لەناوچەی (وبرە) ئاوەدان تر بوو، ئەو کاتەی پێغەمبەر کۆچی کرد بۆ مەدینە ناوچەی (حرة واقم) گرنگترین هۆزەکانی جولەکەی تێدا نیشتەجێ بوو، زۆربەیان لە بەنی نەضیرو بەنو قورەیظە بوون، هەندێ هۆزی تری جولەکەشی تێدا بوو. لەهەمان کات دا بنەماڵە سەرەکییەکانی هۆزی ئەوس کە (بنو عبد الأشهل) و (بنو ظفر) و (بنو حارثە) و (بنو معاویة) بوون لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، لەگەڕەکی (بنو عبد الأشهل) دا قەڵاکەیان کەناوی (واقم) بوو لەوێ دا بنیات نرابوو، کە لەدوایی دا (حرة) ئەو ناوەی وەرگرت و بووبە (حرة واقم).[116]

---

[114] لێرەدا شەش دێڕ هەن بەپێویستم نەزانی بیانکوردێنم چونکە دەربارەی شی کردنەوەی وشەی (احمد أطم) دەدوان.

[115] بڕوانە کتێبی (مككة و المدينة) ص ٢٩٤.

[116] منزل الوحي/ محمد حسين هيكل ص ٢٧٧.

## بارو دۆخی ئایینی و مەکانەتی کۆمەڵایەتی مەدینە:

عەرەبەکان بەگشتی لەبارەی ئایین و بیرو باوەڕەوە شوێنکەوتووی قورەیش و دانیشتوی مەککە بوون، قورەیشییەکانیان بەپێشەوای ئایین و رابەری عەقیدەو عیبادەت لەقەڵەم دەداو بەسەرو کارو بەڕێوەبەری کارو باری کەعبەیان دەزانین و بەرێزەوە بۆیان دەروانین، ملکەچی دیاردەی بتپەرستی بوون: کەلە سەرانسەری جزیرەی عەرەبی دا باو بوو، ئەوبت و صەنەمانەیان دەپەرستن کەقورەیش و دانیشتوانی نیوە دوورگەی عەرەبی دەیانپەرستن وەلێ پەیوەندییان بۆ هەندێ لەبتەگەورەکان بەهێز تر بوو لەهەندێکی تر یان، بۆ نموونە (بت) ی (مناة) لای مەدینەیی یەکان رێزێکی تایبەتی هەبوو، کونترین (بت)ی ناسراویان بوو، هۆزی ئەوس و خەزرەج لەبتەکانی تر، زیاتر رێزیان لێ دەگرت و بەگەورە تریان دەزانی، بەهاوەڵی خودایان حسیب دەکرد. شوێنەکەشی لەبەرامبەر کێوی (قدید) کە کێوێکە لەنێوان مەککەو مەدینە بەلای کەناری دەریاوە، هەروەکوو بتی (اللات) کەتایبەت بوو بە دانیشتوانی (الطائف). (بت) ی (العزى) ش تایبەت بوو بە دانیشتوانی مەککە. دانیشتوانی ئەم شارانە زۆر هۆگری بتە تایبەتەکانیان بوون، زیاتر رێزیان لێ دەگرتن،هەندێکیش لەدانیشتوانی مەدینە لەبەردو داریان لەشتێکی تر بتێکی تایبەتی بۆ خۆی لەماڵەوە هەڵنابوو ناوی (مناه) یان لێ نابوون. بۆ نموونە عەمری کوڕی (الجموح) پیاو ماقوڵ و ریش سپی بەنی سەلەمە پێش ئەوەی ئیمان بێنێ بتێکی لەو جۆرە هەبوو.

لەحەدیسێك دا کەئیمام ئەحمەد لەعوروەو ئەویش لە عائیشەوە لەبارەی تەفسیری ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ. سورة البقرة (١٥٨)﴾ دەفەرموێ: یاریدە دەران پێش ئەوەی موسوڵمان بن، پەرستشیان

بۆ (مەنات) دەکرد، ئەو گەورەبتەی کەلای (المشلل) عیبادەتیان بۆ دەکرد هەرکەسێکیان ڕێ‌وو ڕەسمی پەرستشکردنی (بت)ی مەناتی جێ بەجێ بکردایە ئیتر لەوە دوا تەوافی صەفاو مەروەی بە پێویست نەدەزانی. لەم بارەوە لە پێغەمبەریان پرسی وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە لەسەر دەمی نەفامی دا هاتوچۆی نێوان گردی صەفاو مەروە مان بەپێویست نەدەزانی‌و خۆمان لێ دەدزیەوە. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ. سورة البقرة (١٥٨)﴾ نازڵ کرد. ئێمە لەمێژوودا نەمان دیوەو نەمان زانیوە کە دانیشتوانی مەدینە بتێکی تایبەتی بەناو بانگی وەکوو (اللات) و (مناة) و (العزی) یان هەبووبێ، یان وەکوو (بت) ی هوبەل بۆ پەرستش بۆ کردنی خۆیان بەسەردا کوشمەڵە بکەن‌و ڕێگای دووری بۆ ببڕن‌و لەدەرەوەی مەدینەوە بێنە زیارەتی، وادیارە دیاردەی (بت)و بتپەرستی لەمەدینەدا بەر فراوان نەبوو وەکوو لەمەککەدا دەبیندرا، لەمەککەدا هەموو ماڵێک‌و هەموو خێزانێک بتێکی تایبەتی هەبوو، بت‌و صەنەمی جۆراو جۆر بەناو شاری مەککەدا دەگێڕ دران بۆ کڕین‌و فرۆشتن، بەڵام لەمەدینەدا ئەو دیاردەیە نەدەبیندرا. دانیشتوانی مەدینە چاو لێکەرو شوێنکە وتەی مەککەیی یەکان بوون لەبتپەرستی داو پاشکۆی ئەوان بوون. دانیشتوانی مەدینە ساڵانە دوو ڕۆژیان هەبوون یارییان تێدا دەکردن‌و دەیانکردنە جەژنی خۆیان، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆچی کرد بۆ لایان پێ ی فەرموون خودا ئەو دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بەڕۆژی باشتر، ئەو دوو ڕۆژە باشترەش ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان‌و ڕۆژی جەژنی قوربانە.

هەندێ لەراڤەکەرانی فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتویانە: ئەو دوو ڕۆژەی مەدینەیی یەکان دەیانکردنە جەژن ڕۆژی نەورۆزو ڕۆژی

میهرەجان بوون وادیارە لەفارسەکانیان وەرگرتووە.[١١٧] لەلایەکی ترەوە قورەیشییەکان دانیان بەگەورەیی بەگزادەیی هۆزی ئەوس و هۆزی خەزرەج دا دەنا، ئەوانیان بە (بنو قحطان) دەزانی: کە عەرەبی عاریبەو رەسەنن، ئافرەتیان دەدانێ ئافرەتیان لێ دەخواستن، هاشمی کوڕی (عبد مناف) کە گەورە پیاوی قورەیش بوو لەخێڵی (بنو النجار) ژنی هێنا بوو، سەلمای کچی عەمری کوڕی زەیدی مارە کردبوو: کە لەبنەماڵەی (عدی) ی خێڵی (بنو النجار) کە بەرەبابێکی هۆزی خەزرەجن. وەلێ لەگەڵ ئەوەش دا قورەیشییەکان خۆیان لەئەوس و خەزرەج بەگەورە ترو رێزدا رتر دەزانی. ئەوەتا (عوتبەو شەیبەو الولید) کوڕانی رەبیعە کەلەرۆژی بەدردا داوای زۆرانبازی و مەیدانبازییان کرد، کۆمەڵێك گەنج لەیاریدەدەران بۆ یان چوونە مەیدان، پێیان گوتن ئێوە کێن؟ وتیان ئێمە کۆمەڵێك گەنجی ئەنصارین، کوڕانی رەبیعە وتیان ئێمە ئیشمان بەئێوە نیە، ئەمجار یەکێکیان بانگی کرد ئەی موحەممەد هاو کوفی خۆمان لەقورەیش بۆ بنێرە مەیدان، بێزمان نایە شیربازی و مەیدانبازی لەگەڵ ئەمان دا بکەین. ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەی عوبەیدەی کوڕی (الحارث) هەڵسە، ئەی حەمزە تۆش خۆت ئامادە بکە، هەڵسە عەلی تۆش لەگەڵیان بچۆ، جاکە بۆیان چوونە مەیدان و لێیان نزیك بوونەوەو ناوی خۆیان راگەیاند، وتیان: بەڵێ ئەمانە هاوکوفی ئێمەن و رێزدارن، قورەیشییەکان بەچاوێکی سوکەوە سەیری کاری وەرزێری و کشت و کاڵ کردنیان دەکرد، کە دانیشتوانی مەدینە

---

[١١٧] دەڵێم: وێدە چێ جەژنی نەورۆزی دانیشتوانی مەدینە لەجولەکەوە وەرگیرا بێ، چونکە هەر لەکۆنەوە بەنو ئیسرائیلی یەکان رۆژی نەو رۆزیان کردوە بەجەژن تەنانەت کێ بڕ کێ ی نێوان حەزرەتی موساو ساحیرەکانی فیرعەون لەو ڕۆژەدا ئەنجام دراوە، ئەو کاتە بەو ڕۆژەیان گوتوە (یوم الزینە).

زۆر جۆری هەبوەو وردەکاری زۆری تێدا کراوە، زانینی هەموو لایەنەکانی زۆر زەحمەتە، دانیشتوانی مەدینە ئەزمونی زۆرو رێگای جۆراو جۆریان زانیوە بۆ پەرەپێدان و چاککردنی بەرو بوومی خورماو بەکار هێنانی بەچەند شێوازێك، ئەمانەشیان لەئاکامی ئەوەوە بۆ پەیدا ببوو کە لە مێژ ساڵ بوو ئەوان لەگەڵ خورما ئاشنابون و ئیشیان لەسەر کردبوو، یەکێك لەو تەجربەو تاقیکردنەوەیە نێرومێ کردنی دار خورما بوو، کەپێ ی دەڵێن: (تأبير النخل) ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەلە مەدینەدا جم و جۆڵی بازرگانی نەبوەبەڵکوو تا ئەندازەیەك جم و جۆڵی بازرگانی تێدا بووە بەلام نەگەییشتۆتە ئاستی جم و جۆڵی بازرگانی کردنی مەککەیی یەکان: کەولاتەکەیان چەقەن و رەقەن و بێ کشت و کاڵ و بەرو بوم بووە، ناچار بوون بازرگانی خۆیان بەهێز بکەن و بەهاوێن کاروانیان بەرەو شام و بەزستان بەرەو ولاتی یەمەن بنێرن و سەرگەرمی مامەڵەی کڕین و فرۆشتن بن!

لەمەدینەدا بڕی پیشەسازی هەبوو بەزۆری جولەکەکان خەریکی بوون، وێدەچێ فێربوونی ئەم پیشەسازی یەیان لەولاتی یەمەنەوە گواستبێتەوە، ئیتر جولەکەکان دەستبەرداری ئەو لایەنە پیشەسازییە نەبوون هەتا لەدوایی دا لەمەدینە وەدەرنران، جولەکەکان لەبواری پیشەسازی دا دەست رەنگین و کارامە بوون زۆربەی بەنو قەینوقاعییەکان ئاڵتون چی بوون و دەوڵەمەند ترین هۆزو تیرەی جولەکەی ناو مەدینەو دەوروبەری بوون، ماڵەکانیان پڕ بوو لەکالای جوان و بەنرخ، پارچە زێڕو زیوی زۆرو جۆراو جۆریان لەماڵ دا پەزمەندە کردبوو، هەرچەندە ژمارەیان زۆر نەبوو. سروشتی ولاتی مەدینە کەخاوەنی زەوی و زاری بەپیت و ئاوی زۆرو شیرین بوو، شیوو دۆڵی زۆری لێ هەڵکەوتوون کە لافاوو جۆگەو جۆباری زۆری تێدا دەکشێن و زەوی یەکانی ئاو دەدەن و باغ و زرعاتەکانی تێراو دەکەن،

بەحوکمی ئەوەی ولاتەکەیان ولاتێکی کشتو کاڵی بوو، بژێوی خۆیان ـەرێگەی فەلاحەتەوە دابین دەکردو پشتیان بەوە دەبەست. ئەم تێڕوانین و بەسوکزانینەی فەلاحەت لەوتەکەی ئەبو جەهل دا بەئاشکرا دەردەکەوێ کاتێك برینـدار کرابوو بەدەستی کوڕانی عەفرا کە لەیاریدە دەران بوون، ـەگەڵیانەلاودا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود چووە سەری وتی (وغير أكار قتلني) خۆزگە پیاوێك بیکوشتمایە وەرزێرو فەلا نەبوایە.[118]

## باری ئابوری و ژیاری شاری یەثریب:

ولاتی یەثریب بەسروشت ولاتێکی کشتو کاڵی بوو، زۆربەی دانیشتوانەکەی بوبژێوی خۆیان پشتیان بە کشتو کاڵ کردن دەبەست، گرنگترین بەروبوومی مەدینە خورماو ترێ بوو، باغو باغاتی خورماو ترێی زۆر تێدا بوون، باغە مێوی وای تێدا بوون مێوەکانی کەپریان بۆ کرابوو، هەروا باغە خورمای یەك فاقو دوو فاقو لەجۆرەها جۆر، لەکشتو کاڵیش دا دانەوێڵەی گەنمو جۆ و زوڕاتو شتی تریش هەبوە، خورما بەتایبەتی لەساڵی گرانیو بێ بارانی دا دەبوە بژێوو قوتی دانیشتوان، وەکو عوملەیەك وابوو لەکاتی پێوستی دا مەدینەیی یەکان کالای تریان پێ دەکڕی، تەنانەت دەتوانین بڵێین: خورما سەرچاوەی خێرو بێرێکی زۆر بوو لەژیانی مەدینەیی یەکان دا. بەرو بوومەکەیان دەکردە بژێو قەدو لقەکانیان بۆ خانو کردن بەکار دەهێنا، دەیانکردە ئامێری پیشەسازیو بۆ سوتەمەنیو ئالێکی ئاژەلەکانیان سودیان لێ وەردەگرت، خۆرمای مەدینە

---

[118] محمد طاهر الفتني لە (مجمع بحار الأنوار) دا دەڵێ: (اكار) واتە: کشتو کاڵ کەر، فەلا. بەلای عەرەبی قورەیشەوە ئەو کارە کارێکی بێ رێز بووە. ج ١/٦٨.

یەکی لەو شیوە ئاودارو بەپیتانەی دۆڵی (العقیق)ە. کە هاوێنە هەوارو سەیرانگای مەدینە بوو، ئاوی لێ هەڵدەقولاّو بەباغو باغات رازابووەوە، تێکڕای زەوی یەکەی گونجاو بۆ بیر لێدانو ئاو هەڵگوازتن. باغی جۆراو جۆری وەبەر هاتبوون، هەیانبوو شورای بۆ کرابوو، کە مەدینەیی یەکان پێیان دەگوت (الحائط) واتە دیواری باغ. زۆر لەبیرە ئاوەکانی بەوە بەناو بانگ بوون کەئاوەکانیان شیرینو سازگارە، جۆگاو پلوسكو دوێلاّویان هەبوون، ئاویان بەناعور هەڵدێنجاو دەیانگەیاندە باغەکانیان. دانەوێڵەی سەرەکییان گەنمو جۆ بوو، سەوزەو باقلاواتیان زۆر بوو، چەند یاساو رێسایەکیان هەبوو بۆ کشتو کاڵکردن وەکوو (مزارەعە، موئاجەرە، موزابەنە، موحاقەلە، موخابەرە، موعاوەمە).[119]

ئەمانە چەند شێوەو شێوازێك بوون کە مەدینەیی یەکان کشتو کاڵی خۆیان بەو شێوانە ئەنجام دەدا، ئەمجار کەئیسلام هات هەندێ لەم شێوانەی بەپەسەند زانیو هەندێکیانی قبووڵ کردو چاکسازی لە هەندێکیان دا کرد. دراوی مامەڵە پێکراوی مەدینەو مەککە یەك دراو بوو، لەوە پێش ئاماژەمان بۆ کرد. دانیشتوانی مەدینە زۆرتر گرنگیان بە ئامێری پێوانە دەداو زیاتر لەدانیشتوانی مەککە پێویستیان بەو جۆرە ئامێرانە بوو، چونکە دانیشتوانەکانی زیاتر خەریکی بەرهەمهێنانو کڕینو فرۆشتنی دانەوێڵەو میوەجات بوون، ئەو ئامێرانەی بۆ پێوانە لەمەدینەدا باو بوونو بەکار دەهێندران، (مودد) و (ربە)و فەرقو عەرقو ویسق (تەغار) بوون، ئامێری کێشانیش دیرهەمو ثەقافو دانقو قیراطو نەواتو ریطلو قنطارو ئوقیە بوو.

---

[119] لەکاتی چاپکردن دا مانای ئەو وشانەشی دەکرێتەوە.

ولاَتـی مەدینـە وێـڕای ئـەوەی خاكەكـەی بـەپیتو ئـاو داربـوو بـەروبوومی بەشـی خۆیـانی نـەدەكرد، دانیـشتوانەكانی ناچـار دەبـوون هەنـدێ جـۆری خۆراك لەدەرەوە بێنن.

جۆرێـك ئاردیـان لـەدەرەوە دەهێنـا پێیـان دەگـوت: (دقیـق الحـواری) یـان (درمكه)، هـەروا رونو هـەنگوینیان لەشـامەوە دەهێنـا، لەفەرمودەیـەك دا كـە تـیرمیـذی لەقـەتادەی كـوڕی (النعمـان) ەوە ریوایـەتی كـردوە دەڵـێ: خواردەمـەنی ئـەهلی مەدینـە بـەزۆری خورمـاو جـۆ بـوو، ئەگـەر یـەكێك دەوڵەمەند بوایە پیاوی خۆی دەنارد لەشام (درمكه) یان بۆ دێنا. ئەم جۆرە خواردەمەنییـە تایبـەت بـوو بـەپیاوە دەوڵەمەندەكـە خۆیـەوە، بـەلاَم مـاڵو منداڵەكـەی خۆراكیـان جـۆو خورمـا بـوو! ئـەم سەرگورشـتە رۆشـنایی یـەك دەخاتـە سـەر چـۆنیەتی خـۆراك لەمەدینـەدا، ئـەو حاڵـەتو چـۆنیەتیەی كـە گۆڕو گومەت دوای كۆچكردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەیدا نەبوو، هـەروا رۆشنایی یەك دەخاتە سەر ئاستە جیا جیا كانی باری ژیان.جولەكە وەكو دابو نـەریتو سروشـت مێـژوویان دەری دەخـا لەهـەموو ولاَتێـك دا لەعەرەبـەكان دەوڵەمەنـد تـر بـوون، عەرەبـەكان بـەهۆی سروشـتی سارانشینیانەوە زۆر بیریان لەدوا رۆژی خۆیان نە دەكردەوە تاماڵو سامان بۆ ئەو ڕۆژانە پەزمەندە بكەن، ئەوان بەسروشت ئـەهلی سـەخاوەتو نانبـدە بـوون، زۆر جـار ناچـار دەبـوون بـچن پـارە لەجولەكـەكان قـەرز بكـەن، زۆر جاریش ئەم قەرز كردنە بەسودو بەرەهن بووە دانیشتوانی مەدینە ثەروەتو سامانێكی زۆریان لەحوشترو رەشە ولاَخو مەڕو بزن هـەبوو، وشـتریان بـەكار دەهێنا بـۆ ئـاو دێـری زەویو زار، بـەو وشترانەیان دەگـوت (الأبل النواضح) حوشتری ناعور، هەندێ خەڵك پاوانی هەبوو لەو پاوانانە (زغابة) و (الغابة) خەڵك داری سوتانی لێ دەستەبەر دەكـردن، مـەڕو مالاَتیـان تێـدا دەلەوەڕانـد،

ئەسپیان هەبوو بۆ شەڕ بەکاریان دەهێنا، هەرچەند بەرێژەی مەککەیی یە کان ئەسپیان نەبوو، بەنو سەلیم بەوە مەشهور بوون، کەزۆر گرنگیان بەراگرتنی ئەسپ و بە خێو کردنیان داوە، لەدەرەوەڕا دەیانهێنان.

لەمەدینەدا چەند دوکان و بازاڕێك هەبوون، هەرە گرنگیان بازاڕی بەنو قەینوقاع بوو، مەڵبەندی سەرەکی خشڵ و زێڕو زیوو بوو، بازاڕی کوتاڵفرۆشیش هەبوو، لەمەدینەدا چەند قوماشێکی تەنراوی لۆکەو حەریر هەبوو، سەرچەف و پەردەی ڕەنگاو ڕەنگ، عەتر فرۆشەکان جۆرەها عەترو میسکیان دەفرۆشت، هەیانبوو تەنیا بازرگانی لەعەنبەرو جیوە دا دەکرد، چەند جۆرە مامەڵەی تێدا دەکرا هەندێکیان ئیسلام بەپەسەندی زانین و هەندێکیانی ڕەتکردنەوە، (بيع النجش) و ئیحتیکار و بەپیرەوە چوونی کاروان بۆ دەرەوەی شارو فرۆشتنی ئاژەڵی گوان هەڵاو ساو بەهۆی نەدۆشینی شیرەکەی، فرۆشتنی بەقەرزی بێنەو نیە، فرۆشتنی شارنشین بەسارا نشین، فرۆشتنی (مجازەفە) فرۆشتنی (المزابنة) و (المحاضرة) هەندێ لەئەوسی یەکان مامەڵەی ڕیبا ئامێزیشیان دەکرد هەرچەند بەڕێژەی جولەکەکان نەبوو. بێگومان ژیان لەمەدینە دا گەشەی کردو پێشکەوت، خۆشگوزەرانی پەیدا بوو، دانیشتوانەکەی بوونە چەند چین تەبەقەیەك، هەندێ خانوو حەوشەو باغیان تێدا بوون، هەیانبوو ئاوی شیرین و گوارای لەحەوشەکەی دا هەبوو پیاڵەو پەرداخی لەشوشە دروستکراوو لەبەرد دروستکراویان بەکار دەهێنا چرای جۆراو جۆریان هەبوون کیتەڵەو جەڕەیان بەکار دەهێنان، لەئیشی ناو ماڵ و کشت و کاڵ دا دەوڵەمەندەکانیان (بەتایبەتی جولەکەکان) ئەسبابی ناو ماڵیان زۆر هەبوو،

جۆرەها خشڵ وەکوو بازنەو دەمە لۆج وخڵخاڵو گوارەو هەنگوستیلەو ئەڵقەو دەستەوانە لەزێرو لەمیوی ظەفار. رستن و تەنین کاری سەرەکی خان و بەرەو دارتاشی و نەقاری لەو جۆرە پیشەسازییانە بوون کەپیش کۆچکردنی پێغەمبەر لەمەدینەدا باو بوون.

## بارو دۆخێکی ئاڵۆز توشی پێغەمبەر بوو لەمەدینە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوەڵانی کەلەشاری مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، وەنەبێ لەشارێکەوە کۆچیان کردبێ بۆ گوندێك، بەڵکوو لەشارێکەوە کۆچیان کرد بۆ شارێك، هەرچەند شاری کۆچ بۆ کراو لەزۆر لایەنی ژیان و دیاردەی شارە ستانی یەوە ئاڵۆز تر بوو، ئەو بارو دۆخانەی لەو شارەدا هەبوون، ئەو روداوانەی بەرەو روی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بونەوە زۆرو هەمە جۆرو ئاڵۆز بوون چونکە مەدینە زۆر جۆر ئایین و کۆمەڵگەو رۆشنبیری جۆراو جۆری تێدا هەبوون، زۆر ئەستەم بوو ئەم هەموو ئایین و کۆمەڵگاوو روشنبیریانە لەقاڵبی بیرو باوەری تازەدا بتوێنرێتەوە، یەك بانگەواز بیان بۆ بکرێ. ئەمە هەر لەتوانای پێغەمبەرێکی لەخودا وە پشتگیری کراو دا هەیە، ئەو پێغەمبەرەی خودا حیکمەت و دانایی پێ بەخشی بوو هێزی یەکخستن و تەبایی خستنە ناو چەند کۆمەڵگاو جۆری ئادەمیزادی پێ بەخشی توانی چەند هێزی دژ بەیەك بکاتە براو پشتگیری کەر بۆ یەکتری. خۆشەویستی ئەو زاتەی خستە دڵی شوێنکەوتوانی یەوە. بۆیە خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِن يُرِيدُواْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللّهُ هُوَ الَّذِيَ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ. سورة الأنفال (٦٢)﴾.

# پێغەمبەر لەمەدینە

## دانیشتوانی مەدینە چۆن پێشوازییان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کرد؟

یاریدە دەران هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەریان لە مەککەوە بۆ مەدینە بیست، کەوتنە چاوەڕوانی بۆ گەییشتنی، هەموو ڕۆژێ دوا نوێژی بەیانی دەچوونە دەرەوەی شاری مەدینە، چاوەڕوانی گەییشتنی پێغەمبەر یان دەکرد، تاگەرمایان لێ دەهات و ناچار دەبوون خۆ بکوتن بۆ ژێر سێبەر، ئەوجا دەگەڕانەوە بۆ ناو شارو دوچوونەوە ماڵی خۆیان، کاتەکەش کاتی هاوین و گەرما بووە!!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کاتێك گەییشتە مەدینە، خەڵکە چاوەڕوانی کەرەکان لەبەر گەرما گەڕابوونەوە بۆ ماڵی خۆیان، جولەکەکان چاوەڕوانی و تامەزرۆیی ئەنصارەکانیان بۆ دیتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەزانی و ئاگایان لێ بوو. یەکەم کەس، کە پێغەمبەری بینی لەمەدینە پیاوێکی جولەکە بوو، کەبینی خێرا هاواری کردو یاریدە دەرانی لەگەییشتنی زاتی بەڕێزی ئاگادار کردەوە، ئیتر یاریدە دەران لەماڵ هاتنە دەرەوەو راجمین بۆ لای ئەو شوێنەی پێغەمبەری لێ بوو کەلەژێر دارخورمایەك دا بوو ئەبو بەکریشی لەگەڵ بوو، ئەوو پێغەمبەر لەتەمەن دا دوسێ ساڵێکیان نێوان بوو، زۆربەی یاریدەدەران لەوەپێش بەخزمەت پێغەمبەر نەگەییشتبون و نەیاندیبوو، لێیان کۆبوونەوە، زۆربەیان پێغەمبەرو ئەبو بەکر یان لێك جیا نەدەکردەوە، نەیاندەزانی کامە پێغەمبەرەو کێ ئەبو بەکرە، ئەبو بەکر هەستی بەوە کرد، بە ڕێداکەی سێبەری بۆ کرد، ئەمجار بۆ خەڵکەکە

دەرکەوت کامەیان پێغەمبەرە!![١٢٠] نزیکەی پێنج سەد کەس لەئەنصارەکان پێشوازییان لە پێغەمبەر کردو بەرەو پیری چوون تابە خزمەتی گەیشتن، ئەمجار ئەنصارەکان بە پێغەمبەرو ئەبو بەکریان گوت تەشریفتان بەخێر بێن و فەرموون بڕۆن ئەمین بن لەناحەزو دوژمن، چی بفەرموون بەسەر چاو جێ بەجێ دەکرێ، ئەمجار پێغەمبەرو هاوەڵی خۆشەویستی کەوتنە ناو ئاپورەی جەماوەرەوەو بەرەو شوێنی تایبەت بەڕێ کەوتن، ئیتر هەموو دانیشتوانی مەدینە لەماڵ هاتنە دەر بۆ بینینی زاتی پاکی، تەنانەت منداڵی ئەنصارەکان لەسەر بانەکانەوە دەیان بینی و دەیانگوت: کامەیان ئەوە؟ کامەیان ئەوە؟! ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: لەژیانما دیمەنی ئاوام نەبینیوە لەکاتی گەیشتنی پێغەمبەرو ئەبو بەکر بەشاری مەدینە دانیشتوانەکەی بەژن و پیاوو گەورەو بچوکەوە لەسەر ڕێگاو جادەو کۆڵان و سەر سوێ بانەکانیان چاوەڕوانی پێغەمبەر یان دەکردو دەیانەویست چاویان بەبینینی ڕۆشن بێتەوە، هەموو تێکڕا دەیانگوت (الله اکبر) پێغەمبەر هات (الله اكبر) موحەممەد هات. (الله أكبر) موحەممەد هات . (الله اكبر) پێغەمبەری خودا هات.

بەرائی کوڕی عازیب کەئەو کاتە منداڵ بوو، دەڵێ: ئەو کاتەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشتە مەدینە کەیف خۆشی یەك ڕوی لەخەڵکەکە کرد، نەمدیوە بەهیچ شتێکی تر ئەوەندە کەیف خۆش بن، تەنانەت منداڵە وردکەش دەیانگوت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشت.[١٢١] هەموو موسوڵمانەکان تێکڕا (الله اکبر) یان دەکرد لەخۆشی هاتنی پێغەمبەر، لەژیانیان دا ئەوەندە کەیفوخۆشیان بەخۆوە نەبینیوە، شاری مەدینە دەم

---

[١٢٠] سيرة ابن هشام جـ ١/ ٤٩٢.

[١٢١] الجامع الصحيح للبخارى (باب مقدم النبي ص واصحابه الى المدينة).

بەپێکەنین و لەبەرگی ئالاو والآدا خۆی دەنواند، کچە یاریدەدەرەکان بەشەوق و زەوقەوە سرودی

طلع البدر علينا من ثنيات الوداع

وجب الشكر علينا ما دعى لله داع

أيها المبعوث فينا جئت بالأمر المطاع[١٢٢]

---

[١٢٢] ئیبنو کەثیر جـ ٢/ ٢٦٩. بەیهەقی بەروشتەی خۆی لەئیبنو عەبباس و عائیشەوە. ئیبنو قەییم دو دێرە شیعری یەکەمی بۆ کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەغەزای تەبوك ریوایەت کردون، دەڵێ: کە پێغەمبەر لەغەزای تەبوك گەڕایەوە بۆ مەدینە خەڵکەکە بەپیریەوە چون و ئەم سرودانەیان دەگوت، ئەمجار ئیبنو قەییم دەڵێ: هەندێ ریواتکەر وای بۆ چون بۆ چونە کەشیان ئاشکرایە، چونکە (ثنيات الوداع) لەلای شامەوەیە ئەو کەسەی لەمەککەوە بێ بۆ مەدینە نای بینێ و پێشی دا ناڕوا مەگەر رو بکاتە شام و بۆ ئەوێ بچێ. زاد المعاد جـ ١٠١/٢ وەلێ ئەوەی مەشهورو بلاوە ئەوەیە ئەم سرودە کاتێك خوێندراوەتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەککەوە چووە بۆ مەدینە، وێدەچێ هەموو نووسەرانی ژینامەی پێغەمبەر لەسەر ئەوە کۆك بن، لەسرودەکەدا چەند شایەتێکی ناو خۆیی هەن ئەوە دەگەیەنن کەئەم شیعرانە لەیەکە مجاری چوونی پێغەمبەر بۆ مەدینە خوێندراونەوە، چونکە ئەو گیانی فەرەح و کەیفخۆشی یەی زاڵە بەسەر شیعرەکان دا ئەوە دەگەیەنێ کەشیعرەکە لەکاتی گەیشتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەیەکەمجار دا گوترابن.

لەلایەکی ترەوە چەند (ثنيات الوداع) یك لەدەوری مەدینە هەن، ئیتر چ قەیدی هەیە ئەوەی لەمەککە وە دێ بە (ثنية الوداع) یك دابێ کەدەکەوێتە دەروازەی مەدینە، تەنانەت ئەو بەرەو خوارکەی لێوەی دەچی بۆ بیری مەعونە ولەجنوبی خۆر ئاوایەوە پێی ئەگوترێ (ثنية الوداع). لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی مەدینە کەمیوانیان بەرێ دەکردن بۆ لای شام لە (ثنية الوداع) یکەوە بەرێیان دەکردن کەکەوتبوە لای شام دەی لەهەمان کاتدا بۆیان هەبوو کەلە (ثنية الوداع) لای رێگەی مەککەوە ئەو میوانانە بەری بکەن کە دەچوون بۆ مەککە.

## مزگەوتی قوباء و یەکەم ئەنجامدانی نوێژی هەینی لەمەدینە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چوار ڕۆژ لەقوبا و مایەوە، لەوێ مزگەوتێکی بنیات نا، بەیانی ڕۆژی جومعە لەوێ دەرچوو کاتی جومعە لەناو خێڵی بەنی (سالم) ی بەنی عەوف بوو لەمزگەوتی ئەوان دا نوێژی هەینی خوێند، ئەوە یەکەم نوێژی هەینی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینە ئەنجامی دا.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەرەو ناو شاری مەدینە کەوتە ڕێ بەدەم ڕێگاوە دانیشتوانەکەی کۆمەڵ کۆمەڵ پێشوازییان لێ دەکردو داوایان لێ دەکرد ببێتە میوانیان و گەورەیان بکا، دەیانگوت: تەشریفت لامان بمێنەوە بە گیان و ماڵ پارێزگاریت دەکەین. هەوساری حوشترەکەیان دەگرت و لێی دەپاڕانەوە، ئەویش دەیفەرموو: واز لەحوشترەکە بێنن ڕێشمەکەی بەرەڵا بکەن ئەو بۆ خۆی فەرمانی پێ کراوە لەکوێ دەوەستێ، چەند جارێك ئەوە دووبارە بووە، جا کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلای خێڵی بەنی (النجار) دا تێپەڕی کچەکانیان دەفیان لێ دەداو دەیانگوت:

نحن جوار من بني النجار    ياحبذا محمد من جار

ئێمە کچۆڵەی بەنی نەجارین ئای چەندمان پێ خۆشە (محمد) ببێتە جیرانمان، ئیتر تەشریفی بەسواری حوشترەکەی ڕۆیشت هەتا گەییشتە هۆبەی بنەماڵەی مالیك لەخێڵی بەنی نەجار، ئیتر حوشترەکەی لەشوێنێك کە ئەمڕۆ دەرگای مزگەوتی مەدینە یە چوکی دادا. لەو دەمەدا ئەو شوێنە شوێنی مشتاخە خورما بوو، خورمایان تێدا وشك دەکردەوە ملکی دوو منداڵی هەتیو بوو لەخێڵی بەنی نەجار کە دەبوونە خاڵوانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەوشترەکە دابەزی ئەبو ئەییوب (خالدی

کوڕی زەیدی نەجاری‌و خەزرەجی) کەل‌و پەلەکانی هەڵگرت‌و بردنی لەماڵی خۆی دای ناو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بوو بەمیوانی، ئەبو ئەیبوب لەخۆشیانا نەیدەزانی چی بکا، زۆر زێدە رۆیی کرد لەمیوانی کردنی‌و رێز پێدانی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەقاتی خوارەوەی ماڵی ئەبو ئەیبوب دا نیشتەجێ بوو، ئەبو ئەییوب پێ ی ناخۆش بوو ئەو خۆی‌و خاوو خێزانی لەقاتی سەرەوە بن‌و پێغەمبەر لەقاتی خوارەوەبێ، داوای لە پێغەمبەر کرد ئەو تەشریفی بچێتە قاتی سەرەوەو ئەوان خۆیان بێنە قاتی خوارەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموی ئەی ئەبو ئەییوب! بۆ ئێمەش‌و بۆ ئەوانەی لەگەڵم دان‌و بۆ ئێوەش کەلەسەر مانەوەن واگونجاوەو لەبارە ئێمە لەقاتی خوارەوە بین. ئەبو ئەییوبی ئەنصاری دەوڵەمەند نەبوو، ماڵ‌و حاڵی بۆ میوانداری نەدەگونجا، وەلێ هێندەی پێ خۆش بوو: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەماڵی ئەودا دا بەزیوە، هێندەی گرنگی بەم رێز لێنانە دەداو هێندە سوپاس گوزار بوو کەخودا ئەم سەروەرییەی پێ بەخشیوە، لەخۆشیان نەیدەزانی چی بکا، خۆشەویستی ئیلهام بەخشە، ئەو خۆشەویستی یەی ئەو بۆ پێغەمبەر زۆر جۆر شێوازی خزمەتکردن‌و دابینکردنی راحەت‌و ئارامی بۆ پێغەمبەری فێر کردبوو، کە جگە لەخۆشەویستی هیچ شتێکی تر ئەو هەڵس‌و کەوتەی بەئەبو ئەییوب نەدەکرد. ئەبو ئەییوب دەڵێ: ئێمە خواردنی ئێوارەمان بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دروست دەکردو بۆ مان دەنارد، جاکە بەرماوەکەی بۆمان دەهاتەوە، من‌و ئوم ئەییوب دەمانەویست بزانین کام شوێنە دەستی پێغەمبەری وێ کەوتووە لەوەمان دەخوارد، دەمانەویست خێرو بەرەکەتمان دەست بکەوێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

لەقاتی خواروی خانوەکە دابوو ئێمەیش لەسەرەوە بووین، رۆژێك کوپە ئاوەکەمان شکاو ئاو بڵاو بووە، لێفەو پێخەفمان نەبوو جگە لەپارچە قەریفەیەك منو ئوم ئەییوب پارچە قەدیفە کەمان هێنا ئاوەکەمان وشك دەکردەوە لەترسی ئەوەی نەبادا ئاوەکە دایداتە خوارەوەو دڵۆپە بەر پێغەمبەر بکەونو ئازاری توش بێ.

## ☙ بنیاتنانی مزگەوتی پێغەمبەرو خانو بۆ خۆیو خێزانی:

یەکەم شتێك کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینە بیری لێ کردەوە ئەنجامی بدا دروستکردنی مزگەوتێك بوو بۆ کۆبونەوەی موسوڵمانانو خودا پەرستی تێ یدا، بۆیە ویستی لەو شوێنەدا کەوشترەکەی چۆکی دادەدا مزگەوتێك بنیات بنێ، بۆ ئەم مەبەستە بانگی خاوەنی ئەو زەوییەی کرد کەلەوەپێش شوێنی مشتاخە خورما بوو، هی دوو کوڕی هەتیو بوو، مامەڵەی لەگەڵ کردن، کەلێیان بکڕێو بیکاتە مزگەوت، ئەوانیش ویستیان بەخۆڕایی بیبەخشن بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەڵام پێغەمبەر رازی نەبوو، هەوڵی لەگەڵدان تا لێ ی کڕینو پاشان مزگەوتی لێ بنیات نا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی لەدروستکردنی مزگەوتەکەدا ئیشی دەکرد، خشتی دەگواستەوە، ئیتر موسوڵمانانیش چاویان لەو کردو تاویاندایە ئیش کردن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەدەم ئیش کردنەوە دەیفەرموو:

اللهم ان الأجر أجر الآخرة فارحم الأنصار والمهاجرة.

خودایە پاداش پاداشی قیامەتە، خودایە رەحم بەیاریدەدەرانو کۆچکەران بکە. موسوڵمانەکان کەیفخۆشو تەڕ دەماغ بوون، بۆ زێدە

حەماس و دەست و بردی کردن شیعریان دەخوێندنەوە، سوپاسی خودایان دەکرد لەسەر نیعمەتی ئیسلام.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەماڵی ئەبو ئەییوب دا حەوت مانگ مایەوە[١٢٣] تا مزگەوت و خانووی حەوا نەوەی خۆی و خێزانەکانی تەواو بوون، ئەمجار لەماڵی ئەبو ئەییوبەوە گواستی یەوە بۆ خانووی تازەو تێ یدا نیشتەجێ بوو. ئەمجار وردە وردە موسوڵمانەکان لەمەککەوە پەیوەندییان پێوە کردو کۆچیان کرد بۆ مەدینە، تاوای لێ هات کەسیان لەمەککەدا نەمایەوە، مەگەر کەسێك هیچ چاری نەبوو بێ، رێگەی لێ گیرا بێ، حەبس بووبێ. لەلایەکی ترەوە هیچ ماڵە ئەنصاری یەك نەما موسوڵمان نەبووبێ، هەموویان ئیمانیان هێنا.

## برایەتی نێوان کۆچکاران و یاریدەدەران:

بەمەبەستی پتەوکردنی رێزەکانی کۆمەڵگای موسوڵمانان لەمەدینەداو جێ خۆشکردن بۆ موسوڵمانە کۆچکەرەکان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەیمانی برایەتی خستە نێوان کۆچکەران و یاریدە دەرانەوە. برایەتی خستە نێوانیانەوە بۆ دڵدانەوەی موسوڵمانە کۆچکەرەکان، یاریدە دەرەکان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ بەستنی پەیمانی برایەتی لەگەڵ موهاجیرەکان، هەتا وای لێ هات لەبەر زۆری داخوازی ئەنصارەکان و کەمی کۆچکەران یاسای

---

[١٢٣] ئیبنو کەثیر ج ٢٧٩/٢ ئەمەریوایەتی واقیدی یە لای ئەبو سەعد.. ئیبنو حەجەر لەفەتح دا ئەوەی چەسپاندوە، ئیبنو ئیسحاق دەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینە مایەوە لەمانگی رەبیعی یەکەمەوە تامانگی سەفەری ساڵی داهاتوو هەتا مزگەوتەکەی و خانووی دروست کرد کەوابێ دەبێ زیاد لەدەمانگ لەماڵی ئەبو ئەییوب دا مابێتەوە.

قورعەیان بەکار هێنا. ئەنصارەکان موهاجیرەکانیان دەکردە برا بەشی خۆیان و داوایان لێ دەکردن بەئارە زووی خۆیان چییان دەوێ لەناومالٌو خانوو زەوی هەڵی بگرن، بەرژەوەندی ئەوانیان پێش بەرژەوەندی خۆیان دەخست، وادەبوو کابرای ئەنصاری بەبابای موهاجیری دەگوت: ئەوە نیوەی ماڵەکەمە فەرموو.. بۆ خۆت بیبە، دووژنم هەن کامەیانت بەدڵە بۆتی تەڵاق دەدەم، بابای موهاجیر لەئاستی ئەم لەخۆ بردویەی کابرای ئەنصاری دا دەیگوت خودا بەرەکەت بخاتە ماڵو منداڵتەوە هیچم ناوێ و رێگەی بازاڕم نیشان بدە دەچم کاسبی دەکەم چەندێك یاریدە دەران ئیثاریان بەکار بهێنایەو بەرژەوەندی خۆیان وەلا بنایەو بیانویستایە هاریکاری موهاجیرەکان بکەن، بەو رێژەیە موسوڵمانە کۆچکەرەکان نەفس بەرزیو تەعەفوفو بێ نیازی خۆیان لەماڵو سامانی ئەنصارەکان دەر دەخست ئەم پەیمانی برایەتییە بناغەیەکی پتەوبوو بۆ برایەتی ئیسلامی جیهانی سەرتاسەری بێ وێنە لەمێژوودا، سەرەتایەك بوو بۆ رابوونی نەتەوەیەکی خاوەن بەرنامەو بانگەوازی یەکتا پەرستی هەنگاوی دەنا بۆ وەدی هێنانی جیهانێکی نوێو کۆمەڵگایەکی تازە کەلەسەر بنەمای بیرو باوەڕی راستو مەبەستو ئامانجی پیرۆزوگونجاوو رزگار کەری جیهان لەنەگبەتیو شومو دژایەتیو خۆکوژی دا دەمەزرێ، کۆمەڵگایەك کەلەسەر جۆری پەیوەندی تازە لەئیمانو برایەتی راستەقینەو هەمئاهەنگیو هاریکاریو پێکەوە ژیانو پڕ لە گیانی لێ بوردەیی دادەمەزرێ، ئەم برایەتیە سنور دارییەی نێوان موهاجیرو ئەنصارەکان پێشەتایەك بوو بۆ دەست پێکردنی ژیانێکی تازە بۆ جیهانو مرۆڤایەتی، بۆیە پەروەردگار خیطابی خۆی ئاراستەی ئەم کۆمەڵە بچوکەی ئادەمیزاد لەم شارە بچکۆلەدا دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ. (٧٣) سورة الأنفال﴾.

## نووسینی قەباڵە نامەیەك لەنێوان موهاجیرەكانو ئەنصارەكانو موصاڵەحە كردن لەگەڵ جولەكەكان:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ ڕێكخستنو پتەوكردنی ناو كۆمەڵگای مەدینە، قەباڵە نامەیەكی لەنێوان كۆچكەرانو یاریدەدەران دا نووسیو پەیمانی برا یانەی راستەقینەی پێ بەستن، برایەتیەكی وا كەلە برایەتی خوێنو نژاد بەهێز ترو پتەو تر بوو، برایەتیەك كەلە سەر بنەمای ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ دامەزراو (من منو تۆ تۆی) تێدا كوژایەوە، یاریدە دەران بەدڵفراوانییەوە هاتن بەدەم كۆچەرییەكانەوەو لەناخی دڵیانەوە كردیانن بەسەر پشك لەنیوەی ماڵو سامانیان دا، لەهەمان كات دا كۆچكەرەكانیش بەو پەڕی نەفس بەرزییەوە، بەهەڵسو كەوتی جوانمێرانەوە غیرەتی پیاوانەوە وەڵامی یاریدە دەرانیان دایەوە. وێڕای نووسینی ئەو قەڵەباڵە نامەیەی برایەتی نێوان موهاجیرو ئەنصار، پەیماننامەیەكی ئاشتییانەی لەگەڵ جولەكەكان دا بەستوعەهدو پەیمانی لەگەڵ دا مۆر كردنو چەند خاڵو مەرجێكی بۆ دانانو چەندێكیشی خستە سەر شانی خۆی، چەندی ماف پێدان ئەوەندەشی ئەرك خستنە ئەستۆ لەسەر ئاینو ماڵو حاڵی خۆشیان هێشتنیەوە، ئەم پەیمانەی نێوان پێغەمبەرو جولەكەكان لەمەدینە بەگرنگترینو كۆنترین بەڵگە نامەی سیاسی دەژمێردرێ كەبە دەق تائێستا بەئێمە گەییشتووە.

## داهێنانی بانگی نوێژ:

دوای ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینەدا نیشتەجێ بوو دڵنیا بوو، بناغەیەكی دەوڵەتی دامەزراند ریزەكانی ناو كۆمەڵی ڕێكخستن، ئیسلام جێگیر بوو دەسەڵاتی سیاسیو تەشریعی گرتە دەست، موسوڵمانە

کانیش بەبێ هەبوونی بانگ یان شتێکی تری وەها لەکاتی نوێژەکان دا بەزەحمەت لەدەوری پێغەمبەر کۆدەبوونەوە، بۆیە بیری لەوە کردەوە شتێك هەبێ لەکاتی نوێژەکان دا موسوڵمانان ئاگادار بکاتەوە، پێشی ناخۆش بوو بۆ ئەم مەبەستە چاو لەجولەکەو مەسیحی یەکان بکا، زەنگ‌و بۆق بەکار بێنێ، یان ئاگر لەشوێنی بەرز بکاتەوە، پەروەردگار بۆ رێز لێنان لەموسوڵمانان، بانگی بۆ دانان، بیلالی حەبەشی: کەدەنگی بەرزو خۆش بوو، هەڵبژێردرا ئیتر بیلال بوو بە بانگدەری پێغەمبەر هەتا رۆژی قیامەت بووەتە رابەرو پێشەوای بانگدەرانی موسوڵمان،

## پەیدا بوونی دیاردەی دووڕوویی دووڕووەکان لە مەدینەدا:

تا پێغەمبەرو موسوڵمانان لەمەککە دا بوون دیاردەی دوو ڕوویی لەناویان دا نەبوو. چونکە لەمەککەدا موسوڵمانان‌و ئیسلام ژێر دەستەو چەوساوە بوون، هیچ هێزو توانایەکی ئەوتۆیان نەبوو بتوانن زیان بەکەسانی دیکە بگەیەنن، یان سود بگەیەنن. لەهیچ رویەکەوە دارای زیان‌و سود گەیاندن نەبوو، هەرکەسێك موسوڵمان بوایە گیان‌و ماڵی دەخستە خەتەرەوەو خۆی دەخستە بەر هەڵمەتی زەرەرو نارەحەتی‌و چەرمەسەری، دوژمنی بێ رەحمی بۆ خۆی پەیدا دەکردن، رقی ناحەزانی لەخۆی هەڵدەستان. کەوابوو کەسێك لەناخەوە ویژدانی نەجولایەو، عەزم‌و جەزمی راستگۆیانەی نەبو یایەو ئیمانی بەهێز نەبوایە موسوڵمانبوونی خۆی رانەدەگەیاندوموجازەفەی بەژیان‌و داهاتووی خۆی نەدەکرد، لەمەککەدا دوو هێزی هاو کوف‌و دەسەڵاتدار نەبوون، بەڵکوو موشریکەکان باڵا دەست‌و بەهێز بون‌و موسوڵمانەکان بێ هێزو چەوساوە، دەستیان بەکڵاوە

کـۆنی خۆیـان دا گرتبـوو بانـەیبا، هـەروەکوو قورئـان وێنـەی کێـشاون و دەربـارەی موسـوڵمانەکانی مەککـە دەفـەرموێ: ﴿وَاذْكُـرُواْ إِذْ أَنــتُمْ قَلِيــلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ. سورة الأنفال (٢٦)﴾ یادی ئەو ڕۆژگارانە بکەنەوە کـەئێوە لەمەککـەدا کـەم و بـێ دەسـەڵاتبوون، لەنیـشتمانی خۆتـان دا دەچەوسێندرانەوە، ترسی ئەوەتان هەبوو خەڵك بتانڕفێنن.

جا کە موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینەو پێغەمبەرو هاوەڵانی لەوێ دا جێگیر بوون و ئیسلام باڵی کێشا بەسەر دانیشتوانەکەی داو ڕۆژ بەڕۆژ پـەرەی دەسـەندو بـڵاو دەبـوەوەو دەسـەڵاتی پەیـدا دەکـرد، کۆمـەڵگای ئیسلامی سەری هەڵداو حکوومەتی ئیسلامی دامەزرا، بارو دۆخەکە گۆڕاو دوو ڕوویی پەیدا بوو سەری بەرزکردەوە، ئەمەش دیاردەیەکی سروشتی و دەروونی بوو دەبوایە سەر هەڵبداو پەیدا ببێ، چونکە بەرواڵەت دیاردەی دوو ڕوویـی لەکۆمەڵگایـەك دا سـەر هەڵـدەدا کـە دوو بانگەوازی دژ بەیـەکی تێدا هەڵبدرێ، دوو سەرکردایەتی پرۆگرام جیاواز هـەبێ و هەریەکـەیان کار بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیـان بکـەن، ئالـەم بـارو دۆخـەدا کەسـانێك پەیـدا دەبـن نایانەوێ خۆیان یەکلایی بکەنەوە لەنێوان ئەم دوو لایەنە دژ بەیەکەدا دێن و دەچن و بەرژەوەنـدی خۆیـان دەپـارێزن و بـەس. وادەبـێ لایـەنی بانگـەوازی لایـەکیان دەگـرن و دەچـنە ئـەو مەعەسـکەرەوە، بەرواڵـەت دەنـگ و لایـەنگری خۆی دەدا بەو لایەنەو سۆزی بۆی دەبـێ، وەلێ بەرژەوەندییـە مادییـەکانی و جـم و جـۆڵی بانگـەوازی لایـەنی بەرامبـەرو سـەرکەوتنی لەهەنـدێ بـواردا ڕێگەی ئەوەی لێ دەگرن بەتەواوی لەلایەکەی تر بپچڕێ و هەڵوێستی خۆی رابگەیەنێ و لێبڕاوانە بچێتە ژێـر خێمـەی بانگەوازی یەکـەوە. لـەئاکامی ئـەم حاڵـەت و چـۆنیەتییانەدا دوو ڕوویـی و دوو ڕوو پەیـدا دەبـن. بێگومـان

قورئانی پیرۆز زۆر بەجوانی وێنەی هەڵوێستی ئەو جۆرە ئادەمیزادە کێشاوەو دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ. سورة الحج (١١)﴾ هەندێ ئادەمیزاد هەن بەتەواوی خۆیان یەکلایی ناکەنەوە بەرواڵەت عیبادەتی خودا دەکەن‌و راران، لەسەر کەنارن، جا ئەگەر ئەو بابایە توشی خێر بوو ئەوە بەردەوام دەبێ لەسەر عیبادەت، خۆ ئەگەر توشی چورتم‌و ناخۆشی یەك بوو، ئەوە لە ئیمان هێنان‌و عیبادەتکردن پەشیمان دەبێتەوە، خەسارەتمەندی دونیاو قیامەتەو عیبادەتەکەی سودی پێ ناگەیەنێ ئەوەش ماڵوێرانیەکی ئاشکرایە.

یەکێك لەسەرۆکە فێڵبازو چەنەبازەکانی دوو ڕووەکان کەلە ئەوس‌و خەزرەج‌و جولەکەکان پێکهاتبوون عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو، ئەم پیاوە قیر سیچمە رێوی سروشتە مونافیقەکان لەدوای شەڕی (بعاث) ەوە کردبویانە سەرۆکی خۆیان‌و تاجی سەرۆکایەتییان پێ دابوو، کاتێك کە ئیسلام هات ئەو وەکوو سەرۆکی دوو ڕووەکان کاری دەکرد، جا کەدیتی خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمان دەبن زۆر دڵتەنگ بوو، زۆری رق لەئیسلام‌و موسوڵمانان دەبوەوە.

ئیبنو هیشام دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشتە مەدینە سەرۆکی سەرەکی‌و قسە رۆیشتوی مەدینە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی عەوفی بوو، هەر لەکۆنەوە هەتا هاتنی ئیسلام هۆزی ئەوس‌و هۆزی خەزرەج بۆ هیچ کەس ئاوا کۆك نەبوون وەکوو بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ملکەچ بوون هەموویان بەسەرۆکایەتی ئەو رازی بوون، بەدڵ حەزیان دەکرد سەرۆکایەتییان بکاو ببێتە پاشا یان، کەپەروەردگار پێغەمبەری ئیسلامی رەوانە کردو سەرەنجام کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەموو دانیشتوانی مەدینە

تێکڕا عەبدوڵڵایان بەسەرۆکی خۆیان دەزانی، جاکە خەڵکەکە هەموویان موسوڵمان بوون عەبدوڵڵا زۆر دڵگیر بوو رق و کینە دژی ئیسلام چووە دڵیەوە، وای لەقەڵەم دا کە پێغەمبەر

مەلیکایەتیەکەی لێ داگیر کردوە، ئەمجار کەبۆی دەرکەوت خەڵکەکە جگە لەموسوڵمان بوون هیچی تریان بەلاوە پەسەند نیە، بەناچاری بەرواڵەت موسوڵمان بوو بەڵام بەدوو ڕوویی و کینە لەدڵ!!

ئیتر هەموو ئەوانەی دڵیان نەخۆش بوو یان تەماعی سەرۆکایەتی لەمێشکی دابوو دەستیان کرد بەدژایەتی کردنی پێغەمبەر و موسوڵمانە راستەقینەکان، بەبڵاو بوونەوەی ئایین بەناو خەڵك دا تەنگە تاو بوون، پێیان ناخۆش بوو ئەو ئایینە تازە ئاوا کاریگەرەو بارودۆخی مەدینەی گۆڕی و موهاجیرو ئەنصاری کردونە برای یەکتری نەتەوەیەکی یەکڕیزو یەکهەڵوێستی لێ پێك هێناون و خۆ لەپێناو پێغەمبەر و ئیسلام دا بەخت دەکەن، پێغەمبەر یان لەباوك و براو کوڕو کچ و خێزان خۆشتر دەوێ، ئیتر دڵی داخ لەدڵەکان و دوو ڕووەکان پڕ بوو لەقین و کین و دەستیان کرد بەپیلان گێڕان و فرت و فێڵ کردن و هەڵس و کەوتی ناجوامێرانە، هەمیشە چاوەڕوانی فرسەت بوون و لەهەلێك دەگەڕان خەنجەری ژەهراوی خۆیان بوە شێنن، هەمیشە خەریکی دوزوبانی و ئاشوب نانەوە بوون، بەم جۆرە لەمەدینەدا بەرەیەکی دوژمن و ناحەز بەئیسلام سەری هەڵدا، وەکوو مۆرانە خۆیان خزاندبوە ناو کۆمەڵگای ئیسلامی یەوە پێویست بوو موسوڵمانەکان بەحەزەرەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، چونکە خەتەری ئەم دوو ڕووانە لەسەر ئیسلام و موسوڵمانان زۆر ترسناکتر بوو لەدوژمنە ئاشکراو بەرامبەرەکانیان، بۆیە لەم روەوە قورئانی پیرۆز زۆریان باس دەکاو پەردە لەسەر هەڵوێستی ناجوانمێرانەی ئەو کۆمەڵە داخ لەدڵانە هەڵدە داتەوەو

پیلانەکانیان ئاشکرا دەکا، ئیتر لەوەدوا ئیسلام لەگەڵ ئەوان و ئەوان لەگەڵ ئیسلام دا چەندان کێشمە کێشم و دژایەتی و ناکۆکی روی دا، باسی هەڵس و کەوتی دووروەکان لەکتێبەکانی سیرەداو لەم کتێبەدا بەتایبەتی دوبارەو سێ بارە بۆتەوە.

## سەرهەڵدانی دژایەتیکردنی جولەکە بۆ ئیسلام:

جولەکەکانی مەدینە کە لەوەپێش هەڵوێستی بێ لایەنییان وەرگرتبوو لەئاستی بەر بەرەکانی موسوڵمانەکان و کافرەکانی مەککەو مەدینە دا، بەڵکوو تائەندازەیەکیش مەیلیان بەلای ئیسلام و موسوڵمانەکانەوە بوو، چونکە ئەوان لەگەڵ موسوڵمانەکان دا لەچەند خاڵی هاوبەش دا یەکیان دەگرت، هەردولایان ئیمانیان بە پێغەمبەرایەتی و بەزیندو بوونەوە هەبوو، هەرچەندە لەهەندێ تەفاصیل دا بۆ چوونی جیاوازیان هەبوو، ئەوان نزیکترین نەتەوە بوون بۆ موسوڵمانەکان دەربارەی یەکتا پەرستی و خودا بەیەکناسین و بڕوا بەتاک و تەنهایی خودا لەزات و لەصیفات دا. هەرچەندە بیرو باوەڕی جولەکە توشی شکستی بو بوو بەهۆی کاریگەری نەتەوە نەفامەهاو سێکانیان و بەلای کوشندەی بتپەرستی، چونکە ماوەیەکی زۆر لەرۆژانی دەربەدەری و مانەوەی درێژیان لەدوورە ولاتی دا لەناو بتپەرستی دا ژیانیان بەسەر برد بوو، هەروا ئەو زێدە رۆیی یە بێتامەی کەدەربارەی تەقدیس و بەپیرۆز زانینی هەندێ لە پێغەمبەرانیان خزاند بوە ناو ئایینەکەیانەوە، وەکوو لەوەپێش لەباسی بارودۆخی ئاینی لەلای جولەکە لەسەدەی شەشەمی زایینی دا ئامارەمان بۆ کرد. بەڵێ هەموو دیاردەو مەزندەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کەجولەکەکانی مەدینە لەشەڕی نێوان موسوڵمانەکان و موشریکەکانی جزیرەدا بەلانی کەمەوە ئەگەر شوێن

ئیسلام نەکەون، هەڵوێستی بێ لایەنی وەردەگرن، ئەو ئیسلامەی هاتووە تەصدیقی نامەی ئاسمانی ئەوان دەکا: بانگەوازی دەکا بۆ ئەوەی خەڵك بڕوای بە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیلی هەبێ، قورئانی پیرۆز لەسەر زوبانی موسوڵمانان دەفەرموێ: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ. سورة البقرة (٢٨٥)﴾ خۆ ئەگەر وابوایەو جولەکە شوێن پێغەمبەری ئیسلام بکەوتنایە، ئێستا مێژووی مرۆڤایەتی –ج جایی– مێژوویی ئیسلامی بەشێوەیەکی تر دەبوو لەباردۆخێکی تردا دەبوو، بانگەوازی ئیسلامیش زۆر لەو مەشاکیل و چورتمو روداوانەی تووش نەدەهاتن کە کێشەو بەربەرەکانی نێوان ئیسلامو جولەکایەتی پەیدایان کردن، ئەم هەموو مەشاکیلانە نەدەبوون کە تێکۆشان لەنێوان موسوڵمانە تازە رسکاوەکانو جولەکە دەوڵەمەندە ڕۆشنبیرەکان دا دەستە بەریان کردن، بەلاّم شوێنکەوتنی جولەکە بۆ پێغەمبەری ئیسلام نەهاتە دیو لەشەڕی نێوان ئیسلامو موشریکەکانیش دا بێ لایەن نەبوون، ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان جولەکە بەسروشت نەتەوەیەکی حەسودو وشكو بەرچاوتەنگو بێ چڵێدانەن، دووەمیان ئەو رەخنەو هێرشانەی قورئان ئاڕاستەی جولەکەکانی دەکرد دەربارەی بیرو باوەڕی بەتاڵو ئەخلاقی روخاوو دابو نەریتی ناشیرینو نەشازیان، هەروا باسکردنی مێژووی پڕ لەروداوی ناجوانمێرانەیان، وەکوو دژایەتیکردنو کوشتنی پێغەمبەرانیان دورکەوتنەوە لەڕێبازی خوداو بوختانکردن بەدەم خوداوە، مامەڵە کردن بەریباو سود خۆریو خواردنی ماڵی خەڵك بەناحەقو بەرتیلخۆریو فێڵبازی، گۆڕانکاری کردن لەتەورات دا خۆپەرستیو ژیان خۆشەویستی لەرادە بەدەرو زۆر شتی تر کەقورئان باسیان دەکا. ئەگەر لەشوێنی



پێغەمبەری خودا رابەرێکی سیاسی ببوایەو یان بەتەعبیرێکی تر بڵێین: ئەگەر مەحەممەد پێغەمبەر نەبوایەو رابەرێکی سیاسی بوایە، بەتەئکید حیسابێکی تایبەتی دەکرد بۆ پێکهاتەی دانیشتوانی مەدینەو ئەو بارو دۆخە ئالۆزەی مەدینەی تێدا دەژیا. خۆی دە پاراست لەوەی رقی جولەکەکان هەڵبسێنێ و دژایەتییان بکا، بەڵکوو لەوانە بوو زەمانە سازیو کات بردنە سەری لەگەڵ دا بەکار بهێنانایەو خۆی لەلا خۆشەویست بکردنایە، بەلآم وەکوو دەبینین پێغەمبەر هەڵس و کەوتێکی تری کرد، چونکە ئەو پێغەمبەر بوو، فەرمانی پێ کرابوو پەیامی خۆی بگەیەنێ، ئەوەی فەرمانی پێ کراوە بیتەقێنێ و بلآوی بکاتەوە، حەق و بەتاڵ لێك جیا بکاتەوە پێناسەیان بکاو بۆ مەردومیان رون بکاتەوە، بەهیچ شێوەیەك زەمانە سازی لەگەڵ فەسادو گومڕایی نەکا، ئەو راسپێردراوە بەوەی بانگەوازی هەموو گەل و نەتەوەیەك بکا، بەجولەکەو مەسیحیشەوە بۆ ژێر ئالآی ئیسلام، ئەو فەرمانی پێ کراوە پەیامی خودا بگەیەنێ بەهەموو جیهان، بالە پێناو ئەوەدا توشی تەنگ و چەڵەمەو ئاستەنگ و چورتەمیش ببێ! پەیڕەوو پرۆگرامی ئەو رێبازی پێغەمبەرێتی یەو شەقامەرێی پێغەمبەرانی پێشوو بووە، ئەو نەهج و پرۆگرامەی ئەو پتەوو راست و رەوان و بێ غەل و غەشە. هەر ئەو هەڵویست و ئاکارانەشن کەجوداوازی دەخاتە نێوان پێغەمبەرایەتی و سیاسەتمەداری یەوە، رابەرو سەرکردە نەتەوەیی یەکان لە پێغەمبەرە رەوانە کراوەکان جیا دەکاتەوە.

ئەم دەست لێدان و پەلامار دانەی پێغەمبەر بۆ سەر جولەکەکان دەربارەی بیرو باوەڕو ژیان و رەوشتیان بووە هۆی ئەوەی جولەکەکان لەبەرامبەر ئیسلام و موسوڵمانان بوروژێنێ و هەڵوێستی بێ لایەنی خۆیان وەلا بنێن و هەڵوێستی دژایەتی و دوژمنایەتی وەربگرن، بەنهێنی و بەئاشکرا

دژایەتی خۆیان بەرامەر ئیسلام رابگەیەنن، ئیتر هاتنە گۆڕەپانی مەیدان و شمشێری دوژمنایەتییان لەکالان دەرکێشا.

بێگومان نووسەری جولەکە نژاد ئیسرائیل ولفنسون زۆر ژیرانەو بە ویژدانەوە هۆکارەکانی دوژمنایەتی و صیراعی نێوان ئیسلام و جولەکەی شی کردونەتەوەو دەڵێ: (ئەگەر تەعلیماتی پێغەمبەر لەسنووری دژایەتی ئایینی بتپەرستی دا بوەستایەو داوای لەجولەکەکان نەکردایە، دان بە پێغەمبەرایەتی ئەودا بنێن، هەرگیز نیزاع لەنێوان جولەکەو موسوڵمانەکان دا بەرپا نەدەبوو، جولەکەکانیش بەچاوی رێزو شکۆمەندی دەیانڕوانی یە پەیڕەو پرۆگرامی پێغەمبەرو یارمەتییان دەدا بەماڵ و گیانیان، بۆ ئەوەی بتپەرستی لەناو بەرن و بیرو باوەڕی پڕو پوچی بتپەرستی ریشە کێش بکەن، بەڵام بەمەرجێك پێغەمبەر تەعەروزی نەکردایە بۆ جولەکەکان و بۆ ئایینەکەیان، هەروا بەمەرجی ئەوەی داوایان لێ نەکا ئیعتراف بەئایینی تازە بکەن، چونکە عەقڵییەتی جولەکایەتی زۆر رەق و سەر سەختە لە بەرامەبەر هەرشتێك کەبیەوێ لەسەر ئایینی خۆی لایبەرێ، هەرشتێکی پێ هەزم بکرێ ئەوەی پێ هەزم ناکرێ داوای لێ بکرێ واز لەئایینی خۆی بێنێ، بە هیچ شێوەیەك ئامادەنین دان بە پێغەمبەرێك دابنێین کەلەنەتەوەی بەنی ئیسرائیل نەبێ[١٢٤]. لەلایەکی ترەوە جولەکەکان رق و کینەیان بەرامبەر پێغەمبەرو موسوڵمانان و ئیسلام پەرەی سەند، بەتایبەتی کاتێك زانییان کۆمەڵێك لەعالم و زاناکانیان موسوڵمان بوون! کاتێك بۆ یان دەرکەوت: کەگەورە پیاوو زانای بەناو بانگیان عەبدوڵڵای کوڕی سەلام موسوڵمان بوو زۆریان پێ ناخۆش بوو، رق و کینەیان لە پێغەمبەرو لەئیسلام گەیشتە تۆپەلاك و خەشم و قینی شاراوەیان سەری کردو لەکوڵ هات، چونکە هەرگیز

---

[١٢٤] تاريخ اليهود في بلاد العرب ولفنسون ص ١٢٣.

پێیـان وانـەبوو مـالمی وەکـوو عەبـدوڵلاّیان ئیمـان بێنـێ و شـوێن پێغەمبـەر بکـەوێ.[١٢٥] دژایـەتی و دوژمنایـەتی جولەکـەکان هەربەوەنـدەوە نەوەسـتا سەرپێـچی یاسـای ئیـسلام بکـەن و لێ ی دوور بکەونـەوە، بـەڵکوو لـەوەیان تێپەڕاندو گەیشتنە ئاستێك بتپەرستییان بەلاوە باشتر بێ لەخودا پەرستی موسوڵمانەکان، تەفضیلی موشریکەکانیان دەدا بەسەر ئەو موسوڵمانانەدا کەلـەبیرو بـاوەڕی یـەکتا پەرسـتی دا یـەکیان دەگرتـەوە، خـاڵی هاوبەشـیان هـەبوو لـەترۆکردنی بـت و صـەنەم دا. بـەگوێرەی عـەقڵ وا چـاوەڕوانیان لێ دەکـرا ئـەوان ئەگـەر داوایـان لێ بکرایـە رای خۆیـان دەربـبڕن ئایـا ئـایینی قورەیش کەبتپەرستی بوو باشترە یان ئەو ئایینەی کەموحەممەد بانگەوازی بـۆ دەکـا هەرچـەندە خـیلاف و راجیـانی زۆریـش لـەنێوان ئـەوان و موسـوڵمانەکان دا هەبوایـە، بـەگوێرەی عـەقڵ دەبوایـە شـایەدی بەفـەضڵ و گەورەیی ئیسلام بدەن، ئایینی ئیسلام بەگەورەترو باشتر بزانن لەئایینی بتپەرستی عەرەبە موشریکەکان وەلێ دوژمنایەتییان بۆ ئیسلام رێگەی ئەم شـایەتیەی لێ گـرتن، بـەڵکوو بەپێـچەوانەوە شـایەتییان داو تـەفـضیلی بتپەرسـتیان دا بەسـەر ئیـسلام دا. ریوایـەتکراوە کەقورەیـشییەکان بـە ئـەو مالمـە جولەکانـەی کەدەیـدەنی ئـەوانیان کردبـوو لەمەککـە گـوت: ئـەری جەماوەری زانایانی جولەکە ئێوە خاوەنی یەکەم نامەی ئاسمانین، ئاگاداری

---

[١٢٥] ژمارەی ئەو جولەکانەی ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناو رێزو شەرەفی هاوەڵیەتی پێغەمبەریان بەدەست هێنا، (٣٩) سی و نۆ پیاو بوو، ناوو ژینامەیان لەکتێبەکانی تایبەت بەژینامەی هاوەڵانی پێغەمبەر دا وەکوو کتێبی (الأصابة في تمييز الصحابة- الأستيعاب في معرفة الأصحاب (أسد الغابة) حياة الصحابة ليوسف كاند هلوی) داهاتووە هەندێکیان لەگەورە گەورانی هاوەڵان دەژمێردرێن، سەیری کتێبی ( الصحابه والتابعون من أهل الكتاب) دانراوە مجيب الله ندوی بکە.

ئەو خیلاف و کێشەیەن کە ئێمە لەگەڵ موحەممەددا تێ ی کەوتوین، پێمان بڵێن: ئایا ئاینی ئێمە حەقە یان ئاینی موحەممەد؟ هەموو تێکڕا وتیان:ئاینی ئێوە لەئاینی ئەو باشترە، ئێوە لانی حەقتان گرتووە. زانای بەویژدانی جولەکە نژاد د. ئیسرائیل ولفنسون باری سەرنجی خۆی لەسەر ئەم روداوە دەردەبڕێ و دەڵێ: بەڵام ئەوەی کەسەر زەنشتی جولەکەکانی لەسەر دەکرێ و ئەوەی جێگای رەخنەی هەموو خودا ناسێکە لەموسوڵمان و جولەکە وەکوو یەك، ئەو روداوەیە کە لەنێوان چەند کەسێکی جولەکەو قورەیشییە موشریکەکان دا روی دا، کە ئەو چەند کەسە جولەکە ئاینی بتپەرستی جولەکەیان بەسەر ئاینی ئیسلام دا پاساو دایەوە، ئاینی موحەممەد یان بەناحەق لەقەڵەم داو ئاینی بتپەرستییان بەحەق و راست دانا. دوکتور ولفنسون: پێوە دەڕوا تادەگاتە ئەوەی کەدەڵێ: پێویستیانی جەنگ پاساوی ئەوەی بۆ گەل و نەتەوەکان دەستەبەر کردوە کەفرت و فێڵ درۆو دەلەسەو چاوو راو بەکار بێنن، پەنابەرنە بەر هەڵس و کەوتی ناڕاست بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمنان دا، بەڵام ویڕای ئەمانەهەموو لەسەر ئەو کۆمەڵە جولەکەیە پێویست بوو کەخۆیان نەخەنە ئەو هەڵە گەورەوەو ئەوەندە خۆیان گێل نەکەن و راستی پێخوست نەکەن، کە لەبەرامبەر سەرانی قورەیشی بتپەرست دا شایەتی ئەوە بدەن کەعیبادەتی صەنەم و بتپەرستی باشترە لەیەکتا پەرستی و خودا ناسی لەئیسلام دا. هەرچەندە ئەو داننان بەحەقیقەت و راستی یەدا سەری بکێشایە بۆ ئەوەی قورەیشییەکان مەرامی ئەوان نەهێننە دی. چونکە نەتەوەی ئیسرائیل ئەو نەتەوە رەسەنە خاوەن هەڵوێستەیە بەدرێژایی سەدان ساڵ هەڵگری ئاڵای یەکتا پەرستی بووە لەجیهان دا، لەکاتێك دا نەتەوەکانی دەورو بەرو هاوسێیان هەموو بتپەرست بون، نەتەوەی ئیسرائیل ئەو نەتەوەیەیە

لەچاخە جیاجیا کان دا بەهۆی سووربوونیان لەسەر یەکتا پەرستی توشی دەیـــان چـــورتمو دەربـــەدەریو کوشـــتنو بـــڕین بـــوون، دەرکـــراون چەوسێندراونەوە، کوژراون ئەزیەتو نارەحەتی زۆرو زەبەندیان چەشتووە، دەی دەبوایـە ئـەو چـەند کەسـە جولەکانـەش کـە چـوونە مەککـەو لەگـەڵ قورەیـشییەکان وتو وێـژیان کـرد حـەقیان بگوتایـە، نـەدە بـوو بـەهیچ شێوەیەك ڕێگا بەخۆیان بدەن ئاوا حەقیقەتو ڕاستی ژێر پێ بدەن، ئەرکی سەرشانیان بوو ژیانو گیانو ماڵو سامانیان بکردایەتە قوربانی لەپێناو ڕیسوا کردنی موشریکەکان.[١٢٦] بێگومـان قورئـان لەئایـەتێکی دا ئامـاژەی بەم هەڵوێستە ناجوانمێرانەی جولەکە کردووەو فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً. سورة النساء (٥١)﴾ واتە:: ئەوە ناڕوانی بۆ ئەوانەی بەشێکیان لەکتێبی ئاسمانی پێ دراوەو تەورات دەخوێنن، چۆن کلکە لقێ بۆ موشریکە قورەیشییەکان دەکەنو، بڕوا بەبتو صەنەم دەکەن، یارمـەتی قورەیـشییەکان دژی موسـوڵمانەکان دەدەن، هـەموو پێداویـستی یـەکیان بـۆ دابـین دەکـەن، شـا یـەتی بـەدرۆیان بـۆ دەدەن، دەڵـێن: موشریکەکانی قورەیش ئایینەکەیان ڕاست ترو حەق ترە لەئایینو ڕێبازی ئەوانەی ئیمانیان بەپەیامی موحەممەد هێناوە. .).

## گۆڕانی قیبلە لەبە یتولمەقدیسەوە بۆ کەعبە:

لەسەرەتای ئایینی ئیسلامەوە، هەموو فەترەی مەککیو ماوەیەکیش لەمەدینـــە (شـــانزە مـــانگ) موســـوڵمانەکان لەنوێـــژدا ڕویـــان دەکـــردە

[١٢٦] اليهود في بلاد العرب ص ١٤٢.

بەیتولمەقدیس، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) حەزی لێ بوو روگەی بگۆڕدرێ بۆ کەعبە، عەرەبە موسوڵمانەکانیش هەر حەزیان لەوەبوو. چونکە ئەوان خۆشەویستی کەعبەو رێز لێ گرتنی ماڵی خودایان بەشیرەوە خوار دبوو، خۆشەویستی ئەو ماڵە پیرۆزەیان لەناخ دا روابوو، تێکەڵی خوێن و گۆشتیان بو بوو، هیچ ماڵێکیان هێندەی کەعبە بەلاوە پیرۆز نەبوو، هەرگیز نەیان دەویست رۆگەی ئیبراهیم و ئیسماعیل پا شگۆی بخەن و رو بکەنە شوێنێکی تر، روکردنە (بەیتولمەقدیس) یان بەلاوە ناخۆش بوو، بەلاّم چار نیەو فەرمانی ئایینە فەرمانبەردار بون، فەرمانەو لەخوداوە هاتووە دەبێ پابەندی بن، ئەوان جگە لە ملکەچی بۆ فەرمانی خودا هیچی تریان نەدەزانی، لەئاست فەرمانی ئایین دا هیچ رەخنەیەکیان نەبوو جا پێیان خۆش بوایە یان نا. لەگەڵ داب و نەریت یان گونجاو بوایە یان نا. جاکە خودا دەری خست ئەوان بەتەواوی ملکەچی فەرمانی خودان و بەراستی تەقواکارن، پەروەردگار ئاواتی دێرینیانی بۆ هێنانەدی و رۆگەی لەبەیتولمەقدیسەوە بۆ گۆڕین بەکەعبە.[١٢٧] قورئانی پیرۆز لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلاَّ عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللّهُ وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ. سورة البقرة (١٤٣)﴾ ئیتر دوای نازڵبونونی ئەم ئایەتە پیرۆزە، موسوڵمانەکان رویان کردە کەعبەو ئەو ماڵە پیرۆزە بوو بەقیبلەی موسوڵمانان بۆ هەتا هەتایە، لە هەرشوێنێك بن لەخودا پەرستی دا- بەتایبەتی لەنوێژدا رو دەکەنە لای کە عبە.

---

[١٢٧] گۆڕانی قیبلە رێکەوتی ساڵی دووەمی کۆچی کردوە.

## ﴾ ورده هێرش و پەلاماردانی قورەیش بۆ موسوڵمانەکان لەمەدینە:

دوای ئەوەی موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینەو تێ یدا جێگیر بوون، قورەیشییەکان بۆ یان دەرکەوت کەڕۆژ بەڕۆژ موسوڵمانەکان لەبرەوو گەشەکردن دان، ڕۆژانە هێزیان زیاد دەبێ و ئایینی پاکی ئیسلام بەناو خەڵك دا بڵاو دەبێتەوە، ئیتر گەییشتنە ئەو قەناعەتە ئەگەر بارو دۆخەکە وابڕوا جڵەوی ڕوداوەکانیان لەدەست دەردەچێ و ڕۆژ دوا ڕۆژ زیاتر گلۆڵەیان دەکەوێتە لێژی، موسوڵمانەکانیش وەکوو گەنجێکی تازە پێگەییشتوو خۆی دا دەڕێژێ و بەرەو کامڵ بوون دەچێ و وایان لێ دێ بەهیچ شتێك چاریان ناکەن. ئیتر بەتەواوی لێبڕان بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام و موسوڵمانان، قۆڵیان هەڵماڵی بۆ بەگژدا چوونونی ئیسلام، لەهەموو لایەکەوە پڕ یان دانێ، لەهەمان کات دا پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانەکان کرد کەدان بەخۆیان دا بگرن و چاو پۆشی بکەن، پێیان دەگوترا (كفوا ايديكم وأقيموا الصلاه) دەستی خۆتان بپارێزن و نوێژەکانتان بەجێ بێنن، بۆ ئەوەی ژیان و خۆشیەکانی بەلایانەوە بێ بایەخ بێ و، بەئاسانی بتوانن تاعەتی خودا بکەن و سەرپێچی نەفس و شەیتان بکەن، بەرژەوەندی برای موسوڵمانیان پێش بەرژەوەندی خۆیان بخەن.

## ﴾ ئیزندانی موسوڵمانەکان بۆ شەڕکردن:

کاتێ موسوڵمانەکان لەمەدینەدا خۆیان گرت و بەهێز بوون پەروەردگار ئیزنی ئەوەی پێ دان: کەلەگەڵ موشریکەکان شە ڕ بکەن، لەوە پێش فەرمانیان پێ کرابوو دان بەخۆیان دا بگرن شەڕ نەکەن، ئێستا ئیزنیان پێ دراوە کەلە هەر شوێنێك شەڕیان بەتوشەوە بوو یان هەلی دەست

وەشاندنیان بۆ رەخسا، شەڕ بکەن. ئەوە بوو ئەم ئایەتە نازڵ بوو: کە دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ. سورة الحج (٣٩)﴾ رێگە دراوە بەو موسوڵمانانەی کە شەڕیان دژ دەکرێ دەستە وەسان دائەنیشن، بەرەنگاری دوژمن ببنەوەو شەڕ بکەن، چونکە ستەمیان لێ کراوە، لەماڵو حاڵی خۆیان وە دەرنراون، خودا پشتگیرییان دەکا، بێگومان دەتوانی یا رمەتییان بدا و بەسەر دوژمن دا سەریان بخا.

## دەستەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحشو غەزای ئەبواء:

لەدوای ئەوەی پەروەردگار رێگەی ئەوەی دا موسوڵمانەکان هەرکاتێ هەلیان بۆ رەخسا دەست لەدوژمن بوەشێنن، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستەو مەفرەزەی لەموسوڵمانان ناردن بۆ سەر هەندێ هۆزو هۆبەی دەوروبەری مەدینە، زۆربەی زۆری ئەو مەفرەزەو دەستە جەنگاوەرانە بەمەبەستی شەڕی راستەقینە نەدەنێردران بەڵکوو مەبەستەکە خۆدەرخستنو ترس خستنە دڵی موشریکە عەرەبەکان بوو، بۆ ئەوەی گورجو گۆڵیو شکۆمەندی موسوڵمانەکان دەربکەوێ، ئێستا ئێمە لێرەدا باسی یەکێ لەو مەفرەزەو دەستە جەنگاوەرانە دەکەین: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ناردنی ئەویش مەفرەزەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش بوو، بۆیە باسی ئەو مەفرەزەیە دەکەین چونکە دەربارەی ئەم مەفرەزەیە ئایەتێکی قورئان نازڵ بووە، هەروەها ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەوە کە قورئان زەمانە سازی لەگەڵ موسوڵمانان ناکا، ئەگەر هەڵە یەکیان کرد یان سنووریان بەزاند چاوپۆشییان لێ ناکا بەڵکوو ئاگاداریان دەکاتەوە، ئەو قورئانە تەرازویەکی دادوەری راستەقینە یە لەحوکمو بریاردان دا بەسەر هەموو گەلو نەتەوەو پێڕو چینو کۆمەڵێك دا. دەی باخوێنەر لەگەڵمان بێ بزانین

سەرگوروشتەی ئەم مەفرەزەیە چۆن بووە؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مانگی ڕەجەبی ساڵی دووەمی کۆچی عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی ئەسەدی ناردو کۆمەڵێکی لەکۆچکاران لەتەکیا نارد، نامەیەکی نووسیو دایە دەستیو فەرمانی پێ کرد کەهەڵی نەپچڕێو سەیری نەکا تا دوو ڕۆژە ڕێ دەبڕن ئەمجار سەیری بکاو چی تێدا نووسراوە تەنفیذی بکاو کەس لەهاوەڵانی بەزۆر نەبا. جاکە دوو ڕۆژ ڕۆیشت نامەکەی هەڵپچڕی تێیدا نووسرابوو بڕۆتا دەگەیە (نەخلە) لەنێوان مەککەو طائیف دا، لەوێ خۆتان مەڵاس بدەنو چاودێری قورەیشییەکان بکەن، هەواڵی ئەوانمان بۆ بنێرن..

جاکە عەبدوڵڵاسەیری نامەکەی کرد وتی: من بەش بەحاڵی خۆم فەرمانبەر دارمو فەرمانی پێغەمبەر جێ بەجێ دەکەم ئەمجار بەهاوەڵانی گوت: پێغەمبەر فەرمانی پێ کردوم کەبڕۆ بۆ ناوچەی (نەخلە) چاودێری جمو جوڵی قورەیشییەکان بکەمو بزانم چی دەکەنو خەریکی چین؟ ئەوەشی لێ قەدەغە کردوم کەزۆرە مللێ لەکەستان بکەم، هەرکەسێ دەیەوێ پلەی شەهید بوون وەرگرێو حەزی لێ یە بالەتەکم دابێ، ئەوەی ناشیەوێ بابگەڕێتەوە، بەلام من بەپێ ی فەرمانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەرەو پێش دەچمو ناگەڕێمەوە، ئیتر عەبدوڵڵا بەرەو (نەخلە) ڕۆییو هاوەڵانی لەتەکیا بوونو کەسیان نەگەڕایەوە، عەبدوڵڵاو هاوەڵانی ڕۆیشتن تاگەییشتنە (نەخلە) لەوێ خۆیان مەڵاس دا، کاروانێکی قورەیش بەکالایەکی زۆرەوە بەوێ دا تێپەڕی عەمری کوڕی ئەلحەضرە مییان تێدا بوو، جا کەقورەیشییەکان چاویان بەو مەفرەزە موسوڵمانە کەوت ترسیان لێ نیشت بەتایبەتی کەزۆر لێیان نزیك بوون. . موسوڵمانەکان لەناو خۆیان دا کەوتنە مشتو مڕ، کاتەکەش ڕێکەوتی دوا ڕۆژی مانگی ڕەجەبی دەکرد، (ڕەجب) یش یەکەم مانگی قەدەغە کراوەکانە ئەو مانگانەی شەر تێیان دا یاساغە.

جا موسوڵمانەکان وتیان: ئەگەر ئێمە ئەمشەو دەستیان لێ نەوەشێنین ئەوە دەگەنەوە مەککەو لەکیسمان دەچنو دەستمان نایانگاتێ، ئەگەر شەڕیشیان لەگەڵ بکەین ئەوە شەڕکردنەکەمان ڕێکەوتی یەکێ لەو مانگانە دەکا کە شەڕیان تێدا قەدەغەیە. لەمەوە مقۆ مقۆیان لێ پەیدا بوو، سەرەتا ترسان هێرش بکەن، دوایی ورەیان بەر خۆداو بڕیاریان دا دەستیان لێ بوەشێنن. کێیان بۆ کوژرا لێیان بکوژن، ئیتر تاویان دایە چەکەکانیانو پەلاماریان دان.

واقیدی کوڕی عەبدوڵڵای تەمیمی تیرێکی ئاڕاستەی عەمری کوڕی ئەلحەضرەمی کردو کوشتنی دو کەسیشیان لێ بەدیل گرتن کاروانەکەشیان کۆنتڕۆڵ کرد، ئەمجار عەبدوڵڵای کوڕی جەحشو هاوەڵانی سەر بەرزانە گەڕانەوە بۆ مەدینە بەدوو دیلو کاڵای کاروانە کەشەوە، جاکە بەوماڵەوە چونە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەوە چیتان کردوە؟ خۆمن پێم نەگوتبوون شەڕ بکەن!! کاروانو دوو دیلەکەیان ڕاگرتو پێغەمبەر ئامادە نەبوو لێیان وەربگرێ، جاکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو ڕەخنەیەی ئاڕاستە کردن ئیتر بەتەواوی دەستیان لەکراس هاتەدەرو گومانیان برد: کە ماڵوێران بوون، لە هەمان کات دا برا موسوڵمانەکانی تریان کەوتنە سەر زەنشت کردنیانو پێیان دەگوتن بۆ چی لەقسەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەرچون؟! قورەیشییە موشریکەکانیش گەزافیان کێشاو کەوتنە پڕو پاگەندەی جۆراو جۆرو وتیان: موحەممەدو هاوەڵانی ڕێزی مانگە قەدەغەکراوەکانیان شکاندوە، خوێنیان تێدا ڕشتووە، ئیتر پەروەردگار لەم بارەوە ئەم ئایەتەی نازڵ کرد کەدەفەرموێ: ! ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ. سورة البقرة (٢١٧)﴾ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی مانگە

قەدەغەکراوەکان لەروی چۆنیەتی شەڕ کردن تێیدا، بڵێ: شەڕکردن تێیان دا تـاوانی گەورەیـە، لادانـە لـەڕێبازی ئـاییـنی خـودا، بـڕوا نەبوونـە بـەخودا بەمزگـەوتی کەعبـە، بـەلأم وەدەرنـانی موسـوڵمانان لەمەککـە لای خـودا لـەو تاوانە گەورەترە. ئانەوەی فیتنەو ئاشوبیش لەکوشتن گەورەترە.[١٢٨] ئیبنـو لقەییمی ئەلجەوزی لەکتێبی (زاد المعادا) دەڵێ: مەبەست لەئایەتەکە ئەوەیە پەروەردگار بڕیارو حوکمی خۆی لەنێوان خۆشەویستانی خۆیو دوژمنـانی دا راگەیانـد، خۆشەویـستەکانی لـەو کـارەدا بـێ تـاوان دەرنـەکرد، ئـەوەی راگەیاند: کەئەوان لەئەنجامدانی ئەو شەڕەی کردیان لەمانگی قەدەغەکراودا تـاوانێکی گـەورە بـوو، بـەلأم لەهـەمان کـات دا تـاوانی ئـەو هەڵوێستو بیرو بـاوەڕەی موشـریکەکان دەینـوێننو لەسـەری بـەردەوامن لەئەنجامـدانی شـەڕ لەمانگە قەدەغەکراوە کان دا گەورەترە، ئەوان شایانی سەرزەنشتو تۆڵـە لێ ستاندنو سزادانن، بەتایبەتی کەموسوڵمانەکان لەشەڕ کردنەکەیان دا جۆرە تـەئویلێکیان کـردوە، یـان بڵـێین جـۆرە تەقـصیرو کەمتەرخەمییـەکیان لێ

---

[١٢٨] جەماوەری زانایانی ئیسلامو شەرعزانان پێیان وایە ئایەتی (یسئلونك عن الشهر الحرام.....الأیة) نەسخ کراوەتەوە بەئایەتی سورەتی بەرائە کەدەفەرموێ: ﴿فَـاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ...الآية﴾ هەروەها بەئایەتی: ﴿وَقَـاتِلُواْ الْمُـشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَـا يُقَـاتِلُونَكُمْ كَآفَّـةً ...﴾ پرسـیار لەسـەعیدی کـوڕی ئەلموسە ییەب کـرا ئایـا دروسـتە موسـوڵمانان لەمانگــە قەدەغــەکراوەکان دا شــەڕ لەگــەڵ کــافرو موشــریکە کــان بکەن؟فەرمووی بەڵێ. لەهیچ کتێبێکی مێژوو سیرەدا نەمان دیوە بڕیارو راگەیاندنێك لەسەر کردایەتی ئیسلامی یەوە، لەکۆشکی خەلافەتو مەرکەزی فەرمانڕەوایی یەوە دەرچووبی بۆ فەرمانـدەی هێزێکـی ئیسلامی کەشەڕ رابگـرێ لەبەر ئـەوەی کاتـەکانی (اشهر الحرم) ە مانگە قەدەغە کراوەکانە .

رودراوە، ئـەوەش خـودا لێیـان خـۆش دەبـێ چـونکە یـەکتا پەرسـتو تەقواکارن، لەتەك پێغەمبەر دا لەپێناو ڕەزامەندی خودا دا کۆچیان کردوە، وازیـان لـە زێـدو نیـشتمانی خۆیـان هێنـاوە مـاڵو سـامانی خۆیـان جـێ هێشتووە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی سەرپەرشتی غەزای ئەبوائی کرد ئەو غەزایە یەکەم غەزا بووە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی سەرپەرشتی کـردوە، لەوغەزایـە دا توشـی هـیچ ناخۆشـیو چـورتمێك نـەهاتو بەسـەر بەرزی گەڕایەوە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا چەندان غەزاو پەلاماردانی دوژمـن لەلایـەن موسـوڵمانەکانەوە روی دا. بـەجۆرێك کەموشـریکەکان بەتـەواوی تەنگە تاو بونو حەراسانیان هەڵگیرا.

## واجب بوونی ڕۆژوی مانگی رەمەزان:

هەر لەساڵی دووەمی کۆچی دا ڕۆژوی مانگی رەمەزان فەرزکرا، ئەمـەش دوای ئـەوەی بـیرو بـاوەری ئیـسلامی بەتـەواوی لـەدڵی موسـوڵمانەکان دا چەسپاو لەگەڵ نوێژ کردن راهاتنو وەگری بوون، فـەرمانیان پـێ کـرا کـەخۆ ئامادە بکەنو بۆ وەرگرتنی ئەو حوکمـە شـەرعیانە بەدڵفراوانی یـەوە بـەرەو پیری فەرمانی پەروەردگار بچن. ئیترئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ. سـورة البقـرة (١٨٣)﴾. هەروەها ئایـەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ. سورة البقرة (١٨٥)﴾

# جەنگی بەدری یەکالاکەرەوە ساڵی دووەمی کۆچی:

## گرنگی شەڕی بەدر:

لەمانگی رەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی دا شەڕی بەدر روی دا، ئەم شەڕە شەڕێکی یەکالا کەرەوە بوو دوا ڕۆژو ئاکامی نەتەوەی موسوڵمان‌و ئاکامی بانگە وازی ئیسلامی دەستنیشان کرد.. بەڵکوو ئاکامی مەعنەوی مرۆڤایەتیشی دیاری کرد، خاڵی وەرچەخان بوو، بناغەی هەموو سەرکەوتنە سەرەکییەکانی ئیسلام بوو لەدژی کوفر. هەرچی سەرکەوتن‌و رزگار کردنی وڵات‌و گەل‌و نەتەوەکان کەلەوەدوا رویان دا، هەرحکومەت‌و فەرمانڕەوایەکی ئیسلامی کەلەوەدوا دامەزران هەموویان قەرزداری سەرکەوتنی شکۆمەندی گۆڕەپانی بەدرن، بۆیە پەروەوردگار ناوی ئەو شەڕەی ناوە رۆژی جیاکەرەوە (یوم الفرقان) دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ. (٤١) سورة الأنفال﴾.

سەرگوروشتەی ئەم شەڕە ئەوە بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەواڵی پێ گەیی کەئەبو سەفیانی کوڕی حەرب لەشامەوە بەکاروانێکی زۆرو کالای بەنرخی جۆراو جۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، زۆربەی سەروەت‌و سامانی قورەیشییەکان لەو کاروانەدایە، شەڕی نێوان موسوڵمانان‌و موشریکەکان هەڵگیرسا بوو، قورەیشییەکان هەرچی بۆیان بکرایە دژی ئیسلام ئەنجامیان دەدا، تابۆیان بکرایە خەڵکیان لەئیسلام دەگێڕایەوە، لەمپەرو ئاستەنگی جۆراو جۆریان لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامی‌و موسوڵمانان دادەنان. ماڵ‌و سامانی خۆیان‌و هێزو توانایان‌و چەك‌و وزەیان لەدژی ئیسلام خەرج دەکرد. هەرچی لەتوانایان دا بوایە بۆ دژایەتی ئیسلام ئەنجامیان دەدا،

هەندێ جار مەفرەزەو دەستەیان دەگەیشتنە دەوروبەری مەدینەو باغ و لەوەڕگاکانی، جا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بیستی کەئەبو سەفیان لەشامەوە بەکاروانەکەوە دەگەڕێتەوەو خۆی سەروکاری کاروانەکە دەکا. لەسەرێکی ترەوە ئەبوسەفیان دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام و موسوڵمانان بوو، بۆیە پێغەمبەر خەڵکی هەڵنا بۆ ئەوەی خۆیان ئامادە بکەن بڕۆن پێشی کاروانەکە بگرن و نەهێڵن بگاتە مەککەو روتیان بکەن و کاروانچییەکانیش بەدیل بگرن. بەڵام خەڵکێکی زۆر بەپیر بانگەوازی یەکەوە نەچوون، چونکە مەوزوعەکە نەفیر عام نەبوو بەڵکوو گرتنی کاروانەکە بوو.

ئەبو سەفیان هەواڵی ئەوەی پێ گەیی: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەهێزێکەوە لەمەدینە دەرکەوتووە بۆ دەست بەسەرا گرتنی کاروانەکە، ئیتر هاواری نارد بۆ مەککە کە تازووە بەهانایەوە بێن و پارێزگاری بکەن و نەهێڵن موسوڵمانەکان زەفەریان پێ بەرن. هاوارەکە گەیشتە مەککەو قورەیشییەکان زۆر بەوە تەنگە تاو بوون و بەلایانەوە سوکایەتی پێکردن بوو، کەموسوڵمانەکان پێکێشی ئەوە بکەن کاروانی ئەوان روت بکەن، بۆیە خێرا لەشکرێکی گەورەیان پێکەوە نا بەپەلە بەهاواری کاروانەکەوە هاتن، هیچ کام لەپیاو ماقوڵانیشیان دوا نەکەوتن، هۆزە عەرەبەکانی تریش لێیان کۆبونەوە، هیچ کەس لەتیرەو بەرەبابەکانی قورەیش بەدەگمەن نەبێ دوا نەکەوت، هەموویان بەرق و کینەوە هاتبوون و داخ لەدڵ و رق هەڵساو!!

## ✿ بەپیرەوە چوونی ئەنصارەکان و خۆبەختکردن و ئامادە باشییان بۆ جەنگ!!

کاتێك هەواڵی لەشکر کێشی قورەیشییەکان بەو شێوە بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشت، راوێژی بەهاوەڵان کرد ئاخۆ چی بکەن، لەم

راوێژەشی مەبەستی ئەنصارەکان بوو، چونکە ئەوان پەیمانیان دابوویە کەوەك خۆیان ئەویش بپارێزن، جاکە عەزمی دەرچوونی کرد لەمەدینە ویستی بزانێ ئاخۆ هەڵوێستی هاوەڵانی چۆنە، کۆچکەرەکان رای خۆیان دەربڕی‌و هەڵوێستیان مەردانە بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) جارێکی تر راوێژی پێکردنەوەو ئەوانیش هەڵوێستی خۆیان دووبارە کردەوە، بۆسێیەمجار راوێژی ئاراستە کردنەوە ئەنصارەکان تێگەیشتن کە پێغەمبەر مەبەستی ئەوانەو دەیەوێ هەڵوێستی ئەوانی بۆ دەر بکەوێ. ئیتر سەعدی کوڕی مەعاز هەڵسایە سەر پێ‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا وادیارە مەبەستت ئێمەیەو دەتەوێ دەم‌و دوی ئێمە تاقی بکەیەوە؟ وادیارە ترسی ئەوەت هەیە ئەنصارەکان بەمافی خۆیانی بزانن دەستت لێ بەردەن‌و پشتگیریت نەکەن، مەگەر لەناو ماڵی خۆیان دا بێ؟! ئەی پێغەمبەری خودا من بەزمانی یاریدەدەرانەوە عەرزت دەکەم‌و لەجیاتی ئەوان وەڵامت دەدەمەوە، بڕۆ بۆ کوێ دەچی بچۆ، ئێمە لەخزمەتت داین، لەگەڵ کێ پەیوەندی دەبەستی لەگەڵ کێ دوژمنایەتی دەکەی. ئێمە لەگەڵت داین، لەماڵ‌و سامانی ئێمە چی وەلادەنێ ی بۆ بەرژەوەندی ئایین سەر پشك بە، چیمان دەدەیە ئێمە رازین، دڵنیابە ئەوەی لێمان وەردەگری لەلامان خۆشەویست ترە لەوەی بۆ مان جێ دێڵی، هەرچی فەرمانمان پێ دەکەی ئێمە گوێ لەمشت‌و فەرمانبەر دارین، رامان لەگەڵ ڕای تۆیە، هەرچی بفەرموی جێ بەجێ ی دەکەین، سوێندم بەخودا ئەگەر بەرەو پێش بڕۆی تادەگەیە باڵەخانەی غومدان[١٢٩] ئێمە لەخزمەتت داین‌و هەنگاوێك لێت دوا ناکەوین، سوێندم بە خودا ئەگەر پێشمان بکەوی‌بۆ ناو دەریا لەگەڵت دا خۆی تێ فڕی دەدەین.

---

[١٢٩] غومدان: باڵەخانەیەکە لەصەنعای یەمەن بارەگای پاشاکانیان بووە.

میقدادیش وتی: ئێمە وەکوو قەومی موسا ناکەین بڵێین ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ بڕۆ تۆو خودا کەت شەڕ بکەن ئێمە لێرە دانیشتووین و چاوەڕیی ی سەرەنجام دەکەین. بەڵکوو ئێمە لەگەڵت دەبین و لەراست و لەچەپتەوە، لەپێش و دواتەوە شەڕ دەکەین و دەجەنگین. جاکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم وتانەی گوێ لێ بوون روخساری گەشایەوە، فەرمووی برۆن سەرکەوتن بۆ ئێمە یە موژدە بێ.[١٣٠]

## کێ برکێ گەنج و لاوە موسوڵمانەکان بۆ بەشداریکردن و شەهید بوون:

کاتێك موسوڵمانەکان رویان لەبەدر کردو سوپایان بەڕێ کەوت، کوڕە لاوێك کەناوی عومەیری کوڕی ئەبووە قاص بوو لەتەمەنی شانزەساڵی دابوو، لەگەڵ سوپاکە دەرکەوتبوو دەترسا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەهێڵێ بچێ بۆ غەزا لەبەرئەوەی تەمەنی کەمە، دەیەویست خۆ پەنابداو کەس نەیبینێ، برا گەورەکەی کەسەعدی کوڕی ئەبوو قاص بوو لێ ی پرسی ئەوە بۆ واخۆت دەشاریەوە؟ وتی: دەترسم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بمگەڕێنێتەوە، لەکاتێك دا پێم خۆشە بەشداری بکەم بەڵکوو خودا شەهید بوونم بەنسیب بکا، هەرواش بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ویستی بیگەڕێنێتەوە چونکە نەبو بوە پیاو ئیتر عومەیر گریا، پێغەمبەر بەزەیی پێدا هاتەوە و ڕێگەی پێدا کەلەگەڵیان بچێ بۆ ئەو شەڕە. لەو غەزایەدا شەهید بوو.[١٣١]

---

[١٣٠] زادا المعاد جـ ٣٤٢/١-٣٤٣، سیرە ابن هشام جـ ٦١٤/١ بوخاری لەتەفسیری ئایەتی ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ﴾ موسلیم لە (باب غزوة بدر)دا.

[١٣١] اسد الغابة ١٤٨/٤.

## جیاوازی نێوان موسوڵمانەکانو موشریکەکان لەژمارەو کەرەسەی جەنگ دا

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەپەلە لەگەڵ (٣١٣) سێسەدو سیانزە جەنگاوەردا لەمەدینەوە بەرەورووی کافرەکان بەڕێ کەوت، تەنها دوو ئەسپ سواریان لەگەڵ بوو، حەفتا حوشتریان پێ بوو، دوو دووسێ سێ بەنۆرە سواری حوشترەکان دەبوون، فەرقی سەربازو ئەفسەر نەبوو، جیاوازی نێوان سەرکردەو نەفەری ئاسایی نەبوو، لەو لەشکرەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەکوو سەرکردەی لەشکر ئامادە بوو، ئەبو بەکرو عومەرو گەورە هاوەڵانی تێدا بوون ئاڵای سوپا درایە مەصعەبی کوڕی عومەیر ئاڵای کۆچکەران درایە عەلی ئەبو طالیب، ئاڵای یاریدە دەران درایە سەعدی کوڕی مەعاذ.

کاتێ ئەبو سەفیان بۆی دەرکەوت کەموسوڵمانەکان لە مەدینە بەمەبەستی گرتنی کاروانەکەی وەدەر کەوتوون، ڕێگاکەی خۆی گۆڕیو خوار بووە بۆ کەناردەریاو لەوێوە تێپەڕیو کاروانەکەی ڕزگاری بوو، ئەمجار نامەی نووسی بۆ قورەیشییەکان کە بگەڕێنەوە، بۆی نووسیبوون کەهۆی دەرچوونی ئێوە لەمەککە بەمەبەستی پاراستنی کاروانەکە بوو، ئەوا کاروانەکە بەسەلامەتی ڕزگاری بوو ئیتر واباشە بگەڕێنەوە ، لەشکری قورەیش ویستیان بگەڕێنەوە، بەڵام ئەبو جەهل وتی: نەخەیر هەروا بەئاسانی ناگەڕێینەوە، شەڕ دەکەین، دەبێ دەرسێکی وا بە موحەممەدو هاوەڵانی بدەین جارێکی تر خەیاڵی لەم جۆرە نەکەن!!

ژمارەی سوپای قورەیش هەزارو شتێك بوون هەموو پیاو ماقوڵوجەنگاوەرە ناودارەکانیانو سوار چاکەکانیان هاتبوون، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕوی کردە هاوەڵانو فەرمووی ئەوە مەککەیە هەموو خۆشە ویستەکانی خۆی بۆ ئێوە ناردوە.

## موسوڵمانەکان راوێژ دەکەن:

قورەیشیەکان بەقسەی ئەبو سەفیانیان نەکرد پەرەیان بەپێشڕەوی خۆیان دا تا لەلایەکی دۆڵی بەدەرەوە لەشکر بەزییان کرد، موسوڵمانەکانیش لەلایەکی تری دۆڵی بەدرەوە لەشکری خۆیان دامەزراند. حەبابی کوڕی مونذیر هات وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەم شوێنەی کەواین تێ یدا، شوێنێکە خودا فەرمانی پێکردوی لێ ی بین، بۆمان نیە بەرەو پێشتر بچین یان بەرەو دواوە بگەڕێ ینەوە، یان ئەوەرای خۆتەو شەڕ فرتو فێڵە؟! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموی بەخەیر ئەمە رای خۆمەو شەڕ فێڵو پلانە، وتی: دەسا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شوێنە بەکەڵکی لەشکربەزی ئێمە نایە، شوێنێکی تری دەست نیشان کرد بۆ شەڕ تێدا کردن گونجاو بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: رایەکەت پەسەندەو هەڵسا، هاوەڵانی لەتەکی دا راست بوونەوە، هاتنە خوار ئاوەکەو خۆیان تێدا لەمەکۆدا. . .

هێشتا شەو بەشێکی مابوو پێغەمبەرو هاوەڵانی خۆیان گەیاندە ئاوەکەو حەوزی پێویستیان تێدا دروست کردن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئاوی خواردنەوەی لە کافرەکان قەدەغەنەکرد، هەرچییان بهاتایە بۆ ئاو خواردنەوە رێگە یان لێ نەدەگرت. ئیتر ئەو شەوە بەقودرەتی خودا بارانێکی بەخوڕ باری، ئەم بارانە بووبەکێشەو چورتم بۆ کافرەکانو نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن، بۆ موسوڵمانە بوو بەرەحمەتو زەوییەکەی پەستاوتەوەو قاچیان لەسەری وەستاو هۆیەك بوو لەهۆیەکانی سەرکەوتن، دڵیان ئارامی گرتو دڵە راوکێیان نەما، پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ. سورة الأنفال (١١)﴾.

## پێغەمبەری سەرکردە:

بێگومـان حـەزرەتی موحەممـەد پـێش هـەموو شـتێك پێغەمبـەر بـوو، پێغەمبەرایەتیەکەی سەرچاوەی هەموو ئیلهام و لێزانیو پسپۆڕییەکی بوو، لەم عەزایەدا بەتەواوی لێهاتوویی‌و لێزانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەبواری سەرکردایەتی کردنی سوپادا بەدەرکەوت، وێڕای پەیامە پیرۆزە گەورەکەی کەبنـەمای هـەموو ئیلـهام‌و هیدایـەتێك بـوو، لـەم جەنگـەدا دەرکـەوت: کـە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چەند لێزان‌و کارامەیە لەبەڕێوە بردنی سوپاو سەرو کـاری کردنـی‌و پـڕ کردنـەوەی بۆشـایی ناوسـوپاو کـون‌و کەلەبـەر گـرتن لـەدوژمن‌و پوچـەڵ کردنـەوەی هێـرش‌و پەلامـاردانـەکانی هـەروەها مەزەنـدە کردنـی راسـت‌و دروسـتی بـۆ هێـزی شـەڕ کـەری دوژمـن‌و ژمـارەی جەنگاوەرانی‌و شوێنی دامەزرانی، ئەم لایەنـە بـەوردی لەکتێبـەکانی سیرەدا رون کراونەوە،[١٣٢]

## خۆئامادە کردن بۆ جەنگ:

پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) کـەپرێك (کۆختـە) یـەکی بـۆ خـۆی لەسـەر تەپۆلکەیەك بنیات نا بۆ ئەوەی لێیەوە چاودێری شەڕەکە بکا، بەناو شوێنی شـەڕگەکەدا گـەڕاو بـەتاقی کـردەوە، یەکـە یەکـە دەسـت نیـشانی شـوێنی کـوژرانی سـەرانی قورەیـشی کـرد، فـەرمووی: خـودا حـەز بکـا ئەمـە شـوێنی کـوژرانی فلانـە، ئـەو شـوێنی لـەخوێن داگـەوزانی فیـسارە، ئەمـە شـوێنی

---

[١٣٢] هەرکەسێ بیەوێ بەدورو درێژی ئەو لایەنانە بزانێ بابگەڕێتەوە بۆ کتێبی (حدیث الدفاع) دانراوی لیوا موحەممەد ئەکبەر خان سەرکردەی سوپای پاکستان لەئوردو. هەروا کتێبی (الرسول القائد) دانراوی لیوا روکن خانەنشین مەحموود شیت خەطاب سەرکردەیەکی سوپای عێراق.

رمبانی فلتانە. چونی فەرموو، ئاوا سەرانی قورەیش لەو شوێنانەدا کوژران کەموشریکەکان دەرکەوتن‌و هەردو لەشکر یەکتریان بینی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەوتە دوعاکردن‌و پاڕانەوە، دەیفەرموو: خودایە! ئەوە قورەیشن بەهەموو هێزو توانایانەوە، بەلەخۆبایی بون‌و لوتبەرزییەوە هاتون شەڕ لەگەڵ ئایینی تۆ دەکەن، پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخەنەوە..

ئەو شەوەی بۆ بەیانی شەڕەکە روی دا شەوی هەینی بوو حەڤدەی مانگی رەمەزان بوو، کە رۆژ بووە هەر دوو لەشکر بەرامبەر یەك وەستان، قورەیش هەموو هێزو توانای خۆیان ئامادە کرد.[١٣٣]

## پاڕانەوەو نوزانەوەو دوعاکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): -

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەموسوڵمانەکانی ئامادە کردو هەموو شوێن‌و سەنگەری خۆی گرت‌و ئامادەی جەنگ بوون ئەمجار گەڕایەوە بۆ ژێر کە پرە (کۆختە) کەی خۆی‌و چووە ناوی، ئەبو بەکریشی لەگەڵ دابوو، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستی کرد بەپاڕانەوەو لالانەوەو دوعاکردن، بۆ سەرکەوتنی موسوڵمانان. بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەیزانی ئەگەر موسوڵمانەکان بەپشتیوانی هێزو توانای خۆیان شەڕ بکەن دەرەقەتی کافرەکان نایەن، چونکە هێزەکان تابلێ ی نابەرانبەر بوون، موسوڵمانەکان کەم‌و بێ چەك‌و کەرەسەی شەڕ، قورەیشیەکان زۆرو پڕ چەك‌و تەیار، ئاشکراشە هەرکاتێ هێزێکی زەعیف لەگەڵ هێزێکی زۆرو پڕ چەك دا جەنگ بکەن، هێزە زەعیفە کە تێ شکاوە.!

---

[١٣٣] زاد المعاد جـ ٣٤٣/١-٣٤٤.

جاکە پێغەمبەر هەردوو هێزەکەی بینین، لایەنی موسوڵمانەکانو لایەنی قورەیشییەکان، لێی مەعلووم بوو کە دوو هێزەکە نابەرانبەرن، ئیتر قورسایی یەکی پتەوی خستە تای موسوڵمانەکانەوە، بەرواڵەت کێشەکەیانی هێنایەوە تایم، ئیتر هاواری کردە ئەو خودایەی کەکەس ناتوانێ بڕیاری هەڵبوەشێنێتەوە، حوکمو قەضای ڕەت ناکرێتەوە، (وما النصر الا من عند الله) شەفاعەتی کرد، پاڕایەوە بۆ ئەوەی هێزی کەمی موسوڵمانان سەربخا، پشتیوانی لەشکری ژمارە کەمو بێ کەرەسە بکا، دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمانو دەیفەرموو: (اللهم ان تهلك هذه العصابة لاتعبد بعدها في الأرض) خودایە! ئەگەر یارمەتی ئەم کۆمەڵە موسوڵمانە نەدەی لەوە بەو لاوە لەزەوی دا پەرستشت بۆ ناکرێ. ئیتر دەستی کرد بەنوزانەوەو هاوار کردن لەخوداو دەیگوت: (اللهم أنجزني ماوعدتني اللهم نصرك!) خودایە ئەوەی وادەت پێداوم بۆم جێ بەجێ بکە، خودایە یارمەتی تۆمان دەوێو چاوەڕوانی ئەوەین. هێندەی دەست بەرز کردەوە تاریداکەی لەسەر شانی کەوتە خوارەوە، ئەبو بەکریش لەلایەوە بوو دڵنەوایی دەکردو بەزەیی پێدا دەهاتەوە چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئێجگار زۆر لالأیەوەو نوزایەوەو کڕوزایەوەو دوعای کرد.

## پێناسەیەکی ورد بۆ موسوڵمانانو دیاریکردنی ڕۆڵیان لەژیان دا:

بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دوعاو پاڕانەوەی بۆ ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە کرد لەوکاتە چارە نووس سازەدا بەو وتەکورتو پڕمانایەی کەبتمانە بەخۆو ڕاڕایی و ئارامگرتنو هەژاری شان بەشانی یەك پێکەوە گرێ دابوو، بەراستی وتەکەی بەڕێزی وردترین پێناسە بوو بۆ نەنەتەوەی

موسوڵمان، باشترین دیاریکردنی سنوورو رۆڵو پایەی موسوڵمانان بوو لەناو گەلان دا، نرخو رێزی لەجیهان دا دەرخستن، قایمو قوڵی سەنگەریانی چەسپاند، ئەویش بانگەوازی بۆ رێبازی خوداو دڵسۆزی بەرامبەر ئایینو بەندایەتیکردنی راستاڵانە بۆ خودا [١٣٤] بێگومان ئەو سەرکەوتنە سەرنج راکێشەی کە هەموو ئەزموونێکی رواڵەتی مرۆڤانەی پوچ کردەوە، راستی ئەو وتەیەی پێغەمبەرو وردی پێناسەکەی چەسپاند، لەراستی دا وێنە کێشانێکی پڕاو پڕی بێ غەلو غەش بوو بۆ نەتەوەی ئیسلام.

پاشان پێغەمبەر هاتەوە لای هاوەڵانیو هەڵینان بۆ شەڕکردن، عوتبەی کوڕی رەبیعەو شەیبەی برایی و وەلیدی کوڕی هاتنە مەیدان، لەنێوان هەردو لەشکرەکە وەستان داوای ئەوەیان کرد سێ کەس لەموسوڵمانەکان بۆیان بچنە مەیدان، سێ گەنجی ئەنصاری بۆیان چوونە مەیدان، وتیان: ئێوە کێن؟ وتیان کۆمەڵێکین لەیاریدە دەران، وتیان: ئێمە ئیشمان بەئێوە نیە، دەمانەوێ هاوشانی خۆمان بێتە مەیدانمان لەخزمو کەسو کاری خۆمان بابێنە گورەپان بۆ مان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عوبەیدەی کوڕی (الحارث) ی کوڕی (عبدالمطلب) ی کوڕی عەبدی مەناف هەستە بچۆرە مەیدان، هەستە حەمزە بڕۆرە مەیدان، عەلی هەڵسە بچۆرە مەیدان، جاکە ئەم سێ پاڵەوانە موسوڵمانە چوونە مەیدان، کوڕانی رەبیعە وتیان: هاوشانی خۆمانن، عوبەیدە کەلە هەموانیان بەتەمەن تر بوو، لەگژ

---

[١٣٤] لەحەدیثی صەحیح دا لە عومەری کوڕی خەتا بەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ کەڕۆژی بەدر هات، پێغەمبەرو سێسەدو نۆزدە لەهاوەڵانی لەشکر بەزییان کرد پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) روی کردە ڕۆگەو دەستی بەرزکردنەوەو کەوتە پاڕانەوەو لاڵانەوەو دەیفەرموو (اللهم انجزني ماوعدتني اللهم آت ماوعدتني، اللهم ان تهلك هذه العصابة من أهل السلام لاتعبد في الأرض ( باب الأمداد بالملائكة في غزوة بدر)

عوتبە راچو، حەمزە کەوتە وێزەی شەیبەی کوڕی رەبیعە، عەلی کوڕی ئەبو طالبیش کەوتە زۆرانبازی لەگەڵ وەلیدی کوڕی عوتبە. حەمزەو عەلی زوو بەرامبەرەکانی خۆیان کەلە پارچە کردنو لەناویان بردن، بەڵام عوبەیدەو عوتبە ماوەیەك یەکتریان هێناو برد یەکەی دو برینیان لێکتر کردبوون، ئەمجار حەمزەو عەلی بەشمشێرەکانیان هەڵمەتیان بردە سەر عوتبەو کوشتیان، عوبەیدەیان بە برینداری لەمەیدان بردە دەرو پاش ماوە یێك گیانی دەرچوو شەهید بوو. ئەمجار هەردولا بەرەو روی یەکتر هاتنو لێك نزیك بوونەوە، کافرەکان زیاتر هاتنە پێشەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی بڕۆن بۆ بەهەشتێك پانتایی یەکەی بەقەی پانتایی ئاسمانەکانو زەوییە!!

## یەکەم شەهیدی بەدر:

عومەیری کوڕی (الحمام) ی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووت: ( بەهەشتێك پانتایی یەکەی بەقەی ئاسمانەکانو زەوی یە؟) فەرمووی بەڵێ: وتی: (بەخبەخ) ئەی پێغەمبەری خودا، وتی: چی وای لێ کردی وشەی (بەخ بەخ) بڵێ ی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا سوێندم بەخودا حەزدەکەم لەئەهلی بەهەشت بم، فەرمووی تۆ لە ئەهلی بەهەشتی، هەندێ خورمای لەهەمبانەکەی خۆی دەرهێنان بۆ ئەوەی بیانخوا، دەستی کرد بەخواردنیان پاشان وتی: بەخوا تامن ئەم خورمایانە دەخۆم زۆری پێ دەچێ، ئیتر خێرا خورماکانی فڕی دانو کەوتە وێزەی کافرەکانو شەڕی کرد تاشەهید بوو، ئەم زاتە یەکەم شەهیدی جەنگی بەدرە.[١٣٥]

---

[١٣٥] زاد المعاد جـ ٣٤٥/١ وسيرة إبن كثير جـ ٢/ ٤٢١.

ئیتر موسوڵمانەکان لەشوێنی خۆیان دامەزراوو جێگیر بوون، دانیان بەخودا گرتبوو بەصەبرو پشوو درێژ بوون، زیکری خودایان دەکردو سەرگەرمی شەڕو بەربەرەکانی بوون، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خودی خۆی شەڕێکی مەردانەی کرد، نزیك ترین کەس بوو لەدوژمنەوە[١٣٦] لەهەموو جەنگاوەرە موسوڵمانەکان ئازاترو بەوورەتر بوو، پەروەردگار فریشتەی نازڵکردن بۆ یارمەتیدانی موسوڵمانە کان و کوشتارێکی باشیان لێ کردن، بەڵگەی نازڵبوونی فریشتە بۆیارمەتیدانی موسوڵمانەکان ئەو ئایەتەی قورئانە کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرَّعْبَ فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ. سورة الأنفال (١٢)﴾

## پێشبڕکێ برایان لەکوشتنی دوژمنانی خوداو پێغەمبەری خودا:

شەڕ گەرم بوو، گەنجە موسوڵمانەکان کەوتنە پێشبڕکێ بۆ شەهید بوون و کافرکوشتن و بەمراز گەیشتن، پێشبڕکێ کەلەنێوان دۆست و خۆشەویست و برا دابوو. عەبدور رەحمانی کوڕی عەوف دەڵێ ڕۆژی بەدر من لەریزی جەنگاوەران دا بووم شەڕم دەکرد، کەڕۆم وەرگێڕا روانیم لەلای راست و لەلای چەپمەوە دوو لاوی تازە پێگەیشتوم بینی وەکوو ئەوە بڵێ ی من تێم رانەدەدین بتوانن هیچ بکەن، کەچی یەکیان: بەسرتەوە سەری هێنایە بنگوێم بۆ ئەوەی هاوەڵەکەی گوێی لێ نەبێ، وتی: مامە، ئەبو جەهلم پێ نیشان بدە، وتم: رۆڵە ئەوا نیشانیشم دای، دەتوانی چی بکەی؟ وتی:

---

[١٣٦] سیرة ابن كثير جـ ٤٢٥/٢.

پەیمانم داوە بەخودا ئەگەر چنگم کەویٚ بیکوژم یان خۆم بەکوژ بدەم. کوڕە لاوەکەی تریشیان بەدزی هاوەڵەکەیەوە هەمان قسەی پیٚ گوتم، ئەمجار عەبدو ڕرەحمان دەڵیٚ: من زۆر کەیف خۆشبووم کەبینم لەنێوان دوجەنگاوەردام ئیتر منیش ئەبو جەهلم نیشان دان، هەردووکیان وەکوو هەڵۆی چنگ بەخوێن هەڵمەتیان بۆ بردو لێی نزیك بوونەوە هەتا دەستی خۆیان لیٚ وەشاندو کوشتیان. ئەو دولاوە هەردوکیان کوڕی عەفراء بوون[١٣٧]

جاکە ئەبو جەهل کوژرا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەوە ئەبو جەهلە فیر عەونی ئەم نەتەوەیە.[١٣٨]

## سەرکەوتنی گەورەو مەزنو ئاشکرا

جاکە شەڕ کۆتایی هاتو سەرکەوتنی موسوڵمانەکان دەرکەوتو تێشکانی کافرەکان بوو بەئەمری واقیع. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (الله اكبر، الحمد لله الذي صدق وعده ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده). شکۆمەندی هەر بۆ خودایە زاتی پاکی لە هەموو کەسو هەموو شتێك بەرزو پیرۆز ترە، سوپاس بۆ ئەو خودایەی وادەی خۆی بەراست گێڕا، یارمەتی بەندەی خۆی دا، هەر ئەو کۆمەڵانی دوژمنکاری شکاندن. پەروەردگار لەبارەی سەرکەوتنی موسوڵمانەکان لەبەدردا دەفەرمویٚ: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ. سورة آل عمران (١٢٣)﴾.

---

[١٣٧] بڕوانە صحيح بوخاری (كتاب المغازي - باب غزوة بدر).

[١٣٨] سيرة ابن كثير جـ ٢/٤٤٤.

ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی کرد کوژراوەکانی قورەیش فڕێ بدەنە شیوی قولەیبەوە، هەموویان لەشیوەکەدا گرد کرانەوە، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەریان راوەستاو فەرمووی ئەی ئەهلی قولەیب! ئایا بۆتان دەرکەوت ئەوەی خودا وادەی پێدا بوون حەقەو هاتە جێ؟ بێگومان من ئەوەی خودا وادەی پێدابووم هاتە جێ و حەقە.(١٣٩)

لەغەزای بەدردا لەگەورە گەورانی قورەیش حەفتا کەسیان لێ کوژرابوو، حەفتا کەسیشیان لێ بەدیل گیرا بوو، لەموسوڵمانەکانیش چوار جەنگاوەر شەهید بوون شەشیان لەکۆچکەران و هەشتیان لەیاریدە دەران بوون.

## کاریگەری شەڕی بەدر:

دوای تەواوبوونی جەنگی بەدر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلەشکرە سەرکەوتوویی یەکەیەوە گەڕایەوە بەرەو مەدینە، سەرفرازو شکۆمەند، ترسی خستە دڵی هەموو دوژمنەکانی لەمەدینەو دەورو بەری دا، دوای شەڕی بەدر خەڵکێکی زۆر لەئەهلی مەدینە موسوڵمان بوون هەر لەگەڵ شەڕی بەدر تەواو بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەپێش خۆیەوە دوو مزگێنی دەری ناردنەوە بۆ مەدینە، یەکیان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەواحە بوو مزگێنی دابە دانیشتوانی مەدینە وتی: ئەی کۆمەڵی یاریدەدەران، مزگێنی بێ لێتان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەلامەتە، ژمارەیەکی زۆریش لەقوڕەیشییەکان کوژراون، ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گیراوە، ئەمجار یەکە یەکە ناوی کوژراوەکانی قورەیشی دەهێنان، ماڵەو ماڵ دەگەڕاو مزگێنی پێ دەدان، منداڵان شوێنی کەوتبوون لەخۆشیان دا شیعرو

(١٣٩) سيرة ابن هشام جـ ١/٦٣٨-٦٣٩.

سرودیان دەخوێندنەوە، خەڵکەکەش هەیانبوو بڕوایان دەکرد، هەیانبوو دوو دڵ بوو، هەتا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەییشتەوە مەدینە دیلەکانیان هێنان‌و رایاننواندن، شەقران کەمەولای پێغەمبەر بوو سەرپەرشتی دەکردن، هەتا گەییشتنە شوێنێك کە پێ ی دەڵێن: (الروحا) لەوێ دا موسوڵمانەکان پێشوازییان لێ کردن‌و پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لێ کردن!.

هاوکات لەمەککەدا شین‌و گابۆڕ پەیدا بوو، گریان بۆ کوژراوان‌و لاواندنەوەیان زۆر بوو، ترس‌و لەرز کەوتە ناو دڵی دوژمنانەوە، ئەبوسەفیان لەسەر خۆی فەرز کرد کەئاو بەسەری خۆی دا نەکاو خۆنە شوا هەتا ئەم تۆڵە لە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەکاتەوە، ئەو موسوڵمانانەی لەمەککەدا بەدزی یەوە مابوونەوە لەدڵ‌و ناخی خۆیان دا هەستیان بەشکۆمەندی دەکرد.

## ☙ برایەتی ئایینی لەژور برایەتی ریشەو نژادەوەیە:

لەڕۆژی بەدردا ئەبو عەزیزی کوڕی عومەیری کوڕی هاشم کەبرای باوك‌و دایکی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو بەدیل گیرا. موصعەبی برای لەو ڕۆژەدا خاوەنی (لیواء) ئاڵا بوو، ئەبو عەزیزیش هەڵگری ئاڵای موشریکەکان بوو، موصعەبی برای بەلای دا تێپەڕیێ پیاوێکی ئەنصاری دەستی دەبەستن، موصعەب وتی: بەقوربانت بم توند دەستەکانی ببەستە، ئەمجار وتی: ئەم پیاوە دایکی دەوڵەمەندە لەوانەیە فیدیەی بۆ بدا، ئەبو عەزیز وتی: برای خۆم ئەمەیە ئامۆژگاریت دەربارەی من؟! موصعەب پێ ی گوت ئەتۆ برام نی ئەوە برامە.

## فێرکردنی منداڵی موسوڵمانەکان لەجیاتی فیدیەی دیلی

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دیلەکانی عەفو کردن، فیدیەی لێ وەرگرتن بەگوێرەی دەوڵەمەندەی و هەژارییان فیدیەی لێ وەردەگرتن... ئەوەی هیچی نەبوایە بەمنەت بەرەڵڵای دەکرد، قورەیشییەکان بۆ هەندێ لەدیلەکان فیدیەیان ناردو پێغەمبەر بەرەڵڵای کردن، لەنێو دیلەکان دا هەیانبوو خوێندەوار بوو، ماڵو سامانیشیان نەبوو، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەجیاتی فیدیە داوای لێ کردن هەریەکەیان دە منداڵی موسوڵمانان فێری خوێندەواری بکەن، زەیدی کوڕی ثابیت یەکێکە لەوانەی بەم شێوە فێری خوێندەواری بووە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەرێزی عیلمو زانیاری لەئیسلام داچەند نرخی هەیە.[١٤٠]

## غەزاو سیریەکان

لەدوای شەڕی بەدر ئەبو سەفیان لەسەر خۆی پێویست کردبوو کەئاو رێی سەری نەکەوێ هەتا غەزای موسوڵمانەکان نەکاو تۆڵەی بەدریان لێ نەستێنێ. بەدوو سەد سوارەوە لەمەککە دەرچوو بۆ ئەوەی سوێندەکەی لێ نەکەوێ، ئیزنی لەسەلامی کوڕی میشکەم وەرگرت کە گەورەی بەنو نەضیر بوو، ئەویش ئیزنی داو میوانداری کرد ئاوی بۆ دابین کرد، چاو ساغی کردن، ئەمجار ئەبو سەفیان هەندێ کەسی نارد دو پیاوی ئەنصارییان شەهید کردن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هێزێکی پێکەوە ناو شوێنیان کەوت ئەبو سەفیانو لەشکرەکەی بەرەو مەککە هەڵاتن، دەترسان موسوڵمانەکان

---

[١٤٠] مسند امام احمد ج ١/٢٤٧ وطبقات ابن سعد ج ١٤/٢.

پێیان بگەن، بۆیە بۆ بارسوکیو خێرا هەلاَتن هەرچی پێیان بوو لەتێشوو خواردەمەنی فڕێیان دا، زۆربەی تێشوەکە شیان قاوت و (سویق) بوو، بۆیە ئەم غەزایە ناو نرا (غزوه السويق).

بەنو قەینوقاع یەکەم کۆمەڵی جولەکە بوون کە پەیمانی نێوان خۆیانو پێغەمبەریان هەڵوەشاندەوە، لەغەزای بەدرو ئوحوددا شەڕیان دژی پێغەمبەرو موسوڵمانان کردوە، زۆر ئەزیەتی موسوڵمانەکانیان دا، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەمارۆی دانو پانزە ڕۆژو شەو ئەم گەمارۆدانە بەردەوام بوو، دوایی لەسەر بڕیاری پێغەمبەر لەقەلاَکەیان دابەزین، سەرۆکی دوو ڕووەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئوبەی شەفاعەتی بۆ کردن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەبەر خاتری ئەو مەرەخەسی کردن، ژمارەیانحەوت سەد شەڕکەر بوو، ئیشو کاریان ئاڵتونچیەتیو بازرگانی بوو[١٤١]

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لێبوردنێکی گشتی بۆ ئەو جولەکانە دەرکرد بەمەرجێ شاری مەدینە بەجێ بێڵن، بۆ خۆیان شوێنێکی تر هەڵبژێرن و ڕەوی بۆ بکەن، لەمەدینە دەرکران بەرەو ولاَتی شام ڕەویان کرد، گیانیان پارێزرابوو، بۆشیان هەبوو هەریەکەیان باری حوشترێك یان چەندێك دەتوانن کالاَ لەگەڵ خۆیان بەرن، ئیتر بەنو قەینوقاعەکان مەدینەیان جێ هێشت بەسەلاَمەتی رزگاریان بوو، ئەمەش دوای ئەوەی پێیان وابوو سزای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانو یاخی بوونیان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ، کوشتو بڕکردنیانە.[١٤٢]

---

[١٤١] زاد المعاد جـ ٣٤٨/١.

[١٤٢] زاد المعاد جـ ٤٢٥/١ بێگومان وەدەرنانی هۆزی بەنو قەینوقاعی جولەکە لەمەدینە یەکێکە لەو هۆکارە گرنگانەی پلەو پایەی پێغەمبەر یان لەمەدینە دا چەسپاند، هۆی

کەعبی کوڕی ئەشرەف یەکێك بوو لەسەرانی جولەکە، زۆری ئەزیەتی پێغەمبەر دەدا، شیعری دڵداری بەژنی هاوەڵان دا هەڵدەگوت، جاکە شەڕی بەدر رویدا چوو بۆ مەککە، لەوێ قورەیشییەکانی هەڵنان بۆ ئەوەی زیاتر دوژمنایەتی پێغەمبەرو موسوڵمانان بکەن، پاشان بەو حاڵەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی کێ بۆم لەعودەی کەعبی کوڕی ئەشرەف دێ، بێگومان ئەو خوێرییە زۆری ئەزیەتی خوداو پێغەمبەری خودا داوە؟ چەند پیاوێکی ئەنصاری خۆیان بۆ فیدایی کردو پارێزیان بردێو کوشتیان.

---

ـەم دەرکردنە وەکوو هەندێ ریوایات باسی لێوە دەکەن کێشەیەکی بچوك بوو لەنێوان جولەکەی قەینوقاعو برێ بازرگانی موسوڵمان لەبازاڕی مەدینەدا.

ـونتجمری وات ئەوەرەت دەکاتەوە کە هۆی ئەم دەرکردنە چیرۆکی ئەو ژنە موسوڵمانەی کەلە بازاڕی قەینوقاع دا دەستدرێژی کرایە سەر وەکوو لەکتێبەکانی ـیرەدا هاتووە. ناو براو دەڵێ: ئەو هۆیانەی کە موحەممەدیان هەڵنا بڕیاری ـەرکردنی جولەکە لەمەدینەدا وەربگرێ وادیارە زۆر لەو روداوە قوڵ ترو گەورەتر بێ ـ شکرایە جولەکەکان ئامادە باشی خۆیان دەرنە بڕی بۆ ئەوەی موسوڵمان ببنو ـکۆمەڵگای ئیسلامی بتوێنەوە.

ـلایەکی ترەوە پێغەمبەر ئاگاداری هەموو ئەو کەینو بەینانە بوو کە جولەکەکان ـگەڵ قورەیشییەکان دا هەیان بوو پەیوەندی دۆستایەتی جولەکەکان و قورەیشی ـەککە لە موحەممەد شاراوە نەبوو، ئەمەش سەرپێچی یەکی ئاشکراو عەیان بۆ ئەو ـیمانناموەی کەلە نێوان موسوڵمانەکان و جولەکە کان دا مۆرکرابوو.

# غەزای ئوحود لەمانگی شەوالی ساڵی سێیەمی کۆچی

## دەمارگیریو تۆڵە ستاندنەوە:

کاتێك کەلە شەڕی بەدردا پیاوماقوڵانی قورەیش توشی ئەو نوشوستییە هاتن: حەفتا کەسیان لێ کوژراو حەفتاشیان لێ بەدیل گیرا، لەشکرە شکاوەکەیان بەو حاڵە شپرێوە گەییشتەوە مەککە، بەڵاکەیان زۆر گەورە بوو پیاوانی مەککە (کوڕ کوژراوو برا کوژراوو باب کوژراو) رۆیشتن بۆ لای ئەبو سەفیانو قسەیان لەگەڵ کرد، هەروا باسی چۆنیەتی شەڕەکەو شکست هێنانیان بەو جۆرە بەدوورو درێژی بۆ باسکرا، ئەوانەی ماڵو سامانیان لەکاروانی بازرگانیەکەدا هەبوو، بڕیاران دا ماڵەکەیان تەرخان بکرێ بۆ پێداویستی شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان، هەموو قورەیش بڕیاریان دا شەڕی مانو نەمان لەگەڵ پێغەمبەرو هاوەڵانی دا بکەن، شاعیرەکانیان بەشیعری حەماسیو وروژێنەر خەڵکیان هەڵنا بۆ شەڕو غیرەتیان وەبەرنان. پاش ئامادە باشی یەکی تەواو لەنێوەڕاستی مانگی شەو والی ساڵی سێیەمی کۆچی دا قورەیشیەکان بەهەموو هێزو تواناو پێداویستی یەکی شەڕەوە بەگشتی لەمەککە دەرکەوتن، گەنجو پیریان، ژنی تانە دەرو قسە نەستەقیشیان لەکەژاوەدا لەگەڵ خۆ بردن، سەرانی قورەیشو پیاو ماقوڵانیان خێزانەکانی خۆیان لەگەڵ خۆ هێنانو هاتن تاگەییشتنە بەرامبەر مەدینەو لەشکر بەزییان کرد.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وای بەباش دەزانی کەموسوڵمانەکان لەمەدینەدا بمێننەوەو دەرنەچن، ئەگەر قورەیشییەکان هێرشیان بۆ کردن بۆ ناو مەدینە، لەوێ دا شەڕ بکەن، بەڵکوو پێغەمبەر درودی خودای لێ بێ پێ ی ناخۆش بوو لەمەدینە دەربچن، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی رای پێغەمبەری

پەسەند کرد، کۆمەڵێك لەو موسوڵمانانەی ئامادەی شەڕی بەدر نەبوو بوون و ئەو سەروەرییەیان لەکیس چو بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا بمانبە، بۆ دەرەوە بۆ روبەرو بوونەوەی دوژمن، باوا نەزانن ئێمە لێیان ترساوین بێ هێزو لاوازین.

ئیتر وازیان لە پێغەمبەر نەهێناو داوایان لێ کرد لەمەدینە دەربچێ و لەدەرەوەی شار بەرەنگاری قورەیشییەکان ببنەوە، هێندەیان ئیلحاح کرد هەتا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چووە ماڵێ و زرێ ی شەڕی لەبەر کرد، ئیتر ئەمجار ئەوانەی لەوەپێش ئیلحاحیان لە پێغەمبەر کرد بوو بۆ دەرچوون لەمەدینە لەهەڵوێستی خۆیان پەشیمان بوونەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە زۆرمان لێ کردی، مافی ئەوە مان نەبوو ئەوەندە ئیلحاحت لێ بکەین، ئەگەر ئارەزوت لێ یە دانیشەو ناچینە دەرەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ هیچ پێغەمبەرێك رەوانیە کەزرێی لەبەر کرد بۆ شەڕ تاشەڕ نەکا دایکەنێتەوە، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەسوپایەکی هەزار جەنگاوەرییەوە لەمەدینە وەدەرکەوت، کاتێك لەشکری موسوڵمانەکان گەییشتە نێوان مەدینەو کێوی ئوحودەوە، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بەسێیەکی لەشکرەکەوە گەڕایەوە، وتی: پێغەمبەر بەقسەی منی نەکرد بەڕای ئەوان جولایەوە، بۆیە من هاوکاری ناکەم.

## لەگۆڕەپانی ئوحوددا:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلەشکرەکەیەوە پێشڕەوی کرد تاگەیشتە شیوی ئوحود، کێوی ئوحود سێ کیلۆمەترێك لەمەدینەوە دوورە، لەوێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) موسوڵمانەکانی وادە مەزراند پشتیان کردە ئوحود، فەرمووی کەس شەڕ نەکا تافەرمانی شەڕکردن رادەگەیەنین. ئیتر پێغەمبەر

(درودی خوای لەسەربێ) ئامادە باشی بەموسوڵمانان کرد بۆ شەڕ: کەژمارەیان حەوتصەد جەنگاوەر بوو، عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە سەر کاری تیر هاوێژەکان: کەژمارەیان پەنجا کەس بوو، پێیانی فەرموو بەتیرەکانتان ئەسپ سوارمان لێ بتەکێننەوە، مەهێڵن لەدواوە پاشبڕ مان بدەن، ئێمە سەرکەوین یان تێ بشکێین ئێوە شوێنی خۆتان بەجێ مەهێڵن و سەنگەری خۆتان بەرمەدەن. تەنانەت ئەگر بەچاوی خۆتان بینیتان باڵندە عەسکەر دەڕفێنێ ئێوە لەم شوێنە مەجوڵێن.[١٤٣] پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زرێیەکی تری لەسەر زرێکەیەوە لەبەر کرد ئاڵاکەی دابە موصعەبی کوڕی عومەیر خودای لێ رازی بێ.

## گەنجو لاوە موسوڵمانەکان پێشبڕکێ دەکەن:

ڕۆژی دەرچون بۆ غەزای ئوحود، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆمەڵێکی لاوی موسوڵمانی گێڕانەوە لەبەر ئەوەی تەمەنیان بچوك بوو، سومرەی کوڕیجوندوبو رافیعی کوڕی خودەیجی گەڕاندەوە کە تەمەنیان پانزە ساڵ بوو، باوکی رافیع تکای بۆ رافیعی کوڕی کرد، وتی ئەی پێغەمبەری خودا رافیعی کوڕم تیر ئەندازێکی باشە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕێگەی بەودا، ئەمجار سومرەی کوڕی جوندوبیان هێنا ئەویش لەتەمەنی رافیع دا بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەڕاندییەوە، سومرە وتی: ڕێگەت بەرافیع داو منت گەڕاندەوە؟ وەڵڵاهی ئەگەر زۆرانی لەگەڵ بگرم لەعەرزی دەدەم زۆرانیان پێ گرتن، سومرە رافیعی بەعەرزدا داو خستی، ئیتر ڕێگە بەسومرەش درا هاوبەشی بکا، لەگەڵ سوپاکەوتو شەڕی کرد، لەشکری موسوڵمانەکانو

---

[١٤٣] زاد المعاد جـ ٣٤٩/١ وصحیح البخاری باب غزوة احد من کتاب المعازی.

ـشـکری قورەیـشییەکان بەرامبـەر یـەکتر وەسـتانو لێـك نزیـك بوونـەوە، هێنـدی کچی عوتبـە لەگـەڵ کۆمـەڵێك ئافرەتی تر لەپشتی جەنگاوەرانەوە ـستیان کرد بەدەف لێدانو هەڵیان دەنان بۆ شەڕ کردنو خۆڕاگری، شەڕ ـستی پێکردو گەرم بوو، ئەبو دوجانە شمشێرێکی لە پێغەمبەر وەرگرت و ـەی دایە کەمافی تەواو بەو شمشێرە بدا، ئیتر کەوتە وێزەی کافرەکانو هەرکەسێکی توش بهاتایە دەیکوشت.[١٤٤]

## شەهید بوونی حەمزەی کوڕی عەبدو لموتەلیب و موصعەبی کوڕی عومەیر رەزای خودایان لێ بێ:

حـەمزەی کـوڕی عەبدولموتـەلیب یەکێکـە لەپاڵەوانـە جـەنگاوەرە ـ وەدارەکانی سوپای موسـوڵمانان، لەشـەڕی ئوحـوددا شـەڕێکی مەردانـەی کرد. ژمارەیەکی زۆری لەپاڵەوانەکانی سوپای قورەیش کوشت. وەحشی. کەبەندەی جوبەیری کوڕی موطعیم بوو خۆی بۆ مەلاس دابوو، ئەم وەحشی ـە حەربە هاوێژێکی کارامـا بوو کەم واهەبوو حەربە بهاوێژێو نـەیپێکی. جوبەیر کەئاغای وەحشی بوو وادەی پێدا بوو ئەگەر بتوانێ حەمزە بکوژێ ـزادی بکا، جوبەیر زۆر داخ لەدڵ بوو چونکە ڕۆژی بەدر طوعەیمـەی مامی کوژرابوو، هینـدیش وەحـشی هەڵـدەناو دەنـە دەنـەی دەدا بـۆ کوشـتنی حەمزەو دەیەویست داخی دڵی خۆی پێ بڕێژێ، ئیتر وەحشی بە رمەکەیەوە مەڵمـەتی بـۆ هـەمزە بـردو حەربەیـەکی ئاڕاسـتە کـردو شـەهیدی کـرد. موصعەبی کوڕی عومـەیر پارێزگاری لە پێغەمبەر دەکرد هەتا شـەهید بوو موسـوڵمانەکان مەردانـە شـەڕیان کـردو تـەنگیان بـەکافرەکان هەڵـچنی،

---

سیرة ابن هشام جـ ٢/٦٦ (٢) هەمان سەرچاوە ص ٦٧-٦٨.

پەروەردگار یارمەتی دان و سەری خستن و وادەی خۆی بۆ هێنانەدی، دوژمن پەشۆکاو شکا ئافرەتە دەف لێدەرو دەنە دەنە دەرەکان پشتیان هەڵکردو هەڵاتن، لەم بارودۆخەدا کە موسریکە کان تێشکابون و خەریکی هەڵاتن و خۆر رزگار کردن بوون بەرەو پاش گەڕانەوە تاگەییشتنەوە لای ئافرەتەکانیانن. جا کە تیر ئەندازە موسوڵمانەکان سەیری گۆڕەپانی جەنگیان کردو لەشکری دوژمنیان ئاوا بەپەشۆکاوی دی، دڵنیا بوون لەسەر کەوتنی موسوڵمانە کان هاواریان لەیەکتر کرد: کوڕینە تاڵان، تاڵان فریا کەون بەشمان نەما!!.

هەرچەندە ئەمیرەکەیان فەرمودەی پێغەمبەری بیر هێنانەوەو پێ ی گوتن کە ئەو پێ ی فەرمون: بەهیچ شێوەیەك ئەوان ئەم بەندەنە بەر نەدەن و لەهیچ بارودۆخێك دا چۆڵی نەکەن، بەگوێیان نەکرد، چونکە پێیان وابوو موشریکەکان توانای گەڕانەوەو پاشقول گرتنیان نەماوە، بیر لەوە ناکەنەوە لەدواوە بێنەوە بەندەنەکە بگرن، ئیتر بەندەنەکەیان جێ هێشت و پشتی موسوڵمانە شەڕ کەرەکانی گۆڕەپانی شەڕیان چۆڵ کرد، ڕێگا ئاچوخ بوو بۆ ئەوەی خالیدی کوڕی وەلید کە سەرکردەی سوارەکانی قورەیش بوو لەدواوە سەرکەوێتە سەر کەژەکەو بەندەنەکە بگرێ و ئەو هەشت نۆ تیر ئەندازەی لەگەڵ عەبدوڵلای ئەمیریان دا مابوونەوە گەمارو بداو شەهیدیان بکا. ئیتر هەڵگرانی ئالای موشریکەکان کە لەوە پێش توشی تێ شکان و کوشتن و هەڵاتن بوو بوون و ئالاکەیان لەقوڕ چەقیبوو کەس لەموشریکەکان نەیدەوێرا توخنی بکەوێ، یان لێی نزیك بێتەوە، بەلام کە خالید بەهێزەکەیەوە پاشی لەموسوڵمانەکان گرت و پەلاماری دان، بارودۆخی شەڕەکە گۆڕا، لەو کاتە ناسك و چارەنووس سازەدا یەکێ لەموشریکەکان نەڕاندی وتی: موحەممەد خۆی کوژراوە!! ئەم هەواڵە وەکوو هەورە تریشقە

لەموسـولمانەکانی داو بـۆ دواوە گەڕانـەوە، موشـریکەکان بەهـەلیانزانی و هێرشیان هێنا، بەراستی ساتە وەختێکی ناخۆش و ڕۆژێکی تەنگانەوە پڕ چـورتوم بـوو، موسـولمانەکان بەتـەواوی پەشـۆکان، کافرەکـان توانیـان لـە پێغەمبەر نزیك ببنەوەو بەردی تێگرن، روخساری بریندار بوو، ددانی شـکا، سـەری شـکا، خـوێن لـەدەم و چـاوی دەهاتـە خـوار خێـرا خێـرا خوێنەکـەی دەسڕی و دەیفەرموو: (كيف يفلح قوم خضبوا وجه نبيهم وهو يـدعوهم الى ربهـم) چۆن نەتەوەیـەك سـەرکەوتوو دەبن دەم و چاوی پێغەمبەرەکـەیان خوێنـاوی بکەن وەلحالێ ئەو بانگەوازییان دەکا بۆ لای خـودای خۆیـان!!![145] پێغەمبـەر بەم حاڵەو موسولمانەکانیش شـوێنەکەی نـازانن، عـەلی کوڕی ئـەبو تالیـب لێ یەوە نزیك بوو دەستی گرت و طـەلحـەی کوڕی عوبەیـدوڵلاّ لەچاڵەکە بـەرزی کـردەوە، هـەتا وای لێ هـات ڕێـك وەسـتا.. ئـەمجار وردە وردە گـڕو تـین بـەر موسولمانەکان کەوتەوەو یەکدیگیر بوونەوە.

هەڵبەتـە ئـەم تیـشکانەی موسـولمانەکان هـەلاّتن نـەبوو، بـەڵکوو جـێ گۆڕکـێ و سـەنگەر گـۆڕین بـوو: کـە زۆر جـار سـوپا پێویـستی پـێ دەبـێ، لەشـوێنێکەوە دەگوێزرێتـەوە بـۆ شـوێنێکی تـرو هەڵمـەتی لێـوە دەبـا، ریزەکانی خۆی ڕێك دەخاتەوەو سەر لەنوێ پەلامار دەداتەوە!!!.

ئـەوەی لـەڕۆژی ئوحـوددا بەسـەر موسـولمانەکان هـات لـە تێـشکان و لەدەستدانی پێگەو شەهید بوون و بریندار بوونی زۆریان، لێکەوتنی زەرەرو زیانی زۆرو بێ شمار، هەمووی ئاکامی هەڵەیەکی تیر ئەندازەکان بـوو، هـۆی ئەوە بوو پابەندی فەرمان و ئامۆژگارییـەکانی پێغەمبـەر نـەبوون، نـەیانتوانی تـا کۆتـایی شـەڕەکە دان بـەخۆیان دا بگـرن و سـەنگەرەکانیان چۆڵ نەکـەن،

---

[145] سيرة ابن هشام ج٢ص٧٨-٨٠.

گوێ نەدەنە ماڵی دونیاو چاو نەبڕنە تالأنی جەنگ. بەراستی هەڵەیان کردو خـودا زللـەی میهرەبـانی لێ دان، فـەرمانی پێغەمبـەریان شـکاندو خـودا بەتاقیکردنەوە، وەکوو قورئان لـەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ . سورة آل عمران (١٥٢)﴾.

## نموونەی خۆشەویستی و خۆفیدا کردن:

ئـەبو دوجانـە خـۆی کردبـوە مـەتاڵ بـۆ پێغەمبـەر، کافرەکـان تیریـان ئاڕاسـتەی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) دەکـرد، هـەموو تیرەکـان لەپـشتی ئـەبو دوجانـە دەکـەوتن کـە خـۆی بەسـەر پێغەمبـەردا کـۆم کردبـوەوە هـەتا وای لـێهات ژمارەیـەکی زۆری سـەرەتیرە بەپـشتەوە بـوو، سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەققاص خێرا خێرا تیری بەکافرەکانەوە دەنان، پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) بـۆ خۆی سەرەتیرەی دەدان بە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص‌و پـێ ی دەفـەرموو: (ارم فداك أبـي وأمـي) تیریـان تـێ بگـرە دایـك‌و بـاوكم بـەقوربانت بـێ هـەر لـەو شەڕەدا قەتادە چاوێکی دەرپەڕی لەسەر کوڵمی بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەدەستی موبـارەکی خستیەوە شـوێنی خـۆی، لـەوەدوا ئـەو چـاوە جـوانترو تیژ تریش بوو، موشریکەکان هێرشێکیان بۆ پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) کـرد، ویـستیان ئـەوەی خـودا نایـەوێ ئـەوان بیهێننـە دی. نزیکـەی دەجـەنگاوەر بـەرەنگاریان بـوون بـەرگرییان لـە پێغەمبـەر کـرد تاهـەر دەیـان کـوژران، طـەلحـەی کوڕی عوبەیدوڵلاً شـەڕێکی مەردانـەی لـەدژ کـردن، خـۆی کردبـوە مـەتاڵ‌و بەجەسـتەی خـۆی جەسـتەی پێغەمبـەری دەپاراسـت. هـەرتیرێکیان ئاڕاستەی پێغەمبەر بکردایە ئەو دەستی بەردێنا، لەئاکام دا دەستی ئـازاری

پێ گەیی و لەکار کەوت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ویستی بچێتە سەر بەردێك لەبەر برین و ماندویی و شەکەتی نەیتوانی سەر بەر دەکە بکەوێ طەلحە دانیشت و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چووە سەرشانی و سەر بەردەکە کەوت. کاتی نوێژ هات پێغەمبەر لەبەر بێ هێزی و برینداری و ماندو بوون بەدانیشتنەوە پێش نوێژی کرد.[١٤٦] کەموسولمانەکان شکان و هەلاتن ئەنەسی کوڕی نەضر (مامی ئەنەسی کوڕی مالیك) خزمەتچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەڵنەهات، بەڵکوو بەرەو پێش هەڵمەتی برد، سەعدی کوڕی مەعاز توشی بوو پێ ی گوت: ئەوە بۆ کوێ دەچی ئەبو عومەر؟ ئەنەس وتی: ئای‌کە بۆنی بەهەشت خۆشە ئەی سەعد! ئەمن بۆنی بەهەشت دەکەم لەئاکامی شەهید بوونم لەغەزای ئوحوددا.[١٤٧] ئەنەسی کوڕی نەضر گەییشتە کۆمەڵێك لەموهاجیرو ئەنصارەکان دەستەو ئەژنۆ دانیشتبوون، پێ ی وتن: ئەوە بۆ دانیشتوون!؟ وتیان: پێغەمبەر کوژراوە، ئیتر ئێمە تازە پاش ئەو ژیانمان بۆ چیە! وتی: کورە ماڵوێرانینە دەهەستن لەو ڕێبازەی پێغەمبەری تێدا کوژراوە ئێوەش خۆتان بەکوژ بدەن، ئیتر برەو پێشی کافرەکان ڕۆیی شەڕی کرد تا شەهید بوو ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: ئەو ڕۆژە کەبە شەهیدی چوینە سەری حەفتا برینی پێوە بوو، کەسمان نەیناسی یەوە، خوشکەکەی بەنیشانەیەك کەلەسەر پەنجەی بوو ناسی یەوە، . . .

زیادی کوڕی (السکن) لەگەڵ پێنج لەیاریدە دەران پارێزگارییان لە پێغەمبەر دەکرد هێرشی کافرەکانیان پوچەڵ دەکردەوە، یەکە یەکە لەوپێناوەدا شەهید بوون، زیاد شەڕی کرد هەتا لەبرینە زۆرەکانی دا

---

[١٤٦] سيرة ابن هشام جـ ٢ ص٨٦ وزاد العاد جـ /٣٥٠.

[١٤٧] زاد المعاد جـ ١/ ٣٥٠ واصل الرواية في الصحيحين.

خەڵتانی خوێن بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرمووی لێمی نزیك بکەنەوە، لێیان نزیك خستەوە، ئەویش قاچی خۆی بۆ کردە سەرین، رومەتی لەسەر قاچی پێغەمبەر بوو گیانی دەرچوو. .

عەمری کوڕی (الجموح) شەل بوو زۆر دەشەلی، چوار کوڕی گەنجی هەبوون لەگەڵ پێغەمبەردا لەغەزادا بوون جاکە بەرەو ئوحود ڕۆیشتن ویستی لەگەڵیان بچێ، کوڕەکانی پێیان گوت، خودا ڕێگەی داوی کە هاوبەشی غەزانەکەی، پێمان خۆشە بۆ خۆت لەماڵەوە بی ئەوە ئێمە لەجیاتی تۆ غەزا دەکەین و خودا ئەو ئەرکەی لەسەر هەڵگرتووی عەمر هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) وتی: قوربان کورەکانم پێیان خۆشە من لەخزمەت تۆدا نەیەم بۆ غەزا، وەڵلاهی من پێم خۆشە شەهید ببم و بەم قاچە شەلەمەوە بەناو بەهەشت دا بسوڕێمەوە، دەمەوێ بەئەم قاچە شەلەم پێ لەعەرزی بەهەشت بدەم. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرمووی: ئەتۆ خودا ڕێگەی پێداوی کە هاوبەشی غەزانەکەی، بەکوڕەکانیشی گوت وازی لێ بێنن بەڵکو خودا شەهادەتی بەنسیب بکا، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەر دەرچوو بۆ غەزاو ڕۆژی ئوحود شەهید بوو. زەیدی کوڕی ثابیت دەڵێ: ڕۆژی ئوحود پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) ناردمی لەسەعدی کوڕی (الربیع) بگەڕێم، فەرمووی ئەگەر دیت سلاوی منی پێ بگەیەنە، پێ ی بڵێ: پێغەمبەری خودا دەڵێ: هەواڵم بداتێ وەزع و حاڵی چۆنەو چی دەست کەوتووە؟ زەید دەڵێ منیش چوم بەناو کوژراوەکانی ئوحوددا دەگەڕام، بینیم لەگیانەلادا بوو، حەفتا برینی لێ کرابوو، هەموو جەستەی شوێنی سەرەرمو دەمە شیرو سەرە تیر بوو، پێم گوت: ئەی سەعد! پێغەمبەری خودا سلاوی لێ دەکردی، دەفەرموێ: چیت دەست کەوتووە؟ وتی سلاو لە پێغەمبەر بێ، عەرزی بکە ئەی پێغەمبەری خودا، بۆنی بەهەشتم دەست کەوتووە، بەنەتەوەکەم کە

ئەنصارەکانن بڵێ: ئێوە لای خودا بیانوتان نیە ئەگەر دوژمن دەستیان بگاتە پێغەمبەرو ئێوە زیندو بن، ئیتر گیانی دەرچوو.

عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لەو ڕۆژەدا وتی: خودایە من پەیمانت دەدەمێ: کەسبەینێ شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەم بمکوژن پاشان ورگم بدڕن، لوتو گوێچکەم ببڕن، پاشان ریسوام بکەن پێم بڵێ ی ئەوە لەپێناو چی دا دەڵێم لەپێناو ڕەزامەندی تۆدا.

## گەڕانەوەی موسوڵمانەکان بۆ مەڵبەندی خۆیان:

کەموسوڵمانەکان پێغەمبەریان بینیو زانییان: کەماوە هەڵیان ساندەوە، ئەویش لەگەڵیان هەڵسایەوەو بەرەو شیوەکە ڕۆیشتن، ئوبەی کوڕی خەلەف پێیان گەیی و دەیگوت: ئەی موحەممەد ئەگەر بێڵم دەرچی داوەشێم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی وازی لێ بێنن، کەنزیك بووەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) حەربە یەکی لەیەکێ لەهاوەڵانی وەرگرتو بەرەو ڕوی چوو یەك رمێکی لەملی چەقاند لەسەر ئەسپەکەی گلۆری کردەوە.

عەلی کوڕی ئەبو طالیب تیر دانەکەی پڕ کرد لەئاوو خوێنی دەمو چاوی پێغەمبەری شۆشت، عەلی ئاوی پێدا دەکردو فاطیمە دەیشت، عەلی بە بەمەتاڵەی ئاوی پێدا کرد، جا کە فاطیمە دیتی ئاوەکە خوێنەکە زیاد دەکا، پارچە حەسیرێکی هێنا سوتاندیو خۆڵەکەی لێ دا ئیتر خوێنەکە وەستایەوە،[١٤٨] لەشەڕی ئوحوددا عائیشەی کچی ئەبو بەکرو ئوم سولەیم کوندە ئاویان دەخستە سەرپشتی خۆیانو دەیانهێنا دەیانکردە دەمی خەڵکەکەوە، لەگەڵ تەواو دەبوون دەگەڕانەوە پڕیان دەکردنەوەو دەهاتنەوە

---

[١٤٨] رواه البخاري في غزوة بدر باب ماأصاب النبي من الجراح يوم احد .

ئاوەکەیان دەکردە دەمی خەڵکەکەوە، ئومموسولەیط لەسەر ئاوەکە کوندەکانی بۆ پڕ دەکردن،[١٤٩].

لە لایەکی ترەوە هیندی کچی عوتبەو کۆمەڵە ئافرەتێك لەتەکیا هەتکی شەهیدەکانیان دەکرد دەمو لوتو گوێچکەیان دەبرین هیند ورگی حەمزەی هەڵدڕیو جەرگی دەرهێنا پارچەیەکی خستە دەمیەوەو جویو بۆی قوت نەچوو تفی دایەوە. . . !

جا کە ئەبو سەفیان ویستی لەئوحود بگەڕێتەوە، چووە سەرکێوەکەو تاهێزی تێدا بوو قیڕاندی، وتی: بێگومان سەرکەوتن لە شەڕدا بەنۆرەیەو هەر ڕۆژە بۆ یەکێکە، دەی ئەی بتی هوبەل! خۆت بەبەرزی بنوێنە، تۆ هەربەرزی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: عومەر هەڵسە وڵامی بدەرەوە، بڵێ بەرزیو شکۆمەندی هەر بۆ خودایە، ئێمە و ئێوە وەك یەك نین کوژراوی ئێمە لەبەهەشت دان، کوژراوی ئێوە لەئاگردان، ئەبو سەفیان وتی: ئێمە بتی (العزی) مان هەیە ئێوە (عزی)تان نیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی بەهاوەڵان وڵامی بدەنەوە، وتیان: بڵێین چی؟ فەرمووی بڵێن: خودا گەورەو سەرپەرشتیارمانە ئێوە بێ سەرپەرشتیارن.[١٥٠]

جاکە ئەبو سەفیان گەڕایەوەو موسوڵمانانیش گەڕانەوە ئەبو سەفیان بانگی کرد وتی: وادەمان بەدر بێ لەساڵی داهاتوودا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەیەکێ لەهاوەڵانی فەرموو بڵێ باشە ساڵی داهاتوو ئێمەو ئێوە لە بەدر یەکتری دەبینینەوە.

---

[١٤٩] الجامع الصحيح للبخاري باب أم سليط.

[١٥٠] الجامع الصحيح للبخاري باب عزوة أحد.

خەڵکە زۆر بەپەرۆش بوون بۆ کوژراوەکانیان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆری پەرۆشی حەمزە بوو، مامیشی بوو برای شیریشی بوو، پارێزەرو پشتیوانی بوو، (صفية)ی کچی عەبدولموتەلیب کەخوشکی باوکی و دایکی حەمزە بوو هات بۆ ئەوەی چاوی بەبراکەی بکەوێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە کوڕەکەی گوت کە زوبەیری کوڕی عەووام بوو، فەرمووی دایکت بگێڕەوە بابەو حاڵە حەمزەی برای نەبینێ، زوبەیر وتی: دایکە! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ بابگەڕێتەوە پێویست ناکا تۆ حەمزە ببینی، (صەفیە وتی: بۆ بگەڕێمەوە؟ خۆمن زانیومە کە بەکوژراوی براکەمیان هەتك کردوە! ئەو لەپێناو ڕەزامەندی خودادا ئەوەی بەسەر هاتووە، من داوای پاداشت لەخودا دەکەمو خودا یاریێ صەبر دەگرم، ئەمجار هاتە سەر لاشەی حەمزەی برایو سەیری کردو نوێژێکی لەسەر کرد وتی (إنا لله وإنا إليه راجعون) داوای لێخۆشبونی بۆ کرد، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی کرد ناشتیان.[151]

## موصعەبی کوڕی عومەیرو شەهیدەکانی تر چۆن نێژران؟

موصعەبی کوڕی عومەیر کەیەکێك بوو لەگەنجە قۆزەکانی قورەیش لەپێش ئیسلام دا، زۆر بەناز پەروەردە کرابوو کوڕێکی جوانخاصو پۆشناخ و شۆخ و شەنگ بوو، ڕۆژی غەزای ئوحود ئاڵای پێغەمبەری هەڵگرتبوو شەهید بوو، چارەکە خامێکی بۆ کرا بەکفن بەشی هەموو جەستەی نەدەکرد، ئەگەر سەریان پێ داپۆشیایە قاچی بەدەرەوە دەبوون،

---

[151] سيرة ابن هشام جـ ٩٧/٣.

ئەگەر قاچیان پێ دا پۆشینایە سەری بەدەرەوە دەبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەقوماشەکە سەری داپۆشن و قاچەکانی بە (ئیز خەر)[١٥٢] بشێرنەوە ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کراسێکی دێنا دوو پیاوی شەهیدی دەخستنە ناو، پاشان دەیفەرموو کامیان زۆر تر قورئانی لەبەر بووە، ئەگەر بیانگوتایە ئەمەیان زۆر تری لەبەر بووە لە گۆڕیچە کەدا پێشی دەخست، ئەمجار فەرمووی: من ڕۆژی قیامەت شایەتییان بۆ دەدەم، پاشان فەرمانی کرد بەخوێنەوە بیاننێژن، نەنوێژی لەسەر کردن نەششتنی.

## هەڵوێستی ئافرەتانی موسوڵمان دەربارەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):

موسوڵمانەکان لەئوحودەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە، بەلای ئافرەتێکی (بەنی دینار) دا تێپەڕین، ئەم ئافرەتە لەجەنگی ئوحوددا مێردەکەی و باوکی و براکەی شەهید بو بوون، جاکە سەرەخۆشییان لێ کرد، وتی: توخوا پێم بڵێن: پێغەمبەر چۆنە؟ وتیان: شکور ئەو سەلامەتە بەویستی تۆیە، وتی: دەباشە نیشانم بدەن بابیبینم، وتیان: هاها ئەوەتا، جاکە چاوی پێکەوت وتی: ئۆخەیش کەتۆ بێ وەی و سەلامەتی، هەموو بەلاو نارەحەتیەك سەهل و ئاسانە.[١٥٣]

---

[١٥٢] گیایەکی بۆن خۆشە، حەشیشە سەوزەیە.

[١٥٣] سیرة ابن هشام جـ ٢/٩٩.

## راوونانو هەڵبرینی قورەیشییە لەلایەن موسوڵمانەکانەوە:

لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود، موشریکەکان لەناو خۆیان دا دەستیان کرد بەسەر زەنشتی یەکتری، هەندێکیان بەهەندێکیان گوت: ئێوە هیچتان نەکرد، چەند پیاوێکی بەناو بانگو دیارتان لێکوشتنو ئیتر وازتان لێهێنان بەتەواوەتی لەناوتان نەبردن، ئەوەندە یان هێز ماوە خۆیان رێکبخەنەوەو بێنەوە سەرتان، باوازیان لێنەهێنین بۆیان بگەڕێ ینەوە ریشەکێشو بنە بڕیان بکەین. ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی دابە هاوەڵانی: کە شوێن دوژمن بکەونو پەلاماری بدەن. موسوڵمانەکان تازە لەجەنگی ئوحود گەڕابوونەوە بۆ مەدینە ماندوو شەکەتو لەش بریندارو پەشۆکاو، هێشتا ماندوو یەتییان نەرەوی بووە. برینەکانیان سارێژ نەبوو بوون جلو جۆری جەنگیان دانە کەندبوو، بانگدەری پێغەمبەری بانگەوازی بۆ موسوڵمانەکان بڵاو کردەوە، فەرمانی پێ کردن خۆیان نەکەنەوەو ئامادەبن بۆ چوونە دەر لەمەدینەو شوێن کەوتنی دوژمن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردن کە تەنیا ئەوانە لەگەڵی دا بچنەدەر، کە دوێنێ ئامادەی جەنگە کە بوون، هەمووشیان بریندارو ماندو بوون، ڕۆژی دوایی کەڕۆژی یەکشەممە بوو بەبێ دواکەوتنو دوو دڵی، هەموو موسوڵمانە بەشداربووەکانی جەنگی ئوحود، ئامادە بونو لەخزمەت پێغەمبەردا بەرەو سوپای دوژمن بەرێ کەوتنو ڕۆیشتن تا گەییشتنە شوێنێك کەپێ ی دەگوترێ (حمراء الأسد) کەهەشت میل لە مەدینە دوور بوو، ئیتر پێغەمبەرو هاوەڵانی ڕۆژانی دوو شەممەو سێ شەممەو چوار شەممە لەو شوێنە مانەوە، پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە، پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا ئەم هەڵوێستو ورە بەرزیو فەرمانبەر دارییەی هاوەڵانی پێغەمبەری بەرز

نرخاندوەو زیندو راگرتووە دەفەرمویٚ: ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ. الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ. فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُواْ رِضْوَانَ اللّهِ وَاللّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ. إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ سورة آل عمران/١٧٢-١٧٥.

لەجەنگی ئوحوددا حەفتا لەهاوەڵان شەهید بوون، زۆربەیان لەیاریدەدەران بوون، لەموشریکەکانیش بیستو دوو پیاو کوژرا بوون.[١٥٤]

## پەروەردەکردنی دەروونی موسوڵمانەکان:

بێگومان ئەوەی لە ئوحود روی دا، ئەوەی توشی موسوڵمانەکان بوو لەچورتمو بەڵاو ناخۆشی، لەبۆتە دانو بەتاقیکردنەوەو پاڵفتە کردنو پەروەردە کردن بوو بۆیان، زللەیەکی میهرەبانی بوو بۆ ئەوەی هیچ کاتێك بەسەرکەوتن بوغرا نەبنو بەژێر کەوتن ناهومێد نەبن. چونکە هیچ کاتێ بتمانە بەکۆمەڵێك ناکرێ: کەلەسەر هەوای سەرکەوتنو خۆشی بژین، هەمیشە نەشوەی بالاَ دەستیو شیرینایەتی شکاندنی دوژمنیان لەکەللە دابێ، بێ ئەوەی تاڵی بەڵاو چورتمو خەسارەتیان نەچەشتبێ، چونکە ئەگەر ئەو کۆمەڵە هەمیشە لەنەشوەی سەرکەوتنو خۆشیو کامەرانی دوژمن شکاندن دا بن، ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان توشی تێشکانێك بوون زۆریان بەلاوە قورس دەبێو بەشۆکاوی دەکەوێتە ناویانو بیرو باوەڕیان لەق دەبێ. بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلاَ تَلْوُونَ عَلَى أحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي

---

[١٥٤] سیرة ابن هشام جـ ٢/١٠١-١٠٢.

ُخْرَاكُمْ فَأَثَابَكُمْ غُمَّاً بِغَمّ لِّكَيْلاَ تَحْزَنُواْ عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ مَا أَصَابَكُمْ وَاللّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ. سورة آل عمران (١٥٣)﴾ بێگومان پەروەردگار لەم جەنگەدا دڵی موسوڵمانەکانی راهێناو پەروەردەی کردن بۆ ئەوەی لەداهاتوودا بەمردنی پێغەمبەر تێك نەچن، بتوانن بەرەورووی کارەساتێکی لەو جۆرە ببنەوەو لەسەر بیرو باوەڕی خۆیان دامەزراوو چەسپاو بن. قالبوی مەیدانی جەنگو رۆژانی سەختو دژوار بن، بانگەوازی بکەن بۆ ئایینی خوداو هەوڵو تێکۆشان لەپێناوی دا، وەفاو ئەمەکدارییان بەردەوام بێ بۆ ئایینی پاکی ئیسلام لەژیانی پێغەمبەر داو لەدوا کۆچکردنیشی ورە بەرزو دامەزراوبن، ترسنۆکیو ریسوایی رویان تێ نەکا، لەپێش چاوی دوژمن سوكو سەلیم نەبنو تەمبەڵو تەوەزەل نەکەون، بۆیە پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ. سورة آل عمران (١٤٤)﴾

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لای هاوەڵانی لەگیان خۆشەویست تر بوو.

ساڵی سێیەمی کۆچی[١٥٥] تیرەی (عضل) و تیرەی (قارة) بەپیلانی قورەیشییەکانو بۆ تۆڵە ساندنەوەی کوژراوانی بەدریان داوایان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کرد: کە چەند کەسێك لەهاوەڵانی بنێرێ بۆ لایان بۆ ئەوەی فێری ئایینیان بکەنو ئادابی ئیسلامیان بۆ رون بکەنەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) شەش کەس لە هاوەڵانی تێگەیشتوی خۆی لەگەڵ دا ناردن (عاصم) ی کوڕی ثابیتو خوبەیبی کوڕی عەدیو زەیدی کوڕی (الدثنة) یان تێدا بوون، ڕۆیشتن تاگەیشتنە (الرجیع) شوێنێکە لەنێوان عەسفانو

[١٥٥] هەندێك پێیان وایە مانگی سەفەری ساڵی چوارەم بووە.

مەککە، لەوێ نیازی دڵی خۆیان دەرخستو لەژێرەوە خەبەریان دا بە (هوزەلی) یەکان ئەوانیش بەدوو سەد چەکدارەوە دەوریان گرتن، پێیان گوتن عەهدو پەیمان بێ خۆ تەسلیم بکەن ناتانکوژین دەتان دەینە دەست قورەیشی یەکان، هەندێ لەموسوڵمانەکان وتیان ئێمە لەگەڵ موشریكو بتپەرست دا عەهدو پەیمان نابەستینو بەڵێنی ئەوان بڕوا ناکەین، شەڕیان کرد تا شەهید بوون، زەیدی کوڕی دیثنەو خوبەیبو عەبدوڵلای کوڕی طاریق دەستگیر کران، لەڕێگا عەبدوڵلا یان شەهید کرد، خوبەیبو زەید یشیان بەقورەیشی یەکان فرۆشت: حوجەیری کوڕی ئیهاب خوبەیبی کڕی بۆ ئەوەی لەباتی باوکی کە (اهاب) بوو بیکوژێتەوە،[١٥٦] زەیدیش صەفوانی کوڕی ئومەییەی کڕی بۆ ئەوەی لەجیاتی باوکی (أمية) ی کوڕی خەلەف بیکوژێتەوە. لەمەککە زەیدیان لەحەرەم بردە دەر بۆ ئەوەی بیکوژن، کۆمەڵێك لەقورەیشی یەکان ئامادە بوون، ئەبو سەفیانیشیان تێدا بوو، ئەبو سەفیان بەزەیدی گوت: بەخودات سوێند دەدەم تۆ پێت خۆش بوو ئێستا موحەممەد لەشوێنی تۆ بوایەو بمانکوشتایە، تویش لەناو ماڵو منداڵی خۆت دا بویتایە؟ زەید وتی: سوێندم بەخودا. من پێم ناخۆشە ئێستا موحەممەد لەشوێنی خۆی چقڵێکی لەقاچ راچێو من لەناوماڵو منداڵی خۆم دا بومایە. ئەبو سەفیان وتی کەسم نەدیوە کەسێکی تری خۆش بوێ بەئەندازەی خۆشەویستی هاوەڵانی موحەممەد بۆ موحەممەد. (خوبەیب) یش کە هێنایان بۆ ئەوەی بیکوژن، پێی گوتن ڕێگام دەدەن دوو رکات نوێژ بکەم ئەمجار چی دەکەن بیکەن، وتیان باشە دورکاتە نوێژەکەت بکە، ئەویش بەرێكو پێکی دوور کاتی نوێژ کرد پاشان روی لەخەڵکەکە کرد وتی: خەڵکینە بزانن وەڵلاهی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە گومانتان دەبردکە

---

[١٥٦] هەندێ دەڵێن عوقبەی کوڕی حارث کڕی تا لەجیاتی باوکی بیکوژێتەوە.

من لەترسی مردن درێژە بە نوێژەکەم دەدەم زۆرم درێژ دەکردەوە. ئەمجار ئەم دوو دێڕە شیعرەی خوێندەوە.

فلست أبالي حين أقتل مسلما
على أي شق كان في الله مصرعي
وذلك في ذات الإله وان يشأ
يبارك على أوصال شلو ممزع

## مەفرەزەی بیری مەعونە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر داوای عامیری کوڕی مالیك کۆمەڵێکی لەهاوەڵانی نارد بۆ سەر وڵاتی نەجد بۆ ئەوەی بانگەوازی ئیسلامی بڵاو بکەنەوە، ژمارەی هاوەڵەکان حەفتا کەس بوو، عامیری کوڕی مالیك وادەی ئەوەی دا پەناگیری موسوڵمانەکان بکاو نەهێڵێ دوژمن زیانیان پێ بگەیەنێ. ئەم پەناگیرییە لەناو عەرەب دا باو بوو هیچ پەناگیری کراوێك زیانی پێ نەدەگەیەنرا، بەم پێیە حەفتا کەس لەهاوەڵان بەڕێ کەوتن تاگەییشتنە بیری مەعونە لەوێ خستیان، کاتێکیان بەخۆ زانی هۆزەکانی بەنی سولەیم (عصیە، رعل، زکوان) گەلە کۆمەکییان لێ کردن و دەورەیان دان، موسوڵمانەکان کەوایانزانی دەستیان دایە شمشێرو شەڕی بەرگرییان کرد تا هەموویان شەهید بوون جگە لە کەعبی کوڕی زەید کە بەبرینداری لەناو شەهیدەکان دا مابوەو دوایی مەرەخەس کرا، ئەم زاتە ژیا هەتا لەغەزای خەندەق دا شەهید بوو[١٥٧] هەروا عەمری کوڕی ئومەییە کەلەو کاتەدا لەوێ نەبوو، ئەم دوو هاوەڵە نەکوژران .

---

[١٥٧] بوخاری موسلیم و سیرەی (ابن هشام).

## وشەی كوژراوێك بكوژەكەی موسوڵمان كرد:

لە ناو ئەم مەفرەزەیەی بیری مەعونە دا (حەرام) ی كوڕی (میلحان) شەهید بوو بەدەستی جەباری كوڕی سولەمی دوایی (جەبار) موسوڵمان بوو، هۆی موسوڵمانبوونەكەی وشەیەك بوو (حەرام) لەكاتی گیانەڵاو دا وتی: جەبار دەڵێ: ئەوەی پاڵی پێوە نام موسوڵمان ببم ئەوە بوو من لەو شەڕەدا رمێكم لە ناوشانی پیاوێكیان دا، روانیم سەری رمەكە لەسینگی دەرچوو بوو لەو كاتەدا گوێم لێ بوو وتی: (فزت ورب الكعبة) بەخودای كابە بەمراز گەیشتی، لەدڵی خۆم دا وتم بەمراز گەیشتنی چی؟ ئەوە نیە من كوشتم، دوایی لەو بارەوە پرسیارم كرد وتیان: مەبەستی شەهید بوون بووە، ئەمجار وتم وەڵلاّ دیارە بەمراز گەیشتووە ئەمە بوو بەهۆی موسوڵمانبوونی جەبار[١٥٨]

## وەدەرنانی بەنو نەضیر:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رۆیشت بۆ لای هۆزی بەنو نەضیر كە هۆزێكی گەورەی جولەكە بوون، بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن لەخوێن بەستنی دوو كوژراوی بەنو عامیر، چونكە لەنێوان بەنو نەضیرو بەنو عامیردا پەیمانو بەڵێن نامە هەبوو، ئەوانیش بەقسە نەرم بوونو وادەی خێریان دا، بەلاّم لەدڵ دا خەشمو قینیان هەبوو پیلانی تیرۆرو كوشتنی لەناكاویان بۆ پێغەمبەر نیاز بوو، پێغەمبەر لەبن دیواری خانوێكیان لایان دانیشتبوو گفتو گۆی لەگەڵ دەكردن، هەندێكیان بەسرتە بەهەندێكیان گوت: جارێكی تر ئێمە موحەممەدمان ئاوا بۆ هەڵناكەوێتەوە، پیاوێكمان دەست بكەوتایە

---

[١٥٨] بوخاری (باب غزوة الرجيع من كتاب المعازي وابن هشام جـ ١٨٧/٢).

بچویایه سەر ئەو بانەو تاوێرە بەردێکی گەورەی بەسەردا بدایەو لەکۆڵی بکردیانایەوە! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چەند کەسێکی لەهاوەڵان لەگەڵ بوو، لەوانە ئەبو بەکرو عومەرو عەلی.

پەروەردگار بەنیگا پێغەمبەری لەوپیلانە شوومە ئاگادار کردەوە، پێش ئەوەی کارەکەیان ئەنجام بدەن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو شوێنە هەڵساو بەپەلە گەرایەوە بۆ مەدینە، بەگەیشتنەوەی بۆ ناو شار فەرمانی دا بەهاوەڵانی خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕ لەدژی جولەکەی بەنو نەضیر گەمارۆ دانیان، پاشان بەسوپایەکەوە چووە سەریان و چوار دەوری گرتن، ئەمەش ڕێکەوتی مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی چوارەمی کۆچی بوو، شەش شەو گەمارۆدانەکەی بەردەوام بوو، خودا ترسی خستە دڵیانەوە، داوایان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کرد: کەبەمەرجێك گیانیان پارێزراو بێت، ڕازین لەمەدینە وەدەریان نێن هەر یەکەی باری حوشترێك کەل و پەلی خۆیان جگە لەچەك بەرن بۆ ئەو شوێنەی بۆی دەونێردرێن... پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەم مەرجانە ڕازی بوو، ئەوانیش هەریەکەیان باری حوشترێکیان کەل و پەل لەگەڵ خودا برد، هی وایان هەبوو خانووی خۆی دەڕوخاندو دارو پەردووەکەی لەحوشترەکە بار دەکردو دەڕۆیی، پەروەردگار دەربارەی ئەم غەزایە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ سورة الحشر/٢. جا ئەو جولەکانە کەبەو شێوە لەمەدینە وەدەرنران هەیانبوو چوو بۆ خەیبەر، هەیانبوو ڕۆیی بۆ شام، موسوڵمانانیش لەلانەیەکی جاسوسی و سیخوڕی و پیلان ڕزگاریان

بوو كۆمەڵێك دو ڕوو پیلانگێڕو فێڵبازیان لەناو دا نەمان: ﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا.﴾ سورة الأحزاب/٢٥. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ماڵو سامانی بەجێماویانی بەسەر كۆچكەرە پێشینەكان دا دابەش كرد.

## غەزای ذات الرقاع:

لەساڵی چوارەم دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) غەزای وڵاتی نەجدی كرد، ئەوە بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی پێ گەیشت: كە چەند تیرەیەك لەنەجدییەكان (بنو محارب) و (بنو ثعلبة) و (بنو انمار) خەریكن خۆیان ئامادە دەكەن بۆ جەنگ دژی پێغەمبەر بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر بەخێرایی سوپایەكی پێكەوە ناو بەرەو لای ئەو هەرێمە كەوتە ڕێ تاگەیشتنە شوێنێك كەپێ ی دەگوترێ (ذات الرقاع) یان هەندێكیان پێلاویان دڕاو ناچار بوون پەڕۆو پیتاڵیان لەتاچی خۆیانەوە دەئاڵاند، ئیتر بۆیە غەزاكە ناوی نراوە (ذات الرقاع) جاكە دوژمن زانییان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەو سوپایەوە هاتووە بۆ سەریان، بەسەڵتە خێزانی هەڵاتن، ماڵو سامانی بەجێماویان و هەندێ ئافرەتیشیان كەوتە دەست موسوڵمانەكان موسوڵمانەكان ماوەیێك لەوێ مانەوە بەڵام ترسی ئەوەیان هەبوو لەناكاو دوژمن پەلاماریان بداو غافڵگیریان بكەن بۆیە پێغەمبەر نوێژی عەصری بەشێوەی نوێژی مەترسی (صلاة الخوف) پێ كردن.[١٥٩]

---

[١٥٩] سيرة ابن هشام جـ ٢/٢٠٤.

جا کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەم غەزایە گەڕایەوەو خەڵکەکە لەتەکیا گەڕانەوە، لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا لەشیوێکی درخت چقلاوی دا لایان دا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەبن درەختێك دا شمشێرەکەی هەڵواسی و لێ ی نوست، خەڵکەکەش هەر دو دووسێ سێ لەبن درەختێك دا پاڵیان دایەوە جابیر دەڵێ: ئێمە خەومان لێ کەوت، هێندەی پێ نەچوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بانگی لێ کردین کەچوین بۆ خزمەتی کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لای دانیشتبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی من نوستبوم ئەم کابرایە هاتبوو شمشێرەکەی منی هەڵکێشابوو پێم نەزانیبوو، بەخەبەر هاتم روانیم شمشێرەکەی منی بەروتی بەدەستەوەیە، پێ ی گوتم: کێ تۆ لە من رزگار دەکا؟ وتم: خودا، ئیتر شمشێرەکەی خستەوە ناکالان و داینا، ئەوە ئێستا دانیشتوە. پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هیچ سزای نەدا.

## چەند غەزایەك کەشەڕی تێدا نەکراوە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمانگی شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچی لە مەدینە دەرچوو بۆ بەدر چونکە ئەبو سەفیان وادەی بەدری دانابوو، پێغەمبەرو موسوڵمانەکان هەشت شەو لەوشوێنە مانەوە، چاوەڕوانی هاتنی ئەبو سەفیانی کرد، ئەبو سەفیانیش لەسەر وادەی خۆی بەلەشکرێکەوە بەرەو بەدر هات، پاشان وای بەباش زانی بگەڕێتەوە، بەلەشکرەکەی خۆی گوت: ئەمساڵ وشکە ساڵەو گرانی و قات و قڕی بەرێوەیە، من پێم باشە بگەڕێینەوە، ئیتر گەڕانەوە شەڕ توشی موسوڵمانان نەبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) غەزای (دومة الجندل) یشی کرد، توشی هیچ ناخۆشی و رو بەڕو بوونەوەیەك نەهاتن و گەڕانەوە بۆ مەدینە.

## غەزای خەندەق یان غەزای ئەحزاب:

لەمانگی شەووالی سالی پێنجەمی کۆچی دا غەزای خەندەق یان غەزای ئەحزاب روی دا، روداوی خەندەق لەو روداوانەیە کە کاریگەریەکی قولّو چڕو پڕی لەمێژووی ئیسلامو موسولّمانان دا هەیە، رەورەوەی مێژووی ئیسلامیو بانگەوازی ئیسلامی گۆڕی، ڕۆلێکی بەرچاوی بینی لەپەلهاویشتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەهەر چواردەوری خۆی دا، غەزای خەندەق روداوێکی یەکالاّ کەرەوە بوو، ئەزمونو تاقیگەو لەبۆتە دانێك بوو موسولّمانانی پێ تاقیکرانەوە، قالّی کردن بۆ روبەرو بونەوەی هەموو ئەو روداوانەی لەوەدوا توشی موسولّمانان هات. ڕۆژی خەندەق رۆژێکی سەختو چارەنووس سازبوو، وەرچەخانێکی مێژوویی بوو قورئانی پیرۆز وەکوو کامیرایەکی موعجیزە ئاسا وێنەی بارو دۆخەکەمان بۆ نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا.﴾ سورة الأحزاب/١٠. هۆکاری ئەم غەزایە وەکوو مێژوو نووسان باسیان لێوە کردوە، پیلانو دەنە دەنەدانی جولەکەکان بوو، قورەیشی کانیان هەلّنان بۆ شەڕو داوایان لێ کردن ئەمجارەش بەختی خۆیان بەتاقی بکەنەوەو وادەی یارمەتیو هاریکاری زۆریان پێ دان. ئەمەش دوای ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەچەند شەڕو روبەرو بوونەوەدا سەرکەوتنی بە دەست هێناو مەلّبەندی کوفرو بتپەرستی خستە لەرزەوەو جولەکەکانی لەمەدینەدا تەفرو تونا کردن، بۆیە هەولّی تەقەلّلای نەیارانی ئیسلام جەمو جۆلّی زیاتری بەخۆوە بینی، جولەکەکان هەرچەند ئەهلی کیتاب بوون بەرواڵەت یەکتا پەرست بوون، بەلاّم دوژمنێکی سەرسەختی فێلّبازی پێغەمبەرو موسولّمانان بوون، ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە بەسروشت پیسو حەسودو بوغزاوی بوون،

بەرژەوەندیشیان لەدەست دابوو ئەوان لە وەپێش بەهۆی ئەوەوە کە ئەهلی کیتاب بوون و نامەی ئاسمانییان هەبوو، زانیاری خۆیان بەکار دەهێنا بۆ ژێر بارکردنی عەرەبەکان و زاڵبون بەسەریان دا بەلام ئێستا بەهۆی بلاوبونەوەی بانگەوازی ئیسلامی ئەم بەرژەوەندییانەیان هەموو لە دەست چووە، ئەوەشیان لێ ئاشکرا بووە کە بەشێکی زۆری نامە ئاسمانییەکەیان تەزویرەو گۆڕانکاری تێدا کراوە، لەشوێنی خۆشیان گوێزراونەوەو ملك و سامانیان داگیر کراوە، لەبەر ئەم هۆیانەو گەلێ هۆی تر بیریان لەوە کردەوە لەگەڵ قورەیشییەکان دا یەك بگرن و پەیوەندی نێوان خۆیان توندو تۆڵ بکەن، بەهەموو لایەکیان لە پێغەمبەرو هاوەڵانی بدەن بۆ ئەم مەبەستە شاندێك لەبەنو نەضیرو بەنی وائیل چوونە مەککەو لەگەڵ قورەیشی یەکان دا کۆبونەوە، داوایان لێ کردن شەڕ لەگەڵ پێغەمبەرو موسوڵمانان بکەن، لەوە پێشیش بۆ خۆیان دەستیان بەم ئاگرە سوتا بوو، نەیاندەوێرا بۆ خۆیان بەتەنها بەگژ موسوڵمانەکان دا بچن، قورەیشییەکانیش تا ئەندازە یەك شەڕکردن یان بەلاوە نابوو، نەیاندەویرا جارێکی تر ئەو ئاگرە هەڵگیرسێننەوە، بەلام شاندی جولەکەکان کە چوونە مەککە، قورەیشییەکانیان هانداو بەزمانی لوس و فێڵبازی خۆیان وایان لێ کردن جارێکی تر بۆ شەڕ خۆیان کۆبکەنەوە، بەڵێنی ئەوەیان بەموشریکەکانی مەککەدا کەیارمەتییان بدەن و بەماڵ و گیانیان هاوبەشی شەڕەکە بکەن تابە هەر دوولایان موسوڵمانەکان ریشە کێش دەکەن! ئەمەش قورەیشییەکانی دڵخۆش کردو ورەی بەرز کردنەوە دەستیان کرد بەئامادە باشی و خۆڕێکخستن بۆ شەڕ، شاندی جولەکەکانیش گەڕایەوەو چونە لای هۆزی (غطفان) ئەوانیشیان بانگهێشت کرد، بەناو هۆزو تیرەکانی تری عەرەب و جولەکەدا گەڕان و پرۆژەی گرتنی مەدینەو لەناوبردن و ریشە کێشکردنی

موسوڵمانەکانیان بۆ باسکردنو موافەقەو ڕەزامەندی قورەیشی کانیشیان پێ ڕاگەیاندن،[160] هەموو تیرەو هۆزەکان ئامادە باشی خۆیان دەربڕیو پەیمانی عەسکەری یان بەست، قورەیشییەکانو جولەکەو هۆزی (غطفان) سێ کۆچکەی گرنگی ئەم پەیمانە بوون، لەسەر چەند خاڵێکی سەرەکی ڕێك کەوتن، یەکێ لەو خاڵە گرنگانە ئەوە بوو هۆزی (غطفان) بەشەش هەزار جەنگاوەر هاوبەشی لەسوپای هاوپەیمانی دا بکا، جولەکەکانیش داهاتو بەرو بوومی ساڵێکی وڵاتی خەیبەر بدەنە هۆزی (غطفان)، قورەیشییەکانیش چوار هەزار جەنگاوەر ئامادە بکەن، بەهەردولایان دەهەزار شەڕکەر کۆبکەنەوەو سەرکردایەتی سوپاکەشیان خستە ئەستۆی ئەبو سەفیانو بەرەو مەدینە سوپا کەوتە گەڕ! کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی ئەم لەشکر کێشی یەی بیستو بەوردی گەلەکۆمەکێ ی ئەو هەموو هۆزو تیرەو لایەنانەی بڕیان داوە شەڕ دژی موسوڵمانان بکەنو ڕیشە کێشیان بکەن بۆ دەرکەوت، موسوڵمانەکانی کۆکردەوەو کەوتە ڕاوێژ لەگەڵیان داو بڕیاری بەرگری کردن درا، بەڵام هەر لەناو مەدینەدا بمێننەوەو خۆیان قایم بکەنو بەرگری لەخۆیانوماڵو منداڵیان بکەن، ژمارەی جەنگاوەرانی موسوڵمانیش لەسێ هەزار کەس تێ نەدەپەڕی ئالەم کاتەدا سەلمانی فارسی بیروکەی لێدانی خەندەکی بەدەوری مەدینە دا خستە بەردەم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەڵکەندنی خەندەك نەخشەو پلانێك بوو فارسەکان لەشەڕا پەیڕەوییان دەکرد، سەلمان وتی ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە لەوڵاتی فارس دا هەرکاتێ هێرشی لەم جۆرەمان بکرایەتە سەر، بەدەوری خۆمان دا خەندەکمان لێ دەدا. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕای سەلمانی پەسەند کردو فەرمانی دا بەهەڵکەندنی خەندەك لەو دەشتاییەو

---

[160] سيرة ابن هشام جـ ٢/٢١٤-٢١٥.

ناو چەیەی کەوتۆتە باکوری خۆر ئاوای سارەوە، کە بەروالەت ناوچەیەکی دەشتایی و روتەن بوو لەمپەری سروشتی لێ نەبونو ترسی هاتنە ناوەوەی دوژمنی لێ دەکرا.[١٦١]

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەڵکەندنی خەندەکی لەنێوان هاوەڵان دا دابەشکرد بۆ هەر دەکەسیان چل گەز هەڵکەنن، درێژیی خەندەکەکە پێنج هەزار گەز بوو قوڵی حەوت گەز تا دە گەز بوو پانیشی (٩) گەزو بەرەو ژورتر بوو.

## گیانی یەکسانی و هەمئاهەنگی نێوان موسوڵمانان:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی هاوکاری هەڵکەندنی خەندەکی کرد بۆ ئەوەی موسوڵمانەکان زیاتر سەرگەرمی هەڵکەندنی بن. موسوڵمانان بەچالاکی یەوە بەشدارییان کرد، بێ وچان پێغەمبەرو هاوەڵانی خەریکی بەئەنجام گەیاندنی ئەو کارە بوون، کاتەکە وەرزی سەرما بوو زۆریان سەرما بوو لەهەمان کاتدا خۆراکیشیان وەکوو پێویست دەست نەدەکەوت. برسیایەتی و سەرما تەواو هیلاکی کردبوون، وەلێ هێزی ئیمانو برایەتی و هاوکاریو بەشداریکردنی پێغەمبەر بۆ خۆی قەرە بووی هەموو کەمو کوڕیەکانی بۆ پڕ کردنەوە. ئەبو طەلحە دەڵێ: چوینە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) باسی برسیایەتی خۆمانمان بۆ کردو هەریەکەمان کە بەردمان خستبو بەر پشتێنی خۆمان لەبرسان بەردەکانمان نیشان دا، کەچی پێغەمبەر (درودی

---

[١٦١] خەندەکەکە لەباکوری خۆر هەلاتی مەدینەوە دەست پێ کرا تا باکوری خۆر ئاوای. سنوری خۆرهەلاتی کەناری (حرة واقم) و سنووری خۆر ئاواییشی خۆر ئاوای شیوی (بطحان) بوو کە دەبێتە تەنیشتی (حرة الوبرة). بڕوانە کتێبی: آثار المدینة المنورة/ عبد القدوس الأنصاري.

خوای لەسەربێ) پەردەی لەسەر سکی خۆی لادا روانیمان ئەو دوو بەردی بەر پشتێنی خۆی داوە.[١٦٢] موسوڵمانەکان بەورەی بەرزو حەماسەتەوە هاوبەشی هەڵکەندنی خەندەکیان دەکرد، حەمدو سوپاسی خودایان دەکرد، شیعری حەماسەت خوڵقێنیان دەخوێندەوە، گرژیو ناڕازیبوونیان پێوە دیار نەبوو، ماندوو نەدەبوونو سات دوا سات پتر شانیان لەهەڵکەندنی خەندەک خۆش دەبوو.

ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەشریفی هات بۆ سەر خەندەکەکە، بینی ئەوا کۆچکەرانو یاریدەدەران لەبەیانی یەکی زۆر ساردا سەرگەرمی هەڵکەندنی خەندەکن، بەندەو کۆیلە یان نەبوون لەجیاتی ئەوان ئەو کارە لەئەستۆ بگرن، جاکە بینی دیاردەی ماندوویی و برسییەتییان پێوەیە فەرمووی:

اللهم إنّ العيش عيش الآخرة　　فاغفر للأنصار و المهاجرة

خودایە ژیان ژیانی قیامەتە، دەسا خوایە لەیاریدەدەرانو کۆچکەران خۆش ببە.

موسوڵمانەکانیش بەدەنگی بەرز وڵامیان دایەوەو وتیان:

نحن الذين بايعوا محمدا　　على الجهاد مابقينا أبدا

ئێمە ئەوانەین پەیمانمان بەموحەممەد داو تادەمرین لەسەر جیهاد کردنو خۆبەختکردن بەردەوام بین. . .

---

[١٦٢] تیرمذی ئەم ریواتەی گێڕاوەتەوە. (الطيبى) دەڵێ دابو نەریتی ئەوانەی کەبرسیان دەبێ بەردێك یان زیاتر بخەنە بەر پشتێنی خۆیان بۆ ئەوەی بیرو شی برسیایەتیە کەیان بێ. چونکە ساردی بەردەکەو گەرمی سکیان لێك بدا هەستکردن بەبرسیایەتی کەم دەبێتەوە.

ئەنەس دەڵێ: ناو ناوە یەکەی لوێچە جۆیەکیان بۆ دێنان لەگەڵ هەندێ پیخۆری بۆن و تام و گۆڕاو قنیاتیان پێ دەکرد.

## مـوژدەی دەرکـەوتنی ئاسـۆی سـەرکەوتنی سـوپای ئیسلام بەسەر جیهان دا لەوکاتە ناسك و تەنگانەیەدا.

لـەکاتی هەڵکەنـدنی خەندەکەکـەدا موسـوڵمانەکان توشـی بـەردێکی گەورەی تەمتەمی سەخت هاتن، پاچ قوڵنگ کاری لێ نەدەکرد. گیرو گرفتی ئەوەیان بردە لای پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەبەردەکەی بینی تاوێ دایە قوڵنگ و وتی: (بسم الله) یەك قوڵنگی پیاکێشاو سێیەکی لێ کردەوە. ئەمجار وتـی: (الله اکبر) کلیلی وڵاتـی شـامم پیـدراو ئـەو وڵاتـە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی شوێنکە و تـوانی منـەوە، ئەمجار قوڵینگێکی تری دا و وتی (الله اکبر) کلیلی وڵاتی فارسم پـێ دراو ئەو وڵاتە دەکەوێتە ژێـر کۆنترۆڵی موسوڵمانانەوە وەڵڵاهی ئێستا باڵەخانە سپی یەکەی پایتەختی ئەوان دەبیـنم لەمـەدائین کـە دەکەوێتـە ژێـر کـۆنترۆڵی ئێمـەوە پاشـان قوڵنگێکی تری پیا ماڵی و وتـی (بسم الله) باقی ماندەی بەردەکەی لەت و پەت کرد، ئەمجار وتی (الله اکبر) کلیلی وڵاتی یەمەنم پێدرا، سوێند بەخودا ئێستا من چاوم ها لەدەرگاکانی شاری صەنعا چۆن دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئێمەوە. ئەم هەواڵانە لەکاتێك دا بوو: کە موسوڵمانەکان دەربارەی ژیانی خۆیان کەوتبوونە گومانەوە، برسیایەتی برستی لێ بڕیبون و تینی بۆ هێنا بوون. سەرما ئازاری دەدان و دوژمن هەڕەشەی لێ دەکردن!!

## موعجیزەکانی پێغەمبەریتی لەو غەزایەدا:

چەند موعجیزەیەك لەسەر دەستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رویان دا کاتێك لەشوێنێکی خەندەکەکەدا درکە شاخێ ئاخی بوو نەدەشکا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی جامێ ئاوم بۆ بێنن، جامە ئاوەکەیان بۆ هێناو تفی تێکرد، پاشان وەندەی توانی لەخودا پاڕایەوەو ئاوەکەی بەتیلماسکە شاخەکەدا کردو تێك روخاو وەکوو کۆمەڵە لمبی لێهات. هەروا بەدوعاو نزای پێغەمبەر بەرەکەت کەوتە خۆراکی کەمەوە بەجۆرێك کە خواردەمەنیەکی کەم سوپایەك پێ ی تێر بوو، بەشی هەموویانی کرد.

جابیری کوڕی عەبدوڵلاّ دەڵێ: ئێمە رۆژی خەندەك خەریکی هەڵکەندنی خەندەك بووین درکەشاخێك هاتە بەرمان زۆر سەخت بوو بۆمان نەشکا، هاوەڵاّن هاتنە لای پێغەمبەر عەرزیان کرد قوربان درکە شاخێك هاتۆتە بەرمان بۆمان ناشکێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی من بۆی دەچمە خوارێ، هەڵسا، دیار بوو بەردی لەسەر سکی دانابوو توند بەستبووی، سێ رۆژ ماینەوە وەخۆراکمان تام نەکردو زەوادمان نەچوە گەدەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قوڵنگی هەڵگرت پیا کێشا، ئیتر ئەو درکە ساخە وەکوو خوێڕیز پرژاو بلاّو بووە، جابیر دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد قوربان رێگەم بدە تا ماڵەوە دەچم، کەچوومەوە بەخێزانەکەمم گوت: پێغەمبەرم بەشێوەیەك بینی تەحەممول ناکرێ، لەبرسانا بەردی لەسەر سکی دا نابوو توند بەستبووی. هیچ خواردەمەنیەکمان هەیە؟؟ وتی جۆمان هەیەو گیسکێشمان هەیە، خێرا جۆیەکەم هاڕیو گیسکەکەم سەربڕیو گۆشتەکەم کردە مەنجەڵەوە، پاشان هاتمە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ ئەوەی میوانداریم بکا، هەویر ئامادە کرابوو بکرێ بەنانو گۆشتەکەش لەسەر سێ کۆچکەی ئاگردان دەکولاّ، واتە نزیك بوو خواردن پێ بگا، عەرزیم کرد

قوربان! کەمێك خۆراکم ئامادە کردوە تەشریفت و یەکێکی تر یان دوکەسی تر بێنە بابچینەوە لەخزمەتت دا دەبم. فەرمووی خواردنەکە چەندە؟ بۆم باسکرد، فەرمووی زۆرو بەلەزەتە، هەواڵ بۆ خێزانت بنێرە چێشتەکە لەمەنجەڵ دەرنەکاو نانیش نەخاتە تەنوورەوە تادێم، ئەمجار فەرمانی بەکۆچکەران و یاریدە دەران دا فەرمووی هەستن بابڕۆین، هەموویان دوا مان کەوتن. کاتێك گەیشتمەوە ماڵ، بەخێزانم وت بابان شێواو، پێغەمبەر بەخۆی و موهاجیرین و ئەنصارەوە هاتوون بۆ نانخواردن! خێزانم وتی: ئایا پێغەمبەر پرسیاری لێ کردی خواردنەکە چەندەو چۆنە؟ وتم بەڵێ، ئیتر پێغەمبەر فەرمووی قەرەباڵغی مەکەن و بچنە ژورەوە، ئیتر نانی ورد دەکردو گۆشتاوی پێدا دەکرد گۆشتی کوڵاو، دەکەوتە سەر نانەکە، مەنجەڵی چێشتەکەو تەنوری نانەکەی دادەپۆشێ، تاوە جبەیەکی تری تێ دەکردو دەیخستە بەردەمی هاوەڵان. ئیتر بەو جۆرە بەردەوام بوو تاهەموویان تێر بون، هێشتا هەندێکی مابوو، فەرمووی ئەوەش بۆ خۆتان بخۆن و بیدەن بەکەسانی دی. چونکە خەڵك توشی برسیایەتی بووە.[١٦٣] لەریوایەتێکی تردا جابیر دەڵێ: هاتمە لای پێغەمبەرو بە سرتەوە عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا ئاژەڵێکمان هەبوو سەرم بڕیوە، ربە جۆیە کیشمان هەبوو هاڕیومە، تەشریفت و دووسێ کەسی تریش لەگەڵ خۆت بێنە فەرمون بۆ ماڵی ئێمە، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەدەنگی بەرز فەرمووی ئەی هاوەڵانی خەندەك هەڵکەن! جابیر دەعوەتی کردوە بابچین بۆ ماڵیان.

بەڵێ خەندەك تەواو بوو، قورەیشییەکان بە گوێرەی وادەو پەیمانی سەربازییان لەگەڵ جولەکەو هۆزی (غطفان) دا بەرەو مەدینە هاتن و لەشکر بەزییان کرد، هۆزی (غطفان)یش بەخۆیان و لق و پۆپی ترەوە هاتن و لەنزیك

---

[١٦٣] بوخاری لەباسی غەزای خەندەك دا ریوایەتی کردوە.

مەدینە لەریزی قورەیشییەکان لەشکر بەزییان کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) و موسوڵمانەکان کەسێ هەزار کەس دەبوون هاتنە بەرامبەریان لەنێوان ئەمان و دوژمن دا خەندەك هەبوو. لەنێوان موسوڵمانەکان و بەنو قورەیظەدا عەهدو پەیمان هەبوو، بەڵام حویەی کوڕی ئەخطەب سەرۆکی بەنو نەضیر هانی دان بۆ ئەوەی لەعەهدو پەیمانی خۆیان پەشیمان ببنەوە، بەنو قورەیظە پاش دوو دڵی و رارایی یەکی زۆر هاتنە سەر رای حویەی و لەپەیمانی خۆیان پەشیمان بوونەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەمەی زانی و دڵنیا بوو لەهەڵوێستی نا پیاوانە یان. ئیتر ئەمجار تەنگانە بوو بەدوو، ترس و خۆف زیادی کرد دوژمن تا ئێستا هەر دوژمنی دەرەکی بوو ئەوا دوژمنی ناو خۆش پەیدا بوو، هەندێ لەدوو رووەکانیش سەریان هەڵداو کەوتنە جم و جۆڵی نامەردانە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ویستی لەگەڵ هۆزی (غطفان) دا رێککەوتن بکاو سێیەکی داهات و بەرو بوومی مەدینە یان بداتێ. بۆ ئەوەی ئەو زەختە گەورە لەسەر ئەنصارەکان کەم بکاتەوە، چونکە ئەوان قورسایی هەرە گەورەی ئەم شەڕەیان لەسەر شان بوو، بەڵام پاشان لەم فکرەیە لای دا، ئەمەش دوای ئەوەی کە سەعدی کوڕی مەعاذو سەعدی کوڕی عوبادە هەڵوێستی مەردانەی خۆیان دەربڕی و بەناوی یاریدە دەرانەوە خۆڕاگری و ملنەدانی خۆیان بۆ دوژمن راگەیاند، سەعدی کوڕی مەعاذ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، لەرابردودا ئێمە و ئەوان لەسەر بیرو باوەڕی بتپەرستی بووین، هاوەڵمان بۆ خودا دادەنا، خودامان نەدەناسی، پەرستشمان بۆخودای تاك و تەنها نەدەکرد، ئەوان هەرگیز نەیان توانیوە تەماع لە ئێمە بکەن بۆ هیچ شتێك، لەرێگەی میزانداری یان کڕین و فرۆشتنەوە نەبووبێ حوققە میوەیەکمان نەداونێ، ئایا دوا ئەوەی خودا بەهۆی ئیسلامەوە رێزی داوێنی و هیدایەتی داوێن بۆ خودا پەرستی و

یەکتا پەرستی، بەهۆی شوێنکەوتنی ئایینی تۆوە، شانو شەوکەتمان پەیدا کردوە! ئێستا ماڵو سامانیان بدەینێ؟ بەخودا ئێمە بەهیچ شێوەیەك ئامادە نینو کارمان بەوە نیە، بەخودا جگە لەشمشێر هیچیان نادەینێ، ئێمەو ئەوان گۆڕەپانی شەڕ، هەتا خودا نێوانی ئێمەو ئەوان دەکا. ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: تۆ ئەوەت لێ دێ، پیاوی وەك تۆ هەر هەڵوێستی ئاوای دەبێ.

## کێ بڕکێ ی نێوان پاڵەوانی ئیسلامو پاڵەوانی کافر:

پێغەمبەرو موسوڵمانەکان لەشوێنی خۆیان مانەوە، دوژمنیش لەوبەر خەندەك دەورەیان دابوون، شەڕ روی نەدا، وەلێ هەندێ سوار چاکی قورەیش بەئەسپ سواری هاتن، ئەسپەکانیان تاو دان تالەسەر لێواری خەندەك راوەستان، کەخەندەکیان بینی وتیان سوێندمان وابێ، ئەم فێڵە فێڵێکە عەرەب نەیانزانیوە، پاشان بەرەو شوێنێکی خەندەکە ڕۆیشتن کەبڕێ تەنگە بەربێ بۆ ئەوەی لێوەی بپەڕنەوە، بەپڕ تاوو قڵمباز پەڕینەوە بۆ بەری مەدینە، یەکێ لەو سوارانە پاڵەوانی مەشهور عەمری کوڕی عەبدی ود بوو، کەبەخەیاڵی خۆی دەرەقەتی هەزار کەس دێ. جاکە لەو بەر وەستا، وتی: کێ دەتوانێ بۆم بێتە مەیدان، عەلی کوڕی ئەبو تالیب بۆی چووە مەیدانو وتی: ئەی عەمر! ئەتۆ پەیمانت بەخودا داوە، کەهەر پیاوێکی قورەیشی بانگت بکا بۆ دوو رەوشت لێ ی وەردەگری. وتی: بەڵێ:-

عەلی وتی: من بانگەوازیت دەکەم بۆ لای خوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەرو پابەند بوون بەئاایینی ئیسلام. عەمر وتی: من کارم بەو ئیشە نیە، وتی: دەباشە بانگت دەکەم بۆ زورانبازیو شەرەشیر. عەمر وتی: بۆ چی برازای خۆم؟ سوێندم بەو خودایە من نامەوێ بتکوژم.

عەلی پێی گوت: بەڵام من پێم خۆشە بتکوژم. ئیتر ئەو بەم قسەیە دونیای لە پێش چاو تاریك بوو کەللەی گەرم بوو، لەئەسپەکەی دابەزیو ئەسپەکەی سەر بڕیو خوێنەکەی لەم دەمو چاوی خۆی دا. ئەمجار روی کردە عەلیو چەمپەرەیان لێکەوە هێناو یەکتریان هێناو برد سەرەنجام عەلی کوشتی! یەکێکی تر لەپاڵەوانەکانیان نەو فەلی کوڕی موغەیرە بوو ئەسپەکانیان بەرەو ئەوبەری خەندەك غاریان داو پەڕینەوە.

## دایکێك کوڕەکەی هاندەدا بۆ شەڕ کردنو شەهید بوون:

عائیشە (دایکی موسوڵمانان) رەزای خودای لێ بێ، دەفەرموێ: من لەگەڵ چەند ئافرەتێکی تری موسوڵمان لەقەڵای بەنو حاریثە دا بووین، ئەم روداوەش پێش ئەوە بووە کە حیجاب واجب ببێ، دەفەرموێ: سەعدی کوڕی مەعاذ بەلامان دا تێپەڕی زرێیەکی کورتی لەبەر دابوو هەموو باسکی بەدەرەوە بوو، شیعری دەخوێندەوە دایکی پێ ی گوت: گوتم دایکی سەعد! بەخودا پێم خۆش بوو زرێ کەی سەعد تێرو تەسەل بوایە لەوەی ئێستای. هەر وایش بوو ئەوەی عائیشە لێی دەترسا هاتە جێ سەعدی کوڕی مەعاذ تیرێکی پێوەندرا دەمارێکی قوڵی بڕیو لە عەزای بەنو قورەیظەدا شەهید بوو.

## ولله جنود السموات والأرض:

لەشەڕی ئەحزاب موشریکەکان دەورەی موسوڵمانەکانیان دابوو، بەجۆرێك شوێنی موسوڵمانەکان وەکوو قەڵای دەورە دراو وابوو، لەهەر چوار لاوە دوریان گێرابوو، ئەحزاب نزیکەی ماوەی مانگێك گەمارۆیان دان،

لەهەموو لایەکەوە ڕێگەیان لێ بڕیبوونەوە، کارەسات قورس بوو، دوڕوویی بە تەواوی سەری هەڵدا، هەندێ لەخەڵکەکە داوایان لە پێغەمبەر کرد ڕێگە یان بدا بڕۆنەوە بۆ مەدینە وتیان: (ان بیوتنا عورة وما هي بعورة ان يريدون الا فرارا) جالەم سات و کاتەدا کە پێغەمبەر، موسوڵمانان لەو ترس و دڵە راوکێیە دابوون، بڕێکیان گیانیان گەیشتبوە سەری لوتیان و لەهەموو لایەکەوە گەمارۆ درا بوون، نەعیمی کوڕی مەسعوودی (الغطفاني) هات وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من موسوڵمان بووم، نەتەوەکەم بەموسوڵمانبوونی منیان نەزانیوە، فەرمانم پێ بکە چی بکە چی بکەم، هەرچی دەفەرمووی وادەکەم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی تۆ تاقە پیاوێکی، بچۆ بزانە کێت بۆ پەشیمان دەبێتەوە لەو کۆمەڵ و گروپانە پەشیمانی بکەرەوە، چونکە بێگومان شەڕ فرت و فێڵی تێدا دەکرێ، زۆر جار فێڵ و چاوو ڕاو ڕۆڵی خۆیان دەبینن. ئیتر نەعیمی کوڕی مەسعود هەڵسا چوو بۆ لای بەنو قورەیظە بەجۆرێك قسەی لەگەڵ دا کردن، کە گومان پەیدا بکەن لەچۆنیەتی و هەڵوێستیان و دۆستایەتی قورەیش و غەطەفان، ئەوانەی کە دانیشتوی مەدینە بوون و دوژمنی موهاجیرین و ئەنصارەکانن کە دانیشتوی مەدینەن و هاوسێ ی هەمیشەیی جولەکەکانن. داوای لێ کردن کەیارمەتی قورەیش و غەطەفان نەدەن نەبنە هاو بەشیان لەشەڕدا هەتا یەکێك لەپیاو ماقولأنیان نەکەنە بارمتە لایان، ئەوانیش رای نەعیمیان پەسەند کردو وتیان باشە. ئەمجار نەعیم هەڵسا چوو بۆ لای قورەیشییەکان دڵسۆزی خۆی بۆ دەربڕین و ئامۆژگاری کردن، هەواڵی پێدان کەجولەکەکان لەپەیمان و بەڵێنی خۆیان پەشیمان بوونەوە لە ئێستا بەو لاوە داوا دەکەن پیاو ماقوڵێکی ئێوە ببێتە بارمتە لایان و تا ئەو مەرجەیان نەهێننە دی

ئەوان متمانە ناکەن. بەنیازیشن ئەو بارمتەی لایان دادەنێن بیدەنە دەست پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ ئەوەی لەملی بدەن‌و بیکوژن، ئەمجار چو بۆ لای (غطفان) ئەوەی بەقورەیشی یەکانی گوتبوو بەوانیشی گوت، هەردو لای لێك دڕ دۆم کردو دڵی لەیەکتری کرمێ کردن، هەردو لایان گومانیان لەجولەکەکان پەیدا کرد، ئیتر دوو بەرەکی‌و بێ متمانەیی بەناو کۆمەڵ‌و گروپەکان دا بڵاو بووە، هەریەکەیان لە هاوەڵەکەی دەترسا. جا کە ئەبو سەفیان‌و سەرانی غەطەفان داوایان کرد بە هەموو لایەك شەڕێکی یەکالاّ کەرەوە بکەن‌و بەهەموو لایەك پەلامار بدەن، جولەکەکان خۆیان دزیەوە، تەمەڵییان نواند، داوایان کرد بارمتەیان بدەنێ، یەکێك لە پیاو ماقوڵانیان بەبارمتە لا دابنێن ئەمجار ئامادەن هاوبەشی بکەن، ئیتر قورەیش بۆیان دەرکەوت قسەی نەعیمی کوڕی مەسعود راستە، داخوازی جولەکەکانیان جێ بەجێ نەکرد، جولەکەکانیش بۆ یان مەعلوم بوو کە قسەی نەعیم راستە. ئیتر هەموو لایەك لەیەکتر کەوتنە گومانەوە، مقۆ مقۆیان تێ کەوت، یەکریزی‌و یەکدەنگیان نەما.

لەلایەکی ترەوە بەویستی خودا، بۆ یارمەتیدانی پێغەمبەرە پەروەردگار رەشەبایەکی سەخت‌و زریانێکی توندی ناردە سەر ئەو گروپ‌و کۆمەڵانە زستانی ساردو شەوو رەشەبا یەکیان گرت‌و تەنگیان پێ‌هەڵچنین، رەشەبای سەخت خێمەو رەشماڵی بردن، مەنجەڵ‌و مەرکانەی وەرگێڕان، ئەبو سەفیان هاواری لێ هەڵساو بەدەنگی بەرز وتی: ئەی جەماوەری قورەیش ئێوە کەوتوونە بارو دۆخێکی وا تەحەممول ناکرێ، ئاژەڵ‌و کەڵ‌و پەلمان لەناو چوو بەنو قورەیظە درۆیان لەگەڵ کردین، هەواڵی ناخۆشمان لێیانەوە بۆ هاتووە، ئەو نارەحەتی‌و ئەزیەتەی لەم رەشەباو زریانە پێمان گەیشتووە

ئەوەتا هەموومان بەچاوی خۆمان دەبینین. مەنجەڵو دیزەمان بۆ لەسەر ئاگردان ناوەستێ، خێمەو رەشماڵمان هەمووی باهەڵی تەکاندو بەحەوادا چوو، چی زووە خۆ کۆبکەنەوەو باربکەن، ئەوەتا من وادەرۆمو چیدی نامێنمەوە. ئیتر ئەبو سەفیان چوو بۆ لای حوشترەکەی کەییخ درابوو بەسترابووەوە، چووە سەر پشتیو راست بووە، ئیتر قاچاندنی. قورەیش بەدوی دا، هۆزی غەطەفان ئەم هەڵوێستو هەڵسو کەوتەی قورەیشییان بیست، ئەوانیش خێرا بەپەلە پرووزە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو کاتو شەوە ساردەدا، خەریکی شەو نوێژ بوو، ئەبو حوزەیفەی کوڕی (الیمان): کە پێغەمبەر نارد بووی بۆ ناو گروپو حیزبەکان بزانێ چی دەکەنو چی ناکەنو ئەمجار بێتەوە هەواڵی بداتێ: گەڕایەوە واقیعو روداوی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، جاکە ڕۆژ بووە پێغەمبەرو موسوڵمانان گەڕانەوە بۆ مەدینەو چەکی شەڕیان دانا، تەنگانە بەسەر چوو ترسو بیم نەما. بۆیە لەم بارەوە خودا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا.﴾ سورة الأحزاب/٩. شەڕ کۆتایی هاتو ئاگری فیتنە کوژایەوە، ئیتر لەوەدوا قورەیش نەگەڕانەوە بۆ شەڕی موسوڵمانەکان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئیتر لەم ساڵەوە قورەیش هێرش ناهێننە سەر ئێوە بەڵکوو ئێوە غەزای ئەوان دەکەن.

لەغەزای ئەحزاب دا لەموسوڵمانەکان حەوت کەس شەهید بوون لەموشریکەکانیش چوار کەس کوژران.

# غەزای بەنو قورەیظە ساڵی پێنجەمی کۆچی

## هەڵوەشاندنەوەی پەیمان لەلایەن بەنو قورەیظەوە :

لەوە پێش ئاماژەمان بەوە کرد کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کاتێك چووە مەدینە، پەیمانو بەڵێننامە یەکی لەنێوان موهاجرینو ئەنصارەکان دا نووسی، دڵنەوایی جولەکەکانی کردو پەیمانی لەگەڵ دا بەستن، لەسەر ئایینوماڵو حاڵی خۆیان هێشتنیەوە، مەرجی لەسەر دانانو مەرجیشی بۆ دانان، لەو بەڵێننامەیەدا هاتووە دەڵێ: ( هەر کەسێ لەجولەکەکان شوێن ئێمە بکەوێ ئەوە ئێمە یارمەتی دەدەین ناهێڵین کەس ستەمی لێ بکا، ناهێڵین کەس بالاّ دەستی بکا بەسەریان داو لافی ئاغایەتی لێ بدا بەسەریانەوە، نابێ هیچ بتپەرستێك (قورەیشییەك) یان ماڵو سامانی بگرێتە خۆیو پەنای بدا، نابێ هاوکاری بتپەرست بکەن بۆ ئەوەی گەلە کۆمەکی لەسەر موسوڵمانان بکەن، جولەکەو موسوڵمانەکان بەیەکەوە ماڵو سامان بۆ شەڕ خەرج دەکەن هەتا لە شەڕ دابن، هۆزەکانی جولەکە لەگەڵ موسوڵمانەکان یەك گەلو نەتەوەن، جولەکە لەسەر ئایینی خۆیانو موسوڵمان لەسەر ئایینی خۆیان سوێند خورانیانو خودی خۆیان! هەر لەپەیماننامەکەدا هاتووە، هەموو ئەوانەی لەم پەیماننامەدا ناویان هاتووە دەبێ یەك ڕیز بن لەبەرامبەر دوژمنە کانیان، دەبێ لەشتی چاکەدا هاریکاری یەکتر بنو نەسیحەتو ئامۆژگاری یەکتری بکەن، هەرکاتێ هێزو خێڵ و کۆمەڵێك هێرش بکەنە سەر یەثریب ئەوان تێکڕا بەرەنگاری دەبنەوە.

وەلێ حویەی کوڕی ئەختەبی جولەکەو سەرۆکی هۆزی بەنو نەضیر، توانی بەنو قورەیظە هەڵبنێ بۆ ئەوەی پەیمانە کەیان هەڵبوەشێننەوەو، مەیلیان بەلای قورەیش دا وەربگێڕێ. ئەمەش دوا ئەوەی ڕیش سپی

یەکەیان کەعبی کوڕی ئەسەدی (القرظی) وتی: من لەموحەممەد جگە لەراستیو وەفاداری هیچی ترم لێ نەدیوە، کەچی ویڕای ئەوەش کەعب پەیمانی خۆی هەڵوەشاندەوەو تەبەڕای کرد لەو عەهدو پەیمانەی لەنێوان ئەوو پێغەمبەر دا هەبوو، جاکە هەواڵی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە لەلایەن جولەکەکانەوە بە پێغەمبەر گەیشت، سەعدی کوڕی مەعاذ کەسەرۆکی ئەوس بوو هاوپەیمانی بەنو قورەیظە بوو، سەعدی کوڕی عوبادە کەسەرۆکی خەزرەج بوو لەگەڵ کۆمەڵێك لەئەنصارەکان ناردنی بۆ ئەوەی لە هەواڵەکە بکۆڵنەوە، کە چونو سەیرییان کرد، هەڵوێستی جولەکەکان زۆر لەوە خرا پتر بوو: کە بیسترا بوو تەنانەت قسەی ناشرینیان بە پێغەمبەر گوتبوو، گوتبویان کێ پێغەمبەرە؟؟ هەرگیز لەنێوان ئێمەو موحەممەددا نەعەقد هەیە نە عەهدو پەیمان!!! لەسەرێکی ترەوە بەعەمەلی خۆیان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر موسوڵمانانو لەپشتەوە خەنجەری ژەهراوی خۆیان بوەشێنن. هەڵبەتە خەتەری ئەم جۆرە هەڵویستە زۆر لەخەتەری شەڕی بەرامبەریو هجومی راستەو خۆ زیاترە، بۆیە قورئان ئاماژە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا.﴾ سورة الأحزاب/١٠. ئەم وەزعە لەسەر موسوڵمانەکان زۆر توند بوو زۆری پێ تەنگە تاو بوون، تەنانەت سەعدی کوڕی مەعاژ کەلە هەموو کەس زیاتر بۆیان دڵسۆز بوو، لەهەموو تێکگیراوێکیانا بە دەمیانەوە دەچوو، کاتێك سەعدی کوڕی مەعاذ لەغەزای خەندەق دا تیرێکی رێ کەوتو شادەمارێکی بڕیو دڵنیا بوو ئەم برینە دەیکوژێ، وتی: خودایە گیانم دەرنەچێ هەتا بەچاوی خۆم زەلیلیو مەینەتی هۆزی بەنو قورەیظە دەبینم.

## لەشکر کێشی پێغەمبەرو موسوڵمانان بۆ سەر بەنو قورەیظە:

کاتێک پێغەمبەرو موسوڵمانان لەخەندەک گەڕانەوەو گەیشتنەوە مەدینەو چەکیان لە خۆکردەوە، حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای پ ێ ی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە چەکی شەڕت داناوە؟ پێغەمبەر وەڵامی دایەوە وتی:بەڵێ. جوبرائیل وتی: دەسا بزانە تائێستا فریشتە چەکیان دانەناوە، خودا فەرمانت پێ دەکا چی زووە بڕۆی بۆ سەر بەنو قورەیظە، ئەمنیش بۆ سەر ئەوان دەچمو وە شەقەتۆڵەیان دێنمو تاروماریان دەکەم. ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی بەبانگدەرێک کرد بەناو خەڵک دا جاڕ هەڵبدەن، هەرکەسێ گوێی لێ یەو فەرمانبەر داری پێغەمبەرە نوێژی عەصر نەکا تانە چێتە ناو بەنو قورەیظە[١٦٤] پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چووە سەر بەنو قورەیظەو گەمارۆدان بیستو پێنج ڕۆژ گەمارۆ دانەکە بەردەوام بوو هەتا وایان لێ هات تەواو تەنگە تاو بوونو ترسو لەرز چووە دڵیانەوە.

بەنوقورەیظە پیاویان نارد بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) داوایان لێ کرد کە ئەبو لوبابە (برای عەمری کوڕی عەوف) بنێرێ بۆ لایان کە هاو پەیمانی هۆزی ئەوس بوون. بۆ ئەوەی دەربارەی خۆیان راوێژ بکەن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەبو لوبابەی نارد بۆ لایان، کەجولەکە کان دیتیان چەند پیاوێکیان بەرەو پیری چون، ئافرەتو منداڵ دەستیان کرد بەشینو شەپۆڕ لەبەر دەمی دا، ئەویش بەزەیی پێدا هاتن، دوایی وتیان ئەی ئەبو لوبابە، ئەتۆ پێت باشە لەسەر بڕیاری موحەممەد لەقەلا دابەزین؟ وتی: بەڵێ. بەدەستیش ئاماژەی بۆ گەردنی خۆی کرد واتە: ئەگەر دابەزن سەرتان دەبڕێ.ئەبو لوبابە

---

[١٦٤] سیرة ابن هشام جـ ٢/٢٣٣-٢٣٤.

دەڵێ: سوێند بەخودا لەشوێنی خۆم نەبزوتم هەتا دڵنیا بووم لەوەی: کەمن خیانەتم لەگەڵ خوداو پێغەمبەر کرد، پاشان ئەبو لوبابە رۆیی بەرێی خۆیەوەو سەری خۆی شۆڕ کرد. هێشتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) نەهاتبوو بۆ مزگەوت ئەبو لوبابە خۆی بە کۆڵەکەیەکی مزگەوت بە ستبووەوە وتی: وەڵڵاهی خۆم ناکەمەوە لەم شوێنە دەرناچم هەتا خودا لەتاوانم خۆش دەبێ و چاوپۆشیم لێ دەکا. پەیمانم بەخودا داوە کە ئیتر من جارێکی تر پێ ناخەمە ناو خاکی بەنو قورەیظەوە، نامەوێ خۆم ببینم لەوڵاتێك دا کە خیانەتم لەگەڵ خوداو پێغەمبەر تێدا کردبێ. جاکە خودا لە تاوانی خۆش بوو ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە دەفەرمووێ: ﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ.﴾ سورة الملك/١١. ئیتر خەڵکەکە راجمین بۆ ئەوەی لەکۆڵەکەکەی بکەنەوە، ئەبو لوبابە وتی: بەخودا نابێ بمکەنەوە هەتا پێغەمبەر تەشریفی دێنێ و بەدەستی خۆی دەمکاتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بەلای دا تێپەڕی بۆ نوێژی بەیانی، ئیتر بەرەڵڵای کرد، بێگومان ئەبو لوبابە نزیکەی بیست شەو بەو شێوە مایەوە، هەموو ڕۆژێ خێزانەکەی لەکاتی نوێژ دا دەهات دەیکردەوە پاش نوێژ کردنەکەی دەچوو خۆی دەبەستەوە.

## سەعدی کوڕ مەعاذ لەپێناو رەزابوونی خودادا گوێ بەلۆمەی لۆمەکەران نادا:

بەنو قورەیظە لەسەر بڕیاری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) رازی بوون لە قەلا دابەزن، ئیتر هۆزی ئەوس، هەڵسانە سەر پێ و وتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەوانە هاوپەیمانی ئێمەن، نەك هی خەزرەج. تەشریفت دەزانی لەوەپێش چیت دەربارەی هاو پەیمانانی برا کانمان کرد (واتە: هاوپەیمانی خەزرەجییەکان ) ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) فەرمووی: ئەی کۆمەڵی

ئــەوس ئایــا رازی نــابن پیاوێــك لــەخۆتان بكەمــە حەكــەمو بڕیــار دەر دەربارەیـان؟ وتیـان بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـودا، پێغەمبـەر فـەرمووی ئـەو كەسـە سـەعدی كـوڕی مـەعاذە، ناردی بـۆ لای، جاكـە سـەعد هـات، ئەوسـی یەكان پێیان گوت ئەی ئەبو عەمر لەگەڵ هاوپەیمانەكانمان باشبە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆیـە تـۆی كـردوە بەحەكـەم بـۆ ئـەوەی چاكەیان لەگـەڵ بكـەی. جاكە زۆر ئیلحاحیان لێ كرد وتی بەخودا لەپێناو رازی بـوونی خـودادا گـوێ نادەمە سەرزەنشتی لۆمە كاران. ئەمجار وتـی: بڕیاری من دەربارەیان ئەوەیە پیاوە كانیان بكوژرێن ماڵو سامانیان دابـەش بكرێ، ژنو منـداڵیان بكرێنـە كۆیلە، پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بـەحوكمی خـودا حوكمت كردن[١٦٥]

---

[١٦٥] سيرة ابن هشام جـ ٢/٢٣٩-٢٤٠لة ریوایـەتی بوخـاری ء موسـلیم دا هـاتووە دەڵـێ (قضيت بحكم الله) یانو تویەتی (بحكم الملك) بڕوانە ( صحيح البخاري كتاب المغازي باب مرجع النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ من الأحزاب ومخرجه من بني قريظة) ژمـارەی جولەكە ئیعدام كراوەكان نزیكەی (٨٠٠) هەشت سـەد كـەس شـەڕ كـەر بـووە وەكـوو لـە (الكامل)ی ئیبنو لئەثیردا جـ ١٢٧/٢ ئامـاژەی بـۆ كـراوە. بێگومـان بـڕێ نووسـەری هـاو چەرخ لەژێر روشنایی بەراوردو لێكۆڵینەوەدا گومانیـان خسـتۆتە سـەر ئـەم كـۆ كوژییـە وتویانە عەقڵ نایبڕێ لەشارێكی بچوكی وەكوو مەدینەدا لەسەر دەستی پێغەمبەرێكی ئـاوا بەبـەزەیی و مـرۆڤ دۆسـت دا ئـەو حەمكـە پیـاوە ئیعـدام كرابـێ بـەبێ ئـەوەی ئـەو نووسەرانە هیچ بەڵگەیەكی مێژوویيان بەدەستەوە بێ. سەرچاوەكانی جولەكە خۆیـان بێ دەنگن لەرونكردنەوەو وروژاندنی ئەم روداوە كەزۆر شیاوە بۆ ئەوەی هەسـتی دینـی لای جولەكەكان پێ بورووژێندرێ نووسەرێكی جولەكە نـژار بـەناوی (سیموئیل أسبك) كتێبێكـی گرنگـی لەسـەدەی شـانزەهەمی زایینـی دا دانـاوە نـاوی نـاوە ( مـأثر شـهداء اليهـود) نووســەر لــەو كتێبــەدا بــەهیچ كلۆجــێ لــە بــارەی دەركردنــی جولەكــەی بــەنو قەینوقاعو بەنو نەضیر لەمەدینـەو هـەروا ئیعـدامكردنی شـەڕ كـەرەكانی بـەنو قـورەیظە هیچ ئامارژەیەكی نەكردوە.

ئەم بڕیارە ڕێك هاتەوە لەگەڵ قانوونی شەڕ لەشەریعەتی بەنو ئیسرائیل دا، ئەوەتا لە (سفر التثنية ئیصحاحی بیست ١٠-١١-١٢-١٣) دەڵێ:-

كاتێك لەشارێك نزیك دەبیتەوە بۆ ئەوەی شەڕی لەگەڵ دانیشتوانەكەی دا بكەی. سەرەتا بانگیان بكە بۆ ئاشتی، جا ئەگەر بەپیر بانگەوازی یە كەتەوە هاتن ئامادە بوون بۆ ئاشتی و شارەكەت گرت، ئەوە هەموو دانیشتوانەكەی هی تۆن و دەتوانی ژێر دەستەیان بكەی، ئەگەر شەڕیان لەگەڵ دا كردی، دەورەیان بگرەو گەمارۆیانبدە، جا ئەگەر خودا سەركەوتووی كردی و بالآ دەست بووی. ئەوە هەموو نێرینەكانیان بەشمشێر بكوژە، ئافرەت و منداڵ و ئاژەڵەكانیان و هەرچی لەشارەكە دایە بیكەرە دەستكەوتی تالآنی و بۆ خۆتی دانێ، چۆنت دەوێ ئاوا دەستكەوتی بەدەست هاتوو لەدوژمنەكانت بخۆو خەرجی بكە. ئەوە دەسندەو بە خششێكە خودا پێی داوی.

ئەم شێوە تەعامولە لەناو بەنو ئیسرائیل دا لەسەردەمی پێغەمبەرە كانیان پەیڕەو دەكرا، ئەوەتا لەتەورات دا هاتووە دەڵێ: بەپێ ی فەرمانی خودا لەشكر كەشییان كرد بۆ سەر (مدیان) هەرچی نێرینەو كار بەدەستی (مدیان) هەبوو كوشتیانن كوژراویان كەلەكە كردن، هەموو دانیشتوانی أوی، راقم، صور، حور، رابع، پێنج كار بەدەستی مدیان، بلعام بن باعور، هەموویان بە شمشێر كوشت و بڕ كردن، هەرچی ئافرەتی (مدیان) و منداڵەكانیان هەبوون هەموو كوژران هەرچی ئاژەڵ و پیڕۆیان هەبوو هەموو مڵك و ماڵیان بەتالآن بریا، هەموو شارو گوندو شاروچكە و قەڵاو بەناگایان بەئاگر سوتێنرا، سفر العدد الاصحاح الحادي و الثلاثون، ٧-٨-٩-١٠.

ئەم ڕووداوانە هەموو لەسەردەمی حەزرەتی موساداو بەڕەزامەندی ئەو بووە، وەكوو لەتەوراتدا هاتووەو دەڵێ: موسا لەشار دەرچوو عازری كاهن و

هەموو سەرەك عەشیرەت و پیاو ماقوڵەكان لەتەكیا بوون بۆ پێشوازی لەسوپای گەڕاوە لەشەڕ، موسا رقی هەڵسا لەفەرماندە عەسكەریەكان كەهەزاران سەربازیان لەبەردەستدا بوو لەشەڕ گەڕابوونەوە، بەتووڕەییەوە مووسا پێی وتن: ئایا هەموو مێینەكانتان بەزیندوویی هێشتنەوە؟ (سفر العدد، الاصحاح الحادي والثلاثون، ١٣-١٦) الكتاب المقدس مطبعة اركسفورد ١٨٧٩م.

بەڵێ دەربارەی بەنو قورەیظە حوكمی سەعدی كوڕی معاذ جێبەجێ كرا، شاری مەدینە لەهەموو هێلانەیەكی سیخوڕی و شەڕو ئاشووبی جولەكە ڕزگاری بوو، موسوڵمانان ئەمین بوون لەوەی لەدواوە خەنجەری ژەهراویان لێ بدرێ، هەروا لەوەش دڵنیا بوون كەجارێكی تر لەناوەوە فیتنەو ئاشووب بەرپابێ. خەزرەجییەكان سەلامی كوڕی ئەبولحەقیقیان كوشت، چونكە هاندەرێكی سەرەكی بوو بۆ گرد كردنەوەی حیزبەكان و گەمارۆدانی مەدینە. ئەوسییەكانیش لەوەو پێش كەعبی كوڕی ئەشرەفیان كوشتبوو، چونكە دەست پێشخەربوو بۆ دوژمنایەتیكردنی پێغەمبەر و هەڵنانی خەڵك بۆ بەگژاچوونی، ئیتر موسوڵمانان ڕزگاریان بوو لەسەرانی فیتنە گێڕو ئاشوبخواز كەهەمیشە دژی ئیسلام و موسوڵمانان لەجم و جۆڵدابوون گرۆهـو كۆمەڵیان پێكەوە دەنا بۆئەوەی دژی موسوڵمانان كاربكەن و دژیان بوەستن!!!

بەدەركردن و لەناوبردنی بەنو قورەیزە موسوڵمانەكان ئیسراحەتیان كرد[١٦٦] ئەو هەڵس و كەوت و یاساو ڕێسایەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەربارەی بەنو قورەیظە تەعامولی پێ كرد، شتێك بوو سیاسەتی شەڕو

---

[١٦٦] سيره ابن هشام ج/٢-٢٧٣.

چـۆنیەتی سروشـتی هـۆزو تـیرە عـەرەبو جولەکـەکان داخـوازی بـوون، بەسەرهاتی بەنو قورەیظە سزادانێکی یەکالاکەرەوەو بنج بڕبوو، بۆئەوەی ببێتە دەرسو عیبرەت بۆ هەموو ئەوانەی گاڵتە بەپەیمانو بەڵێن دەکەنو پابەندی قسەو گفتی خۆیان نابن..

R. V. C. Bodley لەکتێبەکەیدا کەناوی ناوە (حیاة محمد) دەڵێ: محمد (درودی خوای لەسەربێ) لەوڵاتی عەرەبدا تاقە کەس بوو، ئەم وڵاتە لەڕووی ڕووبـەرەوە پانتاییەکـەی بەئەنـدازەی سـێ یـەکی وڵاتـە یـەگرتووەکانی ئەمەریکا دەبوو، ژمارەی دانیشتوانی (٥) ملیۆن کەس بوو. موحەمەدیش ئەوەنـدەی سـوپاو هێـز نـەبوو کەخـەڵکی وا لـێ بکـا فەرمانبـەرداری فەرمانەکانی بن، هەموو سوپای کە موحەممەد هەیبوو بریتی بوو لەسێ هەزارو چەند کەسێك ئەم سوپا کەمەشی بەتەواوی چەکدار نەبوو، چەكو سیلاحی وەکوو پێویست نەبوو، جا ئەگەر موحەممەد لەم روداوەدا لاوازی نیشان بدایە، یان چاو پۆشی لەبەنو قوورەیظە بکردایەو بەبێ سزادان وازی لێ بهێنانایە، بەبێ شك لە نیوە دورگەی عەرەب دا ئیسلام نەیدە توانی بمێنێتەوە، بێگومان پرۆسەی ئیعدامکردنی جولەکەکان زۆر توندو تیژی تێدا بوە، بەلاّم وە نەبێ تاکە روداو بێ کەلە مێژووی ئایینەکان دا رویدا بێ، بەڵێ ئەم تۆڵە ستاندنە بەو جۆرە توندو تیژییە پاساوی هەبوو لەلای موسوڵمانەکان، لەئێستا بەو لاوە پێویستە هەموو تیرەو هۆزەکان جار دواجار پێش ئەوەی پڕکێشی کارێکی ئاوەها بکەن زۆر بیر بکەنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە، هەرگیز جارێکی تر خییانەتی ئاوەها نەکەنو پەیمان هەڵ نەوەشێننەوە، چونکە ئەوەتا بە چاوی خۆیان سەرەنجامی ترسناکی پەیمانشکێنیو خییانەتیان دی. بۆیان دەرکەوت موحەممەد دەتوانێ ئەوەی بیەوێ بیکا ئەنجامی بدا!!

بێگومــان ســودو قــازانجی قــەڵا چــۆکردنی دوا قــەڵای جولەکــەکان لەمەدینەدا بۆ هێز کردن‌و لاواز بوونی بەرەی دوو ڕووەکان‌و کەمبوونەوەی جم‌و جۆڵی خییانەتکارەیان. بێگومان ئەو زەبرە کوشندە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر ورەو مەعنەوییەتیان، تائەندازەیەکی زۆر متمانەیان لە دەست دا، هیواو ئاواتیان کوژایەوە، چونکە لەراستی دا جولەکەی بەنو قورەیظە دوا سەنگەری خییانەتکاری و خم خۆرکەی ناو کۆمەڵگای مەدینە بوون، دوکتور ئیسرائیل ولفنسون کاتێ دەربارەی غەزوەی بەنو قورەیظە دەدوێ دەڵێ: بەڵام دوو ڕووەکان لەدوای جەنگی بەنوقورەیظە دەنگیان کپ بوو هەڵس‌و کەوت‌و جم‌و جۆڵیان سستی تێکەوت، لەوە بەو لاوە نەمان بیست کارێك بکەن، قسەیەك بڵێن پێچەوانەی ویستی پێغەمبەرو هاوەڵانی بێ، لەپێش غەزای بەنو قورەیظە بەتەواو شوویان لێ هەڵکێشابوو، هەرچی دەیانکردو دەیانگوت بۆ دژایەتی پێغەمبەرو هاوەڵانی بوو.[١٦٧]

## بەسەر هاتی ثەمامەی کوڕی ئاثال:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستەیەکی سوار ناردن بۆ وڵاتی نەجد ثەمامەی کوڕی ئاثالیان هێنا:کە سەرۆکی بەنو حەنیفە بوو هێنایان بەکۆڵەکەیەك لەکۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بەستیانەوە، پێغەمبەر بەلای دا تێپەڕی، فەرمووی: ثەمامە چیت لایە؟ وتی: ئەی موحەممەد! ئەگەر بمکوژی کەسێك دەکوژی خاوەن خزم‌و کەس‌و کارە، ئەگەر ڕێزی بگری‌و نیعمەتی لێبوردنی بەسەردا بڕێژی، ئەوە پیاوەتی لەگەڵ سوپاسگوزار دەکەی! ئەگەر ماڵ‌و سامانت دەوی، داوا بکە چیت دەوێ دەدرێتێ، ئیتر

---

[١٦٧] الیهود في بلاد العرب /١٥٥.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەجێی هێشت. جارێکی تر بەلای دا تێپەڕییەوەو هەمان قسەی پێ گوتەوە، ئەویش هەمان قسەکانی پێشووی پێ گوتەوە. جاری سێیەم بە لای دا تێپەڕییەوە فەرمووی ثەمامە بەرەڵلاّ بکەن، ئیتر بەرەڵلاّیان کرد.

ثەمامە چووە ناو باخە خورمایێکەوە کەلە مزگەوتەکەوە نزیك بوو، خۆی شۆشت، ئەمجار هاتە لای پێغەمبەرو موسوڵمان بوو وتی: سوێندم بەخودا لەسەر روی زەوی دا دەمو چاوێك نەبووهێندەی دەمو چاوی تۆ لەلام دزێوبێ بەلاّم ئێستا روخساری تۆ خۆشەویسترین روخسارە لەلام. هیچ ئاینێکیشم هێندەی ئایینی تۆ نەدەدزا وەلێ ئێستا روخساری تۆ خۆشەویسترین روخسارە لەلام. هیچ ئاینێکیشم هێندەی ئایینی تۆ نەدەدزا وەلێ ئێستا خۆشەویسترین ئایینە لەلام. کۆمەڵێك ئەسپ سواری تۆ گرتیانم من دەمەویست بچم بۆ عەمرە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) مزگێنی دایەو فەرمانی پێ کرد کە عەمرەکەی بکا. جاکە ثەمامە چووە لای قورەیشی یەکان وتیان: ئەی ثەمامە شێت بووی! ئەوە بۆ وات لەخۆت کرد.

وتی نەبەخودا شێت نەبووم بەڵکوو موسوڵمان بووم، ئیمانم بەئایینی موحەممەد هێناوە، سوێندم بەخودا لەوە بەولاوە بەبێ ڕەزامەندی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ناهێڵم دەنکە گەنمێکتان لەولاّتی یەمامەوە بو بێ.

ولاّتی یەمامە وەکوو دێهاتی مەککە وابوو زۆربەی دانەوێڵەی لەیەمامەوە بۆ دابین دەکرا. دوایی ثەمامە گەڕایەوە بۆ ولاّتی خۆی، بارکردنی دانەوێڵەی بۆ مەککە مەنع کرد، هەتا وای لێ هات قورەیشی یەکان تینیان بۆ هات، نامەیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نووسی داوایان لێ کرد،

نامە بۆ ثەمامە بنووسێ ڕێگە بدا خۆراك بێ مەککە پێغەمبەریش داواکەیانی جێ بەجێ کرد.[١٦٨]

## غەزای بەنولموسطەلەق و چیرۆکی بوختان:

مانگی شەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچی هەواڵی ئەوە بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):- کە بەنولموستەلەق کە لقێکی هۆزی خوزاعە بوون خۆیان ئامادە دەکەن بۆ پەلاماردانی پێغەمبەرو موسوڵمانان، جا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەمەی بیست، سوپای پێکەوە ناو ڕۆیی بۆ سەریان، ژمارەیەکی زۆر لەدوو ڕووەکان لەگەڵیا بۆ ئەو غەزایە چوون، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول سەرۆکایەتی دوو ڕووەکانی دەکرد. بێگومان هەڵمەتی موسوڵمانەکان دوای سەرکەوتنیان لەغەزای (الأحزاب) دا گەیشتە چڵە پۆپەو چونکە گەلە کۆمەکێ ی قورەیش و غەطەفان و جولەکە بۆ ئەوە بوو موسوڵمانەکان ریشە کێش بکەن، گەلە کۆمەکی یەك بوو لەوە پێش گەلە کۆمەکی وەها ساز نەدرابوو، کەوابوو سەرکەوتنی موسوڵمانەکان و تێکشکاندنی ئەو گەلە کۆمەکێیە بوو بە چقڵێك لەگەروی کافرەکانی مەککەو جولەکەکان و دوو ڕووەکانی مەدینەو دەوروبەری. ئیتر دوو ڕووەکان بۆیان دەرکەوت کەلەمەیدانی شەڕو ڕوبەڕو بوونەوەدا لە ڕێی ژمارەی زۆر لەشەڕکەرو پێداویستی جەنگ ناتوانن موسوڵمانەکان بشکێنن، بۆیە دوا جار هاتنە سەر ئەو بڕیارە: کەخەریکی دووزمانی و هەڵگیرسانی فیتنەو ئاشوب بن، هەوڵی ئەوەبدەن موسوڵمانەکان لێك دڕ دۆم بکەن،

---

[١٦٨] زاد المعاد جـ١/٣٧٧ ورداه مسلم في كتاب الجهاد والسير باب الأمداد بالملائكة يوم بدر.

بانگەشەی دەمارگیری نەتەوایەتی و هۆزایەتی و خێڵایەتی بکەن، قسەو قسە لۆك بۆ پێغەمبەر هەڵبەستن، دڵی موسوڵمانان لەیەکتر کرمێ بکەن، بوختان لەربارەی ناموس و رێزی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بڵاو بکەنەوە، بوختان بۆ خۆشەویسترین خێزانی هەڵبەستن، بۆ ئەوەی کەسایەتی و کییانی ئەم کۆمەڵگا نموونەیی یە تازە رسکاوە بکەوێتە شەقەتۆڵەو پایەکانی وە لەرزە بکەون، ئەو کۆمەڵگایەی کەوا دامەزرابوو هەموو تاکێکی هەموو ئەندامێکی ئاوێنەبێ بۆ براکەی. ئەگەر شتێکی وای لێ بیست کەوا گومانی لێ پەیدا بکرێ خێرا بەخۆی دا دەچێتەوە، بەپاك و خاوێنی لەقەڵەم دەداو ئەو تۆمەتەی لێ دوور دەخاتەوە، وەکوو چۆن تۆمەت لەخۆی دوور دەخاتەوە!!

هەروەها هەندێکیان متمانە بەیەکتر نەکەن، جا ئەگەر متمانە بەخانەوادەی پێغەمبەر نەما، کەس متمانەی پێ ناکرێ، بێگومان بوختانکردن بەدایکی موسوڵمانان خاتو عائیشە گەورەترین پیلان بوو کەدوو ڕووەکان نەخشەیان بۆ دارشت، ئەم سیاسەتە فێڵ و تەڵەکە بازییە بەتەواوی لەغەزای بەنو لموسطەلەق دا لەهەموو غەزاکانی تر زیاتر دەرکەوت.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەسوپایەکەوە لەمەدینە دەرکەوت بۆ سەر (بەنو لموسطەلەق) لەنزیك ئاوێك کە پێ ی دەگوترێ (المرسیع) لەدەڤەری قەدید بەلای کەناری دەریاوە بەیەك گەیشتن، شەڕ دامەزراو تێکڕژان پەیدابوو بەنولموسطەلەق شکان و شەڕ کۆتایی هات. هەڵبەتە ئەم غەزایە گرنگی یەکی تایبەتی خۆی هەبوو، گرنگی سیاسی، ستراتجی، ئابوری، چونکە کەوتبوە سەر ڕێگەی سەرەکی بازرگانی مەککەیی یەکان، لەهەمان کات دا ڕێگەیەکی فەرعی نێوان مەککەو مەدینە بوو، هەروەها چەند تایبەتمەندی تریشی هەبوو، لەدوای شەڕی بەنولموستەلەق خزمەتکارێکی عومەری

کوڕی خەتتاب کەلە بەنی غەففار بوو لەگەڵ هاوپەیمانی یەکی خێڵی خەزرەج کەلە هۆزی جوهەینە بوو شەڕیان بوو، کابرای جوهەنی هاواری کرد: ئەی جەماوەری یارمەتیدەران فریام بکەون، خزمەتکارەکەی عومەریش هاواری کرد ئەی جەماوەری کۆچکەران وەرن بەهانامەوە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول رقی هەڵساو کۆمەڵێکیشی لەخزمو کەس‌و کاری خۆی لەلابوو، وتی: توخوا ئەمە کاری کردنە، لەوڵاتی خۆمان دا لەسەر ملك‌و ماڵی خۆمان تەنگیان پێهەڵچنیوین ولأتیان لێ قەرەباڵغ کردوین، هێشتا ئەوان دەستدرێژیمان دەکەنە سەرو گەلە کۆمەکیمان لێ دەکەن، وەڵڵاهی ئەمە وەکوو ئەو پەندەی لێ هاتووە کە دەڵێ: (سەگەکەت قەڵەو بکە بتخوا) دەسا سوێندم وابێ ئەگەر گەییشتینەوە مەدینە دەبێ خاوەن شکۆو پیاوە رەسەن‌و بالأ دەستەکان ئەو کۆچکارە بێ ماڵ‌و داماوانە دەربکەون‌و نەهێڵن لەمەدینەدا دانیشن، ئەمجار روی کردە ئامادە بووانی لای خۆی‌و پێ گوتن ئەمەی کردتان خۆتان بەخۆتان کرد، بەدەستی خۆتان خۆڵتان بەسەری خۆتان دا کردوە، لەزیدو نیشتمانی خۆتان جێگاتان کردنەوە، ماڵ‌و سامانتان لەگەڵ بەش کردن بەخت‌و خۆڕایی کردتانن بەبرابەشی خۆتان، سوێندم بەخودا ئەگەر ئێوە ماڵ‌و سامانی خۆتانتان لێ بگرتنایەوە یارمەتیتان نەدانایە دەڕۆیشتن بۆ وڵاتێکی تر.

جاکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوێی لەو مقۆ مقۆیە بوو خێرا فەرمانی کرد بەبارکردنی شت‌و مەك‌و بەرێکەوتنی سوپا، هەرچەندە کاتەکە کاتی کەوتنە رێی سوپا نەبوو بەڵکوو بۆئەوە بوو خەڵکەکە دەم تێك نەنێن‌و شەیتان‌و فیتنە جۆ نەکەونە نێوانیان‌و دڵیان لەیەك کرمێ نەبێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ، ئەو ڕۆژە بەبێ وچان‌و شەوەکەشی ڕێگەیان بڕی‌و هەدادانیان نەبوو هەتا ڕۆژ بووە بەیانیەکەشی هەر ڕۆیشتن تاگەرما داهات

ئەمجار لایان دا بۆ پشودان، هەر لەگەڵ باریان خستن و دانیشتن یەکسەر خەویان لێ کەوت.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی پێش کەوت لە سەر ڕێگا بۆ باوکی راوەستا، کەباوکی گەییشتە جێ حوشترەکەی ییخ داو پێ ی گوت: بەخودا وازت لێ ناهێنم هەتا پێت نەسەلمێنم کەتۆ زەلیلی ومحەممەد عەزیزە! پێغەمبەر بەلای دا تێپەڕی و فەرمووی: لێ ی گەڕێ، سوێندم وابێ هەتا لەناو مان دابێ بەجوانی هاورێیەتی دەکەین و خراپە کاری لەگەڵ ناکەین.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەبچویایە بۆ سەفەر قورعە (پشك) ی دەخستە ناو خێزانەکانی، کامەیان پشکەکەی بۆ دەربچویایە ئەویانی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ سەفەرەکە، لەو غەزایەدا پشکەکە بەر خاتو عائیشە کەوت، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ خۆی بردی، کەلە غەزاکە بوونەوە بەرەو مەدینە گەڕانەوە، هاتن هەتا گەییشتنە شوێنێك نزیك مەدینە، لەشوێنێك لایان دا، بڕێ لەوشەوە لەوێ دا نووستن، پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی دا لەشکر بەڕێ بکەوێ لەو کاتەدا خاتو عائیشە بۆ هەندێ کاری تایبەتی خۆی دوور کەو تبوەوە، ملەوانکەیەکی لەمل دا بوو پساو دەنکە میروەکانی پەرت و بڵاو بوونەوە، کە گەڕایەوە بۆ لای کاروانەکە ملەوانکەکەی لەمل دا نەمابوو، لەوکاتەش دا لەشکرەکە بەڕێ کەوت، ئەوانەی بەر پرسیاری حوشترو کەژاوەی خاتو عائیشە بوون هاتن کەژاوەکەی خاتو عائیشەیان خستە سەرپشتی حوشترەکەی و پێیان وابوو لەناوی دایە، چونکە ئەو کاتە عائیشە ئافرەتێکی مێر منداڵ و کزەڵۆکە بوو، هیچ هەستیان بەوە نەکرد ئاخۆ عائیشە لەناو کەژاوەکەدا یە یان نا. کاتێك عائیشە هاتەوە بۆ شوێنی لەشکر بەزیبیەکە کەسی لێ نەمابوو، نە کەس

مابوو بانگ بکا، نەکەس هەبوو وەڵام بداتەوە، لەشکر بەرێ کەوتبوو، ئیتر عائیشە بەعاباکەی خۆی خۆی پێچایەوەو لەشوێنی خۆی راکشا، لەکاتێك دا عائیشە لەو بارودۆخەدا بوو، هاوەڵێکی تر کەناوی صەفوانی کوڕی (المعطل السلمي) بوو ئەویش بەهۆی هەندێ کاری تایبەتی خۆیەوە لەلەشکرەکە بەجێ مابوو، کەهاتو خاتو عائیشەی بەو حاڵە بینی وتی: (انا لله وانا اليه راجعون ) ناکا ئەوە هاوسەری پێغەمبەری خودا بێ؟! ئیتر حوشترەکەی خۆی لێ نزیك کردەوەو بۆ خۆی پاشەو پاش کەمێ چووە دواوە، ئەمجار خاتو عائیشە سواری حوشترەکە بوو، ئەمجار رێشمەی حوشترەکەی گرتو بەپەلە شوێن لەشکرەکە کەوتن بۆ ئەوەی پێیان بگەنەوە، پاش ماوەیەك لەکاتێك دا لەشکرەکە لایان دابوو بۆ پشوودان، پێیان گەییشتەوە، ئەو روداوە هیچ سەرنجی خەڵکەکەی رانەکێشا، چونکە ئەو جۆرە شتانە لەژیانی سارا نشینەکان دا باو بوو، پێیەوە راهاتبوون، پارێزگاری عەهدو پەیمانو داوێنپاکیو خۆ دوور خستنەوە لەرەوشتی نزم دابو نەریتی عەرەبەکان بوو[١٦٩] ، تەنانەت لەسەردەمی پێش ئیسلامیش

---

[١٦٩] نمونەیەکی لەو جۆرە ئەو سەر گوروشتەیەی ئومموسەلەمەیە، کەخزمەکانی نەیان هێشت کۆچ بکا بۆ مەدینەو بچێ بۆ لای مێردەکەی، ئەوە بوو هەموو ڕۆژێ بەیانیان لەماڵ دەردەچوو بۆ دەرەوەی مەککەو هەتا ئێوارە لەوێ دەگریا، ماوەی ساڵێك یان کەمتر بەو حاڵە مایەوە، هەتا خزمەکانی بەزەییان پێدا هاتو وتیان بڕۆ بۆ لای مێردەکەت، ئەویش حوشترێکی ئامادە کردو بەتەنیا بەڕێ کەوتو کەسی لەگەڵ نەبوو عوسمانی کوڕی طەلحەی (الداري) تۆش هات بەزەیی پێدا هاتو هەوساری حوشترەکەی گرتە دەستو بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ، ئومموسەلەمە دەڵێ: سوێندم بەخودا کەسم نەدیوە هێندەی عوسمان بەرێزو خاوەن شەرەف بێ، هەرکاتێ دەگەییشتینە قۆناغ وشترەکەی یەخ دەداو بۆ خۆی لێم دوور دەکەوتەوە کەدادەبەزیم ئەمجار دەهات حوشترەکەی دەبرد دەیبەستەوە، کەوەختی بەڕێ کەوتنمان دەهات

دا پارێزگاری ناموسیان بەلاوە گرنگ بوو، ئەوەتا شاعیری سەردەمی جاهیلی دەڵێ:

**وأغض طرفي ان بدت لي جارتي   حتى يواري جارتي مأواها.**

بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەعامولیان لەگەڵ پێغەمبەردا وەکوو هەڵس و کەوتی کوڕ لەگەڵ باوکی دا بوو، خێزانە کانی پێغەمبەریان بەدایکانی خۆیان دەزانی، خۆشە ویسترین کەس لایان پێغەمبەر بوو، لەباوك و کوڕی خۆیان خۆشتر دەویست. صەفوانی کوڕی (المعطل) یش بەئاییندارو داوێنپاك و خاوەن شەرم و حەیا ناسرا بوو، تەنانەت دەگوترێ حەزی لەئافرەت نەبوە، روداوەکە سەرەتا سەرنجی کەسی رانەکێشا، شتێکی ئاسایی بوو، وەلێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دوا گەڕانەوەی بۆ مەدینە ئەم روداوەی زەق کردەوە، هەوا خواهانی بلاْویان کردەوە، گەورەیان کرد، بۆ بەرپا کردنی فیتنەو ئاشوب و لاواز کردنی پەیوەندی نێوان پێغەمبەرو هاوەڵانی، لاوازکردنی متمانەی موسوڵمان بە موسوڵمان و نەهێشتنی متمانە لەهەموو رویەکەوە، بڕێکیش لەموسوڵمانەکان قاچیان لەم قوڕە چەقی و هاوبەشی ئەم بوختانە گەورەیان کرد. بەخۆیان نەزانی بوونە نێچیری هەواو هەوەسی خۆیان و جونەوەی قسەو قسەلۆکی بوختانکەرەکان و لەم پیلانە گەورەو بوختانە گەورەیەی کەبە خانەوادەی خودی پێغەمبەری خودا کرا هاوبەشییان کرد وەکوو لەم بارەوە قورئان ئامارژە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ. (١٥) سورة النور﴾ جاکە لەدوا

---

حوشترەکەی بۆ ئامادە دەکردم و سوار دەبوم و پێشم دەکەوت، بەو جۆرە هاتین تا گەیشتینە مەدینە.

گەڕانەوەی سوپا بۆ مەدینەو تێپەڕ بوونی ماوەیێک خاتو عائیشە ئەم هەواڵە جەرگتەزێنەی وەکوو هەورە تریشقە بەر گوێ کەوت، کەوتە لەرزین‌و غەم‌و خەفەت دایگرت‌و زۆر دڵتەنگ بوو، فرمێسکی دەباراندن‌و خەوی لێ زڕا، شەکەت‌و پەرێشان بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەمەی زۆر لەسەر شان گران بوو، سەرچاوەی پیلانەکەشی دەزانی، هەر ئەو ڕۆژە وتارێکی خوێندەوە، لەسەر دوانگە گلەیی لەعەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کرد، وتی موسوڵمانینە، بۆ چی ئەزیەتم دەدەن، قسەو بوختان بۆ خێزانم هەڵدەبەستن، کێ هەیە پاساوم بۆ بێنێتەوە دەربارەی پیاوێك کە ئەزیەتی پێ گەیاندوم بوختانی بۆ خێزانم هەڵبەستووە؟ وەڵڵاهی من جگە لەچاکە خراپەم لەخێزانی خۆم نەدیوە، پیاوێکیان گلاندۆتە ئەو بوختانەوە جگە لەخێرو چاکە هیچی ترم لێ نەدیوە، لەگەڵ خۆما نەبێ نەهاتۆتەماڵی من. ئیتر کۆمەڵێك لەپیاوانی ئەوس خوێنیان گەرم بوو ئامادەباشی خۆیان دەربڕی بۆ کوشتنی ئەو کەسەی ئەم بوختانە گەورەیەی هەڵبەستووە، وتیان: قوربان بفەرموو ئەو بوختانچی یە لەهەرتایەفەو خێڵ‌و هۆزێك بێ بابیکوژین. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی لە هۆزی خەزرەج بوو، هێندی لەخزمەکانی دەمارگیری خزمایەتی گرتنی‌و هەڵیاندایە لەسەری، خەریك بوو ببێتە شەڕو هەرا لەنێوان ئەوس‌و خەزرەج دا، وەلێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەحیکمەت‌و لێزانی خۆی هەراکەی کپ کردەوەو نەیهێشت گڕ بسێنێ، دەنگ‌و باسی ئەم بوختانە گەورەیە بەناو مەدینەدا بڵاوبۆوە. خاتو عائیشە بۆ خۆی دڵنیا بوو لەپاکداوێنی خۆی، ورەی بەرز بوو دەیزانی کاتێك دێ ڕاستییەکان دەردەکەون، بێ تاوانی‌و پاکداوێنی خۆی وەکوو هەموو بێ تاوان‌و پاکداوێنێك متمانەیەکی تەواوی لەلاپەیدا کردبوو، دڵنیا بوو خودا بێ تاوانی ئەو دەردەخا، هەموو گومان‌و تۆمەتێك لەخۆی‌و

خێزانی پێغەمبەر دوور دەخاتەوە، بەڵام گومانی ئەوەی نەدەکرد خودا نیگا لەبارەی بێ تاوانی و پاکداوێنی نازڵ بکا، ئایەتی قورئان لەو بارەوە بنێری و هەتا هەتایە بخوێندرێتەوە! ئەو بەهیوا بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە خەو بۆی دەربکەوێ کە ئەو بوختانە بێ بنەمایەو هیچی بەسەر هیچەوە نیە. بەڵام زۆری پێ نەچوو پەروەردگار ئایەتی قورئانی بەنیگا نازڵ کردە سەر پێغەمبەری خۆی و لەژوور حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە پاکداوێنی عائیشەی راگەیاندو فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ. سورة النــور (١١)﴾

بەنازڵبوونی ئەم ئایەتانە ئاگری فیتنە کوژایەوە، پاکداوێنی خاتو عائیشە چەسپاو مادەی فەسادو ئاشوب پوچایەوە، شەیتان و هەوا خوانی ریسوا بوون، بارودۆخەکە ئاسایی بووە، هەر وەکوو ئەوە هیچ نەبووبێ. موسوڵمانەکان کەوتنەوە سەر کاروباری خۆیان و بەپێ ی فەرمانی خوداو رێنومایی پێغەمبەرو بەو شێوەی کە خێرو بێری مرۆڤایەتی و موسوڵمانانی تێدابێ هەڵس و کەوتیان کرد.

# پەیمانو ئاشتینامەی حودەیبییە مانگی زولقەعیدەی ساڵی شەشەمی کۆچی

## خەوبینینی پێغەمبەرو خۆ ئامادەکردنی موسوڵمان بۆ چونە ناو مەککەوە:

لەوەپێش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینە بوو لەخەودا بینیبووی کە چووە ناو مەککەو تەوافی کەعبەی کرد، بەڵام دیاریکردنی کاتو مانگو ساڵی نەزانی، هەر ئەوەندەی بینی چووە مەککەو تەوافی کرد هیچی تری بۆ مەعلووم نەبوو، ئەویش بەهاوەڵانی فەرموو کەلە خەودا شتێکی ئاو های بینیوە هاوەڵان ئەم خەونەی پێغەمبەریان بەموژدەو خۆشی زانی، زۆری پێ کەیف خۆش بوون، چونکە دەمێك بوو لەمەککە دابڕا بوونو لەکەعبە دووركەوتبوونەوە دڵیان بۆی دەیکورکاندو ئاواتە خوازی ئەوە بوون ڕۆژێ لەڕۆژان بەدیداری شاد ببنەوە، بەهۆی موسوڵمانبونیان هێندەی تر پەیوەندییان بەکەعبەوە زیادی کردو، بەدڵو بەگیان ئاواتە خوازی ئەوە بوون ڕۆژێ بێتە پێشەوە ئەوان تەوافی ئەوماڵە پیرۆزە بکەنو ئاوو هەوای ئەو خاکە پیرۆزە هەڵمژن.

کۆچکەرەکان لەئەنصارەکان زیاتر دڵیان دەیکورکاند بۆ مەککەو بەشەوقو سۆزەوە چاوەڕوانی وەدی هاتنی خەونەکەی پێغەمبەر بوون، ئەوان لەمەککەدا لەدایك بو بوون بەئاوو هەوای ئەو خاکە پەروەردە بو بوون.

زێدو نیشتمانیان بوو بەتۆپزی لێ ی وەدەرنرا بوون جاکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی دیتنی خەونێکی لەو جۆرەی پێدان، گومانیان لەوەدا نەما

کەئەو خەونە لەمساڵەدا دێتە جێ و بەچاوی خۆیان ناوەڕۆکی ئەو خەونە دەبینین.

خەونەکە ئەوەندەی تر خۆشەویستی کەعبەی لەلای هاوەڵان چەسپاند، لەناخەوە سۆزو خۆشەویستی ئەوانی وروژاند، بۆیە پێش وەخت خۆیان ئامادە کرد بۆ هاوبەشی کردن و چوونە دەرەوە لەتەك پێغەمبەردا.

هەر لەگەڵ فرمانیان پێ کرا یەکسەر هەموویان ئامادە بوون و کەسیان خۆی پاش نەدا.

## بەرەو مەککە دوای دابڕانێکی زۆر:

پێغەمبەری خودا لەمانگی ذی یلقەعیدەی ساڵی شەشەمی کۆچی دا لەمەدینەوەبەرەو حودەیبییە کەوتە ڕێ. بەمەبەستی ئەنجامدانی عومرە، بەهیوای شەڕ نەبوو، هەزارو پێنج سەد کەسی لەهاوەڵان لەخزمەت دا بوو، ئاژەڵی دیاری بۆ کەعبەی لەگەڵ خۆی دا هێنا بوو، ئیحرامی بەعەمرە بەست بوو بۆ ئەوەی لەخەڵکی بگەیەنێ کە دەرچوونەکەی لەمەدینە بەمەبەستی زیارەتی کەعبەیەو ڕێز لێ گرتنیەتی. لەهەمان کات دا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پیاوێکی خوزاعەیی ناردبوو بۆ ئەوەی چاودێری قورەیشییەکان بکاو بزانێ چی دەکەن و بەتەما چین و هەواڵەکە بە پێغەمبەر بگەیەنێ. لەشکرەکە هات هەتا گەییشتنە نزیك عەسفان شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا، کابرای خوزاعەیی هاتەوە بۆ لای پێغەمبەرو عەرزی کرد قوربان: من کەعبی کوڕی (لؤی) یم بینی خەڵکێکی زۆری بۆ شەڕ لەگەڵ کردنت کۆ کردبوەوە، لەهەموو هۆزو خێڵێك جەنگاوەری کۆکردنەوە، ئەوان بەتەمای شەڕن و ناهێڵن بچینە ناو مەککەو تەوافی کەعبە بکەن، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێ ڕۆیی تاگەییشتنە شوێنێك کەپێ ی دەگوترێ: (الثنیة) لەوێ

حوشترەکەی چۆکی دادا، هاوەڵان وتیان: وەڵڵا (قەصواء)[١٧٠] لەشوێنی خۆی ناجوڵیو ( قەصواء مانی گرتووەو ناڕوا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نەخێر قەصواء مانی نەگرتووە ئەوە رەوشتی قەصواء نیە مان بگرێ، وەلێ ئەو کەسەی فیلی لەچونە پێشەوە بۆ سەر کەعبە مەنع کرد (قەصواء) یشی مەنع کردوە، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە قورەیش داوای هەرچیم لێ بکەن دەربارەی ئەو شتانەی سنورەکانی خودای تێدا رێز گیراوبێ، هەر پرسیارێکم لێ بکەن دەربارەی صیلەی رەحم، وڵامیان دەدەمەوە، ئەمجار لەحوشترە (قەصواء) کەی راخوڕیو ئاوزەنگی لێ دا قصواء راپەڕیو رۆیی تاگەییشتە ئەو پەڕی حودەیبییە لەوی لەشوێنێکی زۆنگاوی کەم ئاودا دابەزی، هاوەڵان هانای بێ ئاوی و تینویەتییان بۆ پێغەمبەر هێنا، ئەویش تیرێکی لەتیردانەکەی خۆی دەرهێناو فەرمانی بەهاوەڵان کرد بیخەنە ناو زونگاوەکەو، ئیتر ئاو هەڵقولاو جاری بوو، تالەوێ بوون بێ ئاوییان بەخۆوە نەبینی.

## قورەیش ترسان موسوڵمانەکان بچنە ناو مەککەوە:

قورەیشییەکان لەوە ترسان کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەتەما ئەوە بێ بچێتە ناو مەککە. لەسەرێکی ترەوە پێغەمبەر بەلایەوە باش بوو یەکێك لەهاوەڵانی بنێرێ بۆ لایان وتو وێژیان لەگەڵ بکا، بانگی عومەری کوڕی خەتتابی کرد بۆ ئەوەی بینێرێ بۆ لایان، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەمەککەدا کەسێکی تیرەی عەدی کوڕی کەعبی لێ نەماوە ئەگەر قوڕەیشییەکان دەستیان لێ وەشاندمو ئەزیەتیان دام لەسەرم بکاتەوە، پێم

---

[١٧٠] قەصواء: ناوی حوشترەکەی پێغەمبەرە.

باشە عوسمانی کوڕی عەففان بنێرێ چونکە هۆزی ئەو لەوێ دا هەن، عوسمان دەتوانێ ئەوەی دەتەوەێ پێیان بگەیەنێ، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) عوسمانی بانگ کردو ناردی بۆ لای قورەیشییەکان، پێ ی فەرموو پێیان بێژە ئێمە نەهاتووین بۆ شەڕ بەڵکوو هاتووین عەمرە بکەین‌و بگەڕێینەوە، لەهەمان کات بانگەوازییان بکە بۆ موسوڵمانبوون، لەهەمان کات دا فەرمانی پێ کرد کەدیدەنی چەند پیاوێکی موسوڵمان‌و ئافرەتی موسوڵمان بکا مزگێنی رزگار کردنی مەککەیان پێ بداو ورەیان بەرزبکاتەوەو سوربن لەسەر ئایینی خۆیان، لەسەر راسپاردەو فەرمانی پێغەمبەر عوسمان رۆیی بۆ مەککە، چووە لای ئەبو سەفیان‌و ریش سپیانی قورەیش‌و راسپاردەکانی پێغەمبەری پێ گەیاندن‌و هەڵوێست‌و مەبەستی پێغەمبەرو موسوڵمانانی بۆ شیکردنەوە. کەعوسمان لەقسەکانی بووەوە، قورەیشییەکان بەعوسمانیان گوت: ئەگەر دەتەوەێ تەوافی کەعبە بکەی بچۆ تەواف بکە، عوسمان وتی: تا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەواف نەکا من تەواف ناکەم.

جاکە عوسمان گەڕایەوە موسوڵمانەکان پێیان گوت، ئەی ئەبو عەبدوڵلا تینوایەتی خۆت بەتەوافی کەعبە شکاند؟؟ عوسمان گوتی: بەخودا گومانی خراپتان پێ بردوم، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ساڵێك بمامایەوەو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەحودەیبییە دا بوایە، تا پێغەمبەر تەوافی نەکردایە من تەوافم نەدەکرد، ئەمجار وتی: قورەیشییەکان زۆریان پێ گوتم: کەبچم تەواف بەڵام نەمکرد.

## پەیمانی خودا لەخۆرازیکردن (بیعە الرضوان):

لەوکاتەدا کەعوسمان لەناو قورەیشییەکان دابوو پێغەمبەر هەواڵی ئەوەی پێ گەیی: کە عوسمان کوژراوە، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) داوای

لەموسـولْمانەكان كـرد كەپـەيمانی پـێ بـدەن و ئامـادە باشـی خۆيـان بـۆ خـۆ بـەختكردن دوپـات بكەنـەوە، ئـيتر موسـولْمانەكان خوێنيـان گـەرم داهـات و هـەموويان لـەدەوری پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) كەلـەژێر درەختێـك دابـوو كۆبونـەوە، پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) دەسـتی خـۆی گـرت و فـەرمووی ئـەم پەيمانـە لـەجياتی عوسمانـە،، هـاوەڵان هـەموويان پـەيمانيان پێـدا، ئـەم پەيمانـە كـە پێـی دەگـوترێ (بيعـة الرضـوان) لـەژێر درەختـی (سـومرە) لەحودەيبييـە ئـەنجام درا، ئـەو درەختـەی كـە پـەروەردگار دەربـارەی دەفەرمووێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا. سورة الفتح (١٨)﴾ جالەو كاتەدا كەموسـولْمانەكان لـەم جـم و جۆڵـە دا بـوون پيـاوێكی خوزاعـەيی كـە نـاوی (بودەيلی كوڕی وەرقاء) بوو لەگەڵ چەند پياوێكی هـۆزی خوزاعـە، قسەيان لەگەڵ پێغەمبەر كرد، پرسياريان كرد بۆ چی هاتوون؟؟

لـەوەڵام دا پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی ئێمـە نـەهاتووين بـۆ شـەڕ كــردن لەگــەڵ كــەس دا، هــاتووين عــەمرە بكــەين و بگــەڕێ ينــەوە، قورەيـشيەكانيش شـەڕو هـەرا تـەواو مانـدوی كـردون و زۆريـان زيـان پـێ گەيـشتووە، جـا ئەگـەر حـەزيان لێ يـە ماوەيـان بـۆ درێـژ دەكەمـەوە، چييان بەسـەر نێـوان مـن و خـەڵكی يـەوە نـەبێ، ئەگـەر دەيانـەوێ بێنـە نـاو ئـەو پەيمانەی نێوانی من و خەڵكی يەوە بابێن. ئەگەر هيچ كام لەم رێيانە ناكەم، ئەوە سوێندم وابێ لەسەر كاری خۆم دەڕۆم و هەتا سەرم لەجەستەم جيا دەبێتەوە شەڕيان لەگەڵ دەكەم، يـان خـودا فـەرمانی خـۆی دەربارەيـان جـێ بەجێ دەكا.

جاكـە بودەيـل وتـەكانی پێغەمبـەری پـێ گەيانـدن، عـوروەی كـوڕی مەسعودی (الثقفي) وتـی: بێگومـان ئـەم پيـاوە نێردراوە پلانێكـی باشـی بـۆ

داناون، رایەکەی وەرگرن، لێم گەڕێن بامن بچم بۆ لای، وتیان: فەرموو بچۆ، عورەوەی کوڕی مەسعود هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قسەی لەگەڵ کرد، عوڕوە خێرا خێرا سەرنجی هاوەڵانی پێغەمبەری دەدا کەفەرمانی پێ نەکردن خێرا ئەنجامیان دەدا، کەدەست نوێژی هەڵدەگرت شەڕ بوو لەسەر ئاوی دەستنوێژی کەفەرمایشتی دەفەرموون، هەموویان بێ دەنگ دەبوون‌و متەیان لەخۆ دەبڕێ گوێچکەیان بۆ کلور دەکرد زاتیان نەبوو پڕ بەچاویان سەیری بکەن چونکە ئەوەندە بەلایانەوە گەورە بوو، ئیتر عوڕوە هاتەوە بۆ لای جەماعەتەکەی‌و وتی گەلۆ سوێندم وابێ من سەردانی زۆر پاشاو فەرمانڕەوام کردوە، چوومە لای کیسراو قەیصەرو نەجاشی، سوێندم بەخودا هیچ پاشاو مەلیکێکم نەدیوە هاوەڵەکانی رێزی لێ بگرن هێندەی هاوەڵانی (موحەممەد) رێز لەموحەممەد دەگرن، پیاوی چاك بن لێیان گەڕێن باعەمرەکەیان بکەن‌و بەبێ وەی‌و شەڕو هەرا بگەڕێنەوە!!

### پەیمان‌و ئاشتی:

لەم کات‌و ساتانەدا پیاوێکی بەنو کەنانەیی‌و پیاوێکی تریش کەناوی مکرز) ی کوڕی (حفص) بوو هاتن چییان بینیبوو بەوجۆرە هەواڵیان بەقورەیشییەکان دا ئەمجار قوڕەیشییەکان سوهەیلی کوڕی عەمریان نارد، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سوهەیلی بینی فەرمووی قورەیش کە ئەم پیاوەیان ناردوە وادیارە دەیانەوێ پەیمانی ئاشتی ببەستین. ئەمجار کەمات‌و دانیشت‌و قەسەکرا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی نووسراوێك لەنێوان ئێمەو ئەوان دا بنووسەو ئامادەین بۆ ئاشتەوایی. سوهەیلیش پێی باش بوو ئیتر بانگی نووسەرەکەی کرد (کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو) وتی: بنووسە (بسم الله الرحمن الرحيم) سوهەیل وتی: بەخودا ئێمە نازانین

(الـرحمن) چـيە لەپـەيمانو نووسـراوی ئێمـەدا ئـەو جـۆرە وشـانە بـەكار نـاهێنرێن، بـەڵكوو بنووسـە (باسمـك اللـهم) وەكـوو لـەوە پـێش دەتنووسـی، موسوڵمانەكان رەخنەيان گرتو رازی نەبوونو وتيـان نابـێ ئـاوا بنووسـرێ، هەردەبێ بنووسرێ (بسم الله الرحمن الرحيم) پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی بنووسە (باسمك اللهم) قەيناكا. ئەمجارفەرمووی بنووسە (هذا ماقاضى محمد رسول الله) سوهەيل وتـی: ئەگـەر ئێمـە دان بـەوەدا بنـێين كـە تـۆ پێغەمبـەری خـودای لەتـەوافی كەعبـە مـەنعمان نـەدەكردیو شەريـشمان لـەدژت رانەدەگەيانـد بـەڵكوو بنووسـە (محمـد بـن عبـدالله) پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی مـن پێغەمبـەری خـودام هەرچـەندە بەدرۆشـم بخەنـەوە، قـەيناكا بنووسـن ( محمـد بـن عبـدالله) فـەرمانی بەعـەلی كـرد كەوشـەی (رسـول الله) بكوژێنێتـەوە عـەلی وتـی: بـەخودا مـن وشـەی (رسـول الله) ناكوژێنمـەوە پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی وشـەكەم نيـشان بـدە مـن بـۆ خـۆم دەيكوژێنمەوە، عەلی نيشانی داو ئەويش بە دەستی خۆی كوژاندييەوە.

## ئاشتیو ئەزموون:

پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە ئەو پەيمان ئاشتينامەيەيە كە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلاّ مۆری كرد لەگەڵ سوهەيلی كوڕی عـەمردا، كە رێگەمان بۆ چۆڵ بكەن بچين تـەوافی كەعبـە بكـەين. سوهەيل وتـی: دەبـێ لەسـاڵی داهـاتوودا بـێن بـۆ عـەمرە نـەك ئەمـساڵ، چـونكە ئـەوە بەتێـشكان لەسەر ئێمە حيساب دەكرێو عەرەبەكان بەدۆڕاومان حيساب دەكەن.

خـاڵێكی تـر كـە سـوهەيل جـەختی لەسـەر كـردەوە ئـەوە بـوو كـەوتی: هەركەسـێ لەقورەيـشييەكان هاتـە لای تـۆو دەبـێ بيگێڕيـەوە بـۆ مەككـەو داڵـدەی نـەدەی بابێتـە سـەر ئـاينی تـۆش. موسـوڵمانەكان سەرسـام بـوون

وتیان چۆن کەسێك بێ موسوڵمان بێ ئێمە بیگێڕینەوە بۆ لای بتپەرستەکان؟! بەڵام پێغەمبەر ئەمەشی قبوڵ کرد فەرمووی باشە رازین.

لەکاتێك کەسوهەیلی کوڕی عەمر بەو شێوە خەریکی دانوسان بوو سەرگەرمی ئەم بێنەو بەرەیە بوون ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیل هات، پەنای هێنا بۆ موسوڵمانەکان و وتی موسوڵمان بووم و لای ئێوە دەمێنمەوە، کە سوهەیل کوڕەکەی بینی بۆی هەڵساو دەستی کرد بەلێدانی بە پێغەمبەری گوت، پێش ئەوەی ئەم کوڕەی من بگاتە ئێرە ئێمەرێکەوتنەکەمان مۆر کردوە، دەبێ بیگێڕیەوە بۆ مەککە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی راست دەکەی ئیتر سوهەیل ئەبو جەندەلی کوڕی رادەکێشا بیباتەوە بۆ مەککەو ئەبو جەندەلیش هاواری دەکرد ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان ئایا ڕەوایە باوکم بمباتەوە بۆ ناو بتپەرستەکان و لەئایین لام بدەن؟. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) روی کردە ئەبو جەندەل و پێی فەرموو: ئارامت بێ و بەفەرمانی خودا رازی بە، بزانە خودا دەرووی خێر لەتۆیش و موسوڵمانان دەکاتە، ئێمە پەیمانمان بەستووە لەگەڵ قورەیش دا رێك کەوتوین، پەیمانی خودامان داوێ ناتوانین ئەو پەیمانە بشکێنین.

هەردوولا موسوڵمانەکان و قورەیش رێك کەوتن: کە بۆ ماوەی دەساڵ ئاشتی بەر قەراربێ، خەڵك دڵنیابێ و بەئاشتی ژیان بەسەر بەرن. کەس دەست درێژی نەکاتە سەر کەس. هەرکەسێ بەبێ ئیزنی وەلی یەکەی لەقوڕەیشییەکان بێتە لای موحەممەد دەبێ بیگێڕێتەوە، ئەگەر لەهاوەڵانی موحەممەد پاشگەز بوەوە چوو بۆ لای قوڕەیشییەکان نایگێڕنەوە بۆ لای موحەممەد. هەرکەسێ دەیەوێ بچێتە ناو عەهدو پەیمانی موحەممەدەوە دەتوانێ بچێتە ناو پەیمانەکەیەوە هەرکەسێ ئارەزۆی لێ یە بچێتەناو پەیمانی قوڕەیشەوە بابچێ.

## بەڕواڵەت موسوڵمانەکان لەصولح دا تێشکابون:

کاتێك موسوڵمانەکان لەحودەیبییە بینییان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو هەموو مەرجە قورسانەی قورەیشییەکانی قبوڵ کرد، خەڵکەکە کەوتنە حاڵەتی جۆش دامان و خەفەتبارییەوە بەجۆرێك هەندێکیان خەریك بوو لەخەفەتان دڵیان بتەقێ هەرچی بیریان لێ دەکردەوە خۆیان بەدۆڕاو تێشکاو دەزانی. هەتا عومەری کوڕی خەتتاب هات بۆ لای ئەبو بەکر خودایان لێ رازی بێ، وتی: ئەرێ پێغەمبەر نەیفەرموو ئێمە تەوافی کەعبە دەکەین و دەچینە ناو ماڵی بەیتەوە، ئەبو بەکر وتی: بەڵێ، وەلێ پێم خۆشە ئەوە بزانی ئایا پێغەمبەر وتی: ئەمساڵ؟! عومەر وتی: ناوەڵڵا نەیفەرموو ئەمساڵ. ئەبو بەکر وتی: دەسا دڵنیابە دەچینە ناو ماڵی بەیتەوەو تەوافی کەعبەش دەکەین. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەلە مۆرکردنی ئاشتینامەکە بوەوە چوو بەدەستی خۆی حوشترەکەی بەدیاری بردبووی سەری بڕی، ئەمجار دانیشت و سەری خۆشی تاشی بەمەش موسوڵمانەکان زۆر نارەحەت بون و نەیاندەزانی لەخەفەتان چی بکەن چونکە ئەوان کەلە مەدینە وەدەر کەوتبوون دڵنیا بوون سەد دەرسەد کە دەچنە مەککەوەو تەوافی کەعبەش دەکەن، بەڵام وائێستابە چاوی خۆیان دیتیان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) حوشتری دیاری خۆی سەربڕی و ئیحرامی شکاند دڵنیان کەلەم مەو سیمەدا تەوافیان بۆ ناکرێ و عەمرەیان بۆ ئەنجام نادرێ وەندەی تر خەفەتبار بوون، بەڵام وێڕای ئەوەش خێرا هەریەکە یان پەلاماری دیارییەکانی خۆیان داو سەریان بڕین و سەری خۆیان تاشی و ئیحرامیان شکاند.

## ئاشتینامەی شەرم ئاوەر یان سەرکەوتنی ئاشکرا:

دوای ئیحرام شکاندن پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) گەڕایەوە بۆ مەدینە لەکاتی گەڕانەوە دا پەروەردگار ئایەتەکانی سەرتای سورەتی (الفتح) ی نازڵ کرد، دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا.﴾ سورة الفتح/١. کە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) ئایەتەکانی بەسەر موسوڵمانەکان دا خوێندەوە عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: ئەمە سەرکەوتنە ئەی پێغەمبەری خودا؟! پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) فەرمووی بەڵێ: (عسى أن تكرهوا شيئاً وهو خير لكم) وێدەچێ شتێکتان پێناخۆش بێ وەلێ سەرنجامی خێر بێ کە پێغەمبەر گەڕایەوە بۆ مەدینە پیاوێك لەقوڕەیشییەکان موسوڵمان بوو بوو هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) کە ناوی ئەبو بەصیر (عوتبەی کوری ئوسەید) بوو، قوڕەیشییەکان دوو پیاویان نارد بەشوێنیا، بۆ مەدینە وتیان: بەگوێرەی عەهدو پەیمانی مۆرمان کردوە دەبێ موحەممەد پەنای نەداو بۆمانی بگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (درودی خوای لێبێت) ئەبو بەصیری لەگەڵ ناردنەوەو بەرەو مەککە کەوتنەڕێ لەڕێگا فرسەتی لێ هێنان و شمشێرەکەی لەدەستی یەکیان وەرگرت و کوشتی و ئەوی تریان هەڵات و ئەبو بەصیریش گەڕایەوە بۆ مەدینەو ئەم هەواڵەی بە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) گەیاندو ئەمجار بەرەو دەریا رۆیی تاگەییشتە شوێنێك پێ ی دەگوترێ (العيصى) لەوێ بەقاچاغی هەڵهات پەیوەندی بەئەبوبەصیرەوە کرد وردە وردە موسوڵمانی تریش لەمەککەوە پەیوەندییان پێوە کردن هەرکەسێ لەمەککە موسوڵمان بوایە دەهاتە گەڵ گروپی ئەبو بەصیر هەتا وایان لێ هات بوونە هێزێکی رێگرو هەرکاروانێکی قورەیش بەرەو شام بڕۆییشتایە ئەوان پێشیان پێ دەگرت و کاروانچیەکانیان دەکوشت و کاڵا کەشیان داگیر دەکرد، قورەیشییەکان تەنگە تاو بوون و داوایان لە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) کردو لێ ی پاڕانەوە وتیان بۆ خاتری خوا بۆ خاتری خزمایەتی و صیلەی رەحم با ئەو کۆمەڵە

بچنە مەدینەو ڕێگەمان لێ نەگرن‌و لەوەبەو لاوە هەرکەسێ موسوڵمان دەبێ بابچێتە لای موحەممەدو ئێمە داوای ناکەینەوە، ئیتر ئەبو بەصیرو گروپەکەی لەسەر داوای قورەیش‌و فەرمانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هاتنەوە مەدینەو لەوە بەدواش هەرکەسێ لەقورەیشییەکان ئیمانی بهێنایەو بهاتایە بۆ مەدینە وەردەگیراو نەدەگەڕێندرایەوە بۆ مەککە. بەم جۆرە ئاشتینامەی حودەیبییە بوو بەسەرکەوتن بۆ موسوڵمانەکان. ڕوداوەکانی دووا صوڵحی حودەیبییە ئەوە یان سەڵمان کەنەرم کێشی پێغەمبەر بۆ زەخت‌و زۆری قورەیشییەکان، قبوڵکردنی ئەو هەموو مەرجە قورسانەی قورەیش قورەیش لەلایەن پێغەمبەرەوەو دان بەخۆدا گرتنی موسوڵمانەکان‌و پابەندبوونیان بەڕێنومایی یەکانی پێغەمبەر تا ئەو پەڕی سنور، دەرگایەکی سەرکەوتنی گەورەی لێ کردنەوە، بوو بە بەهۆی خێرا بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام لەناو نیوە دوورگەی عەرەب دا. لەهەمان کات دا بوو بەدەرگایەکی سەرەکی بۆ رزگار کردنی مەککەو بانگەوازی پاشاکانی جیهان، ( قەیصەرو کیسراو، موقەوقیس‌و نەجاشی‌و سەورۆکو ریش سپیانی خێڵە عەرەبەکان) بۆیە پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ. (٢١٦) سورة البقرة﴾ یەکێك لەدەستکەوتە سەرەکییەکانی ئەم ئاشتینامەیە دان پێدانانی قورەیشییەکان بوو بەکەسایەتی‌و مەکانەتی موسوڵمانەکان، تەسلیم بوونیان بەوە کەموسوڵمانان هێزێکن‌و دەبێ حیسابیان بۆ بکرێ، پەیمان‌و ئاشتینامەیان لەگەڵ دا مۆر بکرێ، دان‌و سان‌و بەرامبەرییان لەگەڵ دا ئەنجام بدرێ، لەلایەکی ترەوە گەورەترین بەرو بوومی ئەو صولحە بەرقەرار بوونی ئاشتی‌و شەپوەستان بوو، موسوڵمانەکان لەو شەڕە ماڵوێرانکارانەی سەرو بنیان نەبوو رزگاریان بوو، چی تر وزەو توانایان لەو جۆرە شەڕانەدا خەرج نەدەکرد، لەماوەی ئاشتی

یەکەدا موسوڵمانان توانییان بانگەوازی ئیسلامی بڵاو بکەنەوە، لەژێر سایەی ئاشتوایی و کەش و هەوای ئارامی دا پەیامی خۆیان بە خێڵ و هۆبەو گوندو شارەکان بگەیەنن.

لەهەمانکات دا ئەم ئاشتینامەیە بواری ئەوەی بۆ موسوڵمانەکان و موشریکەکان رەخساند تێکەڵاوی یەکتربن و لەوزع و حاڵی یەکتری ئاگاداربن، بەهۆی تێکەڵاوی و یەکتری دیتنەوە موشریکەکان ئاگاداری ئاکارو رفتاری جوانی موسوڵمانەکان بوون، بۆیان دەرکەوت ئەو ئایینە چۆنی قاڵی کردون و لەبۆتەی داون و دڵ و دەرونی مشت وماڵ کردون و ئەخلاق و رەوشتی ئارایش داون، چڵك و پۆخڵاوتی شیرك و بتپەرەستی لێ نورخستونەوە، دوژمنایەتی و کێشەو نیزاعی لەنێودا نەهێشتون، رقەبەری و شەڕەنگیزی و تینوێتی بۆ خوێن رشتن و براکوژی لەبیر بردونەوە، کۆمەڵگایەکی نموونەیی و بەخۆ چاراوو پوخت و هاوڕازو هەمئاهەنگ و خودا پەرستی لێ دروست کردون، هەرچەندە بتپەرستەکان سەررەق ملنەدەر بوون بۆ بانگەوازی پێغەمبەر، بەڵام هەستیان بەوە دەکرد کەتەنها رینومایی یەکانی ئیسلامەو هاوەڵیەتی پێغەمبەرە وای کردوە موسوڵمانەکان لەخزم و کەس و کاری خۆیان جیا بکاتەوەو گەل و نەتەوەیەکی نموونەیی و خاوەن رەوشتی بەرزو سەنگین بەدی بێ. هەموو ئەمانە وای کرد بتپەرستەکان لەئیسلام تێبگەن و دان بەکاریگەری و بێهاتوویی ئەو ئایینە دا بنێن. ئەوەتا ساڵێکی تەواو تێنە پەڕی بەسەر ئەم صولحەدا ئەوانەی لەعەرەبەکان موسوڵمان بوون پتربوون لەوانەی لەماوەی پانزە ساڵی پێشوودا موسوڵمان بوون. بەمەرجێك هێشتا مەککە رزگار نەکرابوو!

ئیمام ئیبنو شەهابی زوهری (مردوی ١٢٤هـ) دەڵێ: لەپێش صولحی حودەیبییە دا هیچ شەڕو غەزایەك نەکراوە هێندەی ئاشتینامەی حودەیبییە

کاریگەر بوونی، لەپێش حودەیبییەدا موسوڵمانەکان بۆ جەنگو بەرامبەری بەیەك دەگەیشتن، کەئاشتی بەرقەرار بوو شەڕو ڕوبەڕو بوونەوە نەما، خەڵك کەوتنە ئارامیو خۆشی یەوە، هەندێکیان بەقسەو وتو وێژ بەیەك گەیشتن بیرو رایان ئاڵو گۆڕ کرد، کەوتنە موناقەشەی دورو درێژەوە، هەرکەسێ بەوردی ئاینی ئیسلامی بۆ شی بکرایەوە موسوڵمان دەبوو، چەندێك لەماوەی پێش صولحی حودەیبییە موسوڵمان بو بوون لەدوساڵی دوا حودەیبییە زیاتر لەو ژمارەیە موسوڵمان بوون.

ئیبنو هیشام دەڵێ: بەڵگە لەسەر راستی قسەی (الزهری) ئەوەیە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەچوو بۆ حودەیبییە هەزارو چوار سەد کەسی لەخزمەت دابوو، کەلە ساڵی رزگار کردنی مەککەدا کە دووساڵ دوا حودەیبییە بوو دەهەزار کەسی لەگەڵ دابوو. .

لەسەرێکی ترەوە لەوئاگر بڕو شەڕ وەستانەدا موسوڵمانە هەژارەکانی ناو مەککە زۆر سود مەند بوون، تەنانەت خەڵکێکی زۆر لەدانیشتوانی مەککە لەسەر دەستی ئەبو جەندەل موسوڵمان بوون، قورەیشییەکان بەجمو جۆڵی ئەبو جەندەل زۆر تەنگە تاوبونو بانگەوازی کردنی ئەم هاوەڵە لەخۆ بردوە ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو لەبڵاو بوونەوەی ئاینی ئیسلام دا. چ لەمەککەو چ لەدەرەوەی مەککەدا. گروپی ئەبو جەندەل تالە مەککەدا بوون هەمیشە سەر گەرمی پەیوەندیکردنو بانگەوازی کردن بوون دوایی پەیوەندییان کرد بە گروپەکەی ئەبو بەصیرەوە، ئیتر بوونە هێزێکی گەورەو حیساب بۆ کراو، قورەیشییەکانی ناچار کرد لەو بارەوە لەگەڵ پێغەمبەردا سەر لەنوێ لەسەر چەند خاڵێکی صولحی حودەیبییە دانو سان بکەنەوە، بەڵکوو داوایان لە پێغەمبەر کرد کەئەو گروپە بگەڕێنێتەوە بۆ مەدینەو چی تر نەبنە رێگر لەسەر ڕێگای کاروانی بازرگانییان، ئەو خاڵە زەقەی کەلە

صوڵحی حودەیبییە دا بەئیلحاحەوە لەسەر موسوڵمانەکانیان داناو (تێ یدا هاتبوو هەرکەسێ لەقورەیشیەکان پەیوەندی بەموحەممەدەوە بکا دەبێ بیگەڕێنێتەوە بۆ مەککە) بەناچاری وازیان لێ هێناو لە پێغەمبەر پاڕانەوە خیان قبوڵ بکا، ئەویش قبووڵی کرد، بە مەش قوڕەیشییەکان لەو تەنگانە نابوریە رزگاریان بوو کە گروپی ئەبو جەندەل و ئەبو بەصیر خستبویانە سەر دانیشتوانی مەککە. کەوابوو ئەمەش لەچاکەکاری و سیمای باشی ئەم صوڵحە بوو.

هەڵبەتە هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لەئاشتینامەی حودەیبییەداو هەوڵدانی بۆ وەلانانی شەڕو کار کردنی دڵسۆزانە بۆ چەسپاندنی ئاشتی و ئارامی، هەروا پشوو درێژی و لەسەرە خۆیی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لەهەموو کات و سەردەمێکی ژیانی دا بیرو بۆچونی هۆزە عەرەبەکانی کەتائەو کاتە موسوڵمان نەبو بوون سەر لەبەر گۆڕی و وای کرد بەتێڕوانینێکی تازەوە بڕوانە ئیسلام و بانگخوازانی، لەدڵ و دەرونیان دا جۆرە شکۆمەندییەکی چەسپاند لەوە پێش نەچەسپابوو، بەکورتی ئاشتینامەی حودەیبییە لەهەموو رویەکەوە سود بەخش بوو بۆ موسوڵمانان بەتایبەتی لەبواری بانگەوازی کردن دا.

## موسوڵمانبوونی خالیدی کوڕی وەلیدو عەمری کوڕی عاص:

ئاشتینامەی حودەیبییە کلیلی قفڵی دڵەکان بوو لەدوای حودەیبییە، کەڵە پیاوی وەکوو خالیدی کوڕی وەلید موسوڵمان بوو سەر لق و بەرپرسی سوار چاکانی عەرەب و پاڵەوانی شەرەبە ناو بانگەکان و سوپا سالاری فوتوحاتی ئیسلامی لەعێراق و ولاّتی شام دا هێندە ئازاو نەبەرد بوو

پێغەمبەر ناز ناوی (سیف الله) ی بۆ دانابوو، هەروا پیاوی وەکوو عەمری کوڕی عاص ئیمانی هێنا! کەیەکێکە لەقائیدو فەرماندە عەسکەرییەکانو ڕزگار کەری میصر، ئەم دوو کەڵەپیاوە لەدوای صوڵحی حودەیبییە هاتن بۆ مەدینەو موسوڵمان بوونو تاکۆتایی ژیانیشیان بەو پەڕی دڵسۆزییەوە لەپێناو ئیسلام دا تێکۆشانو فیدا کارییان نواند!

## بانگەوازیکردنی پاشاو مەلیکەکانی ئەو ڕۆژگارە بۆ موسوڵمانبوون:

لەکۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیو سەرەتای ساڵی حەوتەم. کەئاشتینامەی حودەیبییە مۆرکراو بارودۆخ ئارام بووە بانگەوازی ئیسلامی کەشو هەوایەکی باشی بۆ ڕەخسا، ڕێگەی بۆ کرایەوە بۆ پێشکەوتنو گەشە کردن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چەند نامەیەکی نووسین بۆ پاشاو مەلیكو قەڕاڵەکانی جیهانو پیاوە ناودارەکانی عەرەب، بەشێوەیەکی حیکمەتئامێز بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنانو شوێنکەوتنی ڕێبازی خوداو ئایینی ئیسلام، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر گرنگی بەم بوارەی پەیوەندیکردنەوە داوە، بۆ هەریەکێ لەو مەلیكو پادشایانە بەنوێنەرێکی خۆی دا نامەی نارد، کەسێکی هەڵبژارد بۆ ئەو نامە بردنە کەبەتەواوی زمانی نامە بۆ نێردراو بزانێ.[١٧١] لەبەر ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا نامە بەبێ مۆر

---

[١٧١] واپێدەچێ ئەم نامانە لەمانگی ذیلحجەی ساڵی شەشەمی کۆچی دوای ئاشتینامەی حودەیبییە نێر درابن، کەرێکەوتی ساڵی ٦٢٧ ی زایینی دەکا. پێش هەموو ئەو پاشایانەی نامەی بۆ نێردراوە کیسرا ئەپەروێزە. ئەم کیسرایە لە مانگی ئازاری ساڵی ٦٢٨ ی زایینی لەدونیا دەرچووە، کە وابێ دەبی صولحی حودەیبییە

قبـول نـەکراوە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) هەنگوسـتیلەیەکی دروسـتکرد ئەڵقەکەی لە زیو بوو، لەتەختی هەنگوستیلەکە رستەی (محمد رسول الله) ی لێ هەڵکەند بوو، هەرنامەیەکی بنار دایە بەو مۆرە مۆری دەکرد. . .

ئەم نامانە ئاماژەی ئەوەیان تێدا بوو کە ئەم دینە بەتەنیا دینی عەرەب نیە. یان تایبەت نیە بە دانیشتوانی جەزیرەوە. بەڵکوو ئایینی هەموو

---

سەرەتای ساڵی ٦٢٧ ی کۆچی بێ. جائەگەر نامەی پێغەمبەر ساڵی ٦٢٨ی زایینی بۆ هیرقەڵی رۆم نێردرابێ رەحمەتە ئەو ساڵە نامەکەی پێ گەیشتبێ چونکە هیر قەل ئەو ساڵە روەو ئەرمینیا رۆیشتوە. ئیبنو سەعد لە (طبقات جـ ٢٣/٢) داو سیوطی لە الخصائص الكبرى، جـ ١١/٢) دا ئاماژە بەوە دەکەن کەگەیشتنی ئەم نامانە بەشێوەی موعجیزە بووە.نووسەر هەرچەندە ئەوە بەدوورنازانێ کە گەیشتنی نامەکان بە شێوەی موعجیزە بووبێ و زانینی نامەبەرەکان بۆ زمانی نامە بۆ نێردراوەکان هەردووبارە موعجیزە بووبێ. خوێندنەوەی پێغەمبەرانی پێشوو پڕە لەنموونەی موعجیزە. نینکاریکردنیان تاوانی گەورەیە وەلێ وێڕای هەبوونی ئەم ئەگەرە، بەڵام ئەو بۆ چوونە بەپەسەند دەزانین کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەحیکمەت و لێزانی و دانایی خۆی کەسانی شیاوی هەڵبـژاردون بۆ گەیاندنی نامەکان، ئاشکراشە هەبوونی کەسانێك کەزمانی رۆمی یافارسی یاقبطی یازمانی حەبەشە بزانێ شتێکی ئاسایی بووە، چونکە عەرەبەکان تێکەڵاوی ئەم گەل و نەتەوانە بوون و هاموشۆی یەکتریان کردوە، بازرگانییان لەگەڵ یەك کردووە، کەوابێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەسێکی ناردوە بۆ لای کیسرا زمانی فارسی بزانێ، کەسێکی ناردوە بۆ لای هیر قەل زمانی رۆمی بزانی، ئەوانەی ناردونی بۆ لای سەرەك هۆزە عەرەبەکانی جەزیرەش بێشك بەزمانی عەرەبی رەگماکی خۆیان ئاخاوتنیان لەگەڵ کردون، ئەو کەسانەی پێغەمبەر هەڵی بژاردون بۆ نامە بەری هەموویان داناو لێهاتوو بوون. بۆ نموونە دوحیەی کەلبی هەڵبـژاردو بۆ بردنی نامە بۆ لای هیر قەلی رۆم لەبەر ئەوە بووە گەنجێکی جوانخاصی زیرەکی خاوەن وییرو باوەڕی پتەو بووە، تەنانەت گوتراوە جوبرائیل زۆر جار لەسەر شێوەی دیمەنی دوحیە هاتووە بۆلای پێغەمبەر.

ئادەمیزادەو ئایینی مرۆڤایەتییە. ئەم نامانە ئاگادار کردنەوەو ئینذار بوون بۆ پاشاو دەسەڵاتدارانی دەرەوەی جەزیرەی عەرەب، ترساندنی خاوەن هێزو پلەو پایەکان بوو کە چەندێك قەڵەمڕەوی بەرفراوان‌و دەسەڵاتی زۆرو پڕ زەبرو زەنگتان هەبێ، ئەگەر بەخۆشی وەڵامی نامەکانی پێغەمبەر نەدەنەوە ئەوە زۆری پێ ناچێ روبەروی تێك روخان‌و لەدەستدانی دەسەڵات دەبنەوە، ئەگەر بەپیر بانگەوازی ئیسلامی یەوەی نەیەن‌و نەچنە ژێر سایەی پیرۆزیەوە، یان بەلانی کەمەوە دەبێ رێگە بدەن رەعیەت‌و جەماوەری ژێر دەسەڵاتیان ئەم ئایینەیان بۆ شی بکرێتەوەو نەبنە ڕێگر لەبەر دەم بانگخوازانی ئیسلام‌و موسوڵمانبوونی گەل‌و نەتەوەکانی ژێر قەڵەمڕەویان!!

## ئەو نامانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەرین) ناردنی بۆ پاشاکان

یەکێك لەو پاشایانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەرین) دوای ئاشتنامەی حودەیبییە نامەی بۆ ناردو بانگەوازی کرد بۆ ئیمانهێنان، ئیمپراتۆری روم (هیر قەل) و ئیمپراتۆری فارس (کیسرا ئەپەروێز) بوو هەروا نەجاشی پاشای حەبەشە بوو، (المقوقس) ی مەلیکی میصر بوو، ئەمەش دەقی نامەکانە، کەیەکە یەکە دەیاننوسین: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەرین) نامەی بۆ هیر قەلی روم بەهاوەڵێکی دا کە ناوی (دحية الكلبي) بوو نارد، دوحیە نامەکەی گەیاندە پاشای (بوصرا) ئەویش بەدەوری خۆی ناردی بۆ هیر قەل دەقی نامەکەش بەم جۆرە بوو:

بسم الله الرحمن الرحيم

**من محمد عبدالله ورسوله، الى هرقل، عظيم الروم سلام على من اتبع الهدى اما بعد فاني أدعوك بدعاية الأسلام، اسلم تسلم يؤتك الله اجرك مرتين، فان توليت فان عليك اثم الأريسيين ياأهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا وبينكم، الا نعبدوا الا الله ولانشرك به شيئا ولايتخذ بعضنا بعضا اربابا من دون الله فان تولوا فقولوا اشهدو بأنا مسلمون.**

واتە بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان، لەموحەممەدەوە بەندەو پێغەمبەری خودا بۆ هیرقەل پاشاو گەورە پیاوی ڕۆم ئاشتیو ڕەحمەت لەسەر کەسێك بێ شوێن هیدایەتی قورئان دەکەوێو ئاییني ئیسلام قبولْ دەکا. پاش سلاّو هیوای خۆشی، من بانگەوازیت دەکەم بەبانگەوازی ئیسلامی، موسوڵمان بە خوێنو ماڵو ژیانت پارێزراوە، خودا دوچەندانە پاداشت دەداتەوە، بەختەوەری دونیاو قیامەتت دەبێ، ئەگەر پشت هەڵبکەی ئەوە هۆباڵی تاوانی ئەریسییینە کانیشت لە ئەستۆ دەبێ (ئەی خاوەن نامەکان، هەڵگرانی تەوراتو ئینجیل وەرن باهەموومان بەیەکەوە لەسەر ئاینێك کۆببینەوە، هەرخودا بپەرستینو جگە لەئەو کەسی تر بەخودا نەزانین، هیچ شتێك نەکەین بەهاوەڵی، بڕێکمان نەچن بڕێکمان بەخودا لەقەڵەم بدەن لەجیاتی ئەوە بەندایەتی بۆ خودا بکەن بەندایەتی ئەوان بکەن، جا ئەگەر ئەو خاوەن نامانە پشتیان هەڵکردو نەهاتنە ژێر سایەی ئیسلامەوە، ئەوە ئێوە پێیان بڵێن: دەسا باش بزانن ئێمە موسوڵمانینو پابەندی ئەو ئایینە پیرۆزەین..!

لەونامەیەش دا کە بۆ کیسری ئەپەروێزی نووسیوە دەفەرموێ:

بسم الله الرحمن الرحيم

من محمد رسول الله الى كسرى عظيم فارس. سلام على من أتبع الهدى و آمن بالله و رسوله وشهد ان لا إله إلا الله و أني رسول الله إلى الناس كافة، لينذر من كان حياً أسلم تسلم فأن أبيت فعليك إثم المجوس.

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان. لەموحەممەد پێغەمبەری خوداوە بۆ کیسرا گەورە پیاوی فارس، سڵاو لەسەر کەسێك بێ شوێن هیدایەتی خودا دەکەوێ و ئیمان بەتاك و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەی دەهێنێ، شایەتی دەدا کە جگە لەخودا هیچ خودای ترنین شیاوی پەرستن بن، هەروا شایەتی بدا کە من پێغەمبەری خودام بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بۆ ئەوەی کەسانێك بترسێنم کەدڵیان زیندوە، موسوڵمان ببە گیان و ماڵی خۆتان دەرپارێزن ئەگەر پشت هەڵبکەی و بەپیر بانگەوازی یەکەمەوە نەیەی ئەوە هۆباڵی تاوانی مەجوسەکانت لەئەستۆیە.

لەونامەیەش دا کەبۆ نەجاشی نووسی دەفەرموێ:

بسم الله الرحمن الرحيم

من محمد رسول الله الى النجاشي عظيم الحبشة سلام على من اتبع الهدى، أما بعد فان احمد اليك الله الذى لااله الا هو الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن. وأشهد ان عيسى بن مريم روح الله وكلمته القاها الى مريم البتول الطيبة الحصينة فحملت بعيسى من روحة ونفخة كما خلق آدم بيده، وانى أدعوك الى الله وحده لاشريك له والموالات على طاعتة وان تتبعني وتؤمن بالذى جاءنى. فانى رسول الله، وانى ادعوك وجنودك الى الله عز وجل وقد بلغت ونصحت فأقبل نصحيتى والسلام على من اتبع الهدى.

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان، لەموحەممەد پێغەمبەری خوداوە بۆ لای نەجاشی گەورە پیاوی حەبەشە، سڵاو لەسەر کەسێك بێ شوێن هیدایەت دەکەوێ دوای سڵاو من سوپاسی ئەو خودایە دەکەم کە هەر خۆی خودایەو پاشای بونەوەرە، باڵا دەستو پیرۆزو شکۆمەندە شایەتی دەدەم کەعیسای کوڕی مەریەم گیانی یەزدانی یەو بەوشەی یەزدانی کە (کن فیکون) بوو ئاراستەی خاتو مەریەمی پاکداوێنو شوونەکردوو دەست لێ نەدراو کرا، بەفەرمانی خودا عیسا لەرەحەمی خاتو مەریەم دا بەبێ هەبوونی باوك خەلق بوو، وەکو چۆن بەدەستی قودرەت ئادەمی دروست کرد ئەمن بانگەوازیت دەکەم بۆ یەکتا پەرستی، بۆ خودا بەیەك ناسینو داننان بەوە کەهاوەڵی نیە، بەردەوامبوون لەسەر تاعەتو بەندایەتیکردن بۆ زاتی پاکی، داوات لێ دەکەم شوێنم بکەویو ئیمان بێنی بەو پەیامەی بۆم هاتووە. بێگومان من پێغەمبەری خودام، من تۆو نەتەوەکەت بانگەوازی دەکەم بۆ لای خودا ئەوا من پەیامی خۆم گەیاندو ئامۆژگاری پێویستم ئەنجام دا، ئامۆژگارییەکانم وەربگرە سڵاو لەسەر ئەوانە بێ کە شوێن هیدات دەکەون.

نامەیەکی نووسی بۆ لای (المقوقس) گەورە پیاوی قیبطییەکان دەفەرموێ:

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان.

لەموحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوداوە بۆ (المقوقس) گەورە پیاوی قیبط سڵاو لەکەسێك شوێن هیدایەت دەکەوێ، دوای سڵاو ئەمن بانگەوازیت دەکەم بە بانگەوازی ئیسلامی، موسوڵمانبە سەلامەت دەبی، موسوڵمانبە گیانو ماڵت پارێزراوە، موسوڵمانبە خودا بەختەوەری دونیاو قیامەتت دەکا، ئەگەر پشتت هەڵبکەی ئەوە هۆباڵی تاوانی هەموو نەتەوەی

(قیبطی)یت لەئەستۆیە.﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ سورة آل عمران/٦٤.[١٧٢]

---

[١٧٢] بروانە المواهب اللدينيە جـ ٣/٢٤٧-٢٤٨. بێگومان تائێستا پێنج پارچە چەرم دۆزرانەوە، خۆر هەڵاتناسی فەرەنسی بارتلیمی لەیەکێ لەکەنیشتەکانی ناوچەی ئەخمیم لەصەعیدی میصر ساڵی ١٨٥٠ی ز پارچە چەرمێکی دۆزی یەوە دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە ئەو پارچە چەرمە نامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بووە کە ناردوویەتی بۆ (المقوقس) گەورە پیاوی قیبط لەمیصردا. مامۆستا المسیوبلین هاوبەشی کرد لەپشکنین و لێکۆڵینەوەی نامەکەداو بەراورد کردنی دەقەکەی بەو دەقانەی کەلەسەر چاوە مێژوویی و ئایینی یەکان دا هاتوون، دوای لێکۆڵینەوەو پشکنین ئەوەی راگەیاند کە متمانەی تەواوی هەیەو دڵنیایە لەوەی کە ئەو نووسراوە نوسخە ئەصڵی یەکەیە. ئەم لێکۆڵینەوەشی لەگۆڤاری بەناو بانگ (المجلة الأسیویة ساڵی ١٨٥٤ دا بلاو کردەوە، پاشان لەگۆڤاری (الهلال) ی میصری دا ساڵی ١٩٠٤ دا بلاو ی کردەوە. هەروەها پێستە نوسراوێك دۆزرایەوە وامەزەندە کرا کەنامەی پێغەمبەر بووبێ بۆ (منذر) ی کوڕی ساوی کەفەرمانڕەوای بەحرەین بووە دوکتۆر بۆش (Busch) ی ئەڵمانی لەگۆڤاری خۆر هەڵاتناسانی ئەڵمان دا لێکۆلینەوەیەکی لەسەر ئەو پارچە پێستە بلاو کردەوە. لەساڵی ١٩٤٠ی ز خۆر هەڵاتناسی ئینگلیزی دنلوب (Dunlop) نووسینێکی لەگۆڤاری (الجمعیە الأسیویە الملکیە) دا بلاو کردەوە لەو لێکۆڵینەوەیەدا ئەوەی راگەیاند کەلە رێگەی بازرگانێکی سوری یەوە، پێستە نووسراوێکی دۆزیوەتەوە پێ ی وایە نامەی پێغەمبەرەکە کاتی خۆی بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە ناردویەتی، ئەوەشی رون کردۆتەوە کە ئەو بازرگانە سورییە گوتویەتی ئەم پارچە پێستەی لەکەشیشێکی ئەثیوبی یەوە دەست کەوتووە کە کاتی خۆی هاتووە بۆ سوریە لەکاتی جەنگی جیهانی دووهەم دا.

ساڵی ١٩٦٣ز دوکتور صلاح الدین المنجد وتارێکی لەڕۆژنامەی (الحیاة) دا لەبیرۆت بلاو کردەوە، تێیدا باسی دۆزینەوەی ئەو نامەیە دەکات کەکاتی خۆی پێغەمبەر (درودی

*** تێبینی و سەرنجدانی دانایانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەتایبەت بوو بەو پاشاو گەورە پیاوانەی نامەکانی ئاڕاستە کردن.**

**خوێنەری زیرەك تێبینی ئەو جودا وازییە وردو ژیرانە دەکا کەلە نێوان نامەکان دا هەیەو حیکمەتو دانایی پێغەمبەری تێدا دەردەکەوێ، لەبواری بانگەوازی دا، موراعاتی ئەوەی تێدا کراوە ئەو پاشایانە بیرو باوەڕیان**

---

خوای لەسەربێ بۆ کیسرای ناردبوو، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نوسخە چەرمە ئەصڵەکەی ئەم نامەکەیە لەلای هەنری فیر عەون ( وزیرەکی پێشووی لوبنان بوو) هەڵگیراوە لەنێوان دووپارچە شوشە دا پارێزراوە، دڕوییەکی پێوە دیارە لەلای سەرەوەرا بەرەو ناوەڕاست ئەمجار بەرەو لای راستیو ئەمجار دڕاویەکە بەرەو خوار هاتووە، ئەم شوێن دڕاوییە زۆر بەکارامایی پێکەوە نووسێنراوەتەوە بۆ ئەوەی دیمەنی نامەکە وەك خۆی بمێنێتەوە.

لەپوختەی باسێکی پەیوەست بەنامەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ پاشاو قەڕاڵەکانی سەردەمی خۆی: کە دوکتۆر (عزالدین ابراهیم) پێشکەشی کۆنگرەی ژینامەی پێغەمبەری کرد کە مانگی موحەرەمی ساڵی ١٤٠٠ی کۆچی لەدەوحە بەسترا لەو باسەدا هاتووە: دەڵێ: ئەو نامەیەی ئاڕاستەی ئیمپراتۆری رۆم (هیر قەل) ی کردن، ئەوە تاسەدەی حەوتەمی کۆچی لە ئیسپانیا هەڵگیرا بوو مێژوو نووسی بەناو بانگ (السهیلي) لەرۆژگاری خۆی دا ئاماژە بەهەبوونی ئەو نامەیە دەکا لەکتێبی ارشاد الساري لشرح صحیح البخاري نووسینی شهاب الدین احمد بن محمد القسطلاني جـ ٨١/١ داهاتووە دەڵێ: دەگێڕنەوە پاشای فەرەنگ لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیك مەنصور (قلاون الصالحي) دا سندوقێکی زەر کەفتی بۆ سەیفو الدین قلج دەرهێنا، لەناو سندوقەکەدا قوتووە زێڕێکی هێنایە دەرێ نامەیەکی تێدابوو زۆربەی پیتەکانی سڕابوونەوە، وتی: ئەمە نامەی پێغەمبەری ئێوەیە کاتی خۆی بۆ باپیرە گەورەی من قەیصەری رومی ناردوە، ئێمە پشتاو پشت پارێزگاری ئەم نامەیەمان کردوە، باوكو باپیرانمان رایان سپاردوین کەپارێزگاری بکەین چونکە تا ئەم نامەیە لامان بێ دەسەڵاتمان پارێزراوە.

چۆنەو چی لەناخیان دەدا، چۆن سەرنجیان بۆ لای خۆی رادەکێشێ، ئەوەتا چونکە هیرقەل‌و موقەوقەس کەم تازۆر بڕوایان بەخودایەتی مەسیح هەیە، یان پێیان وایە کوڕی خودایە. لەو نامانەدا کە ئاڕاستەی ئەوانی کردون وشەی بەندەی خودا (عبدالله) ی بۆ خۆی بەکار هێناوە، دوای بیسمیلا کردن دەفەرموێ لەموحەممەد بەندەی خوداو پێغەمبەری خوداوە بۆ لای هیر قەل گەورە پیاوی رۆم. یان دەفەرموێ لەموحەممەد بەندەی خوداو پێغەمبەر خوداوە بۆ لای موقەوقس گەورە پیاوی قیبط. بەپێچەوانەی ئەو نامەی بۆ کیسرا نووسیوە دەفەرموێ لە موحەممەد پێغەمبەری خوداوە بۆ لای کیسرا گەورە پیاوی فارس. هەروەها دەربارەی هیر قەل‌و موقەوقیس ئایەتی ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ سورة آل عمران/٦٤. لەم دوو نامەیەداو لەو نامەیەدا کە بۆ کیسرای نووسیوە، جودا وازی یەکی بەرچاو هەیە، چونکە لەدوو نامەکاندا ئایەتە کە خیطاب لەگەڵ ئەهلی کیتاب دەکا ئەوانەی بڕوایان بەخودایەتی مەسیح هەیە، مالم و قەشەکانیان کردون بەئەرباب جگە لە خوداو حەلاڵ‌و حەرامیان بۆ دیاری دەکەن‌و شەریعەتیان بۆ دادەنێن. بێگومان هیر قەل. ئیمپراتۆری بیزەنتی‌و موقەوقیس فەرمانڕەوای میصر هەردوکیان سەرکردەی رامیاری بوون، دوو رابەری ئایینی گەورەو ناوداری عالەمی مەسیحی بوون، هەرچەندە جیاوازی یەکی کەمیان لەنێوان دا هەبوو دەربارەی خودی مەسیح لەوبارەوە ئایە یەك سروشتی هەیە، یان خاوەنی دوو سروشتە؟ جالە کاتێك دا کیسرا ئەپەروێزو نەتەوەکەی خۆرپەرست و ئاگر پەرست بوون، بڕوایان وابوو دوو خودا لەبونەوەردا هەن، یەکێکیان خودای خێرەو یەزدانیان پێ دەگوت، ئەویتریان خودای شەڕ بوو

ئەهریمەنیان پێ دەگوت. زۆر بەچمکی پێغەمبەرێتیو تێروانینی راستی بۆ پێغەمبەرایەتی بێگانە بوون، دوور بوون لەو جۆرە مەفهوومە.

لەونامەیەی ئاراستەی ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی کرد ئەم رستەیەی تێدا هاتووە دەڵێ: (واني رسول الله الى الناس كافة لينذر من كان حيا) .

## ئەو پاشایانە کێن کە پێغەمبەر نامەی بۆ ناردن؟!

بۆ ئەوەی هەست بەگرنگی ئەو نامانە بکەین کەلە پێغەمبەرەوە ئاراستەی فەرمانڕەواو پاشاو وڵاتەکانو پاشاکان کراون بزانین مەکانەی راستەقینەو رۆڵیان لەمێژووی سەردەم دا چۆنەو چیە؟ تاچەند کاریگەریان لەسەر دڵو دەرونەکان هەبوە؟ بۆ زانینی ئەو واقیعە پێویستە پێناسەیەکی ئەو چوار پاشایە ( هیرقەل، کیسرا، نەجاشی، موقەوقیس) بکەینو قەبارەو پانتایی ئەو دەڤەرانەی ئەوان تێیان دا باڵا دەست بوون بزانینو سنووری قەڵەمرەویان چەندو چۆن بووە؟ وادە بێ خوێنەرێکی بێ ئاگا لە چۆنیەتی بارودۆخی سەدەی حەوتەمی زایینی یاکەسێك کەماوەی لێکۆڵینەوەی دەربارەی ئەو پاشایانەی بۆنەرەخسابێ وا تەصەور دەکا کە ئەو نامانە ئاراستەی چەند فەرمان ڕەواو پاشاو دەرەبەگێك کراون: کەلە هەموو سەردەمو شوێنێك دا ژمارەیان زۆرو زەبەندەیە، وەلێ کەسێك ئاگاداری ئاستی مەکانەتو دەسەڵاتو پانتایی قەڵە مڕەوی ئەوان بێ و زانیاری تەواوی دەربارەیان هەبێ، نەخشەی سیاسی ئەو ڕۆژگارە بزانێ، مێژووی هەڵسو کەوتو ژینامەو رەو شتیان شارەزابێ، بزانێ ئەو چوار پاشایەی پێغەمبەر نامەکانی ئاراستەی کردون چەند بەدە سەڵاتو هێزو تواناو زەبرو زەنگ بوون، چەند دیکتاتۆرو ملهوڕو خۆبە خودا زان بوون، کەسێ ئەمانە هەموو بزانێ ئەمجار بۆی دەردەکەوێ: کەئاراستە کردنی ئەو جۆرە نامانە

بۆ ئەو پاشایانە لەتواناى كەسێك دایە پێغەمبەر بێ و خودا فەرمانی پێ كردبێ و ئەركی بانگەوازی لەئەستۆدا بێ، كەسێك ئەوە دەكا نەزانێ ترس چیە لەهیچ ئاقارێكەوە تارمایی و سێبەری ترس و لاوازی لەخۆی دا نەبینێ، ملك و مەلەكوتی ئاسمانەكان و زەوی بۆ ڕانوێنرابێ و ئەو پاشا و خۆبەخودا زانانەی وەكوو بووكە شوشەو دومیە كەپۆشاكی ڕەنگاو ڕەنگیان لەبەر كرابێ یان وەكو پەیكەرە گرگنوكە هاتبێتە پێش چاو كەبێ گیان بن و هیچیان پێ نەكرێ، !! دەی بابزانین ئەم پاشایانە كێ بوون و پانتایی دەسەلاتیان چەند بوەو چۆن بووە؟

## هیرقەلی یەكەم، قەیصەری ڕۆم (٦١٠-٦٤١ ز) :

هیر قەل قەیصەری ڕۆم ئیمپراتۆری بیزنتی بووە، فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتێكی فراوان و گەورەی كردوە، لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ئێرانی دا جیهانی شارەستانی ئەو سەردەمەیان لە نێو خۆیان دابەش كردبوو، نیوەی جیهانی ئەوسای لەژێر كونترۆڵ دا بووە، چەندان هەرێم و ناوچەی بەرفراوان و خاوەن شارەستانی لە كیشوەرەكانی ئەوروپاو ئاسیاو ئەفەریقادا هەبوە، جێگیرو شوێنگرەوەی دەوڵەتی گەورەی ڕۆم بوو، كە لەكاتی خۆی دا هەموو دونیای كۆنی بەدەستەوە بوو،[١٧٣] هیر قەل لەبنەماڵەیەكی ڕەسەنی یونانی دا چاوی بەدونیا هەڵهێناوە، لەشاری (كیبودیشیا) لەدایك بووە، لەقەرتاجنە (كارتهیج) [١٧٤] پەروەردە بووە،

---

[١٧٣] لەوەپێش لەباسی دەوڵەتی ڕوم دا ئەو هەرێمانەمان دیاری كردن كە ئەو ئیمپراتۆریەتە فەرمانڕەوایی كردون.

[١٧٤] شارێكی كۆنە لەئەفەریقا فینیقییەكان ساڵی (٨١٤ پ.ز) بنیاتیان ناوە دوایی وێران بووە لەنزیك كەلاوە كۆنەكانی شاری (تونس) ی ئێستا بنیات نراوە.

باوکی فەرمانڕەوای ئەفریقیای رۆمی بووە (Exarch of Africa) لەسەرەتادا هیچ بلیمەتی و لێهاتوویی پێوە دیار نەبوو، ئازایەتی لێزانی و عەبقەرییەتی سەرکردایەتی و رابەری لێ نەدەبیندرا، هەتا لەساڵی ٦٠٢ی ز Phocac (فوقس) ی داگیر کەر، Muurice (موریقس) ی کوشت. موریقس ئیمپراتۆری شەرعی بێزەنتی بوو بەکوژرانی ئەم ئیمپراتۆرە دەرگا لەبەر سوپای کیسرای ئەبەروێز دا ئاوالا بوو بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر دەوڵەتی بیزەنتی و داگیری بکەن، بەڵێ فارسەکان پێشڕەوییان کرد بۆ ناو وڵاتی بیزەنتی و تەخت و تاراجی ئەو ئیمپراتۆرییەتەیان هێنایە لەرزەو سوکایەتییان پێ کرد، دەوڵەتی بیزەنتی کەوتە گیانەڵاوو خەریک بوو دوا هەناسە بداو کۆتایی پێ بێ. ئالەو کاتەدا لەقەرتاجنەوە هیر قەل بانگ کراو (فوقسی) کوشت و ساڵی (٦١٠ ز) جڵەوی سەرکردایەتی و دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت و بوو بەیەکە پیاوو گەورە پیاوی ئیمپراتۆرییەتی بێزنتی بەڵام چ ئیمپراتۆرییەک؟ ئیمپراتۆرییەتێک کە لەگەڵ مردن دا چەمبەرەی بەستبوو، توشی دەیاندەردی کۆمەڵایەتی وەکوو برسیایەتی و نەخۆشی تاعون و هەژاری و عیجزی مالی) بو بوو، هیر قەل لەساڵە سەرەتایی یەکانی فەرمانڕەوایی یەکەی دا دەستەوەستان بوو هیچی پێ نەدەکراو نەیدەتوانی هیچ کارێک ئەنجام بدا! وەڵێ ساڵی (٦١٦ ز) گۆڕانکارییەکی سەرتاسەری بەسەر ئەو ئیمپراتۆرە نەخۆشە شپڵەڵێ دراوە داهات، وەکوو ئینقلاب و کودەتایەکی بنەڕەتی روداوەکان پێچەوانە بوونەوە، ئەو ساڵە هەمان ساڵ بوو کە قورئان ئاماژەی بۆ دەکا و دەفەرموێ: ﴿الم، غُلِبَتِ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ، فِي بِضْعِ سِنِينَ﴾ سورة الروم/١-٤ ئەوە بوو هیرقەل لەپاشایەکی تەنپەروەری خۆپەرستی بێ دەسەڵاتی تەمبەڵ و هیچ لەدەست نەهاتوو گۆڕا بوو بەسەرکردەیەکی ئازاو قارەمان و جەربەزەو بیر

تیژو پشوو درێژو خۆفیداكارو كۆڵنەدەرو قاڵبووی بەرەكانی جەنگ، سوپای رێك خستو روی كردە پایتەختی ئیمپراتورییەتی ئێرانو دەستی كرد بەرزگار كردنو گێڕانەوەی بست بەبستی وڵاتی داگیر كراویو گێڕانەوەی شكۆمەندیو كەسایەتی بۆ گەلو نەتەوەكەی. پێشڕەوی كردو سنووری ئیمپراتورییەتی ساسانی بەزاندو كەوتە داگیر كردنی شارە بەناو بانگەكانی ئێرانو پایتەختو مەڵبەندە گرنگەكانی ئەو ئیمپراتۆرییەتەی یەك لەدوا یەك داگیر كرد هەتا چووە ناوەڕاستی ئیمپراتۆرییەتو سوكایەتی بەدامو دەزگا سەرەكییەكاتنی ئەو وولاتە كرد، وڵاتی پانو پۆڕی ساسانی لەفرمێسكو خوێن دا لێواو لێو كرد، هەتاوای لێ هات خەریك بوو بەتەواوی ئیمپراتۆرییەتی ئێران لەناو بەرێ، خەریك بوو تەختی كیسرا ژێرو زەبەر بكا، دوای ئەم سەركەوتنو پێشرەوی كردنە هیر قەل بەرەو وڵاتی خۆی گەڕایەوە، ساڵی (٦٢٥ ز) وەكوو سەركردەیەكی سەركەوتو چووە ناو قوستەنطینیەوە ئەمجار ساڵی (٦١٩ ز) روی كردە بەیتولمەقدیسو بۆ ئەوەی صەلیبی پیرۆز بگێڕێتەوە، ئەو صەلیبەی لەوە پێش فارسەكان برد بوویانو دەستیان بەسەردا گرتبوو، ئەم فەرماندە ئازاو لێهاتووە بەهەر شوێنێك دا بڕۆیشتایە فەرشیان بۆ رادەخست عەترو گوڵاویان بەسەردا دەپرژاند، هەلهەلەیان بۆ دەكێشا، فیستیڤاڵو كۆڕو كۆبونەوەیان بۆ رێك دەخستن، كەصەلیبی پیرۆزی گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆی جەژنو شادی بۆ ئەنجام درا خۆشیو كەیف خۆشی كەوتە وڵاتەوە، ئالەو كاتەدا بوو: كە نامەی پێغەمبەر گەییشتە هیر قەل داوای لێ دەكا ئیمان بهێنێ[١٧٥] ئیتر لەوەدوا هیرقەل روی كردەوە ژیانی تەنپەروەریو

---

[١٧٥] هۆی دوا كەوتنی نامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ هیر قەل ئەوە بوو نامەكە لەپێش دا درابوو بەپاشای بوصرا بۆ ئەوەی ئەو بینێرێ بۆ هیر قەل، رەنگە پاشای

رابواردن‌و بەزم‌و صەفا، کار بەدەست‌و پیاوەکانی سەرگەرمی کەیف‌و شادیی بون‌و جۆرەها نەخۆشی کۆمەڵایەتی لەناو ئیمپراتورییەتە کەی بلاو بووە، دام‌و دەزگای هیر قەل بەم شێوە رۆژگار یان تێپەڕاند هەتا سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەریان‌و سەرەنجام تەخت‌و تاراجی تێك چوو کۆتایی بەدەسەلاتی هات‌و ئیمپراتورییەتی بێزەنتی لەکیشوەری ئاسیاو ئەفەریقادا لەناو چوو تەنیا دەسەلاتیان لەئەوروپاو ئاسیای بچوك دامایەوە، بەهەرحاڵ هیر قەل لەرۆژگاری خۆی دا یەکێك بوو لەپاشا هەرە گەورەکانی جیهان‌و هیچ پاشاو مەلیکێك شانی لەشانی نەداوە، لەروی بەرفراوانی قەڵە مرەوو هێزی سەربازی‌و گەشە کردنی شارەستانی‌و باری ژیارو زانست‌و زانیاری جگە لەئیمپراتۆری ئێرانی خوسرەوی دووەم هیچ کەس هاوشانی نەبوە. ساڵی (٦٤١ ز) لەقوستەنطینیە لەدونیا دەرچوو هەر لەوێش بەخاك سپێردرا.

## کیسرا ئەبەروێز خەسرەوی دووەم (٥٩٠-٦٢٨ ز):

کوڕی هورموزدی چوارەم‌و کوڕەزای خەسرەوی یەکەم ناسراو بە (ئەنەو شیروان) ی داد پەروەر کە عەرەب پێ ی دەڵێن: کیسرا ئەبەروێز ساڵی (٥٩٠ ز) باوکی کوژرا، لەدوای کوژرانی باوکی تاجی پاشایەتی نرایە سەری. بارامی چۆپین لێ ی راپەڕی، خەسرەو شکاو نەیتوانی لەناو

---

بوصرا نەیتوانیبێ لەکاتی خۆی دا نامەکە بگەیەنێ، چونکە قەیصەر سەرگەرمی شەڕو جەنگ بووەو لەپایتەختی ولاتی خۆی زۆر دوور بووە، هەندێکیش پێیان وایە هیر قەل ساڵی (٦٢٨ ز) چووە بۆ ئەرمینیا بەمەبەستی کوژاندنەوەی راپەرینێك کەلەو دەڤەرە سەری هەڵدا بوو بۆیە نەیتوانی نەزرەکەی بەجێ بێنێ کەبریتی بوو لەگێرانەوەی صەلیب بۆ شوێنی خۆی تاساڵی (٦٢٩ ز) .

قەڵـەمڕەوی ئیمپراتۆرییـەتی ساسـانی دا بمێنێتـەوە، ناچـار بـوو پـەنا بـۆ ئیمپراتۆرییـەتی بێزەنتـی مـۆریقس بـەرێ و داوای لـێکرد یارمـەتی بـدا بـۆ وەرگرتنـەوەی دەسـەڵات و وڵاتـی لـەکیس چـووی، مـوریقس سـوپایەکی گـەورە و بەهێزی بۆ ڕێك خست و لەگـەڵ سـوپای بەهرام دا کەوتنە شـەڕی خوێناوی و سەرەنجام بەهرام شکاو خوسرەو تاج و تەختی لەدەست چووی وەرگرتەوەو لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی ڕۆنیشتەوە!!

سـاڵی (٦١٢ ز) خەسـرەو هێرشـی کـردە سـەر وڵاتـی بێزەنتـەو بەسوپایەکی زۆرەوە پـەلاماری ئـەو وڵاتـەی دا بـۆ ئـەوەی تۆڵـەی کـوژرانی (مـۆریقس) یارمـەتی دەرو پـەنادەری لەتەنگانـەی دەر بـەدەری داو بـاوکی مەعنـەوی خـۆی بستێنێ تۆڵـەی ئـەو دۆسـتە گـەورە بەئەمەکـەی لـەو بکـوژە خوێڕی یـە داگیرکـەرە بستێنێ کـەناوی نـوقس بـوو عەرشـی قەیـصەرەکانی داگیرکردوە خەسرەو لەو هێرشە دا هەربەوەندە وە نەوەستا: کە (فوقس) ی کوشت، بـەڵکوو درێژەی بەپێشڕەوی یەکـەی داو گەیشتە قوسـتەنطینیە و داگـیری کـرد، سـەرکەوتنێکی وای بەدەسـت هێنـا کـە لـەوەپێش هـیچ کـام لەپاشاکانی ئێران بەدەستیان نەهێنا بوو، ساڵی (٦١٥ ز) سـەرکەوتنە کـانی گەیشتە تۆپـەڵاك و بەتـەواوی، هـەتا هیرقـەل هاتـە مەیـدان و ئێرانییـەکانی شـکاندو لـەوڵات دەری کـردن بەوەشـەوە نەوەسـتا بـەڵکوو هیر قـەل هێرشـی بـەهێزو تۆکمـەی ئاڕاسـتەی ئیمپراتۆرییـەتی ساسـانی کـردو تـەنگی پـێ هەڵـچنین، هـەتا وای لـێهات خەسـرەو ناچـار بـوو پایتـەختی فـەرمانڕەوای خۆی جێ بێڵـێ و پەنابـەرێ بۆ شوێنی قایم و سـەخت، بەڵام ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو، سـاڵی (٦٢٨ ز) لەکۆدەتایـەك دا کـوژرا. مێـژوو نووسـانی ئێـران هـەموویان کـۆکن لەسـەر ئـەوە: کـە خوسـرەوی دووەم گـەورەترین و بەدەسـەڵاترین پاشـاکانی ئێـران بـووە لـەڕوی شـکۆمەندی و جـاهو

دەسەڵاتەوە، حکومەتی ساسانی لەسەردەمی ئەودا گەیشتە لوتکەو تۆپەڵاکی شارەستانیو هێزو دەسەڵات فراوانیو دیاردەی خۆش رابواردنو بەزمو صەفا، بەشێکی هەرێمی شیمالی خۆرئاوای هیندو ستانیشی کۆنترۆڵ کردبوو، خۆی بەخوداوەند دەزانیو بەم شێوەیە پێناسەی دەسەڵاتو پاشایەتی خۆی کردوە( لەناو خوداوەندەکان دا ئادەمیزادێك هەیە نافەوتێ، لەئادەمیزاددا خودایەك هەیەو بەس! بەرزو شکۆمەندە ناوی، مەجدو عەظەمەتی بەرز بۆتەوە، لەگەڵ روناکی خۆردا شکۆمەندی ئەو هەڵدێ، خۆر بەهۆی ئەوەوە روناکەو تاریکە شەوەکان روناك دەکاتەوە[١٧٦] لەرۆژگاری خەسرەودا ئیمپراتۆرییەتی ساسانی گەییشتە پلەو پایەك لە شکۆداریو رازاوەیی خانو بەرەو ناومالّو کالاّی جۆراو جۆردا لەهیچ سەردەمو رۆژگارێك دا نەگەییشتە ئەو ئاستە. طەبەری لەکتێبە بەناو بانگە مێژووییەکەی دا ئاوا باسی شکۆمەندی خەسرەو دەکاو دەڵێ: خەسرەو لەهەموو پاشاکانی ساسانی زیاتر توندو تیژ بوو، را دروستترو دووربین تر بوو، لەدەسەڵاتو بەهانا چوونی لێ قەوماوان و کۆکردنەوەی ماڵو سامانو پەزمەندە کردنی زێرو زیوو سەرکەوتن بەسەر دوژمنو شانسو بەختو هاتی دا، گەییشتە ئاستێك بۆ هیچ پاشایەکی تر دەستە بەر نەبو بوو، بۆیە ناوی (ئەبەروێز) یان خستبوە پاڵ ناوەکەی: واتە سەرکەوتوو! لەدیاردەی خۆش رابواردنو رازاندنەوەی خانو بەرەو ناومالّو تەختو کورسیو جلو بەرگو حەشەمو خەدەم دا زۆر فنتازییانە هەڵسو کەوتی کرد، زۆری گرنگی بەخواردنو خواردنەوەدا، سفرەو خوان بەجۆرەها خۆراكو خواردنەوەی جۆراو جۆرو رەنگاو رەنگ دەرازایەوە، جۆرەها عەترو کریم و ئامێری جوانکردن و ئارایشتی رازاندنەوەی

---

[١٧٦] ایران في عهد الساسانيين ص ٦٠٢و٦٠٤.

دەستەبەر کردبوو. لەسەردەمی ئەودا زۆرگرنگی دەدرا بەجۆری خواردنی بەتامو مەیو شەرابی نایابو قاپو قاچاخی شت تێدا خواردنو پیاڵەو پەرداخی مەیخواردنەوە، جۆرەها عەتری بۆ نخۆشو دەرمانی ئارایشت هاتبوەدی، گۆرانیو موسیقاو سازو سەمتور باوی ستاندبوو، جەماوەر پێشبڕکێ ی لەدەستەبەر کردنی ئەو جۆرە خۆڕازاندنەوەو ژیانە فنتازییەدا دەکرد، هەموو هەوڵو کۆششیان بۆ کۆکردنەوەی ماڵو سامانو پەزمەندە کردنی زێڕو زیوو خەزنکردنی بوو، شتی عەنتیکەو بەبەهاو جوانو سەرنج راکێشیان کۆدەکردەوەو هەڵیان دەگرتو خۆیان پێ هەڵدەنایەوە، شانازییان بەخاوەنداریەتی ئەوشتە بەنرخو عەنتیکانە دەکرد. . ساڵی (٦٠٧-٦٠٨ ز) کاتێك گەنجینەی کیسرا لەمۆزەخانە کۆنەوە گوێزرایەوە بۆ باڵەخانەی تازە لەشاری طەیسەفون ئەو ئاڵتونەی گوێزرایەوە بریتی بوو لە (٤٦٨) چوار سەدو شەصت هەشت ملیون میثقاڵ زێڕ. کەئەمڕۆ بە (٣٧٥) سێسەدو حەفتاو پێنج ملیون فرنکی زێڕ مەزندە دەکرێ، ساڵی سیانزە هەمی پاشایەتی ئەم خوسرەوە لەخەزێنەی پاشا خۆی دا (٨٨٠) هەشت سەدو هەشتا ملیون میثقاڵ.

ئەم پاشا ناوداره سیو حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی کرد لەدوای خۆی شیرەوەیهی کوڕی بووە جێ نشینی.

(المقوس) فەرمانڕەوای شاری ئەسکەندەرییەی بەناو بانگو بریکارو نائیبی گشتی دەوڵەتی بێزەنتە لەئاخی میصردا، مێژوو نووسە عەرەبەکان بەگشتی بە (المقوس) ناویان هێناوە، هەرچەندە کەوتوونە راجیایی یەوە دەربارەی ناوی حەقیقیو ناز ناویو هەریەکەیان جۆرە بۆ چونێکی هەیە، مێژوو نووس ئەبو صالح کەمێژووەکەی لەسەدەی شەشەمی کۆچی (١٢٠٠ز) دا داناوە بە (جورەیح) ی کوڕی مینا (المقوس) ناوی بردوە،

ئیبنو خەلدون دەڵێ ئەم موقەو قسە، قیبطی بووە، مەقریزی دەڵێ: ناوی (المقوقس الرومي) بووە! کاتێك فارسەکان هێرشیان کردە سەر میصر، فەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە کە بێزەنتی بوو هەڵات، ناوی John The ALmoner بوو لەئەسکەندەرییەوە هەڵات چوو بۆ قوبروس و لەوێ مرد. هیر قەل لەشوێنی ئەو نائیبێکی دامەزراند ناوی جۆرج بوو، وێدە چێ هەر ئەم جورجەیە کە عەرەب پێ ی دەڵێن: جورەیج، هیرقەل سەرۆکایەتی کەنیشتەی ملکانی پێ دا، هەندێ لەمێژوو نووسان دەڵێن: دامەزراندنی جۆرج (جريج) لەساڵی (٦٢١ ز) دابووە.

ئەلفەرد بەتلەر دانەری کتێبی (فتح العرب لمصر) دەڵێ: عەرەبەکان پێیان وابوو ئەو فەرمانڕەوایەی بێزنتی یەکان دایانبوو بەسەر وڵاتی میصرەوە دوای سەرکەوتنیان بەسەر ئێرانی یەکان دا ناز ناوی (المقوس) ی هەبوە، ئەم فەرمانڕەوایە هەم پاشای میصر یووە هەم سەرۆکی کەنیسە بووە، واتە دەسەڵاتی دونیایی و دینی هەبوە، ئەمجار لەقەبی (مقوقس) یان پاڵ ئەو (جۆرج)ە داوە کەنائیبی دەوڵەتی بێزەنتی بووە، کەوابێ پێدەچێ وشەی (المقوس) ناز ناو بووبێ نەك ناو! هەندێ پێیان وایە ریشەی ئەم ناوە قیطبی یە، دەشگونجێ لەوکات و رۆژگارانە دا کەفارسەکان میصریان گرت کەشیشێکی قیبطي دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتبێ و لەهەمان کات دا سەرۆکی کەنیسەش بووبێ، ئاشکراشە هێزەکانی ساسانی ساڵی (٦٢٧ ز) لەمیصر گەڕانەوەو (انسحاب) یان کرد وەڵێ ساڵی (٦٢٨ ز) پەیمانی ئاشتییان مۆر کرد، جاوا پێدەچێ نامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەم سەرو بەندەدا گەیشتۆتە دەستی (المقوقس) لەوکاتەدا (مقوقس) پاشایەکی نیمچە سەر بەخۆ بووە، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە (عظيم القبط) گەورە پیاوی قیبط ناوی بردوە. بێگومان میصر دەوڵەمەند ترین هەرێم و ئەیالەتی ئیمپراتورییەتی بێزەنتی بووە، خاك و وڵاتی لەهەموو خاك و وڵاتەکانی تر

بە پیت و بەرو بوم دار تر بوو، دانیشتوانەکانیشی قەرەباڵغ تر بوون، هەمیشە زۆربەی خۆراکی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی لەولاتی میصرەوە دابین کراوە.

عەمری کوڕی عاص رزگار کەری میصر کە چووە ناو میصرەوە (١٤) ساڵ بەسەر ناردنی نامەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ (المقوقس) تێپەڕی بوو، ئەو ڕۆژگارەی عەمر میصری رزگار کرد، فەرمانڕەوای موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب بوو، عەمر لەمیصرەوە نامەیەکی بۆ عومەر نووسی بەم جۆرە باسی ئاخی میصرە دەکا. (مصر تربة غبراء وشجرة خضراء طولها شهر وعرضها عشر)[١٧٧] میصر ولاتێکی تەپ و تۆزاوی و بەپیت و پڕ دارو درەختی سەوزە درێژی یەکەی مانگەرێ یەکەو پانی یەکەی دە ڕۆژە ڕێیە. ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئاوەدانی میصرو زۆری دانیشتوانەکەی لەو ڕۆژگارەدا ئەوەیە: کاتێك عەمری کوڕی عاص ساڵی (٢٠) ی کۆچی (٦٤٠ز) سەرژمێری ئەوانەی کرد کەشیاوی ئەوەن سەرانەیان بخرێتە سەر، ژمارەیان گەییشتە زیاد لە شەش ملیون کەس[١٧٨] ڕۆمەکان ژمارەیان سەد هەزار کەس بووە. لەنامەکەی عەمردا کە بۆ عومەری کوڕی خەتتابی نووسیوە هاتووە دەڵێ: دوای سڵاو من شارێکم ڕزگار کردوە وەصفی ئەو شتانە ناکەم کەتێ یدا هەن، وەڵێ هەر ئەوەندە دەڵێم: چوار هەزار گردۆلکەو چوار هەزار حەمام و چل هەزار یەهودی و چوارسەد تیا ترۆ خانەی تێدایە بۆ پاشاکان.[١٧٩]

---

[١٧٧] النجوم الزاهرة لابن تغرى بروى جـ ١ /٣٢.

[١٧٨] دائرة معارف. قرن العشرين- محمد فريد وجدى مادەی میصر هەرچەندە دانەر گومانی لەو ژمارە زۆرە هەیە.

[١٧٩] حسن المحاضرة للسيوطي.

## نەجاشی پاشای حەبەشە:

ئەم وڵاتەی ئەمڕۆ پێ ی دەگوترێ حەبەشە هەر لەدێر زەمانەوە بەم ناوە مەشهوور بووەو پێیان گوتووە Abyssinia یان پێیان گوتووە ئثیوبیا Ethiopia ئەم وڵاتە بەشێکە لە ئەفریقای خۆر هەڵاتی و کەوتۆتە باشوری خۆرئاوای دەریای سورەوە، ئێستا زۆر بەنارەحەتی سنوورەکانی دیاری دەکرێن. حکوومەتی حەبەشە کۆنترین حکوومەتی جیهانە، لەنووسراوو هەواڵەکانی جولەکەدا ئاماژە بەوە کراوە کەشاژنی (سبأ) کاتی خۆی لەحەبەشەدا نیشتەجێ بووە، وەچەو نەوەی حەزرەتی سولەیمان تائێستاش فەرمانڕەوایی حەبەشە دەکەن، جولەکەکان دوای وێرانکردنی هەیکەلی سولەیمان دەستیان کرد بەنیشتەجێ بوون لەحەبەشەدا، هەروا ئاینی مەسیحی لەسەدەی چوارەمی زایینی یەوە لە ناو دانیشتوانی حەبەشەدا بلاوبۆتەوە!!

کاتێک پاشای یەمەن دەستی کردبەچەوساندنەوەی مەسیحییەکان لەوڵاتەکەی دا (جێستینین) ی یەکەم داوای لەپاشای حەبەشە کرد، کەیارمەتی مەسیحییەکانی یەمەن بدا، ئەویش ساڵی (٥٢٥) ی ز توانی یەمەن داگیر بکا، دەسەڵاتی حەبەشییەکان بەسەر یەمەن دا نزیکەی پەنجا ساڵێکی خایاند، لەم سەرو بەندە دا پاشای یەمەن لەلایەن حەبەشەوە کە ئەبرەهەی ناو بوو، هێرشی کردە سەر مەککە بەمەبەستی روخاندنی کەعبە، ئیتر روداوی فیل پەیدا بوو. پایتەختی حەبەشە (AXUM) بوو حکومەتێکی سەربەخۆی تێدا دامەزرابوو ملکەچی هیچ حکوومەتێکی بێگانە نەبوو، سەرانەی نەدەدا، بەهیچ کەس. لەروی دۆستایەتی و هاوبەشی لەئایینی مەسیحی دا و بەرژەوەندی تایبە تییەوە نەبێ پەیوەندی بە ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی یەوە نەبوو، بەڵگە لەسەر ئەم راستی یە ئەوەیە

ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی (جیستینین) لەناوەڕاستی سەدەی سێیەمی کۆچی دا لەدەربارەی حەبەشەدا پیاوێکی کردە شاڵیار ناوی جولیان Julian بوو.

دیلاسی ئۆلیری لەکتێبەکەی دا (العرب قبل محمد) دەڵێ: حەبەشە لەساڵی ٥٢٢ ی زایینی یەوە هەتا پەیدا بوونی ئیسلام ڕۆلێکی گرنگی لەبازرگانی خۆر هەلاتی دەریا لوشی دەریای سورو ئەفەریقادا هەبوو، بەڵکوو بەسەر هەموو بازرگانی هیندو ستان دا بالا دەست بوو.

مەلیکی حەبەشە هەمیشە ناز ناوی (النجاشی) هەبوو. بیرو بۆ چون و ریوایەتەکان دەربارەی دیاریکردنی ئەو نەجاشی یەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نامەی بۆ نوسیوەو بانگەوازی کردوە بۆ ئیسلام بوون چەواشەو تێکەڵ و پێکەڵن. . . ئەوەی گومانی تێدا نیە دوو کەسایەتی لێکتر جیا هەبوون، یەکەمیان ئەو نەجاشی یەیە کەسەرەتا موسوڵمانەکان لەمەککەوە هیجرەتیان بۆ لا کردو پەنای دان، لەناو موسوڵمانە کۆچکەرەکان دا جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب هەبوو، ئەم کۆچکردنەی موسوڵمانەکان ڕێکەوتی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی بووە، ناشگونجێ ئەو کاتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نامەی بۆ نووسیبێ، چونکە بارودۆخی بانگەوازی ئیسلامی ئەو هەلەی بۆ نەڕەخسابوو لەو کاتەدا نامەی لەو جۆرە بۆ پیاوی لەو جۆرە بنووسێ، تا ئێستاش نەمانزانیوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێش کۆچکردن بۆ مەدینە نامەی بۆ هیچ پاشایەکی لەو جۆرە پاشایانە نووسیبێ، داوای لێ کردبن ئیمانی پێ بهێنن. وێدەچێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەو کاتە داوای لەنەجاشی کرد بێ کەپەنا بەو موسوڵمانە بدا کەقورەیشییەکان دەیان چەوساندنەوە، لەو هەواڵ و ریوایەتانەی ئیبنو هیشام و هی تریش لەکتێبەکانی سیرەدا گێڕاویانەتەوە بۆنی ئەوە دێ: کەنەجاشی نووری ئیمان چووەتە ناو دڵیەوە، ئیمانی بەوە هێناوە،

کەعیسای کوڕی مەریەم بەندەو پێغەمبەری خودایەو بەفەرمانی خوداو ڕستەی (کن فیکون) هاتۆتە وجود.

ئەو نەجاشی یە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نامەی بۆ نووسیوەو داوای لێ کردوە بەپیر بانگەوازی ئیسلامی یەوە بێ و ئیمان بهێنێ. وەکوو ئیبنو کەثیر ئاماژەی بۆ دەکا ئەو نەجاشی یە یە دوای ئەو نەجاشی یەی ئیمانی هێناو جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب چووە لای و قسەی لەگەڵ دا کرد. بووەتە پاشای ولاّتی حەبەشە. ئیبنو کەثیر دەڵێ: ئەم نامە نووسینەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ نەجاشی (پاشای حەبەشە) کاتێك بووە: کە پێش ڕزگارکردنی مەککە نامەی ئاڕاستەی پاشاکانی سەرزەوی کردوە، بانگەوازی کردون بۆ ئیمانهێنان و خودا پەرستی و خودا بەیەکناسین، کەوابێ ڕای پەسەند ئەوەیە، ئەم نەجاشی یە ئەوەیە: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی مردنەکەی بلاّو کردەوەو بەناو موسوڵمانان داو نوێژی (غائب)ی لەسەر کرد، هەروەها (ئوبەی) لە واقیدی و غەیری واقیدیشەوە لەشارەزایانی مێژوو ژینامەی گەورە پیاوان، دەڵێ ئەم نەجاشی یە ئەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی لەکاتی گەڕانەوەی لەتەبوك نوێژی لەسەر کرد[١٨٠].

بەمجۆرە ڕیوایەتەکان ڕێك و پێك دەبن و چەواشەکارییان لێ بەدی ناکرێ، نیشانەو تێگەییشتنەکانیش پشتگیریمان دەکەن.

## هەڵس و کەوتی ئەو پاشاو مەلیکانە بەرامبەر نامەکان:

یان بڵێین ئەو پاشاو مەلیکانە چۆن بەپیر نامەکانی پێغەمبەرەوە چون؟؟ مێژوو ئەوەمان بۆ دووپات دەکاتەوە: کە هیر قەل و نەجاشی و موقەوقیس

---

[١٨٠] صحیح مسلم جـ ٥/ ١٦٦.

بەئەدەبانەوە وەڵامی نامەکانی پێغەمبەر یان دایەوە، بەنەرمی لەگەڵ نامە بەرەکان دا جوڵانەوە، تەنانەت موقەوقیس لەگەڵ وەڵامەکەی دا دوو جارییەشی بۆ پێغەمبەر بەدیاری ناردن یەکێکیان (ماریە)ی قیبطی یە کە دایکی ئیبراهیمی پێغەمبەرە، بەڵام کیسرا ئەبەرویز، کەنامەکەی پێغەمبەر یان بۆ خوێندەوە، نامەکەی دڕیو بەتوڕەیی یەوە وتی: بەو جۆرە ئەو کابرایە کە کویلەی منە نامەم بۆ دەنووسێ؟!

کە ئەم هەواڵەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە فەرمووی: خودا دەسەڵاتی شەق و پەق بکاو تەختو تاجی وەرگێڕێ.[181] ئەمجار کیسرا فەرمانی بە (بازان) کرد کەفەرمانڕەوای بوو بەسەر وڵاتی یەمەنەوە، کە پێغەمبەر بگرێو بە پەل بەستراوی لەلای کیسرا ئامادەی بکا، (بازان) یش (بابویە) ی نارد بە پێغەمبەر بڵێ: کەشاهەنشای پاشایان خاوەن شکۆ کیسرا فەرمانی بە (بازان) ی فەرمانڕەوای خۆی بەسەر یەمەنەوە کردوە کەچەند کەسێك بنێرێ پەلبەستی بکەنو بیهێنن، ئێستاش (بازان) منی ناردوە بۆ ئەوەی بەڕێزەوە لە تەکمابێ ی . لەو کاتەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی خودا کیسرای لەناو برد؟ (شیرەوەیە)ی کوڕی کوشتی!بێگومان ئەم هەواڵەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو کاتەدا رایگەیاند هاتە جێو کوڕی کیسرا کەناوی (قوباز) و ناز ناوی (شیرەوەیە) بوو کودەتای لەباوکی کردو تەختو تاجی لێ داگیر کرد، بەفەرمانی ئەو ساڵی ٦٢٨ ی ز کیسرا زۆر بەزەلیلی کوژرا، لەدوای کوژرانی کیسرا مڵكو دەسەڵاتی کیسرا شەق و پەق بوو، دامو دەزگاو دەسەڵات بوونە ئامێری یاری کردن بەدەستی هەتیو مچەو پیاوانی بنەماڵەی کیسراوە، شەش مانگ تێ پەڕی بەسەر پاشایەتی

---

[181] الجامع الصحيح للبخاري باب كتاب النبي صلى الله عليه وسلم الى كسرى وقيصر.

شـيرەوەيە) دا كودەتـاى لىٚ كـراو لىٚ خـرا، لـەماوەى چـوار سـالٚ دا (دە) پاشـايەك لەدوايـەك هاتنـە سـەر تـەختى پاشـايەتى و كاروبـارى دەولّـت لـە گرێژنـە چـوو ، پـشيوى سەرانـسەر ئێمپراتۆرييـەتى ساسـانى گرتـەوە، تـا لەسـەرەنجام دا جـەماوەرو پيـاو مـاقولآن بڕياريـان دا (يـەزدو جـورد) بكەنـە پاشاو تاجى شاهە نشاهى لەسەر نێن و خۆيان لەم گەندەلّى و ئاشوبە رزگار بكەن، يەزدو جورد بووە پاشـاو لەسـەر تـەخت رۆنيشت، هـەر ئـەميش بـووە دوا پاشـاو فـەرمانڕەواى ئيمپراتۆرييـەتى ساسـانى، هەرئـەويش بـوو كەوتـە بەر هێرشى سوپاى ئيسلام و تێشكاو سەرەنجام كۆتايى بە ئيمپراتۆرييـەتى ساسـانى تەمـەن چـوار سـەد سـالّە هـات و بەتـەواوى لـەناو چـوو.. ئەمـەش رێكەوتى سالّى (٦٣٧ ز) كرد، بەم جۆرە ئەو پێشبينى يەى پێغەمبەر كردى لەماوەى هەشت سالٚ دا هاتە دى و لەوە بەولاوە دەسەلآتێك نەما لەجيهان دا نـاوى دەسـەلآتى ساسـانى بـێ و كيـسرا لەتۆپـەلآكى هەرەمەكـەى دا بـێ، ئەمەش راستى فەرمودەكەى پێغەمبـەرى چەسپاند: كەفـەرمووى: (اذا هلـك كسرى فلا كسرى بعده) ئەگەر ئـەو كيسرايە لـەناو چوو ئيتر كيسرايەكى تـر دوا ئەو نايە.

بـەلٚێ: دەولّـەتى ساسـانى روخـاو موسـولّمانەكان تـەخت و تـاج و مڵـك و ولآتـى كيـسرايان كەوتـە ژێـر دەسـت، جـەماوەرى ئـەو ولآتـەش هـەموويان موسـولّمان بـوون، بـەدڵ و بـەگيان باوەشـيان بـۆ ئيـسلام كـردەوە زانـاو پێشەواى گەورەيان تێدا هەڵكەوت، عەبقەرى و فەيلەسوفى بەناو بانگيـان لىٚ پەيدابوو فەرموودەى پێغەمبەر هاتە دى! كەدەربارەيان دەفـەرموێ: (لو كـان العلـم بالثريـا لتناولـه رجـال مـن فـرس) ئەگـەر زانست و زانيارى بەئەستێرەى ثورەياوەبێ پياوانى فارس نژاد بەدەستى دەهێنن.

## گفتوگۆی نێوان هیر قەلو ئەبو سفیان:

هیر قەلی رۆم ویستی دەربارەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دڵنیا ببێ، دەگەڕا یەکێکی دەست بکەوێ بەوردیو دورو درێژی هەواڵی پێ بدا، هاوکات لەوسەرو بەندەدا، ئەبو سەفیان لەشاری (غەززە) بوو، بۆ بازرگانی چوو بوو، فەرمانی کرد ئەبوسەفیانیان بردە لای، دەربارەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چەند پرسیاری ژیرانەی ئاراستە کردن، پرسیاری کەسێکی خاوەن ئەزمونو شارەزا لەمێژووی ئایینەکانو تایبەتمەندی پێغەمبەرانو ژینامەیانو هەڵسو کەوتیان لەگەڵ گەلو نەتەوەکانیان داو دابو نەریتی خودا دەربارەیان، ئەبو سەفیانیش راستگۆیانە وەڵامی پرسیارەکانی هیر قەلی دایەوەو ئەم گفتو گۆیە لەنێوانیان دا بەرپا بوو.

**هیرقەل:** ئەو پیاوە لەنێو ئێوە خانەدانو خاوەن بنەماڵەیە؟

**ئەبوسەفیان:** بەڵێ ئەو خاوەن بنەماڵەو خانە دانە لەناو ئێمەدا.

**هیرقەل:** ئایا کەسێك لەئێوە لەوەپێش لافی پێغەمبەرێتی لێداوە؟

**ئەبو سەفیان:** نەخێر.

**هیر قەل:** ئایا ڕێ کەوتووە یەکێك لەباوكو باپیرانی پاشا بووبێ؟

**ئەبو سەفیان:** نەخێر

**هیر قەل:** ئایا پیاو ماقوڵو پیاوی ساماندارو خانەدان شوێنی کەوتون یان هەژارو مسکێن؟

**ئەبو سەفیان:** هەژارو بۆرە پیاو شوێنی کەوتوون.

**هیر قەل:** ئایا ژمارەی شوێنکەو توانی ڕۆژ بەڕۆژ زیاد دەکەن یان کەم دەبنەوە؟

**ئەبو سەفیان:** بەڵکوو زیاد دەبن.

**هیر قەل:** ئایا تائێستا ڕێ کەوتووە کەسێك چووەتە ناو ئایینەکەیەوەو پەشیمان ببێتەوە.

**ئەبو سەفیان:** نەخەیر

**هیر قەل:** ئایا ئێوە پێش ئەوەی لافی پێغەمبەرێتی لێ بدا تۆمەتی درۆزنیتان پاڵ داوە؟

**ئەبو سەفیان:** نەخەیر

**هیر قەل:** ئایا غەدر دەکا. ؟

**ئەبو سەفیان:** نەخەیر، ئێمە ماوە یێکە لێ ی دور کەوتوینەوە نازانین چی تێدا دەکا.

**ئەبو سەفیان:** دەڵێ نەمتوانی وشەیەك بڵێم جگە لەووشانەی گوتمن.

هیر قەل: ئایا شەڕتان لەدژ کردوە؟

**ئەبو سەفیان:** بەڵێ.

**هیر قەل:** شەڕەکانتان لەدژی چۆن بووە؟

**ئەبو سەفیان:** شەڕ لەنێوان ئێمەو ئەودا بەنۆرەیە وادەبێ ئەو سەرکەوتووە، وادەبێ ئێمە سەرکەو تووین. .

**هیر قەل:** فەرمانی چیتان پێ دەکا؟

**ئەبو سەفیان:** پێمان دەڵێ تەنیا پەرستش بۆ خودا بکەن، کەس مەکەن بەهاوەڵو شەریکی، پێمان دەڵێ: واز لەبیرو باوەڕی باوكو باپیرتان بهێنن، فەرمانمان پێ دەکا بەئەنجامدانی نوێژو بەراستگۆیی و داوێنپاکی و بەجێهێنانی صیلەی ڕەحم. ئەمجار هیر قەل بەتەر جومانەکەی وت پێ ی بڵێ: پرسیارم لێ کردی لەریشەو نژادی، لەوەلآم دا وتت ئەو خاوەن بنەماڵەو خاوەن نژادی ڕەسەنە. هەروایشە پێغەمبەران دەبێ لەبنەماڵەی

خانەدانو رەسەن دا بنێردرێن. پرسیارم لێ کردی ئایا لەوە پێش کەسێک لەئێوە ئەم لافەی لێ داوە؟ وتت: نەخەیر، دەڵێم: ئەگەر یەکێك لەئێوە پێش ئەو ئەم لافەی لێ بدایە گومانم بۆ ئەوە دەچوو کەئەو پیاوە لاسایی کەسانی پێش خۆی دەکاتەوە، پرسیارم لێ کردی ئایا رێ کەوتووە یەکێك لەباوكو باپیرانی پاشا بووبن؟ وەڵامت بەنەخەیر دامەوە، ئەگەر یەکێك لەباوكو باپیرانی پاشا بوایە دەمگوت ئەو پیاوە هەوڵی گەڕاندنەوەی تەختو تاجی باوکی دەدا.

پرسیارم لێ کردی ئایا لەوە پێش تۆمەتی دروزنیتان پاڵ داوە! لەوەڵام دا وتت: نا، بێگومان دەزانم ئەو لەو کەسانە نیە کە درۆ بەدەم خەڵکەوە هەڵ نەبەستێ، بەڵام بەدەم خوداوە درۆ هەڵبەستێ، پرسیارم لێ کردی ئایا شوێنێکەو توانی پیاو ماقوڵو کەسانی ناودارن؟ یان بۆرە پیاوو هەژارن، وتت شوێنکەوتوانی بەزۆری بۆرە پیاوو هەژارەکانن. هەروا بووە، بەدرێژایی مێژوو بۆرە پیاووهەژارەکان شوێنێکەو تووی پێغەمبەران بوون، پرسیارم لێ کردی ئایا ژمارەی شوێنکەوتوانی رو لەزیادین یان لەکەمی؟ وتت رو لەزیادین، ئەمەش دیاردەی ئەهلی بڕوادارە و کاری ئیمانی راستەقینە یە تا بەئاکام دەگا، پرسیارم لێ کردی ئایا کەسیان لێ پاشگەز دەبێتەوە؟ بەم جۆرە پاش ئەوەی ئەو بیرو باوەڕە وەردەگرن رقیان لێ هەڵسێ و زێوان بینەوە؟ وتت: نەخەیر، ئەمەش کاریگەری ئیمانی راستەقینەیە کاتێك دەچێتە ناو دڵانەوەو جێگیر دەبێ بەهیچ شتێك ناجوڵێ. پرسیارم لێ کردی ئایا ئەو پیاوە غەدر دەکا؟ وتت: نەء. ئەمە رەوشتی پێغەمبەرانە هەرگیز ئەوان غەدر ناکەن. پرسیارم لێ کردی فەرمانتان پێ دەکا چی بکەنو چ نەکەن؟ وتت: فەرمانمان پێ دەکا، کە عیبادەت بۆ خودا بکەینو کەس نەکەین بەهاوەڵی، واز لە بتپەرستی بێنێنو یەکتا پەرستی بکەین.

هەروەها وتت فەرمانمان پێ دەکا بە نوێژ کردنو راستگۆیی و داوێنپاکی. جا ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێ ی راست بێ دڵنیابە ئەم شوێنەی کەوا قاچم لەسەر داناوە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتیەوە. من لەوە پێش دەمزانی کە پێغەمبەرێکی ئاوا پەیدا دەبێ بەڵام نەمدەزانی کە لەریشەو نژادی ئێوەی عەرەب دەبی. ئەگەر من بمزانیایە دەتوانم بگەمە لای، هەوڵم دەدا هەرچۆنێك بێ چاوم پێ بکەوتایە. ئەگەر لای بومایە خزمەتم دەکردو قاچەکانیم دەشۆردن.[١٨٢] ئەبو سەفیان دەڵێ: ئەمجار هیر قەل فەرمانی کرد کەپیاو ماقوڵانی روم لەباڵەخانەی پاشادا کۆببنەوە کە کۆبوونەوە فەرمانی دا دەرگای باڵەخانە داخران، ئەمجار روی کردە خەڵکەکەو وتی: ئەی جەماوەری روم! ئایا دەتانەوێ لەژیان دا سەر کەوتوو بنو ملكو سەڵتەنەتتان پایە دار بێ؟ وەرن بابەیعەت بەو پێغەمبەرە بکەین، خەڵکەکە کەزۆریان پێ ناخۆش بوو هەڵسان لەقەصر بڕۆنە دەرو بەرەو دەرگا راجمین کەرۆیشتن دەرگاکان داخرا بوون. جاکە هیر قەل بینی جەماوەرەکە زۆر بەوە نارازینو دڵنیا بوو ئامادە نین ئیمان بە پێغەمبەر بێنن. وتی: جەماوەرەکەم بۆ بێننەوە قسەی تریان بۆ دەکەم، وتی: من ئەو قسانەی پێشووم بۆیە بۆ کردن بۆ ئەوەی تاقیتان بکەمەوە، وتم بزانم تاچەند پابەندی ئاینو بیرو باوەڕی خۆتانن، ئەوا بۆم دەرکەوت زۆر باشە، ئەوانیش کەوتنە سوجدە بردن بۆ هیر قەلو ئەویش رەزامەندی خۆی لێیان نیشان دا. بەم شێوە هیرقەل ملكو کورسی بەسەر هیدایەتو بەختەوەری هەتا هەتایی قیامەت دا هەڵبژارد، لەوەدوا شەڕو هەرایەکی زۆر لەنێوان ئەوو موسوڵماناندا لەسەردەمی خەلافەتی ئەبو بەکرو عومەردا روی داو سەرەنجام بووە هۆی لەناو چوونی دەسەڵاتی هیر قەلو داگیر کردنی وڵاتو قەڵە مڕەوی.

---

[١٨٢] وەرگیراوە لەفەرمودەیەکی درێژ بوخاری ریوایەتی کردوە لە (باب)ی چۆنیەتی دەست پێکردنی نیگا بۆ پێغەمبەر .

## أریسیون کێن؟

وشەی ئەریسین یان ئەلیەریسین لەزۆر ریوایەتی حەدیث دا هاتووە، بەتایبەتی لەو نامەیەدا کە پێغەمبەر ناردی بۆ هیر قەل، وەلێ لەنامەکانی تردا کەناردونی بۆ پاشاو ئەمیرەکان وشەی ئەریسین نەهاتووە، زانایانی فەرمودە ناس و زمانەوان لەمانای ئەم وشەیەدا راجیاییان هەیە. قسەی مەشهورو باو ئەوەیە ئەریسیین کۆی (أریسی) یە کە بەمانا خزمەتکارو کرێکار دێ، لەکتێبی (لسان العرب) ی ئیبنو مەنظوردا هاتووە دەڵێ: (الأرس) واتە ئەصل و بنەما، (الأریس) کرێکار. ئیبنو مەنظور ئەمەی لە ثەعلەب وەرگرتووە. هەر ئەو لەئیبنو لئەعرابی یەوە نەقڵ دەکا دەڵێ (أرس یأرس أرسا اذا صار أریسا) (وأرس یورس تأریسا) (اذا صار أکارا) لەئەبو عوبەیدەوە گێردراوەتەوە دەڵێ قسەی پەسەند لای من ئەوەیە بگوترێ (الأریس) ئەو کەسەیە بەرپرسی کرێکارو خزمەتچیەکان بێ، کەفەرمانی پێ کردن گوێ بیسی فەرمانەکانی بن.

ئێستا خوێنەر بۆی هەیە پرسیار بکا بڵێ ئەگەر مەبەست بە (الأریسیین) وەرزێرو فەلا بێ، دەبوایە لەو نامەیەدا کەپێغەمبەر بۆ کیسرای نووسی وشەی (ئەریسین) ی تێدا بوایە چونکە کیسرا شیاو تر بوو بەوەی کە بەر پرسیارێتی ئەریسییەکانی بکەوێتە ئەستۆ، لەبەر ئەوەی چینی وە رزێرو فەلا لەئیمپراتۆرییەتی ساسانی دا پتر هەبوو تا لە ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی دا.

زۆربەی زۆری دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەتی ساسانی پشتی بەکشت و کاڵ دەبەست و زۆربەی داهاتی دەوڵەت لەکشت و کاڵەوە پەیدا دەبوو، بۆیە ئەزهەری وەکوو ئیبنو مەنظور لێیەوە نەقڵ دەکا دەڵێ: دانیشتوانی رەشە خاك (أهل السواد) هەیانبوو لەسەر ئاینی کیسرا بوو بەکشت و کاڵ و باخ و

بێستانەوە خەریك بوون، جەماوەری ڕۆمانی خاوەن کالاو پیشەسازیو هونەر بوون، بە مەجوسییەکانیان دەگوت: (ئەریسین) پالیان دەدان بۆ لای (الأريس) واتە: کرێکار، عەرەب پێیان دەگوتن: وەرزێر.

بۆیە ئێمە ئەوەمان بەلاوە پەسندە کە بڵێین: مەبەست بە ئەریسیین شوێنکەوتوانی (أريوس)ی میصری یە ٢٨٠-٣٣٦ ی ز دامەزرێنەری گروپێکی مەسیحی یە. ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە مێژووی بیرو باوەڕی مەسیحیو چاکسازی ئایینی، بێگومان ئەم گروپە مەسیحی یە ماوەیەکی دورو درێژ دەوڵەتی بێزەنتیو کەنیسەی مەسیحی هەڵەو گێر کردن! (أريوس) بانگەوازی بۆ یەکتا پەرستی کردو مەفهوومی خالقو مەخلووقی لێك جیا دەکردەوە، (باوكو کوڕ) ی باوی ناو مەسیحیەکانی لێك جیا نەکردەوە، ئەمەش بووە هۆی گفتو گۆو موناقەشەی نێوان مەسیحییەکان، بۆ ماوەی چەند سەدەیەك کۆمەڵگای مەسیحی خستە بێنەو بەرەیەکی فەلسەفیو نیقاشو نیزاعێکی توندو تیژو دورو درێژ.

پوختەی بیرو بۆ چونەکانی ئەوە بوو دەڵێ لە سروشتی خودادا ئەوە نیە کەلە سەر زەوی دەربکەوێ، لەبەر ئەوە مەسیحی پڕ کردوە لەزانستو هێزو قسەی پڕ مانا. هەروەها پێ ی وایە: صیفاتی تاكو تەنهاییو هەبوونی بێ سەرەتاو بێ کۆتایی صیفاتی سەرەکی خودان، وەهەر گیز خودا راستەوخۆ کەسی لەزاتی خۆی دروست نەکردوە، هەروەها (کوڕ) واتە: عیسا خودا نیە، بەڵکوو دیاردەی فەرمانی خودایە، خودایەتی عیسا ئیضافییە رەها نیە.

جیمس ماکینون Jams macinon لەکتێبەکەی (من المسيح الى قسطنطين) دا دەڵێ: (أريوس) زۆر پێکێشی لەوە کردو جەختی کردەوە کەخودا بۆ خۆی بەزاتی خۆی هەربوەو هەر دەبێ، (أزلي وابدي) کەس نیە

هاوشانو هاوەڵی بێ، ئەو (کوڕ)ی واتە: عیسای لەنەبوو دروستکردوە، کەوابێ (کوڕ) عیسا ئەزەلی نیە، هەرگیزاو هەرگیز خودا باوك نەبوەو نابێ، ڕۆژگارێك هەبوە، عیسا نەبوە، عیسا بۆ خۆی تایبەتمەندییەکی هەیە خودا لەوەدا وەك ئەو ناچێ، عیسا ملکەچی گۆڕانکارییەکانە، بەهیچ شێوەیی عیسا بەمانای تەواو خودا نیەو لەخودا ناچێ، بەڵام دەتوانێ کەمو کوڕی تێدا نەبێو کامڵ بێ، وەلێ بەهەموو حاڵێك لەوە دەرناچێ کە بگوترێ دروستکراوێکی بێ کەمو کوڕییە. لەکاتێك دا کەنیسەی ئەسکەندەرییە لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی زایینی بڕوای بەخودایەتی عیسا هەبوو بانگەشەی بۆ ئەو بیرو باوەڕە دەکردو هیچ جوداوازییەکی لەنێوان بەدیهێنەرو بەدیهێنراودا (کوڕو باوك) دا نەدەکرد!!

ساڵی (٣٢١ ز) سەرۆکی کەنیسەی میصر ئەلەکساندەر (أریوس) ی لەکەنیسەی ئەسکەندەرییە وەدەرناو ئەریوس بەناچاری شاری ئەسکەندەرییەی بەجێ هێشت، وەلێ بەدەرچوونی ئەریوس لەئەسکەندەرییە کێشەی نێوان شوێنکەوتوانی ئەریوسو مەسیحیەکانی تر کۆتایی نەهات، هەرچەندە (قوستەنطنین) هەوڵەکانی خۆی خستە گەڕ بۆ نەهێشتنی ئەو کێشەیە. وەلێ سەرکەوتوو نەبوو، ساڵی (٣٢٥ ز) لەنیقیە کۆڕێکی بەرفراوان بەسترا (٢٠٣٠) ئوسقوف بەشدارییان تێدا کرد، ئیمپراتۆر بۆ خۆی بیرو باوەڕی بەلای ئەوەدا دەشکایەوە کەعیسا خودایە، بە پێچەوانەی بیرو باوەڕی ئەریوسەوە هەڵسو کەوتی دەکرد، هەرچەندە زۆربەی زۆری بەشدار بووانی کوڕەکە پشتگیری بیرو باوەڕی (ئەریوس) یان دەکردو لەو ژمارە زۆرەی بەشدار بووان تەنیا (٣١٨) ئەسقوف پشتگیرییان لەبیرو بۆ چونەکانی قوستەنطین کرد، بەڵام قوستەنطین رای خۆی سەپاندو دیکتاتۆریانە هەڵسو کەوتی کرد بڕیاری دا ئەریوس دوور بخرێتەوە بۆ

البريا) و چی نووسینی هەیە بسوتێندرێ، هەرکەسێك نووسینی (ئەریوس) ی بەلاوە بێ سزا بدرێ، وەلێ ئەو هەموو لەمپەڕو هەوڵدانانە بۆ ڕەتکردنەوەو بڵاونەبوونەوەی بیرو باوەڕی ئەریوس نەیانتوانی جەماوەر لەشوێنکەوتنی ئەو ژێوان بکەنەوە یان کەمیان بکەنەوە، ئەوە بوو ڕۆژ دوا ڕۆژ جەماوەری زیاتر دەبوو بیرو باوەڕەکانی زیاتر بەناو خەڵك دا بڵاو دەبوەوە، سەرەنجام قوستەنطین ناچار بوو هەندێ نەرمی لەهەڵوێستی خۆی دا بنوێنێ و ئەو سانسۆرەی خستبویە سەر بیرو باوەڕی (أریوس) لای بەرێ، لەدوای مردنی ڕکابەری گەورەی ئەریوس کە ئەلەکساندەر بوو، هەروا دوور خستنەوەی جێگرەکەی Athananius (ئەریوس) قاچاغ و دەرکراو گەڕایەوە بۆ ئەسکەندەرییە، قوستەنطین خەریك بوو بیکاتە سەرۆکی کەنیسەی میصرو بیرو باوەڕیشی قبوڵ بکا، وەلێ پێش ئەوەی ئەوە بێتە جێ قوستەنطین مرد.

لەکتێبی (الصراع بین الدین والعلم) ی درابەر هاتووە دەڵێ: لەسەدەی چوارەمی زایینی دا سیانزە کۆڕو قوتابخانەی مەسیحی لەدژی ئەریوس دەنگیان دا، پانزە کۆڕو قوتابخانە دەنگیان بۆ دا، حەڤدە کوڕ ڕایان لەرای ئەریوس نزیك بوو، بەم جۆرە (٤٥) چل و پێنج کوڕ کەوتنە دان و سان و گفت و گۆوە بۆ ئەوەی ئەم قەضییە یەکالا بکەنەوە، .

لە ڕاستی دا جیهانی مەسیحی ئەو بیرو باوەڕە سێ خودایی یەی کەئێستا هەیەتی و لەناویان دا باوە پێش سەدەی چوارەم چ دیاردەیەکی نەبوە، لەکتێبی دائیرە تولمە عاریفی کاثۆلێکی تازەدا هاتووە دەڵێ: پەردە لەسەر بیرو باوەڕی سێ خودایی نهێنی یەکانی هەڵنەدرایەوە مەگەر لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی دا ئەو بیرو باوەڕە بڵاو بووەو پەرەی سەند، هەموو ئەوانەی دەربارەی بیرو باوەڕی سێ خودایی ڕەها

قسەیان کردوە، یەکسەر لەبەرە بەیانی مێژووی مەسیحی یەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی چوارەم. بێگومان بیرو باوەڕو داننان بەوەی کەخودای تاكو تەنها سێ دیاردەی هەن (الأقانيم الثلاث) لەناو جەماوەری مەسیحی دا سەری هەڵنەدا مەگەر لەم ماوە زەمەنی یەی باسمان کرد.. بەڵێ بیرو باوەری ئەریوس‌و بانگەوازی یەکەی بەردەوام لەکێشەو نیزاع دا بوون دژی بانگەوازی بەخودا زانینی عیساو یەکسانیکردنی بەخودای بالاّ دەست و بەدیهێنەر، شەڕو جەنگ لەنێوانیان دا بێ پسانەوەو برانەوە هەبوو، بێگومان ژمارەیەکی زۆر لەمەسیحیەکان لەویلایەتە خۆر هەلآتیەکانی ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی دا بیرو باوەری (ئەریوس) یان وەرگرت‌و پێوەی پابەند بوون هەتا (تیوسودس) ی گەورە قوستەنطینیە کۆڕێکی مەسیحی بەست لەو کۆڕەدا بڕیاری خودایەتی عیساو بەکوڕ بوونی درا، ئەم بڕیارو ئیعلانە بەتەواوی پاڵە پەستۆی خستە سەر ئەو بیرو باوەڕەی ئەریوس بانگەوازی بۆ دەکرد، سەرەنجام ئەم بیرو باوەڕە نوزەی لێ بڕاو بەکۆتا هات، بەلاّم لەگەلّ ئەوەش دا کۆمەڵێك لە مەسیحییەکان پێوەی پابەند بون‌و وازیان لێ نەهێنا ئەم کۆمەڵە بە گروپی ئەریسییەکان بەناو بانگ بون، کەوابێ رای پەسەندو مەعقول ئەوەیە بگوترێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەلەنامەکەی هیر قەل دا دەفەرموێ: (فأن توليت فان عليك اثم الأريسيين) مەبەستی بە (ئەریسیین) ئەو گروپەیە، چونکە ئەوان لەناو ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی دا پابەندی بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی یەکی مام ناوەندی بوون.

مەعروف ئەلدەوالیبی لەم بارەوە بەحثێکی بەنرخی نووسیوە پشتگیری ئەوە دەکا کە مەبەست بە (الأريسيين) لەنامەکەی پێغەمبەر بۆ هیرقەل گروپێکی (مەسیحی) ین شوێنکەوتووی (ئاریوس)ن بانگەواز‌ی

دەکەن بۆ بیرو باوەڕی ئەوە کەعیسا ئادەمیزادەو رەوشتی خودایەتی تێدا نیە[١٨٣] سەیرە بڕێك لەگەورە زانایانی ئیسلام لەسەدەی یەکەمی کۆچی دا بۆ ئەم مەعنایە چون، ئیمام ئەبو جەعفەری طەحاوی لەکتێبی (مشکل الآثار) دا دەربارەی (الأريسيين) دەڵێ: هەندێ لەزانایانو شارەزایان وتویانە لەناو جەماوەری هیر قەل دا گروپێك هەبون پێیان گوتراوە (الأروسية) ئەمانە یەکتا پەرست بون دان دەنێن بەبەندایەتی مەسیح داو دەڵێن عیسا بەندەی خودایەو پێغەمبەری خودایە ئەو قسانەی مەسیحییەکان دەیکەن دەربارەی خودایەتی ئەوان نایڵێنو ئەو بیرو باوەڕانەیان نیە. ئەوان پابەندی ئایینی راستەقینەی مەسیحنو بڕوایان بەناوەڕۆکی ئینجیلەکەیەتیو دژی هەموو بیرو باوەڕێکی ترن کەلەو سنورە دەردەچێو بانگەشەی خودایەتی عیسا دەکا، جا ئەگەر ئەمە وابێ، دەگونجێ بەم کۆمەڵە بگوترێ گروپی (الأريسيون) لەحاڵەتی (رفع) دا (الأريسيين) لەحاڵەتی (نصب) و (جر) دا. وەکوو زانایانی فەرمودە فەرمویانە[١٨٤] نزیك لەم رایە ئەوەیە کە ئیمام محي الدين یەحیای نەوەوی راڤەکەری (صحيح)ی موسلیم (٦٧٦هـ) دەڵێ: دووەم ئەوانە (جولەکەو مەسیحی)ن، شوێنکەو تووی عەبدوڵڵای کوڕی ئەریس ئەو کەسەی نەصرانییە ئەروسییەکانی پاڵ دەدرێن پێیان دەگوترێ (ئەروسییون)[١٨٥]

---

[١٨٣] بروانە نظرات اسلامية ٦٨-٨٣.

[١٨٤] مشكل الآثار جـ ٣٩٩/٣.

[١٨٥] شرح صحيح مسلم جـ ٩٨/٢.

## نامەکانی پێغەمبەر بۆ لای میرە عەرەبەکان

یەکێك لەو میرە عەرەبانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نامەی بۆ نوسیون مونذیری کوڕی ساوا میری بەحرەین بوو،[186] هەروەها نامەی ناردوە بۆ لای (جیفر بن الجلندا) و (عبد بن الجلندا) لەهۆزی ئوزد بونو فەرمانڕەوای عەمان بوون.[187] هەروەها نامەی نارد بۆ لای (هوزە) ی کوڕی عەلی خاوەنی یەمامە[188] هەروەها بۆ لای (حاریث) ی کوڕی شەممەری غەسانی.. مونذیری کوڕی ساواو جەیفەرو عەبد کوڕانی ( جلندای ئوزدیو موسوڵمان

---

[186] پێشی دەگوترێ: (الأحساء) زۆربەی دانیشتوانی لەبەنی عەبدول قەیسو تیرەی بەکری کوڕی وائیلو هۆزی تەمیم بوون ئەمیرەکەشی لەکاتی نامە ناردنی پێغەمبەردا (منذربن ساوی) بووە لەهۆزی بەنو تەمیم بوو.

[187] جیفەری کوڕی جولەندیو عەبدی کوڕی جولەندی هەردوکیان فەرمانڕەوا بوون بەسەر وڵاتی عەمانەوە، جەیفەر پاشا بوو لەعەبدی برای بەتەمەن تر بوو سەیری نهایە الأدب ١٨-٦٧بکە وشەی جولەندی وەکوو دەردە کەوێ لەریوایەتی هەواڵ گێڕەوەکان ناوی کەس نیە بەڵکوو ناز ناو بووە بەمانا (کەم) یان کاهین هاتووە. تأریخ العرب قبل الأسلام علی جواد الطاهر جـ ٢٠١/٤.

[188] هۆزەی کوڕی عەلی (الحنفی) پاشای یەمامە بوو لەسەر ئایینی مەسیحی بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە (سلیط بن عمرو) دا نامەی بۆ نارد. سنووری یەمامە لەو ڕۆژگارەدا لەخۆر هەڵاتەوە دەگەیشتە بەحرەین، لەخۆر ئاواوە دەگەیشتە حیجاز ناوچەیەك لە ناوچەکانی یەمامە (منفوخە) بوو زێدو نیشتەمەنی (الأعشی) بوو، دیاری ترین هۆزی یەمامە لەسەر دەمی پێغەمبەردا (بنو حەنیفە) بوون (مسیلمة الکذاب) لەوان بوو. ناز ناوی درۆزنی پێوە نراوە چونکە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی کردوە. هەرکەسێ بیەوێ بەدور درێژی ئاگاداری دەقی نامە نێردراوەکانی پێغەمبەر بێ کەناردونی بۆ پاشاو میرەکانی ئەو ڕۆژگارەو ناوی نامەبەرەکانو نامە بۆ نێردراوەکانو ژینامە یان بزانێ بابگەڕێتەوە بۆ کتێبی (اعلام السائلین عن کتب سید المرسلین دانانی محمد بن طولون الدمشقی.

بون، وەلێ (هوذة) ی کوڕی عەلی خاوەنی یەمامە داوای کرد پێغەمبەر فەرمانڕەوایی بداتێ، پێغەمبەریش ڕازی بوو دوا بەدوای ئەوە مرد.

## غەزای بەنو لەحیان و غەزای ذیقەرد:

لەنێوان پەیمانی حودەیبییە ساڵی شەشەمی کۆچی و غەزای خەیبەردا غەزای بەنو لەحیان و غەزای ذیقەرد رویان دا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتومی بەسەر مەدینەوە داناو تەشریفی لەگەڵ هاوەڵانی دا بەڕێ کەوت بۆ ئەنجامدانیان.

## غەزای خەیبەر ساڵی حەوتەمی کۆچی:

پەروەردگار پێش وەخت لە (بیعة الرضوان) دا کەلە حودەیبییە هاوەڵان لەژێر درەختەکە پەیمانیان بە پێغەمبەردا، پێش وەخت موژدەی سەرکەوتنی پێدان موژدەی ڕەزامەندی خۆی لێیان و سەرکەوتنی دەسکەوتی زۆرو بەنرخی دایە ئەو هاوەڵانە کەپابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بوون و بڕیاری خودایان بەسەر ئارەزۆکانی خۆیان دا هەڵبژارد، دەستبەرداری ویست و بیرو بۆ چوونی ڕواڵەتی خۆیان بون و بێ چەندو چۆن ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانی خودا ڕاگەیاند! دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا، وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ سورة الفتح/١٨-١٩. بێگومان خودا ڕەزامەندی خۆی لەو موسوڵمانانە ڕاگەیاند کەلە ژێر درەختی (سمرة) دا بەڵێنیان بەتۆ دا ئەی پێغەمبەر! پەیمانیان لەگەڵ بەستی کەدژی قورەیشییەکان بجەنگن و بەگیان و ماڵ بەرگری

لەئیسلام بکەنو گۆڕەپانی جەنگو رو بەرو بوونەوە چۆڵ نەکەن.

پەروەردگار دەیزانی چی لەدڵیان دایە، ئاگاداری ئەوە بوو کە بیرو باوەڕو راستیو دڵسۆزی و بەئەمەکیو فەرمانبەر دارییان چەندەو چۆنە، بۆیە خودا زیاتر ئارامیو تەسکینی خستە ناو دەرونیانەوە، سەرکەوتنی خەیبەری بە نسیب کردن دوا بەدوای سەروەری غەزای خەیبەر رزگار کردنی مەککەشی بۆ دەستەبەر کردن، ئەمجار سەرکەوتنو بالاّ دەستی فرەی پێ بەخشینو ولاّتی تریان کۆنتڕۆڵ کردن، سەروەری یەك لەدوا یەکی باقی کیشوەرو ولاّتانی تریان بۆ دەستەبەر کرا، هەروەها پادا شی تریشی دانەوە بەوە! دەستکەوتی زۆرو زەبەندەی جولەکەکانی خەیبەری بۆ دەستەبەر کردن، بەتایبەتی ئەو ثەروەتو سامانەی خەیبەر بەسەر ئەوان دا دابەش کراو بەشی کەسی تری لێ نەدرا.

بەڵێ دوای پەیمانی حودەیبییە دەرگای سەرکەوتنەکان بۆ موسوڵمانان کرانەوە، پێشەنگی ئەو سەرکەوتنو دەستکەوتانەش غەزای خەیبەر بوو، خەیبەر بۆ خۆی کۆمەڵگایەکی جولەکە نشین بوو ژمارەیەکی قەلاّو شورای قایمو قوڵو سەرباز خانەی جولەکەی تێدا بوون[١٨٩]، دواسەنگەرو سەربازخانەیان بوو لەناو جەزیرە تول عەرەب دا . ئەم جولەکانە هەمیشە لە هەلێك دەگەڕان موسوڵمانەکان تێ بشکێنو ئەوانیش لەپشتەوە خەنجەری ژەهراوی خۆیانیان لێ بوەشێنن، چونکە ئەوان هەمیشە بەسەر هاتی براکانیان بەنو قورەیظەو بەنو قەینوقاعو بەنو نەضیریان لەیاد

---

[١٨٩] قەلاّ بەناو بانگەکانی جولەکە لەخەیبەردا قەلای ( ناعم، قموص، قەلاّی (السق) و قەلاّی (نطاة) قەلاّی (السلالم) و قەلاّی (الوطیح) و قەلاّی (الکتیبە) بوون. یەعقوبی دەڵێ لەخەیبەردا جولەکەکان بیست هەزار شەڕ کەریان هەبوو تاریخ البعقوبی جـ ٥٦/٢.

نەدەچووەوە. دڵنیا نەبوون لەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان ئەوەی بەسەر براكانیان هاتووە بەسەر ئەمانیش نەیە. بۆیە لەگەڵ هۆزی (غطفان) كلكیان لێك بەستبوو بۆ پەلاماردانی مەدینەو قەلاچۆ كردنی موسوڵمانان.[١٩٠] بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ویستی ئیستیراحەتیان لێ بكاو ترسی هێرشی ئەوانی نەمێنێ خەیبەر كەوتبوە باكوری خۆرهەڵاتی مەدینەوە، حەفتا كیلۆ مەتر لەمەدینەوە دوور بوو.

## سوپایەكی خاوەن بڕوا لەژێر فەرماندەی پێغەمبەر

كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەحودەیبییە گەڕایەوە مانگی ذیلحیجەو بڕێ لەمانگی موحەرەم لەمەدینەدا مایەوە، ئەمجار لەو باقی ماندەی موحەرەمەدا ساڵی حەوتەمی كۆچی بەرەو خەیبەر بەڕێ كەوت، عامیری كوڕی ئەكوەع كەهاوەڵێكی پێغەمبەر بوو لەڕێگادا بەدەنگی بەرز ئەم شیعرانەی دەخوێندنەوەو دەیگوت،

| | |
|---|---|
| والله لولا الله ما اهتدينا | ولا تصدقنا ولا صلينا |
| انا اذا قوم بغوا علينا | وان ارادوا فتنة أبينا |
| فأنزل سكينة علينا | وثبت الأقدام ان لاقينا |

[١٩٠] مامۆستای ئینگلیزی نژادی بەناوبانگ مونتو گومری W.Montgomeny لەكتێبەكەی دا (محمد النبي والسياسي) دا دەڵێ: جولەكەكانی خەیبەر بەتایبەتی سەرانی هۆزی بەنونەضیر ئەوانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینە دووری خستبوونەوە، لەدڵی خۆیان دا حیقدو كینەیەكی زۆریان بۆ موحەممەد كەڵەكە كردبوو، هەر ئەوانیش بوون توانییان هۆزە عەرەبەكانی هاوسێیان هەڵنێن بۆ چەك هەڵگرتن دژی موسوڵمانەكان و هێرش كردنە سەریان. لەم پێناوەدا ماڵ و سامانێكی زۆریان دابەو هۆزە عەرەبانەو وادەی زۆری تریشیان پێدان، ئەمەش هۆی سەرەكی بوو بۆ ئەوەی موحەممەد هێرش بەرێتە سەر خەیبەرو غەزایان بكا.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەسوپایەکی (١٤٠٠) کەسی یەوە دوسەدیان ئەسپ سوار بوون روی کردە خەیبەر، رێگەی نەدا بەوانەی لەچون بۆ حودەیبییە دواکەوتبوون لەگەڵیا بچن، بیست ئافرەت لەژنی هاوەڵان هاوبەشی ئەو غەزایەیان کرد بۆ ئەوەی دەرمانی نەخۆش‌و برینداره‌کان بکەن، لەکاتی شەڕو تێکڕژان دا ئاوو خواردەمەنی بگەیەننە شەڕ کەرەکان.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەسوپاکە یەوە رۆیی تاگەیشتە (الرجيع) شوێنێکە لەنێوان یەهودو غەطەفان بۆ ئەوەی نێوان بڕیان بکاو نەهێڵێ پشتگیری دانیشتوانی خەیبەر بکەن‌و یارمەتییان بۆ بنێرن، بەلەشکر بەزی پێغەمبەر لەو شوێنە وای لەهۆزی غەطەفان کرد کەلەماڵی خۆیان دانیشن‌و خۆ لەهەموو جۆرە یارمەتیدانێکی خەیبەرییەکان بپارێزن‌و بێ لایەن بن.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) داوای تێشوی کرد، تەنها قاوتیان هێنا، فەرمووی دابەشی بکەن دوعای زۆر بوونی لێ کرد زۆر بوو موسوڵمانەکان خواردیان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەبەسەر خەیبەردا روانی دوعای کردن، لەخودا پاڕایەوە خێریان توش بێ‌و لەشەڕو نەگبەتی خەیبەرو دانیشتوانەکەی پارێزراو بن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەرکاتێ غەزای قەومێکی بکردایە بەشەو پەلاماری نەدەدان، لێیان دەگەڕا تا ڕۆژ دەبوەوەئەگەر گوێی لەدەنگی بانگ بوایە وازی لێ دێنان، بەگوێرەی ئەم داب‌و نەریتەی شەو چاوەروانی کرد تاڕۆژ بوەوە، گوێی لەدەنگی بانگ نەبوو، ئیتر تەشریفی سوار بوو، هاوەڵانی لەخزمەتیا سوارو تەیار بون، لەو کاتەدا کرێکارو جوتیارو ئیش کەریان لەماڵ دەرکەوتبوون بەپاچ‌و بێڵەکانیانەوە دەچون بۆ ناو کێڵگەکانیان، بۆ ئیش کردن، کە ئەم سوپایەیان بینی لەدەوری قەڵاکانیان هاواریان کردو وتیان ئای پێغەمبەرو

سوپاکەی! ئیتر پاشەو پاش کشانەوەو رایانکردەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (الله اكبر) خەیبەر وێران بوو، ئێمە هەر کاتێ پەلاماری شوێنێك بدەین کاری دانیشتوانی ئەو وڵاتە خراپ دەبێ.

## سەرکردەی سەرکەوتوو:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەلاماری قەڵاکانی خەیبەری دا، قەڵا دوا قەڵای کۆنترۆڵ کردن، یەکەم قەڵایەك: کۆنترۆڵ کرا قەڵای (ناعم) بوو ئەمجار قەڵای القموص) لەو کاتەدا عەلی کوڕی ئەبو تالیب چاوی دێشا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: سبەینێ پیاوێك ئاڵاکە وەردەگرێ خوداو پێغەمبەری خودا خۆشیان دەوێ، ئەو قەڵاکە کۆنترۆڵ دەکا. گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەریەکەیان لەعاست خۆیەوە خودا خودای بوو سەروەری ئەم ئاڵاوەرگرتنە بەر ئەو بکەوێ. ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بانگی عەلی کرد کەبەدەست چاوئێشەوە زۆر نارەحەت بوو، عەلی لە پێغەمبەر نزیك بووەوە، تەشریفی تفی خۆی کردە چاوەکانیەوەو دوعای چاکبوونەوەی بۆ کردو چاوی ئازاریان نەما، ئەمجار ئاڵاکەی پێدا، عەلی وتی: من شەڕیان لەگەڵ دەکەم هەتا شایەتومان دەهێنن.[191] پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو:

---

[191] ریوایەتی جۆراو جۆر هەن دەربارەی دیاریکردنی ئەو قەڵایەی کە عەلی کۆنترۆڵی کرد، ئەوەی لەراستی یەوە نزیکە ئەوەیە بگوترێ: ئەو قەڵایە قەڵای (القموص) بووبێ، چونکە ئەم قەڵایە مەڵبەندی پاڵەوانی جولەکەی ناودارو پاڵەوانی مەیدان بوو کەمەرحەب. بوو، هەرچەندە لەسیرەی ئیبنو هشام دا هاتووە ئەوکەسەی مەرحەبی کوشت موحەممەدی کوڕ مەسلەمە بوو، وەڵێ ریوایەتی مەشهورو پەسند لای مێژوو نووسان ئەوەیە بکوژی مەرحەب عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو. صحيح مسلم حەدیثی ژمارە (١٨٠٧) كتاب السير والجهاد.

برۆ بۆ سەریان و پێشڕەوی بکە تادەگەیە نزیکیان، پاشان بانگەوازییان بکە بـۆ ئیمـان هێنـانو پابەنـدبون بەئیـسلامەوە، پێیـان بڵـێ: چـییان لەسـەر پێویستە بەرامبەر بەخودای تاکو تەنیاو بەدیهێنەر. سوێندم بـەخودا ئەگـەر خودا بەهۆی تۆوە هیدایەتی یەکێك بدا ئـەوە زۆر باشترە بـۆ تـۆ لەحوشتری سـور. عـەلی دەوری قـەڵای (القمـوص) ی گـرت، مەرحـەب کەپاڵـەوانێکی بـەناوبانگی جولەکـە بـوو هاتـە گۆڕەپـانو هەنـدێ شـیعری حەماسـەت خـوڵقێنو خـۆ هەڵکێـشانی خوێندنـەوە، بەشـیر لێـك راسـان عـەلی دەسـت پێشخەری کردو شیرێکی داهێنایە تـەوقی سـەریو کوشـتیو سـەرکەوتنی بەدەست هێنا.

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە لـەم شـەڕەدا هەڵوێستی مەردانەی نوانـدو پاڵەوانانە جەنگا، ژمارەیەکی لەسوار چاکانو پاڵەوانانی جولەکە کوشت. .

## کردەوەیەکی کەمو پاداشی زۆر:

لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەمارۆی قەڵاکانی خەیبەری دابوو، کۆیلەیەکی رەش پێستی حەبەشی کەشوانی مێگەلە مەڕێکی ئاغاکەی بوو، چاوی لێ بوو دانیشتوانی خەیبەر تاویان دایە چەكو خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد پرسیاری لێ کردن ئەوە چی دەکەنو بەتـەما چین؟ وتیـان: دەمانـەوێ شـەڕ لەگـەڵ ئـەو پیـاوە بکـەین کـە پـێ ی وایـە پێغەمبـەرە، بەنـدە رەش پێستەکە، بیستی وشـەی پێغەمبـەر سـەرنجی راکێشاو بەمێگەلـە مەڕەکەیـە وەهـات بـۆ لای پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) عـەرزی کـرد تـۆ چـی دەڵـێیو بانگـەوازی بۆچـی دەکـەی؟ پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی بانگـەوازی دەکەم بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەناو ئادەمیزاددا دەمەوێ مـەردوم شـایەتی بدەن کەجگە لەخودای بونەوەرچ خودای ترنین، هـەروا شـایەتی بـدەن کـەمن

پێغەمبەرو رەوانە کراوی خودام پەرستش هەر بۆ خودا بکەن‌و یەکتا پەرست بن. بەندە رەش پێستەکە وتی: من چیم پێ دەدرێ ئەگەر شایەتومان بێنم بەتاك‌و تەنهایی خوداو پێغەمبەرێتی تۆ؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەت بمرێ دەچیە بەهەشتەوە. ئیتر کابرای قولەرەش ئیمانی هێناو موسوڵمان بوو، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەم مێگە لە مەڕە ئەمانەتە لام چییان لێ بکەم؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەکۆڵ خۆتیان بکەرەوەو بەرەڵڵای سارایان بکە خودا لەجیاتی تۆ ئەمانەتەکەت دەگەیەنێتەوە شوێنی خۆی. ئەویش وای کردو میگەلە مەڕەکە گەڕایەوە بۆ ماڵی خاوەنی، کابرای جولەکەی خاوەن مەڕ بۆی دەرکەوت کەبەندەکەی موسوڵمان بووە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتاری بۆ خەڵکەکە خوێندەوە هەڵینان بۆ جیهاد کردن، جاکە موسوڵمانەکان‌و جولەکەکان کەوتنە شەڕەوەو لەناو کوژراوی موسوڵمانەکان دا یەکێکیان کۆیلە رەش پێستەکە بوو، موسوڵمانەکان جەستەی لەخوێن خلتا بووی ئەویان بردە لای خۆیان‌و لەژێر خێمەیەك دا دایان نا، موسوڵمانەکان وایان زانی پێغەمبەر لەخێمەکەدا چاوی لێ بووە، پاشان روی کردە هاوەڵانی‌و فەرمووی: بێگومان خودای گەورە رێزی لەم بەندەیەی خۆی گرت‌و کێشی کرد بۆ ژێر رەحمەتی خۆی، وەڵڵاهی لەلای سەریەوە دوو حۆری چاوگەشم بینین، بە مەرجێ لەژیانیا سوژدەیەکی بۆ خودا نەبردوە.[١٩٢] کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەرو ئیمانی پێ هێنا، وتی: لەپێناو ئایین دا لەخزمەتت دا کۆچ دەکەم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەهەندێ لەهاوەڵانی فەرموو ئاگاداری ئەم پیاوە بکەن‌و ئایینی ئیسلامی بۆ شی بکەنەوە. جاکە غەزای خەیبەر روی دا، پێغەمبەر

---

[١٩٢] زاد المعاد جـ ٣٩٣/١.

(دروودی خوای لەسەربێ) بڕێك لەماڵو سامانە دەستکەوتەی بۆ دانا، کابرای دەشتەکی لەکاتی شەڕدا پارێزگاری پشتەوەی لێ دەکردن. جاکە کابرا هاتەوە هاوەڵان بەشە دیاریکراوی خۆی کەبۆ دانرابوو پێیان دا ، وتی: ئەمە چیە؟ هاوەڵان وتیان: ئەمە بەشی خۆتە لەتاڵانی، پێغەمبەر بۆی داناوی، کابرا بەشەکەی هەڵگرتو چو بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وتی: ئەمە چیە ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی بەشی خۆتە بۆم داناوی، کابرا وتی: من بۆ ئەوە شوێنت نەکەوتوم، بەڵکوو بۆ ئەوە شوێنت کەوتوم تیرێکم بەگەردن بدرێو شەهید ببمو بچمە بەهەشتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەگەر بەراستی بێ خودا ویستەکەی بۆ دێنێتە جێ. پاشان هاوەڵان راپەڕین بۆ شەڕی دوژمنو شەر گەرم بوو پاش ماوەیەك کابرایان بەکوژراوی هێنایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەوە کابرایە؟ هاوەڵان عەرزیان کرد بەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی لەگەڵ خودا دا راستی کرد خوداش ئاواتەکەی هێنایە دی، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەجبەو جلو بەرگی خۆی کفنی کرد، ئەمجار پێشی خستو نوێژی لەسەر کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم دوعایەی بۆ کرد (خودایە ئەمە بەندەی تۆیە، لەپێناو ئایینی تۆدا کۆچکار بووە لەپێناو ئایینی تۆدا شەهیدبووە، من شایەتی بۆ دەدەم.

### مەرجی مانەوە لەخەیبەر:

قەڵاکانی خەیبەر یەك لەدوایەك پاش شەڕو گەمارۆدان رزگار کران، ئەم شەڕو هەراو گرتنو کوشتنە چەند رۆژێکی خایاند، هەتا داوایان کرد پێغەمبەر صولحیان لەگەڵ دا بکا، پێغەمبەریش دەیویست لەخەیبەر وەدەریان نێ، وتیان ئەی موحەممەد! وازمان لێ بێنە بۆ خۆمان لەم

ناوچەیەدا بڕژین زەوی‌و باخەکانی بەخێو دەکەین‌و بەسەری دا رادەگەین ئێمە لەئێوە باشتر خاکی خۆمان دەناسین‌و دەزانین بە کەڵکی چی دێ‌و چ بەروبومێکی پێ دەکەوێ.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەخۆی‌و نەهاوەڵانی کەسانێکی وایان نەبوو بەسەری دا رابگەن‌و بتوانن زەوی زارو باخەکانی بەخێو بکەن، ئەوەندە بێ ئیش نەبوون خەریکی ئەوە بن، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خەیبەری پێدان بەنیوەیی بەرهەمی بێنن بەکشت‌و کاڵ‌و بەروبوومی دا، چەند پێغەمبەر بەلایەوە باش بێ لەسەری بمێننەوە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ساڵانە عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی دەنارده سەریان باخەکانی بۆ دەخەرساندن، داهاتەکەی دەکردە دووبەش و پێ ی دەگوتن سەرپشك بن کام لا هەڵدەگرن باهەڵی گرن، ئەوانیش دەیانگوت: ئەمە داد پەروەرییەو بەم دادپەروەرییە ئاسمانە کان‌و زەوی راوەستاون.

## گیانی لێ بوردەیی ئایینی:

لەناو ئەو کاڵایەی دەستی موسوڵمانەکان کەوتبوو لەغەزای خەیبەر دا چەند سیپارەو لاپەڕەیەکی تەورات هەبوون، جولەکەکان داوایان کردنەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی دا بیاندەنەوە، دوکتور ئیسرائیل ولفنسون دەبارەی ئەم چیرۆکەوە دەڵێ: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەئەم سیپارە تەوراتیانە چەدڵ‌و دەروونی پێغەمبەردا پلەو پایەی تایبەتییان هەبوە، بۆیە جولەکە ئاشکرا پەنجە بۆ پێغەمبەر رادەکێشن‌و ئەم دەستپاکییەی بەرز دەرخێنن، چونکە سوکایەتی بەپەراوە پیرۆزەکەی ئەوان نەکرد بەرامبەردا هەڵس‌و کەوتی رومانەکان دێننەوە یادی خۆیان کاتێك ئۆرشەلیمیان داگیر کردو ساڵی حەفتای زایینی بەتەواوی لەو ولاتەدا

بالأدەست بوون هەرچی کتێبی پیرۆزی ئەوان هەیە هەموویان سوتاندن‌و خستیاننە ژێر قاچی خۆیانەوە، هەروەها ئەوەی مەسیحیە توندرەوەکان لەشەڕی چەوساندنەوەی جولەکەکاندا لەئەندەلوس ئەنجامیان دا کە هەڵسان بەسوتاندنی نوسخەکانی تەورات‌و لەناو بردنی کتێبە پیرۆزەکانیان، کەوابوو پانتایی یەکی بەرفراوان هەیە لەنێوان هەڵوێستی ئەورۆمان‌و مەسیحیانەو هەڵوێستی پێغەمبەری ئیسلام دا.

## هاتنی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب:

لەکاتی ئەم غەزاو سەرکەوتنە دا بوو کەجەعفەری کوڕی ئەبو طالیب‌و هاوەڵانی گەڕانەوەو هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەگەڕانەوەی جەعفەرو هاوەڵانی زۆر شادمان بوو، بەخۆشی‌و شادمانی یەوە پێشوازی لێ کردن، ناوچەوانی جەعفەری ماچ کردو فەرمووی سوێندم بەخودا نازانم بەکامیان زیاتر کەیفخۆش ببم بەرزگار کردنی خەیبەر یان بەهاتنەوەی جەعفەر!!

## هەوڵێکی تاوانکارانەی جولەکە:

لەم غەزایەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ژەهر خواردو کرا، ئەوەبو ژنی سەلامی کوڕی میشکەم کەناوی زەینەبی کچی (الحرث) ی جولەکە بوو کاوڕێکی سور کردەوەو بەدیاری بۆ پێغەمبەری نارد، ئەم ئافرەتە گۆشتە سورکراوەکەی ژەهراوی کردبوو، پرسیاری کردبوو ئاخۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئارەزۆی لەکوێی گوشتی ئاژەڵە پێیان گوتبوو لەگۆشتی دەستی کاوڕە، ئەویش بەزۆری ژەهری بەو بەشەی گۆشتە سورکراوەکەوە کردبوو، جاکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستی بۆ دەفەشان‌و قۆڵی بوریانییەکە بردو

تیکەیەکی لێ بچڕی خستیە دەمی خێرا پێ ی زانی و تفی دایەوە، فەرمووی: ئەم ئێسقان و گۆشتە پێم دەڵێن: ژەهراوی کراوین. لەو کاتەدا (بشر) ی کوڕی (البراء) یش تیکەیەکی لەو بوریانیە خستبوە دەمی یەوەو قوتی دابوو.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جولەکەکانی کۆکردەوەو پێ ی فەرموون: ئەگەر پرسیارتان لێ بکەم راستم پێ دەڵێن: وتیان بەڵێ: فەرمووی ئەم بوریانیەتان ژەهراوی کردبوو؟ وتیان بەڵێ: فەرمووی بۆچی و چی پاڵی پێوە نان ئەوە بکەن؟ وتیان: ویستومانە لەدەستت رزگارمان بێ وتوومانە ئەگەر درۆبکاو پێغەمبەر نەبێ ئەوە ژەهرەکە دەیکوژێ و لەدەستی رزگارمان دەبێ، خۆ ئەگەر بە راستی پێغەمبەر بێ ئەوە پێ ی دەزانێ و زیانی پێ ناگا. دوایی ئافرەتەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەرو دانی بەتاوانە کەی دا ناو وتی: ویستومە لەتۆڵەی ئەوەی لەگەڵ خزم و کەسەکانما کردت بتکوژم، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی خودا تۆ بەسەر من دا باڵا دەست ناکا. هاوەڵان عەرزیان کرد ئەرێ لەتۆڵی ئەو تاوانەدا نەیکوژین؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی نەخێر، سزاشی نەداو نەشی کوشت لەهەندێ ریوایەت دا هاتووە دەڵێ موسوڵمان بووە، لەریوایەتێکی تردا دەڵێ: کەبشیری کوڕی بەراء بەژەهرەکە مرد پێغەمبەر فەرمانی کرد زەینەبیان کوشت.[١٩٣]

## کاریگەری غەزای خەیبەر:

غەزای خەیبەرو سەرکەوتنی موسوڵمانان تێ یدا کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی ئەو هۆزە عەرەبانەی تا ئەو کاتە

---

[١٩٣] زاد المعاد جـ ٣٩٨/١ رواه البخاري مختصرا عن ابي هريرة في ( باب الشاة التي سمت للنبي بخيبر).

موسـولْمان نـەبوو بـوون. بێگومـان هێـزو توانـای سـەربازیو ئـابوری جولەکەکان لەقەلاّی خەیبەردا ئاشکراو بەرچاو بوو، هەموو هۆزە عەرەبەکان دەیـانزانی چـەند ئـەو جولەکانـە سـاماندارو خـاوەن کـالاّو چـەكو قـەلاّو سـەنگەرو زەبـرو زەنگـن، هـەرێم دەڤەرەکـەیان چـەند بـەپیتو خـاوەنی چ ثـەروەتو سـامانێکی کـشتو کـاڵینو قـەلاّو دژەکانیـان چـەند قـایمو قـوڵن، چەند سەرکردەو پاڵەوانی جەنگی وەکوو مەرحەبو حاریث ئەبو زەینەبیان هەبوون، هەموو ئەم هێزو توانایەیان حیسابی خۆی بۆ دەکراو ڕۆڵی خۆیـان دەگێڕا. دوکتـور ئیسرائیل ولفنسون لەباسـی غـەزای خەیبـەرو کاردانـەوەی لەمێـژووی ئیـسلام دا دەڵـێ: (ئـەوەی گومـانی تێـدا نیـە ئەوەیـە غـەزای خەیبـەرو سـەرکەوتنی موسـوڵمانەکان تێیـدا کاریگەرییـەکی گـەورەی هـەبوو لەمێژووی فوتوحاتی ئیسلامی دا، چونکە تێکڕا هـەموو هـۆزە عەرەبەکانی وڵاتـی حیجـاز زۆر بـەوردی چـاوەڕوانی سـەرەنجامی شـەڕی خەیبـەریان دەکرد. هەموو کاروباری خۆیان سازدەدا بەگوێرەی ئـەو سـەرەنجامەی کەلـە دیـدی خۆیانـدا دەیـان بینـیو چاوەڕوانی یـەکالاّ کردنـەوەی بوون بـەزەبری شمشێر لەنێوان ئەنصارەکانو جولەکەکان دا.

بێگومـان پێغەمبـەر لـە نـاوخودی مەدینـەو دەوروبـەری مەدینـەو سـارای عـەرەب نـشین دا زۆری دوژمـن هـەبوون، هـەموویان هیـواو ئـاواتی خۆیـان بەئاکامی ئەوشـەڕەوە هەڵواسـی بـوو، لەراستیش دا غـەزای خەیبـەر هـەر بۆ ئەوە نەبوو مەڵبەندی بەرهەڵستکاری جولەکە لەناوبچێ بـەڵکوو مەبەستەکە زۆر لەوە بەر فراوانتر بوو، هەنگاوی بۆ دەستەبەر کردنـی چـەند شـتێکی تـر دەنا کە لەراستی دا لەقەلاّ چۆکردنی هێزی جولەکە کەمتر نـەبوو، یـەکێ لـەو مەبەسـتە سـەرەکییانەی غـەزای خەیبـەر سـەرکوتکردنی بەرهەڵـستکاریو دژایـەتیکردنی گـەورەترین هـۆزی عـەرەبی بـوو، کەلـە نێـوان وڵاتـی نەجـدو حیجاز لەباشورو ناوەڕاست دا نیشتە جێ بوون، ئـەویش هـۆزی غـەطـەفان

بوو، چونکە دەبوایە پێغەمبەر پێش ئەوەی هێزەکەی بەرەو مەککەو بۆ ڕزگار کردنی ئەو مەڵبەندە گرنگە ئاڕاستە بکا، هۆزی (غطفان) سەرکوت بکاو ئەو خەتەرە گەورەیە لەسەر دوا ڕۆژی موسوڵمانان و ئیسلام لابەرێ.

## سەرکەوتن و دەستکەوت:

دوای ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کاروباری خەیبەری یەکالا کردەوە، هێزەکەی بەرەو (فەدەك)[١٩٤] ئاراستە کرد، کەلەشکری موسوڵمانەکان لێیان نزیك بوونەوە، زانییان کار لەکار ترازاوە، شاندێکیان ناردە لای پێغەمبەرو داوای ئاشتی و ڕێك کەوتنیان لەگەڵ دا کرد، ڕازی بوون نیوەی فەدەك بدەن بەموسوڵمانان و پێغەمبەریش بەوە ڕازی بوو، ئیتر لەوەدوا پێغەمبەر ئەوبەشە داهاتەی (فەدەك)ی لەبەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان دا خەرج دەکرد. بۆ کوێ پێویست بوایە بۆ وێی دەنارد ئەمجار تەشریفی بەسوپایەکەیەوە هات بۆ سەر دەڤەری (وادی القری)[١٩٥] کۆمەڵە گوندو دێهاتێك بوون کەوتبوونە خەیبەرو تەیما، پێش هاتنی ئیسلام جولەکەکان ئاوەدانیان کردبوونەوەو کردبوویانە مەڵبەندێکی گرنگی خۆیان، ئەمجار کۆمەڵێك عەرەبیشیان ڕەگەڵ کەوتبوون. کەئایینی ئیسلام هات پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان و موسوڵمانبوون، ئەوەی پێ

---

(١٩٤) فەدەك کەوتۆتە بەرزایی یەکانی حیجازو دانیشتوانەکانی جولەکە بوون، بڕێکیشی لەهۆزی (بنی مرة) و (بنی سعد) لێ هەبوون، وەکوو حکوومەتێکی نیمچە سەربەخۆ وابوون.

(١٩٥) وادی القری، دۆڵێکە زۆری گوندی تێدان بۆیە پێیان گوتوە (وادی القری) دانیشتوانەکەی جولەکەو عەرەب بون، ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەتی ولاتی نیوە دورگەی عەرەبە معجم البلدان ج ٧ پیتی واو.

راگەیاندن، ئەگەر موسوڵمان بن ماڵو گیانیان پارێزراو دەبێ و حیسابیان لای خودا دەبێ، ڕۆژی قیامەت خودا بەگوێرەی نیە تپاکی و دڵسۆزییان بۆ ئیسلام پاداشیان دەداتەوە. وەلێ جولەکەکان دەستبەرداری ئایینی خۆیان نەبوون سەرەنجام پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جەنگی لەگەڵ دا کردن، (الزبیر) ی کوڕی (العوام) پاڵەوانی ئەم غەزایە بوو، پاش کەمێك پێکدادانو شەڕو بگرەو بەردە موسوڵمانەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، جولەکەکان ناچار بوون چییان هەبوو تەسلیمی موسوڵمانە کانیان کرد، دەستکەوتی زۆر لەماڵو ناو ماڵ کەوتە دەست جەنگاوەرانی ئیسلام، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دابەشی کرد بەسەریان دا. زەوی زارو باخە خورماکانیشی دایەوە بەجولەکەکانو مامەڵەی سەرانەی لەگەڵ کردن. کەهەواڵی ڕوداوەکانی ( خەیبەرو فەدەكو وادیلقورا) بەجولەکەکانی تەیما گەیشت یەکسەر بەپیر سوپای ئیسلامەوە چونو صولحیان لەگەڵ پێغەمبەر کردو ئامادە باشی خۆیان بۆ سەرانە دانو مەرجەکانی موسوڵمانان راگەیاند، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەسوپاکەیەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە.

## بێ تەماعیو قەناعەتی موسوڵمانە کۆچکەرەکان:

کەموسوڵمانەکان گەڕانەوە مەدینە، کۆچکارەکان کەلەوە پێش بە پێ ی ئەو پەیمانە برایەتیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نێوان ئەوانو یاریدە دەران دا بەستبووی و هەندێ ماڵو موڵکیان پێ بەخشرا بوو، گەڕاندیانەوە بۆ یاریدە دەران، چونکە ئەوان بەهۆی دەستکەوتی خەیبەرەوە بێ ئاتاج و بوو بونو ماڵو سامانو باخە خورمایان پێ بڕا بوو!!! لەوە پێش ئوممومسەلیم کەدایکی ئەنەسی کوڕی مالیك بوو هەندێ بڕە خورمای پێشکەشی پێغەمبەر کردبون، ئەویش ئەو بڕە خورمایانەی دابون بەئوممو ئەیمەن کە

مەولاتی) بوو، لەدوای غەزای خەیبەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بڕە خورماکانی دایەوە بە ئوممو سولەیم و لەجێگای هەر بڕە خورمایەك دەبڕە خورمای لەو باخە خورمایەی لەخەیبەر بەری کەوتبوو دان بە ئوممو ئەیمەن.[196] لە دوای غەزای خەیبەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر مەفرەزەو دەستە جەنگاوەری ڕێکخستن و بەسەرۆکایەتی یەکێك لەهاوەڵانی خۆی ناردنی بەم لاو ئەو لای مەدینەدا، هەندێکیان توشی ڕووبەڕووبوونەوەو شەڕ هاتن و هەندێکیان بەبێ شەڕ گەڕانەوە.

## ئەنجامدانی عەمرەتولقەضا:

لەساڵی داهاتوودا واتە ساڵی حەوتەمی کۆچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ هاوەڵانی لەمەدینەوە بەرەو مەککە بەمەبەستی ئەنجامدانی (عەمرە) کەوتە ڕێ، قوڕەیشییەکان بەپێ ی ڕێ کەوتنی ساڵی پێشوو ڕێگایان بۆ موسوڵمانەکان چۆڵ کردو هیچ بەرگری یەکیان نەکرد، دەرگای ماڵەکانی خۆیان داخست و چوونە سەر کێوی (قعقیعان). پێغەمبەرو هاوەڵانی سێ ڕۆژ مانەوەو عومرەیان بەجێ هێنا. ئەوەش ئەوەیەکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا. (٢٧) سورة الفتح﴾

---

[196] زاد المعاد جـ ١/٤٠٦ ئیمامی موسلیم بەدورو درێژی ئەم بەسەرهاتەی ریوایەت کردوە لەبابی ( ردا المهاجرين الى الأنصار منائحهم من الشجر والثمر حين استغنوا عنها بالفتوح.

## پێشبڕکێ لە بەخێو کردنو لەخۆگرتنی کچو یەکسانی موسوڵمانان لەماف دا :

بەبلاوبوونـەوەی ئیـسلامو جـێگیر بـوونی یاسـاکانی دڵو دەروونـەکان گۆڕانیـان بەسـەردا هـات، عـەقڵو ئاوەزەکـان کرانـەوە، کـچ کـە پیـاو ماقوڵـە عەرەبەکان بەلەککەو حەیا بەرەیان دەزانیو هـەر کـە کچیان دەبوو ڕەنگیـان ڕەش دا دەگیرساو بەنو شوستی لەقەڵەمیان دەداو دەکەوتنە بیرو بۆ چونی ئەوە ئایا ئەم زیندەوەرە حەیابەرە بێڵنەوەو قبووڵی ئەم نوسوشتی یە بکـەن یـان زینـدە بەچـاڵیان دەکـردن. وەڵێ بـەهاتنی ئیـسلام ئـەم دیاردەیـە نـەك هەرنەما، بەڵکوو ئافرەت بەگشتیو کچ بەتایبەتی ڕێزی شیاوی خۆیـان پـێ درا، کچۆڵە لەجیاتی ئەوەی زیندە بەچاڵ بکرێ بوو بەریحانـەو گـوڵو بۆنی پێـوە دەکرا، موسـوڵمانان کەوتنـە پێشبڕکێ لـەوەدا هـەر کەسـە چۆن کـچی خـۆی پـەروەردە بکـاو پـێ ی بگەیـەنێ. هـەموو موسـوڵمانان یەکسان بـونو کـەس لەکـەس گـەورەتر نـەبوو مەگـەر بەتـەقواو خـودا پەرسـتی. کاتێـك پێغەمبەر ویستی لەمەککە دەربچێ کچە بچکۆلەکەی حـەمزە بەمامـە مامـە! شـوێنی کـەوت، عـەلی لەباوەشـی گـرتو لاواندیـەوە، دوایـی دەسـتی گـرتو بەفاطیمەی گوت: ئاگات لەکچە بچکۆلەکەی مامت بێ، فاطیمەش لەباوەشـی گـرت، ئـیتر عـەلیو زەیـدو جەعفـەر لەسـەر ئـەو کـچۆڵە کەوتنـە کێشەو مقـۆ مقۆوە، عەلی وتی: من بەخێوی دەکەمو کچی مامەمەو یەکـەمجار مـن دەسـتیم گرت. جەعفەر وتی: من لەخۆی دەگرم کـچی مامـەو پـوری خێزانمـە، زەیـد وتی: نەخێر مـن لـەخۆی دەگـرم کـچی بـرای خـۆمـە، پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) بڕیاری دا پورەکەی لەخۆی بگرێ، فەرمووی پور لەشوێنی دایکە. بە (عـەلی) یشی فـەرموو: ئـەتۆ لـەمنیو مـن لـەتۆم، بەجەعفەریـشی فـەرموو تـۆ لـە مـن دەچـی لـەبارەی شـێوەو ڕوخسارو ڕەوشـتەوە. بەزەیدیشی فـەرموو تـۆ بـراو خۆشەویستمانی.

# غەزای مۆتە[١٩٧] مانگی جیمادی یەکەم ساڵی هەشتەمی کۆچی:

## کوشتنی سەفیری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) (الحارث) ی کوڕی عومەیری ئوزدی بەنامەیەکەوە نارد بۆ لای (شرجیل) ی کوڕی عەمری (الغساني) فەرمانڕەوای (بصری) و سەر بەقەیصەری ڕۆم، کەنامە بەر گەیشتە لای شورەحبیل لەجیاتی ئەوەی ڕێزی لێ بگرێو بەپیر بانگەوازی ئیسلامی یەوە بێ، قوڵبەستی کردو لەملی دا، ئەم زاڵمە نا پیاوی یەکی زۆر ناشرینی ئەنجام دا، چونکە داب و نەریتی وانەبوو سەفیرو نامە بەر بکوژرێن لەلایەن پاشاو فەرمانڕەوایانەوە، هەرچەندە دوژمنایەتی نێوان نامە نێرو نامە بۆ لانێراود زۆر توند بێ و رقی لەناوەڕۆکی نامەکە بووبێ، چونکە نامە هەڵگر راسپاردەیە راسپاردانیش هیچیان لەسەر نیە. هەڵبەتە کوژرانی نامەبەری پێغەمبەری خودا روداوێك بوو نەدەبوو چاو پۆشی لێ بکرێ، داهێنانی ئەم دابە خەتەرێکی گەورەی تێدا بوو، بۆ سەر گیانی نامە بەرو سەفیرو راسپێراوان سوکایەتیکردن بووبەنامە نێرو خودی نامەکە، کەوابوو زۆر پێویست بوو شورە حبیل ئەوەی بەسەرەوە نەچێ و تەمبێ بکرێ، تۆڵەی کوشتنی ئەو نامەبەرەی لێ بکرێتەوە، بۆ ئەوەی گیانی سەفیرو راسپاردەکان پارێزراوبێ.

---

[١٩٧] مۆتە: گوندێکە لەئەردەن دوانزە کیلۆ مەتر لەباشووری کەرەك دوورە. مەسافەی نێوان مەدینەو گوندی مۆتە ١١٠ کیلۆ مەترە موسوڵمانان بەسواری ئەسپ و حوشتر ئەو ڕێگە دوورە یان بڕی خۆراك و تێشویان لێ بڕا.

## بۆ یەکەمجار سوپای ئیسلام پێ دەخاتە خاکی ڕۆمەوە:

کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی کوژرانی نامە بەرو نێرراوەکەی خۆی پێگەیی، بڕیاری دا سوپایەك بنێرێ بۆ (بصری) لەمانگی جیمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا سوپاکەی ڕێك خست، نزیکەی سێ هەزار جەنگاوەری موسوڵمان ئامادە بوون، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زەیدی کوڕی حاریثەی کردە فەرماندەیان: کە مەولای پێغەمبەر بوو، لەناو سوپاکەدا، گەورە گەورەی هاوەڵان لەکۆچکەران و یاریدەدەرانی تێدا بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کەزەید شەهید بوو جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب بکەنە فەرماندەی سوپاو ئاڵاکەی بدەنێ، ئەگەر جەعفەریش شەهید بوو عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە بکەنە فەرماندەی سوپاو ئاڵاکەی بدەنە دەست. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی ئامادەی بەرێ کردنی سوپاکە بوو، خەڵکێکی زۆریش لەخزمەتیا بوون بۆ خودا حافیزی کردن لەفەرماندەو سوپاکە، سوپای ئیمانداران لەمەدینە دەرچوو بەرەو شام، هەنگاویان بۆ سەفەرێکی دورو درێژو پڕ لە نارەحەتی هەڵهێنا، بەرەو ڕوبەڕوبوونەوەی دوژمنێکی بەهێزو تەیارو خاوەن دەسەڵات کەوتنە ڕێ، دوژمنێك کەگەورە ترین ئیمپراتۆرییەتی ئەو ڕۆژگارە پشتگیری لێ دەکرد، سوپا درێژەی بەڕۆیشتنی خۆی دا تاگەیشتە خاکی (معان) کەسنووری دەوڵەتی ڕۆم بوو، لەوێ موسوڵمانەکان هەواڵیان پێ گەیی کە هیر قەل بەسوپایەکی سەد هەزار کەسی یەوە لە (البلقاء) لەشکر بەزی کردوە کۆمەڵێکی زۆریش لەهۆزو تیرە عەرەبەکان (لحم، جذاب، بلقین، بةهرا، بلی) پەیوەندییان پێوە کردون و سوپاکەی دوژمن هێندەی تر زۆر بووە، سوپای موسوڵمانەکان دوو شەو لەمعان مانەوە، لەبارو دۆخەکە ورد دەبوونەوەو هێزی خۆیان و هێزی دوژمنیان بەراود دەکرد، وتیان باواقیعی حاڵ بۆ پێغەمبەر بنووسین،

چەندییەت و چۆنیەتی هێزی دوژمنی بۆ رون بکەینەوە، یان هێزی ترمان بۆ دەنێرێ یان فەرمانێکمان بۆ دەربکا و پابەندی دەبین.[١٩٨] عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە تەشجیعی خەڵکەکەی کرد، وتی: گەلۆ! سوێند بەخودا ئەوەی ناخۆشتان دەوێ ئەوەیە بۆی هاتوون، کەشەهید بوونە. ئێمە شەڕ لەگەڵ دوژمن بەپێ ی ژمارەو هێزو زۆری و کەمێ ناکەین، ئێمە تەنهاو تەنها بەهێزی ئەم ئایینە شەڕیان لەگەڵ دەکەین، کە خودا بەهۆیەوە رێزی لێ گرتووین، گەلۆ هەستن لەخۆ کەون، پەلاماری دوژمن بدەن، ئێمە یەکێك لەم دوو سەروەری یەمان بۆ دەستەبەر دەبێ یان سەرکەوتن یان شەهید بوون ئیتر جەنگاوەران بڕیاری شەڕ کردنیاندا.

کاتێك موسوڵمانەکان لەدەوروبەری (البلقاء) بوون لەنزیك گوندێك کەپێ ی دەگوترێ (مشارف) روبەرو بوونەوە لەگەڵ چەند تاقم و گروپی سوپای رۆم و خێڵە عەرەبەکانی کە پەیوەندییان بەسوپای رۆمەوە کردبوو، دوژمن لێیان نزیك بوونەوە، موسوڵمانەکان کشان بۆ لای گوندێك کە پێ ی دەگوترا: (مۆتە) تێکرژان و شەڕ بەر پابوو، زەید کە ئالاّی لەشکری هەڵگرتبوو شەڕێکی نەبەردانەی کرد هەتا شەهید بوو، هەموو لەشی سەرە رم بوو، ئەمجار جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب ئالاّکەی گرتە دەست و شەڕی کرد هەتا وای لێ هات برستی لێ بڕێ، بەئەسپەکەیەوە خۆی فڕێ دایە ناو سوپای دوژمنەوە، ئەسپەکەی ئەنگیۆراو لێ ی دابەزی کەوتە شمشێر وەشاندن، قۆڵی راستی بەشمشێر پەڕێندرا، بەدەستی چەپی ئالاّکەی گرت، دەستی چەپیشیان قرتاند ئەمجار بەهەر دوقۆڵی ئالاّکەی لەباوەش گرت هەتا شەهید بوو، ئەو کاتە تەمەنی سی و سێ ساڵ بوو، موسوڵمانەکان بەسینگ و ناوشانی و پێشەوەی زیاد لەنەوەد برینیان ژمارد کە بەشمشێرو

---

[١٩٨] زاد المعاد جـ ٤١٥/١.

سەرەرم لێ ی درابوو، هەموو ئەم برینانەی لەپێشەوە بوون بەو شێوە ئەو گەنجە خوێنگەرمە جوانمەردە لەمەیدانی شەڕدا گیانی دەرچوو نەفسی دەیکورکاند بۆ بەهەشتو گۆرانی بۆ نازو نیعمەتە کانی دەگوتن. گاڵتەی بەدوژمن دەهات، باکی لەزۆری و بەهێزی دوژمن نەبوو، ژیانی دونیاو خۆشی ژیانی بەلاوە مەبەست نەبوو: کە جەعفەر شەهید بوو، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی گرتە دەستو بەرەو ڕوی دوژمن پێشڕەوی کرد، لەئەسپەکەی دابەزی، ئامۆزایەکی ئێسقە گۆشتێکی کولاوی بۆ هێنا هەندێکی گوشت پێوە بوو وتی: کەمێك بەخواردنی ئەم گۆشتە خۆت بەهێز بکەرەوە، ئاگام لێیە چیت بەسەر هاتووە چۆن لەبرسان شەپرزە بووی! ئەویش لێ ی وەرگرت بەددان هەندێ گۆشتی لێ پچڕیو خواردی ئەمجار فرێی داو شمشێرەکەی بەدەستەوە گرتەوەو چووە پێش شەڕی کرد تا شەهید بوو.[١٩٩] لەدوا ئەوە موسوڵمانەکان بڕیاریان دا خالیدی کوڕی وەلید بکەنە فەرماندەی خۆیان. ئەویش ئاڵای بەدەست وەرگرت جەنگاوەرەکانی هەڵنان بۆ ورە بەرزیو بەر خودان، خالید فەرماندەیەکی عەسکەری ئازاو لێوە شاوەو داناو زانا بوو لەسیاسەتی جەنگا زۆر شارە زابوو، بەپێ ی ئەم لێزانیو دوربینی یەی خۆی. وای بەباش زانی سوپای ئیسلام بەرەو باشور ئاڕاستە بکا، دوژمنیش بەرەو باکور ئینسحابی کرد، شەو داهاتو مەیدانی شەڕ چۆڵ بوو، هەردولا حەزیان لەپشودان و ئارامی بوو هەردولا شەڕ نەکردنیان بەلاوە بەپەسەندزانی. خالید ویستی بەشێوەیەکی ڕێكو پێك پاشە کشە بەسوپاکەی بکا، ئاشکراشە پاشە کشە کردن بە سوپا لەبەرەکانی جەنگ- وەکوو لیوا روکن مەحموود شیت خطاب دەڵێ: پاشەکشە کردن بەسوپا گرانترین کاری فەرماندەی سوپاکەیە، دەبێ زۆر

---

[١٩٩] زاد المعاد جـ ٤١٥/١ سیرة ابن هشام جـ ٣٧٩/٢.

بەلێزانی و وردبینی یەوە سەرو کاری پاشەکشە کردنەکە بکا، بۆ ئەوەی پاشە کشە کردنەکەنەبێتە تێ شکان و هەلاتن و روخانی ورەی جەنگاوەرەکان، چونکە تێ شکان و هەلاتن کاریگەیەکە سەر دەکێشێ بۆ بەفیڕۆدانی گیانی زۆر لەهەلاتووەکان.

هەڵبەتە ئەو خەسارەتە کەمەی لەجەنگی (موتە) دا لە موسوڵمانەکان کەوت بەراورد ناکرێ بەو هەموو سودو قازانجە سەربازییەی کە موسوڵمانەکان دەستیان کەوت لەئاکامی ئاگادار بوونیان بەسەر تایبەتمەندییەکانی سوپای رۆم و شێوەی رێکخستنەکانیان و جۆری چەك و شێوازی شەڕ کردنیان. کەلەشەڕەکانی داهاتویان دا موسوڵمانەکان لەو ئەزمون و زانیاریانەیان کەڵکیان وەرگرت و سەرکەوتن و سەرووەرییان بەدەست هێنا[٢٠٠] یەکێك لەتاکتیکە سەربازییەکانی خالید ئەوە بوو ژمارەیەکی زۆری لەجەنگاوەرانی موسوڵمان بەشەو لەهێڵی دوای سوپاوە ا، فەرمانی پێ کردن کە ڕۆژ بووەو دونیا روناك بوو بیکەنە رمبازی و تەپ و تۆزو چڕو صەلاوات و قریوە، وانیشانی سوپاسی دوژمن بدەن کەلە مەدینەوە کۆمەکیان بۆ هاتووەو بەردەوامیش کۆمەکی تر دێ، بەمە ترسی خستە دڵی سوپای دوژمنەوەو وتیان ئەگەر ئەمانە بەسێ هەزار شەڕکەرەوە ئەوە زەبرو زەنگیان بێ، ئەی دەبێ ئەگەر کۆمەك و یارمەتدەری تریان پێ بگا چۆن بن، بەتایبەتی کە ئێمە نەزانین ئەو کۆمەکەی بۆ یان هاتووەو بۆیان دێ چۆنەو چەندە، لەبەر ئەمە رۆمەکان نەوێران هێرش بکەنە سەر موسوڵمانەکان و خودا شەڕی نابەرامبەری لەموسوڵمانەکان دوور خستەوە.

---

[٢٠٠] الرسول القائد/ محمود شيت خطاب ص ٢٠٦-٢٠٧.

لەسەرێكی ترەوە لەو كاتەدا جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام روبەروی ئەو شەڕە نابەرامبەرە بوو بوونەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینە سات بەسات روداوەكانی شەڕەكەی بەموسوڵمانان رادەگەیاند، ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێ: هێشتا هیچ دەنگو باسێكی شەڕەكە نەهاتبوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی كوژرانی زەیدو جەعفەرو عەبدوڵڵای كوڕی رەواحەی بەخەڵكەكە راگەیاند، فەرمووی: زەید ئالآكەی هەڵگرتو ئەنگیوراو شەهید بوو، جەعفەر ئالآكەی گرتە دەستو ئەویش شەهید بوو، كوڕی رەواحە ئالآكەی هەڵگرتو شەهید كرا، لەو كاتەدا كە ئەم هەواڵانەی رادەگەیاندن خوڕ خوڕ فرمێسكی چاوی دەهاتنە خوار. پێغەمبەر بەردەوام بوو لەرانواندنی روداوەكانی جەنگە كە تاگەیشتە ئەوە فەرمووی: شمشێرێك لەشمشێرەكانی خودا (مەبەستی خالیدی كوڕی وەلید بوو) ئالآكەی گرتە دەستو سەركەوتنی بەدەست هێنا.[٢٠١]

لەریوایەتێكی تردا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەم فەرمایشتانەی لەسەر مینبەر فەرموون. ئەوەشی فەرموو: ئەوان پێیان خۆش نیە ئەگەر لامان بوونایە.

دەربارەی جەعفەریش فەرمووی: بێگومان پەروەردگار لەبەهەشت دا دوباڵی بۆ جەعفەر دروستكردون بۆ كوێی بوێ پێیان دەفڕێ[٢٠٢] بۆیە ناز ناوی جەعفەر وشەی (الطيار) یان (ذي الجناحين)ە .

---

[٢٠١] رواه البخاري (باب غزوة مؤته).

[٢٠٢] روى البخاري فيي صحيحه، ئیبنو عومەریش كە سڵاوی لەكوڕەكەی جەعفەر دەكرد دەیفەرموو (السلام عليك يا ابن ذي الجناحين).

## خۆشەویستی یەکی پێغەمبەرانەو سۆزێکی مرۆڤانە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەخێزانی جەعفەری فەرموو: کوڕەکانی جەعفەرم بۆ بێنە، کەهاتنە خزمەتی یەکە یەکە بۆنی پێوە کردن‌و لە ئامێزی گرتن‌و فرمێسکی هەڵوەراندن، ئەمجار هەواڵی شەهید بوونی جەعفەری پێ دان، کە ئەم هەواڵە ناخۆشە یان پێ درا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەماڵ‌و خێزانی خۆی فەرموو: خواردن بۆ ماڵ‌و خێزانی جەعفەر دروست بکەن، چونکە کارەساتیان لێ قەوماوەو نایان پڕژێ خواردن بۆ خۆیان دروست بکەن، غەم‌و خەفەتێکی زۆریش بەروخساری پیرۆزییەوە دیار بوو، زۆری پەرۆشی جەعفەر بوو. جاکاتێك سوپای ئیسلام لەغەزای موتە گەڕایەوەو نزیکی مەدینە بووەوە، پێغەمبەرو موسوڵمانان بەرەو پیریان چون‌و پێشوازییان لێ کردن، لەقەراخ شار منداڵە ورکە تێیان وروکان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ پێشوازی کەران دا بەسواری وڵاغێك دەگەڕایەوە، فەرمووی: منداڵەکان هەڵگرن بیانخەنە باوەشی خۆتانەوە، کوڕی جەعفەرم بدەنێ بالە ئامێزی بگرم. عەبدوڵڵایان بۆ هێنا لەئامێزی گرت‌و لەپێش دەمی خۆیەوە داینا. هەندێ لەخەڵکەکە گڵ‌و خۆڵیان بەسەر سوپاکە دادە کردو هاواریان دەکرد ئەی هەڵاتوە بەزیوەکان! ئەوە لەڕێگای خوادادا هەڵاتون! پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: نەخێر هەڵاتوونین بەڵکوو هێرش بەرن خودا یاربێ هێرش دەکەنەوە!

## لەنێوان غەزای مۆتەو رزگار کردنی مەککەدا:

لەنێوان غەزای مۆتەو رزگار کردنی مەککەدا چەند دەستەو مەفرەزە بەم لاولادا نێر دران لەوانە سەریەی ذا تولسەلاسیل. کەلە مانگی

جیمادیلئاخیرەی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا بوو (ذا تولسەلاسیل) کەوتۆتە پشت وادیلقوراوە، لەوڵاتو هەرێمی (قضاعە).

ناردنی ئەم سیریە بۆ چاو ترساندنی هۆزی قوزاعەو بەربەست کردنیان لەوە هێرش بکەنە سەر مەدینە، هەروەها بۆ چاو شکاندنی تیرەو هۆزەکانی تری ئەو ناوە بەگشتی سیریەی خەبط. مانگی رەجەبی ساڵی هەشتەمی کۆچی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەفەرماندەیی ئەبو عوبەیدەی کوڕی (الجراح) ئەم سیریەی نارد بۆ سەر هۆزێکی جوهەینەیی کەلە قەراخ دەریا دەژیان، ژمارەی جەنگاوەرانی ئەم هێزە سێسەد پیاو بوو، لەرێگا تووشی برسیایەتیەکی کوشندە بوون، تەنانەت ئەوەندەیان برسی بوو گەڵایان خوارد، دەریا ماسییەکی گەورەی بۆ کەنار خستن لە جۆری (عنبر) بوو ماوەی پانزە رۆژ لێیان خوارد رۆنیان لێ گرت، خۆیان پێ هەنو، برینو قڵشاوی جەستەیان پێ چاککردنەوە. جاکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەم هەواڵەی بیست فەرمووی: ئەوە رزقو رۆژی یەکە خودا لەدەریا بۆی دەرهێناون. کەمێکیشی لەگۆشتی ماسی یەکە خوارد.

# رزگار کردنی مەککە مانگی رەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی

## بەرکولێك بۆ رزگار کردنی مەککە:

بەرە بەرە ئایینی ئیسلام بلاو بووە، لەناو دڵەکان دا چەکەرەی کردو روا، چەسپاو گەشەی کرد، موسوڵمانان بەو ئایینە پیرۆزە پەروەردە بونو هێزیان پەیدا کرد تەقواو خودا پەرستی چوە ناو خوێنو گۆشتیانەوە،

لەولاشەوە قورەیشییەکان جامی رق‌و کینەیان پڕ بوو، خەریك بوو لەخەفەت‌و حەسوودی دا بتەقن، هەموو هەوڵێکیان ئەوە بوو بەر لەئایین بگرن‌و دژی خوداو پێغەمبەر بجوڵێنەوە، ( بەڵام ئەوەی لابەندە خەیاڵە لای خودا بەتاڵە). ویستی خودا وابوو بەتەواوی رۆگەی موسوڵمانان لەبت‌و بتپەرستی پاك بکرێنەوە، نوری ئیسلامی تێدا بڵاو ببێتەوە، پێغەمبەرو موسوڵمانان بەسەر کەوتوویی بچنە ناو مەککەو لەکوفرو ستەم رزگاری بکەن، پلە و پایەی شیاوی خۆی پێ بدرێتەوە، ببێتەوە شوێنی خودا پەرستی‌و ئەمن‌و ئاسایش‌و مەڵبەندی خودا پەرستان. پەروەردگار ویستی وابوو بۆ ئەم مەبەستە هۆکار رێك بخا، قورەیشیەکان بۆ خۆیان بوونە رێکخستنی هۆکارەکان، بەبێ ئەوەی پێ بزانن رێخۆشکەرەیان بۆ رزگار کردنی مەککە رەخساند، ئەوە بوو روداوێك روی دا نەك رێگای خۆش کرد بۆ رزگار کردنی مەککەو بەس! بەڵکوو بەپێویستیشی داناو جەختی لەسەر کردەوە، خودا بۆ خۆی کەریمی کار سازە، هۆکارەکانی سازدان بۆ رزگار کردنی مەککە، (ولله جنود السموات والأرض)چ هێزو توانا هەیە لەئاسمانەکان‌و زەوی دا هەمووی هی خودایە. ئەوە بوو لەصولحی حودەیبییە دا ئەوە چەسپابوو هەرکەسێك بیەوێ بچێتە ناو پەیمانی پێغەمبەرەوە عەهدو پەیمانی ئەو قبوڵ بکەن دەتوانن بچنە ناو ئەو عەهدو پەیمانەوە، هەرکەسێکیش پێ ی خۆشە بچێتە ناو پەیمانی قورەیشییەکانەوە دەتوانێ بچێ. بەپێ ی ئەم خاڵەی ناو پەیمانی حودەیبییە، بەنو بەکر چوونە ناو پەیمان‌و عەهدی قورەیشەوە، هۆزی خوزاعەش چوونە ناو پەیمان‌و عەهدی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) هەر لە کۆنیشەوە واتە پێش هاتنی ئیسلام دوژمنایەتیەکی توند لەنێوان هۆزی بەنو بەکرو هۆزی خوزاعەدا هەبوو خوێنێکی زۆر کەوتبوە نێوانیانەوە،

ئیسلام هات پەردەیەکی پێ دا دا خەڵکەکە بەهۆی بڵاو بونەوەی ئیسلامو روداوەکانی نێوان موسوڵمانانو قورەیشییەکان ئەو دوژمنایەتیەیان کەمێك لەبیر چوەوە، کەپەیمانی حودەیبییە مۆر کرا هەریەکێ لەو دوو هۆزە پاڵیان دا بەلایەکەوەو کەوتنە بەرامبەر یەك هۆزی بەنو بەکر ویستیان هەل بقۆزنەوەو تۆڵەی خوێنی کۆنی خۆیان لەهۆزی خوزاعە بکەنەوە، لە کاتێك دا چەند پیاوێکی هۆزی بەنو بەکر پارێزیان بردنێو دەستی خۆیان لێ وەشاندن ژمارەیەکیان لێ کوشتن ئیتر بەتیرو شیر کەوتنە شەڕ لەگەڵ یەکتری قورەیشییەکان یارمەتی جۆراو جۆریان بە هۆزی بەنو بەکر کرد تەنانەت هەندێ پیاو ماقوڵو جەنگاوەریان بەدزی یەوە بەشەو لەتەك بەنو بەکردا هێرشیان کردە سەر خوزاعەو ناچاریان کردن بەرەو حەرەم رەو بکەن، کاتێ گەیشتنە ناو حەرەم بەنو بەکرییەکان بەهەندێ لەپیاوانی خوزاعەیان گوت: ئێمە هەموومان کەوتینە خاکی حەرەمەوە کە شەڕو کوشتار لەبەینمان دا نەمێنێ، وتیان ئەوە نابێ ئێوە هەلتان قۆزتەوەو تۆڵەی خۆتان کردەوە، لەمەو دوا ناهێڵین چیدی هەلتان بۆ هەڵبکەوێ.

لەهەمان کات دا عەمری کوڕی سالمی خوزاعی بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ و چووە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) و لە بەردەمیا وەستاو چەند شیعرێکی حەماسەت خوڵقێنی خوێندنەوە، باسی ئەو پەیمانو بەڵێنانەی نێوان هۆزەکەیو پێغەمبەری کرد، داوای لێ کرد یارمەتییان بداو نەهێڵێ غەدریان لێ بکرێ، سکاڵای خۆی کردو ئەوەی راگەیاند کەقورەیشییەکان پەیمانیان شکاندوەو یارمەتی بەنو بەکریان داوە لەسەر ئاوو مڵکی خۆمان لەکاتێك دا چەند پیاوێکمان خەریکی نوێژ کردن بوون قورەیشو بەنو بەکر لەناکاو پەلاماریان داونو ژمارەیەکیان لێ کوشتوین!! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەی عەمرو دڵنیابە یارمەتیتان دەدەینو تۆڵەیان لێ دەکەینەوە!

## بەرائەی ذیممەو بەڵگە لەسەر راستکردنەوە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ویستی هەواڵەکە رونبکاتەوەو بیانووی قورەیشییەکان ببڕێ، پیاوێکی ناردە لایان سێ رێگای بۆ دانان:

١. خوێنی کوژراوەکانی هۆزی خوزاعە بدەن.

٢. یان خۆیان بێ بەری بکەن لە پەیمانی ئەو کەسەی هەڵساوە بەو پەیمان شکێنی یەو هێرشی بردۆتە سەر هۆزی خوزاعەو ئەو تاوانە گەورەی ئەنجام داوە. کەبەرەبابی (بنو نفاسە) ی هۆزی بەنو بەکر بوون.

٣. یان ئیعلانی ئەوە بکەن کەپەیمانەکەی حودەیبییە ئەوان ناگرێتەوە. هەندێ لەپیاو ماقوڵانیان وتیان: بەڵێ: عەهدو پەیمانەکەیان بۆ فڕێ دەدەینەوە. بەمەش ذیممەی قورەیشییەکان پاك بۆوە، بەڵگەیان لەسەر راستکرایەوە.

## هەوڵدانی قورەیش بۆ تازە کردنەوەی پەیمانەکە

قورەیشییەکان لەو هاوکاریکردنەی خۆیان بۆ بەنو بەکر پەشیمان بوونەوە، لەوولامەش پاشگەزبوونەوە کە هەندێ بێ عەقڵەکانیان ولامی پێغەمبەریان دابووەوە ئەبو سەفیانیان نارد بۆ مەدینە بۆ ئەوەی ماوەی ئاگر بەستەکە درێژ بکەنەوەو پەیمانەکەش زیاتر توندو تۆڵ بکەنەوە، کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی هاتنی ئەبو سەفیانی بیست فەرمووی: من بزانم ئەبو سەفیان بۆ ئەوە هاتووە پەیمانەکە توندو تۆڵ تر بکاو ماوەکەشی درێژبکاتەوە. ئەبو سەفیان کاتێ گەیشتەمەدینە چووە ماڵی کچەکەی خۆی ئوممو حەبیبە کە خێزانی پێغەمبەر بوو، کاتێك ئەبو سەفیان ویستی دانیشی لەسەر فەرشەکەی پێغەمبەر ئوممو حەبیبە خێرا فەرشەکەی

پێچایەوەو لای برد، ئەبو سەفیان وتی: ڕۆڵە لەبەرمن جێگاکەت لابرد یان لەبەر جێگا کە بوو؟ ئوممو حەبیبە بێ پەردە وتی: ئەوە جێگای پێغەمبەرە تویش بتپەرستی پێم ناخۆش بوو لەسەری دابنیشی. وتی: بەخودا ڕۆڵە تویش دوای من توشی خراپی بووی!!!

ئەمجار ئەبو سەفیان چووە خزمەت پێغەمبەرو زۆری لەگەڵ گوت و ئەو هیچ وڵامی نەدایەوە، پاشان چووە لای ئەبوبەکر بەڵکوو قسەیەکی بۆ لەگەڵ پێغەمبەر بکا، فەرمووی من لەو بارەوە هیچ بە ئەو ناڵێم. چووە لای عومەرو عەلی و فاطیمە کەس وڵامی نەدایەوە ئیتر ئەبو سەفیان کەوتە حاڵەتی سەر لێ تێکچوونەوە نەیدەزانی چی بکا.

ئەبو سەفیان بەدەستی بەتاڵەوە گەڕایەوە بۆ مەککەو لێشی مەعلووم بوو کە پێغەمبەر بەرامبەر ئەم پەیمان شکاندن و دەست درێژی کردنەی قورەیش بۆ سەر هاوپەیمانەکانی بێ دەنگ نابێ. جا کە ئەبو سەفیان چیرۆکەکەی بۆ قوڕەیشییەکان گێڕایەوە. وتیان: شتێکت بۆ هێناوینەوە نە پێداویستی ئێمە نەهی تۆ داین ناکا. بەدەستی بەتاڵ گەڕاویتەوەو هیچت بەهیچ نەکردوە، هەی هاوار بۆ چی کابرا (مەبەستیان پێغەمبەرە) وای لێهات گاڵتەت پێ بکا!؟!

## ❧ خۆ ئامادەکردنی پێغەمبەر بۆ ڕزگار کردنی مەککەو نامەی (حاطب) کوڕی بەلتەعە:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی بەموسوڵمانان کرد خۆ ئامادە بکەن، هەوڵیشی دا ئەم خۆ ئامادە کردنەیان بە نهێنی بێ، سەرەتا بەکەسی نەوت بۆ کوێ دەچێ، تەنانەت نزیکترین هاوەڵ و گەورەترین باوەڕ پێکراوی خۆی نەی دەزانی بۆ کوێ دەچێ. پاشان هەندێ لەیارو باوەڕ پێکراوانی خۆی کۆ

کردەوەو پێ ی ڕاگەیاندن کەبە تەمایە بچێتە سەر قورەیشی یەکانو مەککە ڕزگار بکا. فەرمانی پێ کردن کەگرنگی بەم خۆ ئامادە کردنە بدەنو بڵاوی نەکەنەوە، ئەمجار فەرمووی: خودایە! وابکەی قورەیش هەواڵی ئەم خۆ ئامادە کردنو چونەی ئێمە نەزانن تا لەناکاو لەماڵی خۆیاندا پەلاماریان نەدەینو غافڵگیریان دەکەین.

هەڵبەتە کۆمەڵگای ئیسلامی کۆمەڵگای ئادەمیزادە لەواقیعی ژیان دا نەژیو هەستی ئادەمیزادییان هەیەو لەناو خاطیراتی نەفسو حەزو ئارەزوەکانی دا هەڵسو کەوت دەکەن، لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا کەسانێکی تێدا دەبن توشی هەڵەو تاوان دەبن، وادەبێ بیانوێکیان بۆ ئەو هەڵسو کەوتە نابەجێییەیان دەدۆزنەوەو بەخەیاڵی خۆیان کارێکی ناشەرعییان ئەنجام نەداوە، وا دەبێ لەو بیانو دۆزینەوەو تەئویل کردنەیان بەهەڵە دەچنو ڕاستی ناپێکن. ئەمەش دیاردەیەکی کۆمەڵگای ئادەمیزادە کەسەر بەسنتیو ئازادی تێدا باڵا دەست بێ. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) لەکاتێك دا کە چاو پۆشی لەهەڵەکەیان ناکا هەوڵ دەدا بیانویان بۆ بدۆزێتەوەو ئەمجار چاوپۆشیان لێ بکا. هەڵبەتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەهەموو کەس زیاتر سنگو دڵ فراوان بووە لەگەڵ ئەو جۆرە ئادەمیزادە بەهەڵە چوانەدا چاکەو دڵسۆزی ڕابردوی نەدەسڕینەوەو هەوڵو تێکۆشانی لەوە پێشیانی پوچ نەدەکردەوە، کتێبەکانی مێژووی ئیسلامو ژینامەی پێغەمبەر ئەم ڕوداوانەیان بۆ تۆمار کردوین، هەرچەندە بەدەگمەن نەبێ رویان نەداوە. ئەم تۆمار کردنانەش نیشانەی ئەوەن کە مێژووی ئیسلامو ژینامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر بەئەمانەتەوە نووسراونەوە. یەکێك لەم ڕوداوانە بەسەرهاتی (حاطب) ی کوڕی ئەبو بەلتەعەیە ئەم پیاوە یەکێکە لەکۆچکەران کەلە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، هاوبەشی غەزای بەدری

کردوه، ریوایەتەکان دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەخەڵکەکەی راگەیاند کە دەچێ بۆ سەر قورەیش و دەیەوێ مەککە رزگار بکا، تا ئەندازەیەکی زۆریش ئەم نیازەی بەنهێنی راگرت موسوڵمانەکان لەمەدینەدا خەریکی خۆ ئامادە کردن بوون ئالەم کاتەدا (حاطب) ی کوڕی ئەبو بەلتەعە نامەیەکی بۆ قورەیشییەکان نووسی و ویستی هەواڵی لەشکر کێشی بۆ سەریان پێ بگەیەنێ. ئەم نامەیەی دایە ئافرەتێك و کرێیەکی باشی بۆ تەرخان کرد ئەگەر نامەکە بگەیەنێتە قورەیش، ئافرەتەکە نامەکەی لەناو قژی سەری دا شاردەوە بەرەو مەککە بەڕێ کەوت. پێغەمبەر لەئاسمانەوە هەواڵی پێ درا کە (حاطب) چی کردوە، ئەویش عەلی و زوبەیری ناردن پێ ی فەرموون بڕۆن تادەگەنە (روضە خاخ)[٢٠٣] لەوێ ئافرەتێکی کەژاوە نشین هەیە نامەیەکی پێیە دەیبا بۆ قورەیشییەکان، عەلی و زوبەیریش خێرا سواری ئەسپەکانیان بون بەپەلەو بەغار ڕۆیشتن تالەو شوێنەی پێغەمبەر دیاری کردبوو ئافرەتەکەیان گرت. دایانبەزاندو پێیان وت نامەیەکت پێیە؟ وتی: نەخێر من هیچ نامەم پێ نیە، بارو بارگەنەکەیان پشکنی هیچیان دەست نەکەوت، عەلی وتی: سوێند دەخۆم پێغەمبەر درۆ ناکاو درۆی لەگەڵ نەکردوین، بەخودا قەسەم یان نامەکەمان دەدەیتێ یان روتت دەکەینەوە، کەزانی بەراستییانە وتی رو وەرگێڕن! ئەوانیش رویان وەرگێڕا، ئەمجار پرچەکانی خاو کردنەوەو نامەکەی دەرهێناو دایە دەستیان ئەمجار هێنایان بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نامەکە لە (حاطب) ی کوڕی ئەبو بەلتەعەوە نووسرابوو بۆ قورەیش و تێ یدا هەواڵی ئەوەیان دەداتێ کە پێغەمبەر بەنیازە بێتە سەرتان و شاری مەککە بخاتە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆیەوە. ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بانگی (حاطب)ی کرد، (حاطب) وتی: ئەی

---

[٢٠٣] شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا دوانزە میل لەمەدینەوە دووره.

پێغەمبەری خودا لەگەڵما لەسەرە خۆبە. وەڵلاهی من بڕوام بەخودا پتەوە ئیمانم بەڕاستی پێغەمبەرەکەیەتی، من لەئیسلام پاشگەز نەبوومەوە، لەحاڵی خۆم نەگۆڕاوم بەلاَم من بابایەکم تێکەڵی قورەیشییەکان بوم و لەوان نیم، لەناویان دا خزم و کەس و کارم هەیە، ماڵ و منداڵم لەناویان دایە، خزمایەتیم لەگەڵ قورەیشییەکان دا نیە تابە هۆی خزمایەتیمەوە بمپارێزن، هاوەڵەکانی ترت هەموو خزمایەتییان لەگەڵ قورەیشییەکان دا هەیە بەو هۆیەوە ماڵ و منداڵیان پارێزراوە، منیش ویستم پیاوە تییەکم بەسەریانەوە هەبێ بۆ ئەوەی خزم و کەس و کارو ماڵ و منداڵم بپارێزم. عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم گەڕێ بالەگەردنی بدەم بێگومان خیانەتی لەخوداو پێغەمبەری خودا کردوە، هەڵساوە بەئەنجامدانی کاری دوورِوویی. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو هاوبەشی غەزای بەدری کردوە، ئەتۆ چوزانی ئەی عومەر! بەڵکوو خودا بەهاوبەشکارانی بەدری فەرموویێ چی دەکەن بیکەن من لەتاوانتان خۆش بووم، ئیتر عومەر هەردوچاوی فرمێسکیان رشتن و وتی: خوداو پێغەمبەری باشتر دەزانن.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مانگی رەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی لەمەدینەوە بەرەو مەککە رێکەوت، دەهەزار جەنگاوەری لەخزمەت دا بوو، رۆیی هەتا گەیشتە (مر الظهران) قورەیشییەکان نەیانزانی، خودا هەواڵی ئەم لەشکر کێشیەی لێ گوم کردن، لەمەککەدا بەترس و بیمەوە چاوەڕوانی روداو بوون! لەرێگە دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) توشی ئەبو سەفیانی کوڕی (الحارث) ی کوڕی (عبدالمطلب) بوو بەلاَم روی وەرگێڕا چونکە لەوە پێش زۆر ئەزیەتی پێغەمبەرو موسوڵمانانی دابوو، تانەو تەشەری ناشرینی ئاراستەی پێغەمبەر کردبوو، ئەبو سەفیان چووە لای عەلی و سکالاَی خۆی لەم هەڵوێستەی پێغەمبەر بەرامبەری کرد، عەلی پێ ی گوت: برۆ پێش

دەمی پێغەمبەرو داوای لێ بوردنی لێ بکە، وتەکەی براکانی یوسف دوبارە بکەرەوە کە پێیان گوت ( تالله لقد اثرك الله علينا وان كنا لخاطئين) چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رازی نابێ و رێگە بەخۆی نادا ئادەمیزادێك هەبێ لەو قسە جوانترو لێبوردەتربێ، ئەبو سەفیان یەکسەر بەقسەی عەلی کردو چووە پێش دەمی پێغەمبەرو ئەو وتەیەی پێ گوت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەوەلاّم دا فەرموی:﴿قَالَ لاَ تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ سورة يوسف/٩٢. ئیتر ئەبو سەفیانی کوڕی (الحارث) موسوڵمان بوو، لەوە لەخزمەت پێغەمبەردا لەشەرمان سەری بەرز نەدەکردەوە،[٢٠٤]

## ئەبو سەفیانی کوڕی (الحرب) لەخزمەت پێغەمبەردا:

پێغەمبەرو سوپای موسوڵمانان نزیك مەککە بوونەوە، شەو داهات، فەرمانی بەهاوەڵانی کرد ئاگری زۆر بکەنەوە، لەولایشەوە ئەبو سەفیان لەگەڵ چەند کەسێکی تردا چو بوە دەری مەککەو گوێ قولاّغی هەواڵو روداو بوو، کە ئەم ئاگرە زۆرانەی دی، وتی لەژیانم ئەوەندەم ئاگر نەدیوەو سوپای وا زۆرم بەرچاو نەکەوتووە، ئەمە چ حەشامەتێکەو چ قەوماوە؟ (العباس) ی کوڕی (عبد المطلب) مامی پێغەمبەر ماوەیەك لەوە پێش بەماڵو منداڵەوە لەمەککە کۆچی کردبوو بەرەو مەدینە بەڕێ کەوتبوو لەرێگا تووشی سوپای ئیسلام بوبوو موسوڵمان بوبوو لەگەڵ سوپاکەدا گەڕابوەوە، عەرزی پێغەمبەری کرد، کە رێگا چارەیەك بدۆزرێتەوە بۆ ئەوەی شەڕ رو کوشتار رونەداو بەبێ خوێن رشتن مەککە رزگار بکرێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) داوای لەعەباسی مامی کرد کە یەکێك بدۆزێتەوە بچێتە ناو

---

[٢٠٤] زاد المعاد جـ ٤٢١/١.

قورەیشییەکان بیانترسێنێ، عەباس سواری حوشترە سپی یەکەی پێغەمبەر بوو هات بۆ ناوچەی (أراك) بەڵکوو یەکێکی لێزان بدۆزێتەوە رایسپێرێ بۆ ناو قورەیشییەکان و هێزو دەسەلاتی موسوڵمانەکانیان بۆ شی بکاتەوە، بۆ ئەوەی بەئاشتی بەپیر پێغەمبەرەوە بێن و شەڕو هەرا رونەدا. لەم کات و ساتانەدا کە عەباس سەرگەرمی ئەوە بوو یەکێك بدۆزێتەوە گوێی لەقسەکانی ئەبو سەفیان بوو دەنگەکەی ناسی، هات بۆ لای و وتی ئەبو سەفیان! ئەو ئاگرانەی کراونەوە هەمووی سوپای پێغەمبەرە، ئای قوڕ بە سەر قورەیش، ئەمجار هاوەڵەکانی ئەبو سەفیان کە (بدیل) ی کوڕی ورقاو حەکیمی کوڕی حیزام بوون ناردیاننەوە بۆ مەککە بۆ ئەوەی ئامۆژگاری قورەیشییەکان بکەن، ئەمجار عەباس لەترسی ئەوەی یەکێك لەموسوڵمانەکان ئەبو سەفیان ببینێ و بیکوژێ ئەبو سەفیانی خستە پاشکۆی خۆی، بەسواری حوشترە سپی یەکەی پێغەمبەر بەناو سوپاکەدا ئەبو سەفیانی گەیاندە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) و ئەمانی بۆ وەرگرت، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەعەباسی فەرموو ئێستا لەگەڵ خۆت ئەبو سەفیان بەرەوەو بەیانی بیهێنەرەوە، عەباس بەیانی ئەبو سەفیانی هێنایەوە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) روی کردە ئەبو سەفیان و فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەبو سەفیان ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە دان بەوە دابنێ ی کە هیچ خودانێن شیاوی پەرستن بن جگە لەخودا؟ ئەبو سەفیان وتی: دایك و باوکم قوربانت بن چەند لەسەرە خۆو دڵسۆزو خاوەن رێزو جوانمێریت! بەخودا دەزانم ئەگەر جگە لەخودای پەروەردگار خودایەکی تر هەبوایە یارمەتیەکی منی دەدا. ئەمجار پێ ی فەرموو:ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە دان بەدەدا بنێ ی کەمن پێغەمبەرو رەوانەکراوی

خودام؟ ئەبو سەفیان وتی: دایكو باوكم بەقوربانت بن دەربارەی ئەمە تا ئێستا شتێك لەدڵمایە. عەباس هەڵی دایەو وتی:كوڕە ماڵوێران موسوڵمان ببەو شایەتومان بێنە: كە جگە لەخودای باڵا دەست خودای تر نین‌و موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە، پێش ئەوەی لەملت بدەن! ئەبو سەفیان جگە لەئیسلام بوون ڕێگا چارەی تری نەماو بەنا عیلاجی موسوڵمان بوو. شایەتومانی بەحەقی هێنا.

## لێبوردنی گشتی‌و ئەمن‌و ئاسایشی سادە:

پێغەمبەر پێش ئەوەی بچێتە ناو مەككەوە لێبوردنی گشی ڕاگەیاند، ئاشتی‌و لێبوردنی خۆی لەدانیشتوانی مەككە گشتگیر كرد، بەجۆرێك هەركەسێ لە دانیشتوانی مەككە حەزی لەئاشتی بوایە بۆ وەی دەبوو. هەركەسێك شانی لەشەڕو كوشتار نەخورایە لێبوردنەكە دەیگرتەوە، ئەوە بوو فەرمووی: هەركەسێ بچێتە ماڵی ئەبو سەفیان پارێزراوە، هەركەسێك بچێتە ماڵی خۆی‌و دەرگا لەسەر ماڵ‌و منداڵی خۆی دابخا پارێزراوە، هەركەسێك بچێتە ناو كە عبەوە پارێزراوە[٢٠٥] لەهەمان كات دا پێغەمبەر نەی لەوە كرد كە سوپاكەی لەكاتی چوونە ناو كەعبەوە چەك بەكار بهێنن دژی هەر مرۆڤێك مەگەر كەسێك پێشیان پێ بگرێ‌و سەنگەریان لێ بگرێ، هەروەها فەرمانی بەسوپای موسوڵمانان كرد كەدەست درێژی نەكەنە سەر ماڵ‌و مڵكی دانیشتوانی مەككە، چەپاو تاڵان‌و بڕۆ نەكەن.

---

[٢٠٥] سیره ابن هشام جـ ٤٠٣/٢ ریوایەتەكە لەبوخاری بەكورتی هاتووه سەیری (باب أین ركز النبي ص الرایة یوم الفتح)؟.

## ئەبو سەفيان رۆژى رزگار كردنى مەككە:

لەبەردەم كەڕ نەفالّى سوپاى ئيسلام دا: پێغەمبەر (درودى خواى لەسەربێ) فەرمانى بەعەباسى مامى كرد كە ئەبو سەفيان لەشوێنێكى وادا رابگرێ، هەموو دەستەوە تاقم و گروپەكانى سوپاى ئيسلام ببينێ. . .

بەلّێ سوپاى ئيسلام وەكوو شەپۆلى دەريا هەلّرژانە ناو مەككەوە، هەموو هۆزو خێلّ و تيرەو بەرەبابێك ئالاّى خۆى هەبوو هەرتاقمەو بەئالاّى تايبەتى خۆيانەوە داخلّى مەككە دەبوون! هەركە خێلێك بە بەردەميانا تێپەڕ دەبوو ئەبو سەفيان لەعەباسى دەپرسى ئەمە كێن و هۆزى چييان پێ دەلّێن: عەباس وەلاّمى دەدايەوە دەيگوت ئەمە فلاّن تيپ و لەفلاّن هۆزن، دەيگوت جا ئەوانە چ لێ بكەم و چييان پێ بلّێم ئەوانە پەيوەندييان بەمنەوە نيە! سوپا بەمجورە تيپ تيپ و دەستە دەستە بەبەردەمى عەباس و ئەبو سەفيان دا داخلّ بوون هەتا گەييشتە ئەوە پێغەمبەرى خودا لەگەلّ كۆمەلّێ لەياريدەدەران و كۆچكەران دا كەكە تيبەكەيان سەوز بوو هەموويان ئاسن و زرييان پۆشى بوو هەر كەسێ سەيرى بكردنايە تەنها چاويان و ئاسن و زرێ ى دەبينى، ئەبو سەفيان واقى و ڕماو وتى سوبحانەللاّ ئەى ئەمانە كێن؟ عەباس وتى: ئەمە پێغەمبەرى خودايە لەناو كۆمەلّى كۆچكەران و ياريدەدەران دايە، ئەبو سەفيان وتى بەخودا ئەمانە كەس نايانوێرێتێ و كەس چاريان ناكا. سوێندم بەخودا ئەى عەباس! مولّك و سەلّتەنەتى برازاكەت گەورە بوو، لەوەدانەما قورەيش و غەيرى قورەيش دەرەقەتى بێن. عەباس وتى: ئەمە شكۆمەندى و سەلّتەنەتى پێغەمبەرايەتى يە. ئەبو سەفيان وتى: دەى پيرۆزبێ.

ئەمجار ئەبو سەفيان بەسەر سوڕماوى و پەرێشانى يەوە چووە ناو مەككە بە هەموو دەنگى بەرزى هاوارى كرد ئەى جەماوەرى قورەيش! ئەمە

موحەممەدە بەسوپایەکی زۆرو جەربەزەوە هاتووە، بەرهەڵستی و ڕێگرتن لێ ی لەتوانای ئێوەو کەسی تردا نیە، کەس دەست بۆ چەك نەبا، خۆتان پەنابگرن، وەعدم لە پێغەمبەر وەرگرتووە هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبو سەفیانەوە پارێزراوە، هەندێ کەس بەروی دا هەڵشاخان وتیان خودا بتکوژێ ماڵی تۆ چ سودێکمان پێ دەگەیەنێ؟ ئەمجار وتی: هەرکەسێ بچێتەوە ماڵی خۆی دەرگا لەسەر خۆی پێوەدا پارێزراوە، هەرکەسێ بچێتە ناو کەعبەوە پارێزراوە، ئیتر بڵاوەیان لێ کردو هەیانبوو چووەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی و دەرگای لەسەر خۆی گاڵدا، هەیانبوو چووە ناو مزگەوتی کەعبەوە.

## پێغەمبەر بەخوشوعو ملکەچی بۆ خودا دەچێتە ناو مەککە.

پێغەمبەری خودا بەم سەرکەوتن و دەسەڵاتەی هیچ لەخۆی بایی نەبوو، بەخۆ بادان و لوتبەرزی نەچوە ناو مەککەوە بەڵکوو لەکاتی چوونە ناو مەککەدا بە ئەو پەڕی بەندایەتی نواندن و سەرنەوی کردن بۆ خودا داخڵی مەککە بوو، سەری کرنووشی بۆ خودا دانەواندو کەوتە سوپاس و ستایشکردنی پەروەردگار کە ئەم سەرکەوتن و بالا دەستی یەی پێ بەخشیوە، بەبێ جەنگ و خوێن ڕێژی و شکاندنی حورمەتی کەعبە ئاوا بەئاسانی مەککەی رزگار کرد، بەسواری حوشترەکەیەوە سەری نزم کردبوە پێشی خۆی تەنانەت ئەوەندەی سەر نزم کردبووەوە، خەریك بوو چەناگەی بدا لەزینی ولاخەکەی. بەو شێوەش سورەتی (الفتح) ی دەخوێند پێغەمبەر بەچوونە ناو مەککە بەم شێوە شکۆمەندی و بالادەستی یەوە، بەرزگارکردنی مەککە: کە پایتەختی جزیرەی عەرەب و مەڵبەندی روحی و سیاسی عەرەبەکان بوو هیچ لوت بەرزی و کەشخەیی و فیزێکی نەنواند، بەڵکوو

وێڕای سوپاس و ستایشکردن بۆ خودا ئامۆژگاری کردنی جەنگاوەران کە بەهیچ جۆرێ دەست درێژی نەکەنە سەر کەس و ماڵ و سامانی کەس داگیر نەکەن، ئەو پەڕی داد پەروەری و مرۆڤ دۆستی نواند، هەموو شیعارێکی داد پەروەری و یەکسانی نێوان ئادەمیزادی ڕاگەیاند، تەوازوع و بەندایەتی خۆی بۆ خودا نیشان دا، ئوسامەی کوڕی زیدی خستە پاشکۆی خۆی، کەمنداڵی بەندەیەکی ئازاد کراوی بوو، هیچ کام لە منداڵی بەرەی هاشم و پیاو ماقوڵانی قورەیشی نەخستە پاشکۆی خۆیەوە کە زۆرو زەبەندە بوون ئەم سەرکەوتنە گەورەیەو ڕزگار کردنی مەککە لە بەیانی ڕۆژی هەینی بیستی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا بوو لەو ڕۆژەدا پیاوێك قسەیەکی بە پێغەمبەر گوت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆری پێ ناخۆش بوو پێستی گرژ بوو فەرمووی تۆزێ لەسەرە خۆبە، من پاشا نیم من کوڕی ئافرەتێکی قورەیشیم کە تێگوشاوی دەخوارد!! لەکاتێك دا کە سەعدی کوڕی عوبادە بەتیپێك لەیاریدە دەرانەوە بەلای ئەبو سەفیان دا تێپەڕی، سەعد بەئەبو سەفیانی گوت: ئەمڕۆ ڕۆژی شەڕە، ئەمڕۆ حورمەتی کەعبە حەلال دەبێ، ئەمڕۆ خودا قورەیشی زەلیل و ڕیسوا کرد، جاکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەیشتە عاستی ئەبو سەفیان سکاڵای قسەکەی سەعدی لای پێغەمبەر کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! گوێت لێ بوو سەعد چی گوت؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی چی گوت؟ ئەبو سەفیان وتی: سەعد واو وای گوت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قسەکەی سەعدی پێ ناخۆش بوو فەرمووی نەخێر ئەمڕۆ ڕۆژی ڕەحمەت و یەکیەتی یە، ئەمڕۆ خودا قورەیشی سەربەزکرد بەوەی ئایینی ئیسلامیان تێدا بڵاو بووە، خودا شکۆمەندی بەکەعبە بەخشی بەوەی لەبت و بتپەرستی خاوێنی کردەوە، ئەمجار ناردی سەعد هات ئاڵاکەی لێ ستاندەوەو دای بەقەیسی کوڕی کەپیاوێکی هێمن و

لەسەرە خۆ بوو، سەعدیش ئالاّ لیّ ستاندەوەکەی هێندە بەلاوە ناخۆش نەبوو چونکە درابوو بەکوڕەکەی![٢٠٦] پێغەمبەری داناو حەکیم ئەم کێشەیەی زۆر بەئاسانی حەل کرد وشەی (ملحمە) ی کرد بە (مرحمە) باوکێکی لێ خستو کورەکەی خستە شوێنی. دلّو دەروونی برینداری ئەبو سەفیانیشی دەرمان کرد، بەبێ ئەوەی دلّی سەعدیش بڕەنجێ، بەتایبەتی سەعد رابردوویەکی زێرینی هەبوو لەئیسلام دا.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەپلانێکی تۆکمەو وردبینی یەوە سوپاکەی ئاڕاستەی ناو شاری مەککە کرد، لە پێشەوە ئامۆژگارییەکی جوانو پڕ مانای کردن، ئەمجار سوپاکەی کرد بەچوار بەشەوە زوبەیری کوڕی عەوامی کرد بە بەرپرسیاری بەشی چەپی سوپاکە، فەرمانی پێ کرد کەلەلای چەپەوە بچێتە ناو مەککەوە، خالیدی کوڕی وەلیدی کرد بەسەرۆکی لای راستی سوپاکەو فەرمانی پێ کرد کەلە خوارەوە هەلّگەڕێنو بێنە ناو شارەوە، سەعدی کوری عوبادەشی کرد بەلێپرسراوی مەدەنی یەکانو فەرمانی پێ کَرد لەخۆرئاواوە بچێتە ناو مەککەوە، ئەبو عوبەیدەشی کردە سەرۆکی کۆچکەرەکانو خۆیشی لەگەلّیان دا بوو، هەموو کەرتەکان بەگوێرەی پلانەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رژانە ناو شارەوە، هیچ کام لەکەرتەکان توشی شەڕو بەرەنگاری نەهاتن، بێجگە لە تیپەکەی خالیدی کوڕی وەلید کە سوکە پیاهەلّپژانو تێکگیرانێکیان لەگەلّ صەفوانی کوڕی ئومەییەو عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلو سوهەیلی کوڕی عەمر ئەنجام دا، لەقورەیشییەکان نزیکەی دوانزە کەس بریندار بوونو پاشان شکانو هەلاّتن. پێغەمبەر لەوە پێش فەرمانی دابوو بە فەرماندە موسولّمانەکان کەلە کاتی چوونە ناو مەککەوە شەڕ نەکەن مەگەر شەڕیان پێ بفرۆشرێ.

---

[٢٠٦] زاد المعاد جـ ٤٢٣/١.

## خاوێنکردنەوەی کەعبە لەبتو صەنەم:

کە پێغەمبەری خودا چووە ناو شارەوە، خەڵکەکەی دڵنیا کردو دانیشتوان هێور بونەوەو ترس‌و بیمیان نەما، تەشریفی بەرەو کەعبە رۆیی تەوافی کەعبەی کرد، قەوسێکی بەدەستەوە بوو، تەماشای کرد سێسەدو شەصت بت بەدەوری کەعبەوە بوون، ئیتر بەو قەوسە کەوتە سەرو گوێلاکیان، تێوەی دەژەنین‌و دەیفەرموو: ﴿وَقُلْ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا. (٨١) سورة الإسراء﴾ ئیتر یەکە یەکە بتەکان بەرەو دەم سەرەنگری دەبوون [٢٠٧] هەروەها لەناو کەعبەدا چەند وێنەو پەیکەرێکی تری بینین فەرمانی کرد بیان شکێنن‌و تێکیان بدەن.

## ئەمرۆ رۆژی چاکە کاری‌و ئەمەکە:

کاتێك پێغەمبەری خودا تەوافی کەعبەی ئەنجام دا، بانگی عوسمانی کوڕی طەلحە کردو کلیلی کەعبەی لێ ستاندو دەرگای کەعبەی بۆ کرایەوەو چووە ناوەوە، شایانی باسە پێغەمبەری خودا لەوەپێش رۆژێك پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە داوای لەعوسمانی کوڕی طەلحە کرد بوو کلیلی کەعبەی بداتێ، بەڵام عوسمان بەقسەی رەق وەڵامی دابووەوەو قسەی ناشیرینی پێ گوتبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دانی بەخۆیا گرتبوو. دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عوثمان! لەوانەیە ڕۆژێك بێ ئەم کلیلانە بەدەست منەوە ببینی بەئارەزۆی خۆم بیدەم بەکێ دەیدەم، عوسمان وتی: ئەگەر ڕۆژێکی وابێتە پێشەوە مانای وایە قورەیش زەلیل‌و ریسوا

---

[٢٠٧] زاد المعاد جـ ٤٢٤/١ هەروا ئەم چیرۆکە لەصەحیحی بوخاری دا (باب ابن ركز النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الرايه يوم الفتح.

دەبـن، پێغەمبـەر فـەرمووبوی نـەخێر وانیـە بـەڵکوو ئـەو ڕۆژە قـورەیش شکۆمەند دەبن و عیززەت بەدەست دەهێنن، ئیتر قسەکەی پێغەمبەر کاری لـەدڵ و دەروونـی عـوثمـان کردبـوو، وای زانیبـوو ڕۆژێـك دێ ئـەو وادەیـە دێتەجێ.

جاکە پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) لەکەعبـەوە چووە دەر عـەلی کـوڕی ئـەبو طالب بەپیری یەوە چوو، کلیلـەکانی کەعبـەش بەدەست پێغەمبـەرەوە بوون عـەلی عـەرزی کـرد قوربـان لێپرسـراوەتی حیجابـە واتـە: زێـوانی کەعبـەو (السقایە) ئاو دابەشکردن بەسەر حاجیان بۆ ئێمە دابنێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: عـوثمـانـی کـوڕی طـەلحـە لەکوێیـە، بانگیـان کـردو هاتـە خزمـەتی، پێغەمبـەر فەرمووی: ئـەی عـوثمـان! ئـەوە کلیلـەکانت وەربگـرەوە، ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەو وەفادارییە، کلیلەکان وەربگرەوە بۆ هەتا هەتایە، کەسێك ستەمکار نەبێ ئەم کلیلانەت لێ ناستێنێ.

### ئیسلام ئایینی یەکتا پەرستی و یەکیەتییە:

پێغەمبـەری خـودا دەرگـای کەعبـەی کـردەوە، قورەیـشییەکان بـەڕێز وەستابوون مزگەوتیان پڕ کرد بوو، هەموو چاوەڕوانی ئەوە بوون ئاخۆ ئـەم پێغەمبـەرە مەزنـە ئـەم فەرمانـدە دڵسۆزە چ بڕیارێـك دەدا دەربـارەی ئـەو قورەیـشییانەی مـاوەی بیـست سـاڵ بوونـە کۆسـپ و تەگـەرە لەبـەردەم بڵاوبوونـەوەی ئـایینی ئیسلام دا، ئـەوەی لـە دەسـتیان هـات لەئەزیەتـدانی پێغەمبـەرو موسـوڵمانان درێغییـان نـەکرد، ئێستا وا بـەبێ دەسـەڵاتی لـەژێر فەرمانی پێغەمبەر دان و هیچ بەرگرییەکیان بۆ لـەخۆ ناکرێ. پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستی بەدوو لاشیپانەی دەرگاکەوە گرت و قورەیـشییەکان لـەخوار یەوە بوون، فەرمووی: بزانن جگـە لـەخودای گـەورەو میهرەبـان هـیچ خودای

تر نین، وادەی خۆی هێنایە دی، یارمەتی بەندەی خۆی دا، هەر خۆی ئەحزابو کۆمەڵانی هاوپەیمانی تێکشکاندن، ئاگاداربن، هەموو دابو نەریتێکی سەردەمی نەزانی، هەموو دابو نەریتێكو هەڵسو کەوتێکی پەسەند کراوی پێشوو دەربارەی ماڵو سامانو خوێن ڕێژیو خوێن بەستن بەتاڵەو کاری پێ ناکرێ، جگە لەزێوانی کەعبەو ئاودا بەشکردن بەسەر حاجیان دا.

ئەی جەماوەری قورەیش! خودا دەمارگیری سەردەمی نەفامیو خۆهەڵکێشان بەبنەماڵەو باوكو باپیرەوەی لێ قەدەغە کردون، دابو نەریتێکی ناپەسندەو دەستبەرداری بن، ئادەمیزاد هەموویان لەئادەم کەوتوونەوەو ئادەمیش لەخاك دروستکراوە. ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ. (١٣) سورة الحجرات﴾ ئەی ئادەمیزادینە! ئێمە ئێوەمان لەنێرو مێیەك کەباوە ئادەمو دایە حەوایە دروستکردوە، پاشان بەهۆی زاوو زێوە ئێوەمان زۆر کردوە کردومانن بەبەرەبابو تیرەو هۆزو نەتەوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسنو هاریکاری یەکتری بکەنو سەرزەوی ئاوەدان بکەنەوە، لەبونەوەر وردببنەوەو بیکەنە نیشانەی تاكو تەنها خودای بونەوەر بێگومان کێتان تەقواو خودا پەرستی زیاتر بێ ئەوەتان لای خودا ڕێزدارترە. دڵنیا بن خودا زانایە بەهەمووشتێك چی لەبونەوەردایە لەدەرزی یەوە تا مەجەرە خودا دەزانێ چیەو بۆ چی بەدی هێناوە، خەبەر دارە بەهەموو جمو جوڵێك لەبونەوەردا.

## پێغەمبەری خۆشەویست و ڕەوانەکراوی ڕەحمەت:

پێغەمبەری خودا پاشان ڕووی کردە جەماوەرەکەو فەرموی: ئەی جەماوەری قورەیش! پێتان وایە من چی لەگەڵ ئێوە دەکەم؟ وتیان:

بەهیوای خێرین برایەکی دڵسۆزو برازایەکی دڵسۆز! فەرمووی: من بەرامبەری ئێوە هەڵوێستی یوسف بەرامبەر براکانی وەردەگرمو پێتان دەڵێم (لا تثريب عليكم اليوم اذهبوا فانتم طلقاء) ئەمڕۆ سەرزەنشت لەسەرتان نیە بڕۆن هەمووتان مەرەخەسبن ئەمجار فەرمانی بە بیلال کرد بچێتە سەربانی کەعبەو بانگ بدا، سەرانی قورەیش بەگوێی خۆیان بانگی ئیسلام ببیستن وشەی (الله) و بانگی یەکتا پەرستی بەرزدەبێتەوەو مەککەو کێوو دۆڵەکانی بەودەنگە بهەژێنو لەرەلەریان پێ بکەوێ.

ئەمجار پێغەمبەری خودا چووە ناو ماڵی (أم هاني) کچی ئەبو طالیب خۆی شۆشتو بەمەبەستی سوپاسکردنی پەروەردگار هەشت رکات نوێژی فەتحی بەجێ هێنا.[٢٠٨]

## فەرق و جوداوازی لەجێ بەجێ کردنی حودودی خودا دا نییە:

لەو سەروبەندەدا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە مەککە بوو هێشتا نەگەڕابووەوە ئافرەتێکی بەنو مەخزومی ناوی فاطمە بوو، دزی کردبوو، خزمەکانی پەنایان بۆ ئوسامەی کوڕی زەید برد، چونکە بەخەیاڵی خۆیان هەرئەو دەتوانێ لەو بارەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەر بکا، جاکە ئوسامە تکای بۆ ئافرەتەکە کرد، پێغەمبەر ڕەنگی گۆڕا، تووڕەیی یەکی زۆر لەسەر روخساری دەرکەوت. فەرمووی: ئەوە قسەم لەگەڵ دەکەی دەربارەی (حد)ێك لە حودودی خودا!؟ ئوسامە خێرا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە. لەقسەکەی خۆم پەشیمانم. کە ئێوارە داهات

---

[٢٠٨] رواه البخاري في باب منزل النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يوم الفتح وزاد المعاد جـ١/٤٢٥.

پێغەمبەر بەمەبەستی وتاردان هەڵسایەسەرپێ‌و سوپاس‌و ستایشی خودای کرد ئەمجار فەرمووی: بێگومان ئەوەی بوو بەهۆی گەندەڵی‌و لەناوچوونی نەتەوەکانی پێشوو، ئەوە بووە هەرکاتێ پیاوێکی بنەماڵەو بەدەسەلات دزی بکردایە گوێیان پێ نەدەداو (وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچوون)، ئەگەر لاوازو بێدەسەلاتێك دزی بکردایە حەدیان لێ دەردەکردو سزایان دەدا، دەسا سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاطمەی کچی موحەمەد دزی بکا دەستی دەبڕم.

ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی کرد ئافرەتەکەیان هێناو دەستی بڕدرا، تۆبەی لەتاوانەکەی کردو جارێکی تر روی نەکردەوە ئەوتاوانە پاشان شوی کرد!.

## لێبوردن لەهەرەدوژمنە خوێنخۆرەکان:

کە رزگارکردنی مەککە ئەنجام درا، پێغەمبەر جەماوەرەکەی ئارام کردەوە، لێبوردنی بۆهەموو قورەیشییەکان دەرکرد جگە (٩)نۆ کەس کە لێبوردن نەیگرتنەوە، فەرمانی کرد بەکوشتنیان، تەنانەت ئەگەر لەژێر پەردەی کەعبەشدا وەگیر بکەون، ئەو نۆ کەسە تاوانەکەیان زۆر گەورەو ناجوانمێرانە بوو، هەیانبوو لەئیسلام پاشگەز ببوەوە، هەیانبوو بەغەدر موسوڵمانی کوشتبوو، هەیانبوو هەمیشە خەریکی هەجوو جنێودان بوو بە پێغەمبەر و هاوەڵانی و داخی دڵی خۆی بەوە دەرِشت کەتانەو تەشەر لە موسوڵمانان بداو عەیب‌و عاریان بۆ هەڵبەستێ و بەناو خەڵکی دا بڵاوی بکاتەوە، لەوانە یەکێکیان عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوری ئەبو سەرح بوو لەئیسلام پاشگەز بوبوەوە، یەکێکی تریان عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل بوو، چاوی بەرایی نەدا حکومەتی ئیسلامی ببینێ لەبەر ئەوە و لەترسی گیانی

خۆی بەرەو وڵاتی یەمەن هەڵاتبوو، دوایی خێزانەکەی ئەمانی بۆ وەرگرت و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەمانی پێدا، لەکاتێك دا کوڕی سەرسەختترین دوژمنی پێغەمبەر بوو، کە گەڕایەوە پێغەمبەر بەشانی رووت وبێ ریدا لەخۆشیانا بە قڵمباز پێشوازی لێ کرد، عەکرەمە موسوڵمان بوو، پێغەمبەر بەموسوڵمانبوونەکەی زۆر کەیفخۆش بوو، ئەویش موسوڵمانبوونەکەی بەراست بوو، زۆر دڵسۆزی نواند بۆ ئیسلام و هەڵوێستی مەردانەی نواند لەشەڕی پاشگەز بووەکان و شەڕەکانی شام دا.

یەکێکی تریان وەحشی بوو بەندەی ئازاد کراوی جوبەیری کوڕی موطعیمبوو، بکوژی مامی پێغەمبەر و شێری خوداو پاڵەوانی پێغەمبەر حەمزەی کوڕی عبدالمطلب بوو لەوەپێش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خوێنی بەزایە دابوو، فەرمووبووی لەهەر شوێنێك چنگ کەوت بێ سێ و دوو بیکوژن. کە موسڵمان بوو پێغەمبەر موسوڵمانبوونەکەی لێ وەرگرت!

یەکێکی تر لەوانە (هبار)ی کوڕی ئەسوەد بوو، ئەمیان چووبوە سەر رێی زەینەبی کچی پێغەمبەر لەوکاتەدا کەویستبووی کۆچ بکا بۆ مەدینە، لەناکاو هاتبووە بەردەم وڵاخەکەی زەینەب و وڵاخەکە رەوی بووەوە زەینەب بەسەر بەردێك دا کەوتبوو، منداڵی لەبار چووبوو، ئەمجار کەئەم کەتنەی کردبوو هەڵاتبوو، دوایی موسوڵمان بوو موسوڵمانبوونەکەشی دڵسۆزانە بوو، ئەمانیشی وەرگرت بۆ ساراو بۆیەکێ لەو دوو ئافرەتە گۆرانی بێژەی بەگۆرانی یەکانیان هەجوی پێغەمبەریان دەکرد، ئەوانیش موسوڵمان بوون!

## گفتوگۆی نێوان عوتبەو پێغەمبەری خودا:

پێغەمبەری خودا بەوجۆرە دڵسۆزی و دڵفراوانی یەوە هەڵس و کەوتی لەگەڵ قورەیشی یەکانداکرد، ئەوانیش هەموو لێی کۆبوونەوە بۆ بەیعەت

پێکردن و ئیمانهێنان لەسەر تەپۆڵکەی صەفا بۆیان دانیشت و پۆل پۆل دەچوونە خزمەتی لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەیعەتیان پێ دەکرد، ئەویش بەڵێنی لێوەرگرتن کە بەگوێرەی توانا گوێڕایەڵی فەرمانی خودابن و بەندایەتی بۆ بکەن. جاکە لەبەیعەت وەرگرتنی پیاوان بووەوە نۆرەی بەیعەتکردنی ئافرەتان هات، ئەوانیش وەجبە وەجبە هاتنە خزمەتی، لەناو ئافرەتەکاندا هیندی کچی عوتبە، خێزانی ئەبو سوفیانیان تێدابوو، نیقابی پۆشیبوو دەم و چاوی دیارنەبوون، خوا خوای بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەیناسێتەوە لەبەر ئەوکردارە ناشیرینەی کاتی خۆی بەحەمزەی کردبوو لەپاش شەهید بوونی لەغەزای ئوحوددا.

جاکە ئافرەتەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموون: پەیمانم بدەنێ: کە هاوەڵ بۆ خودا دانانێن و کەس ناکەن بەهاوشانی، هیند هەڵی دایەو وتی: وەڵلاهی پەیمانێکمان لێوەردەگری لەپیاوەکانت وەرنەگرتووە.

ئەمجار پێی فەرموون پەیمانم بدەنێ کە دزی ناکەن، هیند وتی: وەڵلاهی سامن لەماڵی ئەبوسەفیان ئەوەندەو ئەوەندەم دزیوە، جا نازانم ئاخۆ ئەوە حەڵاڵە یان حەرامە؟ بەدزی حلێبە یان نا؟ ئەبو سەفیان کەلەوکاتەدا ئامادە بوو وتی: ئەوەی تا ئێستا لەماڵی من بەدزی هەڵت گرتبێ گەردنت ئازادبێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەتۆ هیندی کچی عوتبەی؟ وتی: بەڵێ، داواکارم لەهەڵوێستی رابوردوم خۆشبی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی خودا لێت خۆش بێ. ئەمجار پێی فەرموون: پەیمانم بدەنێ کە هەرگیزاو هەرگیز داوێنپیسی ناکەن. هیند وتی: ئەیەڕۆ جا بۆ ئافرەتی ئازاد و حوڕە زینا دەکا؟![209]

---

[209] السيرة النبوية لابن كثير جـ ٦٠٣/٣.

ئەمجار پێی فەرموون پەیمانم بدەنێ: کەبەهیچ جۆرێ منداڵی خۆتان ناکوژن، هیند وتی: ئێمە بەزارۆکی پەروەردەمان کردن‌و پێمان گەیاندن، کە گەورە بوون تۆ کوشتتن. تۆو ئەوان چاك دەزانن ئێمە چەند بەکوێرە وەری‌و دەردی سەری منداڵی خۆمان پێگەیاندن!! عومەری کوڕی خەتتاب زۆر بەقسەکەی هیند پێکەنی.

پاشان پێی فەرموون: پەیمانم بدەنێ کە لەخت‌و خۆڕایی بوختان بۆ کەس هەڵنابەستن، هیند وتی: وەڵلاهی وەڵلاهی بوختانکردن کارێکی ناشیرین‌و دزێوە، پاشان فەرمووی پەیمانم بدەنێ: کە بێ فەرمانیم ناکەن، هیند وتی: بەڵێ لەچاکە کاری‌دا نافەرمانیت ناکەین.[٢١٠]

کە خودای باڵادەست بارو دۆخەکەی وا لێ‌کرد مەککە کەوتە ژێر دەسەڵاتی پێغەمبەرەوە و بەتەواوی لەبت و بتپەرستی رزگاری بوو، یاریدەدەران لەناو خۆیاندا کەوتنە مقۆمقۆو وتیان: ئەوە پێغەمبەر، خودا بەوڵات‌و زێد و نیشتمانی خۆی شادی کردەوە، مەککە زێدو نیشتمانی خۆیەتی‌و رەنگە لەمەدوا هەر لێرەدا نیشتەجێ ببێ‌و نەیەتەوە مەدینە. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پرسیاری لەیاریدە دەران کرد دەربارەی ئەو وت‌و وێژەی ناوخۆیان، کەسی تریش بەمەی نەزانی بوو یاریدە دەران تەریق بوونەوەو شەرمەزاری گرتنی، دوایی دانیان پیاناو وتیان: بەڵێ لەناو خۆمان دا ئەم بۆچوونەمان تاوو توێ کردوەو هاتووینە سەر ئەو رایە کەلەمەدوا تەشریفت لەمەککەدا دەمێنێتەوە. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (معاذ الله! المحيا محياكم و الممات مماتكم) پەنا دەگرم بەخودا ژیان ئەو ژیانەیە لەگەڵ ئێوەبێ مردنیشم لەناو ئێوە دا دەبێ.

---

[٢١٠] السيرة النبوية لابن كثير ج٣/٦٠٢-٦٠٣ بەزیادیەکی کەمەوە کە لەغەیری ئیبنو کەثیر هێنراوە.

## چۆن دوژمن بوو بەدۆستو خوو خراپ بەتەقواکار:

فەضالەی کوڕی عومەیر ویستی دەست لە پێغەمبەر بوە شێنێ و شەهیدی بکا. لەوکاتەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەوافی کەعبەی دەکرد، جا کە فەضالە لێی نزیك بووەوە، فەرمووی ئەی فەضالە! وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی ئەوە چیت لەدڵدا بوو؟ وتی: هیچم لەدڵ دانەبوو بەڵکوو خەریکی ذیکری خودا بووم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێکەنی، فەرمووی: (استغفر الله) داوای لێ خۆشبون لەخودا بکە ئەمجار دەستی موبارەکی خستە سەر سنگی دڵی ئارامی گرت، فەضالە دەڵێ: وەڵلاهی هێشتا پێغەمبەر دەستی لەسەر سینگم هەڵنەگرتبوو وام لێ هات هیچ کەسم هێندەی ئەو خۆش نەدەویست. جا فەضالە دەڵێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕیم لەوەپێش گفتو گۆی دڵداریم لەگەڵ دەکرد. وتی دەی بادەست بکەین بەقسەو پێکەنینی خۆمانو غەم بەبادەین، منیش وتم خوداو ئیسلام بەوە ناڕازین و ئیتر من شتی واناکەم.

## لابردنی دیاردەی سەردەمی نەزانی شیعاری بتپەرستی:

پێغەمبەری خودا فەرمانی کرد بەهاوەڵانی هەرچی دیاردەو نیشانەی بتپەرستی هەیە لایبەرن، دەستەو تاقمی ناردن بۆ ئەو بتانەی لەدەورو پشتی کەعبە دانرابوون وەکوو بتی (اللات، العزی، مناة الثالثة) هەموویان شکاندن، بانگدەر بەناو مەککەدا جاڕی دا، هەرکەسێ بڕوای بەتاك و تەنهایی خوداو رۆژی دوایی هەیە، لەناو ماڵی خۆی دا بتێك نەهێڵێتەوە هەموویان بشکێنن، ئەمجار چەند کەسێکی لەهاوەڵانی خۆی نارد بۆ ناو تیرەو هۆزەکانی دەوروبەر بتەکانیان شکاندن.

جابیر ریوایەت دەکا دەڵێ: لەسەردەمی نەفامی دا خانوێك هەبوو پێیان دەگوت: (ذو الخلصة) و )الكعبة اليمانية) (الكعبة الشامية) پێغەمبەر فەرمووی: ئەرێ خەمو خەفەتی (ذو الخلصة)م لەکۆڵ ناکەیەوە!؟ جابیر دەڵێ: ئیتر سەدو پەنجا جەنگاوەرم لەگەڵ خۆم برد هەموویان ئەسپ سواربوون، بتەکانیانمان شکاندن، گەڕاینەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەر و هەواڵی سەرکەوتنەکانمان پێ ڕاگەیاند ئەویش دوعای بۆ ئێمە و ئەحمەسەکان کرد.[٢١١]

ئەمجار پێغەمبەری خودا لەمەککە داو تارێکی بۆ خەڵکەکە داو ئەوەی ڕاگەیاند کە ئاخی مەککە خاکێکی پیرۆزە و تارۆژی قیامەت پیرۆزییەکەی بەردەوامە، بۆ هیچ کەسێکی ئیماندار ڕەوانیە خوێنی تێدا بڕێژێ یان دەرختی ببڕێ، فەرمووی: خوێنڕشتن و داربڕین لەمەککە بۆ کەس لەپێش منداو لەدوامنیش حەڵاڵ نەبووەو نابێ، ئەمجار گەڕایەوەی بۆ مەدینە.

هەڵبەتە رزگار کردنی مەککە کاریگەرییەکی قوڵو بەتەوژمی هەبوو لەدڵو دەروونی عەرەبەکاندا، دوا بەدوای رزگار کردنی مەککە خودا هیدایەتی زۆریانی دا بۆ ئیمان هێنان، وەجبە وەجبە و پۆل پۆل دەهاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە موسوڵمان دەبوون، ژمارەیەکی زۆر لەهۆزە عەرەبەکان لەگەڵ قورەیشدا عەهدو پەیمانیان هەبوو بەگوێرەی ئەو پەیمانانە ڕێگایان نەبوو ئیمان بهێنن، چونکە پابەند بوون بەپەیمانەوە لای عەرەبەکان زۆر گرنگی پێ دەدرا، هەندێ تیرەو هۆزی عەرەب لەقورەیشییەکان دەترسان یان ڕێزیان لێ دەگرتن و ئەوانیان لەخۆ نەدەڕەنجاند، جا کە بینیان قورەیشییەکان بۆخۆیان چونە ناو ئایینی ئیسلامەوە باوەشیان بۆ

---

[٢١١] (الأحمس) پیاوی جەنگاوەرو ئازاو نەبەرد و خۆڕاگر. یان توند ڕەو لەبارەی ئایینەوە.

کردۆتەوە، ئەو لەمپەرە لەبەردەم خەڵکی تردا لاچوو، هۆزەکانی عەرەب پێیان وابوو هەرکەسێ ستەمکارو خراپەکاربێ نا توانی مەککە کۆنترۆڵ بکا، هەرکەسێ بەمەبەستی زیانگەیاندن بەکەعبەو مەککە هێرش بکاتە سەر ئەو شارە سەرکەوتوونابێ، ئەو سەردەمە هێشتا کەسانێك مابوون، روداوای فیلیان دیبوو یان هاوچەرخی بوون، بەچاوی خۆیان دیبویان ئەبرەهە چی بەسەرهات. دەیانگوت:واز لەموحەممەد بێنن، چاوەروان بن ئەگەر بەسەر گەل‌و نەتەوەکەی دا زاڵ بوو ئەوە پێغەمبەرێکی راستگۆیە. جا کە پەروەردگار مەککەی خستە ژێر دەسەڵاتی پێغەمبەرەوە قورەیش بەخۆشی و ناخۆشی موسوڵمان بوون، ئیتر عەرەبەکان لەهەموو لایەکەوە رویان کردە ئیسلام و کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمان بوون‌و چوونە ژێر ئالای ئیسلامەوە، وەکو قورئان لەو بارەو دەفەرموێ ﴿إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا. سورة النصر (١-٢)﴾.ئەی موحەممەد! هەرکاتێ بەسەر دوژمنە قورەیشییەکانتدا زاڵ بووی‌و یارمەتی دانی خودات بۆ دەستەبەر بوو، شاری مەککەت بۆ رزگار کراو باڵادەست بووی. ئادەمیزادی بەرەگەز عەرەب‌و ناعەرەبت بینین پۆل پۆل دەهاتنە ژێر خێوەتی ئیسلامەوەو موسڵمانبوونی خۆیان راگەیاند، ئەوە تۆ ئەی موحەممەد! شوکرو سوپاسی خودا بکە.

## فەرماندەیەکی گەنجی تازە پێگەیشتوو:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێش ئەوەی مەککە جێ بێڵێ عوتابی کوڕی ئوسەیدی کردە ئەمیری حەج، داوای لێ کرد ئامادەباشی بۆ ئەوکارو ئەرکە بکا، شایەنی باسە ئەوکاتە عوتاب تەمەنی بیست ساڵێك دەبوو نەدەبوو، ئەمە لەکاتێك دابوو گەورە گەورەی هاوەڵان ئامادەبوون ئەمەش ئەوە

دەگەیەنێ کە مەنصەبو پلەو پایە بەلێهاتوویی و هێزو توانا دەبێ، دوایی حەزرەتی ئەبوبەکریش عوتابی بەئەمیر حەج هێشتەوە.

## غەزای حونەین لەمانگی شەوالی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا:

هەوڵێکی تری دوژمنانی خودا بۆ کوژاندنەوەی نوری خودا بە فوی دەم. ئەوەبوو لەدوای رزگارکردنی مەککە، خەڵکەکە پۆل پۆل موسوڵمان دەبون و دەهاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە، ئیتر عەرەبە بتپەرستەکان دواتیری ژەهراوی خۆیان ئاراستەی ئیسلام و موسوڵمانان کرد، هەوڵێکی پوچی سەرنەکەوتوویان دا بۆ دژایەتیکردنی پێغەمبەری ئیسلام و راگرتنی بڵاو بوونەوەی ئایین لەناو جزیرەتولعەرەب دا، ئەوکاتە هەوازین هێزێکی گەورەی عەرەب بوون لەدوا قورەیش هیچ هۆزێکی تر دەسەڵاتی ئەوانی نەبوو، هەموو کاتێکیش لەنێوان ئەوان و قورەیش دا کێبرکێ هەبوو، کە مەککەش رزگار کرا نەهاتن وەکوو قورەیشیەکان ملکەچی ئیسلام بن و موسوڵمان بن، بەخەیاڵی پوچی خۆیان ویستیان ئەو سەروەرییە بۆخۆیان تۆمار بکەن، موسوڵمانەکان لەناو بەرن و ئایینی ئیسلام ریشە کێش بکەن، خەڵکی پەنجەیان بۆ رادێرن و بڵێن: هۆزی هەوازین لەقورەیشییەکان بەدەسەڵات ترو ئازاترن ئەوەی بە قورەیشییەکان نەکرا ئەوان کردیان. لەسەر ئەم خەیاڵە پوچەی خۆیان مالیکی کوڕی عەوف (النضري) سەرۆك خێڵی هەوازین بانگەوازی شەڕی کرد دژی موسوڵمانەکان، وێڕای هۆزی هەوازین، هۆزی ثەقیف هەمووی. هۆزی (نضر)و (جشم) هەموویان تیرەی سەعدی کوڕی بەکر، هەموو ئەم هۆزانە بەپیر بانگەوازییەکەی مالیکی کوڕی عەوفەوە چون و کۆبونەوە لەهۆزی هەوازین تیرەی (کەعب و کیلاب)

هاوبەشیان نەکرد، ئەوانی تر هەموویان کۆبوونەوەو بەرەو موسوڵمانەکان لەشکرکێشیان کرد، لەگەڵ خۆشیان دا ژن و ماڵو منداڵ و ئاژەڵی خۆیانیان هەموو هێنابوو، بەمەبەستی ئەوەی جەنگاوەرەکانیان شەڕی باش بکەنو بەرگری لەماڵو ناموسی خۆیان بکەنو بەهیچ شێوەیەك خەیاڵی ئەوە نەکەن هەڵبێنو دەست بەرداری ماڵو ناموسیان بن.

(درید)ی کوڕی (الصمة) حازری ئەو شەڕە بووە، ئەوکاتە ئەو پیرێکی تەمەن سەدو بیست ساڵە بوو کوێر بوو بوو، پیاوێکی خاوەن ئەزمون بوو، روداوەکانی رۆژگار لەبۆتەیان دابوو، هاوبەشی کردنەکەی هەرئەوە بوو رای لێ وەردەگیرا و بەس ئەگینا هیچی تری پێ نەدەکرا.

مالیکی کوڕی عەوف کە فەرماندەیی گشتی سوپاکەی پێ درابوو لەسەر بڕیاری ئەویش ئەو هەموو ژنو ژاڵو ماڵو سامانو ئاژەڵەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، هەموویان رژاندە دەشتی ئەوطاسەوە (شوێنێکە لەناوچەی هوازن) ئیتر لەو شیوو پێ دەشتەدا دەنگی گریانی ژنو منداڵ و باڕەباڕی حوشترو مەڕو بزنو زەڕینی گوێدرێژو ...هتد. دەنگی دەدایەوە، (درید)ی کوڕی (الصمة) راو بۆ چونەکەی مالیکی کوڕی نەضری بەلاوە هەڵەبوو، تێك گیرانو نێوانیان تێکچوو، بەڵام خەڵکەکە پشتگیری رای مالیکیان کردو گوێیان بەرای (درید)ی خاوەن ئەزموونو دونیادیدە نەدا. ئەمجار مالیك (فەرماندەی گشتی سوپا) فەرمانی دا بە لەشکرەکەی بڕۆن تەنگە بەرایی شیوی حونەین بگرنو خۆیان دابمەزرێنن، دەنگ نەکەن تا سوپای موسوڵمانەکان دەکەونە ناویانەوەو ئەمجار لێیان بدەنو دەستیان لێ نەپارێزن، بەڵکوو بتوانین بەئاسانی لەناویان بەرین. لەولاشەوە پێغەمبەری خودا کە هەواڵی ئەم لەشەکر کەشییەی هۆزی هەوازینو ثەقیفی بیست لەشکرێکی پێکەوناو لەمەدینەوە کەوتەڕێ بەرەو دوژمن ژمارەی

لەشکری موسولمانەکان دوانزە هەزار کەس بوو دوو هەزاریان لەو مەککەییانە بوون کە تازە موسولمان بوون و هەندێکیان هەرئیمانیان نەهێنابوو دەهەزاریشیان لەهاوەڵانی تری بوون کەهاتبوون مەککەیان گرتبوو، تا ئەو کاتە بۆهیچ غەزایەك ژمارەی جەنگاوەرانی موسولمان نەگەیشتبووە ئەو ئەندازەیە، تەنانەت هەندێ لە موسلمانەکان وتیان ئەمڕۆ ئێمە بەهۆی کەمی ژمارە مانەوە توشی شکستی نابین، بەزۆری لەشکرەکەیان بادی هەوا بوو بوون.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) ژمارەیەکی زۆری چەکی هەمەجۆری لە صەفوانی کوڕی ئومەییە وەرگرت، هەرچەند صەفوان موشریك بوو، ئیتر بەرەو ڕوی دوژمن سوپای ئاژوت. لەتەك پێغەمبەردا هەندێ تازە موسولمانبووی بڕوا لەرزۆك هەبوون، هەندێ هۆزی عەرەب درەختێکی سەوزی گەورەیان هەبوو پێیان دەگوت (ذات أنواط) ساڵانە لەدەوری کۆدەبوونەوە، چەکەکانیان پێدا هەڵدەواسی ئاژەڵیان لەلاسەر دەبڕی و چەند ساتێك لەلای درەختەکە دەمانەوە، لەکاتێکدا ئەوتازە موسولمانبوانە لەخزمەت پێغەمبەردا دەڕۆیشتن چاویان بەدرەختێکی لەوجۆرە کەوت ئیتر بیرەوەری سەردەمی نەفامییان هاتەوە یادو ئەو چەژن و رابواردنەیان هاتەوە بەرچاو و دەمیان ئاوی تێ زییاو لەناخەوە حەزیان لێکرد بچنەوە ئەو رۆژگارە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا درەختی (ذات أنواط)مان بۆ دیاری بکە وەکوو چۆن ئەوان درەختی (ذات أنواط)یان هەیە!! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرمووی: (الله أكبر) سوێندم بەوکەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئێوەش هەمان قسەی نەتەوەکەی موساتان کرد: کەپێیان گوت: ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَآئِيلَ الْبَحْرَ فَأَتَوْاْ عَلَى قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَّهُمْ قَالُواْ يَا مُوسَى اجْعَل لَّنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ. سورة الأعراف (١٣٨)﴾ ئەی موسا: (بت)مان بۆ دابنێ

بیپەرستین وەکوو چۆن ئەونەتەوە بتیان هەیەو دەیپەرستن! موسا وتی: بەڕاستی ئێوە نەتەوەیەکی نەفامن..

وەڵڵاهی ئێوە پەیرەوی ڕێبازی نەتەوەکانی پێش خۆتان دەکەن و بست بە بست شوێنیان دەکەون و چاویان لێ دەکەن! موسوڵمانەکان دەیەمی شەشەلآنی ساڵی هەشتەمی کۆچی لەتاریکە شەوی پێش گزنگی بەرەبەیان دا ڕوویان لەدۆڵی حونەین کرد سەرەو ژێر بوونەوە، بێ ئاگابوون لەوەی کە هۆزی هەوازین پێش ئەوانن خۆیان گەیاندۆتە دۆڵەکەو خۆیان دانوساندوەو لە کەمین دان، لەهەموو پەناو پاسارو لادۆڵ و بن کەندەکان دا سەنگەریان گرتووە، هەرئەوەندەیان خۆش بوو گەیشتنە ناو دۆڵەکەو پێیدا بلاو بوونەوە کاتێکیان بەخۆزانی کەوتنە بەر ڕێژنەی تیرو کەوان و لەهەموو لایەکەوە بەشمشێر پەلامار دران، یەکانگیر هەڵمەتیان کرایە سەر و گەمارۆدران.

موسوڵمانەکان بەم پەلامارە لەنکاوە هەڵسڵەمینەوە بەسەریەك دا شکانەوەو شڵەژان و کەس ئاوڕی لەکەس نەدەدایەوە، کات و ساتێکی زۆر ناسك و چارەنووس ساز هاتەکایەوە، نزیك بوو سوپای موسوڵمانەکان وا بشکێن هەڵنەسنەوە بارو دۆخێکی وایان بەسەرداهات دەشوبهایە ئەو حاڵەتەی لەغەزای ئوحوددا توشیان هات، کاتێك دەنگی ئەوە بلاو بۆوە کە پێغەمبەر کوژراوەو لەموسوڵمانەکانیش دابڕابوو.

## پێخۆشبوونی دوژمنان و ڕوخانی بڕوا لەرزۆکەکان:

کاتێك ئەو تازە موسوڵمانبووە مەککەییانەی کە هێشتا بەتەواوی ئیمان لەدڵیاندا نەچەسپابوو، ئەو تیشکانەی موسوڵمانەکانیان بینی، هەندێکیان کەوتنە تەعلیق لێدان و دەربڕینی ڕق و کینی شاراوەیان. هەندێکیان وتیان:

تازه تاسەر دەریا خۆناگرنەوە، هەندێکی تریان وتیان: ئەوا سیحرو جادو بازییەکەی موحەممەد پوچ بووە.

## سەرکەوتن‌و ئارمگرتن:

موسولْمانەکان تالاوی تێشکانیان چەست، پەروەردگار زللەی میهرەبانی ئاڕاستەکردن‌و ئەدەبی ئەوانەی دادا: کە بەزۆریی خۆیان نازین‌و وتیان ئەمڕۆ بەهۆی کەمی ژمارە مانەوە تێناشکێین. دوای سەرکەوتن‌و رزگار کردنی مەککە ئەو تیشکانەیان توش هات‌و لەبۆتەی دان بۆ ئەوەی بڕوایان بەخودا بەهێزبیێ‌و بەسەرکەوتن لەخۆیان بایی نەبن‌و بەتێشکانیش ناهومێد نەبن، جارێکی تر هەڵیساندنەوەو بەسەر دوژمندا زاڵی کردنەوە، ئارامی خستە دڵی پێغەمبەر و موسوڵمانانەوە لەکاتی ئەو ترس‌و بیمەدا، پێغەمبەری خودا وەکوو کێو خۆراگرو چەسپاو لەشوێنی خۆی وەستا بوو، بە سواری ئێسترە بۆزەکەی هیچ ترس‌و خۆفێکی پێوە دیارنەبوو، کۆمەڵێك لەهاوەڵانی (کۆچکەرو یاریدەدەر) بەدەورەوە مابووەوە، چەند کەسێکیش لەخانەوادەی خۆی‌و هەروەها عەباسی کوڕی (عبدالمطلب) لەلای مابوونەوە، عەبباس رێشمەی ئەسپەکەی پێغەمبەری گرتبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: من پێغەمبەرم و درۆنیە من نەوەی (عبدالمطلب)م، کاتێکیش چەند پۆلە شەڕکەرێکی موشریکەکان شالاویان بۆهێنا چنگێکی خۆڵ هەڵگرت‌و پرژاندی بەدەم‌و چاویان دا لەدوورەوە چاویانی پڕکرد لەخۆڵ‌و لەکاری خستن‌و کەوتنە ئەوەی چاوی خۆیان پاك بکەنەوە، جا کە پێغەمبەر بینی موشریکەکان خەریکی ئەوەن چاوی خۆیان ئاسایی بکەنەوە وتی: ئەی عەبباس! بەدەنگی بەرز هاوار بکەو بڵێ: ئەی جەماوەری پەیمانی ژێر درەختی (سومرە)! هەموو وتیان بەڵێ بەڵێ حازرین، عەبباس

دەنگی بەرزبوو، موسوڵمانەکان بەرەو دەنگەکەی دەهاتن هەیانبوو لەپەلە پەلیان لەحوشترەکەی دادەبەزی و شمشێرو تیرو کەوان و تیردانەکەی هەڵدەگرت و دەهات تا دەگەیشتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەوجۆرە کۆمەڵێکی باش لە هاوەڵان لەدەوری گرد بونەوە، ئەمجار بەفەرمانی پێغەمبەر بەرەو ڕوی دوژمن بوونەوە، شەڕ دامەزراو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ خۆی سەروکاری شەڕەکەی دەکرد، سەیری کرد وا شەڕە شمشێرەو هەردولا تێك هالاون، فەرمووی: ئێستا شەڕ گەرم بوو، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەندێ بەردە وردەی هەڵگرتن بەرەو ڕوی دوژمن هاویشتنی، عەبباس دەڵێ: ئیتر من دەمدی دوژمن لە تێشکان و هەلاتن دا بوو، لەهیچ شوێنێك خۆیان پێ نەدەگیرایەوە، ورە روخاوو ئەژنۆ شکاوو هێز تێدانەماو!.

شەڕ بەردەوام بوو، هیچ شتێك نەبوو سەرکەوتن بۆ دوژمن دەستەبەر بکا، تێشکان بەدوا تێشکان دادەهات، هەتا وای لێهات دیلی دوژمن لەلای پێغەمبەر لەبەر زۆرییان پاڵە پەستۆیان بوو، خودا فریشتەی ناردنە خوار بۆ بۆ یارمەتیدانی موسوڵمانەکان، دۆڵی حونەین پڕبوو لەفریشتە شکانی هۆزی هەوازین تەواو بوو، قورئانی پیرۆز دەربارەی رووداوەکانی ئەم غەزایە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ، ثُمَّ أَنَزلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ. سورة التوبة (٢٥-٢٦)﴾ بە تێشکانی کافرەکان لەغەزای حونەین دا، شان و شکۆی عەرەبە موشریکەکان نزم بۆوە، ئاگری شەڕەنگێزییان کوژایەوە، هێزو توانایان نەما، چەکی شەڕیان کول بوو کۆڕو

کۆمەڵیان لاوازو زەلیل. خودا هیدایەتی دان بۆ ئیمان هێنان‌و هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە.

کە هۆزی هەوازین لە حونەین تێشکان و ئەو هەموو کوژراوو دیلەیان دا، ئەو هەموو ئافرەت‌و ماڵ‌و سامان‌و ئاژەڵەیان کەوتە دەست موسوڵمانەکان کۆمەڵێکیان بەسەرۆکایەتی مالیکی کوڕی عەوفی سەرۆکیان، بەرەو طائیف هەڵاتن و پەنایان بۆ ئەوێ بردو ویستیان خۆیانی تێدا قایم بکەن‌و خەڵکی تریان پێوە نووسا، بوونە هێزێکی گەورە، سەرەتا لە ئەوطاس‌دا لەشکر بەزییان کرد، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەسەرۆکایەتی ئەبو عامیری (الأشعري) هێزێکی بۆ ناردن، کەوتە جەنگ لەگەڵیان داو عامیر شەهید کرا، ولێ سەرەنجام هێزی موسوڵمانەکان توانییان هێزی کافرەکان لە شوێنی خۆیان هەڵکەنن‌و بەرەو طائیف راویان نێن.

ئەمجار دەست کرا بە کۆکردنەوەو سەرژمێر کردنی دیل‌و ئافرەت‌و منداڵی دەست بەسەراگیراو و ماڵ‌و سامانی بەجێ ماو، هەموو دەستکەوتی جەنگ گرد کرایەوە لەشوێنێك کەپێی دەگوترێ (الجعرانة)[٢١٢] دانرا، ژمارەی دەستکەوت لە ئافرەت‌و منداڵەکان شەش هەزار کەس بوو بیست‌و چوار هەزار سەر حوشتر و چل هەزار سەر مەڕو بزن‌و چوار هەزار ئۆقیە زیو دەستکەوتی جەنگی حونەین بوو، تا ئەو رۆژە موسوڵمانەکان دەستکەوتی لەوجۆرەیان بەدەست نەهێنابوو، هەرچەندە موسوڵمانەکان زۆر دڵیان بەو دەستکەوتانە خۆش بوو بەتەما بوون بەسەریان دا دابەش بکرێ، وەلێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دابەشی نەکرد، دەیویست ئەم تالانییە ببێتە هۆی

---

[٢١٢] جەعرانە شوێنێکە دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی مەککە بەلای طائف‌دا ٢٠ کیلۆ مەتر لەمەککەوە دوورە، دەکەوێتە دەرەوەی حەرەم پێغەمبەر لەوێ بۆ عەمرە ئیحرامی بەست.

موسوڵمانبوونی ئەو هۆزانە، بۆیە فەرمانی دا سوپای موسوڵمانان بەرەو طائیف بکەوێتە ڕێ و ئابڵوقەی بدەن، چونکە دەستەو تاقمە پەرتەوازەو هەڵاتوەکانی هەوازین لەوشارەدا خۆیان حەشار دابوو.

لەشەڕی حونەین دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر حەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە و داوای لێ کردبوون کەنابێ بەهیچ جۆرێ منداڵو ئافرەت بکوژرێن، کۆیلەو خەڵکی بەزۆر هێنراو بکوژرێن، بۆیە لەوشەڕە خوێناویەیدا ئەو هەموو ئافرەتو منداڵە گیانیان پارێزراو بوو، کاتێك هەواڵی ئەوەیان پێدا: کە ئافرەتێك کوژراوە زۆری پێ ناخۆش بوو ئەسەفی بۆ خوارد.

## غەزای طائف مانگی شەشەلانی ساڵی هەشتەمی کۆچی:

هێزە پەڕاگەندەکانی هۆزی ثەقیف خۆیان خزاندە ناوشاری طائیفەوە دەرگای سەرەکی شاریان لەسەر خۆیان گاڵدا، کەلێن و کونو کەلەبەری روخاوی قەڵاکەیان تەعمیر کردەوە، پێویستی ساڵێکیان لەگەڵ خۆیان بردە ژوورەوە، پێویستی شەڕیان ئامادەکرد. پێغەمبەری خودا بەلەشکرێکەوە لەمانگی شەشەلانی ساڵی هەشتەمی کۆچی بەمەبەستی چوونە سەریان رۆیی تاگەیشتە شوێنێکی نزیك شاری طائیف، چەندێك هەوڵیان دا نەیانتوانی بچنە ناو شارەکەوە، چونکە دەوران دەوری شار قەڵاو شورابوو، دەرگای سەرەکییان لەسەرخۆیان گاڵدا بوو، پیاوانی هۆزی ثەقیف کە تیرئەندازی بەناوبانگ بوون لەمەتەرێزی قەڵاو شوراکانەوە بەچڕو پڕی تیربارانی موسوڵمانەکانیان دەکردو سەرەتیر وەکوو قاچەقوللە دەکەوتنە ناویان!.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەوای زانی لەشکرەکەی ئەوەندە دوورخستەوە کەتیریان نەگاتێ، لەهەموولایەکەوە بۆماوەی بیست و حەوت شەو گەمارۆی خستە سەر شارەکە، شەڕێکی نەبەردانەو دلێرانەیان لەگەڵدا کردن، تیر بارانی یەکتریان کرد، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەم شارە دا بۆ یەکەمجار مەنجەنیقی بەکارهێناو گەمارۆی لەسەر توندتر کردن، چەند کەسێك لەموسوڵمانەکان بەتیر شەهیدبوون.

جا کە پێغەمبەر گەمارۆکەی توند تر کردو شەڕو تیربارانکردنی یەکتری درێژەی کێشاو دانیشتوانی طائیف ملیان نەدا، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی کرد بەبڕینی ڕەزەکانیان کەسەرچاوەی بژێوو گوزەرانیان بوون، کە دەستیان کرد بەبڕینی درەختی میوەکانیان، دانیشتوانی طائیف هاواریان لێ هەڵساو پاڕانەوە داوایان لە پێغەمبەر کرد لەبەرخاتری خودا و صیلەی ڕەحم واز لەبڕینی ڕەزەکانیان بێنن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەوالەبەر خاتری خوداو صیلەی ڕەحم وازم هێنا. ئەمجار بانگدەرێك بەناوی پێغەمبەرەوە بانگی هەڵدا وتی: هەرکۆیلەیەك لەقەڵا بێتە خوارەوە پەیوەندی بە ئێمەوە بکا ئەو ئازادە، زیاد لەپانزە کەس بەم بۆنەوە لەقەڵاکە خۆیان دزییەوە و پەیوەندییان بەسوپای موسوڵمانانەوە کرد، لەریوایەتێك دا هاتووە دەڵێ ژمارەیان (٢٣)کەس بووە یەکێ لەوانە (ئەبوبەکرە) بوو، پێغەمبەر لەسەر وادەکەی خۆی ئازادی کردن، هەر پیاوێکی لەوانە خستە لای پیاوێکی موسوڵمان بۆئەوەی بژێوی بۆدابین بکا، خەڵکی طائیف بەمە زۆر تەنگەتاو بوون، زۆریان لەسەر شان گرانبوو.[٢١٣]

---

(٢١٣) زاد المعاد ج١/٤٥٧.

پێغەمبەر ڕێگەی پێ نەدرا شاری طائیف فەتح بکا، چەند هۆکارێك هاتنە پێش و بوونە کۆسپ لەبەردەم گرتنی دا، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی بە عومەری کوڕی خەتتاب کرد، کە بەناو لەشکرەکەدا بانگ هەڵبدا بەگەڕانەوە و کۆتایی هاتنی گەمارۆی سەر طائیف. خەڵکەکە کەوتنە بۆڵە بۆڵکردن و مقۆمقۆ وتیان: چۆن دەبێ ئێمە بگەڕێینەوە و شاری طائیف مان ڕزگار نەکردبێ؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دەباشە بەیانی شەڕیان لەگەڵ بکەن و هەڵکوتنە سەریان، بەیانی شەڕ بەرپا بوو لەسەر لێواری شورەی قەڵاکەو بەدووره تیر کۆمەڵێك موسوڵمان بریندار بوون و هیچیشیان پێ نەکردن، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی بەیانی خودا حەزکا دەگەڕێینەوە، ئەمجارە موسوڵمانەکان گەڕانەوەیان پێ خۆش بوو، هەر بەرەبەیان خۆیان حازر کرد دەستیان کرد بەگەڕانەوەو پێغەمبەریش کەبینی وارایان گۆڕی لەبەر خۆیەوە پێکەنینی پێیان دەهات.[٢١٤]

## ژن و منداڵی دەست بەسەراگیراوی غەزای حونەین و دەستکەوتەکانی تری:

پێغەمبەری خودا کە گەمارۆی لەسەر طائیف هەڵگرت و گەڕایەوە، بە لەشکرەکەیەوە چووە (الجعرانة) کە دەستکەوتی غەزای حونەینی تێدا گرد کرابووەوە، هەرچەندە تازە موسوڵمانبووەکان و دەشتەکییەکان ئەوانەی هێشتا بیرو باوەڕی ئیسلامەتی لەدڵ و دەروونیان دا جێگیر نەبوو بوو حەزیان لەوەبوو زوو ماڵ و تالانیەکەیان بەسەردا دابەش بکرێ، وەلێ

---

[٢١٤] اخرجه مسلم في الجهاد و السير باب غزوة الطائف رقم الحديث ١٧٧٨ و صحيح البخاري باب غزوة الطائف.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیویست دوای بخا بە مەبەستی ئەوەی خاوەنەکانیان بێن بە شوێنیاو هاتنەکەیان ببێتە هۆی موسوڵمانبونیان، تەنانەت زیاد لەپانزە رۆژ چاوەڕوانی هۆزی (هەوازین)ی کرد بین لەژن و منداڵو ماڵو سامانی خۆیان بپرسنەوە ونەهاتن، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستی کرد بەدابەشکردنی تاڵانی یەکە، سەرەتا بەشی ئەوانەی دا کەتازە موسوڵمان بوو بوون، ئەمجا بەشی سەرۆکە. قورەیشی یەکانی لێدا، بەشێکی باشی دا بە ئەبو سەفیانی کوڕی حەرب و هەردوو کوڕەکەی یەزیدو معاویە، هەروا حەکیمی کوڕی حیزام (النضر)ی کوڕی (الحارث)و (العلاء)ی کوڕی الحارثء کەسانی دیکەش لەسەرانی قورەیش.. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ویستی بەشێکی وایان بداتێ لەسەر موسوڵمانەتی دڵیان دابمەزرێو دڵسۆزبن بۆ ئیسلام، ئەمانە پێیان دەگوترێ: (مؤلفة القلوب) ئەمجار دەستی کرد بەدابەشکردنی تاڵانی یەکە بەسەر خەڵکە کەداو بەشی یاریدە دەرانی لێنەدا، هەندێ گەنجی یاریدە دەران کەوتنە گلەیی و گازندە کردن و ووتیان: بۆچی دەبێ بەشی سەرانی قورەیش و تازە موسوڵمانبوە کان بدرێو یاریدەدەران بێبەش بکرێ؟!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانی کرد یاریدەدەران کۆببنەوە قسەیان لەگەڵ بکا، لەپەنایەکەوە کۆبوونەوە، پێغەمبەر چووە لایان و وتارێکی بۆدان، کاری لەناخیان کرد، چاویان فرمێسکی هەڵوەراند و خۆشەویستی و دڵسۆزی تێدا وروژاندن. فەرمووی ئێوە نەبوون گومڕاو سەرلێ شێواو بوون خودا بەهۆی منەوە هیدایەتی دان، هەژار بوون دەوڵەمەندی کردن، لەناویەك دا دوژمنی بابەکوشتەی یەکتر بوون خودا ئاشتی خستە نێوانتانەوەو بوونە براو خۆشەویستی یەکتری؟!

هەموو وتیان خوداو پێغەمبەری خودا فەضڵو منەتیان بەسەر ئێمەوە زۆرە. جاکە ئەنصارەکان بێ دەنگ بوون فەیرمووی ئەوە بۆ وەڵامم نادەنەوە و بەرگری لەخۆتان ناکەن؟

وتیان ئەی پێغەمبەری خودا وەڵامی چیت بدەینەوە، فەضلو منەت بۆخواو و پێغەمبەری خودایە.. پێغەمبەر فەرمووی: وەڵڵاهی ئەگەر بتانەوێ وەڵام بدەنەوە قسەتان هەیەو راستیشتان دەکردو منیش دەمسەلماند، دەتانتوانی بڵێین، هاتیتە ناومان بەدرۆیان خستبویەوە، ئێمە بڕوامان پێ کردی، سوکایەتییان پێ کردبووی ئێمە یارمەتیمان دای، دەریان کردبووی ئێمە لەخۆمان گرتی، هەژارو بێ دەرەتان بووی دڵنەوایمان کردی. ئەمجار وتەیەکی کاریگەری ئاراستەکردن ئاماژەی ئەوەی تێدا بوو بۆچی جودا وازی کراوە لەنێوان ئەوانو کەسانی دیکەدا، بۆچی بەشی وان نەدراوەو سەرانی قورەیش و تازە موسولمانبوەکان بەشی باشیان دراوەتێ، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصارەکان ئەوەچیتان لەدڵی خۆتان گرتووە دەربارەی من چیتان گوتووە؟ ئەوە بەوە دڵگران بوون کەمن بەهەندێ پڕو پیتی دونیایی ئەوانم دڵخۆش کردوە بۆئەوەی ئیمان لەدڵیان دا بچەسپێ، ئێوەشم بەئایینەکەی خۆتان سپاردوە، دڵنیام لەوەی کەبیرو باوەڕی ئێوە دامەزراوو چەسپاوە. ئەمجار وتەیەکی کاریگەرتری ئاراستە کردن خۆیان لەئاستیانەگرتو ئیمانو سۆزو خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەر و ئایین فوارەی بەست. ئەوە بوو رووی تێکردنو فەرمووی: ئەی کۆمەڵی یاریدەدەران! ئەرێ ئێوە بەوەرازی نابن کەخەڵکی تر دینارو درەم و مەڕو ماڵات ببنەوە بۆماڵەوەیان کەئەمانە مایەی خۆشی ئەم جیهانە بێبەقایەن، بەڵام ئێوە لەباتی ئەو پەرۆ و پیتاڵانەی ئەوان دەیبەنەوە پێغەمبەر ی خودا لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆ ماڵەوەتان و ئەوله خۆتان رازی بکەن، کە رازی بوونی ئەو

مایەی بەختەوەری هەردو دونیایە، سوێندم بەوکەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەوەی لەگەڵ خۆتانی دەبەنەوە زۆر زۆر باشترە لەوەی ئەوان لەگەڵ خۆیانی دەبەنەوە، ئەگەر کۆچکردن نەبوایە من خۆم یەکێك دەبوم لەئێوەی ئەنصار، باش بزانن ئەگەر خەڵکی تر هەموویان لەشارێگەکانەوە بڕۆنو ئێوەی ئەنصار لەباریکە ڕێگەکەیەوە بڕۆن، من لەڕێگەکەی ئێوەوە دەڕۆم، خودایە ڕەحم بە یاریدە دەران بکە، ڕەحم بەکوڕەکانیان بکە، ڕەحم بەکوڕی کوڕەکانیان بکە.

ئیتر خەڵکەکە دەستیان کرد بەگریان هەتا هەموو ریشیان بەفرمێسك تەڕبوو، بەیەك دەنگ هاواریان کرد بەڵێ ڕازین بەوەی پێغەمبەر بەشی ئێمە بێ..

لەدوای دابەشکردنی تالآن شاندی هەوازین هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) موسوڵمان بوون، ژمارەیان چواردە کەس بوون. پێغەمبەر زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردن، پاشان داوایان لێ کرد کەئەو ژنو منداڵوماڵو سامانەی لەجەنگی حونەین دا دەستی بەسەرداگیراوە بەپیاوەتی بیاندەنەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئێوە دەزانن من چیم لەگەڵدایە، من قسەی ڕاستو بێ پێچ و پەنام پێ خۆشە. ئایا ئێوە دەتانەوێ ژنو منداڵەکانتان بدرێتەوە یان ماڵو سامانەکەتان؟ وتیان: ئێمە هیچ شتێك بەناموس ناگۆڕینەوە، ژنو منداڵەکانمان بدەنەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ئەوەی بەشی خۆمو بەشی بەرەی (عبدالمطلب)ە لەئێستا وە بۆخۆتان بێ، بۆ ئەوانی تریش کەنوێژی نیوەڕۆمان کرد، بەکۆمەڵ ئێوە هەڵسن بڵێن: ئێمە پێغەمبەری خودا دەکەینە تکاکار کەئەو ئافرەتو منداڵە دەست بەسەرگیراوانەمان بدەنەوە. جا کە پێغەمبەر نوێژی نیوەڕۆی کرد، شاندەکەی هەوازین هەڵسانە سەرپێو وتیان: پێغەمبەری خودا دەکەینە

تکاکار بۆلای موسوڵمانەکان و موسوڵمانانیش بۆ لای پێغەمبەر کە ئافرەت و منداڵەکانمان بدەنەوە، پێغەمبەریش هەڵسایە سەرپێ و فەرمووی: ئەوەی لای خۆمو لای بەرەبابی (عبدالمطلب)ە ئەوا دامنەوە، ئەمجارە روی کردە موسوڵمانەکانو فەرمووی: موسوڵمانینە! ئەم برایانەتان لەهەڵوێستی پێشوویان پەشیمانبوونەوە و موسوڵمان بوون، هاتوونە لاتان داوای ژنو منداڵی خۆیان دەکەنەوە، منیش پێم خۆشە بیاندەنەوە، جا هەرکەس حەزدەکا بابیاندتەوە، ئەوەی ناشیەوێ بەخۆڕایی بیانداتەوە با بەقەرز بیاندەنە من، لەمەو دوا من لەیەکەم دەسکەوتا تۆڵەیان بۆدەکەمەوە، هەرخێرا کۆچکەرەکانو یاریدەدەران وتیان: ئەوەی بەشی ئێمەیە ئەوا دامانەوە بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خۆی سەرپشك بێ چۆنیان دەداتەوە بابیانداتەوە، ئەمجار خەڵکەکە هەرکەسە لەعاست خۆیەوە راست بۆوە و وتیان: ئێمەش پێمان خۆشە، پێغەمبەر فەرمووی من بەوشێوە نازانم کێ رازی یەو کێ ناڕازییە، باهەر کۆمەڵە نوێنەرێك دیاری بکاو بێ تێم بگەیەنێ، هەرکۆمەڵە و نوێنەری خۆی دیاری کردو ناردیانە خزمەت پێغەمبەر و هەموویان رازی بوون بە گێرانەوەی ژنو منداڵە دەست بەسەرا گیراوەکان بۆلای هەوازینیەکان.

بێجگە لەسێ کەس، ئەقرەعی کوڕی حابیس و عویەینەی کوڕی جەعینو عەباسی کوڕی مەرداس. ئەمانە رازی نەبوون بەشی خۆیان بدەنەوە، وەلێ کۆمەڵی بەنوسەلیم (خزمەکانی عەباس) گوێیان نەدایە عەباسو بەشی خۆیان پێ دانەوە، ئەوانی تریش پێغەمبەر بەقەرز لێی وەرگرتنەوەو هەموویانی بۆگێڕانەوەو کەس سەرپێچی نەکرد، بۆهەریەکێ لەوماڵو منداڵانە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەرو کراسی کەتانی دەستکردی قیبطي لەبەرکردن. وەلێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ژنو منداڵی مالیکی کوڕی

عەوفی گل دایەوە، ئەوانیش وتیان: چۆن دەبێ ئێمە ژن‌و منداڵی ئەو حەمکە خەڵکە ببەینەوە ژن‌و منداڵی سەرۆکەکانمان نەبەینەوە؟! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خێرو خۆشیم بۆیان دەوێ، ئەمجار سپاردنی بەدایکی عەبدوڵلای کوڕی ئومەییە کەپوریان بوو، هەواڵی مالیکی کوڕی عەوفی لێ پرسین، لەوەڵام دا وتیان لەوڕۆژەوە رایکردوە بۆناو ثەقیفی یەکان لە طائیف و لەوێ ماوەتەوە. فەرمووی: پێی بڵێن: ئەگەر بێ‌و موسوڵمان ببێ سەد حوشتری پێ دەبەخشم. مالیک کەئەم هەواڵەی بیست بەنهێنی قەڵای طائیفی جێهێشت و هاتە خزمەت پێغەمبەر و موسوڵمان بوو؟ پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر بەڵێنەکەی خۆی سەد حوشترەکەی پێ بەخشی و ژن‌و منداڵەکانیشی دایەوەو کردی بەسەرۆکی موسوڵمانەکانی هەوازین.

یەکێك لەوئافرەتە دەست بەسەراگیراوانەی غەزای حونەین (الشیماء)ی کچی حەلیمەی سەعدییە بوو، کە خوشکی شیری پێغەمبەر بوو، کە هێنابوویان بۆلای پێغەمبەر هاوەڵانی کەمێك بەتوندو تیژی لەگەڵیا جوڵابوونەوە، نەیانزانیبوو کە ئەم ئافرەتە کێیە، ئەویش بەلەخۆڕادیوی یەوە وتبوی وەڵڵاهی باش بزانن من خوشکی شیری پێغەمبەرەکەتانم، ئەوانیش بڕوایان پێ نەکردبوو تاهێنابوویانە خزمەت پێغەمبەر، کەهاتە خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من خوشکی شیری تۆم، پێغەمبەر دەفەرموێ بەچ بەڵگەو نیشانەیەك؟ دەڵێ نیشان بەو نیشانە من لەکۆڵم کردبووی گازێکت لەپشتم گرتووە ئێستاش ئێشەکەی لەڵما ماوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ناسیەوە وزانی ئەمە شەیمای کچی حاریسە و خوشکی شیرییەتی بانگی کردە لای خۆیەوە و عەباکەی بۆ ڕاخست لەتەنیشت خۆیەوە داینا، ئەمجار فەرمووی: بۆ خۆت سەرپشك بە ئەگەر لای من

دەمێنیتەوە بەرێزو خۆشەویستنییەوە خزمەتت دەکەم، ئەگەر پێت خۆشە دەتنێرمەوە بۆلای کەسوکاری خۆت، شەیماء وتی: پێم خۆشە یارمەتیم بدەی‌و بچمەوە بۆلای کەسوکاری خۆم، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: یارمەتیشت دەدەم دەشتنێرمەوە بۆلای کەسو کارەکانت، شەیما ئیمانی هێنا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سێ کۆیلەو کەنیزەکێك‌و بڕی مەڕو بزنی پێ بەخشی‌و ڕەوانەی کردەوە.

## عومرەکردنی پێغەمبەر (عمرة الجعرانة):

پێغەمبەری خودا لەگەڵ هاوەڵانی بەبۆنەی ئیش‌و کارەوە سیانزە ڕۆژ لە جەعرانە مانەوە، هەموو تاڵانی‌و دەستکەوتی غەزای حونەینی دابەش کرد، یان گەڕاندییەوە.

جەعرانە قونائاخە ڕێیەك لەمەککە دوورە و میقانی دانیشتوانی طائیفە، هەر لەوێوە ئیحرامی عومرەی بەست‌و هاتە مەککەو تەافی کەعبەی کردو پێویستیاتی عومرەی بەجێ هێناو مەعازی کوڕی جەبەلی لەمەککە دانا فێری ئیسلامەتییان بکا! ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەمانگی ذیلقەعیدەی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا گەڕایەوە بۆ مەدینە[٢١٥] کاتێ موسوڵمانەکان وڵاتی (طائیف) یان جێ هێشت‌و گەڕانەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بڵێن: دەگەڕێینەوە بە تۆبەکاری‌و بەندایەتیکردن بۆ پەروەردگارمان و سوپاسگوزاری کردن بۆ زاتی پاکی. عەرزی پێغەمبەریان کرد وتیان: دوعا بکە هۆزی ثەقیف بدەو دڵیان نەرم بێ بێن بۆلام موسوڵمان بن. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەرەو مەدینە دەهاتەوە پێش ئەوەی بگاتەوە ناوشار عوروەی کوڕی مەسعوودی ثەقەفی گەییشتە خزمەتی‌و ئیمانی

---

[٢١٥] سيرة ابن هشام جـ٢/٥٠٠ و الجامع الصحيح كتاب باب غزوة الحديبية.

هێناو گەڕایەوە بۆناو قەومەکەی بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان، عوروە لەلای هۆزو نەتەوەکەی ریزێکی تایبەتی هەبوو، کەبانگی کردن بۆ موسڵمانبوون و ئەوەی درکاند کەخۆی موسوڵمان بووە تیرە بارانیان کردو شەهید بوو.

هۆزی ثەقیف لەدوای کوژرانی عوروە چەند مانگێك مانەوە دوایی کۆبونەوەیەکیان گرێدا، دوای ئاڵو گۆڕکردنی بیروڕا هاتنە سەرئەوە: کە ناتوانن شەڕ لەگەڵ عەرەبە موسوڵمانەکانی دەرو بەریان بکەن، بۆیە وایان بەباش زانی کەبەیعەت بکەن و موسوڵمان ببن، بۆ ئەم مەبەستە شاندێکیان پێکەوە ناو ناردیان بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەفدەکە گەیشت و چوونە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەپەنا مزگەوتەکەی و خێمەیەکیان بۆهەڵدان، موسوڵمان بوون و داوایان لە پێغەمبەر کرد کە بۆماوەی سێ ساڵ رێگەیان بدا پەیکەری (بت)ی (اللات) بهێڵنەوە و نەیروخێنن پێغەمبەر رازی نەبوو، ئەمجار بەئیلحاحەوە داوایان لێکرد ساڵێك بیهێڵنەوە پێغەمبەر رازی نەبوو ئەمجار وتیان: لەم رۆوە مانگێك بۆمان بهێڵەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی بەهیچ جۆرێك رێگەی ئەوە نادەم و ئەبوسەفیانی کوڕی حەرب و (المغیرة)ی کوڕی شوعبە کەئەمیان لە هۆزی ئەوان بوو، دەنێرم پەیکەری بتی (لات) بڕوخێنن. ئەمجار داوای ئەوەیان کرد نوێژیان لەسەر لاببا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی خێر لە ئاینێك دا نییە نوێژی تێدا نەبێ. جاکە گفت و گۆیان لەگەڵ پێغەمبەر دا تەواو کرد گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەبوسەفیان کوڕی حەرب و موغەیرەی کوڕی شوعبەی لەگەڵ دا ناردن، بەگەیشتنیان بۆ ئەوێ موغەیرە یەکسەر پەیکەری (بت)ی (اللات)ی تێك روخاند، ئاییینی ئیسلام لەو وڵاتەدا بڵاو بۆوە تەنانەت هەموو ئەهلی طائیف تێکڕا موسوڵمان بوون.[٢١٦]

---

[٢١٦] زاد المعاد جـ١/٤٥٨-٤٥٩.

## موسوڵمانبوونی کەعبی کوڕی زوهەیر:

کە پێغەمبەری خودا لە طائیف گەڕایەوە کەعبی کوڕی زوهەیر (شاعیری کوڕی شاعیر) هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ). کەعب لەوەپێش زۆری قسەی ناشیرین و جوێنی بە پێغەمبەر دابوو، لەسەر ئەمە خوێنی حەڵاڵ کرابوو، بەم بۆنەوە دونیای لێ وەتەنگ هاتبوو، کۆن نەبوو خۆی تێدا وەشارێ، بوجەیری برای زۆر ئامۆژگاری کردبوو هەڵینابوو بۆئەوەی تۆبە لەتاوانەکانی بکاو بێتەلای پێغەمبەر و ئیعلانی موسوڵمانبوونی خۆی بکا. هەڕەشەی دوارۆژێکی رەش و ناخۆشی لێ کردبوو ئەگەر بەگوێی نەکا. ئەویش ئەوچامە بەناو بانگەی دانابوو لەپەسنی پێغەمبەردا کە (قصیدة بانت سعاد)ەو هاتە مەدینە لەکاتی نوێژی بەیانی دا دانیشت و دەستی خستە ناو دەستی یەوە.. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەیدەناسی، بە پێغەمبەری گوت: بێگومان کەعبی کوڕی زوهەیر بەپەشیمانی و موسوڵمانی هاتۆتە خزمەتت و داوای ئەمان و پەنا دەکا. ئایا جەنابت تۆبەو موسوڵمانبوونەکەی لێ وەردەگریێ؟ پیاوێکی ئەنصاری قەڵەمبازی بۆبردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا رێم بدە با لەگەردنی بدەم! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: وازی لێ بێنە، ئەو تۆبەی کردوەو کوفرو بێدینی وەلاناوە، ئەمجار کەعب چامە لامیەکەی خۆی خوێندەوە کەلەسەرەتاوە دەڵێ:

بانت سعد فقلبي اليوم متبول — متيم اثرها لم يفد مكبول

ئەمجار پێوە دەڕواو دەڵێ:

ان الرسول لسيف يستضاء به — مهند من سيوف الله مسلول

پێغەمبەر شیعرەکەی هێندە پێ خۆش بوو بوردەکەی پێ بەخشی. کەعب هەتا لەژیان دابوو ئەو بوردەیەی زۆر بەلاوە بەنرخ بوو، معاویە دەهەزار دیناری زێڕی دایە بیداتێ نەیدایە، وتی: هیچ کەس بەشیاوتر

لەخۆم نازانم بۆ لەبەرکردنی ئەو بوردەیە. کە کەعب مرد معاویە ناردی بۆلای میراتگرەکانی بەبیست هەزار دینار لێی کڕین دوای معاویە ئەم بوردەیە دەستاودەستی کرد تا سەرەنجام کەوتە دەست سوڵتانەکانی عوسمانی.

# غەزای تەبوك[٢١٧] لەمانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی

## کاریگەری دەروونی غەزای تەبوك و هۆیەکانی:

غەزای تەبوك بەئەندازەی ڕزگار کردنی مەککە ترس‌و بیمی خستە دڵی دوژمنانەوە، پەردەی لەسەرچاوی ئەوانە لادا کەپێیان وابوو ئایینی ئیسلام چرایەکە هەڵکراوەو پاشان دەکوژێتەوە، یان هەورێکی هاوینەیەو زۆری پێ ناچێ دەڕەوێتەوە، هەڵبەتە ئەم غەزایە سەرەتای شەڕکردن بوو لەگەڵ گەورەترین هێزو گەورەترین حکومەت و دەوڵەتی ئەو ڕۆژگارە. لەو ڕۆژگارەدا لەدیدی عەرەبەکان دا ئیمپراتۆریەتی ڕۆم زلهێزو حیساب بۆ کراوو بەسام و هەیبەت بوو. ئەبو سوفیان کاتێك گرنگی پێدانی هیرقەلی

---

[٢١٧] شوێنێکە لەولاتی عەرەبدا کە وتۆتە نیوە ڕێگەی نێوان مەدینەو دیمەشق بەلای باشوری خۆرهەڵاتی ئەبلەدا کەوتووە. لە معجم البلدان دا دەڵێ تەبوك لەنێوان حیجرو سەرەتای وڵاتی شام چوار قۆناغ لەحیجرەوە دوورە! دەگوترێ (أصحاب الأيكة) ئەو گەلەی شوعەیب بۆ سەریان نێردرا لەو دەڤەرە بوون! شەش قۆناغ لە دەریای قولزومەوە لەنێوان دوکێوی مسحی و شروی دایە ئێستا سەربازخانەیەکەو سەر بەشاری مەدینەیە و حەوت سەد کیلۆ مەترێك لەمەدینەوە دوورە.

رۆمی بینی کە بەنامەکەی پێغەمبەری دا، کە بە دۆحیەی کەلبی دا بۆی ناردبوو، هەستی کرد هیرقەل حیسابێکی تایبەتی خۆی کردوە بۆ پەیدابوونی پێغەمبەرێك لەنیوە دوورگەی عەرەب دا. ئالەو کاتەدا ئەبو سوفیان بەرێکەوت لەوێ دەبێ‌و دەیبەن بۆلای هیرقەل، دەڵێ کە هیرقەل لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە، بووە قاوو قیژو هەراو هۆریا ئیتر ئێمە کراینە دەرەوە، کە چوینە دەرەوە بەهاوڕێکانی خۆمم گوت: کوڕینە کاری کوڕەکەی ئەبو کەبشە گەورە بوو، خۆ ئەوەتا شای رۆمیش لێی دەترسێ (ئەبو کەبشە مێردی باوکی شیری پێغەمبەرە، مێردی حەلیمە سەعدییەیە کە دایەنی پێغەمبەر بووە.) جا ئەبو سوفیان دەڵێ: ئیتر هەر لەوکاتەوە من دەمزانی کە کاروباری پێغەمبەر سەردەکەوێ گومانم لەوەدا نەبوو تا ئەورۆژەی خودا کردمی بەموسوڵمان‌و چوومە سەر ئایینی ئیسلام؟.

عەرەبەکان لەوەپێش هیچ رۆژێ لەرۆژان بیریان لەوەنەکردبوەوە: کە هێرش بکەنە سەر رۆم، بەڵکوو ئەوان هەمیشە لەوە دەترسان رۆمەکان هێرشیان بۆ بکەن‌و لەناو ماڵی خۆیان دا بیانچەوسێننەوە، تەنانەت زۆریان خۆ لەوە بەبچوکتر دەزانی کەبیر لەوە بکەنەوە هێرش بکەنە سەر رۆم، موسوڵمانەکانیش لە مەدینە هەرکاتێ تەنگانەیەکیان لێ پەیدا بوو بێ یان خەتەرو ترسێك بەر بینگی پێ گرتبێ یەکسەر زەینییان بۆ هێرش‌و پەلاماری غەسانینەکان دەچوو، لەهەموو کاتێك دا ترسی ئەوانیان لەدڵدا بوو، دەی غەسانییەکان فەرمانڕەوایی یەکی سەر بە رۆمەکان بوون. حەزرەتی عومەر لەباسی حوکمی (الایلاء) دا: کە ئاخۆ وەکو تەڵاق وایە یان نا، دەڵێ لەگەڵ کابرایەکی ئەنصاری دا برادەرایەتیم هەبوو، ئەگەر من دیارنەبوومایە هەواڵی روداوەکانی بۆ دەهێنام، ئەگەر ئەو دیارنەبوایە من هەواڵم بۆ دەگێڕایەوە. ئەو کاتە ئێمە ترسی هێرشی پاشایەك لە پاشاکانی

ڕۆممان هەبوو، ڕۆژێك هاوەڵەكەم هات بۆ ماڵمان لەدەرگای داو خێرا خێرا دەیگوت: دەرگا بكەرەوە منیش وتم: چیە خۆ بابای غەسانی هێرشی نەكردووە؟ بۆ وا پەشۆكاوی؟

حكومەتی ڕۆم گەیشتە تۆپەڵاكی شكۆمەندی و دەسەڵات، سوپا ئازاو جەربەزەكەی بەسەرۆكایەتی هیرقەل، سوپای ساسانی ئێرانی شكاندو چووە ناو خاكو وڵاتیەوە داگیری كرد، زۆر بەخراپی ئەو جەیشە گەورەی ساسانی تارومار كرد، بەمە هیرقەل بووە سەرۆكی وڵاتێكی زلهێزو بەدەسەڵات، بەشێوەی كەرنەفالێكی شایانەی بێ وێنە لە (حمص)ەوە ڕۆیشت بۆ ئیلیا، ئەوە بوو ساڵی حەوتەمی كۆچی بەمەبەستی سوپاس و ستایش لەسەر ئەو سەركەوتنەی بەسەر فارسەكان دا، صەلیبی ستێنراوەی لەفارسەكان هەڵگرت و ڕۆیی بۆ شاری ئیلیا، بەهەر شوێنێك دا دەڕۆیی فەرشیان بۆ دادەخست و بۆن و گوڵاویان بەسەردا دەباراند، هیچ هێزێكی ئەو سەردەمە بەخەیاڵیش بیریان لەوە نەدەكردەوە بەگژ سوپای دونیا گری هیرقەل دا بچن. دەی دوساڵ بەسەر ئەوسەركەوتنەی هیرقەلدا تێنەپەڕی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەدینەوە سوپای ڕێكخست و بەرەو وڵاتی ئەو ئیمپراتۆریەتە كەوتە ڕێ. ئەم غەزایە كاریگەرییەكی قوڵ و بەرفراوانی هەبوو لەسەر دڵی عەرەبەكان، ئەوەی گەیاند كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سڵ لەهیچ هێزێك ناكاتەوە، بەمەش پەروەردگار ڕێخۆشكەرەیەكی باشی رزگاركردنی بۆ وڵاتی شام لەسەردەمی خەلیفەی یەكەم و دووەمی راشیدین (ئەبوبەكر و عومەر)دا بەرجەستە كرد، غەزای تەبوك لەسەردەمی پێغەمبەر دا پشتگیری و سەنەد بوو بۆ هێرشەكانی سەردەمی ئەبوبەكرو عومەر (رەزای خوای لێ بێ).

دەربارەی هۆکاری ئەم غەزایە گوتراوە: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی ئەوەی پێ گەیی: کە ڕۆمەکان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ پەلاماردانی سنورە باکوریەکانی وڵاتی عەرەب.

ئیبنو سەعدو مامۆستاکەی کە واقیدی یە، دەڵێن: پێغەمبەری خودا هەواڵی پێ گەیی کە هیرقەل ڕزقو ڕۆزی ساڵێکی سەر لەبەری بۆ دەستو پێوەندەکانی دابین کردوە، پیاوانی هۆزی لەخمو جوزام و عامیلە و غەسان و هی تریش لەعەرەبە مەسیحییەکانی کۆ کردۆتەوەو هەموویانی بەرەو سنوورەکانی باکوری جزیرە ئاژوتون و پێشەتای ئەو سوپایە گەیشتۆتە بەلقاء.

جا ئەم ریوایەتە ڕاست بێ یان نا، گومان لەوەدانیە کە مەبەستی سەرەکی لەم غەزایە ترساندنی ئەو دەوڵەتە دراوسێ یە بوو. کە خەتەری هەبوو بۆ سەر مەکەزی موسوڵمانانو بانگەوازی ئیسلامی و هێزە تازە پێگەیشتووەکەی، و مەنعکردنی لەوەی تەماع بکاتە هێرش هێنان بۆ سەر موسوڵمانان لە زێدو نیشتمانی خۆیان دا، یان پێی وابێ موسوڵمانەکان ماڵو سامانێکی بێ خاوەنو بەرەڵانو پارویێکی نەرم و نۆڵی خۆشجونو بەئاسانی قوت دەدرێن. کەسێك ئەوە حاڵی بێ، سوپاو هێزی ئاراستەی وڵاتی ئیمپراتۆریەتێکی وا زلهێز ناکا، ناچێتە ناو سنووری و تەحەدای ناکا ئەمەیە ئەو حیکمەتەی قورئان لەو ئایەتانەدا کە دەربارەی غەزای تەبوك نازڵ بوون، ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلِيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ. سورة التوبة (١٢٣)﴾ ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان بەتاكو تەنهایی خوداو بە پێغەمبەرێتی موحەممەدو بە هاتنی ڕۆژی قیامەتە، دژی کافرەکان بجەنگن، کامەیان لێتان نزیکترەو هاوسێی (دار الاسلام)ە لەوەوە دەست پێبکەن تا هاوسێ و خزمە نزیکەکانتان نەخەنە ژێر ڕکێفی ئیسلامەوە پەل بۆ دور مەهاوێژن.

بێگومان بەم نەخشە و پلانە خوداییە بۆ جیهادو جەنگان، موسوڵمانان هەڵس و کەوتیان کرد، بۆیە سەرەتا جیهادیان لەدژی جولەکەکانی مەدینە ئەنجام دا، جو لەکەکانی هۆزی قورەیظە و بەنو نەضیر و بەنو قەینوقاعو خەیبەریان تەفرو تونا کرد، ئەمجار پەلاماری موشریکەکانی نیوە دوورگەی عەرەبی یان دا، پاشان سوپای ئیسلام بەرەو شیمالی مەدینە بەڕێ خرا بۆئەوەی جیهاد لەگەڵ رۆمەکان بکەن، لەهەمان کاتیش دا سوپایان بەرەو عێراق و وڵاتی فارس رەوانەکرد. ئەوەتا پەروەردگار بێ پەردە موسوڵمانەکان هاندەدا بۆ بەگژاچوونی کوفرو رامالینی لەمپەرەکان و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ سورة التوبة/١٢٣.

با لەشەڕو رووبەڕووبوونەوە دا کافرەکان، رێگرانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام، توندو تیژی و ئازایەتی لەئێوە ببینن، ئازایەتی و خۆراگری چاو نەترسی و مەردایەتی ئێوەیان بۆ دەربکەوێ، بزانن ئێوە چەند سورن لەسەر گەیاندنی روناکی نووری ئیسلام بەهەموو جیهان.

باش بزانن خودا لەگەڵ تەقوا کارانە، پشتگیری ئەوانە دەکا: کە لەخودا ترسن و پارێزگاری سنوورەکانی دەکەن. خودا لەگەڵتانە ئەگەر ئێوە پابەندی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام بن فەرزو سونەتەکانی ئەنجام بدەن، خاوەن صەبرو خۆگرو پابەندی یاساو نیظام بن، خۆتان لەیاساشکێنی و سنور بەزێنی و کەمتەر خەمی لەدابینکردنی پێویستیاتی بەرەنگار بوونەوەی دوژمن بپارێزن.

بەڵێ ئەو مەبەستەی کە سوپای ئیسلامی بەرەو تەبوك بۆ رەوانەکرا هاتە دی، رۆمەکان چاوترسێن کران، ئەوە بوو سوپای رۆم بەرامبەر ئەم لەشکر کێشیەی موسوڵمانەکان هیچ جم و جوڵێکی سەربازی و

بەرامبەرییان ئەنجام نەدا، بەرەو پێش نەهاتن بەڵکوو نیمچە پاشە کشەیەکیشیان کردو حیسابێکی تایبەتییان بۆ ئەم هێزە تازە رسکاوە کرد کەلەوە پێش نەیانکرد بوو.

حیکمەتێکی تری ئەم غەزایەو لەشکرکێشیە ئازایانە یان بڵێین: ئەو موغامەرە ترسناکەی موسوڵمانەکان ئەنجامیان دا، چاو ترسێنی هۆزە عەرەبەکانی ناو جەزیرە بوو، بۆ ئەوە بوو ترس بخاتە دڵی ئەو هۆزە عەرەبانەی ناو جەزیرە کە تائەو دەمە موسوڵمان نەبوو بوون، هەروا ئەو خێڵە عەرەبانەی بوو بوو نە مەسیحی و ملکەچی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی بون و خۆیان بەرەعایای ئەو دەزانی. لەهەمان کات دا بۆئەوە بوو هەل بۆ رۆمەکان و عەرەبەکانیش برەخسێنێ کە بەجیدی بیر لەداهاتووی خۆیان بکەنەوە، بەوردی بروانن گرنگی ئایینی ئیسلام و وانەزانن موسوڵمانان هێزێکی تازە هەڵتوقیوو تازە پەیدابون و وەکوو بڵقی سەر ئاوو میزەڵدانی هەواتێکراو وان و زوو دەپوکێنەوە. تێبگەن کە ئیسلام داهاتوویەکی پرشنگداری هەیە، بەڵکوو بیرلەوە بکەنەوە ئەو ئایینەی تازە لەناو خاك و وڵاتیان دا سەری هەڵداوە. پێویستە حیسابی بۆ بکرێ بۆیە قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەوانەی هاوبەشی ئەو غەزایەیان کردوە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ اللّهِ وَلاَ يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ لاَ يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلاَ نَصَبٌ وَلاَ مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَطَؤُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلاَ يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلاً إِلاَّ كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ إِنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ سورة التوبة/ ١٢٠. ئەوانەی کەدەچن بۆ جیهاد، برێك خاکی کوفر داگیر دەکەن و پێیان دەخەنە سەری و کافرەکان نارەحەت دەکەن، هەروەها کەفرسەت لە کافرەکان دەبینن و دەست لە دوژمن دەوەشێنن، بەدیل دەیانگرن، یان لێیان دەکوژن، یان تالانیان لێ دەگرن و

شکستیان بەسەر دێنن، ئیللا بەهەر یەکێ لەم شتانە چاکەیان بۆ دەنووسرێ، یان پاداشتی باشیان دەدرێتەوە.

بێگومان رۆمەکان هەمیشە و ئێستاشی لەگەڵ دابێ یادی غەزای مۆتە دەکەنەوە، کەهیچ پێداویستی یەکی ئەوانی جێ بەجێ نەکرد، ئاکامەکەی ئەوە بوو هەردوولایان لەگۆڕەپانی جەنگ پاشە کشەیان کرد، بەبێ دەستکەوتی تالانی گەڕانەوە، بەڵام سامو هەیبەتی ئیمپراتۆرییەتی رۆمو سوپا زەبەلاحەکەی لەدڵی عەرەبەکان دا رەواندەوە بەکورتی ئەم غەزایە گرنگی یەکی تایبەتی هەبوو لە سیرەی پێغەمبەرداو لەمێژووی بانگەوازی ئیسلامی دا چەند مەبەستێکی گرنگ و کاریگەری بەدی هێنا، کە رۆڵی خۆیان هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی موسوڵمانانو رەوتی روداوەکان لەمێژووی زێڕینی ئیسلامی دا.

## کاتی ئەم غەزایە:

کاتی بەڕێ کەوتنی موسوڵمانان بۆ ئەم غەزایە لەمانگی رەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی دا بوو[٢١٨]. لەجەنگەکەی گەرماو کاتی هاوین دا لەکاتێك دا

---

(٢١٨) زۆر زەحمەتە بتوانرێ بەگوێرەی مێژووی زایینی کاتی چون بۆ ئەم غەزایە دیاری بکرێ، بەتەواوی نازانرێ چونی پێغەمبەر لەمەدینەوە بۆ تەبوك لەچ مانگێکی شەمسی دا بووە، هەندێ لەنوسەرو شارەزایانی ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مانگی نۆڤەمبەر یان داناوە بە بەرامبەر لەگەڵ مانگی رەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی دا. لەوانە زانای بەناوبانگ شبلی النعمانی لەکتێبەکەی دا بەناوی (سيرة النبي). وەلێ بەڵگە و نیشانە ناوەکی و ئاماژە بۆ کردنەکانی دەقی ئەو حەدیسەی بوخاری و خاوەنانی صیحاح و سونەن ئەوە دەگەیەنن کە ئەم غەزایە لەکاتی هاوین دا بووە، ئەوەتا لەدەقی حەدیسەکەدا لەسەر زوبانی کەعبی کوڕی مالیك هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای

بوو کە سێبەر خۆش بو بوو میوە پێ گەیشتبوو ئالەم کاتەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی دا موسوڵمانان خۆیان ئامادەبکەن بۆ چون بۆ غەزای رۆم، هەڵبەتە کاتی چون بۆ ئەو غەزایە کاتێکی ناخۆش بوو، لەنێوان کۆتایی وەرزی هاوینو سەرەتای وەرزی پایزدابوو، ساڵەکەش ساڵێکی گرانیو وشكو بێ بارانی بوو، ئازوخە کەم بوو، میوە پێ گەیی بوو کاتی ئەوە بوو خەڵکی بەدیار باخەکانیانەوە بمانایەوە خزمەتیان بکردنایەو

---

لەسەربێ) لەجەنگەی گەرماو میوەگەنان دا بۆ ئەم غەزایە بەرێ کەوت. کەوابێ دەبێ دەقی ئەم ریوایەتە بکەین بەتەرازوو پێوەر بۆ دیاریکردنی کاتی ئەم غەزایە، هەر بیرو بۆچونێك لەگەڵ ئەم ریوایەتەی بوخاری رێك نەبێ پشتی پێ نابەسترێ لە ریوایەتی (موسی)ی کوڕی عوقبەدا لە ئیبنوشیهابەوە هاتووە دەڵێ (في قیظ شدید) لەجەنگەی گەرمادا لە رۆژەکانی پایزدا، خەڵکی خەریکی چنینی خۆر مابوون زیاد لەوەش گوتەی دووڕووەکان کە قورئانی پیرۆز لەسورەتی (التوبة) دا نەقڵی کردووەو ئەمجار رەدیان دەداتەوە دەفەرموێ (و قالوا لاتنفروا في الحر) مونافیقەکان وتیان لەم کاتی گەرمایەدا مەچن بۆ جیهاد. ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ. (٨١) سورة التوبة﴾. مانگی نۆڤەمبەر لەوڵاتی مەدینەو حیجاز دا دەکەوێتە سەرەتای زستانەوە، بەرامبەر کردنی تەقویمی شەمسیو مانگی کارێکی ئاسان نییە. زۆر گێرەو کێشەی تێدایە، چونکە نوسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەر ڕاجیاییان هەیە دەربارەی ساڵی کۆچیو تەقویمی کۆچی ئایا لەمانگی رەبیعولئەوەل دابووە یان لەموحەررەم دابوو! مامۆستا ئیسحاق رافعوری دوای لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنێکی دوورو درێژ بۆ رووداوەکان و غەزاکانی پێغەمبەر بەراورد کردنی نێوان تەقویمی شەمسی و قەمەری گەیشتونەتە ئەوە کەدەرچوونی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ غەزای تەبوك لەمانگی نیسان دا بووە، ئەمەش لە راستییەوە نزیکە چونکە مانگی نیسان لەوڵاتی مەدینەو حیجازدا سەرەتای هاوینە، وەلێ ئەم دەڵێ: تەصادوفی ساڵی ٦٣٠ ز کردوە، مامۆستا شبلی دەڵێ: ساڵی ٦٣٥ زایینی بووە.

بەروبوومەکانیان بچنیایەو بەهیچ لایەك دانە چوونایە. سەرباری ئەمانە هەموو ڕێگای نێوان مەدینەو شام بێ ئاوو دورو ناهەموارە، بۆیە بەپێچەوانەی غەزاکانی تر ئەمجارە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بەڕاشکاوی مەبەستو ڕێڕەوی غەزاکەی بۆ موسوڵمانان ڕاگەیاند، دووڕووەکان کەوتنە مقۆ مقۆو بیانوو هێنانەوە بۆ خۆدزینەوە لەو غەزایە لەلایەکەوە دەترسان شەڕ لەگەڵ ئەو هێزە زەبەللاحەی ڕۆم بکەن، لەسەرێکەوە کاتەکە گەرمو وەختی پێگەیشتنی میوە بوو، لەلایەکی ترەوە حەزیان لەجیهاد نەبوو چونکە بڕوایان پێ نەبوو، گومانیان هەبوو بەدڵ موسوڵمان نەبوو بوون. قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ. سورة التوبة (٨١)﴾ دوو ڕووەکان دڵخۆشن بەوەی کەلە مەدینەدا پاش دراون و نەبراون بۆ غەزاو ئەو بەهرە مەندییەیان بەنسیب نەبووە، کەیفخۆشن بەوە لەماڵەوە دانیشتوونو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لەکاتی بەرێکەوتنی بۆ غەزای تەبوك لەگەڵ خۆی نەبردون، هۆی دڵخۆشییان بەو دەرنەچونەیان بڕوانەبوونیانە بەگرنگی جیهادو بەخێرو بێری تێکۆشان لەپێناو ئایینی خودادا، پێیان ناخۆشە لەتەك پێغەمبەر دا بەماڵو بەگیان جیهاد بکەن، هەڵبەتە پێخۆشبوونیان بەمانەوە لەماڵ مانای ئەوە دەگەیەنێ کە چوونیان پێ ناخۆشە بەڵام پەروەردگار مانای ڕستەکەی جەخت کردەوەو فەرمووی: (و کرهوا أن یجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبیل الله) واتە: پێیان ناخۆشە کە جیهاد بکەن بەماڵو گیانیان لەپێناو ئایینی خودادا هاوبەشی غەزابکەن.

جا وا نەبێ هەر بەپێخۆشبوونی مانەوەیان لەماڵەوە وازبێنن بەڵکوو خەڵکی تریش دەترسێنن لەهاوبەشی کردنو هەڵیان دەفریوێنن بۆ

خۆپاشدانو پاڵدانەوە بەجۆرێك هەندێكیان ئامۆژگاری هەندێكیان دەكرد ﴿وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ. سورة التوبة (٨١)﴾ پێیان گوتن: مەچن بۆ جیهاد لەم وەرزە گەرمایەدا و هاوبەشی ئەو غەزایە مەكەن، كاتەكەی ناسكەو سێبەر خۆشن و میوە گەنانەو بەرو بووم پێگەیشتووە، ماڵو حاڵو باغو باغاتی خۆتان بەجێ مەهێڵن. پەروەردگار ڕەدیان دەداتەوە دەفەرموێ: ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ كە ئامادەكراوە بۆسەرپێچیكاران لەو گەرمایە گەرمترە كەئێوە خۆی لێ دەشێرنەوە، ئەگەر عەقڵو تێفكرینتان ببوایە.

## كێ بڕكێی هاوەڵانی پێغەمبەر لەهاوبەشی كردنی غەزا:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەم سەفەرەیدا زۆر بەجیدی هەڵسو كەوتی كرد، جمو جۆڵی گورجو گۆڵی پێوە دیاربوو، فەرمانی بەهاوەڵانی كرد توندو تۆڵو ئامادە باش بن، دەوڵەمەندە كانی هەڵنان بۆ ماڵبەخشینو دابینكردنی پێویستانی غەزایەكە، چەند دەوڵەمەندێك زوربەی خەرجی غەزاكەیان لەئەستۆ گرتو بەتەما پاداشی باشی خودا بوون.

عوسمانی كوڕی عەفان پێداویستی سوپای تەنگانە (جیش العسرة)ی دابینكرد، هەزار دیناری بەخشی پێغەمبەر دوعای بۆكرد، كۆمەڵێك لەهاوەڵە هەژارەكان هاتنە خزمەت پێغەمبەر و داوای وڵاغی سوارییان لێ كرد بۆیان دابین بكاو بچنە غەزا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی ناتوانم وڵاغی سواریتان بۆ دابین بكەم، ئەوانیش زۆر خەفەتبار بوونو پێیان ناخۆش بوو كەناتوانن هاوبەشی بكەن.. قورئان ئەوەی ڕاگەیاند كە ئەوانە گلەییان لەسەر نیە، فەرمووی: ﴿وَلاَ عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لاَ

أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلاَّ يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ. سورة التوبة (٩٢)﴾ هەروەها گلەیی لەسەر ئەوانە نیە کەهاتنە لای تۆ ئەی پێغەمبەر داوای وڵاغی سوارییان لێکردی، ئەتۆش پێت گوتن ناتوانم وڵاغی سواری و تێشوتان بۆ دابین بکەم، ئەوانیش بەدڵ شکاوی گەڕانەوە، لەخەفەتبارییان فرمێسکیان لەچاو دەباری، چونکە تێشوو وڵاغی سوارییان نەبوو، ئەوانە نیازیان پاك بوو بەدڵ پێیان خۆش بوو هاوبەشی بکەنو بۆیان نەکرا.

## بەڕێکەوتنی سوپا بەرەو تەبوك:

پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەربێ) سوپایەکی سی (٣٠) هەزار کەسی ڕێکخستو لەمەدینەوە بەرەو تەبووك کەوتەڕێ، ئەم سوپایە گەورە ترین سوپای ئیسلام بوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕێکی خستبێ و ئاڕاستەی دوژمنی کردبێ، لەمەدینە چووە دەرو لەسەر (ثنية الوداع) لەشکر بەزی کرد، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری کردە لێپرسراو، کارو باری شاری مەدینەی پێ ئەسپارد، عەلی کوڕی (ئەبو طالیب)یشی بۆ ئاگاداری ماڵو خێزانی لەمەدینە هێشتەوە، کە دووڕووەکان تانووتیان لەعەلی کوڕی ئەبو طالیب دا: عەلی هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتی بۆ لەگەڵ ماڵو منداڵ جێم دێڵیو ڕێگەم نادەی هاوبەشی ئەو غەزایە بکەم؟ پێغەمبەر پێی فەرموو: ئەرێ بەوەرازی نابی تۆ بۆ من وەکوو هارون وابی بۆ موسا؟ وەڵێ ئەوەندە هەیە دوامن هیچ پێغەمبەرێك نیە.[٢١٩]

سوپای گەورەی ئیسلام بەفەرمانڕەوایی پێغەمبەر خۆی کەوتە ڕێ، حەزرەتی ئەبوبەکری دانا کە لەکاتی سەر جنجاڵی خۆی دا سەروکاری

---

[٢١٩] صحيي البخاري باب غزوة تبوك.

سوپاکە بکاو نوێژیان بۆ بکا ئاڵای سەرەکی سوپاکەی دایە دەستی ئەو، بەیداخەکانی تری دابەش کرد ئاڵای کۆچەرییەکانی دا بەزوبەیرو ئاڵای ئەوسییەکانی دا بە ئوسەیدی کوڕی خضیرو ئاڵای خەزرەجیەکانی دا بە حوبابی کوڕی مونذیر و خێڵەکانی تر هەریەکە بەیداخی خۆی بۆ دیاری کرد. ئەمجار سوپا بەناوی خودا شاری مەدینەی جێ هێشتو بەرەو تەبوك کەوتە جەوەلان، هەبوو دوادەکەوت و بەجێ دەما، وڵاغی دەوستاو بڕی نەدەکرد، باری گران بوو ئالیك و ئالفی کەم بوو، کە بە پێغەمبەریان دەگوت ئەوە فلان بەجێ ما، دەیفەرموو لێی گەڕێن ئەگەر خێری تێدابێ پێتان دەگاتەوە. یەکێ لەوانەی لەرێگادا پەکی کەوت ئەبو زەڕی غەفاری بوو حوشترەکەی وەستاو لەڕۆیین کەوت، ئەبو زەڕ لەحوشترەکەی دابەزیو تێشوو پێداویستی یەکەی لەکۆڵی ناو شوێن لەشکر کەوت، کاتێك لەشکر بۆ پشودان لایاندابوو، عەرزی پێغەمبەریان کرد لەدوورەوە پیاوێك دیارە کۆڵێکی لەکۆڵدا وەو بەپێ دێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودا رەحم بەئەبو زەڕ بکا بەتەنیا دەروا بەتەنیا دەمرێ بەتەنیا زیندو دەکرێتەوە. ئەمجار پاش حەسانەوە و پشوودان، سوپاکە و تەوەگەڕ بەرەو شام دەنگو خرمە خرمی قاچی ئەسپو حوشترەکان و تەپو تۆزی بەرزەوە بوو لەو سوپا جەراپە دونیای پڕ کردبوو، سوپا گەییشتە وڵاتی (الحجر) کاو لە ئاشەکانی نەتەوەی ثەمود، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێ ی راگەیاندن کەئەم وڵاتە کەلاوە کۆنو خانوی کەس تێدانەماوی گەلی ثەمودی غەزەب لێ گیراوە، بەهیچ شێوەیەك لامەدەنە ناو کاولە کۆنەکانیانەوە مەگەر بەگریانو فرمێسکەوە بەدڵی ترساو لەخوداو ترسی ئەوەی ئێوەش توشی هەمان غەزەبو قین و قاری خودا ببن. لەئاوی بیرو کانیەکانیان مەخۆنەوە دەسنوێژی پێ مەگرن بۆ نوێژ، ئەو هەوێرەی شێلاوتانە مەیکەن بەنان بیدەن بەوڵاغەکانتان خۆتان لێی مەخۆن. خەڵك بەبێ ئاوی نارەحەت بوون،

هاواریان بۆ پێغەمبەر برد دوعای بۆکردن، خودا هەورێکی بۆناردن بارانی بە رەحمەتی بۆناردن، خۆیان و وڵاغەکانیان لێ تێرئاو کردن بەشی خۆشیان لێ پەزمەندە کرد.

کۆمەڵێك لەدووڕووەکان، لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەرەو تەبوك دەڕۆیشت، بەهەندێکی تریان دەگوت ئەوە پێتان وایە شەڕکردن و بەرامبەری کردن لەگەڵ رۆمەکان دا وەکوو شەڕی نێوان دوو خێڵە عەرەب وایە؟ وەڵڵاهی سبەی دەتان بینین دەستو پێ کەلەپچەکراو لەتەنیشت یەکدی ریز کراون.

پێغەمبەر گەیشتە تەبوك و لەشکر بەزی کرد، (یوحنە)ی کوڕی روئبە خاوەنی ئەیلە کەیەکێك بوو لە فەرمانڕەواکانی سنور هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەیمانی لەگەڵ دامۆر کردو ئەویش سەرانەی خۆی پێشکەش کرد، دانیشتوانی (جەرباء)و (ئەزروح) هاتنە خزمەتی و پێغەمبەر نامەی دڵنیایی پێدان و ئەوەشی خستە ئەستۆیان کە سنور بپارێزن و ئاو دابین بکەن و چاودێری رێگەی وشکانی و دەریایی بن، سەلامەتی هەردولا دەستەبەربکەن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر رێزی لە یوحنەی کوڕی روئبە گرت.

## گەڕانەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ مەدینە:

لەم سەرو بەندەدا بوو هەواڵی پاشە کشەی رومەکان و وازهێنان لەوە هێرش بکەنە سەر وڵاتی موسوڵمانان و سنوور بەزێنی بکەن. بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەیشت، ئیتر پێغەمبەر بە پەسەندی نەزانی لەوڵاتی خۆیاندا شوێنیان بکەوێ بەتایبەتی کەمەبەستی سەرەکی غەزاکە بەدی هاتبوو، ئوکەیدەری کوڕی عەبدولمەلیکی کەندی نەصرانی کە فەرمانڕەوای

دەومەتولجەندەل[٢٢٠] بوو پاڵپشت و یارمەتیدەری سوپای رۆم بوو لەلای خۆیەوە هێرشی هێنا بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خالیدی کوڕی وەلیدی ناردە سەر بە پێنج سەد جەنگاوەرەوە خالید لەگەڵی دا هەنگاو سەرەنجام ئوکەیدەری یەخسیر کردو ناردی بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەویش گیانی پاراستو بەسەرانە دان لێی رازی بوو بەرەڵلای کرد. ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەتەبوك دا پانزە بیست رۆژێك مایەوەو دوایی بەرەو مەدینە گەڕایەوە.

## لەرێو رەسمی بەخاکسپاردنی موسوڵمانێکی هەژاردا:

عەبدوڵلا (ذو البجادين) لە تەبوك مرد، لەوەپێش ویستی موسوڵمان بێ خزمەکانی رێگرییان لێ دەکردو نەیاندەهێشت بێ بۆلای پێغەمبەر و موسوڵمان بێ، چاو دێری هەموو جمو جۆڵێکیان دەکرد، هەتا رۆژێك لەسەر پارچە قوماشێکی خەتخەتی ئەستوورو زەبر دانیشتبوو خزمەکانی چاویان لێ غافڵ کردبوو فرسەتی هێناو قوماشەکەی تاودایەو هەڵات بۆلای پێغەمبەر

---

[٢٢٠] دەومەتولجەندەل گوندێکی ئاوەدان بووە کاتی خۆی عەرەبەکان بۆ بازرگانی رویان تێ دەکرد، لەرۆژگارێك دا ئەوشارە دێیە وێران بوو، پاشان ئوکەیدەر ئاوەدانی کردەوەو تێیدا نیشتەجێ بوو، بایەخ و گرنگی خۆی بۆ گێڕایەوە، درەختی زەیتونی زۆری تێدا رواند، لەهەموو لایەکەوە عەرەبەکان رویان تێ کردو تێ یدا نیشتەجێ بوون، شورایەکی کۆنی بەدەوردا کرابوو، قەڵایەکی قایم و پتەوی تێدا بوو لەناو عەرەبەکانی باکوردا ناوبانگی دەرکرد بوو، شارەکە گرنگییەکی تایبەتی و ستراتیجی بەدەست هێنا بوو، زوربەی دانیشتوانی لەخێڵی کەلب بوون ئوکەیدەر خۆی بە پاشاو مەلیك ناساندبوو دانیشتوانی (دومة الجندل) لەسەر ئاینی مەسیحی بوون. تأريخ العرب قبل الإسلام.

(درودی خوای لەسەربێ) کەنزیك بووە قوماشەکەی کرد بەدوپارچە و پارچەیەکیانی کردە ئیزار و ئەوی تریشی بەسەر خۆیدادا لەمەوە نازناوی (ذو البجادین)ی بەسەردا بڕا. جاکە لەتەبوك گیانی دەرچوو پێغەمبەر خۆی و ئەبوبەکر و عومەر بە تاریکە شەو کفن‌و دفنیان کرد ڕێ و ڕەسمی بەخاکسپاردنیان لەئەستۆ گرت، فتیلە چرایەکیان پێ بوو بەروناکی چراکە بەرێگەدا ڕۆیشتن بۆ گۆڕستانەکە چاڵێکیان بۆ هەڵکەندبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەشریفی چووە ناو چاڵەکەوە، ئەبو بەکرو عومەریش تەرمەکەی عەبدولایان دابەدەستی، لەوکاتەدا دەیفەرموو دەی براکەی خۆتانم لێ نزیك بکەنەوە، جاکە خستیە گۆڕەکەیەوە فەرمووی: خودایە من لەم برا موسوڵمانە ڕازی بووم تۆیش لێی ڕازی بەو بیخەرە ژێر ڕەحمەتی خۆتەوە، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود کە ئامادەی ڕێ‌و ڕەسمەکە بوو فەرمووی خۆزگە من خاوەنی ئەو گۆڕە بومایە.[٢٢١]

## بەتاقیکردنەوەی کەعبی کوڕی مالیك و سەرکەوتنی:

لەناو ئەوکەسانەدا کەلە غەزای تەبوك دواکەوتبوون کەعبی کوڕی مالیك و مەرارەی کوڕی (الربیع) و هیلالی کوڕی ئومەییە بوون. مەرارەو هیلال لەو موسوڵمانانە بوون ئامادەی شەڕی بەدر بوون و هەرگیز ئەوسێ هاوەڵە لەهیچ غەزایەك دوانەکەوتوون و خۆپاشدان و خۆدزینەوە لە چون بۆ غەزا داب‌و نەریتی ئەوان نەبوو، ئەم دواکەوتنەیان لەغەزای تەبوك حیکمەتێکی خودایی بوو، بۆ پاڵفتەکردنی دڵ‌و دەرونەکانیان بوو، ڕاهێنان‌و پەروەردەکردنی موسوڵمانان بوو، هۆکارەکەی کەمتەر خەمی‌و ئیرادەی

---

[٢٢١] تأریخ العرب قبل الإسلام جـ٢/٥٢٧-٥٢٨.

زەعیف بوو، پشت بەستن بوو بەهۆکارە مادییەکان هەوڵ نەدانی جیددی بوو بۆ پەلە کردن لەخۆئامادە کردن و ڕەگەڵ کەوتن بۆ غەزا. ئەم جۆرە کەمتەر خەمی و جیددی نەبوونە لەخۆ ئامادەکردن دابۆغەزا بۆتە هۆی زیانگەیاند بەکەسانێك کە خۆشەویستییان بۆ خوداو پێغەمبەر لەهاوەڵەکانیان کەمتر نەبووە ئەمەش ڕاستی یەکە کەعبی کوڕی مالیك بەئاشکرا دەیدرکێنێ: کەدەڵێ: سەرەتا دەستم کرد بەکار کردن بۆ خۆئامادەکردن، هەموو ڕۆژێ دەگەڕامەوە بەبێ ئەوەی هیچم بەدەست هێنابێ، هەموو کاتێ لەدڵی خۆم دا دەمگوت بەم زوانە خۆم ئامادە دەکەم، ماوەیەك بەم هیواو ئاواتە وە ژیام، کەمتەرخەمیم کرد تا کار گەییشتە ئەوە پێغەمبەر و موسوڵمانان لەخزمەتی دا بەڕێ کەوتن من هیچم نەکردبوو، دڵی خۆم بەوە خۆش کرد وتم: دوای ڕۆژێك دوو ڕۆژ خۆم ئامادە دەکەم لەڕێگا پێیان دەگەمەوە، دوای بەرێکەوتنیان دەستم کرد بە خۆحازر کردن و ئەو ڕۆژەش هیچم بە هیچ نەکرد، پاشان ڕۆژی دواتریش هەوڵم دا و خۆم بۆ ئامادەنەکرا، ئیتر ئەوان بەرێکەوتون و بەخێرایی دەڕۆن و من لەماڵەوە خۆم بۆئامادەنەکرا، ویستم بەبێ دەستە بەربوونی تێشوو شوێنیان بکەوم ملی ڕێگا بگرم. خۆزگە وام بکردایە بۆم هەڵنەسوڕا! بێگومان ئەم ڕوداوە تاقی کردنەوە بوو بۆ بڕوای ئەوسێ کەسە پاشکە وتووەی غەزای تەبوك، بۆ ئەوە بوو پەروەردگار دەری بخا ئەو سێ هاوەڵە چەندیان پێغەمبەر خۆش دەوێ و چەند بەئەمەکن بەرامبەر ئیسلام و چەند دڵ دامەزراون لەسەری لەخۆشی و ناخۆشی دا. خەڵك چەند ڕێزیان لێ دەگرن و چەند بێ ڕەحم دەبن بەرامبەر یان، هەڵوێستیان چۆن دەبێ لەکاتی ڕوتێکردنی پێغەمبەر بۆیان و پشت لێ هەڵکردنیان. بەڕاستی ڕوداوی ئەوسێ هەواڵە ئازیزەی پێغەمبەر تاقیکردنەوەیەك بوو نموونەی لەمێژووی کۆمەڵگاکانی ئادەمیزاد دا زۆر

کەمو دەگمەنە، ئەو کۆمەڵگایانەی لەسەر بنەمای بیرو باوەڕو سۆزو خۆشەویستی دادەمەزرێن.

بێگومان ئەوسێ هاوەڵە لەگەڵ پێغەمبەردا راستگۆ بوون لەکاتێك دا کەسانی دیکە درۆیان لەگەڵ کرد، ئەوان دانیان بەتاوان و کەمترەخەمی خۆیان دانا.

کەعبی کوڕی مالیك بۆخۆی بەدورو درێژی بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پاشکەوتووەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر و عوزریان بۆ هێنایەوە ژمارەیان هەشتاو ئەوەندە کەسە بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بیانوەکانی لێ وەرگرتن بەرواڵەت عەفوی کردن و بەیعەتو وادەی لێ وەرگرتن: کە جارێکی دی هەڵوێستی وانە نوێنن، نیازو مەبەستی دڵیشیانی حەواڵەی خودا کرد. ئەمجار من هاتمە خزمەتی و سەلامم لێ کرد، کەسەلامم لێ کرد زەردەخەنەیەکی رق هەڵساوی بەرامبەرم دەرخست، پاشان فەرمووی: وەرە، هاتم لەپێش دەمی دا رۆنیشتم، فەرمووی: بۆچی دواکەوتی و چی بوو بە هۆی ئەوە کەلەغەزا پاشبکەوی؟ ئەرێ تۆ ولاغی سواریت نە کڕیبوو؟ وتم بەڵێ ئەرێ وەڵڵا! سوێندم بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر من ئێستا لای پیاوێکی تر دابنیشتمایە لەپاشاو فەرمانڕەوایانی دونیا دەمتوانی بەعوزر هێنانەوەی پەسەند خۆم رزگار بکەم، ئەمن خودا زمانێکی پاراوی پێداوم پاساو هێنانەوەم بەلاوە ئاسانە، وەلێ ئەمجارەش سوێندم بەخودا ئەمن دڵنیام ئەگەر ئێستا دروست بەقسەی ناراست وابکەم تۆ عەفوم بکەی لەوانەیە خودا لێم ناڕازی بێ، خۆ ئەگەر لەخزمەت تۆدا راست بڕۆم تۆ گلەییت لێم هەبێ، رەجام وایە خودا عەفوم بکا، قوربان بەخودا من هیچ بیانوێکی وام نەبوو لەوغەزایە دوابکەوم، هیچ کاتێ ئەوەندە لەشساغ و دەست رۆیشتوو نەبوم بەئەندازەی ئەو رۆژەی لەغەزاکە دواکەوتم.

کاتی سامناكو پڕغەمو پەژارە بۆ ئەوسێ هاوەڵە ئەو کاتە بوو: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قسە لەگەڵ کردنی هاوەڵانی لێ یاساغ کردن، فەرمانی دا بەموسوڵمانان هیچ کەس قسەیان لەگەڵ نەکاو نەیاندوێنێ موسوڵمانانیش هەموویان فەرمانەکەی پێغەمبەریان جێ بەجێ کرد، دەنگییان لێ دابڕین، رویان لێ گرژو مۆن کردن، لەناو کۆمەڵگای مەدینەدا وەکوو مرۆڤێکی نەدیوو نەناسراو یان لێ هات، کەس روی تێ نەدەکردن کەس سڵاوی لێ نەدەکردن، ئەم سێ هاوەڵە بەو حاڵە پەنجا شەویان بەڕێ کرد مەرارەی کوڕی رەبیع و هیلالی کوڕی ئومەییە لەماڵی خۆیان دا گۆشەنشین بونو پەلو پۆیان شکاو دەستیان کرد بە گریانو بەتەواوی لەکۆمەڵی موسوڵمانان دابڕان، کەعب لەوان گورجو گۆڵترو بەرچاو رونتر بوو، دەچوە ناو بازاڕو ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبوو بەڵام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکرد، هەموو ئەم نارەحەتی و ئەزیەتو دابڕانە لەکۆمەڵ کاری نەکردە سەر خۆشەویستی کەعب بۆ پێغەمبەر و خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ کەعب، بەڵکوو ئەم گلەیی و نارەحەتییە خۆشەویستی پێغەمبەری لەدڵی کەعب دا پتر کرد. کەعب دەڵێ: رۆژی واهەبوو دەهاتمە خزمەت پێغەمبەر دوای ئەوەی لەنوێژ دەبووەوە و سڵاوم لێدەکرد، دوایی لەدڵی خۆم دا دەمگوت ئەرێ پێغەمبەر وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە؟ ئەمجار لەنزیکییەوە نوێژم دادەبەستو تیلەی چاوم دەدایە دەم بینی کە من سەرگەرمی نوێژم سەیری دەکردم کەچاوم دەکردە لای ئەو روی لێ وەردەگێڕام. کەعب کە نارگیر کرا هەموو خەڵك پشتیان تێ کردو رویان لێ وەرگێڕا، کەعب بۆ خۆی دەڵێ: دەنگ دابڕینی خەڵکی لێم درێژەی کێشا، کەس نەیدەدواندم، رۆیشتم بەسەر دیواری ماڵی ئەبو قەتادە کە کوڕی مامم بوو خۆشەویسترین کەس بوو لام هەڵگەڕامو چوومە ماڵیان سڵاوم لێ کرد،

وەڵامی متەقی نەکردو وەلامی سلاوەکەی نەدامەوە، وتم: ئەبوقەتادە بەخودات سوێند دەدەم، تۆ دەزانی و دەمناسی کەمن خوداو پێغەمبەرم خۆش دەوێن؟؟ بێدەنگ بوو، پرسیارەکەم دوبارە کردەوە بێدەنگ بوو پرسیارەکەم دوبارە کردەوە بێدەنگ بوو بۆ جاری سێیەم پرسیارەکەم سێ بارە کردەوە، وتی: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن، هەردوو چاوم فرمێسکیان دەڕژاند، ئیتر هەڵسام بەدڵشکاوی بەرەو دەرگاو هاتمە دەرەوە. کار بەوەندەوە نەوەستا، بەڵکوو خێزانەکانیشیان لێیان دابڕان و فەرمانیان پێ کرا کە لەژنە کانیان کەنارگیر بن و بەناچاری لەوانیش گۆشە گیربوون.

ناسکترین قۆناغی ئەو بەتاقیکردنەوەیە بۆ خۆشەویستی و وەفاو ئەمەکی ئەوسێ هاوەڵە بەرێزە بۆ پێغەمبەر و ئایین ئەوکاتە بوو کە (ودە)مەلیکی غەسان، ئەو پاشایەی هاونشینی کردنی و ئامادە بوون لەکۆڕو مەجلیسەکانی دا ڕێزو شکۆ مەندیەکی وەهای هەبوو شاعیران و وێژەران کێ برکێیان تێدا دەکرد، پێیان دا هەڵدەگوت، دەی لەکاتێك دا کەعب لەو وەزع و حاڵە ناخۆشەدا بوو هەموو موسوڵمانان دەنگیان لێ دابڕیبوو پێغەمبەر رووی لێوەرگێڕابوو. ئالەو کاتەدا پیاوو راسپاردەی مەلیکی غەسان نامەیەکی لە مەلیکەوە بۆ هێنا تێیدا نوسرابوو دەڵێ: ئەی کەعب زانیومانە پێغەمبەرەکەت دەنگی لێ دابڕیوی، ئەتۆ پیاوی ئەوەنی سوکایەتیت پێ بکرێ، مافت پێشێل بکرێ، پەیوەندی بەئێمەوە بکە دڵخۆشیت دەدەینەوە، رێزت لێ دەگرین. بەلام کەعب رقی هەڵدەستێ و خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرو ئیسلام دەیهەژێنێ و دەچێ لە ڕق و قاری خۆی نامەکە دەخاتە تەندورەوە دەیسوتێنێ. جاکەویست و ئیرادەی خودا دەربارەی بەتاقیکردنەوەی ئەو سێ هاوەڵە تەواو بوو باس و خواسیان بەنەمری لەقورئانی پیرۆزدا تۆمارکراو بوو بەوانەو عیبرەت بۆ موسوڵمانان

بۆ هەتا هەتایە، دەرکەوت کە بیرو باوەڕی ئەو هاوەڵانە چەند جێگیرو تۆکمەیە، چەندە خۆشەویستی ئایین و پێغەمبەر لەناخیاندا قوڵبۆتەوەو بەو دەنگ لێ دابڕین و گۆشەگیرییە چۆن دونیایان لێ تاریك بووەو زەوی پان و پۆڕیان لێ وەتەنگ هاتووە. ئیتر پەروەردگار دەرووی رەحمەتی لێکردنەوەو لەژوور ئاسمانەکانەوە تۆبەی لێ قبوڵ کردن!!

قورئان نەهات ئەوسێ هاوەڵە تایبەت بکا بەوەی کەتۆبەیان لێ وەرگیراوە و هەریەکسەر باسی ئەوان بکاو بەس بۆ ئەوەی هەست بە نامۆیی نەکەن و چیدی خۆیان بەدابڕاو لە کۆمەڵگا نەزانن و نەبنە خاڵی رەش لەناو خەڵکدا. بەڵکوو رێخۆشکەرەیەکی بۆ تۆبەکەیان دامەزران ئەوەی راگەیاند: کە قبوڵکردنی تۆبە تایبەت نیە بەوانەوە بەڵکوو تۆبەی پێغەمبەر و کۆچکەران و یاریدەدەرانیش ئەوانەی لەغەزاکە دوانەکەوتبوون وەرگیرا ئەمەش بۆ رێزنان لەوسێ هاوەڵەو دڵدانەوەیان و بەرز کردنەوەی پلەو پایەیان. دەفەرموێ: ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ. وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ. سورة التوبة (١١٧-١١٨)﴾ ئیمامی بوخاری لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا، کەدەڵێ: لەهیچ غەزایەك لە پێغەمبەر هەڵنەبڕوام و لەهەموویان دا جگە لە غەزای بەدر لەخزمەتی دابوم، تا غەزای تەبوك پەیدا بوو، بانگ هەڵدرا بۆ راجمێن و نەفیری عام ...هتد. راڤەکەرانی قورئان چیرۆکی ئەم سێ هاوەڵەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەکورتی دەگێڕنەوە، دەڵێن: ئەم سێ هاوەڵە لەخزمەت پێغەمبەردا نەچوون بۆ غەزای تەبوك و خۆیان پاش دا، کەعب کە یەکێکە لەو سێ کەسانە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی

خوای لەسەربێ) زۆری حەز لەقسەو گفتو گۆی من بوو، کەلەم غەزایە دواکەوتم و نەچووم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دەبێ چ شتێك وای لە کەعب کردبێ نەهاتبێ بۆ غەزا؟ کە تەشریفی گەڕایەوە بۆ مەدینە دووڕووەکان عوزریان هێنایەوە و عوزری لێ وەرگرتن، ئەمنیش چوومە خزمەتی و عەرزم کرد قوربان، من وڵاغی سواری و تێشووم ئامادە بوو: کە نەهاتم تاوان بوو. تاوانم کرد داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) داواکەی ڕەت کردمەوە. ئیتر پێغەمبەر فەرمانی بە موسڵمانان کرد، کە هاونشینی و هاوەڵی ئەو سێ کەسە نەکەن و دەنگیان لێ دابڕن، ئیتر کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردن، ئەمجار فەرمانی کرد خێزانەکانیشیان لێیان جیاببنەوەو دوورە پەرێزییان لێ بکەن، دونیایان لێ تەنگ بوو!! خێزانی هیلالی کوڕی ئومەییە هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتی: قوربان! هیلال ئەوەندە گریاوە و دەگری ترسم هەیە چاوی کوێربن.

ئابەم شێوە پەنجا شەو تێپەڕی، ئەمجار پەروەردگار ئایەتی ﴿لَقَد تَّابَ اللّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ. سورة التوبة (١١٧)﴾ و ئایەتی ﴿وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ. سورة التوبة (١١٨)﴾ی ناردە خوارێ، ئەو کاتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەماڵی ئوممو سەلەمە بوو، هاتە دەرو تەشریفی هات بۆ ژوورەوکەی خۆی فەرمووی: (الله أكبر) ئەوا پەروەردگار عوزری هاوەڵانمی وەرگرت، کە نوێژی بەیانی کرد ئەم تۆبە قبوڵکردنەی بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە، مزگێنی دا کە خودا تۆبەی لێوەرگرتن، ئیتر هاوەڵانی تۆبە لێ وەرگیراو بەهەڵە داوان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

پێغەمبەریش ئایەتەکانی بەسەردا خوێندنەوە. کەعبی کوڕی مالیك وتی: من لەخۆشی قبووڵبوونی تۆبە لێمان بڕیارم دا هەموو ماڵو سامانی خۆم بکەم بەخێرو صەدەقە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕازی نەبوو، وتم: نیوەی دەکەم بەخێر هەر ڕازی نەبوو وتم سێیەکی دەکەم بەخێر فەرمووی باشە. لە ڕیواتێکی تردا هاتووە، کەعب دەڵێ: کە موژدەی تۆبە لێوەرگرتنمان پێدرا، خێرا خۆم گۆڕی و بەهەڵەداوان هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەهاتم ڕوانیم تەشریفی لەمزگەوت دا دانیشتووە موسوڵمانان لەدەوری دانیشتبوون طەلحەی کوڕی عەبدوڵلا بەراکردن بەرەو بیرم هاتو دەستی خستە ناو دەستمەوە و وتی: تۆبە لێوەرگرتنت پیرۆز بێ، هەرگیزاو هەرگیز ئەم هەڵوێستەی طەلحەم لەبیر ناچێتەوە ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەدەم و چاوی وەکوو مانگی شەوی چواردە دەدرەوشایەوە، فەرمووی: ئەی کەعب! موژدەت لێ بێ بە پیرۆزترین ڕۆژگاری ژیانت، لەوکاتەوە هاتویە سەر دونیا ڕۆژی وا خۆشت توش نەبوە، ئەمجار ئایەتەکانی بەسەر دا خوێندەوە.

بێگومان ئەم چیرۆكو ڕوداوە پەندو ئامۆژگارییە بۆ موسوڵمانان و پێویستە خودا پەرستان دڵیان پێی بکەوێتە لەرزەو بەجۆش بێن فرمێسك بڕێژن! دەگێڕنەوە ئیمام ئەحمەد ئەوەندە بەم ئایەتانە دەهاتە گریانو کوڵی هەڵدەستا بەهیچ شتێکی تر ئەوەندە کوڵی گریانی هەڵنەدەستا!.

## تێڕوانینێك بۆ غەزاکانی پێغەمبەر:

بە تەواو بوونی غەزای تەبوك کەلەمانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا کۆتایی هات، غەزاکانی پێغەمبەریش دواییان هات، سەرجەمی غەزەواتەکانی پێغەمبەری خودا،بیستو حەوت غەزا بوو، ژمارەی سریەو

دەستەو مەفرەزە کانیشی شەصت بووە، لەهەمووشیان دا شەڕ ڕوی نەداوە..

لەهەموو ئەو غەزاو مەفرەزەو دەستە نێردرا وانەبۆسەر دوژمن کەمترین خوێن ڕژاوە، کوژراوەکانی ئەو شەڕانە لە هەردولا لە ١٠١٨ هەزارو هەژدە کەس تێپەڕی نەکرد، تابۆی لوابێ هەوڵی داوە خوێن کەم بڕژێ، هەرخودا دەزانێ پێغەمبەر چەندە بەخەم ژیانی ئادەمیزادەوە بووەو ویستویەتی گیانەکان بپارێزێو ئەمنو ئاسایش لەسەرانسەری جەزیرەدا بەرقەرار بکا، وای لێ هات ئافرەت دەچووە ناو کەژاوەو دەیتوانی لە ولآتی حیرەوە بێت بۆ مەککەو تەوافی کەعب بکاو بگەڕێتەوە لە خودانەبێ لەکەس نەترسێ، هەروەها دەیتوانی لە قادسیەوە سواری حوشترێك بێو بەبێ ترس بێت بۆ مەککەو تەوافی کەعبە بکاو بگەڕێتەوە، ئەمە دوائەوەی کە سەارانسەری ولآتی جزیرە لەئاشوب و ئاژاوەدا بوو هەمیشە شەڕو هەراو تالآنو بڕۆو پەلامار دانی نێوان خێڵەکان دونیای داگیر کردبوو، قافڵەی حکوومەتەکان کەبەناو جزیرەدا تێپەڕ دەبوون دەبوایە چەندەها حەرەسو پاسەوانی لەتەك دا بویایە ئەمجار دەتوانرا بەسەلامەتی بڕواو بێتەوە. هەڵبەتە هەموو شەڕو جەنگەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەلەگەڵ دوژمنەکانی دا ئەنجامی دان، لەسەر دووبنەمای سەرەکی قورئانی و حیکمەت ئامێز ئەنجام دراون. ئەم دووبنەمایانە یەکێکیان ئەوەیە کە دەفەرمووێ: ﴿وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ﴾ دووەمیان ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ﴾.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم دووبنەما قورئانیانەدا، کۆمەڵگای ئادەمیزاد ئەندازەیەکی زۆری کاتو وزە بۆدەستەبەر بوو، زۆر دابو نەریتی گۆڕینو خەتەرو چەرمەسەری لێ دوور خستنەوە، قانونو یاسایەکی بۆ کۆمەڵگا دامەزراند هەمووی ڕەحمەت و خێرو فەڕبوو بۆ ئادەمیزاد، بەجۆرێك

دەتوانین بڵێین: ئەو غەزایانە عەمەلییەی ئەدەب دادانو تەمبێ کردن بوون نەك عەمەلێیەی سزادان و تۆڵە ستاندنەوە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ ئەو مەملبیە قورسە کەبریتی بوو لەگۆڕانی کۆمەڵگای جەزیرەی عەرەبی زۆر بە خێرایی ئەنجام درا، ئەوە بوو تواندرا لەماوەی (١٠) ساڵ دا زیاتر لەیەك ملیۆن میل چوارگۆشە لەوڵاتی جەزیرە کەوتە ژێر حوکمی ئیسلامی و دانیشتوانەکەی موسوڵمان بوون. لەماوەی ئەو دەساڵەدا ڕێژەی شەهیدانی ئیسلام زۆرکەم بوو، مانگی لەیەك شەهید تێناپەڕێ.

پێغەمبەری خودا هەرکاتێ سوپایەکی بەڕێ دەکرد بۆ جیهاد ئامۆژگاری دەکردن بەوەی لەتەقوای خودا غافڵ نەبن، لەگەڵ موسوڵمانانی هاوەڵیاندا هاریکارو هەمئاهەنگ بن، بەناوی خوداو لەپێناو وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودادا جیهاد لەگەڵ کافراندا بکەن کەس بەناحەق نەکوژنو غەدر نەکەن، حەسوودو بەخیل نەبن، زێدە ڕۆیی نەکەن. منداڵو ئافرەتو پیرەمێردی پەککەوتە نەکوژن، چییان بەسەر ڕاهیبو دێر نشینەکانەوە نەبێ، دار خورماو داری تر نەبڕن، بیناو باڵە خانە نەڕوخێنن.

دەی بێنە ئەو کوشتارو وێرانکارییەی بەهۆی غەزاکانی پێغەمبەرەوە رویان دا بەرامبەرییان بکە بەو کوشتارو وێرانکارییەی لەجەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨)ز و جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩-١٩٤٥)ز ئەمجار دەزانی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) و یاسای ئیسلام چەند بە خەم ئادەمیزادەوە بونو چەند دژی خوێنرێژی بوون، ئەوەتا نووسەر و لێکۆڵەرەوە لە دائیرەتولمەعاریفی بەریتانی جـ١٩م٦٦٩ دا دەڵێ: ژمارەی

کوژراو لەجەنگی یەکەمی جیهانی دا شەش ملیۆن و چوار سەد هەزار کەس بووە ژمارەی کوژراوانی جەنگی دووەمی جیهانی لەنێوان سی و پێنج ملیۆن تاشەصت ملیۆن کەس دابووە[٢٢٢].

لە کاتێکدا ئەم دوو شەڕە کاولکارییە مرۆڤ قڕکەرە هیچ بەرژەوەندییەکی کۆمەڵگای ئادەمیزادی تێدانەبوو، جیهان بەگشتی نە بەکەمو نە بەزۆر هیچ سودێکی لەو دووشەڕە دەستگیر نەبوو.

ژمارەی قوربانیانی مەحکەمەی تەفتیش لەئەوروپا لەسەدەکانی ناوەراستدا گەیشتە دوانزە ملیۆن کەس.[٢٢٣]

## یەکەم حەج لەئیسلامدا:

ساڵی نۆیەمی کۆچی حەج لەسەر موسوڵمانان فەرزکرا. لەم ساڵەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) حەزرەتی ئەبوبەکری کرد بەمیری حەج بۆئەوەی سەروکاری حەجکردنی موسوڵمانان بکا، هێشتا موشریکەکان بەرێ و

---

[٢٢٢] دائیرەتولمەعاریفی بەریتانی ج١٩/١٠١٣ طبعة ١٩٧٤.

[٢٢٣] صەدام حوسێن و حیزبی بەعث لەعێراق دا لەماوەی ١٩٨٠-١٩٩٠ دا زیاد لەسێ ملیۆن خەڵکی عێراقی بەقردا و کوشت و بری کردن و وڵاتی عیراق بەتایبەتی و جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بەگشتی توشی گرانی و برسیەتی و شەری نەگریسی ناو خۆو ئیرهاب و تیرۆریستکاری کردوەو هێزی ئەمریکاو خۆرئاوای کێش کرد بۆئەوەی بە فیعلی عالەمی ئیسلامی بەگشتی داگیر بکەن و سەروەری حکومەتەکانی نەمێنێ. (محمود)

ڕەسمی خۆیان حەجیان دەکرد، لەتەك حەزرەتی ئەبوبەکردا سێ سەد کەس لەموسوڵمانەکانی مەدینە چون بۆ بەجێهێنانی حەج.[٢٢٥]

لەو سەرو بەندەدا سورەتی (براءة) نازڵ بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بانگی عەلی کوڕی ئەبو طالیبی کردو پێی فەرموو: بچۆ بۆ ناو ئەو خەڵکانەی ئامادەی حەج دەبن، لەرۆژی قوربانی دا کە خەڵك لەمینا کۆدەبنەوە بانگ هەڵبدەو پێیان ڕابگەیەنە: کە کافرو بێ بڕوا ناچنە بەهەشتەوە، ئیتر لەمەدوا نابێ هیچ موشریکێك‌و بێبڕوایەك حەج بکا، نابێ کەس بەروتی وەکوو سەردەمی پێشوو تەوافی کەعبە بکا، هەر کەسێ عەهدو پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەردا هەیە بەردەوامە تاکاتی بۆ دیاریکراوی خۆی. ئیتر عەلی کوڕی ئەبو طالیب سواری حوشتری پێغەمبەر بوو کەبە (العضباء) ناسرابوو، بەرەو وڵاتی مەککە کەوتەڕێ، لەرێگا بەحەزرەتی ئەبو بەکر گەیشتەوە، ئەبو بەکر وتی تۆ فەرماندەی یان فەرمان پێکراوی؟ عەلی وتی: من ئەمیر نیم مەئمورم ئەمجار ڕۆیشتن، ئەبوبەکر سەروکاری مەراسیمەکانی حەجی کرد، هەر رۆژی جەژن هات لەمینادا خەڵکەکە کۆبووەوە، عەلی کوڕی ئەبو طالیب ئەو وتارو ڕاسپاردانەی خرابوونە ئەستۆی بەجێی گەیاندن.

---

[٢٢٥] هەندێ لەزانایانی ئیسلام پێیان وایە فەرز بوونی حەج لەساڵی شەشەمی کۆچی دا بوە، مامۆستا شێخ موحەممەدا (الخضري) لەکتێبی (التشريع الاسلامي ص ٥٢ دا ) ئەم رایەی پەسەند کردوە.

# ساڵی هاتنی شاندەکان بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

# ساڵی نۆیەمی کۆچی:

## دەستپێکردنی هاتنی شاندەکان بۆ مەدینە و کاریگەرییان لەسەر ژیان:

دوای ئەوەی پەروەردگار پشتگیری پێغەمبەر و موسوڵمانانی کردو مەککەیان رزگار کرد، ئەمجار پێغەمبەر و سوپای موسوڵمانان لە تەبوك بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ مەدینە، لەوە پێشیش پێغەمبەری خودا چەند نامەیەکی ئاراستەی ئیمپراتۆرو مەلیك و فەرمانڕەواکانی جیهان کردبوو، بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان و موسوڵمانبون. هەندێك لەو فەرمانڕەوایانە وەڵامی باشیان دابوەوە هەندێکیان وەڵامەکانیان ناسك و دڵخۆشکەرەبوو، هەندێکیان بەترس و دڵە راوکێو مابوونەوە، هەندێکیشیان جوابی ناشیرین و زبریان دابوەوە، لوتبەرزی و سەر رەقییان نواند بوو، جا هەندێك لەوانە خودا زوو تۆڵەی لێستاندن تەخت و بەختیان وەرگەڕا، عەرەبەکان ئەو هەواڵو بەسەر هەتانەیان بیستبوون و بۆ یەکتریان باس کردبوو.

رزگارکردنی مەککە پایتەختی نیوە دورگەی عەرەبی لەروی گیانی و کۆمەڵایەتیەوە هەروا موسوڵمانبوونی زۆر لەسەرانی قورەیش و تێکڕوخانی گەورەترین قەڵای مقاوەمەو دژایەتی لەبەردەم ئایینی خودادا کاریگەرییەکی قوڵی هەبوو لەسەر دڵو دەروونی ئەو عەرەبانەی رارا بوون و چاوەڕوانی سەرەنجامیان دەکرد، ئیتر لەمپەڕ لەنێوان ئەوان و موسوڵمانبوون دانەما، پانتایی نێوان ئەوان و قبوڵکردنی ئیسلام پێچرایەوە.

زانـای بـەناو بـانگ موحەممـەد طـاهیر (الفـتنی) کۆچـکردوی سـاڵی (٩٨٦)ی کۆچی لەکتێبەکەی دا (مجمع بحار الأنوار) دەڵێ: لەم ساڵەدا (واتە ساڵی نۆیـەمی کۆچـی) سـاڵی هـاتنی وەفـدەکان بـوو بۆمەدینـە، بێگومـان عەرەبـەکان چـاوەڕوانی ئـەوە بـوون ئـاخۆ سـەرەنجامی روبەروبوونـەوەی قـورەیش لەگـەڵ پێغەمبـەردا بەچـی دەگـا، چـونکە لەدیـدی عەرەبـەکان دا قورەیش پێشەوای ئادەمیزاد بوونو خاوەنی کەعبەی پیرۆز بوون، جا کە قورەیش گەردنکە چی پێغەمبەر بونو مەککە کەوتە دەست موسوڵمانان و هۆزی ثەقیف موسوڵمان بوون، ئیتر عەرەبەکان تێکڕا ئەوەیان لا ڕون بۆوە کەناتوانن بەرهەڵستی ئیسلام و موسوڵمانان بکەن. ئیتر لەهەموو لایەکەوە وەفدیان نارده لای پێغەمبەر و کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمانبون.[٢٢٦]

هـەموو ئەمانـە کاریگـەری سروشـتییان هـەبوو لەسـەر دڵو دەروونـی دانیـشتوانی جـەزیرەی عـەرەبی، ڕێگـای ئـاوەڵا کـرد بۆچـوونە نـاو ئـایینی ئیسلام و گەیشتن بـە پێغەمبـەر لەمەدینـە، ئیتر لەهـەموو لایەکـەوە وەفـدی عەرەبەکان رویـان لەمەدینـە کـرد بۆ موسـڵمانبونو بۆ تـاوو تـوێکردنی بـارو دۆخەکـە، دەتگـوت تەسـبیحێکی بـچڕاونو دەنکـەکانی کەوتنـە کۆشـی ئیسلامەوە.

هـەموو ئـەم وەفدانـە پـاش گەیـشتن بـە پێغەمبـەرو موسـوڵمانبوون دەگەڕانـەوە بـۆ مەڵبەنـدو شـوێنەکانی خۆیـان بـەگیانێکی تـازەوە بەشـوحنەیەکی ئیمانییـەوە بەحـەماس و لێبڕانێکـی لـەرادە بـەدەرەوە بـۆ بانگـەوازی ئیـسلامی، لەهـەمان کاتـدا رق لێبـونێکی لەڕادەبـەدەر لـەبتو بتپەرسوتی و شوێنەوارەکانی و لەسەر دەمی نەزانی و شیعارەکانی.

---

[٢٢٦] مجمع بحار الأنوار ج٥/٢٧٢.

یەکێ لەو وەفدانە وەفدی بەنوتەمیم بوو، پیاو ماقوڵو ریش سپی و شاعیرو خەطیبی باشیان تێدابوون، خۆرانواندنو موبارەزەو خۆدەرخستنێك لەنێوان شاعیر و خەطیبی ئەوان و شاعیرو خەطیبی موسوڵمانەکان دا بەرپابوو، خەطیبو شاعیرەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەرکەوتوانە فەضلی ئیسلام و راستی ئاییینیەکەیان خستەڕو، ریش سپی و پیاو ماقوڵەکانی بەنو تەمیم دانیان بەوەداناوە موسڵمان بوون، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دیاری باشی پێشکەش کردن.

وەفدی بەنی عامر هات، ضەمامی کوڕی ثەعلبە لەجیاتی بەنوسەعدی بۆناو نەتەوەکەی بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنان، ضەمام یەکەم کەس بوو کەلەناو نەتەوەکەی دا وتی: بتی (اللات) و (العزی) خراپترین شتنو هیچیان بە دەست نیەو دەستی کرد بەتانەو تەشەر لێدانیان. هۆزەکەی لێی هاتنە دەنگو وتیان ئەی ضەمام دەمی خۆت بگرە غەیبەتی بتەکانمان مەکە ئەگەر واز لەو قسانە نەهێنی توشی بەڵەکیو گولی و شێتی دەبی، ضەمام وتی: هاوار بۆ ئێوە، سوێندم وابێ ئەو بتانەی ئێوە بەخودایان دەزاننو ناویان (اللات) و (العزی)یە نە دەتوانن زیان بگەیەنن نە سود دەگەیەنن؟. بێگومان پەروەردگار پێغەمبەری ناردووەو نامەی ئاسمانی بۆ سەرنازڵ کردوە، لەو گومڕایی یەی تێی کەوتون رزگارتان دەکا، من لەئێستاوە شایەتی دەدەم کەهیچ خودا نین جگە لە (الله) تاکو تەنیاو بێ شەریکە، هەروەها شایەتی دەدەم موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە، من لەلای ئەو گەڕاومەوە، فەرمانو نەهیەکانی ئەوم بۆهێناون پێتان دەڵێم چ بکەن چ مەکەن، ئیتر ئەو رۆژە شەودانەهات لەهۆبەی ئەوان دا کەس نەما لەپیاوو ژن موسوڵمان نەبێ.

وەفدی بەنوحەنیفە هاتن موسەیلیمەی درۆزنیان لەگەڵ دابوو، موسوڵمان بوو دوایی پاشگەز بۆوە و لافی پێغەمبەریێتی لێ دا، درۆی زۆرو زەبەندی بۆ هۆزەکەی کرد، ئەوە بوو فیتنەو ئاشوبی پاشگەز بوونەوەی بەرپاکرد و هەر لەوفیتنەیەش دا کوژرا. وەفدی بەنی طەی هاتن زەید (الخیل) سوارچاکی بەناوبانگی هۆزی طەی یەکێك بوو لەشاندەکە، موسوڵمان بوو، پیاوێکی باشی لێ دەرچوو. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ناوی نا زەید الخیر.

عەدی کوڕی حاتەمی تایی هات‌و موسوڵمان بوو، موسوڵمانبوونەکەشی دوای ئەوەبوو کەزۆر رەوشتی جوان‌و پەسەندی لە پێغەمبەر بینین، تەنانەت وتی: وەڵڵاهی هەڵس‌و کەوتی ئەم زاتە لەهی پاشایان ناچێ.

وەفدی بەنو زوبەیدە هاتن، لەناو وەفدەکەدا سوار چاکی بەناوبانگی عەرەب عەمری کوڕی مەعدیکەریبە یان تێدا بوو، وەفدی کیندەش هاتن ئەشعەلی کوڕی قەیسیان تێدا بوو، هەروا وەفدی هۆزی ئەزدو پیاوی نێردراوی پاشاکانی حیمیەر هاتن‌و نامەی پاشاکانی حیمیەریان هێنایە خزمەت پێغەمبەر، کەلە نامەکەدا موسڵمانبوونی خۆیان راگەیاندبوو.

ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) مەعاذی کوڕی جەبەل و ئەبو موسای ئەشعەری ناردن بۆ وڵاتی یەمەن بۆ بانگەوازی ئیسلامی، رایسپاردن‌و پێی فەرموون: ئاسانکاری بکەن ئیش وکار قورس مەکەن موژدە دەربن و تۆقێنەر مەبن.[٢٢٧]

هەروا (فروة)ی کوڕی عەمری (الجذامي) پیاوی خۆی نارد بۆلای پێغەمبەر و موسوڵمانبوونی خۆی راگەیاند ئەم (فەروە) ناوە لێپرسراوی رۆمەکان بوو لەسەر وڵاتی (معان)و دەوروبەری لەوڵاتی شام.

---

[٢٢٧] الجامع الصحيح للبخاري (كتاب المغازي) باب بعث معاذ و ابو موسى الى اليمن.

هـۆزی بـەنولحاریـث (بنوالحـارث)ی کـوڕی کـەعب لـە ولاتـی نـەجران لەسەردەسـتی خالیـدی کـوڕی وەلیـد موسـوڵمانبوون، خالیـد ماوەیـەك لەناویان دا مایـەوە فێری ئایینی ئیسلامی دەکـردن، دوایـی خالیـد لەگـەڵ وەفـدێکی ئـەو هـۆزە گەڕایـەوە بـۆ مەدینـە، وەفدەکـە بەخزمـەت پێغەمبـەر گەیشتن‌و دوایی گەڕانەوە بۆ ولاتی خۆیان، ئەمجار پێغەمبەر عـەمری کـوڕی حەزمی بۆسەر ناردن بۆئەوەی فێری ئایینیـان بکـا، داب‌و نـەریت‌و ڕێنمـایی یەکانی ئیسلام فێربن، زەکاتیان لێ وەربگرێ.

وەفدی (همدان) هاتن‌و ئیعلانی موسوڵمانبوونی خۆیان کرد پێغەمبەری خـودا (المغـیرە)ی کـوڕی شـوعبەی نـارد بـت (الـلات)ی شـکاند، ئـەمجار سـەرکەوتە تۆپـەڵاکی پەیکەرەکـەو پیـاوی تـریش لەتـەکیا سـەرکەوتن، لەسـەرەوەیدا پـێ‌ی دا هاتنـە خـوارەوە بـەرد بـەردیان روخانـدو تالەگـەڵ زەوی‌دا تەختیان کرد، ئەمجار وەفدەکە هات چووە خزمەت پێغەمبەرو ڕێزی لێ گرتن.

وەفـدی عەبـدول قـەیس هـاتن‌و پێغەمبـەر بـەخێرهاتنی باشـی لێ کـردن، فەرمانی پێ کردن بەچاکەکاری، نەی لێ‌کردن لەخراپە.................

وەفـدی ئەشـعەرییەکان و یەمەنییـەکان هـاتن بەحەماسـەوە ئـەم شـیعرە رەجەزەیان دەخوێندەوەو دەیـانگوت (غداً نلقي الأحبة محمداً و حزبه) پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوا ئەهلی یەمەن هـاتن بۆ لاتـان، ئـەوان لەکەسانی دیکـە هەسـت ناسـکترو دڵنـەرم تـرن. بـیرو بـاوەڕ یەمەنی‌یـەو، حیکمـەت‌و دانایی‌یە یەمەنی‌یە.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بـۆلای ئـەهلی یەمـەن بۆئـەوەی بانگـەوازییان بکـا بـۆ ئیـسلام، کۆمەڵێکیـشی موسـوڵمان لەگـەڵ ناردن، شەش مـانگ لـەوێ مانـەوە، خالیـد زۆری هـەوڵ لەگـەڵ دان وەڵامیـان

نەدایەوە، ئەمجار پێغەمبەری خودا عەلی کوڕی ئەبوطالیبی نارد بۆسەریان، ئەویش نامەی پێغەمبەری بۆ خوێندەوە، هۆزی (همدان) هەموویان موسوڵمان بوون، ئیمامی عەلی نامەی بۆ پێغەمبەر نووسی هەواڵی موسوڵمانبوونی ئەوانی پێگەیاند، کەنامەکەی خوێندەوە، کەوتە سوژدە پاشان سەری بەرز کردەوە فەرمووی: سڵاو لە (همدان) سڵاو لە (همدان) سڵاو لە (همدان)[٢٢٨] وەفدی موزەینە کەژمارەیان چوارسەد پیاو بوو هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەفدی نەصرانییەکانی نەجران هاتن شەصت سوار بوون، بیستو چواریان لەپیاو ماقوڵەکانیان بوون ئەبوحاریثە (قەشەو پیاوی ئایینی) بەناوبانگیان بوو، پاشاکانی رۆم رێزیان لێ دەگرتو پارەو پولیان بۆ دەنارد، چەند کەنیشتەو خوێندنگایان بۆ بنیات نابون. چەند ئایەتێکی قورئان دەربارەیان نازڵ بووە.[٢٢٩]

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نامەیەکی بۆ ئەهلی نەجران نووسی بانگەوازی کردن بۆ موسوڵمانبوون. کەنامەیەکیان خوێندەوە، وەفدێکیان نارد بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەوان پرسیاریان لە پێغەمبەر کردو پێغەمبەریش پرسیاری لەوان کرد، لەوەڵامی پرسیاری ئەوان دا چەند ئایەتێکی قورئان لەسورەتی (آل عمران)دا نازڵ بووە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ویستی موباهەلەیان لەگەڵ دا بکا، شورە حبیل رازی نەبوو ترسا لەوەی موباهەلەبکەن. بۆ سبحەینێ هاتنەوە خزمەتی و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوسراوێکی بۆ نوسینو خەراجی خستنە سەرو لەگەڵیان دا ئەبو عوبەیدەی کوڕی (الجراح)ی لەگەڵ دانادرن، فەرمووی ئەم پیاوە ئەمینداری ئەم نەتەوەیەیە.

---

[٢٢٨] زاد المعاد جـ٢/٣٣ نقلاً من صحیح البخاري.

[٢٢٩] زاد المعاد جـ ٢/٣٥-٣٦.

وەفدی (تەجیب) هاتن پێغەمبەر بەهاتنیان زۆر دڵخۆش بوو، رێزی لێ گرتن، چەند داواکاریەکیان لە پێغەمبەر کرد، ئەویش پەسەندی کردن، ئەمجار چەند پرسیارێکیان دەربارەی قورئان و حەدیث ئاراستەی پێغەمبەر کرد، ئەویش زیاتر رێزی لێ گرتن و پرسیارەکانیانی بەدڵ بوون، فەرمانی بەبیلال کرد کەمیوانداری باشیان بکا، چەند رۆژێك مانەوە، بەلاّم مانەوەکەیان زۆر درێژە پێ نەدا، پێیان گوترا بۆچی وا بەپەلە دەگەڕێنەوە؟. وتیان دەچینەوە بۆلای خزمو کەسو کاری خۆمان هەواڵی دیتنو گفتو گۆی خۆمان لەگەڵ پێغەمبەریان بۆ دەگێڕینەوە، چیمان پێ گوت و چۆنی وەلاّم داینەوە، چۆن هەڵسو کەوتی لەگەڵمان کرد هەموو ئەوانەیان بۆ باس دەکەین، ئیتر گەڕانەوە، ساڵی دەیەمی کۆچی لەمەوسیمی حەج لەمینا هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەنێو ئەو وەفدانەی هاتنە خزمەت پێغەمبەر وەفدی بەنی فەزارەو وەفدی بەنی ئەسەدو وەفدی بەهراؤء وەفدی عەزرەبون. هەموویان هاتنو موسوڵمان بوون، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) موژدەی رزگار کردنی ولاّتی شامی پێدان، نەی لێ کردن لەوەی پرسیار لە کاهینەکانیان بکەن دەربارەی غەیبو روداوی داهاتوو، هەروا نەهی لێ کردن لەوجۆرە ئاژەڵ سەربڕینانەی لەوەپێش ئەنجامیان دەداو پێی راگەیاندن کەجگە لەقوربانی هیچی تریان لەسەر نیە.

هەروەها وەفدی (أبلى) و وەفدی (ذی مرة) و وەفدی (خولان) هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پرسیاری (بت)ی خۆلانی لێ کردن کەبتی مەشهوریان بوو دەیانپەرست، وتیان: موژدە بێ خودا بۆی گۆڕیوین بەو ئایینەی تۆ بۆت هێناوین، چەند پیرەمێردو پیرەژنێك ماون پەرستشی بۆدەکەن، ئەمجارە بچینەوە بۆ ولاّتی خۆمان خودا یاربێ یەکسەر دەیڕوخێنین.

هەروەها وەفدی (محارب) و وەفدی(غسان)و وەفدی (غامد)و وەفدی (النخع)یش هاتن. ئەم وەفدرانە، هەموویان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر و فێری ئاداب و ئەحکامی ئیسلام دەبون و شارەزای رەوشت و هەڵسو کەوتی پێغەمبەر و هاوەڵانی دەبون، لەگۆڕەپانی بەردەرگای مزگەوت دا خێمەیان بۆ هەڵدەدرا گوێیان لە خوێندنی قورئان دەگرت، دەیان دی موسوڵمانان چۆن نوێژ دەکەن. هەر پرسیارێکیان لەمێشك دا بوایە بەو پەڕی راشکاویەوە لە پێغەمبەریان دەپرسی و ئەویش بەوپەڕی بەلاغەت و حیکمەت و دانایی یەوە وەڵامی دەدانەوە، ئایەتی قورئانی بەبەڵگە بۆدەهێنانەوە موسوڵمان دەبوون و دڵیان ئارامی دەگرت.

## گوفت و گۆی نێوان بتپەرستێکی نەفام و پێغەمبەری مامۆستا:

ئەمە گوفت و گۆیەکە لەنێوان کەنانەی کوڕی عەبدیالیل و پێغەمبەردا روی دا.

کەنانە: ئەتۆ داوێن پیسی چۆن دەبینی؟ ئێمەی کەسانێکی گەنجین خێزانمان نیە ناچارین دەبێ زینا بکەین.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): زینا کردن حەرامە و بۆتان ڕەوا نیە، خودا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً. سورة الإسراء (٣٢)﴾ نزیکی کاری داوێن پیسی مەکەونەوە، بێگومان زینا فاحیشەیەو کارو رێبازێکی خراپە.

کەنانە: (ربا)ت بەلاوە چۆنە؟ بێگومان ئەوە ماڵ و سامانمانە...

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): ماڵە سەرەکی یەکەی خۆتان وەربگرنەوەو واز لەزێدەکەی بێنن. پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ

مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ. سورة البقرة (٢٧٨)﴾ ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هەیە لەخودا بترسن و خۆتان لەسزای سەختی بپارێزن. ئەو قازانج و سودەی لای خەڵك ماوەتەوە وازی لێ بێنن و گەردنیان ئازاد بکەن، ئەگەر راست دەکەن ئێوە بەدڵ بڕواتان هێناوە.

کەنانە: ئەی دەربارەی عەرەق دەڵێی چی ئەوە شەربەت و گوشراوی خۆمانە دەیخۆینەوە بێ ئەو هەڵناکەین.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): عەرەق خودا حەرامی کردوە، بەکاری شەیتانی داناوە. نابێ نزیکی بکەونەوە خودا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ. سورة المائدة (٩٠)﴾.

کەنانە: ئەی دەربارەی (الربة) دەڵێی چی؟ چی لێ بکەین؟

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): بیڕوخێنن.

کەنانەو هاوڕێکانی: ئەگەر (الربة) بزانێ تۆ دەتەوێ بیڕوخێنی هەموو نەتەوەکەی قڕدەکا لێرەدا عومەری کوڕی خەتتاب هاتە ناو گفت و گۆکەوەو وتی: کوڕە ماڵوێران! هاوار بۆ تۆ ئەی کوڕی عەبدیالیل چەندە نەفامی! (الربة) بەردێکی بێ گیانە چی لەدەست دێ و چی پێ دەکرێ؟!

کەنانەو هاوڕێکانی: ئێمە نەهاتووین بۆلای تۆ ئەی کوڕی خەتتاب، ئەمجار کەنانە بە پێغەمبەری گوت تۆ خۆت فەرمان بدە بیڕوخێنن و خۆت سەرپەرشتی بکە. ئەگینا ئێمە بۆخۆمان نایڕوخێنین.

پێغەمبەری خودا: من بۆخۆم یەکێك دەنێرم بیڕوخێنێ ئەمجار پێغەمبەر رێگەی دان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و رێزی لێ گرتن.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا لەخۆمان یەکێك بکە بە ئەمیرمان، ئەویش عوسمانی کوڕی ئەبولعاص ی کردە ئەمیریان کە لەهەموویان بەتەمەن منداڵ تر بوو، وەلێ زۆر سور بوو لەسەر فێربوونی ئیسلام تەنانەت لەوماوەیەدا کەلە مەدینە مانەوە چەند سورەتێکی قورئانی لەبەر کردبوو.

ئەو ساڵە بەساڵی وەفدەکان (عام الوفود) بەناوبانگە ساڵی قەلاچۆکردنی بتپەرستی بوو، ساڵی نەهێشتنی دیاردەی شیرك‌و کوفر بوو لەولاتی نیوە دوورگەی عەرەب دا.

## فەرزبوونی زەکات‌و صەدەقە:

لەساڵی نۆیەمی کۆچی دا پێغەمبەری خودا کاربەدەست‌و پیاوانی تایبەتی خۆی نارد بۆ هەموو ئەو ولاتانەی ئایینی ئیسلامی تێدا بلاوبوبوەوە. بۆ کۆکردنەوەی زەکات.[٢٣٠]

---

[٢٣٠] رای پەسەند ئەوەیە کەزەکات لەساڵی پێنجەمی کۆچی دا فەرزبووە، ئەو بەڵگەی ئەوە دەگەیەنێ کەفەرزبوونی زەکات پێش ساڵی نۆیەمی کۆچی بووە چیرۆکی ضەمامی کوڕی ثەعلەبەیە. هاتنی ضەمام بۆ مەدینە ساڵی پێنجەم بووە، ئەوەی لەساڵێ نۆیەم دا روی دا ناردنی زەکات کۆکەرەوەکان بوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەپێش ئەم ناردنە زەکات فەرز بووبێ.

# حەجیماڵئاوایی ساڵی دەیەمی کۆچی:

## حەجی ماڵئاوایی و کاتەکەی:

کاتێك ویستی خودا هاتەدی، دڵو دەرونی خەڵك لەچڵکی بتپەرستی پاك بۆوە، دابو نەریتی سەردەمی نەفامی نەما، جیهان بەنووری ئیسلام روناك بۆوە، پشکۆی خۆشەویستی گەشایەوە، ئەوەی کەخودا دەیویست هاتەدیو کەعبە لەبتو بتپەرستی پاك کرایەوە، دڵی موسوڵمانەکان کەلەمێژبوو حەجیان نەکردبوو کورکاندیو کاسەی خۆشەویستی و سۆز پڕبوو، تاسەر رێژی کردو، ساتی جودا بوونەوەی پێغەمبەر لەئوممەتی نزیك بۆوە، پێویست بوو ماڵئاوایی لەنەتەوەکە بکا، ئەوکاتە پەروەردگار رێگای بە پێغەمبەری خۆی دا حەج بکا، تا ئەوکاتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) حەجی ئیسلامی نەکردبوو.!!

## نرخو بەهای ئەم حەجە لەڕوی راگەیاندنو پەروەردەوە:

پێغەمبەری خودا لەمەدینە بەڕێ کەوت بەمەبەستی حەجی ماڵی خودا، بۆئەوەی بەزۆرترین ژمارەی موسوڵمانان بگاو ئاینیان فێربکا، فێری چۆنیەتی ئەنجامدانی حەجیان بکا، پەیامی خودایان پێ بگەیەنێ ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکا، پەیام و راسپاردەی خۆی بە موسوڵمانان بگەیەنێو عەهدو پەیمانیان لێ وەربگرێ، دیاردەی سەردەمی نەفامیو رابردو قەڵاچۆ بکاو بیسڕێتەوەو بیخاتە ژێر قاچیەوە. لەراستی دا ئەم حەجە شوێنی هەزار وتار و هەزار وانەی دەگرتەوە، خوێندنگایەکی گەڕۆك و مزگەوتێکی رۆیشتوو بوو، سەربازخانەیەکی گەڕیدە بوو نەزان تێیدا فێردەبوو، بێ ئاگا وەهۆش خۆ دەهاتەوە تەمبەڵی تێدا گورج و گۆڵ دەبوو

لاوازی تێدا بەهێز دەبوو، هەوری رەحمەت و فەڕو بەرەکەت بوو لەکاتی ڕێڕەوو پشودان دا موسوڵمانانی دادەپۆشین هەوری رەحمەتی هاوڕێیەتی پێغەمبەر و خۆشەویستی سۆزو پەروەردەو چاودێریکردنی پێغەمبەر بوو.

## تۆمارکردنی هەموو هەنگاوو وردەکارییەکی حەجی پێغەمبەر:

راوی‌و روداوگێرەوەکانی راستگۆو عەداڵەتخواز لەهاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەموو هەنگاو و جم‌و جۆڵێکی ئەم سەفەرە مێژوویی یەی پێغەمبەریان چرکە بەچرکە تۆمار کردووە، هەموو روداوو بەسەرهاتێکی ئەوسەفەرە مێژوویی یەی پێغەمبەریان بەوردو گەورەیی تۆمارکردووە، گەشتی هیچ پاشاو ئیمپراتۆرێکی رۆژگاری کۆن‌و نوێ ئاوا بەوردی وزانستیانە تۆمارنەکراوە، ئێستاش ئێمە بەکورتی چۆنیەتی ئەم حەجەی پێغەمبەر کە بەحەجی ماڵئاوایی بەناوبانگە، یان بەحەجی گەیاندنی پەیام یان (حجة التمام) رادەنوێنین، لەو حەجەدا پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەربێ) زیاد لەسەد هەزار هاوەڵی لەخزمەت دابووە، هەندێ پێیان وایە ژمارەی هاوەڵان سەدو چواردە هەزار بووە، هەندێکی تر پێیان وایە سەدو سی هەزار کەس بووە.

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چۆن حەجی کرد:

پێغەمبەری خودا بڕیاری دا حەج بکا، بەناو موسوڵماناندا بڵاوی کردەوە کەئەمساڵ واتە: ساڵی دەیەمی کۆچی دەچێ بۆحەج. لەمانگی ذیلقەعیدەی ئەوساڵەدا ئامادەباشی بۆئەو گەشتە کرد، موسوڵمانان خۆیان ئامادەکرد بۆچوون بۆ حەج لەخزمەتیدا.

خەڵکی دانیشتووی دەوروبەری مەدینە ئەم هەواڵە گرنگەیان بیستو خۆیان ئامادەکردو هاتن بۆناو مەدینەو ویستیان لەتەك پێغەمبەر حەج بکەن، خەڵکێکی زۆریش لەرێگەدا پەیوەندییان بەوگەشتەوە کرد، ئیتر خەڵکێکی زۆر لەپێش پێغەمبەرەوە لەپاشیەوە لەراستو چەپیەوە تاچاوبڕیکا جمەیان دەهات. پێغەمبەر لەگەڵ ئەوجەماوەرە زۆرو بەرفراوانەدا دوای نوێژی نیوەڕۆ پێنج رۆژی مابوو لەمانگی ذیلقەعیدە رۆژی شەمە دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆی کردو وتارێکی بۆ موسوڵمانان داو فێری چۆنیەتی بەستنی ئیحرام و واجباتی حەجو سونەتەکانی کردن. ئەمجار کەوتەڕێ و دەستی کرد بە (لبیك)کردنو دەیفەرموو: (لبيك اللهم لبيك لبيك لاشريك لك لبيك ان الحمد و النعمة لك والملك لاشريك لك) جەماوەرەکەش لەگەڵیا ئەم شێوە (لبيك)ەیان دەگوتەوە، ئەو جەماوەرەی لەخزمەتیابوون لەوسرودو ذیکری (لبيك)ە بەردەوام بوون، ئەمجار رۆیشت تاگەیشتە (العرج)و لەوێ دابەزی، حوشتری تیشو هەڵگری خۆیو ئەبوبەکر یەك حوشتر بوو.

ئەمجار تەشریفی کەوتەڕێ تاگەیشتە (الأبواء) ئەمجار دۆڵی عەسفان، پاشان کەوتەوەڕێ تاگەیشتە (ذي طوى) لەوێ دابەزی و شەوێك مایەوە ئەوشەوە شەوی یەکشەممە بوو چوار رۆژ لەمانگی ذیلحیجە تێپەڕ بوون، نوێژی بەیانی لەوێ بەجێ هێناو پاشان خۆی شتو کەوتەڕێ بەرەو شاری مەککە بەرۆژ لەسەروی شارەوە داخلی مەککە بوو، بەرەو کەعبە رۆیی چێشتەنگاو بوو تەشریفی چووە ناو کەعبەوە، کەچاوی بەکەعبە کەوتو تێی روانی فەرمووی: (اللهم زد بيتك هذا تشريفاً و تعظيماً وتكريماً ومهابة) خودا بە تەشریف و گەورەیی و رێزو شکۆمەندی بۆ ئەم خانوەی خۆت زیاد بکە. ئەمجار دەستی دوعاو پاڕانەوەی بەرز دەکردەوەو (الله أكبر)ی دەکردو

دەیفەرموو (اللهم أنت السلام ومنك السلام حيّنا ربنا بالسلام) کە داخڵی مزگەوت بوو بەرەو کەعبە چوو، کە گەیشتە بەرامبەر بەردە ڕەشەو ماچی کردو زۆر لای نەمایەوە، ئەمجار کەعبەی خستە لای چەپی یەوەو بە ڕۆیشتنی شێوە گورگە لۆقە دەستی بەتەوافی کەعبە کرد، لەسوڕانەوەکەی دا کەمێك بەخێرایی دەڕۆیی و هەنگاوەکانی لێك نزیك دەکردنەوە، ئەمجار ریداکەی بەژێر بنهەنگڵی ڕاستی دا هێناو خستیە سەرشانی چەپی و شانی چەپی داپۆشی و شانی ڕاستی بەروتی مایەوە، هەرکە لە تەوافەکەی دا دەگەیشتەوە لای بەردە ڕەشە دەستی بۆ رادەداشت و بەگۆچانەکەی ئیستلامی دەکرد، کە تەوافی تەواو کرد تەشریفی هاتە پاش (المقام) ئایەتی ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ. (١٢٥) سورة البقرة﴾ی خوێندو دوو ڕکات نوێژی کرد، کە لەنوێژەکەی بووەوە، ڕۆیشت بۆلای بەردە ڕەشەو ماچی کرد، ئەمجار لەدەرگای بەرامبەرییەوە چوو بۆسەر تەپۆلکەی (الصفا) کەلێی نزیك بووە وە ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ. سورة البقرة (١٥٨)﴾ی خوێندو فەرمووی لەوشوێنەوە دەست دەکەم بەسەعی و هاتوچۆ کە خودا لەئایەتەکەدا پێشی خستوە، ئەمجار بەگردۆلکەی صەفادا هەڵگەڕا تا کەعبەی لێ دەرکەووت، ڕوی کردە کەعبەو فەرمووی: (لا اله ألا الله وحده لاشريك له، له الملك و له الحمد وهو على كل شيء قدير، لا إله إلا الله وحده، أنجز عده ونصر عبده وهزم الأحزاب وحده) چوار ڕۆژ لە مەککەدا مایەوە (یەکشەممەو دووشەممەو سێ شەممەو چوار شەممە) لە چێشتەنگاوی ڕۆژی پێنج شەممەدا لەگەڵ ئەوجەماوەرە موسوڵمانانەی لەتەکیابوون بەرەو مینا کەوتەڕێ و تێیدا

دابەزی، نوێژی نیوەڕۆو عەصری لەوێ کردو مایەوە شەو داهات‌و تەشریفی هەر لەوێ بوو، شەوی جومعە بوو، کە رۆژ بووە خۆرهەلات، ئەمجار بەرەو کێوی عەرەفە کەوتەڕێ، لە (نەمیرة) خێوەتێکی بۆ هەڵدرابوو، لای دابەزی‌و لەژێر خێمەکەدا مایەوە تاخۆر لە هێڵی ناوەڕاستی ئاسمان لای دا، ئەمجار فەرمانی دا حوشتری تایبەتی خۆی کەپێیان دەگوت (القصواء) ئامادەکراو سواری بوو رۆیشت تا گەیشتە (بطن الوادي) لەخاکی عەرەفە. لەوێ بەسواری حوشترەکەی خوتبەیەکی گرنگی دا. بەکورتی دەستوری بنەڕەتی ئیسلامی راگەیاند، ریشەو بنەمای شیرك‌و بتپەرستی و داب و نەریتی سەردەمی نەفامی روخاند، بڕیاری شتەسەرەکی یە حەرامەکانی راگەیاند کەبریتی بوون لەدەست درێژی کردن بۆسەرگیان‌و ماڵ‌و ناموس، هەموو یاساو رێسایەکی سەردەمی جاهیلی خستە ژێر قاچی یەوە رێبای سەردەمی جاهیلی حەرام کردو بەتاڵی کردەوە، ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد بەوەی لەگەڵ ئافرەتان دا هەڵس‌و کەوتی جوان بکەن، رێزو نرخیان بۆ دابنێن، مافی پیاوان بەسەر ژنەکانیانەوەو مافی ژنەکان بەسەر پیاوانەوەی بۆڕون کردنەوە، فەرمانی پێ کردن پیاوان پۆشاك‌و بژێوی شیاو بۆ خێزانەکانیان دابین بکەن.

ئەمجار ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد بەوەی کە پابەندی ئەحکامی قورئان بن. هەواڵی ئەوەی پێ دان کەهەتا ئەوان پابەندی ئەحکامی قورئان بن گومڕانابن و سەریان لێ ناشێوێ، ئەمجار پێ‌ی راگەیاندن کەئەوان بەرامبەر ئایین بەرپرسن‌و دەبێ تەنفیز ی بکەن‌و بیپارێزن داوای لێ کردن ئەوان چی دەڵێن و چۆن شایەتی دەدەن؟ وتیان شایەتی دەدەین کە تۆ پەیامی خۆت گەیاندو ئەرکی سەرشانت بەجێ هێنا، ئامۆژگاریت کردین‌و ئەحکامی ئاینت بۆ شی کردینەوە، ئەویش پەنجەی شەهادەتی بۆ ئاسمان

بەرزکردەوەو خودای کرد بەشایەت بەسەریانەوەو سێجار فەرمووی: خودایە! بەشایەتبە، من ئەرکی خۆم گەیاند، ئەمجار پێی فەرموون بائەوانەی ئامادەن لێرە ناوەڕۆکی ئەم وتارو قسانەم بەوانە رابگەیەنن کەلێرەنین. جاکە وتارە مێژوویی یەکەی تەواو کرد فەرمانی بەبیلال دا کەبانگ بلێ، ئەویش بانگی داو قامەتی کرد ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێش نوێژی نیوەڕۆی بە کورتکراوەیی بۆکردن، ئەمجار قامەتی کرد بۆ نوێژی عەصر دوو رکاتی عەصریشی بۆکردن، رۆژەکە رۆژی هەینی بوو، کەلەنوێژەکان بۆوە سوار بوو هاتە (مەوقیف) لەوێ بەسواری حوشترەکەی وەستاو دەستی کرد بەدوعا و پاڕانەوە و لالانەوە هەتا خۆرئاوابوو بێ پسانەوە دوعاو پاڕانەوەی کردن، لەدوعا کردنەکەی دوو دەستی بەرز کردبونەوە بۆلای سینگی و دەیفەرموو: خودایە تۆ قسەی من دەبیسی، شوێنەکەم دەبینی، نهێنیو ئاشکرام دەزانی، هیچ کارێکی من لەتۆ نادیار نییە من ئاتاجو هەژارم، پەنام هێناوە، لێقەماوو پەنابەرم، ترساوو داماوم، دان دەنێم بەتاوانەکانم دا داوای مسکێنانەت لێ دەکەم دەپاڕێمەوە وەکو پاڕانەوەی تاوانباری بێ چارە، نزات لێ دەکەم وەکوو نزای ترساوی نابینا، من کەسێکم ملکەچی فەرمانی تۆ، دووچاوم لەترسی تۆ فرمێسک دەڕێژن، جەستە خەستەمو زەلیل و بێ ئەنوام، بەندەیەکم ناوچەوانم لەسەر زەوی داناوە بۆ زاتی پاکت، خودایە دوعاکانم لێ وەربگرەو نائومێدم مەکە. روحمو بەزەییت بۆمن زۆر بێ، ئەی ئەوکەسەی باشترین داوا لێ کراوی و لەهەموو کەس بەخشندە تری!

ئیتر لەو سەروبەندەدا ئایەتی ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ

كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ. سورة المائدة (٣)﴾ نازڵ بوو!

جا کەخۆر ئاوابوو لەکێوی عەرەفەوە هاتە خوارو ئوسامەی کوڕی زەیدی لەدوا خۆیەوە سوارکرد لەسەرە خۆ لە عەرەفەوە هاتە خوار جڵەوی حوشترەکەی توند گرتبوو، تەنانەت سەری حوشترەکە هێندە بەرزبووبوەوە لەقەراخی بارو بارگانەکەی دەکەوت. لێکدان لێکدان دەیفەرموو ئەی ئادەمیزادینە! لەسەرە خۆو بەهێدی بڕۆنە خوار، ناو ناوەش (لبيك اللهم لبيك ....) دەکرد، بەدرێژایی ڕێگە تا موزدەلیفە هەرخەریکی ئەم ذیکرە بوو، ئەمجار فەرمانی بەبانگدەر دا بانگ بڵێ: ئەویش بانگی فەرموو دوایی قامەتی کردو پێش بارخستن و ییخ دانی حوشترەکان نوێژی شێوانی کرد، کەبارەکانیان خستن‌و حوشترەکانیان ییخ دان فەرمانی دا قامەت کراو نوێژی عیشای کرد، پاشان خەوت تا بەرە بەیان، کەبەیانی ئاسۆ روناك بوو نوێژی بەیانی بەجێ هێنا، ئەمجار سوار بوو هەتا هاتە (مشعر الحرام) لەوێ رووی کردە کەعبەو دەستی کرد بەدوعاو پاڕانەوو لالانەوەو (الله أکبر) کردن‌و تەهلیلە و ذیکر خوێندن هەتا بەتەواوی دونیا روناك بوو، هێشتا خۆر هەڵنە هاتبوو، پاشان لەموزدەلیفەوە بەڕێ کەوت فەضلی کوڕی عەباسی خستبووە پاشکۆی خۆی‌و (لبيك اللهم لبيك..)ی دەگوت‌و دەگوتەوە. فەرمانی بەئیبنو عەباس کرد کە حەوت بەردە وردەی بۆ کۆبکاتەوە بۆ شەیتان رەجم کردن، کەهاتە دۆڵی (محسر) بەخێرایی غاری بە حوشترەکەی داو بەپەلە تێپەڕی، چونکە لەوێ دا (أصحاب الفيل) توشی ئەو عەزابە سامناکە هاتن. هات هەتا گەییشتە میناء، چووە (جمرة العقبة)

و دوای خۆرهەڵات بەسواری حوشترەکەی رەجمی شەیتانی کردو ئیتر کۆتایی بە (لبيك اللهم لبيك ...) کردن هێنا.

پاشان چووەوە بۆ میناء وتارێکی گرنگی بۆ جەماوەری هاوەڵان دا، باسی حورمەتو گەورەیی رۆژی قوربانی بۆکردن، پێی راگەیاند کە ئەورۆژە لای خودا زۆر گەورەیەو مەککە رێزو نرخێکی زۆر گەورەی لای خودا هەیەو فەضل و گەورەیی بەسەر هەموو شارو وڵاتانی تردا هەیە. فەرمانی پێ کردن بەوەی ملکەچ و گوێ رادێربن بۆ کەسێك بەگوێرەی قورئان رابەرایەتییان بکا، فەرمانی پێ کردن کە لەحەجکردن دا چاو لەوبکەنو وەکوو ئەو مەناسیکەکان بەجێ بێنن، فەرمانی پێ کردن کەدوای ئەو نەگەڕێنەوە بۆ کوفرو خوێنی یەکتر نەرێژن، دوایی فەرمانی پێ کردن: کەئەم نەصیحەتو ئامۆژگارییانە لەوەوە بەکەسانی دیکە رابگەیەنن، لەو خوطبەیەی دا فەرمووی: (بەندایەتی خودای خۆتان بکەن پێنج فەرزەی نوێژەکانتان بەجێ بێنن، مانگی رەمەزانی خۆتان بەرۆژو بن، گوێ رادێری فەرمانڕەوای خۆتان بن دەچنە بەهەشتی خودای خۆتانەوە). ئەمجار خودا حافیزی لەجەماوەرەکە کرد، خەڵکەکە وتیان بۆ ئەمە حەجی ماڵئاوایی یە؟ ئەمجار تەشریفی چوو بۆشوێنی ئاژەڵ سەربڕین، بەدەستی خۆی شەصتو سێ حوشتری سەربڕی ژمارەی ئەو قوربانیانە بەئەندازەی ژمارەی ساڵانی تەمەنی بوو، ئەمجار دەستی لەحوشتر سەربڕین هەڵگرتو فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەبو طالیب کرد باقی ماندەی سەد حوشترەکە کەسیو حەوت حوشتر بوو سەریان ببڕێ. جا کە پێغەمبەری خودا لەقوربانی سەربڕین بووە وە بانگی سەرتاشی کرد سەری بۆ تاشی، مووەکانی بەسەر خەڵکەکەی پەنایدا دابەش کرد، ئەمجار بەسواری حوشترەکەی هات بۆ مەککە تەوافی کەعبەی کرد کە (طواف الافاضة) یان (طواف الزيارة)ی پێ دەگوترێ.

پاشان چووە سەرئاوی زمزمو بەپێوە لـێی خواردەوە، ئـەمجار عـەینی ڕۆژ گەڕایەوە بۆ میناء، شەو لەوێ مایەوە، کە ڕۆژ بووەوە چاوەڕێی کرد تـاخۆر لای دا، کە خۆر لـەهێڵی (إستواء) لای دا ڕۆییشت بۆ شـەیتان ڕەجمکردن، سەرەتا (جەمـەرەی یەکـەم و دوایـی ناوەڕاسـت و پاشـان سێیەم) کـە (جمـرة العقبة)یە هەرسێکی بەریز ڕەجم کردن، لەمینادا دوو خوتبەی بۆ جەماوەری موسـوڵمانان دا، وتارێکیـان ڕۆژی یەکـەمی جـەژنی قوربـان و کەلەپێـشەوە ئامـــاژەی پـــێ کـــرا، وتـــاری دووەم ڕۆژی دووەمـــی جـــەژن ئاڕاســـتەی موسـوڵمانانی کـرد. تەشـریفی مایـەوە تـا ڕەجمکردنـی سـێ ڕۆژەی لەسـێ ڕۆژەی جـەژن دا ئـەنجام دا، پاشـان تەشـریفی هاتـەوە ناوشـاری مەککـەو پارشێو پێش ڕۆژ بوونـەوە تـەوافی ماڵئـاوایی کـردو فـەرمانی دا خەڵکەکـە باربکەن و بەرەو مەدینە بگەڕێنەوە.

کاتێك گەیشتە (غەدیر خوم)[٢٣١] لەوێ پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) وتـارێکی بۆ موسڵمانان دا لەو وتارە دا باسی ڕێزو فەضلی عـەلی کرد،[٢٣٢] فـەرمووی: (من کنت مولاه فعلي مولاه، اللهم وال مـن والاه وعـاد مـن عـاداه) کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەســەربێ) گەییـشتە (ذولحـولەیفـە) شـەو لـەوێ مایـەوە، کەمەدینـەی لێ دەرکـەوت ســێ جـار (الله أکـبر)ی کـردو فـەرمووی: هـیچ خـودا نـین جگـە

---

[٢٣١] شوێنێکە لەنیوان مەککەو مەدینەدا نێوان غەدیرو جەعفە، دوو میل دەبێ.

[٢٣٢] سـەیری (سـیرة الـنبي) دانـراوی ئیبنوکەثیر بکـە جـ٤/٤١٥-٤١٦ ئـەویش لـەئیمام ئەحمەدو نەسائی ڕاگوێستووە. هۆکاری ئەم وتەیەی پێغەمبەر ئەوە بـوو هەنـدێ کـەس شـکاتیان لەعـەلی کردو سەرزەنشتیان کرد، هەنـدێ لەوانـەی لەگـەڵی دا بـوون لەیەمـەن ئەوانیش هەندێ عەداڵەتکاری ئیمامی عەلییان بەسـتەم لەقەڵـەم دابـوو، بـەخیلییان پـێ بردبوو لەڕاسـتی دا حـەق لەگـەڵ عـەلی دا بـوو، هەرچـی دەربارەیـان گوتبـوو بوختـان و هەڵبەست بوو. ابن کثیر ٤/٤١٤.

لەخودای تاك و تەنیا هیچ هاوەڵی نین، موڵك و سەڵتەنەت هی خۆیەتی، سوپاس و ستایش هەر بۆئەوە، دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك داهەیە، ئێمە گەڕاینەوە تۆبەكارو پەرستشكارو سوژدەبەر بۆخودای خۆمان، خوداوادەی خۆی هێنایە دی بەندەی خۆی سەرخست، گەلە كۆمەكی ناحەزانی پوچەڵ كردنەوە هەوڵ و تەقەڵڵای دوژمنانی تێك شكاند، پاشان بەرۆژ داخڵی مەدینە بووەوە.

## وتاری پێغەمبەر لەحەجیماڵئاوایی دا:

لێرەدا دەقی ئەو وتارەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كەلەرۆژی عەرەفەدا ئاراستەی موسوڵمانانی كرد دەخەینەڕو هەروەها ئەو وتارەی لەناوەڕاستی (أيام التشريق)دا دای، هەردوو وتارەكە لێرەدا تۆمار دەكەین چونكە پڕن لەئامۆژگاری و ئەحكام و یاسا، سودو بەهرەی زۆریان لەخۆ گرتووە. لەوتاری عەرەفەدا فەرمووی: ...بزانن خوێنتان و ماڵ و سامانتان لێتان قەدەغەیە، نابێ دەستدرێژی بكەنە سەرو بەناحەق پێشێلی بكەن، وەكوو چۆن ئەم رۆژە پیرۆزەو ئەم مانگە پیرۆزەو ئەم شارە پیرۆزە نابێ حورمەتیان پێشێل بكرێ. بزانن هەموو دابو نەریتێكی سەردەمی نەزانی دەخەمە ژێر قاچم و پوچە، هەموو قەرزە خوێنێكی رۆژگاری جاهیلی چاو پۆشی لێ دەكرێ و تۆڵە ستاندنەوەی نیە، یەكەم خوێنێك كەچاو پۆشی لێ دەكەم، خوێنی رەبیعەی كوڕی (الحارث)ە شیر خۆری هۆزی بەنی سەعد بوو، هۆزی هوزەیل كوشتیان. هەروەها هەموو ریباو سودی سەردەمی نەزانی وازی لێ دەهێندرێ، یەكەم هەنگاو بۆلابردنی ریبای پێش هاتنی ئیسلام ریباو سودی عەباسی كوڕی (عبدالمطلب)ە، هەموو پوچەو وەلاندرا. لەخودا بترسن دەربارەی ئافرەت، ئەوانە ئەمانەتی خودان لای ئێوە، بەوشەی

خودایی ئەوان بۆ ئێوە حەڵاڵ بوون، مافیان لەسەر ئێوە هەیەو مافیان پێشێل مەکەن مافی ئێوەش لەسەر ئەوان ئەوەیە کەرێگەنەدەن کەسێك بێتە ماڵتان کە ئێوە پێتان ناخۆشە بێتە سەرفەرشی ئێوە، ئەگەر ئەو سەرپێچی یەیان کرد تەمبیان بکەن لێیان بدەن بەلێدانێکی بێ ئازار، پێویستە لەسەرتان بەشێوەیەکی ڕێكو پێك بژێوو پۆشاکیان بۆ دابین بکەن. من لەناو ئێوەدا شتێکم بەجێ هێشتووە، ئەگەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز ڕێگەتان لێ گوم نابێ‌و گومڕانابن، ئەویش قورئانی پیرۆزە، ئێوە پرسیار لەمن دەکەن، ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: شایەتی دەدەین کە پەیامی خۆت گەیاندو ئەرکی سەرشانت بەجێ هێنا، ئامۆژگاری خۆت کرد ئەمجار قامکی بۆئاسمان بەرزکردەوەو رایداشتاوە بۆ لای خەڵکەکەو سێ جار فەرمووی خودایە بەشایەت بە.[٢٣٣] ئەمەش دەقی وتارەکەی پێغەمبەرە کەلەناوەڕاستی ڕۆژانی جەژنی قوربان دا لەمینا ئاڕاستەی جەماوەرەکەی کرد، فەرمووی:

ئەی خەڵکینە: ئایا دەزانن لەچ مانگێك دان لە چ ڕۆژێك دان لەچ شارێکدان؟ وتیان: لەرۆژی ڕێز لێگیراوو حورمەتدار داین، لەشارێکی پیرۆزو حورمەتدار داین، لەمانگی حەرام داین. پێغەمبەر فەرمووی: بێگومان خوێنتان و ماڵو سامانتان، ناموس‌و شەرەفتان لەسەر یەکتر حەرامە، وەکوو حورمەتی ئەم رۆژە لەم مانگە پیرۆزەدا لەم شارە ڕێزدارو حورمەتپارێزراوەدا نەچن دەستدرێژی بکەنە سەر حورمەتی یەکتری ئەمانە هەموویان لێتان قەدەغەن تا ئەو رۆژەی دەگەڕێینەوە بۆلای خودای خۆتان. پاشان فەرمووی: گوێم لێ بگرن‌و ئاگاداربن! ستەم لەیەکترمەکەن ئاگاداربن! ستەم لەیەکتری مەکەن! بێگومان ڕەوانیە کەس ماڵی موسوڵمان بخوا مەگەر

---

[٢٣٣] رواه مسلم و أبوداود وغيرهما عن جابر ورواه مسلم في صحيحه عن جعفر بن مهدي علي بن الحسين عن أبيه عن جابر.

بۆخۆی لەناخەوە بەوە رازی بێ، ئاگاداربن! هەموو قەرزە خوێنو داواکاری مالٕیو دابو نەریتی باوی سەردەمی نەزانی هەڵوەشایەوەو دەیخەمە ژێر قاچمەوە و کاری پێناکرێ تا رۆژی قیامەت، بێگومان یەکەم خوێنێك کەهەڵی دەگرم خوێنی ربیعەی کوڕی (الحارث)ی کوڕی (عبدالمطلب)ە کەشیرخۆری هۆزی بەنی سەعد بووە و هۆزی هوزەیل کوشتیان. ئاگاداربن! هەموو ریباو سودێکی سەردەمی نەزانی پوچو هەڵوەشاوەن، وەبێگومان پەروەردگار فەرمانی پێ کردم یەکەم ریباو لای دەبەم و پوچی دەکەمەوە سودی عەباسی کوڕی (عبدالمطلب)ە.

ئەوەی قەرزو مامەڵەی ریبا ئامێزی هەیە باواز لەزیادەکە بێنێو ماڵە سەرەکییەکە وەربگرێتەوە نەستەم بکەن نەرێگە بدەن ستەمتان لێ بکرێ ئاگادار بن! رۆژگار دێو دەچێو وەکوو خۆی هەڵدەسوڕێ، لەو رۆژەوەی خودا ئاسمان و زەوی دروست کردوون، ئەمجار ئایەتی ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ. سورة التوبة (٣٦)﴾ ئاگاداربن! نەکەن دوا من بگەڕێنەوە سەر کوفرو بێدینی، نەچن شەڕو ئاژاوە لەناوخۆتان بەرپا بکەنو بکەونە وێزەی گیانی یەکتری و لەملی یەکتری بدەن. ئاگادار بن شەیتان لەوە نائومێد بووە نوێژکەر گوێڕایەڵی بن وەلێ لەرێگەی بەرپاکردنی ئاژاوەوە زەفەریان لێ دێنێ، لەخودا بترسن دەربارەی ئافرەت بێگومان ئەوان یارمەتیدەری ئێوەن لەژیان دا، بۆخۆیان هیچیان نیە بژێوو بەخێوکردنیان لەئەستۆی ئێوەیە، ئەوان مافیان بەسەر ئێوە وە هەیە. ئێوەش مافتان بەسەر ئەوانەوە هەیە، نابێ داوێن پیسی بکەن، نابێ بێڵن کەسانێك کەئێوە خۆشتان ناوێن بێنەر سەر بڕەی ئێوە، ئەگەر ترسی ئەوەتان لێ هەبوون

ناچیزە بن ئامۆژگارییان بکەن، جێگایان لێ جیابکەنەوە، ئەگەر تەمبێ نەبوون لێیان بدەن بەلێدانێکی بێ ئازار، مافیان لەسەر ئێوە ئەوەیە بژێوو پۆشاکیان بەرێکو پێکی بۆدەستەبەر بکەن. ئێوە ئەوانتان بەوادەو پەیمان وەرگرتووە پابەندی بەڵێنی خۆتان بن، بەوشەی خودایی ئەوانتان بۆ حەلاڵ کراوە، هەرکەسێك ئەمانەتێکی لایە بابیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی و خۆی لێ رزگار بکا ئەرێ من پەیامی خۆم گەیاند؟ ئەرێ ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێ هێنا؟ پاشان فەرمووی: با ئامادەبوو ئەم ئەحکامو ئامۆژگارییانە بگەیەنێ بەوانەی لێرەنین. چونکە بێگومان زۆر جار پێ راگەیاندراو لەبیسەر بەختەوەرتر دەبێ.

## کۆچی دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)
## مانگی رەبیعولئەوەل ساڵی یانزەی کۆچی:

### ❧، تەواو بوونی ئەرکی راگەیاندنی پەیام و دامەزراندنی یاساو نزیك بوونەوەی کاتی گەڕانەوە بۆلای خودا:

کاتێك ئایینی ئیسلاك گەیشتە ئاستی تەواو بوون هیچ شتێك نەما شی نەکرێتەوە هیچ یاساو قانونێك نەما دەستورو بنەمای بۆ دانەنرێ، ئایەتی ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا

فَمَن اضْطرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ. سورة المائـدة (٣)﴾ نازڵ بوو. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەیامی خۆی گەیاندو ئەمانەتی لەئەستۆی دابوو بەجێی هێنا، لەرێگای خودا دا تێکۆشاو جیهادی راستەقینەی کرد، گەل و نەتەوەیەکی دروست کرد بتوانێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی لەئەستۆ بگرێ و ئەوبەر پرسیاریەتە بەرێوە بەرێ و بانگەوازی ئیسلامی بڵاو بکاتەوەو پارێزگاری ئایین بکاو نەهێڵێ تەحریف و گۆڕانکاری تێدا بکرێ، فەرمان بە چاکەو نەهی لەخراپە لەئەستۆ بگرن و پێی هەڵسن وەکوو خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ. سورة آل عمران (١١٠)﴾ ئێوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! باشترین کۆمەڵن کە هێنراونە گۆڕەپانی ژیانەوە، سێ رەوشتی سەرەکی و هۆکاری بەختەوەریتان تێدان، فەرماندەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لەخراپەو بڕواشتان بەخودا هەیە. گرینتی ئەوەشی راگەیاند کەئەم قورئانەی بناغەی ئایینی لەسەر دامەزراوە دەیپارێزێ و ناهێڵێ گۆڕانکاری تێدا بکرێ و دەستی تەحریف و شێواندنی بگاتێ. دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ. سورة الحجر (٩)﴾ ئێمە ئەم قورئانەمان نازڵ کردوەو خۆشمان پارێزگاری دەکەین. هەروەها پەروەردگار چاوی پێغەمبەری خۆی فێنک کردنەوەی بەوە کەدەیدی خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ و دەستە دەستە دەهاتنە ژێر سایەی ئایینی خوداوە، بەهەر چوارلادا بڵاو بووەوە دەرکەوت کەبەسەر ئایینەکانی تردا بالادەست دەبێ و هەموو کون و قوژبنێکی دونیا دەگرێتەوە، دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا. سورة النصر (١-٣)﴾.

## پێداچوونەوەی قورئان‌و دوچەندانەکردنی ئیعتیکافی رەمەزان:

داب‌و نەریتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەهابوو هەموو ساڵێك لەمانگی رەمەزان دا دە رۆژ لەمزگەوت دا (اعتكاف)ی دەکرد دەمایەوە، ساڵی لەدنیا دەرچونی بیست رۆژ لەمزگەوت دا مایەوەو ئیعتکافی کرد.

لە لایەکی ترەوە حەزرەتی جوبرائیل هەموو شەوێکی رەمەزان دەهاتە لای و لەگەڵی دا قورئانیان دەور دەکردەوە، وەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەوساڵە فەرمووی: جوبرائیل دوجار بۆی خوێندومەوە، وای دەبینم مەرگم نزیك بووبێەوە!.

پەروەردگار ئیزنی دا پێغەمبەری خۆی بگەڕێتەوە بۆلای خۆی، چونکە هیچ کەسێك ئەوەندە تامەزرۆ نەبووە بۆ گەیشتنەوە بەخودای خۆی، پەروەردگاریش پێی خۆش بوو پێغەمبەر بەرەو ژیانی حاویدانی قیامەت بڕوا. هەڵبەتە خودا دڵ‌و دەروونی هاوەڵانی ئامادە باش کرد بۆئەوەی خۆیان بگرن بۆ بیستنی هەواڵی جەرگبڕی وەفاتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چونکە خۆشەویستی ئەوان بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەئاستێکی زۆر بەرزو نمونەیی‌و میثالی دا بوو، ئەگەر خودا صەبرو خۆراگری پێ نەدانایە، خۆیان بۆئەوکارەساتە رانەدەگرت. ئەوان دەیانزانی دەبێ رۆژێك بێ پێغەمبەر بەجێیان بێڵێ و لەدونیا دەرچێ، چەندێك هاتنی ئەو روداوە بوە غەرێ هەردەبێ بێ، ئەوە بوو لەغەزای ئوحودا هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەر وەکوو هەورە بروسکە دای لەگوێی هاوەڵان‌و شڵەژاندنی، پاشان زۆری پێ نەچوو دەرکەوت، پڕوپاگەندەی شەیتانی بوو، هاوەڵان بۆیان دەرکەوت کەخودا پێغەمبەریان بۆ دەهێڵێتەوە لەژیان دا بۆماوەیەکی تر، وەڵێ هەردەبێ ژیان بەجێ بێڵێ‌و پیاڵەی مردن بچێژێ‌و رۆژێ لەرۆژان روبەڕوی

روداوی لەدونیادەرچوونی پێغەمبەریان ببنەوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ. سورة آل عمران (١٤٤)﴾.

هەڵبەتە هەندێ لەو هاوەڵانەی کە پێغەمبەر زۆر بەجوانی پەروەردەی کردبوون و زۆر لەخزمەتی دا مابونەوەو نووری بیروباوەڕی راستەقینە دڵو دەروونی روناك کردبوونەوە، دڵیان پەیوەست بوو بەخوداوەو سەرگەمی بڵاوکردنەوەی ئایین بونو بەتەواوی لێ بڕاون بۆ خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و هەمیشە لە تێکۆشاندا بوون بۆئەوەی بەندەکان لەبەندایەتیکردن بۆ بتو صەنەم و بەندەکان رزگار بکەنو رایان بێنن بۆ بەندایەتیکردنی خوداو یەکتاپەرستی، دڵنیابوون کەرۆژێك دێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ماڵئاواییان لێ دەکاو بەجێیان دێڵێ و دەگەڕێتەوە بۆلای خوداو لەژیانی جیهانی بێ وەفا جیا دەبێتەوە. بۆیە کەئایەتی ﴿إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا. سورة النصر (١-٣)﴾ نازڵ بوو، هاوەڵان وای لێ حاڵی بوون کە ئەمە ئاماژەیە بەنزیکبوونەوەی ساتی جودابوونەوەی پێغەمبەر لەجیهانو هاوەڵانی. وتیان مانای ئەوەیە ئەرکی پێغەمبەر تەواو بووە. هەندێ لەهاوەڵان بەنازڵبوونی ئایەتی ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ. سورة المائدة (٣)﴾ هەستیان بەوەکرد کەئەمە ئاماژەیە بەلەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ).

## حەزكردن بەگەڕانەوە بۆلای خودا ماڵئاوایی لەجیهان:

دوای ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەحەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە لەوحەجەدا ئاماژەی بۆئەوەكرد كە مەرگی نزیك بۆتەوە، تەنانەت ئیمامی موسلیم لەصەحیحی خۆی دا لە جابیرەوە ئەوەی ریوایەت كردوە، كە پێغەمبەر لای (جمرة العقبة) راوەستاو فەرمووی: مەناسیكی خۆتان دەربارەی حەج لەمنەوە وەرگرن و فێریان بن لەوانەیە من ساڵێكی تر حەج نەكەمەوە. هەر لەو حەجەدا چووە سەر گۆڕی شەهیدانی ئوحودو نوێژی لەسەر كردن، دەتگوت لە نزیكەوە خودا حافیزی لەهاوەڵانی نزیكی دەكا. لەدوای هەشت ساڵ چووەوە سەرگۆڕیان و وەكوو خودا حافیزی لە زیندووان بكا ئاوا خودا حافیزی لێ كردن، ئەمجار چووە سەر دوانگەو فەرمووی: ئەمن پێشەنگتانم، من بەسەرتانەوە شایەتم، وادەی من و ئێوە حەوزی كەوثەرە، ئەمن لەشوێنی خۆمەوە دەڕوانمە حەوزی كەوثەر، وەمن كلیلی گەنجینەكانی زەویم پێ دراوە، من ترسی ئەوەم نیە ئێوە دوای من هاوەڵ بۆ خودا دابنێن، وەڵێ من ترسی ئەوەم لێتان هەیە لەسەر بەدەستهێنانی كاڵاكانی جیهان كێ بركێیەكی وەها بكەن بتانفەوتێنێ وەكوو چۆن گەل و نەتەوەكانی پێش ئێوە بۆ دونیا خۆیان فەوتاندوە.

## پەیدابوونی ئازار لەسەر جەستەی پێغەمبەر:

ئازار لەناوجەستەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) لە رۆژی دوشەممە ئاخرو ئۆخری مانگی سەفەری ساڵی یانزەی كۆچی پەیدا بوو سەرەتای ئەم ئازارەش ئەوە بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەدرەنگانێكی شەودا چوو بۆ

گۆڕستانی (بقیع الفرقد) داوای لێخۆشبوونی بۆ مردوه کانی ئەو گۆڕستانە کرد پاشان گەڕایەوە بۆماڵەوە بەیانی ئازار لەجەستەی پیرۆزی دا پەیدابوو.[٢٣٤]

خاتو عائیشە دایکی موسوڵمانان (رەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگۆڕستانی بەقیع گەڕایەوە، منی بینی سەرم دێشاو دەمگوت ئای سەرم چەند ئازاری هەیە! پێغەمبەر فەرمووی تۆنا بەڵکوو من زۆرم سەر دێشێ، ئیتر ئازارەکەی لێ ی زیاد کرد و پەرەی سەند، ئەو دەمە لەماڵی مەیمونە بوو (رەزای خوای لێ بێ) ئیتر داوای لەخێزانەکانی کرد رێگەی پێ بدەن لەماڵی عائیشە بێ بەنەخۆشی ئەوانیش هەموویان رازی بوون، ئیتر فەضلی کوڕی عەباس و عەلی کوڕی ئەبوطالیب چونە ژێر باڵی و بەقوماشێك توند سەری خۆی پێچابوو وردە وردە هەنگاوی هەڵدێنانەوە، هات هەتا چووە ماڵی عائیشە رەحمەتی خودای لێ بێ.

خاتو عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا لەو نەخۆشی یەی تێیدا لەدونیا دەرچوو فەرمووی ئەی عائیشە من ئێستاش هەست بە ئازاری ئەو خواردنەی لەخەیبەر خستمە دەممەوە دەکەم، ئێستا ئالەم کاتەدا هەست دەکەم خەریکە شادەماری خوێنم بپچڕێ بەکاریگەری ئەو ژەهرە.[٢٣٥]

---

[٢٣٤] سیرة ابن هشام جـ٢/٦٤٢ و ابن کثیر جـ٤/٤٤٣.

[٢٣٥] رواه البخاري معالقاً (باب مرض النبي ووفاته) أسنده الحافظ البيهقي عن الحاكم عن الزهري به/ابن كثير جـ ٤/٤٤٩.

## ناردنی لەشکر بەفەرماندەیی ئەوسامە:

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەکاتی نەخۆشی یەکەی دا ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثەی بەلەشکرێکەوە نارد بۆ شام و فەرمانی پێ کرد سنوری (البلقاء)و (الدارون) لەخاکی فەلەستین بخاتە ژێر قاچی ئەسپەکانیەوە. لەم لەشکرە دا زۆر لە گەورە هاوەڵانی کۆچکارو یاریدەدەرانی تێدابوو، لەهەموانیان بەرچاوترو دیاری تر عومەری کوڕی خەتاب بوو، پێغەمبەری خودا ئەم لەشکرەی بەڕێ کردو نەخۆشی یەکەی تەنگی پێ هەڵچنی، لەشکری ئوسامە لە (الجرف) مایەوەو نەڕۆیی چاوەڕێی ئەوەی دەکرد خەڵکانی دی پەیوەندی پێوەبکەن، دوای لەدونیادەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەبوبەکر لەشکرەکەی بەڕێ کرد ویستو مەبەستی پێغەمبەری هێنایە دی.

## گرنگی دان بەلەشکری ئوسامە:

پێغەمبەری خودا بەدەست ئازاری سەرئێشەوە نارەحەت بوو، لەشکری ئوسامە لەدەوری مەدینە چاوەڕێی پەیوەندی کردنی جەنگاوەران بوو بۆئەوەی بەرێ بکەوێ خەڵکەکە کەمێك تەمبەڵییان نواند لەوەی پەیوەندی بکەن بەسوپاوە، خەڵکەکە کەوتبوونە مقۆمقۆو وتیان ئوسامە منداڵەو تازە پێ دەگا چۆن دەبێ بکرێ بەفەرماندەی سوپایەك کەزوربەی موهاجیرو ئەنصاری تێدا بەشدارن. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەئەمەی زانی بەو ئازارەوە لەماڵ هاتە دەرو سەری خۆی بەقوماشێك توند پێچابوو، هاتە مزگەوت و چووە سەر دوانگەو دەستی کرد بەوتاردان و دوای حەمد و ثەنا کردن فەرمووی: (خەڵکینە پەیوەندی بەو لەشکرەوە بکەن کەئوسامە فەرماندەیەتی. ئەگەر دەربارەی فەرماندەیی یەکەی قسەیەکتان هەیە ئەوە

لەوە پێشیش دەربارەی باوکی قسەی لەوجۆرەتان کردن، سوێندم بەخودا ئوسامە هەرچەند گەنجەو تازە پێ‌دەگا شیاوی ئەو فەرماندەیی یە، وەکوو چۆن باوکیشی لەوەپێش شیاوی فەرماندەیی بوو)[٢٣٦] ئەمجار لەدوانگەکە دابەزی، ئیتر خەڵکەکە پەلەپەلیان پێ کەوت بۆ خۆئامادەکردن‌و پەیوەندی کردن بەسوپای ئوسامەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئازارەکەی توند تر بوو، سوپای ئوسامەش لەدەرەوەی مەدینە لە (الجرف) لەشکربەزی کردبوو چاوەڕێی ئەوەبوو خەڵك پەیوەندی پێوەبکەن‌و سوپاکەی تەواو ببێ. ئازاری پێغەمبەر زیاتر پەرەی ساند ئوسامە بەلەشکرەوە لە شوێنی خۆی مایەوە، چاوەڕێی ئەوە بوون ئاخۆ خودا چی دەربارەی پێغەمبەر بڕیار داوە. ئیتر پێغەمبەر جارێکی تر لەنەخۆشی یەکەیدا جەختی لەسەر بەڕێ کردنی سوپای ئوسامە کردەوە فەرمووی هەرچۆنێك بێ سوپای ئوسامە بەڕێ بکەن، ئەمجار فەرمانی پێ کردن کەلەنیوە دورگەی عەرەب دا دوو ئایین نەهێڵن موشریکەکان وەدەرنێن.[٢٣٧]

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆبوونەوە بەموسوڵمانان دەکاو لەلوتبەرزی و خۆ بەزلزانی دەیانترسێنێ:

لەرۆژێك لەرۆژانی نەخۆشی یەکەی دا کۆمەڵێك لەموسڵمانان چوونە خزمەتی لەماڵی عائیشە، پێغەمبەر زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردن‌و

---

[٢٣٦] رواه البخاري في كتاب المغازي باب غزوة زيد بن حارثة، لەوێدا هاتووە دەڵێ ئەگەر ئێوە تانە لەوەبدەن ئوسامە گەنجەو شیاوی ئەمیری نیە لەوە پێشیش تانەتان لەفەرماندەیی باوکی دا، سوێندم بەخودا زیدشیاوی فەرماندەیی بوو خۆشەویسترین کەس بوو لام و کورەکەشی دوا خۆی خۆشەویسترین کەسە لام.

[٢٣٧] صحيح البخاري باب مرض النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ووفاته.

دوعای هیدایەتو سەرکەوتنی بۆکردن، پاشان فەرمووی: ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی هەمیشە لەخودا بترسنو خوداتان لەیاد نەچێ. ئەوتان بەسەرەوە جێ دێڵم، ئەو ئاگاداری کارو کردەوەتانە، وەمن لەخوداوە ترسێنەرم بۆتان بەئاشکرا دەتانترسێنم لەسزای سەختی خودا، خۆتان بە سەرخودادا بامەدەنو لوتبەرزی لەئاستی دا مەکەن. فیزو تەکەببور بەسەر خوداو بەندەکانی و ولات دا مەکەن. چونکە بێگومان خودا بەمنیش و بەئێوەش دەفەرموێ ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ. سورة القصص (٨٣)﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى اللّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ. سورة الزمر (٦٠)﴾.

## دونیا نەویستی پێغەمبەرو ڕقبونی لەماڵی زێدە:

خاتو عائیشە (دروودی خوای لەسەربێ) دەڵێ: پێغەمبەری خودا لەونەخۆشییەی تێیدا مرد، فەرمووی ئەی عائیشە: چیت لەئاڵتونەکە کرد، بۆم هێنا پێنج تاحەوت یان هەشت تا نۆ زێڕ بوون ئەویش تەشریفی بەدەستی خۆی هەندێ ئەم دیوو ئەودیوی کردن، دەیفەرموو: دەبێ ڕۆژی قیامەت موحەممەد بەرامبەر بەخودا بڵێ چی ئەم پارە زێڕەی هەیە! بڕۆ بی بەخشە با لەماڵم دا نەمێنێتەوە.

## گرنگی دان بەنوێژو پێشنوێژی کردنی ئەبوبەکر:

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تادەهات ئازارەکەی توندتر دەبوو ماوەیەك بوو کاتی نوێژی خەوتنان هاتبوو، فەرمووی ئەرێ خەڵکەکە نوێژیان کرد؟؟

عەرزیان کرد نەخەیر ئەوان چاوەڕێی جەنابتن ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی دەئاوم بۆ بکەنە ناو (مِخْضَب)[٢٣٨] سوێنەوە ئەوانیش ئاوەکەیان بۆ ئامادەکرد، ئەویش خۆی شتو ئەمجار بەرەو مزگەوت بەلۆژە لۆژ ڕۆیشت، نەیتوانی خۆی ڕابگرێ بێهۆشی بەسەردا هات، پاشان وەهۆش خۆ هاتەوە، فەرمووی: ئەرێ خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ وتیان: نەخەیر ئەوان چاوەڕێی جەنابتن ئەی پێغەمبەری خودا، خەڵکەکە هەموویان لەمزگەوت دا مابوونەوە چاوەڕوانی پێغەمبەریان دەکرد بۆ نوێژی خەوتنان، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەڵامی نارد بۆ ئەبوبەکر بەوەی پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکا، ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمو عاطیفیبوو، وتی: ئەی عومەر! ئەتۆ پێشنوێژییەکە بکە، عومەر وتی: تۆشیاوتری لەمن بەو ئەرکە، ئیتر ئەبوبەکر ئەو ڕۆژانە نوێژی بۆ خەڵك کرد پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەندێ ئازارەکەی سوك بوو ویستی بچێ بۆ مزگەوت، بۆ نوێژی نیوەڕۆ عەباسو عەلی (رەزای خوای لێ بێ) چوونە ژێر باڵیەوە، کە حەزرەتی ئەبوبەکر چاوی بە پێغەمبەر کەوت، کشایە دواوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئیشارەی بۆکرد کەنەیەتە دواوە پێشنوێژی بکا، فەرمانی بەعەباسو عەلی کرد کەلەتەنیشت ئەبوبەکر دای بنیشێنن، ئیتر ئەبوبەکر پێشنوێژی بەراوەستانەوەکردو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەدانیشتنەوە نوێژی کرد. (ئومولفەضل)ی کچی (الحارث) دەڵێ گوێم لێ بوو پێغەمبەر لەنوێژی شێوان دا (والمرسلات عرفاً)ی خوێندو ئیتر لەوە دوا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێشنوێژی بۆنەکردینەوە تا خودا گیانی کێشا.

---

[٢٣٨] مخضب: قاپێکە جلی تێدا دەشوردرێن لەکوردەواری خۆمان پێی دەگوترێ سوێنە.

## وتاری خودا حافیزی:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر دوانگە دانیشت، سەری خۆی پێچابوو، هەندێ فەرموودەی ئاڕاستەی جەماوەرەکە کرد، لەوقسانەی فەرموونی ئەوە بوو وتی: (بەندەیەك لەبەندەکانی خودا، پەروەردگار سەرپشکی کردوە لە نێوان دونیاو ئەوەی لای خودایە، ئەویش ئەوەی لای خودای هەڵبژاردوە) حەزرەتی ئەبوبەکر لەمانای ئەم رستەیە حاڵی بوو، زانی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مەبەستی خۆیەتی، بۆیە گریاو فەرمووی: بەڵکوو ئێمە خۆمان دەکەینە قوربانت، خۆمان و کوڕەکانمان بەقوربانت بن.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر! لەسەر خۆبە، بێگومان کەس هێندەی ئەبوبەکر پیاوەتی بەسەر منەوە نیە، بەگیان و ماڵی خۆی یارمەتیدەرم بووە، ئەگەر من برادەرێکم لەناو خەڵك دا بگرتایە، ئەبوبەکرم دەکردە برادەری خۆم، وەلێ دۆستایەتی ئیسلام گەورەترە.. ئەمجار فەرمووی: هەموو پەنجەرەکانم لەسەر پێوەبدەن جگە لەو پەنجەرەیەی سەرماڵی ئەبوبەکر.

## ئامۆژگاری بۆ یارمەتیدەران:

لەو رۆژو ساتانەدا کەئازار پێغەمبەری تەواو تەنگەتاو کردبوو، ئەبوبەکرو عەباس بەلای کۆڕو کۆبونەوەیەکی ئەنصارەکان دا تێپەڕین، بینیان ئەنصارەکان دەگریان ئەبوبەکر وتی: بۆ دەگرین؟ وتیان یادی کۆبونەوەی پێغەمبەرمان کردەوە کەلەگەڵ ئێمەدا کۆدەبووەوەو رێزی تایبەتی لێ دەگرتین، ئەبوبەکر ئەوەی بە پێغەمبەر گەیاند، ئیتر پێغەمبەر لەجێگا هاتە دەر بەپارچە قوماشێك سەری خۆی پێچابوو، چووە سەر دوانگە، لەوە بەولاوە جارێکی تر نەچووە سەر مینبەر، حەمدو ثەنای

خــوداى كــرد، پاشــان فــەرمووى: (ئامۆژگاريتــان دەكــەم دەربــارەى ئەنصارەكان، ئەوان كۆمەڵى منن نهێنى هەڵگرى منن پشتگيرو يارمەتيدەرو پــەنام بــوون، ئــەوەى لەئەســتۆيان بــوو ئــەنجاميان دا، ماوەتــەوە ئــەوەى پێويستە بۆيان بكرێ، ئەرێ ئەوان نەبوون لەمەدينە لەخۆيان گرتن، لەماڵو سامانيان دا كرديانن بەهاوبەش و بەشەبرا، لەبەرژەوەندييەكاندا ئێوە يان پێش خۆيـان خست، هەركەسـێ بـوو بـەكار بەدەسـتى موسـوڵمانان، چاكە لەچاكە كاريان وەربگرنو چاوپۆشى لەخراپە كارييان بكەن).[٢٣٩]

## ❧ دوا نيگاو چاوپێداخشاندنى پێغەمبەر بەموسوڵمانان دا لەكاتێك ئەوان ريزيان بەستبوو بۆ نوێژ:

لەســەر فــەرمانى پێغەمبــەر (درودى خـواى لەسـەربێ) ئەبوبــەكر پێــشنوێژى بــۆ موسـوڵمانان دەكـرد، هـەتا رۆژى دووشـممـە هـات موسـوڵمانان بـۆ نوێـژى بەيانى ريزيان بەستبوو، پێغەمبەر (درودى خواى لەسەربێ) پەردەى ژوورەكـەى خۆى لاداو تەماشـاى موسـڵمانانى كـرد بينــى هــەموويان ريــز ريــز لەبــەردەم پەروەردگاريان دا وەسـتاون، ديتـى كـە بانگـەوازى و تێكۆشـانى بـەروبومى باشـى هەيـە و بەزايـە نەچـووە، دڵخـۆش بـوو كـە گـەل و نەتەوەيـەكى رێـك خستووە پارێزگـارى نوێـژەكانيان دەكـەنو سـوورن لەسـەر بـەجێهێنانيان، پێغەمبەر ئامادە بێ يان لەناو يان دا نەبێ، بەم ديمەنە چاوى فێنك بووەوە، بـزەى هاتــێ بــەو ســەركەوتنەى كــە بـۆهيچ پێغەمبــەرو بـانگخوازێكى پـێش خۆى نەرەخساوە، دڵنيا بوو لـەوەى كە پەيوەنـدى ئەم نەتەوەيە بە ئاييني

---

[٢٣٩] صحيح البخاري (فضائل أصحاب النبي ص باب قول النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اقبلوا من محسنهم و تجاوزوا من مسيئهم).

خـوداوە پەیوەندییـەکی بـەردەوام و هەمیـشەیی یـە، یـەکتا پەرسـتی و عیبـادەتکردنی موسـوڵمانان بـۆ خـودا پایـەدار دەبـێ بـەمردنی پێغەمبـەر کۆتـایی نایـە. بـە تێڕوانین‌وبینینـی ئـەم دیمەنـە بـزەی هاتـێ‌و گەشـایەوە، هەرخودا دەزانێ چەندی پـێ کـەیف خـۆش بـوو هـاوەڵان دەگێڕنـەوە دەڵێن: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) پـەردەی ژوورەکـەی عائیـشەی لادا بەراوەسـتانەوە سـەیری ئێمـەی دەکـرد، دەم‌و چـاوی دەتگـوت پارچـە زیـوی صـافە دەدرەوشـایەوە ئـەمجار بزەیـەکی هاتـێ‌و پێکـەنی، ئێمـە لەخۆشـیان خـەریک بـوو نوێژەکـەمان بـبڕین، وامـان زانـی پێغەمبـەر دێ و بـۆ نوێـژ خـۆی ئامادەکردووە و دێ بۆ مزگـەوت، بـەڵام ئـەو ئیشارەتی بۆ کـردین کەنوێـژی خۆتـان تـەواو بکـەن، ئـیتر پەردەکـەی دادایـەوە، هەرئـەو ڕۆژە کۆچـی دوایـی کرد.

## ترسـاندنی موسـوڵمانان لـەگۆڕ پەرسـتی‌و مزگـەوت بنیاتنان لەسەر گۆڕ:

پێغەمبـەری خـودا لەسـەرە مـەرگ دا چـەند ئامۆژگـاری‌و ڕاسـپاردەیەکی ئاڕاستەی موسوڵمانان کردون‌و جەختی لەسەر کردونەوە بۆئەوەی هەمیشە موسوڵمانان پابەندی بن، لـەو وتانـەی لەسـەرە مـەرگ دا فـەرموونی ئەمانـە هەندێکیانن:

فەرمووی خودا جولەکەو نەصرانی بەکوشت بـەرێ، چونکە هـاتن گـۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت، ڕێگـە مـەدەن لـە جزیـرەدا دوو ئـایین هـەبن، هەردەبێ یەك ئایین پەیڕەو بکرێ.

عائیشە و ئیبنوعەباس دەڵێن کە پێغەمبەر دەردەکەی قورس بوو پارچە قوماشـێکی چوارگۆشـەی دەخـستە سـەردەم‌و چـاوی کـەتۆزێك نارەحـەت

دەبوو پارچە قوماشەکەی لادەداو دەیفەرموو: نەفرینی خودا لەجولەکەو نەصرانی بێ گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردون بەمزگەوت. واتە موسولمانانی دەترساند بۆئەوەی ئەوکارە نەکەن.

ئامۆژگاری کۆتایی پێغەمبەر لەکاتی گیانەلاو دا ئەوە بوو فەرمووی: (الصلاة وماملكت أيمانكم) ئاگاداری نوێژ بن و پاشگوێی مەخەن، ئاگاداری ئەو ئافرەتانە بن کەلەژێر دەستتان دان، ستەمیان لێ مەکەن. تەنانەت وای لێ هات ئەم رستەیەی لەسینگی دا غەرغەرە پێ دەکردو زمانی نەیدە هێنا.[٢٤٠]

ئیمامی عەلی ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەرەمەرگ دا ئامۆژگاری کردین بەوەی ئاگاداری نوێژبین و زەکات بدەین و چاودێری ئافرەتانی ژێر دەستمان بکەین.

خاتو عائیشە دەفەرموێ: چوومە نزیکی پێغەمبەرەوە چاوی هەڵگێڕایەوە بەرەو ئاسمان و فەرمووی: (في الرفيق الأعلى) ئارەزۆی گەیشتن بەپەروەردگارم دەکەم دوجار ئەم رستەیەی فەرموو، هەر عائیشە دەفەرموێ: عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە چیلکە دارێکی تەڕی بەدەستەوە بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەیری کرد، من وای لێ حاڵی بووم کەئیشی بەو چیلکەیە هەیە عائیشە دەڵێ دارەکەم لەدەستی وەرگرت و تۆزێك تەکاندم و دامە دەستی، ئەویش جوان جوان سیواکی پێ کرد، ئەمجار ویستی بیداتەوە دەستم لەدەستی کەوتە خوارەوە.[٢٥٠] هەرخاتوو عائیشە دەفەرموێ: لەپێش دەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) جامێك ئاو دانرابوو، دەستی دەخستە ناو جامە ئاوەکەوەو دەم و چاوی خۆی مەسح

---

[٢٤٠] رواه البيهقي وأحمد (ابن كثير السيرة النبوية جـ ٤/٤٧٣٠).

[٢٥٠] سيرة ابن كثير جـ ٤/٤٧٤-٤٧٥.

دەکردو پاشان دەیفەرموو (لا إله إلا الله) بێگومان مردن ئازارو لەهۆش خۆ چوونی هەیە، پاشان قامکی چەپی هەڵبڕیو دەیفەرموو: (في الرفيق الأعلى) ئارەزوی پەروەردگاری باڵاو شکۆمەند دەکەم. ئەم رستەیەی دووبارەکردەوە هەتا گیانی دەرچوو دەستی پیرۆزی لەجامە ئاوەکەدابوو، خاتوو عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەخۆشی یەکەی تینی بۆهێنا، لەوکاتەدا سەری لەسەر رانی من بوو، ساعەتێك لەسەر خۆ چوو پاشان وەهۆش خۆ هاتەوە چاوی بڕییە هەلآشی هۆدەکەو فەرمووی: (اللهم الرفيق الأعلى) ئەمە دوا وتەیەك بوو کە لەدەمی پێغەمبەرەوە بیسترا.

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەچ شێوەیەك دونیای بەجێ هێشت:

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دونیای بەجێ هێشت نیوەدورگەی عەرەبی بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی خۆی دابوو، پاشاکانی جیهانی ئەو رۆژگارە بەنزیكو دوریانەوە لێ ی دەترسان هاوەڵانیشی بەگیانو منداڵو ماڵو سامانەوە خۆیان بەقوربان دەکرد، کەوەفاتی کرد نەدیرهەم و نەدیناری بەجێ هێشت نەکۆیلەو جارییەی لەدوا خۆی جێ هێشت. جگە لە هێسترە سپی یەکەی وچەکەکەی و پارچە زەوییەك کەکردی بەخێر هیچی لەپاش بەجێ نەما.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەفاتی کرد زرێیەکەی بارمتەبوولای جولەکەیەك لەجیاتی سی ربە جۆ، تاوەفاتی کرد ئەوەندەی پارەنەبوو رەهنەکە وەربگرێتەوە.

لەنەخۆشی یەکەی دا چل کۆیلەی ئازاد کرد حەوت دینار یان شەش دیناری هەبوو فەرمانی بەخاتوو عائیشە کرد بیانبەخشێ!.

خاتوو عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر لەدونیا دەرچوو لەماڵی من دا شتێك نەبوو ئادەمیزاد بیخوا و پێی بگوترێ بژێو، جگە لە تۆزێك نانە جۆ لەرفەیەك دا دام نابوو وردە وردە لێم خوارد تا تەواو بوو.[٢٥١]

ساڵی یانزەی کۆچی دوانزەی مانگی رەبیعولئەوەل رۆژی دووشەممە دوای نیوەڕۆ لەتەمەنی شەصت و سێ ساڵی دا پێغەمبەری خودا گیانی دەرچوو دونیای بەجێ هێشت، ئەو رۆژە رۆژێکی رەش و سامناك بوو کارەساتێك بوو بەسەر موسوڵماناندا هات، بەڵایەکی گەورەبوو یەخەی موسوڵمانانی گرت. وەکوو چۆن رۆژی لەدایکبوونی بەختەوەرترین رۆژ بوو، رۆژی وەفاتیشی ناخۆشترین رۆژ بوو.

ئەنەس و ئەبو سەعیدی (الخدری) دەڵێن: ئەو رۆژەی پێغەمبەری خودای تێدا هاتە مەدینە هەموو شتێك پێدەکەنی و گەشابووەوە، ئەو رۆژەی پێغەمبەری تێدا لەدونیا دەرچوو هەموو شتێك تاریك بوو، هەموو شتێك خەم و خەفەت دایپۆشی، ئوممو ئەیمەن دەستی کرد بەگریان پێی گوترا ئەوە بۆ دەگری بۆ پێغەمبەر؟ خۆ پێغەمبەر ئادەمیزادەو هەر دەبێ بمرێ، وتی: بێگومان دەمزانی پێغەمبەری خودا دەمرێ وەلێ من بۆ برانی ئەو نیگایە دەگریم کەبۆمان دەهات، تازە کە پێغەمبەر نەمێنێ نیگای ئاسمانیش دانابەزێ.

## هاوەڵان چۆن بەرەو ڕوی هەواڵی لەدونیا دەرچونی پێغەمبەر بوونەوە:

بێگومان هەواڵی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وەکوو هەورە بروسکە دای لەگوێچکەی هاوەڵان و تاساندنی چونکە زۆریان خۆش

---

[٢٥١] رواه البخاري في كتاب الرقاق، باب الفقر، ومسلم في كتاب الزهد.

دەویستو ئولفەتیان بەژیان لەخزمەتی دا گرتبوو، ئەوان وەکو منداڵ لەباوەشی باوکی دڵسۆز دا بژیی وا بوون بەڵکوو زیاتریش. خودا دەربارەی خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ هاوەڵانی دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ. سورة التوبة (١٢٨)﴾ بێگومان هەریەکێ لەوهاوەڵانە پێی وابوو ئەو پێغەمبەری لەهاوەڵەکەی خۆشتر دەویست. تەنانەت هەندێك لەهاوەڵان بڕوای بەوەنەدەکرد پێغەمبەر مردبێ، یەکێ لەوانە عومەری خەتتاب بوو بەجیددی ئینکاری ئەوەی دەکرد پێغەمبەر مردبێ، چوو بۆ مزگەوتو وتاری بۆ خەڵکەکە دا وتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نامرێ هەتا خودا دوو رووەکان لەناونەبات.

## هەڵوێستی ئەبوبەکر بەرامبەر بەم رووداوە گەورە:

بێگومان حەزرەتی ئەبوبەکر: کەخودا بۆ ئەوەی ئامادەکرد بوو ببێتە جێنشینی پێغەمبەر و هەڵوێستێکی مەردانەو جوانمێرانەی نواند، خۆراگریو دامەزراوی و دانایی یەکی بێ وێنەی ئەنجام دا، بەراستی پیاوی پێویستی کاتی تەنگانە بوو، کێوی سەرکەشی دامەزراو بوو کە بەهیچ شتێك جوڵەناکاو لاناچێ. کە هەواڵەکەی بیست لەماڵی خۆیەوە هاتە بەردەرگای مزگەوتو لەوکاتەدا حەزرەتی عومەر وتاری بۆ خەڵکەکە دەداو دەیگوت: هەرکەسێ بڵێ پێغەمبەر مردوە بە شمشێر دوو لەتی دەکەم. حەزرەتی ئەبوبەکر ئاوڕی لەهیچ نەدایەوە تاچوو سەر تەرمی پێغەمبەر لەهۆدەکەی عائیشە: کە بەپارچە قوماشێك داپۆشرا بوو لەسەر روخساری هەڵدایەوە و ماچی کرد، وتی: دایكو باوکم بەقوربانت بن، ئەوا ئەو مردنەی کەخودا بۆی بڕیار دابووی چەشتت، ئیتر لەوەدوا جارێکی تر نامری..

ئەمجار بوردەکەی بەسەر دەم و چاوی هەڵکێشایەوە، هاتەدەرەوە، هێشتا حەزرەتی عومەر هەر قسەی دەکرد، وتی: ئەی عومەر! لەسەرە خۆبە وبێ دەنگ بە، عومەر لەقسەی خۆی نەکەوت و درێژەی بەقسەکانی دا. کەحەزرەتی ئەبوبەکر بینی عومەر بێ دەنگ نابێ، چووە پێشترو روی کردە جەماوەرەکەو دەستی بەقسەکردن کرد. کە خەڵکەکە گوێیان لەدەنگی ئەبوبەکر بوو رویان کردە ئەبوبەکر و وازیان لەگوێ گرتن بۆ قسەکانی عومەر هێنا. ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر حەمدو ثەنای خودای کردو پاشان وتی: ئەی خەڵکینە! بزانن ئەوەی موحەممەدی دەپەرست و لەبەخاتری ئەو موسوڵمانان بوو بوو ئەوە بێگومان محەممەد مرد، کەسێکیش پەرستشی بۆ خودا دەکرد ئەوە خودا زیندووەو نامرێ، ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ. سورة آل عمران (١٤٤)﴾ هەندێ لەو هاوەڵانەی ئامادەی ئەم هەڵوێست و روداوانە بووە دەڵێ وەڵڵاهی دەتگوت: ئەو خەڵکە بەم ئایەتە یان نەزانیوە هەتا ئەو رۆژە ئەبوبەکر خوێندییەوە، خەڵکەکە لەئەبوبەکریان بیست هەرئەوە بوو بەدەم خوێندبویانەوە و لەمانەکەی وردنەبوو بونەوە. عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ: وەڵڵاهی کەبیستم ئەبوبەکر ئەو ئایەتەی خوێندەوە سەرسام مام و کەوتمە سەرزەوی، قاچم نەدەکردن چەندێکم هەوڵ دا راوەستم ئەژنۆم نەکردن، ئیتر دڵنیابوم کە پێغەمبەر لەدونیا دەرچووە.

### بەیعەتکردن بە ئەبوبەکر بۆ جێ نشینی:

موسوڵمانان خێرا لە سەقیفەی بەنو ساعیدە کۆبونەوەو بەیعەتیان بەئەبوبەکر کردو هەڵیان بژارد بۆ جێنشینی، بۆ ئەوەی شەیتان رێگەی

نەبێ یەکیەتی موسوڵمانان تێك بداو پەرتەوازەیان بکا، هەروا بۆئەوەی دڵیان ئارام بگرێ و دڵنیا بن لەوەی کە موسوڵمانان گەورەو بەرپرسیان هەیە، هەروەها بۆئەوەی کاتێك پێغەمبەر دونیا جێ دێڵێ موسوڵمانان قسەیان یەك بێ و کۆمەڵیان رێكو پتەوبێ‌و ئەمیرێکیان هەبێ کارو باریان بەرێوەدەبا، یەکێ لەوکارە گرنگانەی دەبوایە موسوڵمانان زوو ئەنجامی بدەن کفن کردن و بەری کردن‌و دفن کردنی جەستەی پێغەمبەر بوو.

## موسوڵمانان چۆن پێغەمبەریان بەرێ کرد:

موسوڵمانان دوای وتارەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر ئارام بوونەوە، سەرسامی و حیرەتیان نەما، سەرگەرمی کارو باری کفن‌و دفن کردنی پێغەمبەر بوون، کەلە شتن‌و کفن کردنی بونەوە کەئەهل‌و بنەماڵەی خۆی ئەنجامیان دا ئەمجار تەرمەکەی لەماڵی خۆی دا دانرا، حەزرەتی ئەبوبەکر هاتە قسەو فەرمووی: مـن لـە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو هەر پێغەمبەرێك کۆچی دوایی کردبێ، لەو شوێنە دفن کراوە کە تێیدا گیانی دەرچووە، ئیتر جێگاکەی پێغەمبەریان هەڵگرت‌و لەو شوێنە دەستیان کرد بەگۆڕ هەڵکەندن، ئەبو طەڵحەی ئەلئەنصاری ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرت، ئەمجار هاوەڵان پۆل پۆل دەچوونە ژوورەوە و نوێژیان لەسەر جەنازەی پیرۆزی دەکر، سەرەتا پیاوەکان نوێژیان لەسەرکرد کەئەوان تەواو بوون ئەمجار ئافرەتان دەستە دەستە هاتنە سەر جەنازەکەی‌و نوێژیان لەسەر کرد. پاشان منداڵەکان، کەس نەبوو بە پێشنوێژ بۆ نوێژکردن لەسەر تەرمی پیرۆزی.[252] نوێژ لەسەر کردن‌و دفن کردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رۆژی

[252] سيرة ابن هشان جـ٢/٦٦٣.

سێ شەممە تەواو بووە[٢٥٣] بێگومان ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی خەماوی‌و ناخۆش بوو لە مەدینەدا، بیلال بانگی بەیانی فەرمووی: کە گەیشتە ڕستەی (أشهد أن محمداً رسول الله) گریاو دەنگی گریانی بەرزبووەوە، موسوڵمانان هەموو غەم دایگرتن‌و گریان چونکە لەوەپێش واراهاتبوون ئەم وشەیەیان گوێ لێ بێ‌و پێغەمبەریان لەناودابێ، دایکی موسوڵمانان ئوممو سەلەمە دەفەرموێ: ئای لەو کارەساتەی ئەو ڕۆژە بەسەرمان هات! لەوەدوا هەر بەڵایەکی ترمان تووش ببێ لەبەرامبەر ئەو موصیبەتەوە بەسووکی دەزانین. هەرکاتێ موصیبەتی وەفاتی پێغەمبەرمان بیر بکەوێتەوە ناخۆشی ترمان لەیاد دەچنەوە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆخۆشی لەم بارەوە فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! هەریەکێ لەئێوە (یان لە موسوڵمانان) ئەگەر توشی بەڵایەك بوو، با بەڵای لەدەست چونی من بێنێتە یادی خۆی، بەم موصیبەتە موصیبەتی خۆی لەیاد بچێتەوە. بێگومان هیچ کەس لە ئوممەتی من دوای من توشی موصیبەتێکی گەورە تر لە موصیبەتی لەدەستدانی من نابێ.[٢٥٤]

فاطیمە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەوکاتەدا پێغەمبەریان خستە گۆڕەوەو دفنیان کرد بەئەنەسی فەرموو: ئەوە چۆن دڵتان هات گڵ بخەنە بان جەستەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)؟ موسوڵمانان هەرچەندە زیاد لەئەندازە پێغەمبەریان خۆش دەویست وەلێ خۆیان گرت‌و شین‌و شەپۆڕیان نەکرد چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر بەتوندی نەهی لەگریان بەدەنگی بەرزو شین‌و شەپۆڕ کردبوو.

---

[٢٥٣] سیرة ابن کثیر جـ ٤/٥٠٧.

[٢٥٤] سیرة ابن کثیر جـ ٤/٥٣٨-٥٣٩.

## خێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دایکی موسوڵمانن:

یەکەم خێزانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) خەدیجەی کچی خووەیلیدی قورەیشی و ئەسەدییە، خودای لێ ڕازی بێ، پێغەمبەری خودا پێش پێغەمبەرێتی مارەی کردوە، ئەوکاتە خەدیجە لەتەمەنی چل ساڵی دا بووە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بووە، خەدیجە رۆڵێکی گرنگی هەبووە لەژیانی پێغەمبەردا. ئەوە بوو پشتگیری کرد لەسەر پێغەمبەرێتی و جیهادی لەگەڵ دا کرد دڵنەوایی کردو خۆی و ماڵو سامانەکەی خستە خزمەت بانگەوازی و بڵاوکردنەوەی ئیسلام، لەهەموو ناخۆشی و تەنگانەیەك دا پاڵپشتی پێغەمبەربوو تاڵی و سوێری لەگەڵ دا چەشت.

سێ ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە ماڵئاوایی لەجیهان کردوە، منداڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جگە لەئیبراهیم هەموویان لە خەدیجە بوون، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەمیشە لەیادی بوو، باسی فەضل و گەورەیی ئەو ئافرەتە دڵسۆزە ڕێزدارەی دەکرد، زۆر جار کەمەڕێکی سەردەبڕی بەشێکی گۆشتەکەی دەنارد بۆ دەستەخوشکەکانی خەدیجە. (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تا خەدیجەی خێزان بوو هیچ ژنی تری نەهێناون، دوای لەدونیا دەرچوونی خاتو خەدیجە بەچەند رۆژێك پێغەمبەر سەودەی کچی زەمعەی قورەیشی مارەکردووە، دوا ئەو خاتو عائیشەی مارەکردووە، پێغەمبەر زۆری خۆش ویستووە، لەهەموو ژنانی موسوڵمان شەرعزانتر بووە زانایەکی ئایینی کەم وێنە بووە، زۆر جار گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر پرسیاری ئایینی و داوای فتوایان لێ کردووە. پاشان حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی مارە کردووە، ئەمجار زەینەبی کچی خوزەیمی هێناوە دوای دوو مانگ هاوسەری زەینەب کۆچی دوایی کردوە

ئـەمجار ئوممـو سـەلەمە (هینـدی کـچی ئـەبو ئومەییـە حوزەیفـەی کـوڕی المغـیرة)ی قورەیـشی مـەخزومی مـارەبڕیوە ئـەم دایکـە بـەڕێزە دوا هـەموو خێزانەکانی پێغەمبەر کۆچی دوایی کردوە، پاشـان زەینـەبی کـچی جەحش (کە دەبێتە کچی پورە ئومەیمـەی) مـارە بڕیـوە، هـەروەها جوەیرییـەی کـچی (الحارث)ی کوڕی ئەبو ضیراری (المصطلقیة)ی مارەکردووە، پاشـان ئوممو حەبیبـەی (ڕەملـەی کـچی ئەبوسـەفیانی صـەخری کـوڕی حـەرب)ی هێنـاوە ئەمجار صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەخطەب پیاو ماقوڵی بـەنی نـەضیرو نەوەی هارونی کوڕی عیمران (برای حەزرەتی موسا)ی مـارەکردووە. پاشـان مەیمونـەی کـچی (الحـارث) هـیلالی مـارەکردووە ئـەم دایکـە دوا مـارەکراوی پێغەمبەرە لەدوا مارەکردنی ئەم ئیتر ژنی تری نەهێناوە.

خیلافو ڕاجیایی نیە لەوەدا کە پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆچـی دوایـی کرد نۆ خێزانـی هـەبوە، جگـە لـە خەدیجە و زەینـەبی خوزەیمیـە کەلـەژیانی خۆی دا وەفاتیان کردوە، خێزانەکانی پێغەمبەر جگە لە عائیشە ئـەوانی تـر هـەموویان بێـوە ژن بـوون[٢٥٥] هـەروەها کاتـێ وەفـاتی کـرد دووجارییـەی هـەبون، یـەکیان مارییـەی کـچی شـەمعونی قیبطـی بـوو پاشـای میـصر (المقوقس) بەدیاری بۆی ناردبوو، لـەم ئافرەتـە کوڕێکی بوو نـاوی ئیـبراهیم بوو. یەکێکی تریان ڕێحانەی کچی زەید لەخێڵی بەنو نەضیر بوو موسـوڵمان بوو پێغەمبەر ئازادی کردو پاشان مارەی کرد. پـەروەردگار یاسـاغی کـردوە لەسـەر موسـوڵمانان کەخێزانـەکانی پێغەمبـەر مارەبکەنـەوە، چـونکە خێزانـەکانی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) دایکـی موسـوڵمانن، ئەمـەش پارێزگاریکردنی ئەو پەیوەندییە حەساس و ناسکە یە کە ئوممەتی ئیسلام پەیوەست دەکا بەپێغەمبەرەکەیەوە، قورئان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا

---

[٢٥٥] زاد المعاد جـ-/٢٦-٢٩.

تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا. سورة الأحزاب (٥٣)﴾

ئیبنو کەثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: زانایانی ئیسلام هەموویان کۆکن لەسەر ئەوە: کە ئەو ئافرەتانەی خێزانی پێغەمبەر بوون حەرامە لەسەر موسوڵمانان دوا لەدونیا دەرچوونی مارەیان بکەنەوە، چونکە ئەو ئافرەتانە لەدونیاو قیامەتدا خێزانی پێغەمبەرن و دایکی موسوڵمانانن.

## هەڵوێستەیەکی کورت دەربارەی فرەژنی پێغەمبەر:

پێغەمبەری خودا بەشێك لەتەمەنی بەزگوردی بەسەر برد، ماوەی بیست و پێنج ساڵ لەتەمەنی رۆیی ژنی نەهێنابوو هەڵبەتە ئەو ماوەیە قۆناغی و گەنجی و پێگەیشتن و کامڵبوونە. لەماوەی ئەم بیست و پێنج ساڵەدا هەموو مەرج و رەوشتەکانی گەنجایەتی و لەشساغی و مەردایەتی تێدا بەرجەستە بوو، بەشێکی زۆری ئەم قۆناغەی ژیانی لە (بادیە) بەسەر بردبوو، دوور لەکەش و هەوای شارستانی، لەوماوەیەدا بەتەواوی رەوشتی سوار چاکی و پیاوەتی و جوانمێری تێدا بەرجەستە بوون، ئەو رەوشتانەی کە عەرەب شانازییان پێوە دەکردن و زانایانی دەروونزانی و ئەخلاق بەبەرز دەیاننرخێنن، دەی کەس نەیتوانیوە تەنانەت دوژمنترین کەس لەم قۆناغە ناسك و حەساسەدا نەیتوانیوە پێش پێغەمبەرایەتی و دوا پێغەمبەرایەتیش ئەمرۆشی لەگەڵ دابنێ لەککەیەکی تێدا بدۆزنەوە، لەهەموو ژیانی دا نموونەی هەرەبەرزی دەروونپاکی و داوێن پاکی و دەستپاکی و پاك و

خـاوێنی بـووە لەهـەموو رویەکـەوە هەرشـتێك شـیاوی پلـەو پایـەی پێغەمبەرێتی نەبوو بۆ ئەو بەتەواوی لێی دوور بووە.

کاتێك تەمەنی گەیشتە بیست و پێنج ساڵ خاتوو خەدیجەی کچی خووەیلدی مارەکرد، بێوەژنێکی تەمەن چل ساڵ بوو، پانزە ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتربوو، پێش پێغەمبەریش دووجار شوی کردبوو منداڵی لەومێردانەی پێشووی هەبوون. دوای لەدونیا دەرچوونی خەدیجە سەودەی کچی زەمعەی مارەکرد، ئەم ئافرەتە مێردەکەی لەو موسوڵمانە کۆچکەرانەبوو کە چووبوون بۆ وڵاتی حەبەشە لەوێ مردبوو! پێغەمبەر بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەو لابردنی ئەو کۆستە ناخۆشە لەسەر سەودە مارەی کردەوە، جگە لە عائیشە خێزانەکانی تری هەموویان بێوەژن بوون، هیچ ئافرەتێکی لەو ئافرەتانە مارەنەکردووە ئیللا بەرژەوەندییەکی بەرچاوی تێدا بووە بۆ بانگەوازی ئیسلام یان لایەنێکی ئەخلاقی و پیاوەتی تێدا بووە، یان هێنانی سودو دورخستنەوەی خەتەرێکی کۆمەڵایەتی گەورەی تێدا بەرچاو گیراوە، بێگومان خزمایەتی و زاواو خەزورایەتی کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لەژیانی خێڵایەتی عەرەب دا. لەروی کۆمەڵایەتی دا نرخ و بەهایەکی هەبوو، ئەم زاواو خەزورایەتیە کاریگەریەکی دورو درێژ خایەنی هەبوو لەمێژووی بانگەوازی ئیسلامی داو لەناو کۆمەڵگای ئیسلامی نمونەیی دا، زۆرجار بەهۆی ژن و ژنخوازی یەوە، بەبۆنەی زاواو خەزورایەتییەوە دژایەتی نێوان هۆزەکان قەڵاچۆ کراوەو لەکوشت و کوشتارو خوێن رشتن رزگاریان بووە.

لەسەرێکی ترەوە ژیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ هاوسەرەکانی ژیانی رابواردن و کەیف و صەفانە بووە، ئەو مەبەستانەی ئێستا زۆرێك لەخەڵکی لەفرە ژنی بەرچاوی دەگرن وەکوو خزمەتکردن و رازاندنەوەی

سفرەو خوانو دروستکردنی خواردنی جۆراو جۆرو بەتامو لەززەت...هتد. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هیچ کام لەم مەبەستانەی بەرچاو نەگرتووە، بەڵکوو ژیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ هاوسەرەکانی دا ژیانێکی زبرو هەژاریو کوێرە وەریو کوللە مەرگی بووە، ژیانێکی خۆنەویستیو پڕ لەقەناعەت و زاهیدی بووە، زۆرجار نانی وشکی نەبووە بیخۆن ئەو ژیانە زەبرەی پێغەمبەر و خێزانەکانی تەحەمولیان کردوە هیچ کەسێکی تر لەگەورە عابیدان زاهیدانی دونیا نەویست لە کۆنو ئێستادا خۆی بۆ رانەگرن و بۆیان ناکرێ پەیڕەوی بکەن (لەوە بەولاوە لەباشی ڕەوشتو ئاکاری پێغەمبەر دا هێندی لەم بارەوە دەدوێین).

بەسە بۆ خوێنەری بەویژدان ئەم ئایەتە بخوێنێتەوەو لێیەوە بڕوانێتە چۆنیەتی ژیانی پێغەمبەر لەگەڵ هاوسەرە کانی دا، ئایەتەکە دفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا. وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا. سورة الأحزاب (٢٨-٢٩)﴾ ئەوە بوو لەئاکامی ئەم پەروەردە یەزدانییەی کە لەماڵی پێغەمبەر دا پەیڕەو دەکراو سەرەنجامی ئەو جۆری تێڕوانینەی پێغەمبەرو خێزانەکانی بۆ ژیانی دونیاو ژیانی قیامەت، کە ئایەتەکە نازڵ بوو پێغەمبەر بۆ خێزانەکانی خوێندەوە تێکڕا هەموویان بەبێ سێو دوو، خوداو پێغەمبەرو ژیانی قیامەتیان هەڵبژاردو بەوژیانە زەبرە رازی بوون، هەر بۆ نمونە و میثال ریواتکراوە دەڵێن: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئایەتەکەی خوێندەوە عائیشە خێرا هەڵوێستی خۆی دەربڕی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نانا پەلە مەکە پرسی دایكو باوکت بکە ئەمجار بڕیار بدە، عائیشە وتی: ئایا ئەلەمەدا پرس بەباوك و دایکم بکەم؟ ئەمە کارێك نییە پێویست بەپرسو رای باوكو دایك بکا، من

خوداو پێغەمبەر و ژیانی قیامەت هەڵدەبژێرم، عائیشە دەڵێ ئیتر هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر هەڵوێستی وەکوو منیان نواند. (رواه البخاري).

فره ژنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نە لەڕووی دەرونی و نە لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە، نەلەڕوی ئابووریەوە، نەبۆتە کۆسپ لەبەردەم بانگەوازیو جیهادو تێکۆشان دا، رێگر نەبوون بۆ ئەنجامدانی کاری گەورەو دابینکردنی ژیانێکی نمونەیی، بەڵکوو خێزانەکانی لەهێزو توانای پێغەمبەریان زیاد کردو هەڵی باشتریان بۆ رەخساند بۆ جیهادو تێکۆشان، بوون بە پاڵپشتو یارمەتیدەری بۆ گەیاندنی پەیامی پیرۆزی و ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی. بۆ فێرکردنی ئایین بە موسوڵمانان بەنێرو مێیانەوە، خێزانەکانی لەغەزاو سەفەرەکانی دا هاوبەشییان کردووە، دەرمانی برینداری نەخۆشیان کردوە، سێیەکی ئایین بەهۆی خێزانەکانیەوە فێر موسوڵمانان کراوەو زۆربەی ئەو مەسائیلانەی پەیوەندی هەیە بەژیانی ژنو مێردایەتی و ژیانی ناوخێزانو زۆر لەحوکمی شەرعی تر لەرێگەی خێزانەکانیەوە بەموسوڵمانان گەیشتووەو فێری بوونو لەبەریان کردوەو بڵاویان کردۆتەوە. نەخوازەڵڵا دایکی موسوڵمانان عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) کە شەمسودینی ذەهەبی لە کتێبەکەیدا (تذكرة الحفاظ)دا دەربارەی دەفەرموێ: خاتو عائیشە گەورەترین فوقەهای صەحابەی پێغەمبەر بوو، زۆر جار لەمەسائیلی حەساسو تەمو مژاوی دا هاوەڵان دەچوونە لایو پرسیان پێ دەکردو رایان وەردەگرت، قوبەیصەی کچی ذوئەیب دەگێڕێتەوە دەڵێ: عائیشە شەرعزانترو تێگەیشتووترین خەڵکی رۆژگاری خۆی بوو، گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر پرسیاریان لێ دەکردو فتوایان لێ وەردەگرت، ئەبو موسا دەڵێ: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەر حەدیسێکمان لێ ئیشکال بووبێ چووبینە لای عائیشە ئیللا دەربارەی ئەو

حەدیسە زانیاری باشمان دەست دەکەوت. حەسان دەڵێ: کەسم نەدیوە هێندەی عائیشە لەقورئان شارەزابێ، ئاگاداری فەرزەکان و حەڵاڵ و حەرام و شیعرو سەرگوزشتەی عەرەب و ریشەو نژاد بێ.

لەبارەی رەوشت بەرزییەوە، لەروی ورەی بەرزو سەخاوەتەوە لەروی مرۆڤدۆستی و فەقیرنەوازییەوە ئەوە قسە لەدەریا دەکەی و بەکۆتاناییەو هەرچی بیڵێی هێشتا کەمە، بەسە بۆ شایەتی ئەم راستی یە ئەو ریوایەتەی هیشام لەباوکییەوە دەیگێڕێتەوە دەڵێ: معاوییە سەد هەزار دیناری نارد بۆ عائیشە، مانگێکی پێ نەچوو هەمووی دابەش کرد کارەکەرێکی وتی: خۆزگە بەچەند دیرهەمێکی ئەو پارەیە هەندێ گۆشتمان بکڕیایە، عائیشە لەوکاتەدا بەرۆژو بوو وتی: باشە بۆ زوو بیرت نەخستمەوە؟ بێگومان کێشەی فرە ژنی لەژیانی پێغەمبەر دا (درودی خوای لەسەربێ) بووەتە جێگای قسەو باسی زۆرێك لە لێکۆڵەرەوە خۆرئاواییەکان و خۆر هەڵاتناسەکان، زۆریان لەسەر نووسیوەو بە ربەی خۆیان پێوانەیان کردووەو لەچاوی خۆیانەوە سەیری ژیانی ژن و مێردایەتی پێغەمبەریان کردوە، ئەو خۆرهەڵاتناسانە هاتوون ژیانی خێزانی وڵاتی عەرەب و ژێر سایەی شەریعەتی ئیسلام و لەو رۆژگارەدا کە ئیسلامی تێدا پەیدابووە بەپێوەری خۆیان و بەقییەم و بیرو بۆچوونی خۆیان و بەداب و نەریتی خۆرئاواییانەی ئەمڕۆ پێوانەو کێشانەی دەکەن، بەو بیرو بۆچونە خۆرئاواییە گیروگرفتەکان دەخولقێنن و دەیانخەنە ناو گێژاوی داب و نەریتی خۆیانەوەو لەدیدی خۆیانەوە دەڕواننە روداوەکان. ئەمەش لەراستی دا قییاسی کەشکێ لەمەشکێ یە. چونکە ئەو پێوەرانە زادەی ژیارێکی تایبەتی و کۆمەڵگایەکی تایبەتن و خودا نازڵی نەکردون، دەی، بەو پێوەرو کێشانە خۆرئاوایی یەی خۆیان داب و نەریت و هەڵس و کەوتێك پێوانە دەکەن و رەتی دەکەنەوەو دژی دەدوێن کە فیطرەی

ساغ و کۆمەڵگای عەرەبی ئەوکاتە بەلایانەوە پەسەند بووە بەرژەوەندی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی داخوازی بووە، پەروەردگاریش ئیزنی پێ داوە. بێگومان ئەمە خاڵێکی لاوازە لەبیر کردنەوەی خۆرئاواییەکانداو لەنوسینەکانیاندا. دێن خۆرئاوا دەکەن بەتەرازوو ئەمجار حوکمی ستەمکارانە دەدەن بەرامبەر هەرشتێك بەو پێ و دانگەی ئەوان نەیەتەوە، لەخۆیانەوە گیروگرفت دروست دەکەن و پاشان دێن بە عەقڵی خۆیان حەلی دەکەن. ئەمەش لەئاکامی لوتبەرزی و بەپیرۆز دانانی قییەم و بەهای خۆرئاوایی دا بەرجەستە دەبێ. بێگومان دانەری کتێبی (السيرة) مستەر R.V.C. Bobdley بەویژدانەوە رەخەی لەوبیرو بۆچونە خۆرئاواییە گرتووە کە دەربارەی فرە ژنی لە ژیانی پێغەمبەر دا دەدوێ و دەڵێ: هیچ پێویست ناکا ژیانی خێزانی موحەممەد بەپێوەرەکانی خۆرئاوایی بکێشین و پێوانەی بکەین، هەروا نابێ لەودیدگاو یاساو داب و نەریتەی مەسیحیەکان دایانهێناوەو پابەندن پێوەی ئێمە بڕیار لەسەر ژیانی خێزانی موحەممەد بدەین.. ئەو پیاوانە واتە: عەرەبەکان – نەخۆر ئاوایین نەمەسیحین ئەو عەرەبانە لەولاتێك دا پێگەیشتوون و لەرۆژگارێکدا بوون کەیاسای رەوشتی تایبەتی خۆیان هەبووە، بەگوێرەی داب و نەریت و شەریعەتێکی تایبەت هەڵس و کەوتیان کردووە...

وێڕای ئەوانە هەموو، هیچ پاساوێك نییە بۆئەوەی یاسای رەوشتی ئەمریکی یان ئەورووپی تەفضیل بدەین بەسەر یاسای رەوشتی عەرەبی دا، لەراستیدا خۆرئاواییەکان تائێستاش پێویستیان بەلێکۆڵینەوەی وردو ژیرانە هەیە بۆئەوەی یاساو نیزامی رەوشتی خۆرئاوایی یانەی خۆیان و شێوە ژیانی تایبەتی خۆیان تەفضیل بدەن بەسەر هی تردا. پێویستە لەسەر یان خۆڵەتانەو تەشەر گرتن لەئایینەکانی ترو ژیارو شارستانی یە

کانی تر دوربخەنەوە.[٢٥٦] ئەو عەیبو عارو رەخنەیەی خۆرئاوایی یەکان هێناویانەتە نێو خەیاڵی خۆیانەوەو بەچاولێکەری و لاسایی کردنە جەماوەرەکەیان پابەندی بوونو بەراستیەکی زانستی حاشا هەڵنەگری دەزانن‌و نوسەرو زاناو یاسادانەرەکانیان هێندەی تر گەورەیان کردوە، عەیب و عارێکی هەمیشەیی نیە، بۆئەوە نابێ بەو شێوە گشتگیرییە و بەدرێژایی رۆژگار و چەرخەکان رەخنەی لێ بگیرێ..

ئەو بەعەیب زانینەی خۆرئاوا دەربارەی فرەژنی لەسەر بنەمای زانستی سەرچاوەی نەگرتووە، فیترەتی ساغی ئادەمیزاد پاڵپشتی ناکا، بیرو بۆچونێکی تەسکی کوێرانەیەو لاسایی کردنەوە یەکی بێ سەروبەرە. ئەو بەعەیب زانینەی فرەژنی لەخەیاڵو سۆزێکی پەیدابووی پڕوپاگەندەی زێدە رۆیانە سەری هەڵداوەو بەگوێرەی رۆژگار و گۆڕانی بیرو بۆچوون‌و گۆڕانکاری لەبواری ئابوری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەییدا ئەویش بەهێزو بێ هێز دەبێ.

## منداڵو نەوەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەخاتو خەدیجەی خێزانی کوڕێکی بوو ناوی نا (القاسم) و بەناوی کوڕەشیەوە کونیەی بۆ دیاری کراو پێی دەگوترا: (أبو القاسم) چوار کچیشی لێ بوون (زەینەب، رقية، ام كلثوم، فاطمة)..

زانایانی سیرەی پێغەمبەر کەوتونە راجیایی یەوە دەربارەی (عبدالله، الطيب، الطاهر) هەندێ دەڵێن ئەم سێ ناوە ناوی سێ کوڕی پێغەمبەر بوون، قسەی راستو بڕوا پێ کراو لەلای ئیبنو قەییم ئەوەیە (الطيب،

[٢٥٦] R.V.C. Bodley the messenger the life of Mohammad (London, 1946) Pp.202-203.

الطاهر) ناز ناو بوون بۆ عبدالله واتە: هەرسێ ناوەکە بۆ یەك کوڕ بووە کە (عبدالله) یە هەموو ئەم مندالآنەی لەخاتو خەدیجە بوون ڕەزای خودای لێ بێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەناو کچەکانی دا فاطیمەی لەهەموویان زیاتر خۆش ویستووە، ئەوەشی ڕاگەیاندووە کە ئەو شاژنی ژنانی بەهەشتە. ئەوەشی فەرمووە: فاطیمە پارچەیەکە لەمن هەر شتێك ئەو دڵناخۆش بکا منیش دڵناخۆش دەکا. هەرچی زیانی بۆ ئەو هەبێ زیانبەخشە بۆ من. ئەو یەکەم کەسی خێزانەکەمە لەقیامەت دا بەمن دەگاتەوە.

لەمارییەی (قیبطی) یش ئیبراهیمی بووە، کە خڕەکە بووە مردوە، ئەو کاتەی ئیبراهیم مردوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆری پەرۆش بووە، فرمێسکی باراندون و فەرموویەتی: چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵ خەمبارو شەکەتە، شتێك نالێین خودا پێی ناخۆش بێ. بەراستی من ئەی ئیبراهیم خەفەتبارم بۆ مەرگی تۆ.. هەر ئەو ڕۆژە خۆر گیرا، خەڵکەکە وتیان بۆیە خۆر گیرا چونکە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر مردوە، کە پێغەمبەر بەمەی زانی وتارێکی داو فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ دونیشانەن لەنیشانەکانی خودا نەبو مردنی کەس دەگیرین نەبۆ ژیانی کەس دەگیرین.[٢٥٧] زەینەبی کچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەشوی کردبوو بەئەبو

---

[٢٥٧] موسلیم لەصەحیحەکەی دا لە کیتابی خۆر گیران دا ریوایەتی کردوە. خودا لێخۆشبوو مەحمود پاشای فەلەکی لە کتێبەکەی دا (التقويم العربي قبل السلام وتأريخ ميلاد الرسول وهجرتة (ص)١٨-١٩ دەڵێ:
لێکۆڵینەوەو حیسابێکی وردم کرد بۆم دەرکەوت خۆر گیراوە بەگیرانێکی تەواو لەمەدینە سەعات هەشت و سێ دەقیقە دوا نیوەڕۆ بەحیسابی غروب کەرێکەوتی ڕۆژی بیست و حەوتی مانگی کانونی دووەمی ساڵی ٦٣٢ زایینی دەق بەرامبەر ڕۆژی ٢٩ ی مانگی شەواڵی ساڵی دەیەمی کۆچی بووە.

لعاصی کوڕی ڕەبیع کەکوڕی خوشکی خەدیجە بوو کوڕێکی بوو ناوی عەلی بوو کچێکیشی بوو ناوی (امامە) بوو. روقیەی کچی پێغەمبەر شوی بەعوسمانی کوڕی عەففان کرد منداڵێکی بوو ناوی عبدالله بوو، لەکاتێك دا پێغەمبەر لەبەدر بوو روقییە مرد، عوسمان بۆی نەکرا بچێ بۆ غەزاکە بەلای روقیەی خێزانیەوە مایەوە چونکە نەخۆشی یەکەی نەخۆشی مردن بوو دوایی عوسمان خوشکی روقیەی مارە کرد واتە ئوممو کولثومی کچی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆیە بەعوسمان دەڵێن: (ذو النورین) چونکە دوکچی پێغەمبەری مارە کردوە عەلی کوڕی ئەبو طالیب فاطیمەی کچی پێغەمبەری مارە کرد دوو کوڕی لێ بوون یەکێکیان ناوی (حسن) بوو کونیەی بەناوی ئەوەوەیە واتە: پێ دەڵێن (أبو الحسن) کوڕەکەی تریشی ناوی حوسەینە، دەربارەی ئەم دوو کوڕەی فاطیمە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەو دوو کوڕە ریحانەی بۆ نخۆشی منن لەدونیادا، هەر دەربارەی ئەوان فەرموویەتی: حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجەکانی ئەهلی بەهەشتن[٢٥٨] پەروەردگار وەچەو نەوەی ئەم دوو کوڕەی زۆر کردون زۆر زاناو رابەرو پێشەواو فەرماندەیان تێدا پەیدا بووە خزمەتێکی زۆری ئاینییان کردوە.

فاطیمە لەعەلی دو کچیشی بوون یەکیان ناوی زەینەبە شوی کردوە بەکوڕی مامی کە عبدوڵلای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیبە. کچەکەی تری ناوی ئومموکولثومە (کچی عەلی) یە شوی کردوە بەعومەری کوڕی خەتتاب و منالێکی لێ ی بووە ناوی زەید بووە، حەزرەتی عومەر شەهید بووە ئەو بەبێوەژنی ماوەتەوە. شایانی باسە هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێش خۆی وەفاتیان کردوە جگە لەفاطیمە ئەو شەش مانگ دوای پێغەمبەر ژیاوە.

---

[٢٥٨] صحیح البخاری کتاب المناقب باب مناقب الحسن والحسین.

## جوداوازی نێوان پێغەمبەر و سەرکردەی سیاسی:

وەکوو گوتراوە ئەو رۆژەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مرد خۆر گیرا. ئەگەر یەکێکی تر بوایە لەجیاتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەم تازیە ناخۆشەدا، ئەگەر هەر رابەرێکی سیاسی و بانگخوازێکی تر بوایە لەرابەرو پێشەوایانی ئادەمیزاد لەقسەی ئەوانەی وتیان خۆر لەپەرۆشی مردنی ئیبراهیم گیراوە بێ دەنگ دەبوو رەدی نەدەدانەوە، پێی وادە بوو ئەو بیرو بۆ چونە لەبەرژەوەندی بانگەوازی یە کەیەتی و سودی پێ دەبەخشێ، بەتایبەتی کە خەڵکە لە خۆیانەوە ئەو بیرو بۆ چونەیان لا دروست بوو وتیان: خۆر لەتاوی مردنی ئیبراهیمی وای بەسەرهات.. بەرواڵەت و بەزاهیری پێغەمبەر دەیتوانی ئەو بیرو بۆ چوونە رەت نەکاتەوە.

ئالێرەدا جودا وازی نێوان پێغەمبەرو غەیری پێغەمبەر دەردەکەوێ، ئەوە بوو پێغەمبەر لەوکاتە تازیەباریەدا لەو بیرو بۆ چوونە هەڵەیە بیدەنگ نەبوو هەڵەی خەڵکەکەی راست کردەوە، بێگومان زۆر جار روداوە سروشتی یەکان لەلایەن بانگخوازو سیاسی یەکانەوە دەقوزرێتەوەو دەیانکەنە پاساو بۆ مەرامو بەرژەوەندی خۆیان، وەلێ پێغەمبەران (درودی خودایان لەسەربێ) قوزتنەوەی ئەو هەلانە لەسەر حیسابی ئایین بەحەرام دەزانن ودەیخەنە خانەی کوفرو شیرکەوە. ئەمن بڕوا ناکەم کەسێکی تر هەبووبێ یان لەمەدوا ببێ جگە لە پێغەمبەر لەتاقی کردنەوەی ئاوهادا بەو جۆرە را ستگۆیانە مامەڵە بکاو لەکاتی ئاواهادا هەڵەی شوێنکەوتوانی بەو جۆرە راست بکاتەوە.

## ئەخلاق‌و رەوشت‌و شێوەو روخساری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ):

هیندی کوڕی ئەبو هاڵە (کوڕی خەدیجە، خاڵی حەسەن‌و حوسەین) کە پیاوێکی وەصف کار بوو، لەبارەی رەوشت‌و شەمائیلی پێغەمبەرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خودا بەردەوام غەمبار بوو، واتە: غەم دوا غەم دادەباری بۆ سەری هەمیشە لەبیرو ئەندێشەدا بوو، ئیسراحەتی نەبوو، بیدەنگ بوو بەبێ پێویست قسەی نەدەکرد، کە دەکەوتە قسە هەموو دەم‌و زەمانی بەکار دێنا، لەژێر لێوەوە قسەی نەدەکرد، قسەکانی پڕ ماناو رەوان‌و پاراو بون، حەق‌و بەتاڵی لێك جیا دەکردەوە، لەقسەکانی دا زێدەو کەم‌و کورتی نەبوو، قسە رەق نەبوو زۆریش قسە نەرم نەبوو بەویقارەوە دەدوا نازو نیعمەت چەندێك بچوك بونایە ئەو بەگەورەی دەزانین. هەرگیزاو هەرگیزیش رەخنەی لەخواردن نەگرتووە، پێشیا هەڵ نەگوتووە، بۆ دونیاو کاڵای دونیا رقی هەڵنەساوە، هەرکاتێ حەق پێشێل کرابێ رقی هەڵساوە هەتا حەقی سەرنەخستبێتەوە، قەت تۆڵەی بۆ خودی خۆی نەکردۆتەوە، هەرکاتێ ئیشارەی کردبێ هەموو دەستی رادا شتووە، کەلە شتێك سەری سوڕمابێ دەستی هەڵگێڕو داگێڕ کردوە، زۆر جار کە قسەی کردوە لەپی دەستی راستی بەچاوە قامکی دەستی چەپیەوە لکاندوە، کەرقی هەڵساوە روی وەرگێڕاوە بەتەواوی، کە کەیفخۆش بووە چاوی داخستوە، زۆربەی پێکەنینی بریتی بووە لەزەردە خەنە، هەر ئەوەندە بووە ددانی جوان‌و وردی وەکوو دەنکە تەرزە دەرکەوتوون.

عەلی کوڕی ئەبوطالیب کەلە هەموو کەس باشتر پێغەمبەری ناسیوەو لەهەموو کەس زیاتر لەخزمەتی دا بووەو لێیەوە نزیك بووەو بەتواناترین کەس بووە بۆ وەصف‌و بەیانکردن، دەربارەی دەفەرمووێ: پێغەمبەری

خـودا قـسەو كـرداری رەق‌و ناشـرین نـەبوو، بـەهاوارو قیـژە قیـژ نـەبوو، خراپەی بەخراپە پاساو نەدەدایەوە، بەڵكوو لێبوردویی چاو پۆشی دەكرد. هەرگیز بەدەستی خۆی لەكەسی نەداوە، مەگەر لەكاتی جیهادو غەزادا، قەت لـەژن‌و بەنـدەو خزمەتـچی نـەداوە، رۆژێ لـەرۆژان نەمـدیوە تۆڵـە بكاتـەوە لەستەمێك كەلێی كراوە مەگەر ئەتكی سنورێكی خودای تێدا كرابێ، ئەو كاتە لەهەموو كەس زیاتر رقی هەڵساوە، هیچ كاتێكیش لەنێوان دوشت دا سـەر پـشك نـەكراوە ئـیللا بـارە ئاسـانەكەی هەڵبـژاردوە، هـەركاتێكیش چـوبێتەوەماڵـەوە ئـادەمیزادێكی ئاسـایی بـووە، ئەسـپێ ی لـەكراس‌و پۆشاكی خۆی دۆزیوە، مەڕی خۆی دۆشیوە خزمەتی خۆی كردوە. زمانی خۆی دەگرتـەوە لەقەسە كردن قسەی نـەدەكرد مەگەر پێویست بوایە قسە بكـا، هـەموو كاتـێ هـاوەڵانی بـۆ لای خـۆی كـێش دەكـردن‌و لـەخۆی نەدەتۆرانـدن، رێـزی پیـاو مـاقوڵی هـەموو هـۆزو نەتەوەیـەكی دەگـرت، وای دەكرد ریزیان لای گەل‌و نەتەوەكەیان زیاد بكا، خەڵكی وشیار دەكردەوە بۆ ئەوەی ئاگایـان لـەخۆبێ، خۆیـشی دەپاراسـت لێیـان بۆ ئەوەی زیانیـان پـێ نەگەیـەنێ، بـەبێ ئـەوەی روخۆشـی خـۆی لـە هـیچ كـەس مـەنع بكـا، لەگـەڵ هەموو كەس دا روخۆش‌و دەم بەزەردەخەنـە بوو، پرسیاری هـاوەڵانی دیـار نەبووی دەكرد، پرسیاری لەخـەڵكی دەكـرد ئـاخۆ چ باسـە لـەناو خـەڵكی دا، جوانی بەلاوە جوان بوو پشتگیری دەكرد، ناشیرینی دەدزاو لاوازی دەكرد، لەهـەموو كاروبـارێكی دا مـام ناوەنـدی پـەیڕەو دەكـردو جودا خـواز نـەبوو، لـەهیچ شـتێك غافـڵ نـەدەبوو نـەوەكوو هـاوەڵانی لێـی غافـڵ بـن‌و مـەلوولی بیـانگرێ، ئەو بۆ هـەموو حاڵێك كەرەسـەی تایبـەتی خۆی هـەبوو، پڕاو پڕ لەگـەڵ حـەق‌و راسـتی دا بـوو نەتەقـصیری هـەبوو نـەڵێ ی دەردەچـوو، ئـەو كەسانەی لەگـەڵیا بـوون باشـەكەیان ئەوانـە بـوون كـە بەخـەم خەڵكـەوە بـن‌و

ئامۆژگارییان بکەن‌و خەریکی ڕێکخستن‌و پێکەوە گونجانی ناو یەکتربن. لەهەر کۆڕو کۆبونەوە یەك دا دابنیشتایەو هەڵسایە یادی خودای فەرامۆش نەدەکرد. ئەگەر بچویایە بۆ لای کۆڕو کۆمەڵێك لەکوێوە جێگا بوایە لەوێ دادەنیشت، فەرمانیشی بەهاوەڵانی دەکرد ئەوانیش وابکەن. کە لەگەڵ خەڵك دا دابنیشتایە هەرکەسەو بەشی خۆی دەدایە، کەسی فەرامۆش نەدەکرد، وای نەدەکرد دانیشتوانی وا هەست بکەن ڕێزی یەکیان لەوی تر زیاتر دەگرێ، لەگەڵ هەرکەسێ دا بنیشتایە یان گفت‌و گۆی بکردایە لەگەڵیا بەردەوام دەبوو تا ئەو کۆتایی بەدانیشتنەکە نەهێنایە ئەو کۆتایی پێ نەدەهێنا، هەرکەسێ داوای شتێکی لێ‌بکردایە داواکەی بۆ دێنایە جێ یان بەقسەی شیرین وەڵامی دەدایەوە، ڕوخۆشی‌و ئەخلاق جوانی خۆی دەدا بەهەموو کەس. بۆ هاوەڵانی وەکوو باوکێکی دڵسۆز وابوو، هەموویان لەئاستی حەق دا لەلای یەکسان بون، کۆڕو مەجلیسی کۆڕی زانیاری‌و حەیاو صەبرو ئەمانەت بوو، دەنگی تێدا بەرز نەدەکرایەوە شتی حەرامی تێدا نەگوترا، هەڵەی تێدا دوبارە نەدەکرایەوە، هەموو هاوەڵانی لەلا وەك یەك وابوو کێیان زیاتر لەخودا ترس بوایە ئەوەیان ڕێز دار تربوو، لەمەجلیسی پێغەمبەردا ڕێزی گەورە دەگیراو سۆز بەرامبەر بچوك ڕەچاو دەکرا. بەرژەوەندی ئاتاج پێش دەخراو غەریب چاودێری دەکرا. ئەمجار عەلی دەڵێ: (پێغەمبەر بەردەوام ڕوگەش بوو، ڕەوشتی ئاسانکاری تێدا بوو، نەرم‌و نیان بوو، ڕوگرژو توڕەو نەوسن نەبوو، قیڕەو نەڕەو هات‌و هاواری نەبوو، عەیبی لەشت نەدەگرت، بەخیل‌و حەسود نەبوو، شتێکی بەهەوەس نەبوایە خۆی لێ بێ ئاگا دەکرد، ئەگەر پرسیار یان لێ‌بکردایە بۆ حەزت لێ نیە وەڵامی نەدەدایەوە بەوە عەیب‌و عارەکانی بەیان بکا، هەر ئەوەندە بوو دەیگوت ئارەزۆم لێ نیە. خۆی وەلا نابوو توخنیان نەدەکەوت، جەدەل و

دەمە دەمێی بێ مانا، لوتبەرزی، شتێك كە پەیوەندی بەوەوە نەبوو خۆی لێ دەپاراست، خۆی لەسێ شتی خەڵك دەپاراست زەممی كەسی نەدەكردو تەشەری لێ نەدەدان، هەوڵی نەدەدا ئاگادار بێ بەسەر عەورەتو عەیبو عاری كەس دا. هەر شتێك هومێدی پاداشی لێ رەچاو نەكردایە قسەی تێدا نەدەكرد. هەركاتێ فەرمایشتی بفەرموایە گوێگرەكانی گوێچكەیان بۆ كلۆر دەكردو دەتگوت باڵندە یان بەسەرەوەیە. ئەمجار كە ئەو تەشریفی بیدەنگ دەبوو خەڵكەكە قسەیان دەكرد. هەرگیز هاوەڵان لەخزمەتی دا قسەیان تێكەوە نەدەهاویشت، ئەگەر یەكێكیان ئاخاوتنی ئەنجام بدایە ئەوانی تر گوێیان دەگرت تالە ئاخاوتنەكەی دەبوەوە، قسە كردنی هاوەڵان لەلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لێ وەڕز بوونی نەبوو، چەندێك قسەیان بكردایە لەخزمەتی دا وایاندەزانی هێشتا سەرەتای قسە كردنیانە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ هاونشینەكانی دا هاوبەشی تەواوی دەكرد، پێكەنینی دەهات بەو شتەی ئەوان پێی پێ دەكەنین، سەرسامی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر هەرشتێك ئەوانی سەرسام دەكرد. پشوو درێژو بارقوڵ بوو بەرامبەر ئەو كەسانەی غەریب بونو دەهاتنە خزمەتیو بەرەقی داوای شتیان لێ دەكرد. بەهاوەڵانیشی دەفەرموو: ئەگەر ئاتاجێكتان بینی داوای شتێكی لێ كردن هاوكاری بكەنو پێویستیاتی بۆ دابین بكەن، هەرگیز قبوڵی نەدەكرد بەرەو ڕو زیاد لەئەندازە سوپاسی بكرێ، ئاخاوتنی بەكەس نەدەبڕێ مەگەر قسەكەرەكە سنووری ببەزاندایە. ئیتر ئەو كاتەیان بەنەهی یان بەهەڵسان لە مەجلیسەكە قسەكەی پێ دەبڕێ. سینگ فراوانترین كەس بوو، راستگۆترین ئادەمیزاد بوو نەرمترین تەبیعەتی هەبوو، شكۆمەندترین كەسەلەروی بنەماڵەو خانەوادەوە. كەسێك سەرەتابیدیایە سامی لێ دەكرد، كەسێكیش لێی نزیك بوایەو زیاتر بیناسیایە خۆشی دەویست، یەكێك

لەهاوەڵانی لەبواری مەدحکردنی دا دەڵێ نەلە پێش پێغەمبەرو نەلە دوا ئەویش وێنەی ئەوم نەدیوە. خودای مەزن پۆشاکی جوانی بە بەر پێغەمبەرەکەی دا کردبوو خۆشەویستی خستبوە دڵی شوێنکە و توانیو شکۆمەندییەکی بێ وێنەی پێ بەخشیبوو.

هیندی کورشی ئەبو هالە لەوەصفی پێغەمبەردا دەڵێ: (پێغەمبەر خۆی لە خۆی دا شکۆمەندو گەورە بوو، لەپێش چاوی خەڵکیش شکۆمەند بوو، دەمو چاوو روخساری وەکوو مانگ شەوی چواردە دەدرەوشایەوە..

(البراء) ی کوڕی عازیب رەزای خودای لێ بێ، دەڵێ: ( پێغەمبەر پیاوێکی چوار شانە بوو نەکورت نەدرێژ بوو، من رۆژێك بینیم پۆشاکێکی سور ئامێزی لەبەردا بوو قەت جوانی وام نەدیوە. ئەبو هورەیرە لەوەصفی دا دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چوار شانە بوو بەلای بالا بەرزی دا دەیڕوانی. موی ریشی زۆر رەش دەینواند دەمو ددانو پوکی جوان بوو، موی برۆکانی درێژ بوون، ناو شان پان بوو، تادەگاتە ئەوەی کە دەڵێ: وێنەی ئەوم نەدیوە نە لەپێش پێغەمبەر داو نەلە دوا ئەویش.

ئەنەس دەڵێ: دەستم لەهیچ ئاوریشمو دیباجێك نەداوە هێندەی بەری دەستی پێغەمبەر نەرمو نیان بووبێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وێڕای ئەوەی خودا رێزی لێ ناوە بەوەی پلەو پایەی پێغەمبەرێتی پێ بەخشیوە، کردویەتی بەخۆشەویستی خۆیو هەڵی بژاردوەو لەگوناهی پێشوویی و دواییینی خۆش بووە، ئەگەر تاوانی هەبوو بن. دەگوترێ: وێڕای ئەوە پێغەمبەر لەهەموو کەس زیاتر لەهەوڵو تێکۆشانو عیبادەتکردن دا بوو، لەهەموو کەس زیاتر سور بوو لەسەر خودا پەرستی.

(المغیرة) ی کوڕی شوعبە دەڵێ: پێغەمبەری خودا هێندە بە پێوە راوەستا لەنوێژدا قاچی ئاوسان، عەرزیان کرد ئەتۆ بۆ ئەوەندە خۆت

ئەزیەت دەدەی خۆ تۆ خودا لەتاوانی کۆن و نوێت خۆش بووە؟ لەوەلاًم دا فەرمووی: ئەرێ بۆ چی من بەندەیەکی سوپاس گوزار نەبم؟ عائیشە دەفەرموێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) شەو نوێژی شەوێکی بەئایەتێکی قورئان بەرێ کرد.

ئەبوذەر دەڵێ: پێغەمبەر شەوێکی شەونوێژی بە ئایەتێکی قورئان بەسەر برد ئایەتەکەش ئایەتی ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ سورة المائدة/١١٨.

عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەڕۆژو دەبوو هەتا ئەوەی دەما نگوت: ڕۆژو ناشکێنێ، واش دەبوو بەڕۆژو نەدەبوو تائەوەی دەمانگوت ڕۆژو ناگرێ...

ئەنەس دەڵێ: ئەگەر بتویستایە پێغەمبەر شەوێك لەشەوان ببینی شەو نوێژ نەکا، ئیللا دەتبینی خەریکی شەو نوێژە، ئەگەر بتویستایە پێغەمبەر شەوێك لەشەوان ببینی نەنوێ ئیللا دەتبینی نوستوە. عەبدوڵڵای کوڕی (الشخیر) دەڵێ: لە پێغەمبەر نزیك بوومەوە نوێژی دەکرد، لەسینگی دا گیزە گیزێك دەهات وەکوو گیزەی دیزە پڕ ئاوی کوڵاًتوی سەر ئاگر. لەبەر گریان. هەرگیز پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەنوێژ کردن ماندو نەبوە، بەهیچ شتێك تەسەللای لەنوێژ کردن نەدەهات، زۆر جار دەیفەرموو: (وجعل قرة عینی في الصلاة) فێنکایی چاوم لە نوێژدا دەستە بەر دەبێ.

هاوەڵاًنی ریوایەت دەکەن دەفەرموون: پێغەمبەری خودا کارێکی گرنگی بهاتایە پێش هانای بۆ نوێژ کردن دەبرد. ئەبو دەرداء دەڵێ: پێغەمبەری خودا کەشەوێکی رەشەبا بوایە خۆی دەخزاندە ناو مزگەوتەوە هەتا رەشەباکەی دەخست ئەگەر رووداوێکی سروشتی روی بدایە وەکوو خۆر

گیران‌و مانگ گیران هانای بۆ نوێژ کردن دەبرد هەتا رۆژەکە یان مانگەکە ڕەها دەبوو.

زۆری حەز لە نوێژ کردن بوو چاوەڕوانی هاتنی کاتەکانی نوێژی دەکرد وەقرەی نەدەگرت‌و هەدا دانی نەبوو تادەچوە ناو نوێژەکەوە جاری وا دەبوو بەبیلالی دەفەرموو: ئەی بیلال بانگ‌و قامەت ئەنجام بدە بابە نوێژ کەمێك خۆشی و ئارامی رومان تێکا.

## تێڕوانینی پێغەمبەر بۆ ژیان‌و گرنگی پێ نەدانی:

بێ بایەخی دینارو دیرهەم‌و ماڵ‌و سامان لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەوە چەندێکی لەسەر بنووسرێ‌و بگوترێ هێشتا کەم‌و مافی خۆی نادرێتێ، چونکە قوتابیانی خوێندنگا ئیمانیەکەی‌و قوتابی قوتابیەکانی لەعەرەب‌و نا عەرەب لەخۆر هەڵات‌و خۆر ئاوای زەوی دا، هەموو ئەوانەی بەراستی شوێن پەیامی ئەو کەوتوون، وەکوو لەتەسواڵەت‌و بەردە وردەو گڵ‌و خۆڵ سەیری دینارو دیر هەمیان کردوە، بەجۆرێك دونیا نەویستی‌و بێ بایەخی ماڵ‌و سامانیان لێوە ریوایەت دەکرێ سەر سوڕ دەمێنێ، هەڵوێستی وایان نواندوە بۆ ماڵ بەخشین‌و بەهانا چوونی بێ نەوایان‌و پێش خستنی بەرژەوەندی غەیر بەسەر خۆیان داو قەناعەت بەژیانی کولە مەرگی‌و کەمتریش لەو ئاستە، پیاو لەئاستیان دا جۆش دادەمێنێ، دەی جاکە ئەمە حاڵی قوتابی‌و قوتابی قوتابیانی مەدرەسەکەی پێغەمبەر بێ دەبێ پێغەمبەر کە خۆی رابەرو پێشەوایانەو لەهەموو خێرو سەروەری یەك دا مامۆستاو پێشەنگ‌و قدوەیان بووە چی بگوترێ و چی بنووسرێ. وەلێ هەر بۆ زاخاوی مێشك و رانواندنی چەند نمونەیەك لەدونیا نەویستی پێغەمبەرو دەرخستنی مشتێك لەخروارێك گوێ رادەگرین بۆ ریوایەتی

هەندێ لە هاوەڵانی و تۆمار کردنی بڕێ لەفەرموودەکانی لەم بوارەدا کەبەراستی ئاوێنەی باڵانمان بۆ چونیەتی ژیانی و هیچ روداوو هەواڵێکی تر ئاوا بەرەوانی و بەلاغەت واقیعەکەمان بورون ناکەنەوە. دەی بابزانین هاوەڵان لەم بارەوە دەڵێن چی؟!

فەرمودەیەکی مەشهورو مەئثووری هەیە کەلە ژیانی دا کاری پێ کردوەو ژیانی بەو شێوە بەسەر بردوە، ئەوە بوو دەیفەرموو: (اللهم لاعيش الا عيش الأخرة) خودایە! ژیانی راستی و شیاو بۆ بایەخ پێدان ژیانی قیامەتە، دەشی فەرموو: (مالي وللدنيا وما أنا والدنيا) الا كراكب استظل تحت شجرة، ثم راح وتركها) ئەوەی بۆمن هەیە لەدونیا، یان پەیوەندی من و دونیا وەکوو سوارێکی رێبوار وایە بۆ حەسانەوە لابداتە بن سێبەری درەختێك پشوێك بداو پاشان هەڵسێ و بڕوا بەجێ ی بێڵێ.

عومەری کوڕی خەتتاب ڕۆژێك پێغەمبەری بینی راکشابوو لەسەر کوتە حەصیرێك کە شوێنی لە لاکەلەکەی کردبوو، عومەر هەردو چاوی پڕ بوون لە ئاو، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە چیتە بۆ کوڵی گریانت هەڵساوە؟ عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ هەڵبـژێراوی خودای بەم حاڵە ژیان بەسەر دەبەی! کیسراو قەیصەریش لەو نازو نیعمەتەدان!! دەڵێ ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەم و چاوی سور بوونەوەو فەرمووی ئەوە گومانت هەیە کورەکەی خەطاب؟ پاشان فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن خۆشی و لەزەتیان بۆ پێش خراوە لەژیانی دونیایان داو لەو دونیا هیچ. جا وەنە بێ ئەو جۆرە ژیانە زەبری هەر بۆ خۆی هەڵبـژارد بێ، بەڵکوو پێ ی خۆش بوو ماڵ و منداڵ و خاوو خێزانیشی بەو جۆرە بژین و ئاوا بەبێ بایەخ بۆ دونیا بڕوانن. ئەوەتا لێوەی ریوایە تکراوە فەرموویەتی: خودایە ئەوەندە رزق و ڕۆژیی بدە بەماڵ و خێزانی موحەممەد کە پێ ی بژین و بەس. ئەبو هورەیرە رەزای

خودای لـێبێ دەڵـێ: سوێندم بەوکەسـەی گیـانی ئـەبو هـورەیرەی بەدەستە هـیچ کاتـێ پێغەمبـەری خـوداو مـاڵ و منـداڵی سـێ ڕۆژ لەسـەر یـەك تێـر نـان نەبوون، تالەژیان دا بوو ئەوە حاڵی بوو.

عائیشە دەفەرموێ: ئێمەی خاوو خێزانی موحەممەد وابووە مانگێکمـان بەسـەر بـردوە ئاگرمـان نەکردۆتـەوە، خـواردنی ئێمـە بریتـی بـووە لـەئاوو خورما.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) زرییەکی هەبوو لای جولەکەیەك بارمتە بوو تـاوە فـاتی کـرد نـەیتوانی قەرزەکـە بداتـەوەو بارمتەکـە وەربگرێتـەوە. لەحـەجی ماڵئـاوایی دا موسـوڵمانان لەخزمـەتی دا ئەوەنـدە زۆر بـوون تـا چـاو بـڕ کـا جمـەیان دەهـات، هـەموو وڵاتـێ جـەزیرەی عـەرەبی لـەژێر دەسـەڵاتیدا بـوو بەهای چوار دیر هەم نـەدەبوو، بەشـێك لـە دوعـاو پارانـەوە کەشـی ئـەوە بـوو ئالەو کاتەدا ئـەو بـارو بارگەنـەی لـەژێریابوو دەیفـەرموو: (اللـهم اجعلـه حجـا لارياء فيه ولاسمعـة) خودایـە وامـان لـێبکە حەجەکەمان رییـاو روپامـایی تێـدا نەبێ.

ریوایەتکراوە: کە پێغەمبـەر بەئـەبوزەڕی فـەرموو: دڵ خـۆش نـابم ئەگـەر بەئەنـدازەی کێـوی ئوحـود زێـڕم هـەبێ و سـێ ڕۆژی بەسـەردا تێپـەڕی و دینـارێکم لابمێنێتـەوە، مەگـەر شـتێك بـێ پەزمەنـدەی بکـەم بـۆ قەرزدانـەوە، مەگـەر ئـاواو ئـاوا بـەناو بەنـدەکانی خـودادا پەخـشان و تەتخـشانی بکـەم بەراست و چەپا بەهەر چوار لادا. جابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا ڕەزای خـودای لـێ بێ، دەڵێ: هیچ کاتێ داوا لە پێغەمبەر نەکراوە بۆ شتێك و گوتبیەتی (نا).

ئیبنو عەبباس ڕەزای خودای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەر سەخی تـرین کـەس بـوو بـەخێرو چـاکە لـەبای پـێش بـارانی ڕەحمـەت. ئەنـەس دەڵـێ: پیاوێـك داوای لـە پێغەمبـەر کـرد ئـەویش مـەڕێکی پێـدا، کـابرا گەڕایـەوە بـۆ وڵاتـی

خۆی وتی خەڵکینە بچن موسوڵمان بن، بێگومان موحەممەد دەبەخشیو ترسی هەژاری نیە. ڕۆژێك نەوەد هەزار دیرهەمیان هێنایە خزمەتی، لەبەر دەمیا لەسەر حەصیرێك ڕۆیان کرد، پاشان هەڵسا دەستی کرد بەدابەشکردنی، هەرکەسێ داوای لێ کرد بەشی دا هەتا تەواو بوو ئەم خودا پەرستیو دونیا نەویستیو ڕوکردنە خودا بەدڵو بەگیانو مەشغوڵبون پێوەیو هەمیشە پاڕانەوەو موناجات لە قاپی پەروەردگار، نەبوونە کۆسپو ڕێگر لە هەمیشە ڕوخۆشیو دڵ ڕاکێشانی خەڵكو دڵنەوایی کردنیانو هەڵسو کەوت لەگەڵ کردنی هاوەڵانی هەریەکە بە پێ ی خۆی، ئەمەش شتێکە لەتواناى کەس دا نەبوە جگە لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆیە ڕوبەڕوی هاوەڵانیو نەتەوەکەی فەرموویەتی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە کەم پێ دەکەنینو زۆر دەگریان[٢٥٩] لەهەموو کەس سینگ فراوانتر بوو، لە هەموو کەس سروشت نەرم تر بوو، لەهەموو کەس خانە دان تر بوو، سوحبەت و قسەی خۆشی لەگەڵ هاوەڵانی دەکرد، تێکەڵاویان دەبوو لەگەڵیان دادەنیشتو گفتو گۆی لەگەڵ دەکردن، یاری لەگەڵ منداڵەکانیان دەکردو لەباوەشی دەگرتنو لەسەر ڕانی خۆی دای دەنیشاندن، وەڵامی کۆیلەو ئازادی دە دایەوە، جودا وازی لەنێوان کارەکەرو هەژارو دەوڵەمەند دا نەدەکرد هەرکەسە بەپێ ی خۆی ئاخاوتنی لەگەڵ دەکردن، سەردانی نەخۆشی دەکرد هەرچەندە لەو پەڕی شاریش بوایە، بیانووی پاساوکاری وەردەگرت، قەت نەبینراوە لەناو هاوەڵانی دا قاچ ڕابکێشێو تەنگ بەهاو نیشینانی هەڵچنێو ئەرك بخاتە سەر یەکێك لەوانەی لەپەنایەوەن.. عەبدوڵڵای کوڕی حاریث خودای لێ ڕازی بێ، دەڵێ کەسم نەدیوە هێندەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەم بەزەردە خەنە بێ.

---

[٢٥٩] متفق علية.

جابیری کوڕی سومرە خودای لێ رازی بێ، دەڵێ: زیاد لەسەد جار لەگەڵ پێغەمبەردا دانیشتوم هاوەڵانی شیعریان دەخوێندنەوە یادەوەری سەردەمی نەزانییان دەگێڕانەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بێدەنگ بوو جار جارەش زەردەخەنەی دەهاتێ.

الشريد دەڵێ: پێغەمبەری خودا داوای لێ کردم شیعری (امیە) ی کوڕی (ئەبوصەلت) ی بۆ بخوێنمەوە، منیش هەندێکم بۆ خوێندنەوە.

پێغەمبەری خودا زۆر خاوەن سۆزو عاطیفە بوو، سۆزو خۆشەویستی ئادەمیزادیانەی تێدا تائەوپەڕی سنور بەر جەستە بو بوو، هەستی ناسكو سۆزی بێ سنوری بەجوانترین شێوە پێوە دیار بوو. ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: پێغەمبەری خودا بە فاطیمەی کچی دەگوت: ئادەی حەسەنو حوسەینم بۆ بانگ بکە، کە دەهاتنە خزمەتی لەئامێزی دەگرتنو بۆنی پێوە دەکردن.. ڕۆژێك بانگی کچە زاکەی کرد (واتە حەسەنی کوری عەلی) ئەویش بەراکردن هاتو خۆی خستە باوەشی پێغەمبەرەوە، ئەمجار دەستی خستە ریشیەوە، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەمی دەکردەوە حەسەنیش دەمی دەخستە ناو دەمیەوە. عائیشە دەڵێ: زەیدی کوڕی حاریثە کەئازاد کراوی پێغەمبەر بوو هات بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەماڵەوە بوو، زەید لەدەرگای دا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەخۆشیانو زوو بەپیرەوە چوونی کراسەکەی لەبەر نەکرد بەدو خۆی دارای دەکێشا، ئیتر باوەشی پێدا کردو ماچی کرد. ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێ کچێك لەکچەکانی پێغەمبەر ناردی بەدووی پێغەمبەر داو هەواڵی بۆ نارد کە کوڕەکەی لەگەڵیانەلاو دایە پێغەمبەر ئێمەی ناردو فەرمووی پێ ی بڵێن: سلاوی لێدەکەم بابزانێ هەموو شتێك هی خودایە چی ببەخشێو چی بباتەوە، هەموو شتێك لای خودا کاتو تەمەنو دیاریکراوی خۆی هەیە. بادان بەخۆی دابگرێو داوای

پاداشت لە خودا بکا. ئیتر کچەکەی پێغەمبەر ناردییەوە بەدوی داو سوێندی لێخوارد کەدەبێ هەربێ. ئیتر پێغەمبەر هەڵساو ئێمەیش لەخزمەتی دا چوینەوە، کە چوینو تەشریفی دانیشت،منداڵە نەخۆشەکەیان بۆ برد، ئەویش لەباوەشی خۆی دا دای نیشاند، منداڵەکە لەگیانەلاوو هەناسە بڕکێ دابوو، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چاوی پڕ بوون لەئاوو فرمێسکی ڕژاند، سەعد دەڵێ: ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە ڕەحمو سۆزێکە خودا دەیخاتە دڵی ئەو کەسانەی دەیەوێ ئەو سۆزەیان هەبێ، خودا ڕەحم دەکا بەو بەندانەی کەخاوەنی ڕەحمو بەزەیین.[٢٦٠] عەبباسی مامی پێغەمبەر یەکێك بوو لەدیلەکانی غەزای بەدر ئەویش وەکوو دیلەکانی تر توند کەلەبچە کرابوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بیستی کەمامی بەو دەست بەستنە زۆر نارەحەتەو دەناڵێنێ ئیتر پێغەمبەر لەتاوان دا خەوی لێ زڕا، ئەنصار بەمەیان زانی دەستیان کردنەوە، وەلێ ئەو خۆشەویستی یەی بۆ مامی نەبوو بەهۆی ئەوەی جودا وازی بخاتە نێوان عەبباسو دیلەکانی تر کەئەنصارەکان زانییان پێغەمبەر ڕازییە بەوەی دەستیان بەرەلا کردون داوایان لێ کرد فیدیەکەشی لێ نەستێنن وایان زانی پێغەمبەر بەوە زیاتر ڕازی دەبێ. وەلێ پێغەمبەر وەلامی نەدانەوە. عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەرو لێی پرسی ئەوە ئێوە چۆن منداڵ ماچ دەکەن؟ وەڵلا ئێمە منداڵ ماچ ناکەین. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموی جامن بڵێم چی کە خودا ڕوحم و بەزەیی لەدڵی تۆ دەرهاویشتبێ؟! زۆر خاوەن سۆز بوو بەرامبەر منداڵانو لەگەڵیان دا هێدیو هێمن بوو، ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر بەلای کۆمەڵێك منداڵ دا تێپەڕی کەسەرگەرمی یاری کردن بوون سلاوی لێکردن، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر بەتەواوی تێکەڵی

---

[٢٦٠] رواه البخاري (كتاب المرضى، باب عيادة الصبيان).

منداڵەکان دەبوو لەگەڵیان دەکەوتە ئاخاوتنو بەزمانی ئەوان گفتو گۆی دەکرد، تەنانەت بەبرایەکی بچوکی منی دەفەرموو: ئەی ئەبو عومەیر: ئەرێ نوغەیر چی کرد.؟

زۆر دڵ نەرمو بەبەزەیی بوو بۆموسوڵمانان بەگشتی، زۆر چاودێری جوداوازی حاڵو وەزعیانی دەکرد، نەیدەهێشت دڵو دەرونیان توشی وەڕزبونو مەلەل بێ.

ئیبنو مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) ، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە ئامۆژگاری دەکردین لێمان ورد دەبووەوە ئاخۆ مەلەلو وەڕز بوون سواری شانمان نەبوە، هەروەها پێغەمبەر وێڕای ئارەزووی زۆری بۆ نوێژ کردن، هەرکاتێ لەنوێژدا گوێی لەگریانی منداڵێك بوایە نوێژەکەی کورت دەکردەوە. ریوایەتکراوە فەرموویەتی من دەست دەکەم بە نوێژ دەمەوێ نوێژەکەم درێژبکەمەوە وەلێ گوێم لەدەنگی گریانی منداڵێك دەبێ ئیتر نوێژەکەم کورت دەکەمەوە لەترسی ئەوەی دایکەکەی نارەحەت بکەم.

لەئیبنو مەسعود ریوایەتکراوە دەفەرموێ: پیاوێك وتی: وەڵڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا من لەنوێژی بەیانیان دوا دەکەوم لەبەر فلان کەس کەزۆر درێژە بەنوێژ دەدا، ئیتر من هیچ کاتێ نەمدیوە پێغەمبەر لەکاتی ئامۆژگاریکردن دا ئاوا تورە بێ بەئەندازەی تورە بوونی ئەو ڕۆژەی. پاشان فەرمووی: هەندێ کەس لە ئێوە موسوڵمانان لەنوێژی بەجەماعەت دوور دەخەنەوە، هەرکامێکتان بوو بەپێشنوێژی خەڵك بالایەنی کورتی بەرچاو بگرێو هەوڵ بدا بەکورتی نوێژەکەی ئەنجام بدا، بێگومان لەناو نوێژ کەرەکان دا لاوازو پیرو خاوەن ئیش هەن.[٢٦١] هەر لەم بارەوە بوو (ئەنجە

---

[٢٦١] رواة البخاری فی کتاب الصلاة...

شە) حودیەی دەخوێند بۆ خێرا ڕۆیشتنی حوشترەکان، ئەنجەشە پیاوێکی دەنگ خۆش بوو، حوشترەکان لەڕێڕەوی قافڵەدا کە گوێیان لەدەنگی دەبوو بەخێرایی ڕەویان دەکرد، ئەمەش بۆ ئەو ژنانەی ناو کەژاوەکانی سەر پشتی حوشترەکان ناخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو: لەسەرە خۆ وشترەکان بئاژو ئەی ئەنجەشە ئاگات لەقەواریرەکانی ناو کەژاوەکان بێ. پێغەمبەر زاتێك بوو خودا لەحیقدو کینە بێ خەوشی کردبوو، لەدڵدا هیچ کینەیەکی بۆ کەس پەزمەندە نەکردبوو، لێوەی ریوایەت کراوە فەرموویەتی: هەر شتێکم لەهاوەڵان پێ دەگا لەخراپەکاری پێم خۆشە ئەو هەواڵە وانەبێ و کە لێکۆڵینەوەی تێدا دەکەم ئاواتە خوازم من بەدڵپاکی و سینەسافی کۆتایی بە شتەکە بێنم. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ موسوڵمانان باوکێکی بەسۆزو بەبەزەیی بوو موسوڵمانانی هەموو بەخاوو خێزان و منداڵی خۆی دەزانین.

باوەشی بۆ دەکردنەوەو لەئامێزی دەگرتن وەکوو چۆن دایکی شیردەر شیرە خۆرەی خۆی لەباوەش دەگرێ. هیچ چاوی لەوە نەبوو هاوەڵانی ماڵ و سامانیان هەیەو ژیانی خۆشیان بۆ ڕێکخراوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان کێشەی هەبوایە قەرزدار بوایە، دەچوە ناو کێشەکەیەوەو هەوڵی حەلکردنی بۆ دەدا، قەرزەکەی لەگەڵ دەدایەوە یان هەمووی دەخستە سەر شانی خۆی. لەم بارەوە دەفەرموێ( کەسێك مردو ماڵ و سامانی لەدوا خۆی جێ هێشت ئەوە هی میراتگرەکانیەتی، ئەگەر قەرزدار بوو ئەوە ئێمە قەرزەکەی بۆ دەدەینەوە[٢٦٢] لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: ( هیچ موسوڵمانێك نیە ئیللا من لەدونیاو قیامەت لەهەموو کەس لێیەوە نزیکترم، ئەگەر بەلاتانەوە سەیرە، ئەوە ئایەتی: ( النبي أولى بالمؤمنين من أنفسهم...) بخوێننەوە. هەر

---

[٢٦٢] رواة البخاري في صحيحه في كتاب الأستقراض (باب الصلاة على من ترك دينا).

موسـوڵمانێك بمرێ مـاڵو سـامان جێ بێڵێ ئـەوە خـزمو کـەسو کـاری میراتەکەی دەبەن هەر کەسێك بن. هەرکەسێك بمرێو قەرزی لەسـەر بێ یـان هـەتیوو منـداڵی بـێ بـژێو جێ بێڵێ بابـێ بـۆ لای مـن مـن سەرپەرشـتی دەکەم.[٢٦٣]

## مام ناوەندی لەپێکهاتەی جەستەیی‌و ڕەوشت دا:

پەروەردگار پێغەمبەر لە ئەوپەڕی جوان جەسـتەیی‌و جوان ڕەوشـتی دا دروست کردبوو، بەدرێژایی مێژوو ئادەمیزادی وا ڕەوشـت جوان‌و جەسـتە جوان نەهاتۆتە سەر زەوی. میانەڕەو لەتـەبیات‌و ئاکاردا لەهەست ناسکی‌و هـەڵس‌و کـەوت‌و بـواری ئـابوری دا، زۆر دور بـوو لەهەڵـچون‌و دا چـون دا، عائیشە دەفەرموێ هەر کاتێ پێغەمبەر لەنێوان دووشت دا سەرپشك کرابێ بارە ئاسانەکەی هەڵبژاردوە، بەمەرجێ تاوان نەبووبێ، ئەگەر بارە ئاسانەکە تاوان بووبێ لەهەموو کەس زیاتر لێی دوور بووە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەهـەموو کـەس زیـاتر دورە پـەرێز بـووە لـە تەکەللوف‌و زێدە ڕۆیـی لـەدونیا نەویـستی دا، لەپێشێل کردنـی مـافی نـەفس‌و کوێر کردنـەوەی حـەزەکانی. ئەبو هورەیرە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـایین ئاسـانەو جـێ بـەجێ کردنـی ئەرکـەکانی قـورس نـین لـەخۆتانی گـران مەکـەن هەرکەسـێ ئـایین لـەخۆی گران بکا دوایـی بۆی جـێ بـەجێ نـاکرێ‌و توشـی بـەد بـەختی دەبـێ. ڕێگـای ڕاسـت‌و حـەق بگـرن، بـەبێ زێـدە ڕۆیـی‌و کەم‌و کورتی. ئەگەر نەتانتوانی شتێك بەتـەواوی ئـەنجام بدەن، هـەوڵ بـدەن نزیکی بکەنەوە لەتەواو. مژدە بـدەن بە پاداشـی بـاش‌و گەشـبین بـن، ئەگـەر نەتانتوانی کردەوەی چاك‌و تەواو ئەنجام بدەن ئەوە بـەهیوای پاداشـی بـاش

---

[٢٦٣] هەمان سەرچاوە ۞ صحيحه ۞ كتاب الأستقراض (باب الصلاة على من ترك دينا).

بن. هەوڵ بدەن بۆ بەر دەوامبون لەسەر عیبادەتکردن بیخەنە کاتێکەوە نیشاتتان هەبێ وەکوو سەرەتای ڕۆژو دوا نیوەڕۆو کەمێکیش لەکۆتایی شەو.

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: زێدە ڕۆیی مەکەن‌و زیاد لەئەندازە ئەرك مەخەنە سەر شانی خۆتان، چەند تواناتان هەیە ئەوە بکەن سوێندم بەخودا خودا وەڕز نابێ لەپەرستشکردنی ئێوە تا خۆتان وەڕز نەبن.

ئیبنو عەبباس دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر کرا چ ئاینێك لای خودا خۆشەویستە؟ فەرمووی: ئایینی پاك‌و خاوێن و بێ زێدە ڕۆیی‌و کەم‌و کورتی.

لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەت کراوە رەزای خودای لێ بێ، دەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەکوشت چون ڕێدەرۆیان لەئایین دا ئەوانەی زۆر لەئایین دا رو دەچن‌و زێدە ڕۆیی دەکەن فەوتاون فەرمووی: بەهەندێ لەوانەی دەیناردن بۆ بانگەوازی ئایینی، ئاسانکاری بکەن‌و ئایین قورس مەکەن. موژدە دەربن‌و خەڵك كێش بكەن بۆ لای ئایین خەڵك لەئایین مەتۆرێنن:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی (العاص) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بێگومان پەروەردگارییێ خۆشە دیاردەی نازو نیعمەتی خۆی بەسەر بەندەی خۆیەوە ببینێ.

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەماڵەوەو لەگەڵ ماڵ‌و خێزانی دا:

پێغەمبەری خودا لەماڵەوەو لەگەڵ خاوو خێزانی دا ئادەمیزادێك بوو لە ئادەمیزادان. عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر لەماڵەوە جل‌و پۆشاکی خۆی دەدۆزی، مەڕی دەدۆشی، خزمەتی خۆی دەکرد، هەروا دەفەرموێ:

پێغەمبەر لەماڵەوە پۆشاکی خۆی پینە دەکرد نەعل و چەکمەی خۆی دەدورینەوە.

بەعائیشە یان گوت: ئەرێ پێغەمبەر لەماڵەوە چی دەکرد؟ لەوەڵام دا وتی: یارمەتی ماڵو منداڵی خۆی دەداو ئیشی لەگەڵ دەکردن، کەکاتی نوێژ دەهات دەچوە دەرەوە بۆ نوێژ. لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەعلەکانی خۆی پینە دەکردن و کراسی دڕاوی دەدورییەوە.. هەروەها عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەهەموو کەس زیاتر لەسەرە خۆو نەرم تەبیعەت بوو، سەخی ترین کەس بوو. زۆر کات دەم بەپێکەنین و لێو بەبزە بوو.

ئەنەس دەڵێ: نەمدیوە کەس هێندەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەبەزەیی و دڵنەرم بێ بۆ خاوو خێزانی خۆی..

عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: باشترتان ئەو کەسەیە بۆ ماڵو منداڵی خۆی باش بێ. من لەهەموانتان باشترم بۆ ماڵو منداڵی خۆم.

لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رەخنەی لەخواردن نەگرتووە. ئەگەر حەزی بووبێ وەنەوشی کردوە، ئەگەر حەزی لێ نەبوو بێ نەیخواردوە.

## پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەسە نزیکەکانی خۆی بۆ تەنگانەو مەترسی پێش خستون بۆ عەطاو بەخشش دوای خستون:

پێغەمبەری خودا شیعاری هەمیشەیی لەگەڵ خزمە نزیکەکانی و ماڵو منداڵی ئەوە بوو لەترس و تەنگانە دا پێشیان بخاو لەکاتی بەخشش و

عەطادا دوایان بخا. ئەوەتا کاتێك عوتبەی کوڕی ربیعەو شەیبەی کوڕی رەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبە کەلە پاڵەوانە ناودارەکانی عەرەب بوون داوایان کرد لەموسوڵمانەکان هاوشانی خۆیان بۆ بچێتە مەیدان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە هەموو کەس باشتر دەیزانی کە ئەو سێ پاڵەوانە چەند کارامای جەنگو لێهاتوون، هەڵبەتە لە ناو موسوڵمانەکان دا پاڵەوان هەبوون بتوانن بەرەنگاری ئەوسێ پاڵەوانە ببنەوە، وەلێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی حەمزە هەڵسە، عەلی هەڵسە، عوبەیدە هەڵسە کەهەرسێکیان خزمی نزیکی بوونو زۆری خۆش دەویستن ئەمانی ناردن بۆ بەرامبەریکردنو شەڕکردن لەگەڵ ئەوسێ پاڵەوانە ناودارانەدا. ویستی خودا وابوو کە حەمزەو عەلیو عوبەیدە سەرکەوتن بەدەست بێنن حەمزەو عەلی بەسەلامەتیو سەرکەوتوویی گەڕانەوە، عوبەیدە بریندار بوو بەبرینداری بردیانەوە.

کاتێکیش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ویستی سوو حەرام بکاو خوێنبەستی سەردەمی نەزانی پوچ بکاتەوەو ئەو دابو نەریتانە هەڵوەشێنێتەوە. سەرەتا بەعەبباسی مامی دەستی پێ کرد، ریبای عەبباسی کوڕی عەبدو لموطەلیبو برازایەکی عەبباس: کەرەبیعەی کوڕی (الحارث) بوو پوچی کردنەوە، ئەوە بوو لەوتارە مێژوویی یەکەی حەجیماڵئاوایی دا فەرمووی: ریبای سەردەمی نەزانی هەڵوەشایەوە، یەکەم ریبایەك کە هەڵی دەوەشێنمەوە ریبای عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیبە، خوێنبەستی سەردەمی نەزانی دەخەمە ژێر قاچمەوە پوچی دەکەمەوە، یەکەم خوێنێك کەلای دەبەم خوێنی رەبیعەی کوڕی (الحارث)ە.

کەچی لەبەخشندەو دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ هەمیشە دەیخستنە دواوە، خەڵکی تری پێش دەخستن عەلی کوڕی ئەبو طالیب

ڕەزای خودای لێ بێ، دەڵێ فاطیمە شکاتی ئەوەی کرد: کە ئاشەوانەکە باش هەڵس و کەوتیان لەگەڵ ناکا، هەموو جارێ کەکاتی باراش هاڕینیان دێ ماوەیەکی زۆر پیوەی مەشغوڵ دەبن. لەهەمان کات دا فاطیمە بیستیەوە: کە پێغەمبەر کۆمەڵێك کۆیلەی بۆ هێنراون، بۆیە چووە خزمەت پێغەمبەرو داوای لێ کرد خزمەتکارێکی بداتێ، ڕەزامەندی بەدەست نەهێنا. فاطیمە ئەمەی بۆ عائیشە گێڕایەوە، پێغەمبەر کە هاتەوە ماڵ عائیشە بۆی باسکرد بوو، جا عەلی دەڵێ: پێغەمبەر کە عائیشە بۆی دەگێڕێتەوە یەکسەر دێ بۆ ماڵی ئێمە ئێمەش لەو کاتەدا خۆمان ئامادە کردبوو بۆ نوستن و چوینە سەر جێگا، ویستمان خێرا ڕاست بینەوە فەرمووی نا نا مەجوڵێن و لەشوێنی خۆتان بن، تەنانەت (وجدت برد قدميه على صدري) فەرمووی ئەرێ شارەزاییتان نەکەم بۆ شتێك زۆر باشتر بێ لەوەی داواتان کردوە، کە چوونە سەر جێگا سی و چوار جار (الله أكبر) بکەن، سی و سێ جار (الحمد لله) بکەن سی و سێ جار (سبحان الله) بکەن، بێگومان ئەوە زۆر باشترە لەوەی داواتان کردوە. لە ڕیوایەتێکی تری ئەم چیرۆکەدا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی وەڵلاهی ناتاندەمێ و ئەهلی صوففە لەبرسان دا سکی خۆیان هەڵگوشن و شتێکم دەست نەکەوێ بیاندەمێ، بەڵکوو بڕیارم داوە ئەو کۆیلانە بفرۆشم و قیمەتەکەیان بکەمە خەرجی و مەصرەف بۆیان.

## هەست ناسکی پێغەمبەرو سۆزی بەرزی:

پێغەمبەری خودا وێڕای ئەرکی قورسی پێغەمبەرێتی و بانگەوازی کردن، هەروا غەم و پەژارەو پەرۆشی بۆ ئادەمیزاد بەگشتی و هەڵگرتنی ئەو ئەرکە قورسانە کە کێوی تۆکمەو چەسپاو خۆیان بۆ ڕانەدەگرتن. وێڕای ئەو ئەرك و غەم و نارەحەتیە هەستێکی ئادەمیزاد یانەی ناسك و سۆزێکی بەرزی

باو کانەی بۆ نەتەوەکەی تێدا بەرجەستە بو بوو لە جوانترین و بەرزترین شێوەدا ڕەنگی دەدایەوە.

بەڵێ لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) زۆر وره بەرزو چاو نەترس و خاوەن عەزم و جەزمی بەهێز بوو حەدی و خاوەن هەڵوێست و صەرامەت بوو کە پێغەمبەران ئەم ڕەوشتانەیان بە زەقی تێدا ڕەنگ دەدەنەوە و لەزاتی ئەو دا گەیشتبونە حەدی کە ماڵ و لە پێناو بانگەوازی ئیسلامی و بەرزکردنەوەی شیعاری (لااله الاالله) و پابەند بوون بە فەرمان و نەهیەکانی خودا حیسابی بۆ هیچ شتێك نەدەکرد. کەچی لەگەڵ ئەوەش دا هاوەڵانی لەبیر نەدەکردن، هەمیشە هاوەڵە بەوەفاکانی خۆی ئەوانەی بەپیر بانگەوازی یەکەیەوە هاتن و لەو پێناوەدا گیان و ماڵی خۆیان بەخشی، لەیادی نەدەچوونەوە، تادوا چرکەی ژیانی لەیادی بون و دوعای بۆ دەکردن و دیدەنی گۆڕەکانی دەکردن، تەنانەت سۆزی خۆشەویستی بۆیان تەنیەوە بۆ خۆشەویستی ئەو شوێنەی تێ یدا شەهید کران و ئەو کێوەی لە دامێنیا شەهید بون و ئەو خاك و شوێنەی گۆڕەکانیانی لەئامێز گرتبوو. هاوەڵان لێوەی ڕیوایەت دەکەن کە دەفەرموێ ئەم کێوی ئوحودە کێوێکە خۆشی دەوێ ین و خۆشمان دەوێ.

ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەری خودا کە کێوی ئوحودی بینی فەرموی ئەوە کێوێکە خۆشی دەوێ ین و خۆشمان دەوێ. ئەبو حەمید دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا لەغەزای تەبوك دەگەڕاینەوە کەمەدینەمان لێ دەرکەوت فەرمووی ئەمە (طابە) یە ئەوە کێوێکە خۆشی دەوێ ین و خۆشمان دەوێ.

عوقبە دەڵێ: پێغەمبەری خودا ڕۆژێك لەماڵ دەرچوو نوێژی لەسەر شەهیدانی ئوحود کرد بەو شێوەیەی نوێژ لەسەر مردو دەکا.

جابیری کوڕی عەبدوڵلاً. دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) باسی هاوەڵانی ئوحودی دەکرد. وەڵڵاهی حەزم دەکرد منیش وەکوو ئەوان لەسەر ئەو کێوە بکوژرامایە بۆ ئەوەی ئەو رێز لێنانەی پێغەمبەر منیشی بگرتایەوە.

بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خۆی راگرت بۆ کارە ساتی شەهید بوونی حەزرەتی حەمزەی مامی و برای شیری، ئەو خزمە خۆشەویستەی کەلە مەککەدا دیفاعی لێکردو لەسەری کردەوە، ئەم خۆشەویستەی لەغەزای ئوحودا شەهید بوو، بەشێوەیەکی زۆر ناشرین سوکایەتی بەجەستەی کرا، موثلەی پێ کرا، وەلێ وەکوو پێغەمبەرێکی ئولولعەزم صەبری گرت. کەلە ئوحود گەڕایەوە بەنزیك ماڵەکانی بەنی (عبدالأشهل) دا تێپەڕی گوێی لەگریان و شین و ڕۆ ڕۆی شەهیدەکانی ئەنصار بوو ئەویش کوڵی گریانی هەڵساو هەستی ئادەمیزادانەی هەژاو چاوی پڕ بون لەئاوو فرمێسکی رشتن، پاشان فەرمووی: وەلێ حەمزەکەس نیە بۆی بگریا.[٢٦٤]

بەلاّم ئەم هەستە ئادەمیزادیانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەیتوانی زاڵ بێ بەسەر هەستکردن بەبە پرسیارێتی پێغەمبەرایەتی و بانگەوازیو راوەستان و پەیڕەو کردنی سنورەکان و رێنمایی یەکانی پەروەردگار. ئەوەتا مێژوو نووسان و شارەزا لەسیرەی پێغەمبەردا ریوایەتیان کردوە دەڵێن: کاتێك سەعدی کوڕی مەعاذو ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (رەزای خوایان لێ بێ)، گەڕانەوە بۆ هۆبەی بەنی (عبد الأشهل) فەرمانیان دا بەئافرەتەکانیان کە پشتێن ببەستن و بڕۆن و شیوەن بگێڕن بۆ شەهید بوونی مامی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئافرەتەکانیش ئەو کارەیا ئەنجام دا، کە پێغەمبەر بەمەی زانی و گوێی لەگریانی ئافرەتە کان بوو، هاتە لایان، ئافرەتەکان لەو کاتەدا

---

[٢٦٤] ابن كثير جـ ٣/٩٥. ئیمام ئیسنادی ئەم حەدیثە دەباتەوە سەر ئیبنو عومەر.

لەبەر دەرگای مزگەوت دەگریان، پێیانی فەرموو بگەڕێنەوە بەر ڕەحمەتی خودا بکەون، بێگومان ئێوە پرسەی خۆتان گێڕا. ریوایەتکراوە کە پێغەمبەر گوێی لەگریانی ئافرەتەکان بوو فەرمووی: ئەوە چیە؟ عەرزیان کرد یاریدەدەران داوایان کردوە ئافرەتەکانیان شین بۆ حەمزە بگێڕن، ئیتر پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن‌و سوپاسی کردن، ئەمجار فەرمووی من ئەمەم نەدەویست‌و گریان لەسەر شەهیدو مردوم بەلاوە پەسەند نیەو نەهی لێ کردن.

لەم هەڵوێستە رونترو ئاشکراتر ئەو هەڵوێستەی بوو بەرامبەر وەحشی (بکوژی حەمزە) ئەوە بوو کە بە پشتیوانی خودا موسوڵمانان مەککە یان رزگار کرد، ئیتر وەحشی سەری کێوانی لێ لێك هاتەوەیەك، نەیدەزانی چی بکا، بیری لەوە کردەوە بەرەو وڵاتی شام رابکا، یان بەرەو یەمەن هەڵبێ یان بۆ وڵاتی تر بڕوا، دونیای لێ تاریك بوو، پێیان گوت: کورە ماڵوێران: موحەممەد کە تۆ ئەوەندەی لێ‌دەترسێ‌ی پێغەمبەری خودایە، هەرکەسێ ئیمان بێنێ نایکوژێ، بڕۆ شایەتومانێکی بەحەق بێنەو موسوڵمان ببە. ئیتر وەحشی هات چووە خزمەت پێغەمبەرو شایەتومانی هێناو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) موسوڵمانبوونی لێ وەرگرت، هیچ روگرژی لەگەڵ نەکردو نەیترساند.. جارێ گوێی راگرت چۆنیەتی کوشتنی حەمزەی بۆ گێڕایەوە کە لەسەر گورشتەکە تەواو بوو هەستە ئادەمیزادی یەکەی جولاّ، بەبێ ئەوەی جێگە بەپلەی پێغەمبەرایەتیەکەی تەنگ بگاو رقی لێی هەڵسێ‌و موسوڵمانبوونەکەی رەت بکاتەوەو لەتۆڵەدا بیکوژێتەوە، هەر ئەوەندەی پێ گوت: خانە خراپ! خۆتم نیشان مەدەو زۆرمەیە بەرچاوم، بانە تبینم، وەحشی دەڵێ: لەوە دوا خۆم لە پێغەمبەر دەشاردەوە، هەتا کۆچی دوایی کرد هەوڵم دەدا نەم بینێ.

لەریوایەتێکی تردا کەبوخاری ریوایەتی کردوە هاتووە وەحشی دەڵێ: کە پێغەمبەر منی بینی، فەرمووی ئەتۆی وەحشی؟ وتم: بەڵێ: فەرمووی ئەتۆ حەمزەت شەهید کرد؟ وتم ئەوە روداوێك بوو روی دا وەکوو بۆیان گێڕاویەوە، فەرمووی: ئایا دەتوانی خۆتم بۆ دەر نەخەی‌و نەتبینم؟![٢٦٥]

لەدیاردەی ئەو هەستە ناسکە ئادەمیزادیانەی پێغەمبەرو سۆزە بەرزەکەی ئەوە بوو جارێك رێی کەوتە گۆڕێك، لەلای ڕانیشت‌و دڵنەرمی بەسەری دازاڵ بوو دەستی کرد بەگریان، فەرمووی ئەوە گۆڕێ ئامینەی کچی وەهبە. ئەمە کاتێك بوو کە ماوەیەکی دورو درێژ بەسەر وەفاتی ئامینەدا تێپەڕ بو بوو.

## پیاوەتی‌و لەسەرە خۆیی پێغەمبەر :

بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێشەوای ئادەمیزادە بەگشتی‌و ماموستاو رابەریانە لەرەوشت‌و دەروونپاکی‌و بێ فیزی دا، بەسە بۆ ئەو: کە خودا دەربارەی رەوشت بەرزی ئەو دەفەرموێ (وانك لعلى خلق عظيم) بێگومان ئەی موحەممەد تۆ لەسەر رەوشتێکی بەرزی. پێغەمبەر بۆ خۆی دەفەرموێ: (أدبني ربي فأحسن تأديبي) خودا منی پەروەردە کرد و جوانی تەربیە داداوم. جابیر دەڵێ:- پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودا منی رەوانە کرد بۆتەواو کردنی رەوشتی بەرزو کرداری جوان.

لەخاتو عائیشە پرسیار کرا ئاخۆ رەوشتی پێغەمبەر چۆن بووە؟ فەرمووی رەوشتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەق بەگوێرەی قورئان بوو.

---

[٢٦٥] الجامع الصحيح للبخاری (باب قتل حمزة).

پێغەمبەری خودا لە لێبوردەیی و لەسەرە خۆیی و بارقوڵی و سینگ فراوانی و دان بەخودا گرتن و خۆراگری دا بەجۆرێك بوو كەبیری تیژی زانا زیرەكەكانو خەیاڵی بەرزە فڕی شاعیران ناتوانن بەتەواوی و وەكوو پێویست وێنەی بكێشنو بیخەنە سەر كاغەز.

ئێستا ئێمە هەندێ لەو شەمائیلو رەوشتە بەرزانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كەبەرشتەی راستو دروستو بەیەكەوە پەیوەست، بەگێڕانەوەی كەسانی عادڵو راستگۆ لەكەسانی وەك خۆیانەوەو بەتەواتورو هەواڵی بلاو پاشینە لە پێشینەی خۆیانەوە ریوایەتیان كردوەو لە كتێبە بڕوا پێ كراوەكان دا تۆمار كراوە، دەڵێم هەندێ لەو شەمائیلانە لێرەدا دەخەینە ڕو:- نموونەیەك لەكەرەمو لێبوردەیی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەرامبەر سەر سەختترین دوژمنی و چاكە لەگەڵ كردنی، ئەو هەڵوێستە بوو بەرامبەر سەرۆكی دوو ڕووەكان نواندی. ئەوە بوو عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی گیانی دەرچوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هاتە سەر تەرمەكەی پاش ئەوەی خستبویانە گۆڕەوە، پێغەمبەر فەرمانی كرد، هێنایانەوە دەر، هەندێ تفی خۆی لێ داو كراسەكەی لەبەر كرد.[٢٦٦]

ئەنەس دەڵێ لەگەڵ پێغەمبەردا دەرۆیشتم بەڕێگادا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) عەبایەكی نەجرانی قەراخ چنراوی ئەستورو زبری لەبەر دابوو، عەرەبێكی دەشتەكی پێ ی گەیی، عەباكەی پێغەمبەری گرتو بای داو توند بۆ لای خۆی كێشی كرد، روانیم لاملی پێغەمبەر بەو راتەكاندنەی عەبایە سوڕ هەڵگەڕابوو، پاشان روی كردە پێغەمبەرو وتی: ئەی موحەممەد! فەرمان بدە لە وماڵو سامانەی بەیتولمال كەلە ژێر دەستی تۆدایە بەشم

---

[٢٦٦] صحيح البخاري كتاب الجنائز.

بدەن، پێغەمبەر ئاوڕێکی لێ دایەوەو پێکەنی و پاشان فەرمانی کرد بەشێکی بدەنێ.[٢٦٧] زەیدی کوڕی سەعنە پێش موسوڵمانبوونی قەرزێکی لەسەر پێغەمبەر بوو داوای کردەوە، کراسەکەی پێغەمبەری راتەکاند پڕ بەچنگی خۆی کراسەکەی لەدەست گرت و بەشێوەیەکی زبر هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد، پاشان وتی: ئەی نەوەی عبدولموطەلیب! ئێوە قەرز کوێرن!! عومەر لێ ی راپەڕی و قسەی ناشرینی پێ گوت و لێ ی تووڕە بوو، لەو کاتەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێ دەکەنی، ئەمجار فەرمووی ئەی عومەر! من و ئەم کابرایە پێویستمان بەو شەڕو تووڕە بوونەی تۆ نیە، دەبوایە داوا لە من بکەی زوو قەرزەکەی بدەمەوەو بەویشت بگوتایە بەجوانی داوای قەرزەکەی بکاتەوە. پاشان فەرمووی: هێشتا بۆ کاتی قەرز وەرگرتنەوەکەی سێ ڕۆژی ماون، ئەمجار بەعومەری فەرموو: قەرزەکەی بۆ بداتەوەو سی بەشی زیاد بداتێ چونکە ترساندویەتی و لێ ی تووڕە بووە، ئەمە بوو بەهۆی موسوڵمانبوونی زەیدی کوڕی سەعنە. ئەنەس دەڵێ: هەشتا پیاو لەئەهلی مەککە لەکێوی (التنعیم) ەوە بەچەکەوە دا پەرینە خوار بۆ ئەوەی پێغەمبەر غافڵگیر بکەن و دەستی لێ بوەشێنن، دوایی خودا وایکرد ئەسیر کران، کەچی ئازادی کردن. لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاّ: رەزای خودای لێ بێ. دەڵێ لەگەڵ پێغەمبەردا غەزای ولاّتی نەجدمان کرد، ڕۆژێك پێش نیوەڕۆ ئارە زوی قەیلوولەی کرد، واتە پێویستی بەئیسراحەتی پێش نیوەڕۆ بوو، لەدۆڵێك دا بوین درەختی غەضای زۆر لێ بوو، پێغەمبەر چووە بن درەختی سومرە بۆ ئەوەی لەژێر سێبەرەکەی دا کەمێ پشوویدا، شمشێرەکەی بەدرەختەکەوە هەڵواسی، خەڵکەکەش بەناو دۆڵەکەدا بڵاو بونەوەو هەریەکەیان خۆی خزاندە ژێر

---

[٢٦٧] رواه البخاري في كتاب الجهاد باب ماكان النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يعطي المؤلفة قلوبهم.

درەختێکەوە، لەکاتێك دا کە ئەمە حاڵی ئێمە بوو پێغەمبەر بانگی کردن ئێمەیش هاتینە خزمەتی، بینیمان کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لای دانیشتووە، فەرمووی: ئەم عەرەبەی دەی بینین هاتە سەرم من خەوم لێ کەوتبوو، شمشێرەکەمی داگرت بوو هەڵی کێشا بوو، بەخەبەر هاتم ئەو لەسەر سەرم راوەستابوو شمشێرەکەی هەڵکێشابوو، وتی: کێ تۆ لەدەست من ڕزگار دەکا؟! وتم خودا من لەدەست تۆ ڕزگار دەکا. ئیتر شمشێرەکەی خستەوە ناو کالانەکەیەوە، پاشان دەستە وەستان دانیشت، ئەوە تا ئێستا وا ئاوا دەیبینن. ئیتر پێغەمبەر سزای نەداو بەرەڵڵای کرد.

بێگومان پێغەمبەر هێندە لێ بوردەو بارقوڵ بوو، کە بارقوڵی هاوەڵان بەقوله پێ نەدەگەیشت. لەکاتێك دا ئەوان خاوەنی حیلمو بار قوڵی بوون، پێغەمبەر لەهەموو ئەم رەوشتە بەرزانەدا مامۆستاو رابەریان بوو، هاوەڵیان بوو، چاکسازو ئیصلاح خواز بوو بۆیان، نمونەیەك لەو بارقوڵیو لێ بوردەیی یەی ئەوەیە؟ ئەبو هورەیرە ریوایەت دەکا دەڵێ عەرەبێکی دەشتەکی لەمزگەوت دا میزی کرد خەڵکەکە لێیان لە هەراداو ویستیان پەلاماری بدەنو زیانی پێ بگەیەنن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرموی وازی لێ بێنین، مەسینە ئاوێك بکەن بەشوێنی میزەکەی دا ئێمە راسپێراوین کار ئاسانی بۆ خەڵك بکەین نەك ئەرکییان قورس بکەین.

موعاوییەی کوڕی حەکەم دەڵێ: کاتێك من لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژم دەکرد پیاوێك لەوانەی لەگەڵما بوون پشمی منیش وتم (یرحمك الله) خودا رەحمت پێ بکا، ئیتر خەڵکەکە هەموو چاویان تێ بڕیمو بەرقەوە سەیریان دەکردم، منیش وتم: (دایکە رۆ نەکەم) ئەوە چیتانە بۆوا سەیرم دەکەن؟ ئیتر هەموویان بەرانی خۆیان دەکێشاو ناڕازی بوون لەکردەوەکەی من، ئیتر منیش لەسەری نەرۆیشتم بێدەنگ بوم. جا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)

نوێژەکەی تەواو کرد باوك و دایکم و خۆم بەقوربانی بم، هەرگیز مامۆستاو پەروەردگاری ئاوام نەدیوەو کەسم نەدیوە بەئەندازەی ئەو جوان پەروەردەی قوتابیانی خۆی بکا، سوێندم بەخودا نەڵێم تورە بوو نەلێ ی دام، نەقسەی ناشیرینی پێ وتم. فەرمووی: (ان هذه الصلاة لایصلح فیها شيء من کلام الناس) نوێژ ئاخاوتنە لەگەڵ خودادا، نابێ هیچ جۆرە قسە کردنێکی ئادەمیزادی تێ دا بکرێ، نوێژ (الله أکبر) گوتن و تەسبیحاتکردن و خوێندنی قورئانە.

ئە نەسی کوڕی مالیك دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر بەرەحم و بەبەزەیی بوو، هەرکەسێ بهاتایە خزمەتی و داوای شتێکی لێ بکردایە، وادەی پێ دەداو بۆی جێ بەجێ دەکرد بەمەرجێ لەتوانای دا بوایە. تەنانەت جارێك کاتی نوێژ بوو هەموو خۆمان بۆ نوێژ ئامادە کردو قامەت کرا عەرەبێکی دەشتەکی هات چاکی کراسەکەی گرت و وتی: کەمێ پێداویستیم ماوە بمدەیتێ دەترسم لەبیرم بچێ، ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژەکەی دواخست چوو پێداویستی یەکەی پێدا، ئەمجار هاتەوە نوێژەکەی کرد هەر لەنموونەی سینگ فراوانی و بار قوڵی و لێبوردەیی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو شایەتیەیە کە ئەنەسی کوڕی مالیك کەهەر لەمنداڵی یەوە خزمەتکاری پێغەمبەر بووە دەڵێ: دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کرد ڕۆژێ لەڕۆژان نەیفەرموو: ئۆف لەدەستی تۆ ئەرێ بۆ ئەوەت کرد یان بۆ ئەوەت نەکرد.[٢٦٨]

سوعادی کوڕی عومەر دەڵێ هاتمە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆنێکم لەخۆ دابوو پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە زەعفەرانە زەعفەرانە لەخۆت داوە، دادەی خۆت نەوی بکە (بکۆمەرەوە) ئیتر دارێکی بە دەستەوە بوو

---

[٢٦٨] موسلیم ئەم ریوایەتەی لە (کتاب الفضائل، بابا حسن خلقه) داهێناوە.

دایگرتم، تاتەواو دار کاری کردمو ئازارم پێ گەیی، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە تۆڵەم لێ دەستێنی؟ ئیتر ئەویش فەرمووی دەها تۆڵەی خۆتم لێ بکەوە.

## پاراستنی رەسەنایەتی ئایینو پابەند بوون بە پوختەی ئایینەوە:

پێغەمبەری خودا وێڕای نەرمیو بارقوڵیو لێبوردەییو چاو پۆشی لە هەڵەو کەمو کورتی خەڵکی تا ئەوپەڕی سنور، وەلێ زۆر سور بوو لەسەر پارێزگاری بنەماکانی ئایینو زۆر پابەند بوو بە پوختەی ئایینو جێ بەجێ کردنی تەعلیماتەکانی. بەمو لەبیرو باوەڕی یەکتا پەرستی لای نەدەداو زۆر حەزەری لەوە دەکرد کە ئومەتەکەی توشی بیرو باوەڕی پڕو پوچو زێدە ڕۆیی لەئایین دا یان کەمتەرخەمی لەئاستی ئایین دا بن، یان تەقدیسی کەسایەتی تایبەتی بکەنو بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی نەفامیو جاهلییەت. هەرکاتێ بیزانیایە کە سوکایەتی بەئایین دەکرێ، یان کارێك دەکرێ لەگەڵ روحی دین دا ناگونجێ، یان زێدە ڕۆییو خوارو ژووری لەئەنجامدانی ئەرکەکانی پەیڕەو دژی دەوەستا، هیچ گوێی نەدەدایە ئەوە ئاخۆ بەرژەوەندی سەرکردایەتی یان بەرچاو گرتنی لایەنی سیاسیو رواڵەتی زیانی پێ دەگا یان نا؟! بەکورتی پێغەمبەری خودا تا ئەوپەڕی سنور حەددیو مەبدەئی بووە، لەسەر حیسابی ئایین تۆز قاڵێك زەمانە سازی نەکردوە. لەم بارەوە بەتەواوی لەهەموو پێشەواو سەرکردە سیاسی یەکانی کۆنو نوێ جیا دەبێتەوە.

دیاری ترین و ئاشکرا ترین نمونە ئەو هەڵوێستو راستکردنەوە بوو کە پێغەمبەری خودا لەکاتی لەدونیا دەرچوونی ئیبراهیمی کوڕی دا پەیڕەوی

کرد.ئەوە بوو ساڵی دەیەمی کۆچی ئیبراهیمی کوڕی لەتەمەنی هەژدە مانگی دا مرد، لەهەمان ڕۆژدا خۆر گیرا، خەڵکەکە وتیان خۆر لەتاوی مردنی ئیبراهیم گیرا، پێغەمبەر کە ئەمەی بیست وتارێکی بۆ خەڵکەکە داو فەرمووی: ( خۆرو مانگ دوو نیشانەی گەورەیی خودان، بەهۆی لەدایکبوون‌و مردنی کەس ناگیرێن، هەر کاتێ شتێکی واتان دی، لەخودا بپاڕێنەوە، (الله اكبر) بکەن، نوێژ بکەن خێرو خێرات بکەن.) ئەگەر بهاتایە لەشوێنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەم هەل‌و مەرجە ماتەمێنی یە سۆزدارەدا هەر بانگخوازێکی تر بوایە، یان هەر رابەرێکی ترو سەرکردەو سیاسەتمەدارێکی تر بوایە، کەمترین هەڵوێستی بەرامبەر بیرو بۆ چونی خەڵکەکە بێدەنگی دەبوو، چونکە بەرواڵەت ئەم بیرو بۆ چونە لەبەر ژەوەندی بانگەوازی‌و بزوتنەوەکەی بوو، هەروەها چونکە ئەم بیرو بۆ چونە پیرۆزی‌و تەقدیسێك دەبەخشێتە خۆی‌و بنەماڵەکەی کە دەتوانێ پشتی پێ ببەستێ بۆ بەر فراوانبوونی دەسەلاّتی بەسەر خەڵکەکەداو کێشکردنی دڵی هاوەلاّنی بۆ لای خۆی‌و زێدە بوونی متمانە پێ ی‌و سەرنج راکێشانیان بۆ کەسایەتی خۆی هەڵبەتە ڕوداوی ئاواو لەهەل‌و مەرجی ئاوادا رابەرانی نەتەوەکان‌و سەرانی گروپ‌و پێشەوایانی سیاسی دەیقۆزنەوەو ئاواتە خوازن هەلی ئاوایان بۆ هەڵبکەوێ. دامەزرێنەری پارت‌و فەرمانڕەواو پاشاو مەلیکەکان هەزارو دوفێڵ‌و تەڵەکە دەخەنە کار شتێکی لەو جۆرەیان بۆ بخولقێ تاپێگەی خۆیانی پێ پتەو بکەن. دەی پەروەردگار ئەم هەل‌و مەرجەی لە ڕێگای غەیبەوە بێ ماندوو بون بۆ پێغەمبەر ڕەخساند، هەر ئەوەندەی لەسەر بووبێ دەنگی لێ‌بکردایەو ڕەتی نەکردایەوە. بەلاّم پێغەمبەری خودا، تەحەممولی ئەم بیرو بۆ چونە هەڵەیەی نەکردو دەقیقەیەك لێ‌ی بێدەنگ نەبوو، بەڵکوو خێرا هەڵی دایەو ئەو وەهم‌و بیرو بۆ چونەی

رەتكردەوە، چونكە لەگەڵ جەوهەری ئاییینەکەی دا نەدەگونجاو بیرو بۆ چوونی لەو جۆرە سەری دەکێشا بۆ گەندەڵبوونی عەقیدەو پەیوەست کردنی روداوەکە ونییەکان‌و داب‌و نەریتەکانی خودا لەبونەوەردا بەو روداوو گۆڕانکارییانە کەبەسەر تاکتاکی ئادەمیزادەکان دادێ، بائەو تاکتاکە ئادەمییانە پێغەمبەران بن یان منداڵ‌و تاکی خێزانەکانیان، واتە: پێغەمبەر رەدی ئەوەی کردەوە کەلە دایکبون یان مردن‌و نەخۆشی‌و تەندروستی یەکێك لەئادەمیزاد ببێتە هۆکاری گۆڕانکاری لەدیاردە سروشتی یە کەونییەکان دا. چونکە بیرو بۆ چونی هەڵەو پەیوەستکردنی روداوی کەونی لەو جۆرە بەمردن یان لەدایکبوونی ئادەمیزادێك هەر پلەو پایەیەکی هەبێ لەکۆنەوە دەرگایەکی کراوەی لەسەر پشت بووە لەناو نەتەوە دێرینەکان داو شیرك‌و بتپەرستی‌و تەقدیسی بەندەکان‌و بەرزکردنەوە یان بۆ پلەی‌خودایەتی لەوەوە پەیدا بووە. بۆیە پێغەمبەری خودا خێرا ئەو جۆرە بیرو بۆ چونە جاهیلی یەی رەتکردەوەو بەفەرمانی خودا نوێژێکی تایبەتی بۆ روداوی خۆر گیران دیاری کرا کە پێ ی دەگوترێ: (صلاة الخسوف) نوێژی خۆرگیران. ئەمەش بەمەبەستی بەهێز کردنی پەیوەندی بەندەکان بە خوداوەو ئەنجامدانی عیبادەت‌و راگەیاندنی بەندایەتی کردن بۆ خودای بالاْ دەست‌و ریشە کێشکردنی هەموو بیرو بۆ چونێکی سەردەمی بتپەرستن‌و نەفامی لەدڵ‌و مێشکی موسوڵمانان دا.

هەروەها پێغەمبەر نەیتوانی لەبەرامبەر هەڵەی ئەو کابرایەدا بێ دەنگ بێ کەپێ ی گوت: (ماشاءالله وشئت) ئەوەی خودا بیەوێ‌و تۆبتەوێ. یەکسەر بەکابرای گوت: ئەوە منت کرد بەهاوشانی خودا؟! هەروەها جارێك کابرایەك وتاری دا لەوتارەکەی دا وتی: (من يطع الله ورسولة فقد رشد، ومن يعصهما فقد غوى) پێغەمبەر پێ ی فەرموو (بئس الخطيب أنت) بەراستی تۆ

وتار بێژێکی خراپی، نازانی قسە بکەی. لەبارودۆخی ئاوادا هەڵوێستی پێغەمبەرانەی پێغەمبەری دەردەکەوێو دەزاندرێ پێغەمبەران بەچی لەرابەرو پێشەواو پاشاو گەورە پیاوانی تر جیادەبنەوە، چەندە دورن لەرەوشتی خۆپەرستیو هەڵقۆزتنەوەی نابەجێو هەڵخەڵەتاندنی خەڵك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، رێگەدان بە هەواخواهانی مەدحو ثەنای بکەن لە سنوری سروشتی تێپەڕێنن،حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) پێشەوای پێغەمبەرانو سەرداری پێغەمبەرانە، قودوەی نموونەییو تەواوە بۆ رەوشتی بەرزو مرۆڤایەتی تەواو، بۆیە همیشە داوای یەکسانی ئادەمیزادی کردوەو دژی هەموو دیاردەیەك بووە کەسەر بکێشێ بۆ بەندایەتیکردنی بەندەکان بۆ یەکێکی وەك خۆیان. ئەوەتا روبەڕوی هاوەڵانی دەفەرموێ: (لاتطروني كما أطرت النصارى عيسى ابن مريم، فأنما أنا عبده، فقولوا: عبدالله ورسوله) زێدە رۆیی مەکەن لەپیا هەڵدانم وەکوو نەصرانییەکان زێدە رۆییان کردو عیسای کوڕی مەریەمیان گەیاندە پلەو پایەی خودایەتی. من بەندەی خودام، بڵێن بەندەی خوداو پێغەمبەری خودا.

## سادەییو خاکی پێغەمبەر درودی خودای لێ بێ:

خۆ بەکەم زانینو سادەیی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەژیان دا گەیشتبوە ئەوپەڕی سنور، هەرگیز حەزی لێ نەبوو لەهیچ شتێك دا لەهاوەڵانی جیا ببێتەوە، نەیدەویست کەس لەبەری هەڵسێ یان زێدە ڕۆیی لەمەدحو پیاهەڵدانی دا بکەن. زیاد لەئەندازە پلەو پایەی بەرز بکەنەوە بیگەیەننە ئاستی خودایەتی. وەکوو گەلو نەتەوە پێشینەکان کە بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان کردیان، زۆری پێ ناخۆش بوو کەلەپلەو پایەی بەندایەتیو پێغەمبەرێتی بەرزی بکەنەوە، ئەنەس دەڵێ: هیچ کەسێکمان

بەئەندازەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خۆش نەدەویست، هەرکاتێ بمان بینیایە لەبەری هەڵنەدەستاین چونکە دەمانزانی زۆری پێ ناخۆشە لەبەری هەڵسین. جارێك یەكێك بانگی لێ كرد (یاخیر البریە!) فەرمووی ئەوە من نیم ئەوە ئیبراهیمە سڵاوی خودای لێبێ.

لەعومەری كوڕی خەتتابەوە ریوایەتكراوە فەرمویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: زێدە رۆیی مەكەن لەمەدح و پەسنی من دا وەكوو نەصرانییەكان زێدە رۆییان كرد لەپەسنی عیسای كوڕی مەریەم دا، ئەمن بەندەیەكی خودام و ئادەمیزادم، بڵێن: بەندەی خوداو پێغەمبەری خودا.[٢٦٩] لەعەبوڵڵای كوڕی ئەبو ئەو فاوە ریوایەتكراوە دەڵێ: پێغەمبەری خودا قەت سڵی لەوە نەكردۆتەوە كەلەگەڵ كۆیلەدا بەرێگادا بڕوا، بەدەم كۆیلەو پیرە ژن و كۆستكەوتوان دا رۆیشتوە بۆ ئەوەی پێداویستی یەكانیان بۆ جێ بەجێ بكا. ئەنەس دەڵێ: هەر كارەكەرو ئەمەتەیەكی مەدینەیی بیویستایە دەیتوانی دەستی پێغەمبەر بگرێ و لەگەڵ خۆی دا بیبا بۆ جێ بەجێ كردنی كارەكەی. كاتێك عەدی كوڕی حاتەمی طائی هاتە مەدینە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بانگی كردە مەنزڵی خۆی كارەكە رێك پارچە بەڕەیەكی بۆ هەڵدا لەسەری دابنیشێ، ئەویش لەنێوان خۆی و عەدی دا رایخست و لەسەر زەوی دانیشت، عەدی دەڵێ: كە ئەوەم لێ بینی زانیم ئەو مەلیك و پاشا نیە. ئەنەس رەزای خودای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خودا سەردانی نەخۆشی دەكرد، ئامادەی كفن و دفنی تەرم دەبوو، سواری گوێدرێژ دەبوو، وەڵامی كۆیلەو بێ نەوایانی دەدایەوە.

---

[٢٦٩] رواه البخاری في كتاب الأنبیاء.

هەر ئەنەس ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەگەر داوەت بکرایە بۆ خواردنی نانی جۆو هەر پێخۆرێك کە بەکەڵکی خواردن بهاتایە دەچو بۆ داوەتەکە.[٢٧٠]

هەر لە پێغەمبەرە وە ریوایەتکراوە کە فەرموویەتی: من بەندەیەکم لە ئادەمیزاد وەکوو بەندە خواردن دەخۆم وەکوو بەندە دادەنیشم. عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەڵێ چوومە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەرینەکەی لەچەرمو ناواخنەکەی ریتاڵی توێکڵە داربوو بۆیان هێنا، پێغەمبەر لەسەر زەوی دانیشتو سەرینەکە کەوتە نێوانمانەوە.

پێغەمبەری خودا بەئاسایی ئیشی ناومالی دەکرد، حوشتری دەبەستەوە ئالفی دەدانێ، لەگەڵ خزمەتکارو کۆیلەدا نانی دەخوارد، هەویری لەگەڵ دەشێلان، لەبازاڕەوە کەلو پەلی دەکڕیو دیبردەوە.[٢٧١]

## ئازایەتیو دلێری پێغەمبەرو شەرمو شکۆی:

بڕی لەرەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رەوشتی ئازایەتی شەرمو حەیا بوو، زۆرێك لە خەڵك پێیان وایە (ئازایەتیو شەرم) دوو رەوشتی دژ بەیەکن، بەلاّم هەردوکیان لە پێغەمبەردا بەئەو پەڕی کە ماڵەوە کۆبو بونەوە.

دەربارەی حەیاو شەرمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ: پێغەمبەری خودا لەگەورە کچی ناو کەژاوە بەشەرمو شکۆتر بوو، ئەگەر شتێکی پێ ناخۆش بوایە لەدەمو چاوی دا دەمانزانی، شەرمو

---

[٢٧٠] رواه الترمذي في الشمائل في باب تواضع النبي.

[٢٧١] كتاب الشفاص/ ١٠١ رواية عن البخاري.

حەیاکەی بەجۆرێك بوو ڕووبەڕووی کەس ڕەخنەی نەدەگرت لەو شتەی دەیدزا. بەشێوەی ناڕاستەوخۆ ناڕەزامەندی خۆی لەو شتە دەردەبڕی.

ئەنەس دەڵێ: پیاوێك لای پێغەمبەر دانیشتبوو شوێنەواری زەردیی پێوە دیار بوو، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) عادەتی وابوو ڕاستەوخۆ ڕەخنەی لەشت نەدەگرت، کەتەشریفی هەڵسا بەخەڵکەکەی فەرموو: ئەگەر بەو کابرایە بڵێن: ئەو زەردی یە لابەرێ.

خاتو عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا ئەگەر بیزانیایە یەکێك ڕەوشتێکی نەگونجاوی هەیە، نەیدە فەرموو ئەوە بۆ فلانەکەس وایەو باوانەکا. بەڵکوو بە کۆ ناوی دەهێناو دەیفەرموو ئەوە چیە کەسانێك هەن وادەکەن یان وا دەڵێن . نەهی لەشتەکە دەکردو ناوی بکەرەکەی بەتایبەتی نەدەهێنا.

لەروی ئازایەتی و دلێریشەوە ئەوە شایەتیدانی عەلی، پاڵەوانی ناودارو مەردی مەیدانی بەسە کە دەڵێ: ئێمە هەرکاتێ تینمان بۆ دەهاتو شەڕ گەرم دەبوو لە لێواری مەرگ نزیك دەبووینەوە پێغەمبەرمان دەکردە پارێزەری خۆمان، هیچمان بەئەندازەی ئەو لەدوژمن نزیك نەدەبووینەوە، لەڕۆژی غەزای بەدردا، لەگەرمەی شەڕدا خۆمان دەخستە پەنای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو لە هەموانمان پتر لە دوژمن نزیك بوو.ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەری خودا جوانترین و شۆخ و شەنگترین ئادەمیزاد بوو، سەخی ترین کەس بوو ئازاترین ئادەمیزاد بوو، شەوێك دەنگ و باس بەناو مەدینەدا بڵاو بوەوە: کە گوایە دوژمن هێرشی هێناوەو ئابلوقەی دەوری شار دراوە، دانیشتوانی مەدینە ترسیان لێ هات، خەڵکە کە تاویان دایە چەك بەپیر هەواڵەکەوە چون، کەڕۆیشتن لەدەری مەدینە تووشی پێغەمبەر بوون (درودی خوای لەسەربێ) دەگەڕایەوە ئەو تەشریفی پێش ئەوان کەوتبوو، بەخەڵکەکەی

دەفەرموو: مەترسن مەترسن هیچ لەئارادا نیە، لەو کاتەدا ئەو سواری ئەسپێکی ئەبو طەلحە بوو زینی لەسەر پشت نەبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەسەرپەرشتی ئەو ئەسپەوە شمشێرێکی لەملی دابوو، ئەنەس دەڵێ: کەبینیم دەتگوت دەریایەو لەهەموو رویەکەوە مەردایەتی و ئازایەتی لێ دەتکا.[٢٧٢] ئەوەش چەسپاوە کە لەشەڕی ئوحودو لەشەڕی خونەین دا کاتێك جەنگاوەران دەوری پێغەمبەریان چۆڵ کردو بەتاقە سوارە مایەوە، بەورەیەکی بەرزەوە بەسواری هێسترەکەی دەجەنگاو دەیفەرموو: ئەمن پێغەمبەرم و هیچ درۆی تێدا نیە، من نەوەی (عبدالمطلب)م.. پێغەمبەری خودا وێڕای ئازایەتی مەردایەتی بێ وێنەی دڵنەرمو بەبەزەیی بوو، زوو فرمێسکی دەباراندن، بەزەیی بەبێ نەواو بێ هێزو لاوازدا دەهاتەوە، بەزەیی بەئاژەڵو ولاغ دا دەهات.

هەمیشە ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد لەگەڵیان دا بەرەحم بن و ئەرکی قورسیان نەخەنە سەر.

شەدادی کوڕی ئەوس دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: پەروەردگار چاکە کاری لە هەموو شتێك دا پێویست کردوە، هەرکاتێ ئاژەڵێکتان سەربڕی بەجوانی سەری بڕن، باهەریەکێ لە ئێوە کە حەیوان سەر دەبڕێ کێردەکەی تیژ بێ و کوشتنی یەکەی ئەزیەت نەدا.[٢٧٣] ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ). دەڵێ پیاوێك مەڕێکی پاڵ خستبوو بۆ سەر بڕینو لەو کاتەدا کێر دەکەی تیژ دەکردەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە چاوی بەو دیاردە کەوت، بەناڕازی بوونەوە بەکابرای فەرموو: ئەوە دەتەوێ دووجار ئەم بەستەزمانە سەربڕی؟

---

[٢٧٢] رواه البخاري في الأدب المفرد ص ٤٦ ورواه الشيخان في الصحيحين.

[٢٧٣] رواه مسلم في باب الأمر بأحسان الذبح كتاب الذبائح.

بۆچی پێش ئەوەی ئاژەڵەکە پاڵ بخەی کێردەکەت تیژ نەکرد؟ ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد بەرێك و پێکی وڵاغەکانیان ئالف و ئاوبدەن، لەکاتی خۆی داو بەشێوەی پێویست ئالیك و ئاویان بۆ دابین بکەن و زیاد لەئەندازە ماندویان نەکەن و ئەرکێکی وایان مەخەنە سەر کە نەتوانن لەژێریا خۆیان بگرن. ئاماژەشی بەوە کرد کە سوککردنی بارگرانی و لابردنی ناخۆشی لەسەریان دەبێتە هۆی دەستەبەر کردنی پاداش لای خودا.

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لەکاتێك دا پیاوێك بەرێگایەك دا دەڕۆیشت تینوایەتی تینی بۆ هێنا، بیرەئاوێکی دۆزییەوە چووە خوار بۆئەوەی ئاو بخواتەوە چاوی لێ بوو سەگێك لمبۆزی لەگڵ وەردەداو دەهاتو دەچوو لەتینوان هەراسانی لێ هەڵگیرابوو، پیاوەکە وتی: وادیارە ئەو سەگەش وەکوو من تینوایەتی تینی بۆ هێناوە، جارێکی تر چووە خوار بۆناو بیرەکەو پێڵاوەکەی پڕکرد لەئاوو بەدەم گرتی هێنایە سەرەوەو سەگەکەی ئاودا، پەروەردگار لەپاساوی ئەوەدا لێی خۆش بوو، هاوەڵان وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە لەهەڵس و کەوتمان لەگەڵ ئاژەڵیش دا پاداش وەردەگرین؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی بەڵێ لەچاکە کردن لەگڵ هەموو خاوەن جەرگ و دڵێکی تردا پاداش هەیە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتکراوە دەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئافرەتێك رۆژی قیامەت بەئاگرسزا دەدرێ لەسەر خراپەکردن لەگەڵ پشیلەیەك نەخۆراکی دایەو نەئاوی دایە. نەلێشی گەڕا بۆخۆی بڕوا لەم لاو لەولا مش ومۆڵێك بکاو بۆخۆی شتێك پەیدا بکا بیخوا.

لەسەهلی کوڕی عەمر (هەندێك دەڵێن: سەهلی کوڕی رەبیعی کوڕی عەمر) ریوایەتکراوە دەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلای حوشترێك دا تێپەڕی

لەبرسانا سکی بەپشتیەوە نووسا بوو، فەرمووی لەخودا بترسن دەربارەی ئەم ئاژەڵە بەستەزمانە بەشێوەی گونجاو باریان لێ بنێن سواریان بن، سەریان ببڕن.

لەعەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خودا چووە ناو شوراو زەوییەکی بەدیوار دەورە دراو، کە هی پیاوێکی ئەنصاری بوو، وشترێکی تێدابوو کە پێغەمبەری بینی کورکاندی و چاوی پڕ بوون لەئاو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چوو بەلایەوە فرمێسکەکانی سڕین و دەستی بەپشتی دا هێنا، ئیتر حوشترەکە ئارامی گرت. ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خاوەنی ئەم حوشترە کێیە؟ کوڕێکی ئەنصاری هات وتی: قوربان ئەمە حوشتری منە! پێغەمبەر فەرمووی: ئەوەبوو لەخودا ناترسن دەربارەی ئەم بەستەزمانانە کە خودا ژێرباری کردون بۆ ئێوە؟ ئەوەتا بەزمانی خۆی کەمن لێی حاڵی دەبم سکاڵای ئەوە دەکا. کەتۆ برسی و تینوی دەکەی. ئەبوهورەیرە دەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر سەفەرتان کرد لەکاتی وادا لەوەڕو گژوگیا زۆربوون ئەوە پەلە لەحوشترەکانتان مەکەن، مافی ئەوەیان بدەنێ کەبەشی خۆیان لەوەڕ بخۆن، ئەگەر کاتەکە قات و قڕی و زەوی بێ لەوەڕبوو بەپەلە قۆناغەکان ببڕن ئەگەر بۆ پشوودان ماندو حەسانەوەی خۆتان ولاغەکانتان لاتان دا لەسەر چەقی رێگا بارو بارگەنەمەخەن لەرێگاکە دوور بکەونەوە چونکە ئەوە رێڕەوی پیرۆیانەو جێگای حەوانەوەی جڕوجانەوەرە بەشەو.[٢٧٤]

لەئیبنو مەسعودەوە (رەزای خوای لێ بێ) ریوایەتکراوە دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین لەسەفەرێك دا، تەشریفی بۆکاری تایبەتی خۆی لێمان

---

[٢٧٤] رواه مسلم في باب مراعاة مصلحة الدواب.

دوور کەوتەوە، ئێمە باڵندە سورەیەکمان دی دوو جوچکی لەگەڵ دابوون گرتمانن ئیتر دایکەکەیان باڵی لێ فش بوو بوون لەتاوان نەیدەزانی چی بکا. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هاتەوە فەرمووی کێ بێچوەکانی گرتون‌و وای بەسەر ئەم بەستەزمانە هێناوە؟ خێرا جوچکەکانی بۆ بەرەڵابکەن. هەروا پێغەمبەر شارەمێروویێکی بینی ئاگرمان تێبەردابوو، فەرمووی: ئەوەکێ ئەم شارە مێروەی سوتاندوە؟ وتمان ئێمە ئەوکارەمان کردوە فەرمووی نابێ جگە لە خودا کەسی تر زیندەوەر بەئاگر سزا بدا.

هەروەها وەسیەتی کردوە دەربارەی خزمەتچی‌و کرێکار کە مافیان پێشێل نەکرێ، ئەوانیش ئادەمیزادن و مافیان بەسەر ئاغەکەیان‌و خاوەن ئیشەکەیانەوە هەیە، بێگومان موسوڵمانانی راسپارد چاکە لەگەڵ خزمەتکارو کۆیلەدا بکەن، جابیر دەڵێ پێغەمبەری خودا ڕاسپاردەی چاکەکاری کرد دەربارەی کۆیلە فەرمووی خۆتان پۆشاکیان بۆ دابین بکەن، مەخلووقاتی خودا سزامەدەن، بێگومان کۆیلەکان براتانن خودا خستونیە ژێر دەستی ئێوەوە، جا ئەگەر کەسێك براکەی لەژێر دەستی دا بوو باچی دەخوا ئەوەش دەرخواردی ئەو بدا، چی لەبەردەکا بالەوەش پۆشاك بۆئەو دابین بکا، زیاد لەتوانای خۆیان ئەرکیان مەخەنە سەر، خۆ ئەگەر ئەرکی قورستان خستنە ئەستۆ یارمەتیان بدەن.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتکراوە دەڵێ عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! رۆژانە چەند جار لەهەڵەی خزمەتکارەکەم خۆش ببم؟ فەرمووی حەفتار جار.

ئینو عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی عەرەقی ئیشکردنی وشك بێتەوە.

## پێشەوایەتیەکی نموونەیی و رابەرایەتیەکی گشتی:

کۆتایی ئەم باسە بەراگواستنی پارچە نوسراوێك دەهێنین لە کتێبی بەناو (الرسالة المحمدیة) هی مامۆستای زاناو بەناوبانگ لەبواری ژیاننامەی پێغەمبەردا سەیید سلێمانی نەدەوی لەو کتێبەدا ئەوەی سەلماندووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مامۆستاو رابەرە بۆ هەموو چینەکانی ئادەمیزاد، بەهەموو مەعنا شیاوی ئەوەیە کەرابەرو پێشەوای هەموو تاکەکانی ئادەمیزاد بێ جوداوازیی حوداوازی کارو کردەوەو بارودۆخ و دەورو بەرو زانستو زانیاریان لەهەموو کاتو شوێنێك و بۆهەموو چینو توێژێك.. ئەو مامۆستا بەناو بانگە دەڵێ:

ژیانی پێغەمبەری خودا زۆر لایەنی جیاجیای تێدا رەنگ دەدەنەوە، لەهەموو ئەو لایەنانەدا دەکرێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بکرێ بەرابەرو پێشەوای نموونەیی، هەڵسو کەوتی لەقۆناغە جیاجیاکانی ژیانی دا بکرێتە پەیرەوو پرۆگرام بۆ ژیانی ئادەمیزاد لەهەموو قۆناغەکانی دا. چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەرانسەری ژیانی دا چی رەوشتی بەرز هەیە، چی هەڵسو کەوتی جوانو دڵگیر هەیە چی سۆزو حەزی مامناوەندیو هیوای گەورەو شکۆدار هەیە هەمووی لەخۆگرتبوون. دەکرێ لەهەموو حاڵو وەزعێك دا بیکەیە رابەری خۆتو شوێنی کەویو چاوی لێ بکەی. ئەگەر دەوڵەمەندو بازرگانی ئەوە چاوی لێ بکە لەوکاتەدا کەتەشریفی بازرگانی دەکرد لەنێوان وڵاتی شامو حیجازدا. هەروا لەوکاتەدا کەمڵكو گەنجینەی بەحرەین کەوتە ژێردەستی. ئەگەر هەژارو نەبووی، ئەوە بڕوانە ئەوکاتەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەلەشیوەی ئەبو طالیب دا گەمارۆ درابوون، هەروەها ئەوکاتەی تەشریفی بە دەستی بەتاڵ کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەرچی پێی بڵێی ماڵی دونیا پێی نەبوو. ئەگەر

فەرمانڕەواو پاشای، هەڵس و کەوتەکانی ڕەچاو بکە لەورۆژگارەدا کەوڵاتی حیجازی کەوتە دەست و کەس نەبوو بتوانێ بەرهەڵستی بکا، هەموو سەرۆک خێڵ و پیاو ماقوڵەکانیان گوێ لەمستی بون، خۆ ئەگەر مسکێن و بۆرە پیاوی ئەوە سەیری هەڵس و کەوتی پێغەمبەر بکە لەو کاتەدا کە لەمەککە لەژێر دەسەڵاتی موشریکەکان دا بوو، ئەگەر سەرکەوتن و بالادەستیت بۆ دەستەبەربوو ئەوە چاو لە ڕەوشت و هەڵس و کەوتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بکە لەکاتی سەرکەوتنی بەسەر دوژمن دا لەشەڕی بەدرو حونەین و رزگار کردنی مەککەدا، ئەگەر تێشکانت بەسەرداهات خوانەخواستە، ئەوە چاو لە پێغەمبەر بکە لە رۆژی ئوحوددا، کەلەناو هاوەڵە شەهیدو بریندارەکانی دا بوو، ئەگەر مامۆستای مەکتەبی چاوی لێ بکە ئەو چۆن هاوەڵەکانی خۆی لەناو مزگەوت دا پەروەردە دەکرد، ئەگەر قوتابی و دەتەوێ فێربی حاڵەتی پێغەمبەر بێنە پێش چاوت کەلەبەردەم جوبرائیل دا دادەنیشت و دڵ و گوێی کلۆر دەکردن بۆ نیگا وەرگرتن، ئەگەر ئامۆژگاریکەرو وتاربێژی، ڕێ نیشاندەرو بانگخوازی، ئەوە گوێ بگرە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چۆن لەسەر مینبەری مزگەوت و کۆڕو مەجلیس دا ئامۆژگاری خەڵکی کردوە، ئەگەر دەتەوێ حەق بچەسپێنێ چاکە بڵاو بکەیەوە کەسێکی ناسراویش پاڵپشتت نەبوو، ئەوە چاو لە پێغەمبەر بکە کەلە مەککەدا بێ پشت و پەنا بانگەوازی بڵاو دەکردەوە کەس نەبوو بەهانەیەوە بێ، کەس نەبوو یارمەتی بدا، لەگەڵ ئەوەش دا لەبانگەوازی کۆڵی نەداو لەحەق بێژی بێ دەنگ نەبوو ئەگەر دوژمنت شکاندو بڕستت لێ بڕی و سەر ڕەقی ناحەزت نەواندو لەسەر دەستی تۆ حەق دەرکەوت و بەتاڵ پوچایەوە و کۆنترۆڵی وڵاتت کرد، چاو لە پێغەمبەر بکە: کە مەککەی رزگار کردو بتپەرستانی تێك شکاندن چەند هەڵوێستی مەردانەی نواند.

ئەگەر دەتەوێ ئیصلاحی ولات و کاروباری خۆت بکەی‌و بەسەر مەملەکەتی خۆت دا بالادەست بی بڕوانە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چۆن ملك و مالی خەیبەر و بەنو نەضیرو فەدەکی رەدام هێناو رێکی خست‌و سپاردی بە کەسانێك کەشیاوی بەخێو کردن‌و بەرێوە بردنی ئەم ملك‌و سامانە بن. ئەگەر هەتیوی و باوکت نەماوە، بڕوانە تاقانە جگەر گۆشەکەی ئامینەی کچی وەهەب و مێردەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب کە هەردوکیان یەك بەدو یەك دا مردن‌و تاقانەکەیان لەکاتی مردنی باوکی دا هێشتا لەرەحەمی دایکی دابوو لەکاتی مردنی دایکیشی دا منداڵ و بێ دەسەلات بوو. ئەگەر منداڵی‌و هێشتا پێ نەگەیشتووی بڕوانە ئەو منداڵە شیرە خۆرەی لای حەلیمەی سەعدییە، ئەگەر لەتەمەنی گەنجی و لاویدای ئەو چاو لە رەوشتی شوانە حوشتری مەککەی بکە کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایە. ئەگەر بازرگان‌و رێبواری بڕوانە سەرۆکی قافڵە کە دەچێ بۆ ولاتی (بصری) ئەگەر قازی‌و دادوەری چاو لە پێغەمبەر بکە لەو کاتەدا کەکێشەی قورەیشییەکانی دەربارەی دانانی بەردە ڕەشەکە حەل کرد نەیهێشت شەڕ لەنێوان قورەیشییەکان دا بەرپابێ و هەموشیان بەشداری دانانی بەردە رەشەکەیان کردو لەشوێنی خۆی دایان نا. ئەمجار جارێکی تر بەخۆتا بچۆرەوە و سەیری پێغەمبەر بکە کاتێك لەمزگەوتی مەدینە دا بەشێوەی دادوەرانە حوکمی دەکردو هیچ جوداوازی نەدەکرد لەنێوان هەژار و دەوڵەمەندا ناسیاو و نەناسیاودا ئەگەر مێردی و هاوسەرت هەیە بڕوانە ژیانی خێزانی پێغەمبەر چەند دڵسۆزو بەئەمەك وەفا بووە، ئەگەر باوکی بڕوانە هەڵس‌و کەوتی باوکی فاطیمەو باپیری حەسەن و حوسەین، چۆن باوکایەتی کردون. تۆ هەرچییەك هەبی لەهەر پلەو پایەیەکی دەسەلات و بەرپرسیارێی دابی، لەهەر بارودۆخێکی ژیان دابی، لەهەر حاڵ‌و وەزعێك دا

بی، ئەوە دەتوانی لەژیانی پێغەمبەر کەڵك وەرگری و بیکەیتە رابەرو پێشەوای خۆت، شوێنی بکەوی‌و چاو لەئەوبکەی بەختەوەری دونیاو قیامەت دەستەبەر بکەی. تاریکایی رێگەتی پێ رۆشن بکەیتەوە، خوارو خێچی کاروبارت راست بکەیتەوە بەهەدی و فەرموودەکانی، خۆت رۆشنبیر بکەی. دڵنیابە ژیاننامەی سەرداری پێغەمبەران گەنجینەی هەموو رەوشتێکی بەرزو رەهنومایی و تەعلیماتی بەرزو پیرۆزە بۆ هەموو ئادەمیزادو لەهەموو بوارەکانی ژیان دا. هەموو کەسێك دەتوانێ پێغەمبەر بکاتە رابەرو پێشەوای خۆی و چاوی لێ بکا، هەموو مرۆڤێك وێرای جوداوازییان لەبەرزی و نزمی ژیان دا لەزانیاری و نەزانی دا، لەرەوشتە جۆراو جۆرەکانیان دا دەتوانن کەڵك لەژیاننامەی پێغەمبەر وەربگرن، چونکە ژیاننامەی پێغەمبەر روناکییە بۆ کەسێك هەوڵی روناکی بدا، فەرموودەکانی چرای رۆشنن بۆ ئەوانەی بەشوێن هیدایەت دا وێڵن. ئامۆژگاری یەکانی رەهنومان بۆ ئەوانەی بیانەوێ رەهنومایان هەبێ.

## فەضڵو گەورەیی پێغەمبەرێتی موحەممەد بەسەر مرۆڤیەتی داو بەخشندەیی بۆ هەموو جیهان:

### ﷺ، راگەیاندنێکی بێ وێنە لەمێژووی پێغەمبەرایەتی‌و ئایینەکان دا:

پەروەردگار خیطابی خۆی ئاراستەی پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەد دەکاو دەفەرموێ: (وما أرسلناك إلا رحمه للعالمين) ئێمە کە تۆمان کردوە بە پێغەمبەر و رەوانەمان کردوی بۆ ئەوەیە ببیە رەحمەت بۆ هەموو عالەم.

لەراستی دا ئەمە راگەیاندنێکی بێ وێنە و تاقانەی رۆژگارە، لە قورئانی پیرۆزو هەمیشە زیندودا پەروەردگار لەوکتێبە نەمرەدا، کە بڕیاری داوە لەهەموو شوێنێك و کات و زەمانێك دا بخوێندرێتەوەو خوێنەرانی ملیۆنەها ملیۆن بن، پاراستن و بەردەوامبوونی پەیڕەوو پرۆگرامی پێغەمبەری راگەیاندووەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ سورة الحجر/٩.

بێگومان بەرفراوانی ئەم راگەیاندنە بەو رەهایی و بێ باکی یە، بەبێ دیاریکردنی سنوری مەکانی و ماوەی زەمانی لەو پانتایی یە گەورەیەدا وای کردووە ئەو راگەیاندنە تاقانەی رۆژگار بێ و خەرقی عادەتی کردبێ‌و پرۆگرامی هیچ پێغەمبەرێك ئەم پانتایی یە بەرفراوانە رەهایەی داگیر نەکردبێ، کەوابێ ناگونجێ ئادەمیزادی عاقڵ‌و تێگەیشتوو هەروا بەسەر سەرەکی وخێرایی بێ لێ وردبوونەوەو تێکگرین بەسەر ئەواراگەیاندنە یەزدانی یەدا رابرێ‌و بەسادەیی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ سورة الأنبياء/١٠٧. بخوێنیتەوە. بێگومان پانتایی زەمانی ئەو راگەیاندنە یەزدانییە هەموو قۆناغ‌و دەورە مێژوییەکانی دوای رەوانەکردنی پێغەمبەر لەخۆ دەگرێ، پانتایی مەکانیشی هەموو عالەم دەگرێتەوە، چونکە پەروەردگار لەراگەیاندنەکەیدا ئاماژەی بۆ جەزیرەی عەرەب یان بۆ رۆژهەلات یان بۆ خۆرئاوا یان بۆ فلان شارو فیسار ولات نەکرد. بەڵکو فەرمووی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾.

لە ڕاستیدا بەرفراوانی و رەهایی ئەم راگەیاندنە، گەورەیی و بەرزی‌و بەردەوامبوونی و نەمریی بەو شێوە شمولی‌و واقیعییە ئەوە دەخوازێ هەموو مێژوونوسانی جیهان و فەیلەسوف‌و داناو هەڵکەو تووەکانی ‌ـتی دا بەسەر سامی رابوەستن بەڵکوو پێویستە هەموو فکری

ئادەمیزادی بەلێبڕانەوە لەئاستی ئەم ڕاگەیاندنەدا هەڵوێستە بکاو بەخۆی دابچێتەوەو بۆ ماوەیەکی پێویست لەڕاستی و واقیعی ئەم ڕاگەیاندنە بکۆڵێتەوە، چونکە ئێمە تائێستا لەمێژووی هیچ ئایین و بیرو باوەڕێك دا، لەمێژووی هیچ ژیارو فەلسەفە و جم و جوڵی چاکسازی و شۆڕش و ڕاپەڕین و بانگەوازی یەکدا بەڵکوو لەمێژووی هەموو عالەم دا بەگشتی و لەکتێبخانەی ئادەمیزادی دا هەمووی، نمونەیەکی تری ئەم ڕاگەیاندنە خوداییەمان دەست نەکەوتووە ئاوا هەموو کەون بگرێتەوە و بۆ هەموو چینە کانی ئادەمیزادبێ و لەهەموو دەورە مێژووییەکان دا ڕۆڵی خۆی گێڕابێ. چ کەسایەتیەکی جیهانی لەکۆن و نوێدا ئەم شکۆمەندییەی بۆ دەستەبەر بووە؟ تەنانەت پوختەی تەعلیماتی پێغەمبەرانی ڕابوردو پوختەیەك لەئەحواڵ و بەسەرهات و ژیاننامەو ڕەوشتیان کە بەئێمە گەیشتووە، هیچیان نمونەیەکی لەم ڕاگەیاندنە تێدا بەدی ناکرێ. هیچ ئاینێك وەکوو ئایینی موحەممەد فەڕو خێرو بێرەکەی جیهانی نیەو هەموو عالەمی نەگرتۆتەوە.

ئەوەتا ئایینی یەهودی کەئایینێکی کۆن و بەناوبانگە، وا دەڕوانێتە خودا کە تەنیا خودای بەنوئیسرائیلیانەو پەروەردگاریانە بێگومان سیپارەکانی عەهدی قەدیم و نامە پیرۆزەکانی ئایینی لای یەهود بەهیچ جۆرێك واباسی خودا ناکەن کە خودای هەموو جیهان بێ یان خودای بونەوەربێ، بۆیە لێکۆڵینەوە لە ژیاننامەی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائلی وەکوو موساو هارون و دوادو سولەیمان بۆئەوەی جۆرێك لەو ڕاگەیاندنە جیهانییەی بۆ پێغەمبەری ئیسلام تۆمار کراوە بدۆزیەوە کارێکی بێهودەیە و خۆماندو کردنێکی بێ ئاکامەو کات بەفیڕۆ دانە، بێگومان ئەم ئایینەی بەنو ئیسرائیل لەهیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی تەمەنی دا پەیام و

ڕەحمــەتی یەکــسانی نــەبوە بــۆ هــەموو عالــەم‌و هــەموو ئادەمیزادەکــانی نەگرتۆتــەوە، هــەوڵی ئەوەنــەدراوە یــان تەشــجیعی ئــەو هەوڵدانــە نــەکراوە بانگەوازی بۆ ئایینی یەهودی لەدەرەوەی چوارچێوەی نەتەوەی ئیسرائیل ئەنجام بدرێ..

ئـایینی مەسـیحیش کەبـەوە ناسـراوە ئـایینی لـێ بـوردن‌و بانگـەوازیی یەکسانییەو پـڕە لەسـۆزو خۆشەویـستی بـۆ بـەرەی ئـادەمیزاد، ئـەوەتا لـە ئینجیل دا بەئاشکرا (هۆباڵ بەئەستۆی ئینجیلەکە خۆی) دان بـەوەدا دەنـێ: کەمەسیح فەرموویەتی من تەنها بۆ ئەوە نیردراوم چاودێری سەرلـێ شێواو و گومڕاکانی بەنوئیسرائیل بکەم‌و بەس.

کــاتێکیش ســـەرنجی عیـــسایان ڕاکێـــشا بــۆلای چـــەند نەخۆشــێك کەلەنەتـەوەی بـەنو ئیـسرائیل نـەبوون کەچـاریان بکـا بیـانووی هێنایـەوەو بەپیر داخوازیەکەیانەوە نەچوو. بەڵکو وتی: (إني لست ذلك الرجل الذي يعطي خبز الأولاد للكلاب)[٢٧٥] ئەمن ئەو کەسەنیم نانی منداڵەکانم بدەم بەسەگ.

ئایینــە ڕۆژهەڵاتییــەکان‌و ئایینــە ئاسـیاییەکانی تـر، بەتایبـەتی ئـایینی هیندۆکی، هیچ کامێ لەم ئایینانە جوداوازییان نیە لەگەڵ ئایینی یەهودی‌و مەسیحی، بەڵکو و لەروی نژاد پەرستی‌و تەفسیرکردنی بنەماڵەوە زۆر پێش ئـەو ئایینانـەش کـەوتبوون. جەماوەرەکـەی خۆیـان دابـەش کردبـوو بۆچـەند چـین‌و توێـژی جیاجیـای بـێ مانـاو سـتەمکاری. هـیچ نـەرم‌و نیانیــەکی سۆزدارانەیان تێدا بەدی نەدەکرا، چینی مـەنبوزو قێزەونـەکان لەکۆمـەڵگای هینـدی دا لــە هــەموو مــاف‌و ڕێزێــك بــێ بــەش بــوون هــیچ شــەرەف و

[٢٧٥] ئینجیل متی باب (١٥) ئایەتی/٢٤ و باب/١٠ ئایەتی/٦-٧ و باب/١٥ ئایەتی/٢٦.

سەروەرییەکیان نەبوو ئازادی و یەکسانی کەدوو مافی سەرەتایی مرۆڤن لەوان قەدەغە بوو، لەکەمترین بنەمای مرۆڤایەتی بێبەش کرابوون.. بۆیان نەبوو فێری خوێندن و نوسین بن، ئەگەر یەکێکیشیان بەدزییەوە فێری خوێندن بوبایە مافی ئەوەی نەبوو دەرس بڵێتەوە. هەروا بۆیان نەبوو ڕێ و ڕەسمە ئایینیەکان ئەنجام بدەن و لایەنی ڕۆحی خۆیان تێر بکەن، خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی (ویدا)و پێشکەشکردنی قوربانی و فۆتۆ بۆ بتەکان و خوداکانیان تایبەت بووە بەبراهیمەکانەوە و بەس. هەروەها تێفکرین و توێژینەوەی کتێبەکانی (ویدا) تایبەت بوو بەتاقمی (الشتری) و (الويش) کە دوو چینی کۆمەڵگای هیندی بوون. (منوشاشتر) دەڵێ: مەنبوذ و قێزەونەکان خودا تەنیا بۆیەك مەبەست دروستی کردون کە بریتیە لەخزمەتکردنی ئەوسێ چینەی کۆمەڵگا (بەراهیمە، شەترا، ویش) بێگومان دانیشتوانی هیندی ڕۆژگاری کۆن نەیاندەزانی لەپاش کێوی (هەمالایا) دونیایەکی تر هەبێ، پێیان وابوو کێوی (هەمالایا) کۆتایی سنوری جیهانە، هیچ پەیوەندییان بەجیهانی دەرەوە نەبوو، گەل و نەتەوەی تریان نەدەناسی، تەنانەت حەزیان لەوە نەبوو بزانن جیهانی دەرەوەیان چییەو چی نیە. بۆیە لێکۆڵینەوەو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی نمونەیەك لەو ڕاگەیاندنە جیهانی و گشتی یە کە لەپەیامی پێغەمبەری ئیسلام دا هەیە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ لەئایین و بیرو بۆچونی هیندییەکان دا کارێکی بێ هودەیە، هەروا هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی پێغەمبەرێك یان وەلی و خودا ناسیك کەرەحمەت بێ بۆ جیهان و مرۆڤایەتی لەئایین و بیرو باوەڕی تاقمێك دا کە بروایان بە (رب العالمين) نەبێ کات بەفیڕۆ دانەو نامەنطیقییە.

## نــرخو بــەهای ئەورەحمەتــەی هاوکــات بــوو لەگــەڵ ڕەوانەکردنی پێغەمبەر دا:

بێگومـان مەزەنـدەکردنی شـتێك و دانـانی لەشـوێنی گونجـاوی خـۆی پێویـستی بـەپێوەرو تـەرازوو یـەك هەیـە چەندییەت و چۆنیەتی ئـەو شـتە دیاری بکا. یەکەم چەندییەتی شتەکە ئەندازە و قەبارەکەی کە بەزاراوەی تازە پێی دەگوترێ Qyantity (الكمية) دووەم کاکڵەو ناوەڕۆکی ئەوشتە واتــە: چـۆنیەتی شـتەکە کەبـەزاراوەی تـازە پـێی دەگـوترێ: Quality (الكيفيـة) دەی ئـەو ڕاگەیاندنـەی قورئـانی پـیرۆز تۆمـاری کـردوە، هـەردوو پێوەرەکەی تێدایە، هەردوو لایەنەکەی لەخۆ گرتووە...

بێگومـان ڕەوانـەکردنی پێغەمبـەر و کەسـایەتی شـکۆداری‌و تەعلیماتـە بەرزو نـەمرەکانی پـیرۆزی‌و بەهرەیـەکی تـازەی لـەژیان‌و نـەش‌و نما بەسـەر مرۆڤایـەتی دا بەخشیوەتەوە. هۆکـاری ڕاسـتەو خـۆ بـوو بـۆ ڕزگـار بـوونی لەنەخۆشییە کۆمەڵایەتیەکانی‌و کردنەوەی گرێ کوێرەکانی‌و بـەکۆتا هـاتنی نەهامـەتی و مەینەتـەکانی‌و چارەسـەرکردنی ئـێش‌و ئازارەکـانی و بارانـدنی بـارانی ڕەحمـەت و فـەڕو بەرەکـەت‌و بەختـەوەری بەسـەر زەوی تینـووی بـێ ئاوی ڕوتەن‌و سوتەمەرۆدا، بەڵێ ئەم ڕەحمەت‌و بەخششانەی ڕەوانـەکردنی پێغەمبەری ئیسلام لەگەڵ خۆی هێنانی تاقانەو بێ وێنـەی ڕۆژگـار بـوون، چ لـەڕوی قـەبارەو پانتـایی‌و چـەندییەتەوە، چ لـەڕووی چـۆنیەت‌و سـوود بەخشی‌و ناوەڕۆکەوە بێ.

ڕەحمـەت وشـەیەکە بـەکارهێنانی لـەژیانی ڕۆژانـەمان دا زۆر و بـەربڵاوە، ڕەحمەت دەگوترێ: بۆ هەر شتێك سود بـەخش بـێ بـۆ ئـادەمیزاد و ڕاحـەتی گیـان‌و بـەدەنی پـێ ببەخـشێ. جۆرەکـانی ڕەحمـەت‌و بەشـەکانی، ئاسـت‌و پلەکانی لەئەژمار نایەن، یەکێك جامێك ئاوی سارد دەدا بەبرایەکی تینووی.

ڕەحمەتە، هەروا ڕەهنومایی کردنی ڕێبواری نابەڵەد بۆ ڕێگای مەبەست، وەگەڕ خستنی فێنککەرەوە لەکاتی گەرماو شوێنی گەرم دا، جۆرێکن لە ڕەحمەت، دایك کە سۆزی بۆ جگەر گۆشەکەی هەیە، باوك کەمنداڵەکەی پەروەردە دەکاو فێری خوێندن و بوارەکانی ژیانی دەکا، مامۆستا کە دەرس بەقوتابییەکانی دەڵێ و نووسین و خوێندنیان فێردەکاو نیعمەتی زانیارییان پێ دەبەخشێ، هەروەها پێشکەشکردنی خۆراك بۆ برسی و هەژار، ڕێزگرتن لەمیوان، دابینکردنی پۆشاك بۆ بێ نەواو هەژارو لێقەوماو بەهانا چوونی نەخۆش و دڵنەوایی کردنی، ئەمانە هەموو بەرەحمەت حسێب دەکرێن و جۆرو دیاردەی ئەو فەڕو بەرەکەتەن. هەرکەسێك بەشێوەیەك لەوشێوە هەڵسو کەوتە ڕەحمەت ئامێزانە لەگەڵمان جولایەوە شیاوی پێزانین و سوپاسەو جێی ڕێ.و قەدر زانییە.

وەلێ گەورەترین دیاردەی ڕەحمەت و جوانترین شێوە لەشێوە جوانەکانی و بەرزترین ئاستی، ئەوەیە یەکێك لەئێمە برای موسوڵمانی لەچنگی مردن ڕزگار بکا، دەبینی منداڵێکی بێ تاوان لەگیانەلاو دایە، خەریکە هەناسەی نەیەتەوە بەبەردا، دایکەکەی بەسەریەوە دەگریاو دونیای لەپێش چاو تاریك بووەو هیوا بڕاوە لەژیانی جگەر گۆشەکەی، هیچ دەراوی ڕون بەدی ناکا، باوکەکەی دێ و دەچێ پەلە قاژەیەتی و دڵتەنگ و خەفەتبارە فریادرەس و پزیشکێکی دەست ناکەوێ، ئالەم کاتە تەنگانەو حەرەجەدا پزیشکێك پەیدا دەبێ وەکوو فریشتە، بەهانایانەوە دەچێ و دەڵێ پێویست بە غەم و نارەحەتی ناکاو لەسەرە خۆ بن و مەترسن دەردی منداڵەکە ئاسانەو چارەسەری هەیە، خێرا چەند دڵۆپە دەرمانێك دەکاتە دەم و قوڕگی منداڵە نەخۆشەکەو دڵنەوایی باوك و دایکەکە دەکا، هێندەی پێ ناچێ منداڵەکە چاو هەڵدێنێ و دەکەوێتەوە حاڵی ئاسایی خۆی، دەی بڕوانە

ئەرێ حەق وانیە بەم پزیشکە بگوترێ: فریشتەی رەحمەت، خودا ناردویەتی بۆ رزگار کردنی ئەم منداڵە لەچنگی مردنو گێرانەوەی گیان بۆی؟ بێگومان هەموو جۆرەکانی رەحمەت کەلەو پێش ئاماژەمان پێ کردن، لە ئاست ئەم جۆرە رەحمەتەی پزیشکەکە بۆ ئەو خێزانەی هێنا بەکەم نمود و بێ بایەخ دەژمێردرێن و خۆیان نانوێنن، بەهانا چونی پزیشکەکە بەتەنیا رەحمەت نیە بۆ منداڵە نەخۆشەکە بەڵکوو منەتو رەحمەتە بۆ هەموو خێزانەکە!!

دەبینین کوێرێك بەگۆچانەکەیەوە بەرێگەیەك دا دەڕوا لەپێشیەوە چاڵێکی قوڵ هەیە، یان بیرێکی لەبەردەم دایە ئەگەر خێرا فریای نەکەوین چەند هەنگاوێکی تر بهاوێ بەرەو چاڵی هیلاکیو مردن دەچێ، لەوکاتەدا یەکێك لەبەندەکانی خودا رادەکاو پەلی دەگرێو ناهێڵێ بکەوێتە ناوچاڵو بیرەکەوە ئایا ئەم کابرایە فریشتەی رەحمەت نیە خودا بۆ ئەو کوێرەی نارد؟!

ئەوە گەنجێکی تازە پێگەیشتووە، فێنکایی چاوی باوكو دایکیەتی، کۆڵەکەی بژێوی ماڵو هەڵسوڕێنەری کاروباری خێزانە، دەبینی ئەوا ئەوکوڕە لەچەمێکی هەڵچوو لافاوو زریانێکی ترسناك دا واخەریکە بخنکێ، پەلەقاژەی رزگار بونیەتیو هیچی پێ ناکرێ، کوڕێکی ئازاو بەجەرگو لێزان خۆی بۆ فڕی دەداو دەستی دەیگاتێو کێشی دەکا بۆ کەنارو لەمردن رزگاری دەکا، ئیتر باوك و دایکی دێن کوڕی رزگار بویان لەئامێز دەگرنو بەخۆیانیەوە دەگوشنو هەرگیز چاکەو پیاوەتی ئەوکابرا فریاد رەسە لەبیر ناکەن، دەی باشە دیاردەی رەحمەتەکانی لەوەپێش باسمان کردن دەگەنە ئاستی ئەم رەحمەتە گەورەیە؟ حەق وانیە بەوکوڕە گیانبازە فریاد رەسە بگوترێ فریشتەی رەحمەت؟

## رەوانەکردنی حەزرەتی موحەممەد بووە هۆکاری رزگار کردنی ئادەمیزاد بەگشتی لەفەوتان وتێدا چون:

بەڵێ دیاردەی رەحمەت زۆرن و جۆراو جۆرن، هەموویان بەختەوەری بەئادەمیزاد دەبەخشن کۆسپەکانی سەر رێگای ژیانی بۆ تەخت دەکەن. وەلێ دوا دیاردە لەدیاردەکانی رەحمەت و سەرتۆپکی رەحمەتەکان هەموویان ئەوەیە پیاوێك هەموو مرۆڤایەتی لەفەوتان و چارە رەشی رزگار بکا، هەڵبەتە جوداوازی زۆریش هەیە لەنێوان فەوتانێك تافەوتانێکی تر، رزگارکردن لەخەتەرێك تاخەتەرێکی تر، ئەو بەهیلاکچون و خەتەرانەی لەوەپێش باسمان لێوە کردن بەهیلاکچون و خەتەریاتێکی سنوردار بوون، کاریگەریەکی ئەوتۆیان نەدەکردە سەر ئادەمیزاد بەگشتی، بەڵام هیلاکی خودانەناسی و بێدینی تێداچونێکی گشتی و هەتاهەتاییە. بۆیە رەحمەتی رەوانەکردنی پێغەمبەران بۆسەر ئادەمیزاد بەراورد ناکرێ بەورەحمەتانەی لەوەپێش ئاماژەمان پێ کردن، هەرچەندە ئەودیاردە رەحمەتانەش گەورەن و گرنگی خۆیان هەیە.

بێگومان لە بەردەممان دا دەریایەکی پان و پۆڕو شەپۆلاوی هەیە لەژیان، ئەو دەریایە هەرتاك و تەرا خەڵك قوت نادا بەڵکوو گەل و نەتەوەو وڵات دەهاوێتە ناو قورگی خۆیەوەو هەڵیان دەلوشێ، ژیار و شارەستانییەت رادەماڵێ، شەپۆلە سامناکەکانی تێکەوە دەهاوێ وەکوو دەمی تیمساحی هێرش هێنەر کەدەم دا دەپچڕێ و پەلامار دەدا، هەڵمەت دەباتە سەرکۆمەڵانی ئادەمیزاد وەکوو شێری ڕق هەڵساوی تێك شکێنەر! گیرو گرفتەکە لەوەدایە چۆن لە ئەم دەریا بێ ئامانە سامناکە بپەڕینەوە، چۆن خۆمان لەو دەریا پڕ مەترسی و پڕ جۆش و خرۆشە رزگار بکەین: کە هیچ بەزەیی و رەحمێکی نیە، چۆن بگەینە وشکانی ئارام و دابەزین؟ دەی

ئەو کەسەی ئادەمیزاد لەو تەنگ‌و چەڵەمەیە رزگار دەکا، کەشتی دەئاژوێ بەناو ئەو هەموو شەپۆلانەدا مرۆڤایەتی دەگەیەنێتە شوێنی ئارام‌و رزگاریان دەکا ئەوە خاوەنی فەضل‌و گەورەیی‌و منەتە بەسەر مرۆڤایەتی داو (رحمة للعالمين) خۆیەتی.

بێگومان چینی ئادەمیزاد سوپاسگوزارە بۆ ئەو زانایانەی زانیاری دەبەخشنە قوتابیان‌و بڵاوی دەکەنەوە، زانیاری کۆدەکەنەوە‌و لێکۆڵینەوەی تێدا دەکەن‌و ئاکامی باش بەدەست دەهێنن، سوپاسگوزارە بۆ هەموو ئەوانەی ڕێگای ژیان خۆشدەکەن‌و هۆکاری بەختەوەری‌و هەرزانی دەرەخسێنن، کۆسپەکانی سەر ڕێگای ژیان لادەبەن‌وخۆیان دەخەنە ناو شیوو دۆڵی ژیانەوە‌و خزمەت بەمرۆڤایەتی دەکەن، هەڵبەتە ئەوانە هەموویان جێگای ڕێزن‌و پیاوەتییان بەسەر ئادەمیزادەوە لەبەرچاوەو فەضل‌و ئەمەکیان پاشگوێ ناخرێ. وەلێ قەضیەی گەورەی ئادەمیزادو گیرو گرفتە سەرەکییەکانی بریتییە لەوەی چۆن خۆی لەو دوژمنەکانی رزگار بکا؟ چۆن خۆی لەدەستی ئەو ناحەزانە بپارێزێ کە هەمیشە بۆی لەکەلێن دان‌و لەهەموو لایەکەوە دەوریان داوە، چۆن ئەو کەشتی یە بگەیەنێتە کەناری ئارام‌و خۆی‌و هاوەڵانی ڕزگار بکا.

ئەو شەپۆلە سامناکانە چین‌و ئەونە هەنگە ترسناک‌و شەڕانیانە چین؟ بێگومان مەبەست پێیان نەفامییە بەرامبەر بەخودای بونەوەر بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و نەناسینی خوداو صیفاتە بەرزەکانی‌و ناوە جوانەکانی و مل لێنان لەهاوەڵدانان‌و بتپەرستی‌و شوێنکەوتنی بیرو باوەڕی پوچ‌و بەتاڵ‌و خەیاڵپلاو، بێگومان ئەوە گێلی و نەفامی‌و خۆ لەبیر چوونەوە‌و لەخوا غافڵبوونە.

ئەوە بەندایەتیکردنی مادەو ورگە، سنورشکێنیو دەست درێژ یکردنە بۆ سەر بەها پیرۆزەکانو موقەدەساتو گوێڕایەڵی بۆ نەفسی ئەممارەو هەڵاتن لەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانو سوربوونە لەسەر بەدەستهێنانی بەشو باری مادیو شتی پڕو پوچی دونیایی.

بێگومان گەورەترین خەتەر لەسەر مرۆڤایەتی ئەوەیە بناغەکەی لەسەر بۆش بنیات نرابێ، یان بەردو بلوكو خشتی بناغەکەی لەشوێنی خۆی جولابێ، ئادەمیزاد نرخی خۆی نەزانێو گرنگی خۆی لەدەست بداو نەزانێ بۆ چی هاتۆتە ژیانەوەو ئەرکی سەرشانی چیەو چی پێویستە لەسەری. زۆر خەتەرو سامناکە ئینسان وابزانێ خۆی گورگێکە دڕندە، یان مارێکی زیانەخرۆیە، ئەو کاتەی ئادەمیزاد ئەم حەقیقەتو راستی یە گەورانەی لێ هون بونو لێیان بێ ئاگا بوو، دەریای ژیانی لێ دەبێتە چاڵی ئاگرو گڕو لرفەی سوتێنەرو فەوتێنەر، ئادەمیزاد چنگ لە خوێنی برای خۆی دێنێو دەیەوێ تێکی بشکێنێو بی پروێنێ، ئەو کاتە ئادەمیزاد خۆی مارو دوپشكو گورگو پڵنگە بۆ قەلاچۆکردنی یەکتری، بەڵکوو ئادەمیزاد دەبێتە گەورەترین دوژمنی خۆیو گورگو دڕندە بەقولە قاپی راناگەن، دەبێتە شەیتانێکی سەرکەشو شەیاتینی شەرمی لێ دەکەن. ئەو کاتە ئادەمیزاد بەدەستی خۆی خۆی دەسوتێنێو خۆی داخ دەکا، پێویست بەوە ناکا لەدەرەوە فەوتێنەر بۆ خۆی بێنێ..

لەم کاتو ساتە ترسناكو تاریکە شەوو تەنگو چەڵەمەیەدا بایەکی رەحمەت هەڵبکا ئێسكو پروسکی رزیوو سوتاوی ئادەمیزاد گیانیان وەبەر بێتەوەو سەر لەنوێ ئادەمیزاد ببوژێتەوە کەشتییەوانو دەریاوانی زیرەكو دڵسۆزی بۆ پەیدا ببێو لەنەبوو بیهێننەوە گۆڕەپانی ژیانو بەختەوەری هەردو جیهانی بۆ دەستە بەربکەنەوە. بێگومان ئەوە نموونەی کاری پێغەمبەرانەو شێوەی بەهاناهاتنیانە بۆ مرۆڤایەتی.

## ئەرکی پێغەمبەرایەتیو ڕۆڵی لەرزگارکردنو دەستەبەرکردنی بەختەوەریو چۆنیەتی کاری پێغەمبەران:

دەتوانین بۆ ڕونکردنەوەی ئەرکی پێغەمبەرایەتی و طەبیعەتی کاری ئەو زاتە پیرۆزانە نمونەیەك بینینەوە، لەروانگەی ئەو نموونەوە ئەرکی پێغەمبەرێتی دیاری بکەینو بزانین چ ئەرکێکی پیرۆزیان لەئەستۆ بووە!!

دەگێڕنەوە دەڵێن: دەستەیەك لەقوتابی خوێندنگایەك بۆ گەشتو سەیران سواری کەشتی یەك دەبنو دەیانەوێ ماوەیەك بەدەریادا بگەڕێنو بای باڵی خۆیان بدەن، یان بپەڕنەوە بۆ کەنارێکی ئارامو ماوەیەك پشوو بدەن. هەموو بەکەیفو خۆشی دەکەونەڕێو دەیانەوێ بۆ خۆشیو کات بەسەر بردن ماوەیەك قسە لەگەڵ کەشتییەوانی نەخوێندەواردا بکەنو پێی رابوێرن، وا دەزانن رابواردن بەو پیاوە نەخوێندەوارە باشترین هەلە بۆ کات بەسەر بردنو پێکەنین، قوتابیەکی زیرەکیان دەڵێ مامەی کەشتی یەوان لەکام لەزانیاری یەکانی سەردەم دا پسپۆڕیو چ زانیاریەك باش دەزانی؟ کەشتی یەوان لەسەرە خۆ دەڵێ کوڕی خۆم لەهیچ زانیاری یەك دا پسپۆڕیم نیە، دەڵێ چۆن مامە گیان زانیاری تەبیعەتت نەخوێندوە؟ دەڵێ هەر ناویشم نەبیستووە!!

یەکێکی تریان هەڵدەداتێو دەڵێ: بەڵام دڵنیام لێکۆڵینەوەت لە ئەقلیدیسو جەبرو مقابەلەدا کردوەو زۆرت لەو بارەوە خوێندۆتەوە. دەڵێ لەراستی دا ئەمە یەکەمجارە ئەم ناوانە ببیستمو ئەم زاراوانە بکەونە بەر گوێم هەتا خودا حەزبکا ئەوەندە لێیان نامۆم.

سێیەمیان روی تێ دەکاو دەڵێ من دڵنیام مامە گیان! تۆ لە زانیاری جوگرافیو مێژوودا زۆرت خوێندۆتەوەو شارەزای تێیان دا، کەشتی یەوان دەڵێ: ئایا جوگرافیو مێژوو ناوی دوشارن یان دو پیاوو کەسایەتی؟! ئیتر

قوتابیەکان خۆیان پێ ناگیرێو لەقاقای پێکەنین دەدەنو دەڵێن: مامە گیان زەحمەت نەبێ تەمەنت چەندە؟ دەڵێ‌تەمەنم لەچلەکان دایەو وابەرەو تەمەنی پەنجا ساڵی هەنگاو دەنێم. قوتابیەکان دەڵێن: بەخودا مامە گیان نیوەی تەمەنی خۆت بەباداوەو بێهودە بەسەرت بردوە، کابرای کەشتی یەوان بەپێنا خۆشبوونەوە بێ دەنگ دەبێو چاوەڕوان دەبێ هەلی بۆ هەڵبکەوێو تۆڵەی ئەم گاڵتە پێکردنە لەقوتابیەکان بکاتەوە.

هێندەی پێ ناچێ و زۆر نابا دەریا دێتە جۆشو خرۆشو شەپۆلەکانی تێکەوە دەهاونو کەشتی دەکەوێتە هەڵبەزو دابەزو ترس پەیدا دەبێو شەپۆلەکان وەکوو نەهەنگو ئەژدیها دەم دا دەپچڕن ها ئێستا نائێستا کەشتی یەکە قوت بدەن، قوتابیەکان یەکەمجار یانە بەناو دەریادا سواری کەشتی ببنو ئەزمونی ئاوایان توش ببێ مەرگ بەچاوی خۆیان دەبیننو ترس دایان دەگرێ، ئیتر کابرای کەشتی یەوانی نەخوێندەوار هەلی بۆ هەڵدەکەوێو لەسەرەخۆو بەئەسپایی رودەکاتە کۆمەڵە قوتابیەکانو پێیان دەڵێ: ئەرێ برادەرینە! ئەو زانیاریانەی ئێوە خوێندوتانن چین؟ قوتابیەکان لیستێکی دوورودرێژ لەوزانیاریانەی خوێندویانن بۆ مامەی کەشتی یەوان ئەژمار دەکەن، ئەو عیلمو ئەدەبەی لەکۆلێژو زانکۆکان دا خوێندویاننو توێژینەوەیان تێدا کردون بەگوێی مامەی کەشتییە وانیدا دەدەن، بەبێ ئەوەی بزانن مەبەستی مامەیان چی یەو چی نیە. جاکە لە ئەژمارکردنی زانیارییەکان دەبنەوە، لەسەرەخۆ دەڵێ: کاکینە! بەراستی زۆرتان زانیاری خوێندونو زۆر ماندو بوون. وەڵێ من پرسیارێکم هەیە ئایا ئێوە زانیاری مەلەوانیتان خوێندوە یا نا؟؟ ئایا ئەگەر خودا نەخواستە کەشتی یەکەمان نزیك بە نقوم بوون بووە، ئێوە چۆن مەلە دەکەنو خۆتان دەگەیەننە کەناری دەریاو شوێنی ئارامو خۆر رزگار دەکەن؟ وتیان: وەڵڵاهی مامەی کەشتی یە

وان مەلەوانی تاکە زانیارییە: کە ئێمە نایزانین و بەداخەوەهیچ گرنگیمان پێ نەداوەو لەکیسمان چووە. ئیتر مامەی کەشتی یە وان کەوتە پێکەنین و روی کردە قوتابیەکان وتی: ئەگەر من نیوەی تەمەنم بەبادابێ و بە بێهودە رۆیشتبێ ئەوە ئێوە هەموو تەمەنی خۆتان بە بێهودە بەسەر بردوە، چونکە ئەو عیلم و زانیاریانەی ئێوە خوێندوتانە لەناو ئەم دەریایەدا بەکەڵکی هیچتان نایەو سودی لێ نابینن، زانیاری تەنیا کەلەم حاڵەدا فریاتان دەکەوێ زانینی مەلەوانییە کە هیچی لێ نازانن[٢٧٦] ئائەمەیە ئەرکی پێغەمبەرایەتی و ڕۆڵی پێغەمبەران لەرزگار کردنی مرۆڤایەتی: کەلەسەر لێواری دەریایەو بەرەو خنکان و فەوتان هەنگاو دەنێ، ئەوە، ئەوە سروشتی کرداری پێغەمبەرانە بەوە پێغەمبەران لەمامۆستاو زانایان جیا دەبنەوە، رەهنومایی و ئامۆژگاری ئەوان جودا وازە لە هەموو جۆرەکانی پەروەردەو فێرکردن و راهێنان، ئەوان چینی ئادەمیزاد فێری زانیاری رزگار بون دەکەن لەتەنگانەو خەتەریات. پەیامەکەیان کەشتی رزگاریە.

بێگومان مێژووی ئادەمیزاد گەواهی ئەوە دەدا: کە هەرکاتێ گەمێ ی ژیان بەهۆی داوەشان و گەنینی ئەخلاقی مرۆڤەوە نقوم بێ، کردەوە خراپەکانی ئادەمیزاد ببنە فاکتەرێکی بەهێز بۆ لەناو چوونی رەچەڵەکی خودی ئادەمیزاد، ئەوە هەر خودی ئادەمیزادەکان تێدا ناچن، بەڵکوو هەموو ئادەمیزاد سەر لەبەرو بەهەموو ژیارو شارەستانی و بەرهەمی فیکری و بەرهەمی زانستی و فەلسەفی یەوە، بەهەموو بەرهەمی شیعرو ئەدەبیات و هەمووجۆرەکانی زانستی یەوە لە ناو دەچێ و هیچی نامێنێ، بێگومان ئەم کەشتی یە فرە نەتەوەی ئادەمیزاد کە نقوم دەبێ و تێدا دەچێ لەبەر ئەوە نیە لەبواری ئەدەب دا پاشە کشەی کردوە، یان خوێندنگای

---

[٢٧٦] ئەم چیرۆکە لە کتێبی (النبوة والأنبياء في ضوء القرآن)ی دانەر وەرگیراوە.

کەمن یان زانکۆو کۆلێژو خوێندنی بالآی نیە، یان لەباری ئابوری و ئاستی بژیودا کەمتەرخەمە، بەڵکوو هۆکاری نقوم بوونی کەشتی یەکە ئادەمیزاد خۆیەتی، ئادەمیزاد بۆ خۆی خۆی ئامادە کردوە بۆ خۆ کوژی و بووەتە قوڵنگی روخێنەر بۆ ئەو باڵەخانەی خۆی و کالآو خاوو خێزانی تێیدایە، مێژوو ئەوەمان بۆ رون دەکاتەوە: کە فکرو هزری ئادەمیزاد زۆر جار دوچاری تەوژمی هەڵبەزو دابەز بووەو پاڵی پێوە نراوە بۆ ئەوەی لەجیاتی ئاوەدانکردنەوەو بینا کردن روبکاتە روخاندن و قەلآ چۆکردن، ئەوەتا بەداخەوە بەچاوی خۆمان بەسەر سامی و دەهشەتەوە بەواقی و وڕماوەوە دەبینین ئەدەمیزاد بنەمای خۆی دەڕوخێنێ و بەجەختەوە هەموو هێزو تواناکانی خۆیان خستۆتە گەڕ بۆ روخاندنی ئەو بناغە شکۆدارەی کە باڵەخانەی ژیارو فکری خۆی لەسەر بنیات ناوە، بەهەموو شێوەیەك بەردەوام خەریکە شێتانە ڕەچەڵەکی خۆی دەبڕێتەوە، زۆر دڵخۆشە بەوڕوخاندن و قەلآ چۆکردنە، وادەزانێ خزمەتێکی گەورە پێشکەش بەئادەمیزاد دەکاو شکۆمەندی و سەروەری بەدەست دێنێ، بەئیلحاح و حەماسەوە خۆی خستۆتە سەنگەری مردنەوەو لەژیان وەڕزەو ئارەزوی مردنی هەیە، لای وایە ژیان دۆزەخەو تێدا چون بەهەشتی رازاوەیە.

## وێنە گرتنی سەردەمی نەفامی و خۆئامادەکردنی بۆ خۆ کوژی:

ئەو وێنە کێشانەی ئاماژەی پێ کرا وێنەی ئەو بارودۆخە بوو: کە مرۆڤایەتی و جیهان لەسەدەی شەشەمی زایینی دا پێ یدا تێپەڕی و تێ یدا دەخولآیەوە، ئێمە کە سەیری مێژوو دەکەین و لەدیاردەکانی ئەو کاتە ورد دەبینەوە دەبینین کۆمەڵگای ئادەمیزاد ئامادەباشی یەکی باشی هەبوە بۆ

(إنتحار) و خۆکوژی ، نەك هەر ئامادەباشی و رازی بوونی بۆ خۆ کوژی هەبوە، بەڵکوو بەحەماسەوە بە لێبڕان و سووربوونەوە بەرەو خۆکوژی بەکۆمەڵی هەنگاوی ناوە وەك ئەوە بڵێی سوێندی خواردبێ یان لەسەر خۆی نەذری کردبێ کە (إنتحار) بکاو بیەوێ سوێندەکەی نەخاو نەزرەکەی بەجێ بێنێ. قورئانی پیرۆز زۆر جوان دیمەنی ئەو رۆژگارەی ئادەمیزادی کێشاوەو لە کتێبی نەمردا تۆمارکراوە هیچ وێنەگرو وێنە کێش و نووسەرو شاعیرو رۆمان نووس و مێژوو نوسێك ناتوانێ ئاوا وێنەی ئەو رۆژگارە بەو شێوە کورت و رەوانبێژی و فەصاحەتە رابنوێنێ، دەفەرموێ: ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ سورة آل عمران/١٠٣. ئەی موسوڵمانەکان! ئێوە یادی نیعمەتی خودا بکەن بەسەرتانەوە، کە لەوەپێش ئێوە دوژمنی یەکتری بوون، خودا بەفەضلی خۆی یەکیەتی و برایەتی و تەبایی خستە ناوتانەوە، ئێوە لەناو خۆتان دا دژایەتی یەکتریتان دەکردو پەرتەوازەو بێ سەروبەر بوون، ئەم ئەوی دەچەوساندەوە و ئەو ئەمی دەکوشت وەلێ بەهۆی نیعمەتی خوداوە کە ئایینی ئیسلامە هەمووتان بوون بەبرای گیانی بەگیانی یەکتری، تەبایی و خۆشەویستی لەناوتان دا بڵاو بۆوە، ئێوە بەهۆی خودا ناسی و جەهل و نەفامییەوە لەسەر لێواری چاڵە ئاگرێکی سوتماك بوون، خەریك بوو تێدا بچن، پەروەردگار لەو ئاگرە رزگاری کردن لەفەوتان و لەناوچوون قورتاربوون..

خودا رەحم بەمێژوو نوسان بکا، بێگومان ئەوان نەیانتوانیوە بەتەواوی لەگەڵ گێڕانەوەی سەرگوشتەی رەوانەکردنی پێغەمبەر وێنەیەکی راستەقینەی سەردەمی نەزانیمان بۆ بکێشن داواکاریی خودا پاداشیان

بداتەوە، رەنگە ئەوان عوزریان هەبێ چونکە ذەخیرە ئەدەبو زمانەوانییان لە ئاستێك دا نەبووە کە بتوانن وەکوو پێویست وێنەی رۆژگاری پێش هاتنی ئیسلام بکێشێ، جگە لەوەش بارودۆخەکە هێندە ترسناكو چەواشەو پڕگوێو گوڵ بووە نەتوانراوە بەنووکی قەڵەم وێنە بکرێ، بەڵکوو دەتوانین بڵێین: وێنەکێشانی بارودۆخەکەی پێش ئیسلام لەتوانای ئادەمیزادی ئاسایی دا نەبوە هەرچەندە توانای بەیانیو دەسەلاتی زمانەوانی بالاّ بووبێ.

دەی بابزانین ئاخۆ سەردەمی نەفامی وە ئەو رۆژگارەی حەزرەتی موحەممەدی تێدا کرا بە پێغەمبەرو رەوانە کرا، کێشەکە تێکروخانی کۆمەلاّیەتیو دابەزینی رەوشت بوو یان قەضیەکە بتپەرستی بوو یان خواردنەوەی عەرەقو بلاّو بوونەوەی دیاردەی قومارو خۆ خەریك کردن بەکاری بێهودە بوو، یابلاّوبوونەوەی ستەمو چەوساندنەوە بوو، یان کێشەکە بریتی بوو لەناڕێك و پێکی یاساکانی ئابووریو سەر رەقی فەرمانڕەوا نەزانەکان؟ یان قەضییەکە زیندە بەچاڵکردنی کچ بوو؟ نەخێر کێشەکە هەموو ئەوانەو زیاتریش بوون، بەڵکوو کێشەکە زیندە بەچاڵکردنی مرۆڤایەتی بوو لەهەموو روویەکەوە.

بێگومان ئەو ڕۆژگارە بەسەر چوو، ئەو چینەی ئادەمیزاد ژیانیان بەسەر بردو نەمان، ئەو دیمەنە سامناکە لە پێش چاو نەماوە، هەر ئەوەندەیە لەمێژوودا کەم تا کورتێکی تۆمار کراوەو دەیخوێنێتەوەو دەیبیسین (شنیدن کی بود ماننده دیده) کەی بیستن وەکوو دیتن وایە. دەی بە چ شێوەیەك ئێمە دەتوانین ئەو ڕۆژگارە وێنە بگرینو بیهێنینەوە بەرچاوی خۆمانو هەستی پێ بکەین؟! بێگومان ئەوە ڕۆژگارێك بوو بەسەر چوو تازە نایەتەوەو ژێر کۆنترۆڵی هەستەکانی مرۆڤ، بڵێین ئەوە سەردەمی نەفامی

بوو، کەسێك بەتەواوی هەستی پێ دەکاو تێی دەگا کە تێیدا ژیابێ و بەو ئاگرە داخ کرابێ ئەگەر وێنە کێش و فەننانێك بیەوێ وێنەی ئەو ڕۆژگارە بکێشێ دەتوانێ بەخەیاڵ مرۆڤایەتی لە وێنەی ئادەمیزادێکی زۆر شۆخ و شەنگ دا کەبێ عەیب و جوان هەندام بێ، ئادەمیزادێك کە نموونەی جوانی و دەست ڕەنگینی پەروەردگار بێ، هیچ کەم و کورتیەکی تێدا بەدی نەکرێ، ئادەمیزادێك فریشتە حەسوودی پێ بەرێ و ئەوپەڕی پلەی کە ماڵی وەرگرتبێ، ئادەمیزادێك خودا تاجی جێ نشینی خۆی لەسەر زەوی پێ بەخشیبێ و جوانی بونەوەری پێ بەخشرابێ، کاکڵەی حەقیقەت و عیرفان بێ، بەهۆی ئەوەوە زەوی وێران و سوتەمەڕۆ بووەتە باغی ڕازاوەی دڵڕفێن و باخچەی بۆ نخۆشی سەر سوڕهێنەر، ئەمجار بێنێ ئەم ئادەمیزادە وا وێنە بکێشێ کەلەخت و خۆڕایی دەیەوێ خۆ فڕێ بداتە ناو چاڵە ئاگرێکی سوتماکی سامناك کە بڵێسەی ئاگرەکەی بەرز بۆتەوەو لرفە لرفی دێ و دارو بەرد دەپڕوێنێ وای نیشان بدا کە گوڕی داوەتە خۆی و بازی داوەو قاچی لەزەوی بڕاون و بەفیعلی بەحەواوە یەو هائێستا نائێستا چرکەیەکی تر دەکەوێتە ناو ئەو جەحەندەمە پڕ گڕو دوکەڵە سامناك و زندە قبەرە، تاریکایی مردن و سوتان و لەناو چون لەخۆ دەگرێ،، لەوانەیە ئەم وێنە کێشانە ئەگەر ئەنجام بدرێ، بڕێ لەلایەنەکانی سەردەمی نەفامی و ڕۆژگاری پێش ناردنی پێغەمبەر دەربخا. قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو ڕاستی یە کردوە، بەشێوەیەکی کورتبڕو سەر ئاسا وێنەی مرۆڤایەتی و هەنگاو نانی بەرەو نەمان وێنە کێش کردوە، دەفەرموێ: ( وكنتم على شفا حفرة من النار فأنقذكم منها) هەر ئەم دەقە قورئانی یەیە کە پێغەمبەری خودا بەشێوەیەکی بەلیغ و سەرنج ڕاکێش شەرحی دەکاو دەفەرموێ: (مثلي كمثل رجل استوقد نارا فلما أضاءت من حوله جعل الفراش وهذه الدواب التي تقع

في النار يقعن فيها وجعل يحجزهن ويغلبنه، فيقتحمن فيها فأنا آخذ بحجزكم عن النار وأنتم تقحمون فيها، وقال في آخرها: فذلك مثلي ومثلكم أنا آخذ بحجزكم عن النار هلم عن النار فيغلبوني و وتقتحمون فيها) بێگومان هەمیشەو هەر لەکۆنەوە قەضیەی گەورەو سەرەکی لەم چیرۆکەدا هەمووی ئەوەیە کەشتی مرۆڤایەتی بەسەلامەتی و بێ وەی بگاتە کەناری ئارامو لەخەتەر رزگاری ببێ، چونکە ئەو دەمەی ژیانی ئادەمیزاد بەشێوەیەکی عەقلانی پەیڕەو بکرێو سروشتی مام ناوەندی بێ باری ئابووری‌و رێك‌و پێك بێ و سود لە ژیان وەربگرێ. کەوابێ ئەو هەموو پرۆژە بیناسازی و گەشە خوازی‌و ئەدەبی و زانستی و فەننی یانەی مرۆڤ دۆستان هەوڵی بۆ دەدەن‌و شەونخونی بۆ دەکەن بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادەو بۆ ئەوەیە کەمێك بەختەوەری بۆ دەستە بەربێ، لەخەتەر دوورکەوێتەوە. لێرەوە بەراشکاوی دەتوانین بڵێین. مرۆڤایەتی هەمووی، قەرزداری پێغەمبەرانە (درودی خوایان لەسەربێ).

چونکە ئەوان مرۆڤایەتییان لەو خەتەرانەی دەورەیان دابوو رزگار کرد، ئادەمیزادیان رزگار کرد لەخەتەرێکی وەها کە وەکوو شمشێری دوژمن بەسەر سەرییەوە بووهەرگیزاو هەرگیز مرۆڤایەتی لەمنەت‌و فەضل‌و پیاوەتی پێغەمبەران دەرناچێ، هیچ قوتابخانەیەکی فیکری یا فەلسەفی نیە، کەلایەنە باشەکانی لەپەیامی پێغەمبەران وەرنەگیرابێ، تەنانەت جیهانی سەردەم، ئێستا قەرزار باری پەیامی پێغەمبەرانەو ئەم بەردەوامبوون‌و مانەوەی لە ژیان دا کاریگەری پەیامی ئەوانی بەسەرەوەیە، چونکە ئادەمیزاد زۆر جار بەزوبانی حاڵ دانی بەوە داناوە کە مافی مانەوەی لەسەر زەوی لەدەست داوەو ئێستا هیچ جۆرە رەحمەت‌و فەڕو بەرەکەت و فەیض‌و سودو قازانجێکی نەماوە، هیچ پەیامێکی باشی بۆ مرۆڤایەتی پێ نیە، بێگومان دەتوانین بڵێین: ئادەمیزاد داوای لەسەر خودی

خۆی لەدادگای خودایی دا تۆمار کردوە، بۆ خۆشی شایەتە دژی خۆی، دوسیەی دادگایی یەکەشی ئامادەیە بۆ بڕیاری کۆتایی دادوەرانەی خودا، ئادەمیزاد خۆی کردوە بەهەدەف بۆ گەورەترین سزای خودایی کە بە خەیاڵ دا بێ، بەڵکوو خۆی خۆی واڵێ کردوە شیاوی سزای ئیعدام کردن بێ، ئەمەش هیچ سەیر نیە بەسەر سوڕهێنەر داناندرێ، کاتێك شارەستانیەت سنوری سروشتی خۆی دەبەزێنێو لەئەندازەی خۆی دەچێتەدەر، بەتەواوی بەها سروشتییەکانی لەبیر دەچنەوە، یان بڕوای پێیان نیەو بەئاشکرا ڕەفزیان دەکا، ئادەمیزاد خۆ غافڵو گێڵ دەکا لەهەموو ئاکامێکی پیرۆزو مەبەستێکی شەریف، خۆی گێل دەکا لەئاستی هەموو واقیعو حەقیقەتێك جگە لە حەقیقەتە مادییەکان، هەموو هەوڵێکی بۆ دابین کردنی ئارەزووە جەستەییەکانیەتی و تێرکردنی داخوازییە حەیوانی یەکانی لەسەرو هەموو شتێکەوە دەبینێ، کاتێك لەجیاتی دڵێکی ئادەمیزادیانەی بەبەزەیی دڵی گورگێك، پڵنگێك، فەهدێك کاردەکا، لەلاشەی ئادەمیزادا گەدەیەکی خەیاڵی و نەفسێکی نەوسنی خراپە خوازی هەڵپەکەر لەکاردا دەبێو هیچ سنورو یاساو ڕێسایەك نایگرێتەوە، کاتێك مرۆڤایەتی توشی نەخۆشی یەکی شێتی کوشندە دەبێ، ئالەو کاتانەدا پەروەردگار کۆمەڵێك پزیشکی جەراح یان تاقمێکی خوێنڕێژی بۆدەنێرێ سەیری برینە خۆرە لێدراو (سەرەطان)ەکانی دەکەن بەکێردی غەیب ئاسا دەکەونە گیانی و لەریشەوە دەی بڕن. بێگومان داوەشانی شارەستانییەتو هەوەسو شێتیەکانی زۆر لەشێتی فەرمانڕەوایی و دیکتاتۆری کاریگەر ترە، شەڕو نەگبەتیەکانی بەرفراوانترە، چونکە تۆ سەیربکە ئەگەر لەماڵێك دا شێتێك پەیدابێ، ئەندامێکی ئەو خێزانە هاربێ، ژیان لەو ماڵە بەڵکوو لەدەروجیرانو گەڕەكو هۆبەش تێك دەدا، خۆشی ژیانو رابواردنیان لێ دەکاتە

قوزەلقورت! دەی دەبێ چی بقەومێو جیهان چی بەسەربێ ئەگەر چینی ئادەمیزاد هەموویان تێکڕا شێت بن؟ دەبێ چی ڕوبدا کەلاشەی مرۆڤایەتی هەر هەمووی گەندەڵ ببێو خۆرەو سەرەطانی لێبێو بۆگەن بکاو سروشتی فاسید ببێ؟ ئایا ئەوکاتە چارەسەری دەکرێ؟

لەراستی دا لەسەردەمی نەفامی دا شارە ستانی نەك هەر گەندەڵ بوو بوو بەس بەڵکوو لاشەکەی رزی بوو بۆگەنی کردبوو کرمو جڕو جانەوەری لێدابوو، قێزەون بو بوو بێزی لێدەکرایەوە.

ئادەمیزاد ئادەمیزادی راودەکردو جاسووسی لێ دەگرت و بەبێ هۆ دەیکوشت، لەززەتی لەلینگە فرتەو گیانەڵاو هەناسەدانی سەرەمەرگی دەبینی، وەکوو چۆن یەکێ لەئێمە بەدیمەنی گوڵو گوڵزار دارو درەخت لەززەت وەردەگرێ و دڵی پێدەکرێتەوە، شاگەشکە و کەیف خۆش دەبوو کاتی دەیدی ئادەمیزاد نێچیرەکەی بەبرینەکەیەوە ئەم دیوو ئەو دیودەکا، هیچ بەزەییو رەحمی تێدانەمابوو بەناڵەو هاتوو هاواری نەخۆشو زامداران و کۆست کەوتوان دەکەوتە نەشونما وەکوو چۆن یەکێك بەخواردنەوەی شەرابی گواراو خواردنی خۆشو دیمەنی جوانو روخساری شیرین دەکەوێتە گەشەو بزەی دێتێ!!

خوێنەری هێژا چاوێك بەمێژووی رۆمادا بگێرە، ئەو رۆمایەی ئێستاو لەوەپێشیش ئەوروپا پێی دا هەڵدەڵێو وەصفو ثەنای دەکاو شانازی بەجەنگەکانیو پاڵەوانیەتی جەنگاوەرانیو پیاوەتیو دابو نەریتو یاساو ژیاری دەکا دەبینی نموونەیەکی دیاردەی دڵرەقیو قەساوەت بوون، بەڵکوو دڵرەقیو بێ رەحمیان گەیشتبوە تۆپەڵاكو لەسنوریان تێپەڕاندبوو، نوسەری ئینگلیزی نژاد (لیکی) لەکتێبێکی دا بەناوی (مێژووی ئەخلاقی ئەوروپا) وێنەیەکی هەرچی و پەرچییەتی ئادەمیزادی ئەو رۆژگارەمان بۆ

رادەنوێنێ، دڕندەیی و خوێنخۆری و دڵڕەقی بێ سنوری ئەو کۆمەڵگایەمان بۆ باس دەکاو دەڵێ: بێگومان ئەو دیمەنانەی کە زۆر کاریگەر بوو بەسەر دڵی ڕۆمەکانەوە لەززەتیان لێ دەبینی و تەسەللایان پێ دەهات، ئەودیمەنە بوو کەبریندارێك لەگۆڕەپانی زۆرانبازی پاڵەوانێك دا لەرەگەزی خۆی دەکەوتە سەرزەوی و لەخوێناوی خۆی دا دەگەوزی، یان پاڵەوانێك لەزۆرانبازی لەگەڵ دڕندەیەك دا بریندارەبوو دەکەوتە سەرزەوی و تلی دەداو هاواری دەکردو خوێن و فرمێسکی لەبەر دەڕۆیی، ئالەو کاتەدا خەڵکەکە کەبەگشتی جلەوی لەدەست دەداو رادەجمین بۆ سەیرکردنی ئەو دیمەنەو بیستنی ئەو هاتوهاوارە، ژن و منداڵو پیرو جوان پاڵەپەستۆی ئەوەیان بوو لەودیمەنە سامناکە نزیك ببنەوە، لەنزیکەوە ئەو ئادەمیزادە لەخوێن شلاڵ بووە دا ببینن و بەدیمەنی گیانەلاوو سەرەمەرگی لەززەت وەرگرن و بزەبیانگرێ، لەکاتێکدا ئەوچارە ڕەشە لەهۆزو عەشیرەتی خۆیان بوو یەکێ بوو لە هاو ولاتیانی خۆیان هەروا بۆ ئەوەی لەنزیکەوە هاتوهاواری بەگوێچکەیان دا بچێ، بێگومان ئەو جەماوەرە بێ ڕەحمە سەرلێشێواوە هاوارو دادو فیغانی ئەو بەدبەختە لەمەیدان کەوتووەیان لەهەموو گۆرانی و مۆسیقایەك و خوێندنی بولبول و قاسپەی کەوو جریوەی مەل پێ خۆشتربوو، پیاوانی پۆلیس کەئەرکی پارێزگاری یاساو نیظامیان لەئەستۆ بوو بەواق وڕماوی و سەرسامی و بێ دەسەلات لەبەرامبەر ئەم ڤیستیڤاڵو لەززەت وەرگرتنە ستەمکارانە رادەوەستان هیچیان بۆ نەدەکرا.

بێگومان چیرۆك و بەسەربردەی سەردەمی جاهیلی یەکەم ئەوە بوو بەردی بناغەی کۆمەڵ لەشوێنی خۆی لاچوو بوو، نەك هەرئەوە بەڵکوو بەردو خشتی بناغەی وردو خاش بوو، هیوای گیرسانەوەو یەکگرتنەوەی لێنەدەکرا بەکەڵکی ئەوە نەدەهات بخرێتەوە شوێنی خۆی، ئادەمیزاد

بەگشتی لەبەردەم دادگایی کردنی خوادا چاوەڕێی دەرچوونی بڕیاری کۆتایی بوو، ئالەو کاتەدا کەئادەمیزاد لەگیانەڵاو دابوو، خەریك بوو بەتەواوی لەناوبچێ، پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی رەوانەکرد، ئەم پەیامە پیرۆزەی بەگوێچکەی بونەوەردا داو فەرمووی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ .﴾ (١٠٧) سورة الأنبياء.

## جیهانی تازە لەحیسابو مەزەندەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دا:

ئەو راستییەی کەشكو گومانی تێدانیە، ئەوەیە ئەم سەردەمەی ئێمەی تێدا دەژین و ئەو رۆژگارو سەردەمانەی کەلەمەدوادێن هەموویان لەروانگەی حیسابو مەزەندە کردنی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەددا و بانگەوازیە گشتی و نەمرەکەیو هەوڵو تێکۆشانی پرپیتو بەرەکەتی هەرهەمووی قەرزداری پەیامی پێغەمبەرە، چونکە پێش هەموو شتێك ئەو شمێشرە روتەی لەسەرگەردنی ئادەمیزاد دانرابوو خەریك بوو لەناوی بەری توری داو ئەمجار بەخشیشی گرانبەهاو دیاریی جوانی پێشکەش کرد نەشو نمای تێدا پەیداکردوو ورەو حەزی بەرەو پێشەوە چوونی پێ بەخشی، شکۆمەندیو رێزی بۆئادەمیزاد دەستەبەر کردەوە، ئامانجی راستەقینەو ئاکامی پیرۆزی بۆدیاری کرد، بەهۆی ئەم بەخششو دەستکەوتە پیرۆزانەوە سەردەمێکی شکۆداری تازە بۆ ئادەمیزاد هاتە کایەوە، رۆشنبیری و شارەستانیەتو خوداو یستیو دڵسۆزی لەکارو کردەوەی دا فێرکرد، دروستکردنەوەی ئادەمیزاد سەر لەنوێ دەست پێ کردەوە و پەروەردەو پێگەیاندنی لەڕوی رەوشتو هەڵسو کەوتی کۆمەڵایەتیەوە کردە ئامانجی سەرەکی و پەرەی پێ دا.

## شەش بەخششی سەرەکی پێغەمبەرێتی موحەممەد و کاریگەری لەمێژووی ئادەمیزاد دا:

ئێستا بۆ نموونە نەك بۆ (حصر) شەش لەوبەخشshانەی کە پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) بەخشییە بەرەی ئادەمیزادو رۆڵێکی گرنگیان هەبوو لەئاراستەکردنی ئادەمیزادو بەرەو رێبازی راستەقینەی بەختەوەری‌و چاکسازی‌و رێ نیشاندانی بۆ چاکە کاری تا عالەمێکی پێشکەو تووی داد پەروەرو خوداپەرستی هێنایە کایەوە، کەهیچی لەکۆمەڵگای کۆن‌و سەردەمی نەفامی نەچێ.

## بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی بێ پێچ و پەنا:

یەکەم بەخشش‌و شکۆمەندی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەوەیە بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی بێ خەوشی بەناو ئادەمیزادا بڵاو کردەوە، بناغەیەکی پتەوی دانا بۆ کۆمەڵگایەکی خاوێن. بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی چەسپاند، بیرو باوەڕێکی کراوەی بێ وێنەی پڕ جم‌و جۆڵی زیندوو، بیرو باوەڕێکی پتەوو زیانبەخش‌و هەڵگیرەوەی بارو دۆخ‌و روخێنەری خودا درۆزنەکان، بیرو باوەڕێك کە ئادەمیزاد نەلەکۆن‌و نەلەداهاتوودا نمونەی نەدیوەو نایبینێ تا رۆژی قیامەت. ئەم ئادەمیزادە کە هەڵگری چەند داوایەکی بۆش‌و بیرو بۆچونێکی بێ ناوك لەشیعرو فەلسەفەو رامیاری و کۆمەڵایەتی، ئەو ئادەمیزادەی چەند جارێك بووەتە ئاغاو کوێخای ئەم وڵات‌و ئەو گەل و نەتەوەیە، ئەو ئادەمیزادەی لەشاخی رەق‌و چەقەن‌و رەقەن باغ‌و گوڵزاری رسکاندوە، کارێزاوی لەناو جەرگی زەوی و شاخ و داخی سەخت دا هەڵقوڵاندوە، هەندێ جاریش لافی خودایەتی لێداوە، ئەم ئادەمیزادە ژیرو لێزانە جاری واهەیە سەری لێ شێواوە سوجدەی بۆ شتی پوچ‌و کەم بایەخ

بردووه، سوجدەی بۆ شتێك بردووه نه دارای زیانی هەبووه نەقازانج نه توانیویەتی ببەخشێ نەدەسەلاتی گرتنەوەی هەبووه. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ﴾ (٧٣) سورة الحج.

بەڵێ ئەم ئادەمیزادە ژیرە واسەری لێشێواو رۆژگارێکی بەسەردا هات ملکەچی شتێك دەبوو کە بۆخۆی دروستی دەکرد، روکوعی بۆ دارو بەردی تاشراوی بێ گیان دەبرد، لێی دەترساو هیوای خێرو بێری لێ دەکرد، سەیر بوو ئادەمیزاد هەرئەوە نەبوو سوجدەی بۆ کێوو چۆم درەختو گیان لەبەران بەرێ. یان لەگیانی شەیاتینیان بترسێو دیاردەکانی سروشت (رەشەبا و هەورە بروسکەو تاریکیو روناکی) بپەرستێو بەس! بەڵکوو وابووە سوجدەی بۆ مێروو جڕو جانەوەرو کرمو ئەو جۆرە شتانە بردوە، ژیانی خۆی لەناو خەیاڵو گومانو وەسوەسەو هیوایاتو خەون دا بەسەر بردووه، لەئاکامی ئەم خەیاڵو بیرو بۆچونە بۆشو پڕو پوچانەدا توشی ترسو داهێزانو چەواشەکاری فکریو قەلەقی دەروونیو نەمانی بتمانەبووه، توشی دڵەڕاوکێو ڕاڕایی هاتووه، سەر لێ شێواوو پەشێو نەیدەزانی چی بکاو چی نەکا، تا لەئاکام دا پەروەردگار پێغەمبەری رەوانەکرد، بیرو باوەڕی پاكو بێگەردی بۆ هێنان، رێزو نرخی بۆ ئادەمیزاد گەڕاندەوە ورەو هێزی پێ بەخشین، سەر لەنوێ ئادەمیزادی بوژاندەوە لەهەموو ترسو بیمێکی بێ بناغەو ئەفسانە ئاسا رزگاری کردن، ئادەمیزادی هێنایە سەر بیرو باوەڕێك لەخودا نەبێ لەکەس نەترسێ، دڵنیا بوو لەوەی هەر خودا دەتوانێ زیان بگەیەنێو سودببەخشێ، رزقو رۆژی بداو بیگرێتەوە، بڕوای هێنا بەوەی کەهەرخودا دەتوانێ پێویستیاتی

ئادەمیزاد دەستە بەربکا، بەهۆی ئەم بیرو باوەڕە تازەیەوە جیهان لەدیدی ئادەمیزادەوە گۆڕاو بیرو بۆچونێکی تری دەربارەی ژیان لەلادروست بوو، وای لێ هات جگە لەخودا بەندایەتی بۆکەس نەدەکرد، لەخودا نەبێ لەهیچ شتێکی تر نەدەترسا، خۆف و رەجای لەهیچ مەخلوقێك نەبوو، دڵەراوکێ و ڕاڕایی نەما، دەرکەوت کەئادەمیزاد رێزدار ترین دروستکراوی خودایە لەسەر زەوی، گەورەی زەوی و جێ نشینی خودایە لەسەری، پێویستە لەسەری گەردنکەچی فەرمانی خوادابێ و عیبادەت بۆ بەدیهێنەری خۆی بکا، پابەندی فەرمان و نەهیەکانی بێ بەوە رێزی ئادەمیزادێتی خۆی دەستبەر دەکا، شکۆمەندی و گەورەیی و نەمری بۆخۆی دەگێڕێتەوە، کەلەوەپێش داب و نەریتەکانی جیهان لێیان قەدەغە کردبون! بەڵێ ئەوە رەوانە کردنی پێغەمبەر بوو ئەو دیارییە پیرۆزەی پێشکەشی ئادەمیزاد کرد کەبریتی بوو لەبیرو باوەڕی یەکتا پەرستی. ئەوبیرو باوەڕە راست و پیرۆزەی کەماوەیەك بوو کەوتبووە ژێر تاریکایی کوفرو نەفامی، بەناحەق پاشگوێ خرابوو، زێدە لەهەموو بیرو باوەڕەکانی تری جیهان ئەو زۆر ستەمی لێ کرابوو، پاشان لەسەردەستی حەزرەتی موحەممەد بانگی حەقی هەڵداو لەجیهان دا دەنگی دایەوە، کەم تازۆر کاریگەری خۆی خستە سەر فەلسەفە جیهانی یەکان و بانگەوازە گشتی یەکان و وەکوو بانگەوازی یەکی عالەمی لەمەککە تیشکی پڕشنگداری هەڵهات..

بێگومان برێ لەئایینە گەورەکان لەسەر بنەمای شیرك و فرەخودایی دروست بوون، بەخوێن و گۆشتەوە تێکەڵی شیرك بوون، بەڵام سەرەنجام ناچار بوون، (هەرچەندە بەدەنگێکی ئەسپایی و بەسرتەش بێ) دان بەوەدا بنێن کە (الله) یەکەو هاوەڵی نیە، ئەمجار هاتن بیرو باوەڕە شیرك ئامێزەکەیان بەشێوەیەکی فەلسەفی تەئویل کردو ویستیان تارمایی شیرك و

فرەخودایی لەئایینەکەیان دوور بخەنەوە، بەڕواڵەت وای لێ بکەن بشوبهێنە بیروباوەڕی یەکتا پەرستی ئایینی ئیسلام، ئیتر پیاوە ئایینی و سەدەنەو هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕانە شەرمیان دەکرد لەوەی دان بەفرە خودایی دابنێن‌و خۆیان بەخەجاڵەت دەزانی ئەگەر هەڵگری ئەو بیرو باوەڕە بن، هەموو ئەو کۆمەڵ‌و نیظامە شیرك ئامێزانە هەستیان بەکەڵغامی خۆیان دەکرد ئەگەر بیرو باوەڕی فرە خوداییان بدرێتە پاڵ‌و خۆیان لێ دەدزییەوە. کەوا بوو ئەو دیارییەی کە پێغەمبەری ئیسلام پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد بەنرخترین دیاری بوو، دیارییەك بوو بەختەوەری بە ئادەمیزاد بەخشی، لەگومڕایی رزگاری کرد.

## ❀ بنەمای یەکیەتی ئادەمیزادو یەکسانی نێوان تاکەکانی:

خاڵی دووەم لەسەروەری‌و بەها بەنرخەکانی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد و فەضل‌و منەتی بەردەوامی بەسەر عالەم دا بەگشتی، بیرۆکەی یەکیەتی ئادەمیزادو یەکسانییەتی، پێش هاتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئادەمیزاد دابەش بوو بوو بەسەر چەند هۆزو نەتەوەو چین‌و توێژێك دا، هەندێ چین لەژورو هەندێ لەخوار بوون، چینێك چەوسێنەرو بەگزادەو قەڕاڵ‌و ماقوڵ، چینێکیش هەژارو چەوساوەو پایین‌و مسکێن. هەندێ گەل و نەتەوە تا ئەندازەی نامەعقول بیرتەسك و دەمارگیر بوون.

جوداوازی نێوان چینەکانی کۆمەڵ‌و نەتەوەکان جوداوازییەکی زۆرو بێ مانابوو، وەکوو جوداوازیی نێوان ئادەمیزادو ئاژەڵ یان جوداوازی نێوان ئادەمیزادی ئازادو ئادەمی کۆیلە یان نێوان بەرستشکارو پەرستش بۆکراو وەهابوو، بەهیچ جۆرێ‌و لەهیچ شوێنێك فکرەی یەکیەتی‌و یەکسانی

لەگۆڕێ نەبوو! دوا چەند سەدەیەك بێدەنگی و تاریکستانی سەرانسەری، پێغەمبەری خودا یەکیەتی ئادەمیزادو یەکسانی نێو تاکەکانی کۆمەڵی ڕاگەیاند، ڕاگەیاندنێکی شۆڕشگێڕانەی سەرسوڕ هێنەرو هەڵەگێڕکەری بارو دۆخەکان، ئیعلانی کردو فەرمووی: (أيها الناس أن ربكم واحد و أن أباكم واحد، كلكم لآدم، وآدم من تراب، أن أكرمكم عند الله أتقاكم و ليس لعربي على عجمي فضل إلا بالتقوى) ئەی ئادەمیزادینە! خوداتان یەك خودایە یەك باوکتان هەیە، هەمووتان لەئادەم کەوتنە خوارو ئادەمیش لەگڵ دروستکراوە ڕێزدار ترین کەس لەئێوە لای خودا ئەوەتانە کەتەقوای زیاتربێ، هیچ بابەیەکی عەرەب لەناعەرەبێك ڕێزدارتر نییە مەگەر بەتەقواو خوداپەرستی. ئەم ڕاگەیاندنە ڕەهایە، بڵاو کردنەوەی ئەم بەیانە گرنگە خۆی لەخۆی دا دوو ڕاگەیاندنی لەخۆ گرتووە، دوو خاڵی سەرەکی تێدان، ئەو دوخاڵە دوو کۆڵەکەو ستونی سەرەکین کەئاشتی و ئارامی لەسەریان بنج بەست دەبێ، هەر لەسەر ئەودو کۆڵەکەیەش لەهەمووکات و شوێنێك دا ئاشتی بەرقەراردەبێ، ئەو دوو کۆڵەکەیەش تاك و تەنهایی پەروەردگار و یەکیەتی ئادەمیزادە، ئادەمیزاد برای ئادەمیزادە لەدوو لاوە، ئادەمیزاد دووجار برای یەکترین، جارێك چونکە خودایان یەکە، جارێکیش چونکە باوکیان یەکە، ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ سورة النساء/١. یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ سورة الحجرات/١٣. بێگومان هەموو ئەو وشانەی لەحەجیماڵئاوایی دا بەسەر زوبانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) هاتن نەمرن و پێویستە هەڵوێستەیان لەسەر بکرێ، ئەوکاتەی پێغەمبەری خودا ئەم بەیانە



مێـژوویی یـەی ڕاگەیانـدن جیهـان بەگـشتی لـەبارو دۆخێکـی ئـارامیو سروشـتی وادا نـەبوو، ئـەم وشـە بوێرو ئاشـکرایانەی پێهـەزم بکـرێ، ئـەم ڕاگەیاندنـە لـەو ڕۆژگـارەدا لـە بومەرزەیـەك کـەمتر نـەبوو، جیهانی شڵەقاندو سەر لەبەر بارودۆخەکەی هەڵەو گێڕکرد. بێگومان هەندێ بیرو بۆچون هەیە، لەوانەیـە بەتـەدریجو پلـە بەپلـە قبـوڵ بکـرێو خـوی پێـوە بگـیرێو لـەناو کۆمـەڵگادا بچەسپێ، وەلـێ ئـاواو بەیەکسەری بومەلەرزەیـەك بـوو بۆخـۆی، وەکوو چۆن تەلی کارەبا، ئێمە ئەگەر داپۆشرابێو لەناو سیلكو تـوێکڵ دابێ دەتـوانین دەسـتی لـێ بـدەینو چ زیانمـان پـێ نـەگا، وەلـێ ئەگـەر تـەلی کارەکـەروت بـوو دەسـتمان لـێدا صـەدمەیەکی بـەهێز لێمـان دەدا، یـان بەتەواوی لەناومان دەبا.

بێگومـان ئەومـەودا درێـژو پـانو پۆڕانـەی فکـری ئـادەمیزاد بڕیویـەتی لەزانیاری و تێگەیشتن بەهۆی بانگەوازی ئیسلامی و پەیدابوونی کۆمەڵگای ئیسلامی و بەهـەوڵو تێکۆشـانی بـانگخوازانی ئیـسلامی و هـەوڵو تەقـەلای ئیـصلاح خـوازانو پـەروەردەکاران، ئـەو ڕاگەیاندنـە بومەلـەرزە ئاسـایەی کەهێلانـەی نـەفامی لێـك هەڵوەشـاندو سـەنگەری شـیركو بتپەرسـتی و دەمارگیری تـەفرو تونـاکرد ئێستا بووەتـە حەقیقـەتێکی ڕۆژانـەی ئاسایی و هەموو دامـەزراوە سیاسـیو کۆمەلایەتیـەکانی جیهـان بانگـەوازی بۆدەکـەنو هـەموو گـوڕو تینێکـی خۆیانیـان بۆتـەرخان کـردوە، لەوانـە جاڕنامـەی مـافی مرۆڤـ و ئـەو هـەموو لێـدوانو بەیاننامـەو وتـارو پەیامانـەی کەیاسـا کۆمارییـەکان ڕێکخـراوو دامـەزراوە مرۆڤـ دۆسـتەکان دەربـارەی مافـەکانی مرۆڤـ و یەکـسانی ئـادەمیزاد، بانگـەوازی بۆدەکـەن، ئەمانـە هـەموویان هەریەکـەیان بەشـێوازی خـۆی بانگـەوزای بۆدەکـا بـەجۆرێك لامـان بۆتـە ئاسایی و بەلامانەوە نامۆنیە، وەلـێ ڕۆژگارێك بەسەر ئادەمیزاد دا تێپەڕی

بیروباوەڕی وەجاخزادەیی هەندێ نەتەوەو خێزانو هۆز باوبووە، هەندێك لەوهۆزو تاقمانە خۆیان لەژور ئادەمیزادی تر پۆلێن دەکردو هەندێ خێزان بنەماڵە خۆیان بەزادەو نەوەی خۆرو مانگ لەقەڵەم دەدا، یان هەندێکیان خۆیان بەنەوەی خودا دەزانی دەیانگوت ئێمە کوڕی خوداین، قورئان بیرو بۆچونی جولەکەو نەصرانییەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ سورة المائدة/١٨. فیرعەونەکانی میصر پێیان وابوو ئەوان نمونەی خوداوەندی خۆرنو دیار دەیەکن لەئەو کەبەخودای (رع Ray) ناسراوە.

لەهیندیش دا دوو خێزان بەناوبانگن، یەکیان ناوی (سورج بنسی) واتە: نەوەی خۆر (کوڕانی خۆر) و (جندر بنسی) واتە: نەوەی مانگ (کوڕانی مانگ). لەئێرانیش دا خانەوادەی کیسراکان پێیان وابوو خوێنی جەستەیان خوێنی خوداییە دەیانگوت: خوێنی ناو ڕەگەکانی لەشمان لەجۆری خوێنی خودایە. دانیشتوانی وڵاتەکەشیان بەچاوی ڕێزو تەقدیسەوە سەیریان دەکردن، بەخودایان دەزانین، نازناوێکی پاشایەکی ئێران (کیسرا ئەپروێز) (٥٩٠-٦٢٨ زایینی) ئەوەبوو بەم شێوە وەصف دەکرا (لەناو خوداکان دا ئادەمیزادێکی نەمرە لەناو ئادەمیزادیش دا تاکە فەردەو دووەمی نیە بەرزو شکۆمەندە کەلیمەکەیو مەجدو گەورەیی ئەو لەژورر هەموو شتێکەوەیە، لەگەڵ خۆر هەڵدێ، جیهان بەروناکی ئەو روناکەو شەوانی تاریك ڕۆشن دەکاتەوە.[٢٧٧] هەروەها قەیصەرەکانیش هەریەکەو خودایەکی خۆی هەبوو، هەریەکێ لەو قەیصەرانە کەدەسەڵاتیان

---

[٢٧٧] ایران في عهد الساسانیین/٦٠٤.

بەدەستەوە دەگرت پلەی خودایەتی دەدرایە، نازناوی ئۆگست August واتە: خاوەن شکۆی پایە بەرز.

چینی یەکان ئیمپراتۆری وڵاتی خۆیانیان بەکوڕی ئاسمان لەقەڵەم دەدا، ئەوان بیرو باوەڕیان وابوو، ئاسمان نێرەو زەوی مێینەیە، بەهۆی بەیەك گەیشتنیانەوە ئەم بونەوەرو حەشامەتە هاتوونە دی، یەکەم کوڕو بەرهەمی ئاسمان و زەوی، ئیمپراتۆرە، ئەو نۆبەرەیانە.

عەرەبەکانیش غەیری خۆیانیان بەعەجەم ناو دەبرد، هۆزی قورەیشیش پێیان وابوو رێزدارترین هۆزی عەرەبن، پارێزگاری ئەو تایبەتمەندییەی خۆیانیان دەکرد، لەکاتی حەج کردن دا خۆیان لەخەڵکە کە جیادەکردەوە لەگەڵ حاجیەکانی ترنەدەچوونە عارەفات، بەڵکوو لە چوارچێوەی حەرەم دا دەمانەوە، لەموزدەلیفە رادەوەستان دەیانگوت ئێمە پێری خوداین، دانیشتووی شارێکین کە ماڵی خودای تێدایە، ئێمە پارێزەری ماڵی خوداین، دەیانگوت ئێمە (حومەسین)، (حمس) بەکەسێك دەڵێن: زۆر توند ڕەوبێ لەئایین دا، یان ئازاو بەجەرگ بێ.

## راگەیاندنی رێز بۆ ئادەمیزادو شکۆمەندی ئادەمیزاد:

منەتی سێیەم و سەروەیی گەورەو بەخشندەیی ئیسلام بۆ کۆمەڵگای ئادەمیزاد، راگەیاندنی رێزداریی ئادەمیزادو کەسایەتی و بەرزی و بەنرخییەتی. ئەوە راگەیەندرا: کە ئادەمیزاد مەخلووقێکی خاوەن رێزو بەهایە، بێگومان لەپێش رەوانەکردنی پێغەمبەردا ئادەمیزاد گەیشتبوە ئاستێکی ترسناك لەچەوساندنەوەو سوکایەتی پی کردن لەسەر ڕوی زەوی هیچ شتێك بەئەندازەی ئادەمیزاد سوكو بێ نرخ نەبوو، هەندێ ئاژەڵو گیانلەبەر، کە بە پیرۆز دادەنران، هەندێ درەخت کە بەپیرۆز دەزانرانو

چیرۆك و ئەفسانەی جۆراو جۆریان پێوە هەڵبەستراوە ئەو ئاژەڵ و درەختە پەرستراوانە زۆر لەئادەمیزاد رێزدار تر بوون و پتر گرنگیان پێ دەدرا، تەنانەت زۆر جار بۆرێز لێنان لەو ئاژەڵ و درەختە پەرستراوانە ئادەمیزادی بێ تاوان کراوەتە قوربانی، گۆشت و خوێنی ئادەمیزاد پێشکەش کراوە، هیچ ویژدان و دڵێك بەرامبەر ئەو دیاردە دزێوانە نەجولاوەو رانەچڵەکاوە، ئێستاش لەسەدەی بیستەمی کۆچی دا لەولاتێکی وەکوو هیندستان دا نموونەی ئەو بێرێزییەی ئادەمیزاد بەشێوەیەکی قیزەون دەبیندرێ.

بەڵێ حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) بەبلاوکردنەوەی پەیامەکەی رێزو نرخی بۆ مرۆڤایەتی گێڕایەوە، ئیعتیبارو نرخی خۆی پێ بەخشیەوە، ئەوەی راگەیاند: کە ئادەمیزاد رێزدار ترین بوونەوەرە، بەنرخترین جەوهەری ئەم جیهانەیە، ئەوەی راگەیاند کە هیچ شتێك لەم بونەوەرەدا بەنرخترنیە لە ئادەمیزادو هیچ شتێك هێندەی ئەو شیاوی خۆشەویستی و رێزلێنان و پاراستن نیە، بەڵێ حەزرەتی موحەممەد پلەی ئادەمیزادی بەرزکردەوە تاگەیاندییە ئەو ئاستەی کە مرۆڤ جێ نشینی خودایە لەسەر زەوی، جیهان لەبەر خاتری ئادەمیزادو بۆ بەرژەوەندی ئەو بەدی هێنراوە، هەموو بونەوەریش بەدی هێنراوی خودایە، قورئان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾ سورة البقرة/٢٩. پەروەردگار ئەو خودایەیە کەهەرچی لەناو زەوی دایە بۆ بەرژەوەندی ئێوەی ئادەمیزاد بەدی هێناوە و ئادەمیزاد رێزدارترین دروستکراوی خودایە سەرجەم، پلەی سەروەری و گەورەیی پێ بەخشیوە، خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ سورة الإسراء/٧٠.

بێگومـان ئێمـه ڕێزمـان لـه ئـادەمیزاد نـاوه، بەسـەر زۆر لەمـەخلووقاتی خۆمـان دا باومـان داوەتـێ، شـێوەو ڕوخـساری جوانمـان پـێ بەخـشیوه، زانـستو زانیاریمـان فێرکـردووه، لەسروشـتی دا گـڵو نەفخـەی یـەزدانی تێدایـه، ڕێزمـان لـێناوه بـەوه ئامادەباشـی ئـەوەمان تێدابـەدی هێنـاوه: کەبتوانێ زەوی ئاوەدان بکاتەوه. تێیدا هەڵسوڕێ و تێبکۆشـێ بـۆ وەدەست هێنـانی پێداویـستی ژیـان، عـەقڵو هۆشمـان پـێداوه فێـری پیـشەسازی و کـشتو کـاڵ کـردنو چـێوداری و شـتی تریبـێ، ڕێزمـان لـێناوه بـەوه کـه فریـشتەکان و هـەموو بونـەوەر ئـەو پێـشوازییه گـەورەیان لـەئادەم کـرد، کرشنووشـیان بـۆ بـرد، ڕێزمـان لـێناوه بـەوه ئـەم ڕێزلێنانـەمان لەنامـەی خۆمان دا ڕاگەیاندوه و بەگوێچکەی بونەوەرمان داداوه..

دەسەڵاتی ئەوەمان پێبەخشیوه هێزو تواناکانی ناوبونەوەر بۆخۆی ڕام بکاو بۆ بەرژەوەنـدی خـۆی بەکاری بێنـێ، لەوشـکانی دا بەگوێرەی ڕۆژگـار دەتوانـێ سـواری وڵاغـه بـەرزەو گوێدرێـژ و هێـسترو گالیـسکه ئوتومۆبیـلو قەتار ببێ، لەهەوادا سواری تەیارەو صاروخ ببێ، لەدەریادا سواری کەشتی ببێ.

ڕزقو ڕۆژیمـان داونـێ لەبـەروبومی کـشتو کـاڵ و میـوەی درەخـتو گۆشـتو شـیری ئـاژەڵ جۆرەهـا خواردەمـەنی و خـۆراکی تـر، هەرواشـێوەو ڕوخساری جوانمـان پێبەخشیون، پۆشـاکی جـوانو ڕازاوەمـان بـۆ فەراهـەم هێناوه.

زێده ڕێزمان داونێ، بەسەر زۆربەی دروستکراوانی خۆمان دا پاساومان داونـەوه، دەسـەڵاتی ئـەوەمان داوه بـەئادەمیزاد: کـه دەتوانـێ زوربـەی گیانلەبەرانی تر بۆ بەرژەوەنـدی خـۆی بەکاربێنێ، عـەقڵو هۆشمـان پێداوه، پاداشو جەزای کردەوه کانی وەردەگرێتەوه.

هیچ دەقێك هێندەی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕێزداری ئادەمیزاد ناسەلمێنێو دان بەگەورەیی دانانێ کە دەفەرموێ: خەڵك هەموو عەیالی خودان، خۆشەویسترین خەڵکیش لای خودا ئەوکەسەیە بۆ عەیالی خودا چاکەکارە.

دەبێ چ دەق و یاسایەك بەلینع تربێ بۆ دیاریکردنی بەرزیی ئادەمیزادو نزیکی لەخودای خۆیەوەو ڕێزو خۆشەویستی خودا بۆی لەو حەدیثەی کەلەم بارەوە ئەبو هوریرە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردوە. دەفەرموێ: رۆژی قیامەت پەروەردگار رودەکاتە بەندەیەك لەبەندەکانی و دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد من نەخۆش کەوتم دیدەنیت نەکردم، دەڵێ خودایە چۆن دیدەنیت بکەم تۆ خودای بونەوەریت و بێ شەریك و بێ مەکانی؟!

دەفەرموێ: ئەی نەتزانی فلان بەندەم نەخۆش کەوت و تۆ سەردانت نەکرد، نەتزانیوە ئەگەر دیدەنیت بکردایە منت لای ئەو دەست دەکەوت! ئەی ئادەمیزاد! داوای خواردەمەنیم لێ کردی بەشت نەدام! کابرا بەسەرسوڕمانەوە دەڵێ خودایە خواردنی چیم بدایە بەتۆ لەکاتێك دا تۆ خودای بونەوەرو هەموو شتێکی؟ دەفەرموێ ئەی نەتزانیوە فلان بەندەی من داوای خواردنی لێ کردیو بەشت نەدا! نازانی ئەگەر بەشت بدایە پاداشی ئەو چاکە و بەهانا چوونەت لای من دەست دەکەوتەوە! ئەی ئادەمیزاد! داوای ئاوی خواردنەوەم لێکردی تاوات نەدامێ! دەڵێ خودایە، ئاوی چیم بدایە بەتۆ کە تۆ پەروەردگاری هەموو عالەمی؟ دەفەرموێ: ئەی ئەوەنەبوو فلان بەندەم داوای ئاوی لێکردی و نەتدایە! نازانی ئەگر بێت و ئاوەکەت بدابایە پاداشی ئەو چاکەیەت لای من دەست دەکەوت.[٢٧٨] دەی باشە ئایا

---

[٢٧٨] رواه مسلم في صحيحه. في كتاب البر و الصلة باب فضل عيادة المريض /٢٥٦٩ رقم الحديث /٢٥٦٩.



تەصەور دەکرێ ڕاگەیاندنێك هەبێ لەم ڕاگەیاندنە ڕونو ئاشکارتر بێ دەربارەی ڕێزلێنانی ئادەمیزاد و بەرزیو شکۆمەندیو پلەو پایەی مرۆڤ لای خودا؟! ئایا ئادەمیزاد لەچ یاساو شەریعەتو فەلسەفەو ئاینێك دا لەکۆنو نوێدا ئەم پلەو پایە بەرزەی بۆ دیاری کراوە؟؟

تەنانەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نازڵبوونی ڕەحمەتی خودای پەیوەست کردوە بەوەی ئادەمیزاد خۆیان لەناو خۆیان دا ڕەحم بەیەکتری بکەن. لەفەرموودەیەکی دا: کە ئەبوداود ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (الراحمون يرحمهم الرحمن، إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء) ئەو مرۆڤانەی خاوەن ڕەحمو بەزەیین خودای خاوەن ڕەحم ڕەحمەتی خۆی دەبارێنێ بەسەریان دا، ئێوە ئەی ئادەمیزاد! لەناو خۆتان دا لەسەر زەوێ ڕەحم بەیەکتری بکەن بۆ ئەوەی پەروەردگاری باڵادەست لەئاسمانەوە ڕەحمتان پێ بکا.

خوێنەری هێژا دەبێ بارودۆخی جیهان لەپێش ڕەوانە کردنی حەزرەتی موحەممەددا چۆن بووبێ؟ دەبێ حاڵەتی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەچ بارودۆخێکی نا هەمواردا بووبێ؟ دەبێ پێش ئەوەی حەزرەتی موحەممەد ئەم بانگەوازییە یەکسانیو مرۆڤایەتیە بڵاو بکاتەوە ئەم جیهادو تێکۆشانە ئەنجام بدا مرۆڤەکان چۆن هەڵسو کەوتیان کردبێ؟

بێگومان مێژوو شایەتە: کە بەهای حەزی دیکتاتۆرێك، دابینکردنی ویستی تاکە کەسێك پێش ڕەوانە کردنی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) زۆرجار بەهەزاران بەڵکو بەسەدان هەزار گیانی مرۆڤی بەقوربان کراوە، پاشایێك، ئیمپراتۆرێك بۆ بەجێهێنانی مەرامێکی ناشەریفانەی خۆی لەشکری تاوداوە، وڵاتی پانو پۆڕی ماڵیوە، مرۆڤ قرانی خستۆتە ناو جیهانەوە، بەئارەزووی خۆی خەڵکی کوشت و بڕ کردووە، ئەوی لەکوشتن

رزگاری بووبێ مۆرکی بەندایەتی پێوەناوە، هەرچی هاتبێتە سەر رێگای قەڵاچۆی کردوە، تەڕو وشکی پێکەوە سوتاندوە. وڵاتی خۆش و زەنوێری کردۆتە خۆڵەمێش و سوتەمەنۆ. ئەمە هەموو بۆ تێرکردنی حەزو ئارەزوی دیکتاتۆرێکی ناکەس بەچە.

ئەسکەندەر لەشکر لەئەژمار نەهاتوی خۆی تاودەدا لەوڵاتی خۆیەوە دەکەوێتە رێ، دەروا تاسەر سنووری هیندوستان لە رێڕەوی خۆی دا چی ژیارو شارەستانییەت هەیە هەموو خاپوور دەکا!!

سەرۆرادەجمێ و نیشان دەگرێتە کۆمەڵانی ئادەمیزاد بەسەدان و بەهەزاران لاڵ و پاڵ دەخا، زوربەی بەکۆمەڵ کوشت و بردەکا بۆ چێژ وەرگرتن.. لەچەرخی بیستەمیش دا دوو جەنگی گەورەی جیهانی بەرپابوون قوربانییەکانی ملیۆنەها ئادەمیزاد بوو جگە لەخاپور کردنی ئەو هەموو گوندو شارۆچکانە کەئێستاش ئاسەواری ماوە، هیچ پاساوێکی رەواش بۆ هەڵگیرسانی ئەو جەنگانە نەبوو جگە لەدەمارگیری و خۆپەرستی و ئارەزوی پاوانکردنی پانتایی یەکی زۆرتر لەجیهان و کۆنترۆڵکردنی بازرگانی جیهانی.

## ❧ دژایەتی کردنی رەشبینی و بتمانە بەخۆکردن و زیندو کردنەوەی ئومێدو رەجا:

سەروەرییەکی تری پەیامی پێغەمبەر کەدەبێتە خاڵی چوارەم لەسەروەرییەکانی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) ئەوەیە لەورۆژگارە دا ئادەمیزاد توشی دەردێکی کوشندە بووبوون کەبریتی بوو لەنائومێدی و رەشبینی و گومانی خراپ بردنە سروشتی ئادەمیزاد، بەتایبەتە لەدروستبوونی ئەوکەش و هەواو بارودۆخەو هەبوونی ئەو

عەقڵییەتە تایبەتییە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو بۆ پەیدابوونی بڕێ لە ئایینە کۆنە کانی خۆرهەڵاتو ئایینی دەست لێ دراوی مەسیحی لەئەوروپا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بێگومان ئایینە کۆنەکانی هیند کە بڕوایان بەبیرو باوەڕی تەناسوخ و فەلسەفەی تەناسوخ هەیە، کەهیچ مەجالێك ناهێڵێتەوە بۆ ئیرادەی مرۆڤ و هەڵسو کەوتی، هەروەها بیروباوەڕی ئەوە: کەهەموو ئادەمیزادێك حەتمەن دەبێ توشی سزابێ بەهۆی ئەوکردەوانەی لەژیانی دونیا ئەنجامی داوە، ئەوەش لەم ڕێگەوە: کە لەوە دوا لەشێوەی دڕندەیەکی بەدخۆیان ئاژەڵێکی بەرەڵلا یان گیانلەبەرێکی قیزەون یان ئادەمیزادێکی بەدبەخت دێتەوە ژیانەوە.

لەکاتێك دا ئایینی مەسیحی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئادەمیزاد هەموویان تاوانبارن، هەرکە لەدایك دەبن بەسروشت تاوان دەکەن، مەسیح لەخاچ درا بۆئەوەی ببێتە کەفارەتی تاوانی ئادەمیزادو لەتاوان بشۆرێنەوە، ئەم بیروباوەڕەی مەسیحی لەدڵو دەرونی ملیۆنەها مەسیحی دا لەجیهانی پێشکەوتوو داکاریگەری خراپی هەبوو هەمیشە گومانی خراپیان دەربارەی خۆیان لادروست بووە و لەدوارۆژی خۆیان ناهومێد بوون، بەڵکوو بەرامبەر ڕەحمەتی خوداش ڕەشبین بوون.

ئالەم کاتو باروذۆخەدا حەزرەتی موحەممەد زۆر بەراشکاوی بەئاشکرا ئەوەی ڕاگەیاند: کە فیترەتی ئادەمیزاد وەکوو لەوحەیەکی صافی بێگەرد وایە کەهیچی لەسەر نەنووسرابێ، دەتواندرێ جوانترین نەخشی لەسەر دروست بکرێ، جوانترین دەقی شیعرو پەخشانی لەسەر تۆماربکرێ، ئادەمیزاد بۆخۆی ژیانی خۆی دەست پێ‌دەکاو شیاوی پاداش یان سزا، بەهەشت یان دۆزەخ دەبێ بەهۆی کردەوەکانی یەوە، ئادەمیزاد بەرپرسیار لەکردەوەی خۆیو بەگوێرەی کردەوەی باشی خۆی پاداش وەردەگرێتەوە.

﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى، وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى، وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى، ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى﴾ سورة النجم/٣٨-٤١. ئەم راگەیاندنە سەر تاسەرییە بتمانەی لەدەست چووی بۆ ئادەمیزاد گێڕایەوە، مەواهیبە سروشتیەکانی پێ بەخشی یەوە، ئادەمیزادی هەڵنا کە بەگوڕو تینێکی بەهێزەوە بەحەماس و سوربوونەوە، بەسۆزو جۆش و خرۆشێکی بێ سنورەوە هەنگاو هەڵێنێ و بەرەوپێش بڕوا، بۆ ئەوەی سەرەنجامی خۆی و سەرەنجامی مرۆڤایەتی دیاری بکا شانس و بەخت و توانای خۆی لەژیان دا بەتاقی بکاتەوە، هەل لەکیس خۆی نەداو، نەهێڵێ رەشبینی رو لەدەروونی بکا.

بێگومان حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) بەئاشکرا ئەوەی راگەیاندوە کەتاوان و هەڵەو خراپەکردن فەترەیەکە لەژیانی ئینسان دا دێ و بەسەر دەچێ، ئادەمیزاد بەنەزانی و سەرکەشی خۆی تێیان دەکەوێ، جاری واهەیە بەهۆی کورت بینی خودی ئادەمیزاد خۆی و بەهۆی گومڕایی کردنی شەیتان و برێ جار لەرێگەی هەڵنان و ئیغراکردنی نەفس ئەوتاوان و هەلانە ئەنجام دەدرێن. لەهەمان کات دا چاکسازی و ژیوان بوونەوە لەتاوان و خراپەکاری و داننان بەتاوان و تۆبەکردن و پەشیمان بوونەوە بنەمایەکە لەبنەماکانی سروشتی ئادەمیزادو جەوهەرو کاکڵەی ئادەمیزادییەتی. هانا بردن بۆلای خوداو پاڕانەوەو لالانەوە لەزاتی پاکی بۆ لێبوردن و سوربون لەسەر وازهێنان لەوتاوانانەو نەگەڕانەوە بۆ سەریان نیشانەی رێزداریی ئادەمیزادەو چاولێکردنی باوە ئادەمە (درودی خوای لەسەربێ): نیشانەی پاکی ئەصل و رەسەنایەتی مرۆڤە.

بێگومان حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) دەرگایەکی گەورەی بۆتۆبەکردن و پەشیمان بوونەوە لەبەردەم تاوانکاران و لەقوڕچەقیوانی زەلکاوی گومڕایی والاکردو داوای کرد ئادەمیزادی گیرۆدەبوو بەتاوان لەو

دەرگـا والآیـەوە خۆیـان لـە قوڕەرەشـی گونـاهو بێـدینی رزگـار بکـەن. بەشێوەیەکی گشتی و هەموانی بانگەوازیی تاوانبارانی کرد بۆ تۆبەکردن و بـەخودا چـوونەوەو وازهێنـان لـەتاوان، بـەدورو درێـژی راڤـەی تەوبـەی بـۆکردن و مـەرج و شـەرتەکانی دیـاری کـردن بـەجۆرێك دەتـوانین بڵـێین: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەم روکنە گەورەو گرنگەی لەئایینی پیرۆزدا زینـدو کردەوە، بۆیە ناوێك لەناوە خۆشەکانی پێغەمبەری ئیسلام (نبي التوبة)یە، چونکە ئەو نەهات بانگەوازی بکا بۆ تۆبەکردن وەکوو وەسیلەیەکی ناچاری ئـادەمیزاد قـەرەبووی ئەوشـتانەی پـێ بکاتـەوە کەلەکیـسی چـون و بـەس: بـەڵکوو هێنـدەی لەشـان و شـکۆی تۆبـە بـەرزکردەوە تاگەیاندییـە ئاسـتێك لەرێزی گەورەترین عبادەت دابنرێ، تۆبەکردن و پەشیمانبوونەوە لـەتاوانی کـردە رێگایـەکی ئاسـان بـۆ گەیـشتن بەبـەرزترین پلـەی خوداپەرسـتی و ئـــاینخوازی کەخـــەڵوەکێش و عیبادەتکـــار و دونیانەویـــست و بەنـــدە راسـتاڵەکانی خـودا حەسـوودییان پـێ دەبـەن بێگومـان قورئـانی پـیرۆز گـەورەیی تۆبـەو پەشـیمانبوونەوە لـە تـاوانی وەهـا راڤـەکردوە: کـە دەبێتـە هۆکـاری کوژاندنـەوەی گـەورەترین تـاوان کـە ئـادەمیزاد بەخـەیاڵی دابـێ، تۆبەکەی رانواندوە کـە دڵخوازبێ، بانگـەوازی تاوانبـارانی کـردوە، لاڵ و پـاڵ کەوتووی دەستی نـەفس و شـەیتانی هـەڵناون بۆئـەوە پـەنا بەرنەبـەر خـوداو بۆلای قاپی ئەو هەنگاو هـەڵێنن و بچنە ژێـر سـێبەری رەحمـەتی و خۆبخەنـە نـاو بـاخی لێبـوردەیی و دەریـای بەخشـشی بێپایـانی، کـەدەورەی هـەموو دڵەکان و هەموو ئاسۆیەکانی داوە وەها تۆبەکەی تەصویر کردوە و تـەماعی خستۆتە بـەر ئادەمیزادە تاوانبارەکـان کـەتا بلـێی سـەرنج راکێشەو ئـەوەی لـێ وەردەگـیرێ کـەخودا نـەك هەربەرامبـەر تۆبـەکاران لێبـوردەو خـاوەن بەزەییەو بەس بەڵکوو (ئەگەر تەعبیرەکە راست بێ) خۆشیشی دەوێـن و رێـز لە هەڵوێستیان دەگرێ و سوپاسیشیان دەکا، بۆ زێدە دڵنیـایی ئـەم ئایەتـە

بخوێنەوە و چێژی شێوازی ئەو هەموو لوطفو خۆشەویستییەی خودا بۆبەندە تۆبەکارەکانی بکە ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ سورة الزمر/٥٣.
زیاتر لەوەو نایاب تر لەوە ئەوەیە کەئەم ئایەتەی دوایی ئاماژەی پێدەکا، ئەوەتا پەروەردگار باسی چەند کۆمەڵێك لەبەندە راستاڵەکانی دەکاو لەپێش هەموو ئەم کۆمەڵە جیاجیا نورانیانەدا ناوی کۆمەڵی تۆبەکارانی هێناوە دەفەرموێ: ﴿التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدونَ الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللَّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ سورة التوبة/١١٢. ئەم تەکریمو رێزلێنانەی پەروەردگار بۆبەندە تۆبەکارەکانی و دەرخستنی بتمانە بەو تۆبەکردنە بەئاشکرا لەسەر گوروشتەی ئەوسێ هاوەڵەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە بەبێ بیانوو لەغەزای تەبوك دواکەوتبوون و لەمەدینەدا مابوونەوە رەنگ دەداتەوە. ئەوەتا پەروەردگار کەباسی قبوڵکردنی تۆبە لە ئەوسێ هاوەڵانەمان بۆ دەکا، راستەو خۆ نایە بفەرموێ: ئەو سێ کەسە تاوانیان ئەنجام داو دوایی تۆبەیان کردو خودا تۆبەکەی لێ قبوڵ کردن، بەڵکوو سەرەتا ناوی پێغەمبەر و ئەوجار کۆچکەرەکانو یاریدەدەران دەهێنێ کەئەمانە هیچیان لەغەزاکە دوانەکەوتون، پاشان ئەوسێ هاوەڵە دواکەوتووە پەشیمانبووە تۆبەلێ وەرگیراوانە عەطف دەکاتەوە بۆ سەر پێغەمبەر و هاوەڵانی دەفەرموێ: ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ، وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ سورة التوبة/١١٧-١١٨.

پەروەردگار بۆیە ئەوەی راگەیاند کە تۆبەی لە پێغەمبەرو کۆچکەران و یاریدەدەران وەرگرتووە، لەکاتێك ئەوان لەغەزاکە دوانەکەوتوون، ئەمەش بۆئەوەی ئەوسێ هاوەڵە دواکەوتووە لەغەزای تەبوك هەست بەوە نەکەن کە ئەوان بەتەنیا تاوانیان کردوە و تۆبەیان لێ وەرگیراوە، لەم روەوە هەست بە ئەولاش کەمی بکەن وەکوو لە (علم النفس)دا پێی دەگوترێ (مرکب النقص) هەروەها بۆئەوەی بۆ موسوڵمانان رون بێتەوە کە پلەو پایەی ئەوان لەریزی یەکەمی پێڕی راستگۆو راستالانی کۆچکەران و یاریدەدەرانن، ئیتر هیچ پێویست بەوەناکا شەرم بیانگرێ و هیچ عەیب دارنین. ئێستا جارێکی تر ئەو دوو ئایەتەی سورەتی (التوبة ١١٧-١١٨) بخوێنەرەوە ئەمجار وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە؟ ئایا نمونەیەك هەیە رونترو جوانتر بێ، وردترو قوڵتر بێ، شیرین ترو سەرنج راکێش تربێ بۆ قبوڵکردنی تۆبە بەو رێزگرتن لەتۆبەکارو رامالین و تەکاندنی تەپ و تۆزی تاوان بەو شێوازە نەرم و نیانی و لوطف و خۆشەویستی یە؟ تا ئێستا لەچ ئایین و داب و نەرێتی چ کۆمەڵگایەك دا لەونمونە بیستراوە دیتراوە؟ بێگومان کە ناچاری بڵێی ئەوە تەنها لەئایینی ئیسلام دا بەر جەستەبووە و بەس!

ئەمجار ئیسلام هات وەکوو بنەمایەکی گشتی ئەوەی راگەیاند کەرەحمەتی خودا بەشی هەموو شتێك دەکاو هەموو شتێك دەگرێتەوە. وەرەحمەتی زۆر لەرق و قاری بالادەست ترە. لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاء وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَـاةَ وَالَّـذِينَ هُـم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ﴾ سورة الأعراف/١٥٦. هەروا لەحەدیسی قودسی دا هاتووە خودا دەفەرموێ (إن رحمتي سبقت غضبي) بێگومان رەحمەت و بەزەییم پێش قارو قینم کەوتووە. نەك هەرئەوەندە و بەس بەڵکوو رەشبینی و

نائومێـد بـوونی کـردوه بـەهاوتای کـوفرو گـومڕایی و نـەفامی، ئـەوەتا پەروەردگار لەسەر زوبانی حەزرەتی یەعقوب دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِيَّ اذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلاَ تَيْأَسُواْ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ سورة يوسف/٨٧. بێگومان لەرەحمەتی خودا نائومێد نابێ مەگەر کافرو بێ بڕواکان. لەشوێنێکی تری قورئاندا لەسەر زوبانی حەزرەتی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّآلُّونَ﴾ سورة الحجر/٥٦.

ئاوا بەوشێوە پێغەمبەری خۆشەویست بەم بانگەوازی یە گشتییە و هەڵنانی ئادەمیزادە تاوانبارەکان بۆ تۆبە دەرمانی دەردی کوشندەی ڕەشبینی کردوە، فەضڵو گەورەیی تۆبەکردنی رون کردۆتەوە ئەوەی ڕاگەیاندوە کە تۆبە کردن بۆ هەموو کەسەو باکەس لەرەحمەتی خودا نائومێد نەبێ، بەم شێوە مرۆڤایەتی زەندەق چووی گیرۆدەبووی داوی نائومێدی و رەشبینی ئارام کردەوە، گیانێکی تازەی پێ بەخشی یەوە، ئەو ئادەمیزادەی کە هەمیشە هەڕەشەی عەزاب و تۆڵەی تاوانو دیاردەی رقو قینی خودای لێ دەکراو ئەویش لەترسا هانای دەبرد بۆ دیوپەرستیو بتپەرستیو داروبەرد پەرستی!!

بێگومان مالمە جولەکەکان و راڤەکەرانی تەورات و ئینجیلو رەبەنە دێرنشینەکانو پیاوە ئایینی یە توند ڕەوەکان لەم بارەوە ڕۆڵی گرنگیان هەبوو.

حەزرەتی موحەممەد کە ئایینی ئیسلامی پیرۆزی هێنا هەلو مەرجێکی باشی هێنایە پێشەوە بۆ تۆبە کردنو خۆخستنە پەنا رەحمەت و بەخشش خوداوە، فرسەتێکی تازەی جوانو تازەی ژیانی رەخساند، و گوڕو تینێکی باشی خستە دڵە بێ هێزو لاوازە خەفەرکراوەکان، گیانێکی تازەی خستە

ناو جەستە لەكار كەوتووەكانی كۆمەڵو خوێنی خەستەوەبوویانی وەسوڕ خستەوەو تینو گەرمایی یەكی تازەی كردە ناو خوێنی جەستەیانەوە، برینەكانیانی دەرمان كردنو جەستەی لەقوڕو چڵپاوی گومڕایی دەرهێنانو بەرزی كردنەوە بۆ تۆپەلاكی عیززەت و سەروەری و بتمانە بەخۆو خۆ ئامادەكردنو پشت بەستن بەخودا.

## كۆكردنەوەی دینو دونیاو ڕێكخستنی ریزەكانی كۆمەڵو یەكیەتی خستنە ناو گروپە ناكۆكەكانو پێرە بازرگانەكان:

بێگومان ئاینە كۆنەكان (بەتایبەتی ئایینی مەسیحی) ژیانی ئادەمیزادیان دابەش كردبوو بۆ دووبەش، بەشێك بۆ ئایینو بەشێك بۆ دونیا، ئادەمیزادی سەر زەوییان كردبوە دووبەش دووسەربازخانە، سەربازخانەی پیاوە ئایینی یەكانو سەربازخانەی پیاوانی دونیایی، ئەم دوو مەعەسكەرە هەرئەوە نەبوو لێك جودابوونو بەس بەڵكوو لەنێوانیاندا كەنداوێكی گەورەو پانو پۆڕ هەبوو، لەنێوانیان دا لەمپەڕێكی گەورەو دڕكاوی و ئەستورو پتەو هەبوو، هەمیشە ئاژاوەو شەڕو هەرا لەناویان دا بەرپابوو، هەردولایان بڕوایان وابوو كەدژایەتی هەیە لەنێوان ئایینو دونیادا ئەوی بیەوێ پیاوی ئایین بێ دەبێ واز لەدونیا بێنێو بەتەواوی لێی دابڕێ، نەك هەرئەوەندە بەڵكوو دەبێ دوژمنایەتی بەرامبەری رابگەیەنێ، ناتواندرێ (بەگوێرەی قسەی ئەوان) لەیەك كات دا ئادەمیزادێك سواری دووكەشتی ببێ، هەروا دەڵێن: بەبێ پاشگوێ خستنی بیری قیامەت، ناكرێ باری ئابوری پێش بخرێو ژیانی كۆمەڵگا گەشەی تێ بكەوێ، پێیان وایە بەبێ رووەرگێڕان لەئایینی خوداو تەعلیماتی بەدیهێنەری ئاسمانەكانو

زەوی، باری ئابوری خەڵك پێش ناكەوێ، هەر وادەڵێن: هیچ فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتێك بەرقەرار نابێ بەبێ پاشگوێ خستنی تەعلیماتی ئایینی و رەوشتی ئایینی و لەبیركردنی ترسی خودا، هەروا دەڵێن: ئایینداری بەبێ رەبەنی و دیرنشینی و خەڵوەنشینی ناگونجێ، هەركەسێ بیەوێ ئایینداربێ دەبێ بەتەواوی واز لەدونیا بێنێ. هەركەسێ بیەوێ دونیای دەست بكەوێ دەبێ لەئایین دابڕێ‌و تەعلیماتەكانی پاشگوێ بخا.

ئاشكرایە ئادەمیزاد هەمیشە حەزی لەئاسانكارییە، بە سروشت ئارەزوی لە خۆشی‌و لەززەت وەرگرتنە، هەرفكرەو ئایینێك رێگەنەدا لەززەتی موباح‌و پێشكەوتنی ژیان‌و گەشە و نەش‌ونمای ئابوری‌و دەسەڵات گرتنە دەست‌و فەرمانڕەوایی بۆ ئادەمیزاد دەستەبەر ببێ، ئەو فكرەو ئایینە بەكەڵكی ئادەمیزاد نایە، چونكە ئەو جۆرە فكرو بیرو بۆچونە روبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ سورشتی ساغ‌و سەلیم دا، سەركوتكردنی غەریزەو حەزو ئارەزوە سروشتی یە بەرێئەكانی ئادەمیزادە، سەرەنجامی ئەو جۆرە فكرەو بیرو بۆچونەو بەربەرەكانی كردنەی سورشتی ئادەمیزاد ئەوەبوو ژمارەیەكی زۆر لەرۆشنبیرو زیرەك‌و خاوەن بڕوانامەو كەفائەی زانستی وازیان لەئایین هێناو رویان كردە دونیاو پێ‌ی رازی بوون‌و دڵیان پێیەوە نووساو بەتەواوی لێ بڕان بۆ رێكخستنی ژیانی دونیاو دەستەبەر كردنی لەززەت‌و خۆشی یەكانی، هیچ هیوایەكیان بە ئایین نەماو لایەنی رۆحییان پاشگوێ خست.

زۆربەی ئەوانەی پشتیان لەئایین كرد بەشێوەیەكی گشتی بۆیە وازیان لەئایین هێناو چونكە پێیان وابوو دژایەتی نێوان ئایین و دونیا دژایەتیەكی حەقیقی سەلماوەو ئایینداری‌و دونیاداری پێكەوە كۆنابنەوە، بۆیە دامو دەزگای فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی دونیایی دژی كەنیسە و پیاوانی

کەنیسە کە تەمسیلی ئایینیان دەکرد، راپەرین و لە گۆڕەپانی ژیان کەنار گیریان کردن، خۆیان لەهەموو کۆت و زنجیری کەنیشتەو پیاوانی ئایینی رزگار کرد، ئیتر فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتەکان وەکوو فیلێکی سەرکەش و هار کە لەزنجیرو پێوەند رەها بووبێ، یان وەکوو حوشترێکی هار هەوساری لەسەر داماڵدرێ ئەم لێك دابڕانەی ئایین و دونیا، ئەو دژایەتیکردنەی نێوان پیاوە ئایینی یەکان و پیاوانی دونیا ویست، دەرگای لەبەردەم بێدینی و کوفردا واڵاکردو نێچیری ئەم ئیلحادو بێ دینیەش یەکەمجار خۆر ئاوابوو، هەروا ئەونەتەوەو وڵاتانە بوون کەلەڕووی فیکرو زانیاری و رۆشنبیری یەوە ملکەچی خۆرئاواوبون و یان لەژێر سایەی خۆرئاواو ئەوروپادا دەژیان. لەلایەکی ترەوە بانگخوازە مەسیحیە توندڕەوەکان و پیاوە ئایینییە بیرتەسکەکانی کەنیشتە، ئەوانەی پێیان وابوو سروشتی ئادەمیزاد، گەورەترین کۆسپە لەبەردەم پاکبوونەوەی گیان و پەیوەندیکردن بەئاسمانەوە، ئەوەندەی تر قوڕەکەیان خەست کرد ئەم توندڕەوو بیر تەسکانە هەرچی لەتوانایان دابوو بەکاریان هێنا بۆزەلیل کردنی گیان و سزادانی بەجۆرەها بڕیاری قورس و تەعلیماتی ستەمکارانە، ئایینیان بەشێوەیەکی ناشیرین و ترسناك دەخستە بەرچاوی جەماوەر، ئاینیان هێندە قورس کرد ئەوەندە بەناشیرینی و ترسناك رایان دەنواند: کە موچورکەی بەجەستەدا دەهێناو خەڵك لێی رادەکرد، سەرەنجام کارگەیشتە ئەوە ئایین کەنارگیر بکرێ و پانتایی تەسك و کورت ببێتەوە و بێدینی پەرەبسێنێ و عیبادەتکردنی هەوەسبازی و دونیا پەرستی گەیشتە تۆچەڵاك و جیهان لەنێوان دوشتی دژ بەیەك دا خواروو ژوری دەکرد، دوایی بەلای لاواز بوونی ئایین دا کەوتەوە، یان بڵێین: هەستی ئایینی کەوتە چاڵی قوڵی بێدینی و چەواشەکاری رەوشتەوە.

گەورەترین دیاری کە پەیامی پێغەمبەر بۆ مرۆڤایەتی هێناو منەتی هەرە گەورەی بەسەر ئادەمیزادەوە ئەو بانگە زوڵاڵە بوو کەلەجیهاندا دەنگی دایەوە: کەبنەمای هەموو کردەوەو ئەخلاقێك ئەو مەبەستە یە کە مرۆڤ داخوازیەتی ئەو مەبەستەی کە شاریح بەوشەیەکی کورت بەڵام پڕمانا تەعبیری لێ داوەتەوە ئەویش (نیازە) دەفەرموێ: (إنما الأعمال بالنيات، و إنما لكل إمريء مانوى...) بێگومان هەموو کردەوەیەك کەئادەمیزاد ئەنجامی دەدا بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوداو دڵسۆزی بۆ خودا هەڵی بنێ بۆ ئەنجامدانی و لەروانگەی پابەندبوونی بەفەرمان‌و نەهیەکانی خودا ئەو کردەوەیە بکا، بێگومان ئەوە وەسیلەو هۆکارە بۆ نزیکبوونەوە لەخوداو گەیشتن بەپلە و پایەی بەرزی یەقین و دڵنیای و ئیمان‌و وباوەڕی راستەقینە، ئەوە ئاینێکی خالص و بێخەوشە، جا ئەوکردەوە جیهادبێ، شەڕو فەرمانڕەوایی بێ ئیدارە بەڕێوە بردن بێ، لەززەت وەرگرتن بێ لەنیعمەتەکانی دونیاو دابین کردنی داخوازی‌یەکانی نەفس بێ، هەوڵ‌و تێکۆشان بێ بۆ رزق‌و رۆژی، لەززەت وەرگرتن بێ بە یاری‌و رابواردنی پاك‌و موباح، ژیان بەسەر بردنی بێ لەگەڵ خێزان‌و ماڵ‌و منداڵدا، ئەمانە هەموو ئەگەر مەبەست ڕەزامەندی خودا بێ بەعیبادەت حسێب دەکرێن‌و پاداشی دەدرێتەوە، بەپێچەوانەوە هەموو عیبادەت‌و خودا پەرستی یەك هەموو کارو کردەوەیەك هەرەچەند بەرواڵەت عیبادەت بێ ئەگەر خالص بۆ رەزامەندی خودانەبێ، بەمەبەستی پابەند بوون بەفەرمانی خودا نەبێ، غافڵانە ئەنجامی بداو دڵسۆزی تێدا نەبێ، ئەوە ئەوکارانە بەکاری دونیایی دەژمێردرێ،، تەنانەت ئەگەر ئەو کردەوانە نوێژو رۆژوو حەج‌و جیهادبێ، ذیکرو تەسبیحات‌و غەزابێ، بەمەرجی مەبەستی لەئەنجامدانی رەزامەندی خودا نەبێ ئەوە ئەنجامدەرەکەی پاداشی لەسەر وەرناگرێتەوە! بەڵکوو ئەوکارو کردەوە ئاییننییە رواڵەتیانە دەبنە تاوان‌و لەخودا دوری دەخەنەوە.

چــونکه مەبەســتی ئەنجامدانەکــەی لەبــەر خــاتری خودانیــە، نیــازی لەکردنەکەیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا نیە.

بێگومـان بـەهاو سـەروەرییەکی تـر لـەکارە زۆر گـرنگ‌و پـیرۆزە کـانی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) لابردنی ئەو دیوارە ئەستورە دروستکراوە بوو کەلەنێوان ئایینداری‌و دونیا ویستی دا دروست کرابوو، پڕکردنـەوەی ئـەو چاڵە پـان‌و قوڵـەی نێـوان ئـایین‌و دونیـا بـوو، ئـەوە بـوو حـەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) توانی ئەم دوشتە (دنیاو دین)ە دژ بەیەکە لێك دورە کەلەمێـژ بوو کێ‌بڕکێیـان بـوو پێکـەوە نـەدەگونجان‌و ڕێك نەدەکـەوتن وایـان لــێ بکــا دەســتەملانی یــەکتربن و پێکــەوە بەخۆشەویـستی هەڵبکــەن‌و بەئاشــتی و بــێ دژایــەتی بــەردەوام بــن، ئاشــکرایە پێغەمبــەری ئیــسلام پێغەمبـەری یەکیـەتی‌و ئـازادی‌و یەکسانی یـە لەهـەمان کاتـدا مـوژدە دەرو ترسـێنەرە، پێغەمبـەری خـودا بـەپێ‌ی ئـەو پەیامـە پـیرۆزەی بڵاوی کـردەوە لەهــەردوو موعەســکەرەکە ئــادەمیزادانی بــۆلای خــۆی کــێش کــردن‌و موعەســکەرێکی خواناســی جیهـان ئاوەدانکـەرەوەی لــێ دروســت کــردن، موعەســکەرێکی خــاوەن بڕوابــە خــوداو هیوابــەخوداو خــاوەن بــەزەیی بــۆ مرۆڤایـەتی و هەوڵـدەر بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خـوداو تێکۆشـەر بـۆ دابینکردنــی پێویــستییەکانی ژیــان‌و پێشخــستنی بــاری کۆمەڵایــەتی‌و شارستانییەت. ئـەو پێغەمبـەرە بـوو فـەرمووی (لـيس الرجـل رجـل الـدنيا ولا الرجل رجل الآخر بل الرجل رجلهما) ئەو پێغەمبەرە بوو ئێمەی فێری ئەم دوعا جوان‌و گشتی‌و بەرفراوان‌و موعجیزە کرد ﴿رَبَّنَـا آتِنَـا فِـي الـدُّنْيَا حَـسَنَةً وَفِـي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ سورة البقـرة/٢٠١. خودایـە لـەدونیا چاکەمان پـێ ببەخـشە و لەقیامـەت بەشـی باشمـان بـدەرێ‌و بمانخـەرە ژێـر ڕەحمـەتی خۆتەوە، لەسزای ئاگر بمانپارێزە.

پێغەمبەر بوو بەم ئایەتە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سورة الأنعام/١٦٢. ئەوەی راگەیاند کەژیانی موسوڵمان بریتی نیە لەچەند کۆمەڵە شتێکی دژ بەیەك و نەگونجاو لەگەڵ یەکتری دا. بەڵکوو ئەوەی سەلماند: کە ژیانی ئینسان کۆمەڵە شتێکن کە گیانی عیبادەتو خودا پەرستی و هیوای پاداش لەخودا بەسەریان دا زاڵە، بڕوا بەخوداو پابەندبوون بەئیسلامو رێنماییەکانی بەرێوەی دەبا، ئەمەش هەموو بوارەکانی ژیانو کونو قوژبنەکانی، هەروەها هەموو گۆڕەپانو کونو کەلەبەری ژیان دەگرێتەوە، گۆڕەپانەکانی تێکۆشانو بوارەکانی کارو لایەنەکانی ژیان هەموویان دەگرێتەوە. بەمەرجێ هەڵسو کەوتەکانی دڵسۆزی لەگەڵ دابێو نییەتی پاك بێو نیازی رەزامەندی خودا بێ، بەگوێرەی پەیڕەوو پرۆگرامی پێغەمبەران کاربکا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئامـاژەی ئەوەی تێدایە کە حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری یەکیەتیو پێکەوە گونجانە، پێغەمبەری یەکسانی و برایەتی و هاریکارییە، موژدە دەرو ترسێنەرە، بەڵێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تۆڕو بیرۆکەی جوداوازی و دژایەتی نێوان ئایینو دونیای لەناو برد، هەموو بوارەکانی ژیانی کردە عیبادەت، هەموو زەوی کردە مزگەوتو شوێنی نوێژ کردن، دەستی ئادەمیزادی گرت لەموعەسکەرە دژ بەیەکەکانەوە کێشی کردن بۆ بەرەیەکی یەکگرتووی بەرفراوانو دەوڵەمەند لەکرداری صالح و خزمەتکردنی مرۆڤایەتیو هەولدەر بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی خودا، بەجۆرێك تۆ دەبینی لەکۆمەڵگای موسوڵمان دا پاشا هەن لەپۆشاکی هەژاران دا زاهید هەن لەلیباسی پاشایان دا، هەموویان کێوی ئارام و کانیاوی زانستو زانیارین، شەو خەریکی شەو نوێژو خودا پەرستینو بەرۆژ سوارچاکی

مەیدانی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەن بەبێ ئەوەی هیچ دژایەتیەك و گرانی و قورساییەك هەست پی بکرێ، یان لەگرێژنە چونو خوارو خێچی یەك بەرچاو بکەوێ...

## دیاریکردنی مەبەستەکانو گۆڕەپانەکانی کارو تێکۆشان:

بەهاوسەروەریی شەشەم یان بڵێین: گۆڕانکاری شەشەم کە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەربێ) لەژیانی مرۆڤایەتیدا بەدی هێنا ئەوە بوو ڕێنمایی ئادەمیزادی کرد بۆ شوێنی شیاوی خۆی بۆ شوێنێك کە بتوانێ هێزو وزەی خۆی تێدا بەکاربێنێ، بەرزی کردەوە بۆ ئاستو فەزایەکی بەرفراوان بۆ ئەوەی بتوانێ هەوا پەروازی بکا.

بەڵێ ئادەمیزاد بەگشتی لەپێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی نەدەزانی، نەیدەزانی بەرەو کوێ هەنگاو دەنێو ئاکامی بەکوێ دەگا! نەیدەزانی بواری باشو ڕاستەقینە بو تواناکانی چیەو لەچی دا بەکاریان بێنێو هەوڵو تێکۆشانی خۆی لەچی دا بەگەڕ بخا؟!

ئادەمیزاد پێش هاتنی ئیسلام بۆخۆی مەبەستی خەباتی دروستکراوی دانابوو، بەدەستی خۆی لەچوار چێوەی دائیرەیەکی تەنگە بەرو سنووردار دا خۆی قەتیس کردبوو هەموو هێزو تواناکانی خۆی لەو چوار چێوە تەسکەدا بەکار دەهێنا، نموونەی هەرە بەرزو بەختەوەری بۆ پیاوی سەرکەوتوو ئەوەبوو زۆر دەوڵەمەندبێ، قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی بەرفراوان بێو دەسەڵاتی بەسەر زۆرترین خەڵك دا بڕواو زۆرترین وڵاتی لەژێر دەست بێ! بەملیۆنەها ئادەمیزاد هەبوو هیوایاتو تەماعی لەوە تێپەڕی نەدەکرد کەجلو بەرگی ئاڵو واڵای هەبێ، دەنگی خۆش ببیستی، خواردنی خۆش

بخوا، حەزی لێ بوو لاسایی بولبول بکاتەوە لەخوێندن دا یان هی تاووس لە پۆشاکی رەنگاو رەنگ و لارو لەنجەدا، بەڵکوو بەزۆری ژیانیان لە شێوەی ژیانی ئاژەڵو پیرۆ دەچوو، بەهەزاران کەس هەبوو لەدەربارەی پاشاو فەرمانڕەوا کان دا ژیانیان بەسەر دەبردو لێهاتویی و زیرەکی خۆیان لەپیاهەڵگوتن و ماستاو کردن بۆشاو وەزیر و گزیردا بەکاردەهێناو دەستەونەزەر لەکۆشکی پاشاکان دا رادەوەستان و سەریان نەوی دەکردو هەندێ جار سوژدەشیان بۆ پاشا دەبرد، هەزاران زیرەك و لێهاتوو هەبوو خەریکی مامە حەمەیی کردن بوو بۆ پیاوە دەوڵەمەندەکانو چاولەدەستیان بوون، یان خەریکی کات بەسەر بردن بوون بەئەدەبێکی بێ ناوەرۆك و بێ نرخ لەدونیاو قیامەت دا.

حەزرەتی موحەممەد هات لەهەموو ئەم دیاردەو مەظاهیرانە دا گۆڕانکاری بنەڕەتی و سەرلەبەری کرد، هەوڵی دا مەبەست و نیازی ئادەمیزاد بەحەقیقەتێکی رەهاوە پەیوەست بکا، هەدەفی بەرزو ئاواتە خوازی خستە پێش چاوی و هانی دا هەوڵێ دەستە بەرکردنی بدا، ئەوەی لەدڵو دەرون دا چەسپاند کە بواری راستە قینە بۆ هەوڵو تێکۆشانی ئادەمیزاد و خەرجکردنی وزەو تواناکانی تێیداو هەواپەروزابوونی گیانی بەرزەفڕی بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری هەردو دونیا ناسینی پەروەردگار و صیفاتی جەلال و جەمالیەتی، ناسینی بەدیهێنەری ئاسمانە کان و زەویە، بیرکردنەوە یە لەگەورەیی بونەوەرو بەرفراوانی و هەڵسوڕانی بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزاد و دەسەلاتی ئەو خودایە، ئەو بونەوەرەی بەدی هێناوەو هەڵیدە سوڕێنێ، هەوڵی دا بیرو باوەڕی راستەقینەی یەکتا پەرستی لەدڵێ ئادەمیزاد بڕوێنێ و یەقین پەیدا بکەن بەتاك و تەنهایی خوداو دەسەلاتی رەهایی و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی خوداو رازی بوون بەقەزاو

قەدەریو دەستە بەرکردنی بەختەوەری هەردو جیهان، ئادەمیزادی فێرکرد هەوڵو تێکۆشانی وەگەڕبخا بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك شتە بڵاوو دژبەیەکەکان کۆبکاتەوەو بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاریان بێنێ و خودایان پێ لەخۆڕازی بکا، هێزە باطینیەکانی گەشە پێ بکاو توانا ڕۆحی یەکانی وەگەڕ بخا هەموو ئەمانە بۆ گەیشتن بە پلەکانی یەقینو نزیکبوونەوە لەخودا و بەندایەتی بۆکردنی، ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و خۆشەویستی و فیداکاریو گەیشتن بەپلەو پایەیەك خودا لەخۆیان ڕازی بکەن ئەوەش پلەو پایەیەکە فریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەس پێی گەیشتوون، بەختەوەری ڕاستەقینە ی ئادەمیزاد تێیدا بەرجەستە دەبێو ئەوپەڕی پلەی کەماڵو بەرزبوونەوەی گیانی دەست دەکەوێ.

## لەدایکبوونی جیهانێکی تازەو ئادەمیزادێکی تازە:

ئاشکرایە دوای ڕەوانەکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەو ڕێنماییو تەعلیماتە بەرزو پیرۆزانەوە کەبڵاوی کردەوە جیهان گۆڕا وەکوو چۆن کەشو هەوای وەرزەکان دەگۆڕێ، ئەوە بوو مرۆڤایەتی لەوەرزێکی پایز ئاساو تەمو دوکەڵاوی و بێ بەروبوومەوە گۆڕا بۆوەرزێکی بەهاری ڕەنگاو ڕەنگو پڕگوڵو باغو باغاتی چڕو پڕی زەنوێرو ڕازاوە. سروشتی ئادەمیزادەکان گۆڕا، دڵەکان بەنوری خودا ڕوناك بوونەوە، خەڵك وازی لەبتپەرستی هێناو ڕویانکردە خوداپەرستی تامو چێژێکی تازەی لەم ئایینە نوێیە دەست کەوت خۆشیو ئارامی کەوتە دڵیەوەو بتمانەی بەخۆیو دواڕۆژی پەیدا کرد. دڵو دەروونە لاوازو سستو ساردو

سڕەکان بەگەرمایی ئیمان سەرلەنوێ ژیانەوەو گەشەیان کردەوە، عەقڵو ئاوەزەکان بەنوری ئیمان سەرلەنوێ روناك بوونەوە، نەفسەکان بەنەشوەی تازە سەرخۆش‌و تەڕ دەماخ بوونەوە، مرۆڤایەتی دەستە دەستە و پۆل پۆل کەوتە جم‌و جۆڵو هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستەقینەو شوێنی بەرزی خۆی، دەیکورکاند بۆ پلەو پایەی بەرزو هەڵکشاوی لەدەست چوی! هیچ گەل‌و نەتەوەیەکت نەدەبینی ئیللا سەرگەرمی کێ بڕکێ بوون لەو بوارەدا، هەموو ولات و شار و هۆبە کان لەهەوڵی ئەوەدابوون چی زووە بچنە ژێر ئەو خێمە پیرۆزەوە دەتبینی عەرەب‌و ناعەرەب دانیشتوی میصرو شام‌و تورکستان و ئێران و عێراق‌و خوراسان باکوری ئەفریقیاو ئەندەلوس‌و ولاتی هیندو دورگەکانی خۆرهەلاتی هیند هەموویان مەست‌و حەیرانی ئەو خۆشەویستی یە خوداییە بوون‌و هەوڵی بەدەستهێنانی ئەو فەیضە ئاسمانی یەیان بوو، شەیدای ئەو ئامانجە بەرزو شکۆدارە بون‌و ئاتاجی ئەو دەرگا رەحمەت بەخشە بوون.

بەڵێ ئاشکرابوو مرۆڤایەتی لەخەوی بێداری وەئاگا هاتەوە، بەخۆی دا چۆوە، دوای خەوێکی درێژ خایەن‌و قوڵو گران چاوی کردەوە ویستی هەلی لەکیس چوی قەرەبوو بکاتەوەو تێ ی هەڵنێتەوە قولی جیدییەت و کارکردنی لێ هەڵمالی‌و لەماوەیەکی کورت‌و قیاسی دا هەموو ئەو ولاتانەی ناومان هێنان ئیسلامیان تێدا بلاو بووەوە، هەموو کون‌و قوژبنێکی ئەو دەڤەرو هەرێمانە بەهەوڵو تێکۆشانی بانگخوازانی ئیسلامی و تێکۆشەرانی ماندو نەناس و دڵسۆز بۆ ئایین و ولات‌و لێزان لەبواری بانگەوازی و پەروەردە کردن‌و ڕێنمایی کردنی خەڵك دا ئیسلام بلاو بووەوە

گەشـەی کـرد. بەڕاسـتی ئەوانـە خـوداناسـی بەراسـتی و سـوتاوی ڕێگـای هیدایەتو خۆنەویستو قوربانیدەر بەگیانو بەماڵ بوون بۆ وەدەستهێنانی خێرو فـەڕ بـۆ مرۆڤایـەتی و ڕزگـار کردنـی لـەو خەتـەرەی لەهـەر چوارلاوە دەورەی دابوو ئـەو بانگخوازە دڵسۆزانە فریشتە حەسوودییان پـێ دەبـردن لەدڵسۆزی بۆ ئاین و پابەندبوون بەفەرمانی خودا، پشکۆی خەفەبووی نـاو دڵو دەروونـی ئادەمیزادەکانیـان گەشـاندەوە و تیـشکی خۆشەویـستی خـودایی لـەدڵیان پرشـنگی داو روبـاری عـیلم و عیرفـان و حەقناسـی ڕەوان بـوو، دونیـا پڕبـوو لـە زانیـاری و ئـەدەبو ئیمـانو خۆشەویـستی.لـەدڵو دەروونی خەڵکەکەدا دژایەتی کردنی ستەم و ستەمکاریو بوغضو کینەیان ڕوانـد، بەهــەموو جۆرێـك دژی چەوسـاندنەوەی جـەماوەرو نەتـەوەکان وەستان، گەلەستەمدیدەو چەوساوەکانیان فێری یەکسانی و ئازادی کـرد، دەرسـیان دادان کـەداوای مـافی خۆیـان بکـەنو مـل بـۆ دەرەبـەگو قـەڕاڵو چەوسـێنەرەوان کـەچ نەکـەن، بەگـژیان دابچنەوە، خەڵکـە هـەژارو پـەراوێز خـراوو مـسکێن و بـۆرە پیاوەکـانی لـەباوەش گـرتو ڕێـزو خۆشەویـستی پێدانـەوە. هـات ئەوانـەی کۆمـەڵگای دەرەبەگایـەتیو دەمـارگیری بەچـاوی سوکەوە سـەیری دەکردنو حیسابی ئاژەڵی بۆ دەکردن مـافی یەکسانیو ئـازادی بۆ دەستە بـەرکردن، بـەم جـۆرە لەهـەموو شـوێنێك جـێ پەنجـەیان دیارەو چاکەیان بەسەر هەموو گەلو نەتەوەیەکی ژێردەستە و چەوساوەوە دیـارەو رەحمـەت بـون بـۆ جیهـان. سـەیری پوختـەی کارەکانیـان بکـەو لەچەندییەتو چۆنیەتی ئیشەکانیان ورد ببـەرەوە، لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوە لەبەرنامەو فیکرو بۆچونیان دا بکە، بڕوانە هەستی ناسك و گیانی هاوکاری

و دڵی پڕ بەبەزەیی و سروشتی ساغ و سەلیمیان، بڕوانە چۆن ئازاریان دەچەشت و وەکوو مۆم دەتوانەوە بۆ بەختەوەری ئادەمیزاد، لەگومڕایی و دواکەوتوویی، دڵو دەرونیان بەئاگری ئاهو حەسرەت و بەزەیی هاتنەوە بەخەڵك و سووربوون لەسەر دەستەبەرکردنی هەرشتێك کەسودو قازانجی بۆ ئادەمیزاد هەبێ چۆن خۆیان دەخستە ناو خەتەریات و لەپێناو بەرژەوەندی خەڵکدا ئەرك و ماندووبون و زەرەورو زیانیان بەلاوە سەیران و خۆشی بوو، خۆیان کردبوو بەقەڵغان و سوپەر بۆ جەماوەر فەرمانڕەواکانیان کاروباریان بەرێك و پێکی بەڕێوە دەبردو هەستیان بەبەرپرسیاریەتی دەکردو ئەمن و ئاسایشیان بۆ دابین کردون، سنوریان بۆ پاراستون و سەنگەریان بۆ پتەو کردون و لەگەڵ جەماوەردا تائەو پەڕی خەیال گونجاو لەبار بوون، بۆیە جەماوەرەکەشی گوێ بیستی فەرمان و نەهیەکانیان بون، ئەوە مێژوو بڕۆ هەواڵو سەرگورشتەی فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان بخوێنەرەوە بزانە خودا پەرستیان چۆن بووە، چەندە دونیا نەویست و زاهید بوون، چەند ڕەوشت بەرزو دەست و دڵپاك بوون، چەند ڕاستگۆ بوون تەنانەت شایەتی زەرەریان لەسەر خۆشیان داوە، بچوکیان خۆش ویستووەو ڕێزیان لەگەورە گرتووە لەگەڵ دۆست برادا دڵنەرم و لێبوردە، سەخی سروشت و دڵ فراوان و گیانپاك و بەبەزەیی بۆ موسوڵمانان و بەهێزو تواناو توندو تیژ بەرامبەر دوژمنی سەر ڕەق.

بێگومان خەیاڵی شاعیران و قەڵەمی ڕەوانی ئەدیب و نووسەران و وتاری شیرینی وتاربێژان ناتوانن بەتەواوی وێنەی ئەو حاڵەتەمان بۆ بکێشن کەئەو جەماوەری ڕۆژگاری زێڕینی مێژووی ئیسلام تێیدا ژیاون لەجیهانی واقیع

دا ئـەو رەوشـت و هـەڵس و كەوتـە حەقيقـەتێكی بەرچـاو بـووە و لـەژيانی خەڵكدا رەنگی داوەتەوە.

ئەگەر لەبەرئەوەنەبوايە كەئەو چيرۆك و بەسـەربردانە بەتـەواوتر بەئێمـە گەيـشتوون بەبـەر بـڵاوی باسـی لـێ وەكـراوەو موفيـدی عـيلم و زانيـارين و شايەتەكانی مێژووی بتمانـە پـێكراو بەيسەلمێنن و چەسپاندويانە، لەوانـە بوو ئێستا بگوترايە ئەوە ئەفسانەو چيرۆكی خـەياڵين و لـەجيهانی واقيـع دا نەبوون.

بـەڵێ هـيچ گومانێـك لەوەدانييـە كەئـەم گۆڕانكارييـە گەرەيـەو ئـەو رۆڵـە گرنگـەی پـەيامی حـەزرەتی موحەممـەد پەيـدای كـردو گێـڕای مـوعجيزە بـوو سـەروەری بـوو شـنەبای رەحمـەت بـوو رەحمـەتی خـودايی كەهـەموو كـون و قوژبنێكی گرتەوە.

بۆيە خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ سورة الأنبياء/١٠٧

